فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی



# تاوان و سزا



وەرگێڕانی: کەیوان هەورامی

ڕۆمان



لەگەڵ ١١ شرۆڤە

# تاوان و سزا

فیۆدۆر میخائیلۆڤیچ دۆستۆیڤسکی

وەرگێڕانی: کەیوان هەورامی



بەرگی یەکەم

## ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد



**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گۆزەکان، نزیک ناوەندی ڕۆژهەڵاتی کوران

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/


### ناسنامەی کتێب


ناونیشان: تاوان و سزا.

نووسەر: فیۆدۆر میخائیلۆڤیچ دۆستۆیفسکی.

بابەت: ئەدەبیاتی ڕووسی — سەدەی ١٩ی میلادی.

ژانر: ڕۆمان.

وەرگێڕانی: کەیوان هەورامی.

پێداچوونەوە: عیسا عوسمان.

بڵاوکەرەوە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

دیزاینی دەق: ئارام مەلا محەمەد

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠ میلادی، چاپی یەکەم.

# سەرچاوە:

جنایت و مکافات

ترجمه از روسی: حمیدرضا آتش‌براب | انتشارات: علمی و فرهنگی | چاپ اول

بۆ ڕەواندنەوەی هەر گومان و نادڵنیاییەک، لە زۆر شوێندا بەم سەرچاوە فارسیانە بەراورد کراوە:

١. جنایت و مکافات

ترجمه از روسی: مهری آهی | انتشارات: خوارزمی | چاپ هفتم

٢. جنایت و مکافات

ترجمه از انگلیسی: احد علی‌قلیان | نشر مرکز | چاپ دهم

٣. جنایت و مکافات

ترجمه از فرانسه: پرویز شهدی | نشر کتاب پارسه | چاپ پنجم

٤. جنایت و مکافات

ترجمه از انگلیسی: اصغر رستگار | مؤسسه انتشارات نگاه | چاپ پنجم

سوپاس بۆ هاوڕێی دڵسۆزم عیسا عوسمان، کە سەرلەبەری ئەو دێڕە زۆر و زەوەندانەی کە خۆم بەو سەرچاوە فارسیانەم بەراورد کردوون، ئەویش ورد و دڵسۆزانە یەک بە یەک بەم دوو سەرچاوە عەرەبی و ئینگلیزییەی بەراورد کردوون تا بچووکترین گومان نەمێنێتەوە:

الجريمة و العقاب:

المؤلف: فيودور دوستويفسكي | مترجم: سامي دروبي | الطبعة الأولى: ٢٠١٠ | الناشر: المركز الثقافي العربي

المؤلف: فيودور دوستويفسكي | ترجمة عن الروسية: د.شوقي حداد | الطبعة الأولى: ٢٠١٠ | الناشر: دار الخيال

Crime and Punishment | Translated By: constance garnett | Publisher: Free eBooks at Planet eBook.com

# پێست



## بەرگی یەکەم



## بەرگی دووەم



## شرۆڤەکان

# وەک پێشەکیی نووسەر[1]

لە دواهەمین ساتدا دەنگی تەقەی گوللەم بیست. دڵم لێوانلێو بوو لە خەفەت؛ خەفەتی ئەوەی کە دەمتوانی بە زۆر شـــوێن بگەم و کەچی دەرفەتم بۆ نەڕەخســـا. من ئەو ڕۆژە مردم و، هەمدیســـان زیندوو بوومەوە. چـاوەکـانی ئێمەیـان کردنەوە و گوتیـان تزار بڕیـاری سووککردنی سزاکەی ئێمەی دەرکردووە.

ســێ ســاڵ بەســەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕیوە. ســێ ســاڵە من هەر بەو زنجیرانەوە دەخەوم و بێدار دەبمەوە کە بە پێیەکانمیانەوە بەســتوون. هەوکردنی زامەکانم لەگەڵ تۆرەگەلی فێدا خۆشــبەختییەکە و بۆ چەند کاتژمێرێک من دەنێرێتە نەخۆشــخانەی ئۆردوگاوە؛ ئەو شــوێنەی کە دکتۆرێک بە دزییەوە مۆڵەت دەدات چەند ساتێک ڕۆمانەکانی دیکنز و هەندێک ڕۆژنامەی تا ڕادەیەک کۆنە بخوێنمەوە. دوێشـەو ئەم دکتۆرە مۆڵەتی دا لە نەخۆشخانە بمێنمەوە...

دوای چەندین سـاڵ لەسـەر تەختەخەوێک ڕاکشـابووم و لە ئاسمان ڕامابووم. ئاسمانێکی چەندە دڵشداهێن بوو! لەو ئاسمانانەی کە تەنیا لەو ســـــاتـانەدا دەتوانیـت بیـانبینیـت کە منداڵ یـان زۆر گەنجیـت. ئاسـمانێکی درەوشـاوە بە ئەسـتێرەگەلی شـەوقنەوە، هاوکات چاوانی تۆش دەدرەوشـــێنەوە. جا بە ســــەرســـامی و داخدارییەوە لە خۆت دەپرسـیت: «شـەڕەنگێزی و دڵڕەقیی سـەرزەوی، چۆن دەتوانن لەژێر

---

[1]. دوو نامەی دۆســتۆیفســکیمان لەبری پێشــەکی تێهەڵکێش کردووە. ســەرچاوە: «برنامه کتابباز – سـعود فراسـتی – نامەهای فیۆدور داسـتایفسـکی» (تێبینی: «و. ف» کورتکراوەی «وەرگێڕی فـارس»ــــــە و «و. ک» کورتکراوەی «وەرگێڕی کورد»ە.)

ئەم جوانییە هەمیشەییەدا درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن؟!» من هێشتا نەمتوانیوە سەیری ئاسمانی دەر و ناوەوەی خۆم بکەم و بڵێم خودا بوونی نییە! وەلێ دەزانم خودا گەر هەبێت یان نا، ئێمە ناچارین بەرپرسیارییەتی کامڵبوون و ئازاری خۆپەروەردەکردنمان بگرینە ئەستۆ. من باوەڕ ناکەم و دەزانم کە نابێت باوەڕ بکەم شەڕەنگێزی و دڵڕەقی لەژێر ئاسمانێکی هێندە دڵڕفێندا دۆخی سرووشتیی مرۆڤە. تا شەو زیاتر تاریک دەبێت ئەستێرەکان درەوشاوەتر دەبن، کتومت وەک درەوشاوەترین ئەو حەقیقەتانەی کە لە تاریکترین شەوانی ژیان و گەورەترین ئازارەکانی خۆمدا دەرکیان پێ دەکەم. شەوقی ئەستێرەکانی حەقیەت لە دڵی ئێمەدا، ڕێک بە ئەندازەی بەرفراوانیی ئازارەکانی ئێمەیە.

نازانم تا کەی دەتوانم لێرە هەڵبکەم، وەلێ دەزانم ئازارەکانی خۆم و مەینەتیی هاوزیندانییەکانم کە منیان لە خەون و مۆتەکەگەلی شەوانەی سەر زەویی سارد و تەختەیی ئۆردوگادا هاوبەش کردووە، ڕۆحم ئازاد دەکەن. ئێستە کە بێ لەم ئاسمانە هیچم بۆ نەماوەتەوە، بیر لە وەهمی ئەو ڕۆژانە دەکەمەوە کە ئازاد بووم؛ ئەو ڕۆژانەی کە ئەوانی دی هاودەنگم بوون.

تۆ گەر ئاواتگەلێکت هەیە، بەدییان بێنە. هەرگیز لە بەدیهێنانی ئاوات و خەونەکانتدا کەمتەرخەمی مەنوێنە. نەک هەر بە تەنیا ئاواتەکانت بەدی بهێنە، بەڵکە هەمیشە زیاتریشیان بکە.

بۆچی لەبارەی ئازادییەوە دەپرسیت، لە کاتێکدا کە بۆمان باس کردوویت!؟ بۆ نازانیت ئازادی هیچ شتێک نییە بێ لە بەرفراوانبوونی بێوەستانی ئەو خواستانەی کە لە ژیاندا هەمانن؟! من دوێشەو بەدەم ڕامان لە ئاسمانی ئەستێرەبارانی سیبیریاوە، ئیدی لە دڵی خۆمدا دەمزانی کە بەرئەنجامی ئەو ئازادییە بۆ دەوڵەمەندان نامورادی و خۆکوشتنە، بۆ هەژارەکانیش هەناسەساردی و تاوانە. دەزانیت،

مرۆڤەکانی ئەمرۆژانە لە دوو شت دەترسن: لەوەی کە هەژار بن و بە چارەڕەشی سەر بنێنەوە، دووەمیشیان ئەوەیە کە جێی بایەخ نەبن و تەنانەت لەوەش خراپتر؛ لە بەرچاوی ئەوانی دیکەدا وەک گاڵتەجاڕ دەربکەون. ڕەنگە هەر لەبەر ئەم دوو هۆکارەش بێت کە وایان پێ باشە ئاوها بە کەساسی تەقەللا بدەن بۆ گەیشتن بە هیچ!

... ئەم خوێنبەربوونی سـیـیە تەنگی پێ هەڵچنیوم، ئەوە نۆرەگەلی فێش تا دێ زیاتر دەبێت! دکتۆرەکان گوتوویانە دەرفەتێکی ئەوتۆم نییە، بەڵام من هەر لە سـەرەتاشـەوە دەمزانی کە دەرفەتێکم نییە! ئەوەی کە لە دواساتەکانی مندا ماوەتەوە، ئازارێکە، کە بە ڕووخۆشی باوەشی بۆ دەکەمەوە، چونکە لە ژیانمدا تەنیا لەڕێی ئازارەوە دەستم بە هەر حەقیقەتێک ڕاگەیشـتووە. لە سـەرانسـەری ژیانی مندا تاکە ترسم هەمیشە ئەمە بوو کە شایستەی ئازاری خۆم نەبم! جا خۆزگە بە من بڵێیت کە ئەمڕۆ من شـایسـتەی ئەم ئازارەم یان نا؟! چۆن دەکرێت بەبێ ئازار تامی عەشـق بکەیت؟ چۆن دەکرێت بەبێ ئازار شـکۆیەک بەدەسـت بهێنیت؟ ئێمە کە لە دایک دەبین، هەموو حەقیقەت لەنێو دەسـتەکانماندایە، ئەم حەقیقەتەش ڕۆژ بە ڕۆژ هێمن‌هێمن و بە بێدەنگی بەنێو پەنجە لەرزۆکەکانماندا ڕۆدەچێت، ئەمەش لەبەر ئەو هەموو ترس و سـووکییەیە کە لە ژیاندا دەچینە ژێر باری تەنیا بۆ ئەوەی ئازار نەکێشین! تەنیا بۆ ئەوەی عاشقانە نەژیین! مۆڵەتی گوتنی ئەوە بە خۆت بدە کە ئەوانی دی ناوێرن تەنانەت لەبەرخۆشـیانەوە بیری لێ بکەنەوە! هەرگیز مۆڵەت مەدە بێدەنگی بژاردەی تۆ بێت، لە کاتێکدا کە دڵت بە دەنگێکی زوڵاڵ بۆت دەدوێت. دەزانم کە زۆر زوو دوای مەرگی من، زمانی ئەڵمانیی پەیامبەری هەموو ئەم قسـانەی منتان بۆ دەکاتەوە. لێگەڕێ با دواهەمین وشـەکانم بۆ ئێوە لەبارەی عەشقەوە بن: عەشق ئەو گەنجینە بەبەهایەیە کە تۆ دەتوانیت لەڕێیەوە هەموو جیهان ببەیتەوە! جا نەک هەر بە تەنیا خۆت، بەڵکە هەموو

مرۆڤەکان لە تاوان داماڵێت و ئازادیان بکەیت. کەواتە دەستوبردی لێ بکە، بێ ئەوەی تەنانەت بۆ چرکەساتێکیش ترست لێ بنیشێت. لەسەر کێلی گۆڕەکەم بنووسە: «ئەو چڵە گەنمەی دەکەوێتە سەر زەوی و بە تەنیایی ئازار دەچێژێت، دەمرێت، بەڵام مەرگی ئەو، چڵەگەنمەکانی داهاتوو بەرەو ئەم سارایە ڕێنوێنی دەکات!»[1]

لەم دواهەمین ساتەدا لەبەرخۆمەوە بیر دەکەمەوە: چ شتێک لەوە سەمەرەترە کە ئێمەی مرۆڤەکان، وێڕای ئاگاداربوونمان لەوەی کە مەرگ تەنیا چەند هەنگاوێک لێمانەوە دوورە، کەچی بەرزترین پاڵنەر و هەوڵمان دۆزینەوەی مانایەکە بۆ ژیان، نەک زیاتر ژیان.

پاییزی ساڵی ١٨٥٢ | ئۆردوگای کاتۆرگا – سیبیریا

فیۆدۆر میخائیلۆڤیچ دۆستۆیڤسکی

---

١. ئاماژەیە بە ئایەتێکی ئینجیل کە لە دەستپێکی ڕۆمانی ***برایانی کارامازۆف***یشدا هاتووە: «هەر بە ڕاستی، هەر بە ڕاستی ئەمەتان پێ دەڵێم: ئەگەر دەنکە گەنم بکەوێتە سەر زەوی و نەمرێت، بە تەنیا دەمێنێتەوە، وەلێ ئەگەر بمرێت، بەرهەمێکی زۆری دەبێت.» (ئینجیل بە گێڕانەوەی سن جان، وەرزی ١٢، ئایەتی ٢٤) «و. ک»

## یەک

دەمەوئێوارەیەکی گەرمی سەرەتای مانگی تەمووز، گەنجێک لە ژوورۆچکە بەکرێکەیدا کە لە نزیک کۆلانی *ستالیارنی* بوو، هاتە دەر و هەنگاوی نایە سەر شەقام، جا دوودلانە بەرەو پردی *کوکوشین* کەوتە ڕێ.

لە پلیکانەکاندا تووشی خاتوونی خاوەنماڵ نەهاتبوو و بە بێوەیی دەرچووبوو. ژوورۆچکەکەی، کە زیاتر لە سندووق دەچوو، ڕێک لەژێر بانەلێژی بینایەکی بەرزی پێنجنهۆمیدا بوو. خاوەنماڵ لەگەڵ ژەمە خۆراکێکی ڕۆژانە و خزمەتگوزاریی پاککردنەوەدا ئەوێی بەکرێ دابووێ و خۆیشی لە نهۆمێک خوارترەوە دەژیا. بەم پێیە، گەنجەکە هەر کات بیویستبا بچێتە دەر، ناچار دەشیا بە بەردەم موبەقی خاتووندا تێبپەڕێت کە ڕووی لە پلیکانەکان بوو و کەم کاتیش هەڵدەکەوت دەرگەکەی لەسەر گازی پشت نەبێت. هەر جار کە بەوێدا ڕادەبورد هەستێکی بەئازار دەست و پێی دەخستە لەرزین و ڕووخساریشی لە شەرماندا کرژ دەبوو. تا قورقوڕاگە لە قەرزی خاوەنماڵەکەیدا چەقیبوو و نەیدەوێرا ڕووبەڕووی ببێتەوە.

وا نەبوو بڵێیت هێندەش ترسنۆک و بەستەزمان بێت، بگرە تەواو بە پێچەوانەوە، وەلێ ماوەیەک بوو بەدخوو و تووڕە بووبوو و بارێکی وەک ماخولیای[1] هەبوو. بە جۆرێک لە خۆیدا ڕۆچووبوو و

---

١. ماخولیا: ئەسپەک؛ مەیخوولی؛ نەخۆشییەکی بیر و هزە، نەخۆش تووشی ژاکان، خەیالات و وڕێنە دەکات. «و. ک»

خۆی لە هەمووان بەدوور دەگرت کە نەک هەر بە تەنیا لە بینینی خانمی خانەخوێ، بگرە سەلی لە بینینی هەر ئادەمزادێک دەکردەوە. لەژێر باری هەژاریدا پلیشابووەوە، گەرچی لەم دواییانەدا تەنانەت ئیدی ئەم دۆخە نالەبارە ئازاریشی نەدەدا. بە تەواوی دەستی لە کارەکانی ڕۆژانەشی شوشتبوو و هەر نەشیدەویست بەدەمیانەوە بچێت. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە گەنجەکەی ئێمە تەنانەت هەر بە مێشکیشیدا نەدەهات کە خاوەنماڵ چ فکر و خەیاڵێکی لەبارەیەوە هەبێت، بەس هەرگیز نەیدەویست لە پلیکانەکاندا بوەستێت، گوێ لەو قسە بێسەروبەر و پڕوپووچانە بگرێت کە بە بۆچوونی ئەو بەقەد پووشێک بایەخیان نەبوو و جا لەبارەی کرێخانووەکەوە نووزانەوە و بۆڵەبۆڵ و هەڕەشە ببیستێت و ناچار بێت خۆی بدزێتەوە و بیانوو بهێنێتەوە و درۆ بکات... کەواتە هەر ئەوە باشترە کە وەک پشیلە بە پلیکانەکاندا بچێتە خوار و تا کەسێک چاوی پێی نەکەوتووە، خۆی لە گێچەڵ ڕزگار بکات.

وەلێ ئەم جارەیان کە هەنگاوی نایە سەر شەقام، ترسانی لە ڕووبەڕووبوونەوەی خانمی خاوەنقەرز، خۆیشی خستە سەرسامییەوە.

*تۆ تەماشا کە من دەمەوێ دەست بە چ کارێ بکەم و کەچی لە چ شتکەلێکی گاڵتەجاڕانە دەترسێم!* بەدەم بزەیەکی سەیری سەر لێوییەوە لە فکردا ڕۆچووبوو. *ئممم... وایە ئیتر... مرۆڤ هەموو شتێکی لە بەردەستدایە، کەچی هێندە ترسنۆکە، لێدەگەڕێ تا لە دەستی بچێ... ئەمە بنەمایە... تەنیا لەوەدا تیا ماوم کە ئاخۆ خەڵکی لە چی دەترسن؟ نەکا لە هەنگاوێکی تازە یان قسەیەکی نوێ*[1] بترسن کە

---

١. دۆستۆیفسکی بڕوای وا بوو کە ڕووسیا سێ بلیمەتی هەیە کە قسەی تازەیان کردووە: *میخائیل لامانۆساف، ئالێکساندەر پوشکین* و تا ڕادەیەکیش *گۆگۆل*. «و. ف»

*دەیلێین؟ بەڵێ، هەر ئەوەیە... من خەریکە زۆری لەســـەر دەڕۆم. هەر لەبەر ئەوەشە کە هیچ کارێکم لەدەست نایێ، هەر خەریکی زۆربلێییم. لەوانەشــە لەبەر ئەوەی کە هیچ کارێکم لەدەســت نایێ، ئاوا تووشــی زۆربلێیی بوومە. دروست لەم مانگەشدا تووشی چەنەبازی بووم کە شـــەو و ڕۆژ لە ســـــووچێکدا کەوتبووم و بیری... بیری گەمژانەم دەکردەوە. باشــە ئێســتە بۆچی دەمەوێ بچمە ئەوێ؟ هەر بە ڕاســت ئەوەم لێ دەوەشــێتەوە؟ ئەســـڵەن مەســـەلەکە جددییە؟ نا بابە، هیچ جددی نییە. تەنیا بۆ ســەرقاڵییە کە لە خەیاڵاتدا خەریکی یاریم. حەزی یاری داویەتی لە کەڵلەم! بەڵێ هەر ئەوەیە! یارییە!*

دەرەوە، بە شــێوەیەکی تۆقێنەر گەرم و قەڵەباڵق و تاســێنەر بوو؛ قســـڵ[1] و داربەند[2] و خشـــت و تۆز و خۆڵ و ئەو بۆگەنە تایبەتەی هـاوینـانی پیتەربورگ هەموو لایەکی تەنیبووەوە. ئەو پیتەربورگییەی کە توانای بەکرێگرتنی ئێلاخی[3] نییە، چاک بەم بۆنە ئاشـــنایە. هەموو ئەمانە، کتوپڕ بە شـێوەیەکی نەخوازراو مێشـکی گەنجەکەیان پڕ کرد کە خۆی شـــەکەت و قەڵس بوو. بۆگەنی مەیخانەکان، بەتایبەت لەم بەشەی شاردا کە ژمارەیان زیاتر بوو و ئەو سەرخۆشانەشی کە لە ڕۆژانی ئاســـایی کاردا لەســـەر ڕێی قوت دەبوونەوە، دیمەنەکەیان بێزارکەر و ناخۆشـــتر دەکرد. کتوپڕ، قەڵســـی و بێتاقەتییەکی زۆر لە ڕووخســـــاری جوانی گەنجەکەدا دەرکەوت. ئەوەی ڕاســـتی بێت ڕووخسـارێکی فرە نازداری هەبوو و ئەندامی باریکەلە و لێکوەشـاوە،

---

١. قسڵ: ئاهەک؛ کلس؛ ماکێکی سپییە لە بەردی ئاهەک بەرهەم دێت.

٢. داربەند: چێوبەســت؛ دابەس؛ چەوتەک؛ تۆڕێک لە تیرەگەلی تەختەیی یان کانزایی بۆ کارکردن لە بیناگەلی بەرز و دەســـتپێڕانەگەیشـــتوو (وەک ســـەر دیوار یان نهۆمگەلی ســـەرووی وارخان) کە بە شـــێوەیەکی ســـتوونی و ئاســـۆیی پێکەوە دەبەسترێنەوە.

٣. ئێلاخ: خانووی هاوینە؛ هەوار یان ماڵ لە شوێنی فێنک و خۆشدا بۆ هاوینان.

بە چاوانێکی جوانی ڕەش و قژێکی خورمایی و بەژنێکی بەرزتر لە هی ئاساییەوە. وەلێ هێندەی پێنەچوو دەتگوت هەر بە تەواوی فکر و خەیاڵ بردوویەتییەوە، یان با ڕێکتر بڵێین، وەک ئەوە وابوو کە جۆرێک لە فەرامۆشی دایگرتبێت و هەر بە هەمان بارەوە درێژەی بە ڕێگەکەی دا. ئیدی چواردەوری خۆی نەدەبینی و هەر نەشیدەویست ببینێت. تەنیا جاروبار لەژێر لێوەوە شتێکی بە خۆی دەگوت کە ئەویش لەبەر ئەو فرەڕێسییە بوو کە لەم دواییانەدا خووی پێوە گرتبوو. لەم ساتەدا خۆیشی دەیزانی کە بیری شپرزەیە و گەلێکیش بێهێز بووە. دوو ڕۆژێک دەبوو کە شتێکی وای نەخواردبوو.

جلوبەرگەکەی هێندە شڕووڕ بوو کە هەر مرۆڤێکی ئاسایی شڕپۆشیش شەرمی دەهاتێ بە ڕۆژی ڕۆشن بەو سیپاڵانەوە بێتە دەر، وەلێ لە لایەکی دیکەوە ئەم شڕ و شێواوییە لە وەها گەڕەکێکدا شتێکی سەیر نەبوو. لە نزیک بازاری *سێنایا* و سۆزانیخانەکان و ئەو کۆمەڵەیەوە کە زۆربەی پیشەساز و کاسبکار بوون و لانەیان کوڵان و لاکۆڵانەکانی ناوەندی پیتەربورگ بوو، هەندێک جار وەها دیمەنێکی کەسبەکەس دەهاتە ئارا کە ئەگەر تووشی هەر جۆرە مرۆڤێکی خێلەڕەشیش[1] ببووبایت، بەلاتەوە سەیر نەبوو. بەس دەروونی گەنجەکە بە چەشنێک لێوڕێژ لە سووکایەتییەکی پڕکینە بوو کە وێڕای هەستیارییەکانی گەنجیی، بە هیچ شێوەیەک تەریق نەدەبووەوە کە بەو سیپاڵەوە بێتە سەر شەقام... هەڵبەتە تووشبوونی ناسیاو یان هاوڕێی دێرین جیاواز بوو، ئاخر بە هیچ شێوەیەک حەزی نەدەکرد چاوی بە ناسیاوێک بکەوێت. لەم بگرەوبەردەیەدا، بەدمەستێک بەتەنیشت گەنجەکەی ئێمەدا ڕەد بوو کە بەسەر گالیسکەیەکی گەورەوە بوو و ئەسپێکی چەلەنگ ڕایدەکێشا و هیچ دیار نەبوو کە

---

١. خێلەڕەشی؛ نەبوو؛ خەیاڵی؛ مرۆڤی سەیروسەمەرە و نائاسایی.

بۆچی و بەرەو کوێی دەبات؛ جا لە بارێکدا کە ئاماژەی بۆ ئەو دەکرد، قیڕاندی:

– هێی، کڵاوئەڵمانی![1]

گەنجەکە وشک بوو و بە تووڕەییەکی زۆرەوە چنگی بە کڵاوەکەیدا کرد. لەو کڵاوە درێژە باوانە بوو کە لەلایەن زیمێرمان[2]ـەوە دەدوورا، وەلێ تەواو پواو و کرچوکاڵ و پڕ لە پەڵە و کون... ئیدی لێوارێکی پێوە نەمابوو و لەبەر چرچولۆچیش بە سەریەوە ناشیرین دەوەستا. نەک هەستی تەریقبوونەوە، بەڵکە هەستی ترس گیانیی تەنییەوە و واقووڕ ورتاندی: *هەر دەمزانی! هەمان ئەو شتەی کە لێی دەترسام! خراپترین بەلا. ئەری، وەها شتێکی گەمژانە، خاڵێکی مێندە لابەلا، دەتوانێ تەواوی پلانی مرۆڤ تێک بدا! ئەری! ئەم کڵاوە زۆر سەرنج ڕادەکێشێ... ئەم سەروسەکوتەی من زیاتر کاسکێتی بۆ باشە، تەنانەت گەر لەو بێکەڵکانەی سەردەمی دەقیانووسیش بێ... نەک ئەم شتە گاڵتەجاڕ و ناشیرینە! باشە ئێستە کێ هەیە لەم کڵاوانە بکاتە سەری! لە دووریی فەرسەخێکەوە خۆی دەنوێنێ و سەرنج ڕادەکێشێ... جا لە هەمووی خراپتر ئەوەیە هەمووان لە یادیان دەمێنێ و بۆ خۆی دەبێتە بەڵگەیەک. لەم دۆخەدا، مرۆڤ دەبێ کارێ بکا کە تا دەکرێ سەرنج ڕانەکێشێ... وردەکاری... ئەری، خاڵی بچووک، هیچ*

---

١. لەو سەردەمەدا بەراورد بەو کەسانەی کە جلی فەرهەنگیی ڕووسییان دەپۆشی، ئەو کەسانەی کە بە شێوازی ئەورووپی خۆیان دەگۆڕی، پێیان دەگوترا «ئەڵمانی». ڕاسکۆلنیکۆڤیش بەو پێیەی کڵاو و جلی لە بەردا بوو، لەو گەڕەکە هەژارنشینەی... سەرنجی ڕادەکێشا و لەو سەردەمەشدا زیاتر وشەی ئەڵمانی، بە مانای بیانی بەکار دەهات. «و. ف»

٢. ناوی خاوەنی ئەو کارخانەی کڵاودوورینەی کە دوکانی کڵاوفرۆشییە بەناوبانگەی شەقامی نێفسکیی پیتەربورگ کە دۆستۆیفسکی لەوێ کڵاوەکەی سەندبوو. «و. ف»

***شـــتێ لەم وردەکارییە گرنگتر نییە! هەر ئەم وردەکارییەیە کە دایمە هەموو شتێ لەناو دەبا...***

ڕێگەیەکی ئەوەندە دووریش نەبوو، تەنانەت دەشـــیزانی لە ماڵی خۆیەوە تا ئەوێ چەند هەنگاوە: ڕێک حەوتسـەد و سـی شـەقاو، ئاخر جارێکیان کە تەواو داڵغەی ڕۆیشـتبوو، بە هەنگاو ژماردی. ئەو ڕۆژە هێشـتا ئەم فکر و خەیاڵانەی نەکەوتبوونە سـەر و تەنیا خەریک بوو تینوێتیی سـەیری خۆی بە بوێرییەکی نەحس دەوروروژاند. ئێسـتە بە تێپەڕبوونی مانگێک، بۆچوونی لەبارەی خەیاڵپلاوییەکەیەوە گۆڕابوو. بەو خۆدوێنییە دەروونییەی، کە لەڕێیەوە قەشـــمەریی بە لاوازی و گاڵتەجاڕیی خۆی دەکرد، ئیدی دەتگوت خۆنەخوازانە گەیشـــتبووە جێیەک کە خەیاڵاتە سـامناکەکەی بە ئەرکێکی ڕاسـتەقینە دەزانی، ئەمەش لە بارێکدا کە خۆی هێشـــتا باوەڕی پێی نەبوو. ئێسـتەش خەریک بوو دەڕۆیشت تا بەر لە هەر شتێک مەشق لەسەر ئەرکەکەی بکات و لەگەڵ هەڵگرتنی هەر شـەقاوێکیشـدا شـپرزەییەکەی زیاتر و بەتینتر دەبوو.

لەگەڵ لەرزەیەکی دەماری و بە جۆرێک وەک بڵێیت دڵی لە مشـتیدا بێت، گەیشـتە بەردەم بینایەکی ئێجگار گەورە کە لە لایەکەوە بەسـەر ئاوەڕۆیەکدا دەیڕوانی و لەولاشـەوە بە شـەقامەکەی کەنارییەوە دەنووسـا[1]. ئەم بینایە لە کۆمەڵە ژوورێکی بچووک پێک هاتبوو کە نیشـتەجێکانی بریتیبوون لە جۆرەها پیشـەوەر: هەر لە بەرگدوور و قوفڵساز و چێشتلێنەرەوە بیگرە تا ئەڵمانیی جۆراوجۆر و کچانی تەنیا و فەرمانبەرانی پلەنزم و تا دوایی. خەڵکی بەردەوام لە هەردوو دەرگە سەرەکییەکەوە ئامۆشۆیان بوو. بیناکە سێ‌چوار دەرگەوانی هەبوو و لاوەکە بەوە دڵخۆش بوو کە هیچ کامیانی نەدیوە و بەبێ

---

١. ئێستە ناوی ئاوەڕۆکە بۆ کەناڵی *گریبایێداف* و شـەقامەکەی کەناریش (شـەقامی *یێکاتیریناگۆف*) بۆ *ریمسکی-کورساکۆف* گۆڕدراوە. «و. ف»

سەرنجراکێشان لە دەرگەوە یەکڕاست بەرەو پلیکانەکانی دەستەڕاست بای دایەوە. پلیکانەکان تەســـک و تاریک بوون و بە پلیکانی لاوەکی دادەنران. پێشوەختە وردودرشتی هەموو شتێکی هەڵسەنگاندبوو و بە گشتی لە دۆخەکە ڕازی بوو، چونکە لەو تاریکییەدا تەنانەت لەبەردەم هەرەشــەی کونجکۆلترین نیگاکانیشــدا نەبوو. *باشــە هەر لە ئێستــەوە دەست و دڵم ئاوا دەلەرزێ، ئەی گەر بێتە سەر کارە سەرەکییەکە چی دەبێ؟* بە دەســـــتی خۆی نەبوو، بەدەم ڕێکردنەوە بەرەو نهۆمی چوارەم، لەم فکرەدا ڕۆ چووبوو. کە گەیشـــتە ئەوێ، چەند باربەرێکی کۆنەسەرباز کە خەریکی گواستنەوەی ناومالی یەکێک لە ئەپارتمانەکان بوون، ڕێگەکەیــان گرت. دەیزانی کە فەرمــانبەرێکی ئەڵمــانی لەگەل خێزانەکەیدا لەوێ دەژیا: *یانی ئاوا... کەواتە ئەڵمانییەکە وا دەڕوا؛ ئەمە مانای وایە جارێ تەنانەت بۆ ماوەیەکیش بێ لە نهۆمی چوارەم و ئەم باداکەدا*[1]*، تەنیا ئەم پیرەژنە هەیە. بۆ پارێزیش بێ، هەر شتێکی باشە...* دیســــــان کەمێک بیری کردەوە و زەنگی ئەپارتمانی پیرەژنەکەی لێدا. زەنگەکە زرنگەزرنگێکی بێگیانی کرد، وەک ئەوەی لە تەنەکە بێت نەک مس. زەنگی ئەپارتمانە بچووکەکانی ئەم جۆرە بینایانە کەم تا زۆر یەک جۆرە. زرنگەزرنگی ئەم زەنگەی بە تەواوی بیر چووبووەوە و دەتگوت دەنگە مردووەکەی کتوپڕ شــــتێکی بیر هێناوەتەوە و کتومت دیمەنێکی هێنایە بەرچاوی... مێشکی هێندە لاواز بووبوو کە بە دەنگی زەنگەکە ڕاچەنی. کەمێـک تێپەڕی و دەرگەکە هێنـدەی پلەپەنجەیەک کرایەوە. ژنە لە هەمـان درزی باریکەوە بە چاوانێکی بەدگومـانانەوە تەماشای میوانەکەی دەکرد و تەنیا چاوە وردەکانی دیار بوون کە لەو تـاریکییەدا دەدرەوشــــانەوە. ژنە کاتێک تەماشـــــای کرد باداکەکە کەسانێکی دیکەشی لێیە، زاتی دایە بەر خۆی و بە تەواوی دەرگەکەی کردەوە. گەنجەکە لە ئـاســـتـانەی دەرگەوە هەنگـاوی نـایە ژوورەوە

---

١. باداک: جێی سوڕانەوە و وچان لە دوای ڕیزێک پلەکان یا بەرزکەرەوە.

تاریکەکەوە، کە بە باریکەدیوارێک جیایان کردبووەوە و موبەقێکی بچووکیش لەپشتییەوە بوو. پیرەژن لەبەرانبەریدا بێدەنگ ڕاوەستابوو و کونجکۆلانە لێی دەڕوانی. قرچۆڵێکی[1] وردیلە و سیسەڵەی کەم تا زۆر شەست ساڵە بوو بە چاوانێکی ورد و دزێوەوە، لووتێکی گچکە و تیژی هەبوو و ڕۆن لە پرچە ناڕێک و سپییەکەی دەتکا و پارچە پۆپەشمینێکی شڕ بە دەوری ملە باریکەکەیدا (کە هەر دەتگوت پێی مریشکە)، پێچرابوو و لەو گەرما بەتینەدا چاکەتێکی چەرمیی بەسەر شانەوە بوو کە لە کۆنەییان زەرد دەچووەوە. پیرێژنەی وردیلە بە درێژایی ئەو ماوەیە هەر کۆکەکۆک و لرخەلرخی بوو. پێدەچوو گەنجەکە تەماشایەکی نائاسایی ئەوی کردبێت، چونکە هەمان بەدگومانیی سەرەتا کتوپڕ لە چاوانی ژنەداترووسکایەوە. گەنجەکە نیوەکڕنۆشێکی برد وەک ئەوەی تازە بیری هاتبێتەوە کە پێویستە بەڕێزانەتر هەڵسوکەوت بکات، جا گوتی:

– ڕاسکۆڵنیکۆفم، یارۆ خوێندکارەکە[2]. مانگێ لەمەوبەر هاتبوومە خزمەتتان...

پیرێژن فرە برگەبڕگە و ڕوون و بەبێ ئەوەی نیگای شپرزەی لەسەر ڕووخساری ئەو لابدات، وەڵامی دایەوە:

– بیرمە، کاکە گیان، باش بیرم ماوە کە هاتبوونە ئێرە.

بەدگومانیی قرچۆڵەکە ڕاسکۆڵنیکۆفی بڕێک نیگەران و سەرسام کرد:

– ئێ، ئەوەی ڕاستی بێ دیسان هاتووم... بۆ هەمان کار...

---

١. قرچۆڵ: دەڵەقۆر؛ پیرەبووک؛ زۆر پیر و ناشیرین (بۆ ژنان).

٢. خوێندکاری زانکۆ.

هەستێکی باشی نەبوو و لەبەرخۆوە بیری کردەوە: *ڕەنگە هەمیشە هەر وا بێ و مەسەلە ئەوە بێ کە من جاری پێشوو سەرنجم نەدابوو.*

پیرێژن چەند ساتێک، وەک ئەوەی ڕاڕا بێت، بێدەنگ بوو و پاشان چووە لاوە و ئاماژەی بۆ دەرگەی ژوورەکە کرد و مۆڵەتی دا میوانەکەی بچێتە ژوورەوە و گوتی:

– وەرە ژووریّ، کاکە گیان.

ژوورەکە بە کاغەزدیواریی زەرد داپۆشرابوو، پەردەگەلی موسیلین بە پەنجەرەکانەوە هەڵواسرابوون و بەردەمیشیان بە گوڵەشەمالی ڕازێندرابووەوە. خۆری دەمەوئێواران ڕۆشنایییەکی بەشەوقی لەو ژوورەدا پەخش کردبوو کە گەنجەکە هەنگاوی نایە ناویەوە. گەلێک خۆبەختانە شتێک وەک برووسکە بە زەینی ڕاسکۆڵنیکۆفدا ڕابرد: *یانی لەو کاتەشدا خۆرەتاو هەر وا دەدرەوشێتەوە!* بە خێرایی سەرنجێکی چواردەوریی دا و وردەکارییەکانی ژوورەکەی سپاردنە زەینی. دەیویست دواتر تا ئەو شوێنەی کە دەکرێت، بە وردی نەخشەکە هەڵبسەنگێنێت و بە باشی شوێنی کەلوپەل و کەشەکە بهێنێتەوە یاد. ئەوێ شتێکی تایبەتیشی لێ نەبوو. مۆبیلیاتی بێکەڵکی ژوورەکە، تەواو کۆنە و لە تەختەیەکی زەرد بوو: قەنەفەیەکی پانوپۆڕ کە پاڵپشتێکی فراوان و خواری هەبوو لەگەڵ مێزێکی شێوە هێلکەیی لە بەردەمیدا، مێزی تەوالێت و ئاوێنە لەنێوان پەنجەرەکاندا، چەند کورسییەکی پشتلەدیوار و دوو سێ وێنەی کچە ئەڵمانیانی باڵندەبەدەست؛ هەر ئەوەندە و بەس. لە سووچێکی ژوورەکەدا، چرایەکی پیسۆز[1] لەبەردەم کۆتەڵێکی بچووکدا دەسووتا. هەموو جێیەک پاکوخاوێن بوو. وەک ئەڵماس بریقەیان لە مۆبیلیات و زەوییەکە هەستاندبوو و گشت شوێنێک لە خاوێنیان دەدرەوشایەوە. گەنجەکە بیری کردەوە: *ئیشی*

---

١. چرای پیسۆز: سبێوس؛ دوبە؛ پیفسۆچ؛ چرایەک کە بە پیو کاری دەکرد.

*لیزاڤێتایە*. ئەپارتمانەکە تۆسقاڵێک تۆزی تێدا نەدەبیندرا. ڕاسکۆلنیکۆف هێشتا خەریکی لێکدانەوە بوو: *تەنیا ماڵی ئەم بێوەژنە پیرە نارەسەنانە ئاوا پاکوخاوێنە!* کونجکۆڵ و لەژێر چاوەوە تەماشـــایەکی ئەو پەردە کەتانەی کرد کە بە دەرگەی دووەمین ژووری بچووکی ئەپارتمانەکەوە هەڵواســـرابوو. تەختەخەوی پیرێژن و ڕەفە چەکمەجەدارەکەی لەوێ بوون، بەڵام گەنجەکە تەنانەت بۆ جارێکیش نەیتوانیبوو ســـەرێک بکێشـــێتە نێو ژوورەکەوە. هەموو ئەپارتمانەکە تەنیا ئەم دوو ژوورە بوون.

پیرێژنەکەش هـاتە نـاو ژوورەکە و وەک جـاری پێشـــوو ڕێک لەبەردەم ئەودا ڕاوەستا تا بتوانێت ڕاستەوڕاست بە دەموچاویدا واق ببێت و زۆر مرومۆنانە پرسیی:

– ئێستە کارتان چی بوو؟ فەرمایشتتان؟

– شتێکم هێناوە بۆ بارمتە، خاتوون!

گەنجەکە کاتژمێرێکی تەختی زیوینی کۆنەی لە گیرفانیدا دەرهێنا؛ بە پشـــــت کـاتژمێرەکەوە وێنەیەکی گۆی زەوی هەڵکۆڵرابوو و زنجیرەکەشی پۆڵایی بوو.

– وەلێ کاتی بارمتەکەی پێشتریشتان تێپەڕیوە. پێرێ سەری مانگ بوو!

– گەر تۆزێ لەسەرم ڕاوەستن سوودی مانگێکی تریشتان دەدەمێ!

– ئەوەیان ئیتر پەیوەندیی بە منەوە هەیە کاکە گیان، کە لەســەرتان ڕادەوەستم یان بارمتەکەتان بەڕێ کەم بڕوا.

– ئێستە بۆ ئەم کاتژمێرە چەند دەدەن، ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا؟

– ئێوە تەنیا شـتی وردەڵەم بۆ دەهێنن، کاکە گیان. بە من بێ دەڵێم بە بەلاشیش گرانە. جاری پێشـوو بۆ ئەنگوستیلەکەتان دوو ڕۆبڵم پێ

دان، ئەمە لە بارێکدا کە لای ئاڵتوونفرۆش دەتوانی دانەیەکی تازەی لەو جۆرە بە ڕۆبڵ و نیوێک بکڕی.

– ئێستە ئێوە چوار ڕۆبڵم بدەنێ. دواتر لە بارمتەیی دەری دەهێنم، ئاخر هی باوکم بووە. بەم زووانە پارەم دێتە دەست.

– ڕۆبڵ و نیوێک، کاکی بەڕێز. پێشـەکیش سـوودەکەی وەردەگرم. ئیتر کەیفی خۆتانە.

گەنجەکە سەرسامانە هاواری کرد:

– ڕۆبڵ و نیوێک!

– کەیفی خۆتانە!

پیرێژن ئەمەی گوت و کاتژمێرەکەی بۆ درێژ کرد.

گەنجەکە کاتژمێرەکەی وەرگرت. هێندە توورە بوو کە دەیویسـت جێی بهێڵێ و بڕوا، بەس دەمودەسـت، دۆخەکەی هەڵسـەنگاند و پاشگەز بووەوە. بیری هاتەوە کە شوێنێکی دیکەی نییە بۆی بچێت و، بێ لەوەش، ئەو لەبەر هۆکـارێکی دیکە هـاتووە بۆ ئێرە. زۆر بە توورەیی گوتی:

– باشە، بمدەنێ!

پیرێژن گیرفانیی پشـکنی تا کلیلەکانی بدۆزێتەوە و چووە ژووری پشـتی پەردەکە. گەنجەکە لە ناوەڕاسـتی ژوورەکەی دیکەدا بە تەنیا مایەوە و کونجکۆڵانە گوێی هەڵخسـت تا بزانێت لەودیو پەردەکەوە چی بە چییە. بیسـتی کە پیرێژن یەک بە یەک چەکمەجەکـانی دەکردنەوە، جا لەبەرخۆیەوە ئەنجامگیریی کرد: *دەبێ چەکمەجەکەی سـەرەوە بێ. هـا، یـانی ئـاوا... کەواتە کلیلەکـانی دەخـاتە گیرفـانی ڕاستییەوە... کلیلەکانی لە ئەڵقەیەکی ئاسنیندا کردوونەتە دەستەیەک...*

*کلیلێکی تریش هەیە، گەورەترینیان، سێ هێندەی ئەوانی تر گەورەترە و ددانداریشـــە، هەر زۆر باشـــە، ڕێی تێناچێ هی چەکمەجەکان بێ... بێگومان ســندووقچەیەک، جانتایەک شــتێ لەئارادایە... ســەیرە، زۆر نامۆیە. تەنیا جانتا ســـندووقییەکان لەو کلیلانە یان هەیە... ئای لەو چەپەڵی و سووکییە!*

پیرێژن گەڕایەوە.

– فەرموون کاکە گیان: گەر لە مانگێکدا بۆ هەر ڕۆبڵێ دە کۆپیک ســـوود لابدەین، ئەوا قەرزی ئەم مانگەتان بۆ ڕۆبڵ و نیوێک دەبێتە پازدە کۆپیک. بیســت کۆپیکیش بۆ ئەو دوو ڕۆبڵەی پێشــتر قەرزارن، هەمووی دەکاتە ســـیوپێنج کۆپیک. کەواتە دەبێت بۆ کاتژمێرەکەتان ڕۆبڵێک و پازدە کۆپیکتان بدەمێ. فەرموون، بیگرن، کاکە گیان.

– چی! یانی بووە ڕۆبڵێک و پازدە کۆپیک!

– کتومت، کاکە.

گەنجەکە ئیدی لەســـەری نەڕۆیشـــت و پارەکەی وەرگرت. هەر تەماشــای پیرێژنەکەی دەکرد و نیازی ڕۆیشــتنی نەبوو، وەک ئەوەی کە هێشــتا قســـەیەکی مابێت یان شــتێکی لەژێر ســـەردا بێت، بەس خۆیشی دوودڵ بوو...

– ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا، لەوانەیە... لەوانەیە هەر لەم ڕۆژانەدا شـــتێکی تریشــتان بۆ بێنم... زیوییە... زۆر جوانە... قتووە جگەرەیەکە... هەر کە لە هاوڕێکەمم وەرگرتەوە، دەیهێنم...

گەنجەکە شێوا و بێدەنگ بوو.

– کەواتە با ئەوکات قسەی لەسەر دەکەین کاکە گیان.

گەنجەکە بەرەو دەرگەی ئەپارتمانەکە دەڕۆیشـــت، هەوڵی دا فرە ئاسایی و سرووشتی بپرسێت:

– باشە، ماڵئاوا، خاتوون... ئێستە بە تەنیان، ئەری؟ خوشکتان لێرە نییە؟

– کارتان بە خوشکم چییە، کاکە گیان؟

– هیچ، چ کارێک؟ هەر وا پرســــیم. دەی ئیتر... خوا ئاگادارتان... ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا!

راســــکۆڵنیکۆف تێفکر و ســــەرقاڵ چووە دەرەوە و تا دەهات دڵەڕاوکێ و تیامانی زیاتر دەبوو. لە کاتی داگەڕان بە پلیکانەکەدا، چەند جارێک ڕاوەســتا، وەک ئەوەی کتوپڕ شــتێکی بە زەیندا هاتبێت. کە هەنگاوی نایە ســەر شــەقامەکە، دەســتی پێ کرد: *ئۆو، خوایە! ئای لەو کارە چەپەڵە! یانی دەکرێ... ئاخر دەکرێ من...* پاشــــان بە جەختلەسەرکردنەوە بۆی زیاد کرد: *نە بابە، نا! ئێ ئەوە بێمانایە، ئای لەو گەمژەییە، ئای لەو پڕوپووچییە! ئاخر ئەم مۆتەکە تۆقێنەرە چۆن کەوتە سەری منەوە؟ یانی دڵم ئەوەندە ڕەش و چەپەڵە؟ بێ لە ڕەشی و چەپەڵی و پیســــیش، ئەوە گوناحە! ئای لەو کارە چەپەڵە! ئەی نارەسەن!... مانگێکی ڕەبەقی پێچوو کە من...*

وەلێ هیچ قسە یان هاوار و سەرکۆنەکردنێک نەبوو کە بتوانێت لە ڕێیەوە قووڵایی پەشێوحاڵیی خۆی پێ دەرببڕێت. ئەو هەستی بێزارییە بێڕادەیەی کە لە ڕێگەی ماڵی پیرێژنەکەدا چنگی خســتبووە دڵییەوە و دایهێزراندبوو، ئێســتە ئیدی بە چەشــنێک هەموو گیانیی تەنیبووەوە و خۆی پێ دەنواند کە گەنجەکە نەیدەزانی لەتاو ئەشکەنجەکەیدا هانا بۆ کوێ ببات. وەک ســــەرخۆش بە پیادەڕێدا هەنگاوی دەنا، دەتگوت ڕێبواران نابینێت و خۆی پێیاندا دەکێشا. هێشتا بە تەواوی هەست و هۆشی نەهاتبووەوە سەر خۆی کە گەیشتە شەقامی دواتر. سەیرێکی دەوروبەریی کرد و زانیی لەبەردەم مەیخانەیەکدا ڕاوەســــتاوە کە پلیکانەیەک لە دەرگەی ســەر پیادەڕێکەیەوە بەرەو ژێرزەمین دەچووە

خواری. هاوکات دوو سەرخۆش بەدەم تانەوتەشەرلێدان لە یەکدییەوە هاتنە دەرێ، وەلێ وریای یەکدی بوون تا تەکەتەک هاتنە سەر شەقامەکە. ڕاسکۆلنیکۆف خنەخنی نەکرد و دەستبەجێ چووە خوارێ. تا ئەو کاتە دووپێی نەچووبووە هیچ مەیخانەیەکەوە، وەلێ سەری دەسووڕا و تینوێتییەکی سووتێنەریش ئەشکەنجەی دەدا. تاسەداری بیرەیەکی سارد بوو و داهێزراوی و لەرزینەکەی ئەم دواییانەشی خستە ئەستۆی برسییەتی. لە سووچێکی تاریک و پیسی مەیخانەکەدا، لەپشت مێزێکی گچکەی لینجەوە دانیشت و داوای بیرەی کرد. کە بە تامەزرۆییەوە یەکەمین پەرداخی هەڵقوڕاند، دەمودەست هەستی بە ئارامی کرد و فکری ڕۆشن بووەوە و هیوادارانە گوتی: *هەمووی قسەی قۆڕ بوو! باری جەستەییم تێک چووە! تەماشا ئەم یەک پەرداخە بیرە و چەند پارووە سووخارییە*[1] *چی دەکا! یەک چرکەشی پێناچێ کە زەین بەهێزتر دەبێ، بیری مرۆڤ ڕۆشن دەبێتەوە و ویستیش دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی! ئەی هاوار! هەمووی قسەی بێسەروبەر بوو!* وێڕای ئەم پرتەوبۆڵە سووکایەتیئامێزانە، کەیفساز دەردەکەوت. وەک ئەوەی لە داگرتنی بارێکی سامناکی سەر شانیدا سەرکەوتوو بووبێت و جا چەند سەرنجێکی هاوڕێیانەی گرتە موشتەریانی مەیخانەکە. وەلێ تەنانەت لەم بارە باشەشدا دڵی هەواڵی دابوو کە سەرخۆشی و گەشبینییەکەی هێندە ئاسایی نییە و تەنانەت نەخۆشانەشە.

مەیخانەکە لەو کاتەدا چەند کەسێک زیاتری تێدا نەبوو. بەدوای ئەو دوو سەرخۆشەدا کە لە بەردەرگەدا تووشیان بووبوو، پێنجشەش کەس بە ئاکاردیئۆنێکەوە پێکڕا چوونە دەرێ کە سۆزانییەکیشیان لەگەڵدا بوو. بە ڕۆیشتنی ئەو دەستەیە، مەیخانەکەش هێمن و چۆڵ بوو. تەنیا پیاوێک بە پەرداخە بیرەکەی بەردەمییەوە مایەوە کە

---

[1] سووخاری: وشەکە ڕووسییە، بە واتای نانی چەندلەتکراو و برژاو. «و. ک»

پێدەچوو کاسبکار بێت و هێندەش سەرخۆش نەبوو و لەگەڵ هاوڕێ سەرخۆش و خەپە و کەتەکەیدا کە ڕیشێکی خۆڵەمێشیی هەبوو و کۆتێکی کەمەرتەسکی لە بەردا بوو. وەلێ هاوڕێ خەپەکەی تەواو سەرخۆش بوو، لەسەر نیمکۆتەکە وەنەوزی دەدا و جاروبار وەک ئەوەی نیوەهایی[1] بێت، دەکەوتە چەقەنەلێدان و باسکەکانیی دەکردنەوە و بێ ئەوەی لەسەر نیمکۆتەکە هەستێتەوە، سەر و سنگی دەلەراندنەوە و لەژێر لێوەوە ویزەویزێکی دەکرد و بە زۆریش دەقی گۆرانییەکەی دەهاتە یاد کە پێدەچوو وەها شتێک بێت:

یەک ساڵی ڕەبەق / ئەو / ژنەکەیی دەلاواندەوە

یەک ساڵی ڕەبەق / ئەو / نازی ئەوی دەکێشا...

یان کتوپڕ سەرخەوەکەی دەشکا و دەیگوت:

بە ڕێگەی پودیچێسکدا / کە ڕادەبورد ڕۆژێکیان

ماشوقە دێرینەکەیی بینی / هەمدیس دڵی داخورپا...[2]

وەلێ هیچ کەسێک نەدەبووە هاوبەشی ئەو کەیفسازییەی کە لە خواردنەوەکەیەوە سەرچاوەی گرتبوو و هاوڕێ بێدەنگەکەشی، بە قین و بەدگومانییەوە تەماشای هەڵچوونی هەستی هاوپیاڵەکەی دەکرد. یەکێکی دیکەش لەوێ بوو کە بە ڕووواڵەتیدا پێدەچوو کارمەندێکی خانەنشینکراو بێت. جیا لەوانی دیکە و بە بارێکی تایبەتەوە لە بەرانبەر پێکەکەیدا دانیشتبوو و جارناجارێکیش قومێکی هەڵدەدا و تەماشایەکی چواردەوریی دەکرد. وا دیار بوو ئەویش پەشێوحاڵە.

---

١. هایی: بێدار؛ بەئاگا؛ ڕابوو. نیوەهایی؛ نیوەبێدار...

٢. چەند دێڕێکی گۆڕراوی شیعرێکی *ڤۆدوبیێل پ. ئەی. گریگۆرییێف* (١٨٧١–١٨٠٦) کۆمیدیی ناوداری ئەو سەردەمە. «و. ف»

## دوو

ڕاســـکۆلنیکۆڤ کەســـێکی کۆمەڵایەتی نەبوو، بەتـایبەت لەم دواییانەشـــدا خۆی لە هەر کەســـێک بەدوور دەگرت. بەڵام ئێســـتە هەسـتێک خەریک بوو ئەوی بەرەو مرۆڤەکان دەکشـاند. لە دەروونیدا شـتێک دەکەوتە ســـەر پێ کە نوێ بوو و ئەوی تینووی تێکەڵیکردنی خەڵکی دەکرد. مانگێکی ڕەبەقی لە پەشـێویی بەردەوام و هەڵچوونێکی خەمناکدا بەسەر بردبوو و ئێستە ئیدی بە چەشنێک بێزار بووبوو کە دەیویسـت بۆ سـاتێکیش بێت، لە دونیایەکی بەدەر لە دونیاکەی خۆیدا هەوایەک بگۆڕێت، گرنگیش نەبوو چۆن و لە کوێ بێت. لەبەر ئەوە بوو کە سەرەڕای ئەو پۆخڵییەی کە لە چواردەوردا دەباری، بەوپەڕی قاییلبوونەوە لە مەیخانەکەدا دانیشت.

خـاوەنی مەیخـانەکە خۆی لە ژوورێکی ســـەرەوەدا بوو، بەس هەیتاهەیتا دەهات و ســـەرێکی لە ســـاڵۆنە ســـەرەکییەکە دەدا. لە پلیکانێکەوە دەهاتە خوار کە دیار نەبوو ئەوســـەری کوێیە، ســـەرەتاش پووتە کەشـــخە ڕەشـــەکانی بە لێوارە پانوپۆڕە ســـوورەکەیانەوە دەردەکەوتن. کۆتێکی درێژی لە بەردا بوو، هێلەکێکی ســـاتنی[1] ڕەش کە لە بەرچاوی هەر کەسێکدا چڵکن دەردەکەوت، بۆینباخی نەبەستبوو و دەموچاویشـی ڕێک دەتگوت قوفڵێکی ئاسـنینی چەورکراوە. لەپشـت پێشـخوانەکەوە تازەلاوێکی چوارده ساڵە دانیشـتبوو و کوڕێژگەیەکی کەمتەمەنتریشی لێ بوو کە ئەگەر موشتەرییەکان شتێکیان بویستبا،

---

١. Satin: جۆرە ماددەیەکە قوماشی لێ دروست دەکرێت، بە گشتی درەوشـاوەیی و سافی بە ڕووی قوماشەکە دەبەخشێت و پشتەوەشی تاریک دەکات.

ئەو بۆی دەبردن. خەیارشـــۆری ئەڵقەکراو و نانی ڕەشـــی وشـــک و پارچە ماســـیشـــی لێ بوو کە هەرســـێکیان بۆگەنیان لێوە هەڵدەســـتا. کەشـی سـاڵۆنەکە هێندە قورس و گەرم بوو کە دانیشـتن لێی ئاسـتەم دیار بوو و هەوا بە چەشـــنێک بە بۆنی شـــەراب تەنرابوو کە هەر ئەوەندە بەس بوو پێنج خولەکێک لەوێ هەناســـە بدەیت تا بەدمەســـت ببیت.

هەندێک جار تووشـــــی غەریبەیەک دەبین کە لە ژیانماندا یەکەمین جارە دەیبینین، وەلێ هەر لە یەکەمین بینیندا ســـەرنجمان ڕادەکێشـێت و بەرەو خۆیمان کێش دەکات، جا ئەوەش بێ پێشەکی و بە شێوەیەکی کتوپڕانە، تەنـانەت بەر لەوەی هیچ کـامـمـان قســـەیەک بکەین. ئەو موشـتەرییەی کە دوور لەوانی دیکەوە بە تەنیا دانیشـتبوو و پێدەچوو فەرمانبەری خانەنشینی دەوڵەت بێت، کتومت هەمان کاریگەریی خستە سەر ڕاسکۆڵنیکۆفی ئێمە.

گەنجەکە دواتر بەردەوام ئەم بەرکەوتنە و کاریگەرییە سەرەتاییەی بیر دەهاتەوە و تەنانەت بە جۆرێک لە پێشـــئاگایی دادەنا. ڕاســـت تەماشـــای نێوچاوانی کابرای با بڵێین فەرمانبەری دەکرد. هەڵبەتە ئەویش چـاوی لە گەنجەکە لا نەدەدا و بە تەواوی دیـار بوو کە لە خوای دەوێ ســـەری قســـە بکرێتەوە. فەرمانبەرەکە لە موشـــتەریانی دیکە و تەنانەت خودی خاوەنمەیخانەکەشی دەڕوانی، وەلێ ئەمە تەنیا لە خووێکەوە ســـەرچـاوەی دەگرت و تەنـانەت ئـاوێتەی جۆرێـک وەڕەزیش بوو. هاوکات جۆرێک لە خەمســـاردی و بەکەمزانینیش لەو نیگایانەدا شـــەپۆلانی بوو کە دەیگرتنە ئەوان، دەتگوت تەماشـــای کەســـانێک دەکات کە نە هاوشـــانی ئەون و نە شـــیاوی دوواندن. ژیرەپیاوێک بوو کە پەنجا ســـاڵی تێپەڕاندبوو، چوارشـــانەیەک بە بالایەکی مامناوەندییەوە. قژی تاڵگەلی ســـپیی تێ کەوتبوو و بەشـێکی زۆری ســـــەریشـــــی تاس بوو. ڕووخســـــاری، بێ لە زەرد، تەنانەت

سەوزیش دەچووەوە و، هێندەی ئارەق خواردبووەوە کە پفی کردبوو. چاوانی بچووکی خوێنتێزاوی لەنێو ئەو پێڵووە ئاوسـاوانەیەوە دەترووسـکانەوە، وەلێ نیگایەکی زیتەڵانە و بەجۆشـی هەبوو. بەڵام شتێکی لەمانەش سـەیرتر لە پیاوەکەدا هەبوو و جۆرێک لە شـەیدایی نیوەئاگایانە کە دەتگوت ڕووناکی دەبەخشـێتە چاوانی. پێدەچوو لە قووڵایی نیگایدا دانایی و ژیریش هەبن، وەلێ بە دڵنیاییەوە بریقەی شـێتیشـیان تێدا بوو. فراکە[1] ڕەشـە کۆنەکەی، سـیپاڵێکی بێقۆپچە بوو کە هەڵبەتە هێشـتا یەکێک لە قوپچەکانی وەفای بۆ کۆتەکە مابوو و کارمەندەکەش هەمان ئەو دانەیەی هەڵدەپێکا، وەک ئەوەی بیەوێت تا دەکرێت، ڕەچاوی ڕێز بکات. لەژێر هێلەکە دەزوویییەکەیەوە، بەرۆکە پیس‌وچڵکن و پرلەکەکەی هاتبووە دەرێ. بە شـێوازی فەرمانبەران ڕیشـی تاشـیبوو، وەلێ خوا دەیزانی کەی، ئاخر تەنکەڕیشـە پرەکەی سێبەری دەخستە سەر دەموچاوی. لە ڕاستیدا هەڵسوکەوت و ویقاری لە هی فەرمانبەران دەچوو، بەس درێدۆنگ بوو و جاروبار دەسـتی بە قژیدا دەکرد و هەندێک جاریش لەتاو پەشێوی سەری دەخستە نێوان دەسـتەکانییەوە و، ئەنیشـکەکانیشـی کە لە سـەرقوڵە دڕاوەکانییەوە هاتبوونە دەرێ، دەخسـتنە سـەر مێزە پیس و لینجەکە. دواجار ڕێک چاوی برییە چاوی ڕاسکۆلنیکۆف و بەرز و بەهێز گوتی:

– کاکی گەورە، بێڕێزی نەبێ دەکرێ بە دوو قسەی ماقووڵ کاتتان بگرم؟ هەڵبەتە ڕەنگە ڕووخسـارتان وا نەنوێنێ، بەس ئێ، ئەزموونم پێم دەڵێ کەسـێکی خوێندەوارن و ئالوودەی خواردنەوەش نین. من هەمیشـە ڕێز بۆ زانسـتێک دادەنێم کە ئـاوێتەی میهرەبـانی و چـاکەخوازی بێ و، هەڵبەتە، خۆشـم فەرمـانبەرێکی پلەدارم. من،

---

[1]. فراک: جۆرێک لە کۆتی ڕەش و شـۆڕی پیاوانە کە لە وڵاتانی خۆرئاوایی لە ڕێوڕەسمی فەرمیدا لە بەری دەکەن.

*مارمیلادۆڤی* بچووکتانم، ناوی بنەماڵەیی منە. ببوورن، جەنابی پایەبەرزیشتان فەرمانبەری دەوڵەتن؟

– نەخێر، خەریکی خوێندنم...

گەنجەکە هەم بە زمانی شکۆداری دوێنەرەکە حەپەسابوو و هەم بەوەی کە فەرمانبەرەکە بێ پێشەکی دابوویە بەر قسە. ڕاستە کە هەر چەند خولەکێک پێشتر خۆی ئارەزووی هاودەمیی خەڵکی دەکرد، وەلێ هەر لەگەڵ بیستنی یەکەمین قسەی ڕوولەخۆی، کتوپڕ هەمان هەستی ناخۆش و ئازاردەری دوورەپەرێزی یەخەی گرتەوە: دوورەپەرێزی لە هەر ئادەمزادێک کە لێی نزیک دەبووەوە یان تەنانەت نیازی بوو لێی نزیک بێتەوە.

فەرمانبەر بە دەنگێکی بەرزترەوە گوتی:

– یانی ئاوها... خوێندکار... یانی کە هەرچۆنێ بووە پێشتر خوێندکار بوونە! هەر دەمزانی! ئەزموونە ئیتر، کاکی بەڕێز... ئەزموونی تەمەنێک!

وەک ئاماژەیەک بۆ ستایش و لەخۆڕازیبوون، پەنجەی خستە سەر تەوێڵی و لەسەری ڕۆیشت:

– خوێندکار بوونە، یان بە جۆرێک لە جۆرەکان گیرۆدەی خوێندن! مۆڵەت بدەن...

کابرا بە زۆر هەستایەوە، بەدەم لەتردانەوە، گۆزە و پێکی ئارەقەکەی هەڵگرت و لە دووریی برە مەودایەک و لە نزیک گەنجەکەوە دانیشت. وێڕای سەرخۆشیی گەلێک ڕەوان و ڕوون دەدوا، تەنیا جاروبارێک سەری دەسووڕا و ئاوازەکەی درێژ دەبووەوە. بە تامەزرۆییەکی تایبەتەوە ڕاسکۆڵنیکۆفی دابووە بەر قسە، وەک ئەوەی

خراپتر لە گەنجەکە، بە درێژایی مانگێکی ڕەبەق قســـەی لەگەڵ هیچ ئادەمزادێکدا نەکردبێت. بە دەنگێکی نمایشکارانەوە کەوتە دوان:

– دەزانن، کاکی مەزن! کەمدەســتی عەیبوعار نییە، ئەوە ڕاســتییە. خۆ دەشزانن کە هەمیشەمەستیش هێژایی نییە، ئەوەشیان کتومت هەر ڕاســتییەکە. وەلێ ســـووکوچرووکی، کاکی مەزن، ســـووکوچرووکی گوناهە، قوربان. گەر دەســـــتکورت بی، ڕەنگە بتوانی حورمەتی خۆت بپارێزی، بەس کە سووک بووی، ئاستەمە. تەنانەت بە داریش مرۆڤی ســووک و کەم تار نانێن، بەڵکە وەک خاشــاک بە گســک لەنێو گرۆی مرۆڤەکاندا دەیخەنە لاوە، بۆ ئەوەی ســـووکوچرووککردنی بگەیەننە ئەوپەڕی خۆی. هەقی خۆشـــیانە! کە ســـەرشـــۆڕ بووی، تۆ یەکەمین کەســـێکیت کە ســـووکایەتی بە خۆت دەکەی! ئارەقخواردنەوەش هەر لەوێوە دەست پێدەکا! کاکی پایەبەرز، هەر ئەم مانگی ڕابردووە بەڕێز *لیبزیاتنیکوف* دەســـتی لە ژنەکەم بەرز کردەوە و، ئێ، خۆ خانمەکەم وەک من نییە! مەســەلەکە جیاوازە! خۆ لە مەبەســتم تێدەگەن، قوربان؟ ئێســتە مۆڵەت بدەن لە کونجکۆڵیان تەنیا لێتان بپرســم ئایا تا ئێســتە هەڵکەوتووە لەســـەر ڕووباری *نێڤا* ڕۆژ بکەنەوە؟ بۆ نموونە لەســـەر ئەو بەلەمانەی کە کا دەگوازنەوە؟[1]

– نا، هەڵنەکەوتووە. بۆچی؟

– ئێ، بەڕێز! من ئێستە ڕێک لەوێوە هاتووم. ئەوە شەوی پێنجەمە کە... پێنج شەو دەبێ کە لەوێ دەنووم...

پێکەکەی پڕ کرد، هەڵی دا و داڵغە بردییەوە. گەر جوان لێی ورد ببووبایەتەوە دەتبینی کە پەڕە کا بە جلوبەرگەکەیەوە نووســـــاوە و تەنانەت بەنێو قژەکانیشـــیدا چووە. بە ئەگەرێکی نزیکیش، بە درێژایی

---

١. شـــوێنێکی دیاری پەترسبورگ کە ســـالانی شـــەســـتی ســـەدەی نۆزدەهەم شـــوێنی ڕۆژکردنەوەی هەژار و وەیلانان بوو. «و. ف»

پێنج ڕۆژ نە خۆی شۆردووە و نە جلی گۆڕیوە. بەتایبەت دەستەکانی گەلێک پیس بوون و چڵک ژێر نینۆکەکانیی گرتبوو. گەرچی ئەوانی دی بە ڕووالەت مەیلێکیان نیشان نەدەدا، لەگەڵ ئەوەشدا وا دیار بوو قسەکانی سەرنجیانی ڕاکێشاوە. دوو کوڕیژگەکەی پشت پێشخوانەکە، خەریک بوون حلیکەحیلک پێدەکەنین. خاوەنمەیخانەکەش وا دیار بوو بەو نیازەوە هاتووەتە خوارێ تا قسەکانی ئەم پیاوە خۆشسەیرە ببیستێت و جا تۆزێک لە دوورترەوە دانیشێت. خۆی گرتبوو و جاروباریش بێتاقەتانە و بە شکۆیەکەوە باوێشکی دەدا. دیار بوو کە ئەویٚ پەناگەی مارمیلادۆڤە، دەمێکە دەیناسن و ئەم حەزە سەیرەشی بۆ قسەی زل و دوانی فەرمی، بەرئەنجامی خووگرتنیەتی بە فەرمایشاتی دوای خواردنەوەوە لەگەڵ غەریبە جۆراوجۆرەکاندا. ئەم خووە بۆ هەندێک لە مەیخۆران شتێکی ئێجگار پێویستە، بەتایبەت بۆ ئەوانەی کە لە ماڵەوەدا هەڵسوکەوتی خراپیان لەگەڵ دەکرێت و هەمیشە بەسەریاندا دەخوڕن. هەر لەبەر ئەوەشە کاتێک لە کۆڕی ئارەقخۆراندا دادەنیشن، دایمە گەلێک تامەزرۆن تا پاکانە بۆ دۆخی خۆیان بکەن و پشتگیری، یان ئەگەریش کرا، ڕێزی ئەوانی دی بەدەست بهێنن.

خاوەنمەیخانە بە دەنگێکی بەرز گوتی:

– ئاخر هەی لۆتی! تۆ بۆچی ئیش ناکەی؟ چ جۆرە فەرمانبەرێکی کە ئێستە لە دەوام نیی؟

– بۆ لە دەوام نیم، کاکی ئازیز؟

مارمیلادۆڤ سەری قسەی گرتە دەست و بەتایبەت ڕووی کردە ڕاسکۆڵنیکۆڤ، وەک ئەوەی لەبری خاوەنمەیخانەکە ڕاسکۆڵنیکۆڤ پرسیاری لێ کردبێت:

– بۆ ئیش ناکەم؟ وا دەزانن دڵم بەوە نائێشــێ کە ئاوا خۆم ســـووکوچرووک دەکەم؟ وا دەزانن ئازارم نەچەشـــت کە مانگێ لەمەوبەر بەڕێز لیبیزیاتنیکۆف – بە دەســکی شــکاوی– کە ژنەکەمی شــین و مۆر کردەوە و منی ســـەرخۆشــیش لە لایەکەوە کەوتبووم؟ ئادەی کاکی لاو، پێش هاتووە کە... ئمممم... پێش هاتووە کە بەبێ هیچ هیوایەک داوای قەرز لە کەسێ بکەی؟

– پێش هاتووە... وەلێ مەبەستتان چییە لە بەبێ هیچ هیوایەک؟...

– یانی لەوپەڕی بێهیواییدا، قوربان. یانی پێشـــوەختە بزانن کە کارەکەتان بێبەرهەمە و هیچتان دەســـت ناکەوێ. بۆ نموونە بزانن و ئەرخەیان بن کە ئەم بەڕێزە، ئەم هاوشارییە نموونەیی و خێرۆمەندە، گەر ئاســـمانیش لە زەوی بدا پارەتان ناداتێ... جا پیاو هەق بڵێ بۆ دەبێ بیـدا؟ ئەو بـاش دەزانێ کە من قەرزکوێرم! یـانی دڵی پێم بســـووتێ؟ وەلێ هەر ئەم بەڕێز لیبیزیاتنیکۆفە پێشـــکەوتنخوازەی خۆمـان کە لایەنگری بیرە نوێکانە[1]، هەر ماوەیەک لەمەوبەر دەیگوت کە زانســـــت لە ســـــەردەمی ئێمەدا بەزەیی قەدەغە کردووە و ئینگلیزســـــتانێک کە لەســـــەر بنەمای ئابووریی ڕامیاری[2] ڕێ دەکات، دەمێکە ئەم مەسـەلەیەی تێدا چەسپاوە. دەی، قسـەی منیش ئەمەیە کە باشـــە بۆچی دەبێ ئەم پیاوە قەرز بداتە من؟ تۆ ســـەرەڕای ئەوەی

---

١. دۆســتۆیفســکی لە دەســتنووســەکانیدا مانای ناوی بنەماڵەیی لیبیزیاتنیکۆفی بە لێکەوتەی چاوکێکی ڕووســـی زانیوە کە دەشـــێت مانا نزیکەکەی زمانلووس و ماســـتاوچی بێت. کتومت وەها کەســـایەتییەک لە کورتەچیرۆکی بوبوک‌دا (١٨٧٣) بەرچاو دەکەوێت. «و. ف»

٢. *ئالێکســـاندەر گێرتســـێن* لە *نامەگەلێک لە فەرەنســـا و ئیتالیا*دا ئاماژە دەکات، کە ئابووریی ڕامیاری، وەک مەکینەگەلێکی ئۆرگانیک تەماشـــای خەڵکی دەکات و چۆن کارخانەیەکیش لە کۆمەڵگە دەڕوانێت. دۆســـتۆیفســـکی ســـەرەڕای هاوڕایی لەگەڵ بۆچوونەکەی ئەودا، نموونەی کاریکاتێریی ئەوان لە کۆمەڵگەی ڕووســـیادا دەداتە بەر ڕەخنە. «و. ف»

دەزانی کابرا یەک پەنابایش[1] ناخاتە مشـــتەوە کەچی خۆت گورج دەکەیەوە و دەچی بۆ لای و...

ڕاسکۆڵنیکۆف قسەی پێ بڕی:

– مادام وایە بۆ دەبێ بچی بۆ لای؟

– ئاخر کاتێ کە کەسێکت نییە و شوێنێ نییە هانای بۆ بەری، ئیتر ناچار دەبی! خۆ دواجار هەر دەبێ مرۆڤ شـــوێنێکی هەبێ کە ڕووی لێ بنێ وایە؟ هەندێ هەلومەرج دێنە پێش کە ئێوە چارەیەکتان نییە و ئەوسا بێگومان هەر دەبێ سەر بە شوێنێکدا بکەن! کە کچە تاقانەکەم بۆ یەکەمین جار بە مۆڵەتنامە زەردەکەیەوە[2] هەنگاوی نایە دەرێ، من بۆچی نەدەبوو بچم... دەزانن، کچەکەم بە مۆڵەتنامەی زەرد نان پەیدا دەکا، قوربان...

مارمیلادۆڤ لە کاتی کردنی ئەم قسانەی کۆتاییدا، بە ئازارێکی فرە کارییەوە تەماشایەکی گەنجەکەی کرد و کاتێکیش ئەو دوو کوڕیژگەیە لەپشـــت پێشـــخوانەکەوە حیلکاندیان و خاوەنمەیخانەکە تیزخەندێکی کرد، دەمودەست بە ڕووخسـارێکی بە ڕوواڵەت هێورەوە درێژەی پێ دا:

– گوێی مەدەنێ، بەڕێز گیـان، قەینـاکـا! خۆتـان بێتـاقەت مەکەن، قوربان! سـەربادانی ئەمانە نارەحەتم ناکا؛ لێرە گشـتیان هەموو شـتێ دەزانن و پەردە لەسەر هەموو شتێ هەڵماڵراوە![3] ئیتر بەم دۆخە زویر

---

٣. پەنابا: شایی؛ پارەی ئێجگار کەمبەها.

١. پێدەچێ ئاماژە بێت بە مۆڵەتنامەیەک کە درابێتە ئەو ئافرەتانەی کاری لەشفرۆشی دەکەن. «و. ک»

٢. ئاماژەیە بە *ئینجیلی مەتا*، پاژی ١٠، ئایەتی ٢٦: *وەیل لەوانەی کە هەڕەشـەتان لێ دەکەن، سـڵ مەکەن؛ چون ئەو سـاتە دەگات کە هەر حەقیقەتێک ئاشـکرا ببێت.* «و. ف»

نابم، هەر ئەوەندە هەیە کە ئیتر دڵم شـــکاوە! با وابێ، هەر وا بووە! دەڵێن *تەمـاشــــای، ئەمە خۆیەتی!*[1] ببوورن، کاکە گیان، وەلێ ئێوە دەتوانن... یـان نـا، لێگەڕێن بـاســـەکەتـان بۆ بکەمەوە و مووبەموو مەبەستی خۆمتان بۆ ڕوون بکەمەوە، *ئێوە دەتوانن*... یان با بەم جۆرە بیڵێم، *ئێوە ئەو توانایەتان هەیە* کە هەر لێرە و هەر ئێســتە چاو ببڕنە چاوم و پێم بڵێن کە من بەرازێکی چەپەڵ نیم؟

گەنجەکە نقەی لێوە نەهات.

وتاربێژ ئەم جارەیان بە شکۆیەکی زیاترەوە ئێستی کرد تا فیلەفیلی ساڵۆنەکە بوەستێتەوە و جا درێژەی پێ دا:

– دەی، دەی، کاکە گیان! گریمان من بەرازێکی چەپەڵم، وەلێ خۆ ئەو خاتوونێکی قورســـوقۆڵە! گریمان من ســـەروســـەکوتی ئاژەڵانم هەبوو، وەلێ هاوســـەرەکەم، کاترینا ئیڤانۆڤنا، بڕوانامەدارە و خوێنی ئەفســـەرێکی ســـوپا بە دەمارەکانیدا دەگەڕێ! ئەســـڵەن قەبووڵمە، من ناپیاوم، بەس خۆ ژنەکەم دڵی لە زێڕە، ڕەسەنە و نموونەی پەروەردە و نەجیبییە! ئێســـتە... چی دەبوو گەر بەزەیی پێمدا بهاتباوە؟ ئاخر کاکی بەڕێز، کاکی مەزن! ئاخر مرۆڤ هەر دەبێ لانیکەم لە شـــوێنێکدا کەســـانێکی خەمخۆری هەبن! وەلێ کاترینا ئیڤانۆڤنا گەرچی ژنێکی قورســـوقۆڵە، کەچی بێویژدانیشـــە. کـاتێـک چـنـگ بەم دوو تـاڵە شـــوویتەقژانەمدا[2] دەکا و ڕایان دەکێشـــێ، چاک تێی دەگەم، تەنیا لە داخاندایە و بەس. تەریقیش نابمەوە، کاکەلاو، وا ئاســـایی دەڵێم کە ژنەکەم قژم ڕادەکێشێ و دەریدەهێنێ...

---

۲. ئاماژەیە بە *ئینجیلی یوحەنا*، پاژی ۱۹، ئایەتی ۵: *ئەوســـا عیســـا بە تاجەدڕک و جلی درێژی ئەرخەوانییەوە هـاتە دەر، پیلاتۆس گوتییە خەڵکی: تەمـاشـــا، ئەمە خۆیەتی!* «و. ف»

۱. شـوویت: شـوویتە؛ شـووتە؛ دوراخ؛ تۆراخ؛ گیایەکە لە سـەوزەوات بە گەڵای وردی چەترئاساوە.

مارمیلادۆڤ لەنێو فیلەفیلی ئامادەبوواندا بە شـــکۆیەکی زیاترەوە جەختی لەسەر ئەم دەربڕینە کردەوە و بەردەوام بوو:

– ئاخر خوایە ئەی خواوەند، چی دەبوو گەر تەنانەت یەک جار... وەلێ نا... نا! هیچ ســوودێکی نییە و قســەشــی پێناوێ! نا، قســەی پێناوێ!.... زۆر جاران بە داواکەم گەیشــتووم و، نەک یەک جار، بەڵکە چەند جارێکیش دڵیان پێم سووتاوە، وەلێ... سرووشــتم ئەمەیە ئیتر... بە سرووشت ئاژەڵم!

خاوەنمەیخانە بەدەم باوێشکدانەوە:

– سەد ڕەحمەت لە ئاژەڵ!

مارمیلادۆڤ توند مستی بە مێزەکەدا کێشا:

– هەر ئەوەم کە هەم! دەزانن، قوربــان... دەزانن.. من تەنــانەت گۆرەوییەکانی ژنەکەشمم فرۆشتن و دامنە ئارەق! پێڵاوەکانی نا، گەر پێڵاو بان هێشتا ماقووڵتر دەردەکەوت... وا دەڵێم گورەوییەکانیم بردن و دامنە ئارەق، کاکە گیان! شـاڵێکی پەژمیشــی هەبوو کە ئەویشــم دایە ئارەق، ئەویان بە دیاری پێ دابوو، جا تازەش نەبوو، پۆشـــاکی ئەو بوو، تێدەگەی؟ کونەمشکەکەشمان زۆر سارده و ئەم زستانە ژنەکەم خراپ ســـەرمای بووە و ماوەیەکە کۆکەی خوێنین دەکا! ســـێ منداڵی وردەڵەشــمان هەن. کاترینا ئیڤانۆڤناش شـــەو و ڕۆژ تەقەلایەتی، هەر شـــتوشــۆر دەدا و خەریکی منداڵەکانە... ئاخر ئەوە خوویەتی، هەر لە منداڵییەوە هۆگری پاکوخاوێنی بووە... وا ئێســـتەش ســـنگی وێرانە و ڕەنگە تووشــی ســیل ببێ... لەم شــتانە تێدەگەم من، کاکە. لاتان وایە تێناگەم؟ تا زیاتریش دەخۆمەوە، زیاتر تێدەگەم. وا دەزانن من بۆچی ئــارەق دەخۆمەوە؟ بۆیە دەخۆمەوە چونکە بەدوای هەســـت و بەزەییەوەم؟ خۆ من بەدوای چێژەوە نیم، تەنیـا خەم و خەفەتەکەیم دەوێ! ئەسڵەن بۆ ئەوە دەخۆمەوە تا زیاتر ئەشکەنجە بچێژم!

ئەمەی گوت و هەناسەسارد و تیاماو سەری خستە سەر مێزەکە.

کە سەری هەڵبڕی، لەسەری ڕۆیشت:

– لە ڕووخساری ئێوەشدا خەفەتێکی تایبەت دەبینم، گەنجۆ. کە هەنگاوتان نایە ژووری، ئەمەم لە ڕووخسارتاندا خوێندەوە و لەبەر ئەوەش بوو کە سەری قسەم لەگەڵتاندا کردەوە. بۆیە گرێی دڵی خۆم لەلا کردنەوە کە تامەزرۆی هاودەمیی تاقە مرۆڤێکی تێگەیشتوو و هەستیار بووم؛ نەک ئەوەی کە بمەوێ لەبەردەم ئەم بێئیشانەدا کە سەرتاسەری بەسەرهاتم دەزانن، خۆم بکەمە پووشپیاز تا پێم پێبکەنن. بەهەرحاڵ، بزانن کە ئەم خانمەی بەندە، لە ناوەندێکی خوێندنی ئیتاڵیی شکۆداری سەر بە خانەدانان خوێندوویەتی و لە ڕێوڕەسمی دەرچووندا بە ئامادەبوونی فەرماندار و پلەبەرزانی دیکەی ئەو ڕێوڕەسمە سەمای شاڵی[1] کردووە و مەدالیای ئاڵتوونی و ڕێزلێنانیشیان پێشکەش کردووە. ئەوە مەدالیاکە... ڕاستییەکەی زۆر دەمێکە فرۆشتوومانە. وەلێ نامەی ڕێزلێنانەکە هێشتا لە سندووقچەکەیدایە. لەم دواییانەدا پیشانی خاوەنماڵەکەی دەدا. نەک لەبەر ئەوەی لاتان وابێ پەیوەندیی لەگەڵ خاوەنماڵەکەماندا باشە، نا! گەرچی لەگەڵ ئەو ژنەدا وەک مشک و پشیلە وان، وەلێ دواجار دەیویست تەنانەت گەر لەبەردەم کەسێکیشدا بووە تۆزێ خۆی هەڵکێشێ و باسی ڕۆژانی شاد و شکۆداری بکا. منیش لۆمەی ناکەم، هەرگیز! بۆ بێ لەوە چیی بۆ ماوەتەوە؟ تەنیا ئەم یادگارییەیە و بەس! خۆ ماباقییەکەی بە با چووە... بەڵێ، بەڵێ! سەر بەو جۆرە ژنە تونەخوو[2] و لووتبەرز و ڕەقانەیە ئەم خاتوونەی من! ئامادەیە خۆی

---

١. سەما بە شاڵەوە، لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم لە ڕووسیادا بووەتە باو و خوێندکارانی نمرەبەرزی ناوەندەکانی خوێندنی تایبەت بە خانەدانان، لە ڕێوڕەسمدا دەیانکرد. «و. ف»

٢. تونەخوو: تونەمەزاج؛ کەسێک کە زوو هەڵدەچێت.

ڕووی ژوورەکە مشـــتومالْ بکا و نانەڕەقە بخوا، وەلێ بێڕێزیی پێ نەکرێ! هەر لەبەر ئەوەش لەبەرانبەر بێڕێزییپێکردنی لیبیزیاتنیکۆفدا خۆی پێ ڕانەگیرا و نەیهێشـت کابرا بە بێوەیی بچێتە دەرێ. کاتێکیش لیبیزیاتنیکۆف لێی دا، نەک لەبەر ئەو لێدانەی کە خواردی، نا، زیاتر لەبەر هەسـتی پامالْکراوی بوو کە کەوتە جێگە. کاتێک یەکترمان بینی، بێوەژنێـک بوو بە ســێ منـداڵە وردکەوە، یەک لە یەک مردۆختر. یەکەمین زەماوەندی زیاتر بەبۆنەی عەشق و خۆشەویستییەوە بوو و لەبەر ئەفســەرێکی پیادەی ســوپا لە مالْی باوکی بۆی دەرچووبوو. شێتانە دڵی دابووە مێردەکەی، وەلێ مێردەکەی وا دەست بە قومار و قەرز دەکا و، بە کورتییەکەی، دادگایی دەکرێ و دەکەوێ و دەمرێ. لە کۆتاییەکاندا، مێردەکەی لێشــی داوە، گەرچی ئاگادارم و شــاهێد و بەڵگەم هەیە کە خاتوونیش لەبەرانبەر ئەو ئێشـانەیدا بێوەڵام نەبووە... ئەرێ، تا ئەمڕۆش کاتێ نـاوی ئەو دەبرێ، بە یـادییەوە فرمێســک دەبارێنێ و بەســەر منیدا دەڕێژێ. منیش دڵخۆشـم، زۆر دڵخۆشـم کە تەنانەت گەر لە خەیاڵیشــدا بێ، بە یادی ڕابردووییەوە بەختەر بێ. دوای ڕۆیشتنی کابرای مێردی، ئەو دەمێنێتەوە و سێ منالْی بچووک، جا ئەوەش لە شارێکی دوورەدەست و نالەباردا کە من ئەو سەردەمانە لەوێ نیشـتەجێ بووم. کەوتبووە وەها کوێرەوەرییەکەوە ئەم ژنە، کە من خۆم، بەم هەموو هەوراز و نشــێو و جۆرەها کێشــانەی کە لە ژیانمدا هەمبوون، زمانم دەرەقەتی باسـکردنی نایێ[1]. کەسـوکاریشـی حاشایان لێ کرد. ئاخر، ژنێکی لووتبەرز بوو، زیاد لە ڕادە لووتبەرز... لێرانەدا بوو کە، کاکە گیان، منێک کە خۆم ژنەکەم مردبوو و کچێکی

---

١. ئەم دۆخە ئێجگار هاوشێوەی بەشکەلێکە لە ژیننامەی *ئیسایێڤا* و *دۆستۆیڤسکی*. ئیســـایێڤا پاش مردنی هاوســـەرەکەی تەنانەت بەبێ تیکە نانێکیش لەگەڵ کوڕە گچکەکەی لە شوێنێکی چەپەکی سیبیریادا بێ کەمترین یارمەتی و پاڵپشتی کەوتبوو و دەتوانین ئەمە لەنێو نامەکانی دۆستۆیڤسکی بۆ میخائیلی برای لە ڕێککەوتی ١٣ی کانوونی دووەم، ٢٤ی ئادار و ٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٥٦دا بخوێنینەوە. «و. ف»

چوارده ســـاڵەم بە ملەوە بوو، پێشـــنیاری زەماوەندم بۆ کرد، ئاخر نەمدەتوانی ئەو هەموو ئەشـــکەنجەیە ببینم و شـــتێ نەکەم. خۆتان دەتوانن لەوە تێبگەن ئەم ژنە بڕوانامەدارە ڕەســـەنە بەو پەروەردە خێزانییەوە، چەندە ئاوارە و داماو بووە کە ئامادە بووە ببێتە ژنی من! بەڵێ، بووە ژنم! هەڵبەتە بەدەم شین و گریانەوە و لە بارێکدا کە لەتاو پەشێوی دەستەکانیی لێک دەئاڵاندن و هیچ ڕازی نەبوو... وەلێ دەی، زەماوەندی لەگەڵ کردم! بووە ژنم، لەبەر ئەوەی هیچ شوێنێکی نەبوو ڕووی تێ بکا. خۆ لە مەبەســتم حاڵی دەبن، کاکە گیان؟ لەوە تێدەگەن کە مرۆڤ شـــوێنێکی نەبێ ڕووی تێبکا یانی چی؟ نا! هێشـــتا ناتوانن دەرک بە بێپەنایی بکەن... یەک ســـــاڵی ڕێک، بە پارێز و جددییەتێکی پیرۆزەوە خەریکی ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکە بووم کە گرتبوومە ئەستۆ و دەســـتیشـــم بەر ئەمە (پەنجەی لە پێکەکە دا) نەکەوت، ئاخر منیش بە ناخێری گیانم مرۆڤم و هەســـــتم هەیە. وەلێ دەی، تەنانەت بەمەش ڕازی نەبوو. جا دواتریش ئیشـــەکەمم لەدەســـت دا. ســـووچی منیش نەبوو، کەوتبووینە سەردەمی گۆڕینی کارمەندەکانەوە. ئیتر لەو کاتەدا بوو کە گیرۆدە بووم و دەســتی پێ کرد. ئێســتەش وا ســـاڵ و نیوێک دەبێ کە دواجار، دوای دونیایەک چارەڕەشـــی و ئاوارەیی گەیشـــتینە ئەم پایتەختە بێوێنەیەی کە بە کروورکروور[1] پەیکەر ڕازێنراوەتەوە. لێرە ئیشـێکم دۆزییەوە... هێشـتا دەســتم پێ نەکردبوو کە هەمدیســان لەدەستم دا! تێدەگەن، قوربان؟ ئەم جارەیان ئیتر سووچی خۆم بوو و سرووشتی پۆخڵم خۆی نواند! ئێستەش کە لە ماڵی ئامالیا فیۆدۆرۆڤنا لیپیڤێخزیلدا ژوورۆچکەیەکمان بە کرێ گرتووە، خۆ من هەر نازانم لە کوێ پارە دەهێنین و چۆن دەیگوزەرێنین! بێ لە ئێمە، کەســـــانێکی تریش لەوێ دەژین. دەڵێی شـــــاری لووتە، قوربـان، لە جۆرە نالەبارەکەشـــی!... ئممم... بەڵێ، ئەمەیە ئیتر... ئەو کچۆڵەیەم کە لە

---

[1]. کروورکروور: بە چەندایەتی یان هەندەی پێنجسەد هەزار.

ژنەکەی یەکەمم بوو لەم بگرەوبەردەیەدا گەورە بوو. ئەوە با لەولاوە بوەستێ کە چیی بەدەست باوەژنەکەیەوە چەشت، باسی ئەوەیان هەر ناکەم. بەڵێ، کاترینا ئیڤانۆڤنا یەک پارچە هەستی بەرزە، وەلێ زۆریش ڕەق و هەستیارە و زوو کەلەیی[1] دەبێ... بەڵێ، کاکە گیان! ئیتر ئەم شتانە پێویست بە گوتن ناکەن! خۆتان دەتوانن سۆسەی[2] بکەن کە سۆنیا خوێندنێکی ڕێکوپێکی نەبووە. چوار ساڵ لەمەوبەریش بەنیاز بووم وانەی جوگرافیا و مێژووی جیهانی پێ بڵێمەوە، وەلێ خۆ، خۆیشم بە باشی سەری لێ دەرناکەم و کتێبی فێرکاریشمان نەبوو تا... هەرچی کتێب بوو فرۆشتبوومانن تا... ئممم!... بەهەرحاڵ کتێبێک لەئارادا نەبوو و وانەش پشتگوێ خرا. گەیشتبووینە بەشی پەیوەست بە کۆرشەوە، پاشای فارس. کە گەورەتر بوو، خۆی لەم جۆرە ڕۆمانە عاشقانانەی خوێندنەوە و لەم دواییانەشدا لەڕێی بەڕێز لیبیزیاتنیکۆفەوە کتێبی فیزیۆلۆژیای[3] لویس... کە لەوانەیە ناویتان بیستبێ، ها قوربان؟ بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە خوێندییەوە و تەنانەت چەند بەشێکیشی بە دەنگی بەرز خوێندەوە... خوێندەواری و زانیاریی لەم ئاستەدایە. ئێستە، کاکە گیان، پرسیارێکی تایبەتم لە جەنابتان هەیە: پێتان وایە کچێکی هەژار و ئاوڕوودار دەتوانێ لە ڕێیەکی ڕاستەوە پارە پەیدا بکا؟... گەر کچێکی ڕێک و سادە بێ و ئیشێکی

---

٢. کەلەیی: دەیری؛ شێت؛ هار؛ تووڕەبوونی لەڕادەبەدەر.

٣. سۆسەکردن: بۆچوون، گومانبردن، گەیشتنە ئەنجام لەڕێی گومان و خەیاڵەوە.

١. وەرگێرانی رووسیی کتێبی *فیزیۆلۆژی ژیانی ڕۆژانەیی* لە نووسینی فەیلەسوف و ڕەخنەگری ئینگلیزیی سەدەی ١٩، *جۆرج هێنری لویس*، لە ساڵی ١٨٦١دا لە مۆسکۆ چاپ بوو و دۆستۆیفسکیش دانەیەکی لە چاپی دووەم هەبوو. لویس ئەم کتێبەی لەژێر کاریگەریی بیری *ئاگۆست کۆمت* پۆزیتیڤیستی فەرەنسیدا نووسی. لەم کتێبەدا چەند دەروازەیەک خراونەتە ڕوو کە دڵخوازی خوێنەرانی لاو بوون لەگەڵ ڕێبازگەلی ماتریالیستی و نیهلیستی، هەروەها ژنانی پزشکەوتووش مەیلێکی تایبەتیان بۆی هەبوو. «و. ف»

تایبەتیش نەزانی، ڕۆژی پازدە کۆپیکێکیشــی نادەنێ؛ جا گەر بەیانی تا ئێوارە لەســـەر یەک تەقەللاش بدا! جا کاتی خۆیشــی، ئیڤان ئیڤانۆڤیچ کلاپشتۆک، کە لە فەرمانبەرە پلەبەرزەکانە و ڕەنگە ناویشتان بیستبێ، پارەی ئەم چەند کراســـە مۆدێل هۆلەندییەشـــی نەدا کە کچەکەم بۆی دووری، ســـەرباری ئەوەش جوێنبارانی کرد و وەدەری نا. نازانن کە، چۆن کابرا، چۆن پێی بە زەویدا دەکوتا و قسەی ناشیرینی بەو کچۆلە بێگونـاحە دەگوت کە بۆچی یەخەکەیـان خوارە و بـاش نەدووراوە. لەولاشـەوە منالەکان برسـییان بوو... کاتریناش سـرەوتی لێ براببوو و ژوورەکەی دەپێوا[1]، دەســـــتەکـانی هەڵـدەگلۆفین و چەنـد پەڵەیەکی ســووریش کەوتبوونە ئەملا و ئەولای ڕووخســارییەوە کە ئاســەواری نەخۆشییەکەینی. دواتریش ڕووی کردە سۆنیا و پێی گوت: *تۆ وا لێرە دەژیی، داخی ئەو نانەمە کە دەیخۆی و دەخەوی و هەر لێرەش خۆت گەرم دەکەیەوە*... کەسـێ نەبوو پێی بڵێ بۆ گەر ئەوێ شـتێکی لێیە بۆ خواردن، لە کاتێکدا کە منالەکان سێ ڕۆژی ڕێک بوو کە تەنانەت یەک تیکە نانیشـــــیان نەبینیبوو! ئەوە منیش لەو ناوە کەوتبووم... ئێ، جا لاتان وایە چی ڕووی دا!... لەوێ ســەرخۆش و وڕ کەوتبووم و گوێم لێ بوو سـۆنیا گوتی... دەزانن ســۆنیای من خۆشــی لە قرەقڕ و ناڵەناڵ نایێ، دەنگێکی زۆر شــەرمنانە و هێمنی هەیە، قژی کاڵە و ڕووخســـاریشـــی دایمەی خوا لاواز و ڕەنگپەڕیوە... ئەرێ، کتوپڕ بیســـــتم کە ســـــۆنیا گوتی: *ئاخر چۆن، کاترینا ئیڤانۆڤنا؟... هەر بە ڕاســـتی مەبەســـتتان ئەوەیە من بچم و دەست بە وەها کارێ بکەم؟*.... لە لایەکی تریشـەوە داریا فرانســـۆڤناناوێک؛ لەو قەحپانەی زەمانە، ڕۆڵی هەبوو کە چەند جارێکیش براببووە پۆلیســــخانە و، لەو دواییانەدا، لەڕێی خاوەنماڵەوە سـێ جار هەواڵی سـۆنیای پرسـیبوو. کاترینا ئیڤانۆڤناش، لە وەڵامدا،

---

[1] لە زۆر شـــوێنی ئەم وەرگێرانەدا «پێوان» بە مـانـا دوور و نەرێنیـــاتی (مەجازی)یەکەی بەکار هاتووە: هاتووچۆی بێسوود.

گاڵتەی بە سـۆنیا کرد کە، *یانی چی کە چۆن؟ دەسـت لە وەها کاریّ نادەی تا پاریّزگاری لە چی بکەی؟ مادام ئەمە گەنجینەیە سـوودی لیّ وەرگرە!...* بەس لیّی مەگرن، لیّی مەگرن قوربان! لەم ژنەی مەگرن، نا! کە ئەم قسـانەی دەکردن، خۆی نەبوو، ئەقڵی لە شـویّنی خۆیدا نەبوو. ویّران بوو، جڵەوی هەسـتەکانیی لەدەسـت دەرچووبوو، نەخۆش بوو و مناڵەکان بە دەوریدا لە برسان هەنسکیان دەدا. گەر ئەم قسەیەشی لە دەم دەرچوو زیاتر لە ڕقان و بۆ خاڵیکردنەوەی داخی دڵی بوو، نەک ئەوەی کە هەر بە ڕاسـتی مەبەسـتیّکی هەبیّ... کاترینا ئیڤانۆڤنا وایە ئیتر. کە مناڵەکان دەکەونە گریان، تەنانەت گەر لە برسـانیش بیّ، دەمودەس دەکەویّتە گیانیـان و لیّیـان دەدا. بە کورتییەکەی... نزیکەی پیّنجی دوای عەسر بوو کە سەرپۆشەکەی بە سەریدا دا و گنجەکەی[1] لە بەر کرد و چووە دەریّ و شـەو نزیکەی کـاتژمیّر نۆ بوو کە گەڕایەوە ماڵیّ. هاتە ژوورەوە، ڕاسـتەوڕاسـت چووە لای کاترینا ئیڤانۆڤنا و قرۆقەپ سـی ڕۆبڵی خسـتە سـەر میّزەکەی بەردەمی. نە یەک وشـەشـی لە دەم هاتە دەر و نە تەماشـای کەسـیشـی کرد، تەنیا دەسـتی دایە شـاڵە پەڕمییە گەورە سـەوزەکەمان (کە لە ماڵەوەدا هەموومان لە سـەرمادا بە خۆمانیدا دەدەین)، جا سـەر و ڕووی پیّ داپۆشـی و خۆی بەسـەر تەختەکەیدا دا. ڕووی کردە دیوارەکە و شـانەکانی و سـەراپای لەشـی هەڵدەرزی... منیش، کاکە گیان، ڕیّک وەک پیّشـتر لەویّ سـەرخۆش و وڕ کەوتبووم... پاشـانیش بینیم کە... هەر وا بیّتەوە... بینیم کە کاترینا ئیڤانۆڤنا بیّ ئەوەی قسـەیەک بکا چووە لای تەختەکەی سـۆنیا گیانەوە و بە دریّژایی شـەو لە بەرپیّیدا کەوتە سـەر ئەژنۆ و هەر خەریکی ماچکردنی پیّیەکانی بوو و لەویّ هەڵنەدەسـتا. دواتریش پیّکەوە خەویان لیّ کەوت، باوەشـیان بە

---

١. گنج: کنج؛ کەوای کورتی بەرباز کە تا سەر کەمەر دادەپۆشیّ.

یەکتریدا کرد و خەوتن، بەڕێز... پێکەوە... پێکەوە... ئەری، کاکە گیان... خۆ من... بە سەرخۆشی لەوێ کەوتبووم، بەڕێز...

مارمیلادۆڤ بێدەنگ بوو، دەتگوت ئیدی دەنگەکەی نایکات. جا لە چاوترووسکاندنێکدا پێکە ئارەقەکەی هەڵدا و سینگیی ساف کرد. تۆزێک دواتر گوتی:

– لەوساوە، بەڕێز گیانم، رێک لەوساوە، لەبەر رووداوێکی شووم و بەبۆنەی راپۆرتی مرۆڤێکی دڵرەق و خراپەکارەوە (داریا فرانسیڤنا هەڵبەتە چووە بنکەلیشەیان، ئاخر بە بۆچوونی ئەو لەم نێوەندەدا بێڕێزیی پێ کرابوو)، کچۆڵەکەی من، سۆنیا گیانم، ناچار بوو مۆڵەتنامەی زەردی سۆزانیەتی وەربگرێ و خۆ ئێستە ئیتر بەم دۆخە تازەیەوە ناتوانێ لای ئێمە بمێنێتەوە... یانی خاوەنماڵەکەمان، ئامالیا فیۆدۆرۆڤنا، ئیتر مۆڵەتی ئەوە نادا (جا لەوە گەڕێ کە پێشتر خۆی لەگەڵ داریا فرانسیڤنادا دەستیان تێکەڵ کردووە) و بەڕێز لیبیزیاتنیکۆفیش کە... ئممم... لە بنەڕەتەوە لەسەر سۆنیا بەگژ کاترینا ئیڤانۆڤنادا چووبوو. سەرەتا خۆی سۆنیای خۆش دەویست، وەلێ کتوپڕ قسەی گۆڕی و خۆی هەڵدەکێشا کە، چی؟ *منی مێژا بەم پێگەیەوە دەبێ لەگەڵ ژنێکی سەرشەقام لە ماڵێکدا بژیم؟* جا کاترینا ئیڤانۆڤناش نەیتوانی لەئاست قسەکەیدا خۆی کەڕ بکا و دەستی پێ کرد... دەی، ئیتر ئەوە ڕووی دا کە نەدەبوو ڕوو بدا! ئێستەش سۆنیا گیان جاروبار دەمەوئێواران سەرمان لێ دەدا، یارمەتیی کاترینا ئیڤانۆڤنا دەدا و هەرچیشی بەدەستەوە بێ بۆمان دەهێنێ... وەلێ خۆی لای بەڕێز کاپیر ناومۆڤی بەرگدوور ژوورێکی بەکرێ گرتووە. کاپیر ناومۆڤی داماویش شەلە و زمانی دەگیرێ و منداڵەکانیشی، کە دانە و دووانیش نین، هەموویان ترن. تەنانەت ژنەکەشی ترە. ئەوان لە ژوورێکدان و سۆنیاش ژووری خۆی هەیە کە سەربەخۆیە و بە باریکەدیوارێک جیا کراوەتەوە... ئممم... خۆ لەوان چارەڕەشتر بوونی

نییە کە هەرهەموویـــان ترن و... بەڵێ دەی... بەیــانییەکەی لە خەو هەستام و ئەم سیپاڵەمم لەبەر کرد، دەستمم بەرەو ئاسمان هەڵبڕی و چوومە خزمەت جەنابی پایەبەرز *ئیڤان ئافاناســـیێڤیچ* و شــــەرەفمەند بووم. جەنابی ئیڤان ئافاناســـیێڤیچ دەناســـن؟... نا؟ کەواتە شــــەرەفی ناسـینی یەکێک لە گەورەترین لەخواترســـە ڕاســتەقینەکانتان لەدەسـت داوە! ئیڤـان ئـافـانـاســـــیێڤیچ هەر دەڵێی مۆمە... مۆمێک لە بـارەگەی خواوەندا... مۆمێک کە بە ئاگر دەســــووتێ[1]... کە بەســــەرهاتەکەی بیســت، تەنانەت چەند دڵۆپە فرمێســکێکیشــی ڕشــتن و گوتی، *باشــە، مارمیلادۆڤ، تۆ تا ئێستەش زۆر منت لە خۆت بێهیوا کردووە، وەلێ... لەسەر بەرپرسیاریەتیی خۆم جارێکی تریش وەرت دەگرمەوە.* کتومت ئەمە قســــەی خۆی بوو. پاشــــــان گوتی، *تەنیا* بیرت نەچێ کە *ئەمە دواهەمین جارتە، دەی ئێســتەش برۆ!* خاکی بەرپێیم ماچ کرد، هەڵبەتە لە خەیاڵی خۆمدا، ئاخر ئەو هەرگیز بە ڕاســـتی ڕێگەی وەها شـتێکی نەدەدا و پێی قایل نەدەبوو. مرۆڤێکی گەورە و پایەبەرز بووە و بیر و بۆچوونی پێشــکەوتنخوازانەی ســیاســیی هەبووە. بە کورتییەکەی کە گەڕامەوە مــاڵــێ، ئــای گەر دەتــدیــت وەخــتــێ گــوتــم دووبــارە دامەزراومەتەوە و بڕیارە مووچە وەربگرم، چ بەزم و شادییەک بەرپا کرا...

مـارمیلادۆڤ هەمـدیســــــان دڵڕەنجـاوانە بێدەنـگ بوو. هـاوکـات کۆمەڵێکی بەدمەســـــت هـاتنە ژوور و کە دەرگە کرایەوە، ئـاوازی ئاکاردیۆن و دەنگی زیکنی منداڵێکی حەوتســــاڵەیش هات کە گۆرانیی

---

[1] ئاماژەیە بۆ *مەزامیر*، بڕگەی ٦٨، ئایەتی ٢؛ *وەک چۆن دووکەڵ لەبەرانبەر بادا پەرتەوازە دەبێ، ئاوها پەرتەوازەیان بکەن؛ جا هەر بەو جۆرەی کە مۆم لەبەرانبەر ئاگردا دەسووتێت، لێکەڕێ گوناحباران لەبەردەمتدا تیا بچن.* «و. ف»

*مەزرای* بچووک[1]ی دەگوت. مەیخانەکە قەڵەباڵغ بوو و خاوەنمەیخانە و دوو شاگردەکەی سەرقاڵی تازەهاتووەکان بوون. بەڵام مارمیلادۆڤ گوێی بە تازەهاتووەکان نەدا و لەســـەر گێڕانەوەی بەســـەرهاتەکەی بەردەوام بوو. پێدەچوو هاز و تینی لێ بڕابێ، وەلێ تا زیاتر دەیگرت، زیاتر لەسەر قسەکردن گەرم دەبوو. کە سەرکەوتنی دواهەمین کاریی بیر خۆی هێنایەوە، کەیفسازتر بوو و تەنانەت ڕووخساری گەشایەوە. ڕاسکۆلنیکۆفیش هەر وا گوێی بۆ دەگرت:

– پێنج حەفتەیەک بەســـەر ئەم ڕووداوانەدا تێپەڕیوە، ئازیز گیان. کاترینا ئیڤانۆڤنا و سۆنیا گیانم کە مەسەلەکەیان بیست... ئای خوایە! دەتگوت هەنگاوم ناوەتە عەرشـــی ئیلاهییەوە! تـا بەر لەوە، وەک ئاژەڵێکی نەفام لە سووچێکدا دەکەوتم و تاکە شتێ کە پێم دەبڕا، جنێو و قســەی ناشــیرین بوو! وەلێ لەوەودوا ئیدی هەردووکیان بە پادزە[2] ڕێیان دەکرد و منالەکانیان بێدەنگ دەکردن کە، *ســیمیۆن زاخارۆڤیچ لەسەر کار گەڕاوەتەوە و ماندووە، وا پشوو دەدا، وس!* سبەینان بەر لەوەی بڕۆم، قاوەی گەرمیان بۆ دەهێنام، جا بە خامەشـــەوە! حاڵی دەبن، کاکی پایەبەرز؟ خامەی ئەســـڵیان دەکڕی! ناشـــزانم لە کوێوە یازدە ڕۆبڵ و پەنجا کۆپیکیان کۆ کردەوە تا دەستێ بە سەروسیمامدا بێنن کە ڕووی ئاوەدانیم هەبێ. پووت، پێشـــبەرۆکی کەتانی... جارێ لەوانە گەڕێ، شازترین یۆنیفۆرمی تازە... هەموو شتێکیش پاکوخاوێن و شــــاز، کاکە گیان... ئاخر بە یازدە ڕۆبڵ و نیو چۆن ئەوەیان کرد؟ کە لە یەکەمین ڕۆژی کارەکەمدا گەڕامەوە ماڵێ، تەماشام کرد کاترینا ئیڤانۆڤنا دوو جۆر چێشـــتی ئامادە کردووە، ســـووپ و گۆشـــتی گای ســـوێرکراو لەگەڵ ســـاسخەرتەلە، کە پێشـــتر تەنانەت لە خەویشـــدا

---

١. لە گۆرانییە دڵخوازەکانی ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمی خەڵکی ڕووسیایە، کە دەقی شیعرەکەی هی *کاڵتسۆفی* هۆندراوەهۆنی میللییە. «و. ف»

١. پادزە: پێدزە: ڕۆیشتنی بێچرپە؛ ڕێکردن بە دزییەوە.

چاومان پێی نەدەکەوت. خاتوونەکەی من دەستە جلێکی تازەشی نییە، یانی ئەسڵەن جلی هەر نییە، کاکە گیانم... وەلێ ئەو ڕۆژە وەک ئەوەی بیەوێ بچێتە میوانییەک، شوێنێک، کەشخە و ڕێکوپێک بوو. نەک بڵێین شـــتێکی نوێی لە بەر کردبێ، نا، بەس ئاخر چاک دەزانێ بەبێ هیچ شتێ خۆی برازێنێتەوە. قژەکانیی داهێنابوون، بەرۆک و سەرقۆڵەکانی خاوێن بوون و هەڵپێکابوون و... بە تەواوی بووبووە کەســـێکی تر... گەنجتر و جوانتر! کۆترەکەشم، سۆنیا گیانم، تەنیا لە ڕووی ماددییەوە چـاوی لێمـان بوو و دەیگوت جـارێ وا بـاشــــە تـا مـاوەیەکی درێژ ســــەردانمان نەکا، تەنیا مەگەر بە تاریکی کە هیچ کەســـێ نەیبینێ. گوێتـان لێمە، هۆشـــتـان لامە، کـاکە گیـان؟ دوای نـانخواردن چووم وەنەوزێ بدەم و جا لاتان وایە چی بوو؟ کاترینا فیۆدۆرۆڤنا کە هەر حەفتەیەک لەوەوبەر لەگەڵ خاتوونی خاوەنماڵمان، ئامالیا فیۆدۆرۆڤنادا شــەڕێکی ئەوەندە پیســی نابووەوە کە هەر مەپرســە، نەیتوانی بەر بە خۆی بگرێ و داوەتی کرد تــا پێکەوە قــاوەیەک بخۆنەوە. دوو کاتژمێرێ دایانمەزراند و پســەپســـیان کرد. کاترینا ئیڤانۆڤنا دەیگوت، *ئێستە ئیتر سـیمیۆن زاخارۆڤیچ چووەتەوە سـەر کارەکەی و مووچە وەردەگرێ. خۆی چووە خزمەت خودی میری مەزن*[1]*! جا میری مەزن هەر خۆیـان لەنێو یەک دونیـا ســــەردانیکەردا بەتـایبەت چوونەتە پێشـــوازیی و بە هەمووانیان گوتووە چاوەڕێ بن، تەنیا دەســـتی ســـیمیۆن زاخـارۆڤیچیـان گرتووە و بە بەرچـاوی هەمووانەوە بردوویانەتە ژوورەکەی خۆیان...* گوێتـان لێمە، کـاکە گیـان؟ کـاترینـا ئیڤانۆڤنا لەســـەری ڕۆیشـــت کە، *میری مەزن گوتوویانە، بێگومان من ئاگاداری لێهاتوویی ئێوەم، سیمیۆن زاخارۆڤیچ! گەرچی پێتان خلیسکا و لەبەرانبەر ئەو خووە ناپەسەندەدا، خۆتان نەگرت، ئێستە کە بەڵێنتان داوە و، وێڕای ئەوەش، ئێمە لە نەبوونی ئێوەدا تووشـی کێشـە بووین،*

---

١. میری مەزن: وشەی ڕێزگرتن بۆ پیاوانی حکوومەت و دەوڵەمەندان.

*من بەڵێنی پیاوانەی ئێوە پەســـەند دەکەم...* گوێتان لێمە؟... دەبێ لە خزمەتتـانـدا ڕایگەیێنم کە هەموو ئەم قســـانەی لە گیرفـانی خۆی دەرهێنان و جا ئەمە تەنیا هەر ئەوەندە نەبوو کە خەریکی قســـەی بێســـەروبەر بێ و بیەوێ خۆی هەڵکێشـــێ؛ نا! ئەو بڕوای بە یەک بە یەکی قسـەکانی هەبوو. ئەم ژنە وەها چێژێک لە خەیاڵاتەکانی دەبا کە لە باس نایێ، کاکە! منیش خەتاباری ناکەم، کاکە، ئەو چ خەتایەکی هەیە؟ شـــەش ڕۆژ لەمەوبەر یەکەمین مووچەمم بردەوە ماڵێ. ڕێک بیســـتوســـێ ڕۆبڵ و چل کۆپیک بوو کە هەموویم بردەوە ماڵێ و کاترینا ئیڤانۆڤنا پێی گوتم، *شـــیرینەکەم!* بەڵێ، جا گوتی، *ئای چەندە جوان و خنجیلەی ئەی دڵبەرەکەی خۆم!* هەڵبەتە تەنیا خۆمان بووین، کاکە گیان... خۆ حاڵی دەبێ. باشـــە ئێوە ئێســـتە لە مندا جوانی و دڵڕفێنییەک دەبینن، کاکە گیان؟ ئاخر من چ جۆرە مێردێکم؟ وەلێ نا، ژنەکەم گۆنامی ڕاکێشا و گوتی، *ئاخ، خنجیلەکەم چەندە سەربەکێچەڵی!*

مارمیلادۆڤ ئێســتێکی کرد. ویســتی بزە بکات، وەلێ کتوپڕ زنجی[1] کەوتە لەرزین. هەر چۆنێک بوو خۆی کۆ کردەوە. مەیخانە، ڕوواڵەتی وێران و ناڵەباری کابرای سەرخۆش کە پێنج شەوێکی لەسەر بەلەمە کاکێشەکان بەسەر بردبوو، بتڵی نیولیتریی ئارەق و، سەرەڕای ئەمانە، ئەوینی نەخۆشـانەی بۆ ژن و خێزان، بە تەواوی ڕاسـکۆڵنیکۆفیان وڕ و گێژ کردبوو. ڕاســـکۆڵنیکۆف گەلێک جـددی گوێی دەگرت، وەلێ خۆیشی هەستێکی نەخۆشانەی هەبوو و لەوەش تووڕە بوو کە باشە ئەو بۆچی هاتووەتە وەها شوێنێکەوە. مارمیلادۆڤ ڕاچەنی و درێژەی پێ دا:

– کـاکە گیـانم! کـاکی گەورە و ئـازیزم! لەوانەیە هەموو ئەمـانە بۆ ئێوە مایەی پێکەنین بن، بە هەمان شـــێوەی ئەوانی تر! لەوانەشـــە من

---

١. زنج: چەناگە.

خەریکی باسـکردنی وردەکاریی پووچ و بێمانای ژیانی تایبەتیم بم، سـەرتان بێشـێنم... وەلێ ئەمە بۆ خۆم بە هیچ شـێوەیەک مایەی پێکەنین نییە! ئازاری یەک بە یەکی سـاتەکانی چووەتە گیانمەوە... جا سەرانسەری ئەو ڕۆژە بەهەشتییەم لە خەونێکی کورتخایەندا بەسەر برد: ئەمەی کە چۆن کارەکان ڕادەپەڕێنم و بۆ منداڵەکان جل و ئەم جۆرە شـتانە دەکڕم، لە هەموو ڕوویێکەوە ژنەکەم ئاسـوودە دەکەم و کچە تاقانەکەم لە زەلکاو دەردەهێنم و دەیگەڕێنمەوە باوەشی خێزان... لەم جۆرە بیر و خەیاڵانە و زۆر شـتی تر... خۆ ئاوات عەیبە نییە، کاکە.. جا دواتر، قوربان، سەری کاکی خۆم نەئێشێنم...

مارمیلادۆڤ کتوپڕ بە توندی ڕاچەنی، سـەری هەڵبڕی و ڕێک بە ڕاسکۆڵنیکۆڤدا واق بوو:

– جا دواتر، قوربان، ڕۆژێ دوای ئەم خەون و خەیاڵانە، یانی ڕێک پێنج ڕۆژ لەمەوبەر، نزیکەی ئێوارە بوو کە بە فڕوفێـڵ، هەروەک دەزانی شەوکوت[1]، کلیلی سندووقچەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنام خیت کرد[2] و هەموو ئەو پارەیەی کە لە مووچەکەم مابووەوە، هەڵم گرت. بیرم نییە کە چەندە بوو... جا ئێستە، کاکە گیان، سەیرم کەن: تا دواهەمین سـکەی بە بـا چوو!... وا پێنج ڕۆژە لە دەرەوەم و ئەوان هەموو شـوێنێکم لەدوو دەگەڕێن. ئەوە کـارەکەشـم خۆمـان خۆش و یونیفۆرمەکەشـم لە مەیخانەیەکی نزیک پردی میسـری بە بارمتە جێ ماوە. لەبری ئەم جلانە دامنا و... هەموو شتێ فەوتا!

---

١. لە ئاماژە دووماناییەکانی دۆسـتۆیڤسـکی بۆ دووەم پەیامی *پەترۆس* لە ئینجیلدا: *وەلێ هاتنی ڕۆژی یەزدان وەک هاتنی دز وایە لە شـەودا، کە تێیدا بە دەنگێکی سامناک ئاسمانەکان لەناو دەچن و تووخمە سووتاوەکان پەرتەوازە دەبن و زەوی و هەرچیی کە لە ئاویدایە، دەبێتە قەرەبرووت. «و. ف»*

٢. خیتکردن: دزیەی؛ دزین.

مارمیلادۆڤ مســــتێکی بە تەوێڵیدا کێشــــا، بەدەم ددانەجیرەوە بە ئەنیشک خۆی بەسەر مێزەکەدا دا. خولەکێک دواتر، بێ پێشەکی باری ڕووخســــاری گۆڕا و بە دزێوی و ڕووقاییمییەکی دەســــتکردەوە تەماشایەکی ڕاسکۆڵنیکۆفی کرد و پێکەنی و گوتی:

– ئەمڕۆ چووم بۆ لای سـۆنیا تا پارەیەکی لێ وەربگرم و ســەری پێ گەرم بکەم! هەهەهە!

یەکێک لە تازەهاتووەکان، کە لەولایانەوە دانیشـتبوو، هاوکات قاقای لێ دا و پڕ بە دەمی هاواری کرد:

– یانی پارەشی پێ دای؟

مارمیلادۆڤ ڕووی دەمی تەنیا لە ڕاسکۆڵنیکۆف کرد:

– خۆ ئەم بتڵە دەبینن، هەر بەو پارەیە کڕیم. ســی کۆپیکی دەرهێنا و پێی دام، بە دەســــتی خۆی... هەر بە تەنیا ئەوەندەی هەبوو، خۆم بینیم کە هەر ئەوەنـدەی هەبوو... هیچی نەگوت و هەر وا قروقەپ سەیرمی کرد. ئەمە هەڵسوکەوتێکی زەمینی نییە، هی ئەو بەرزاییانەیە، بارێکە کە خەمەخۆرەی مرۆڤن و فرمێسکی بۆ دەڕێژن، کەچی لۆمەی ناکەن... بەبێ لۆمە! ئەوەی کە لۆمە ناکەن، زیاتر مرۆڤ ئەشــــکەنجە دەدا، کاکە! ســــی کۆپیک... بەڵێ، کاکە گیان. دەبێ ئێســــتە خۆیشــــی ئاتاجی ئەم پارەیە بێ، ها؟ ئێوە بۆچوونتان چییە، سەرووەران؟ ئێستە ئەو دەبێ ئاگاداری پاکوخاوێنیی خۆی بێ. دەی ئەم پاکوخاوێنییەش شـتێکی پێویسـتە، ئێ خەرجیی دەوێ، تێدەگەن؟ دەچێتە مێشـکتانەوە چی دەڵێم؟ خەرجیی سـووراو و سپیاو. خۆ بەبێ ئەمانە ناکرێ، کاکە گیان. داوێنی کورتی ئاهاردار و لەم جۆرە پووتە بەباقوبریقانەی کە کاتێک بەسەر گۆماوی شتێکەوە پێ بەرز دەکاتەوە تا تێپەڕێ، بتوانێ باش پا و پووزی بنوێنێ. خۆ هۆشتان لامە کاکە؟ ئێستە تێدەگەن ئەو پاکوخاوێنییەی کە باســــم کرد یانی چی؟ جا من، قوربان، باوکی ئەم

کەســـە، ئەو ســـی کۆپیکەم لە دەســـت قاپاند تا بە ئارەقی بدەم، کاکە گیان! وا دانیشـــتووم و دەخۆمەوە! ئەوەتا چۆڕەشـــم لێ بڕی! کاکی گەورە!... ئێستە کێ دڵی بە مرۆڤێکی وەک من دەسووتێ؟ ها؟ ئێستە بۆ نموونە خۆتان کاکە گیان، دڵتان بە من دەســـــووتێ، یان نا؟ دەی بڵێن، دڵتان بە کەسێکی وەک من دەسووتێ یان نا؟ هەهەهەهە!

مارمیلادۆڤ ویستی هەمدیسان ئارەق تێبکات، وەلێ بتڵەکە چۆڕەی لێ بڕابوو، خاڵیی خاڵی بوو.

خاوەنی مەیخانە کە هەمدیســـــان لەبەردەمیاندا قوت بووبووەوە، هاواری کرد:

– بۆ دەبێ بەزەییان بە تۆدا بێتەوە؟

هەمتر[1] دەنگی قاقا بەرز بووەوە و ئەم جارەیان تەنانەت لافاوی جنێوی پێسیش. هەم ئەوانەی کە گوێیان دەگرت پێدەکەنین و جنێویان دەدا، هەم ئەوانەش کە گوێیان نەدەگرت و تەنیا تەماشای سەروسیمای فەرمانبەرە خانەنشینکراوەکەیان دەکرد.

مارمیلادۆڤ کتوپڕ ڕووهەڵماڵراوانە هاواری کرد:

– بەزەیی؟ بۆ دەبێ بەزەییان بە مندا بێتەوە؟

هەســـتایەوە و لە بارێکدا کە دەســـتی ڕووەو پێش درێژ کردبوو، وەک ئەوەی بە ســـرووش شـــتێکی پێ گوترابێ و تەنیا چاوەڕێ بێ وشەکانی ببیستێت.

– دەڵێن بۆ دەبێ بەزەییـان بە مندا بێتەوە، هـا؟ بەڵێ! بۆ شـــتێ ماوەتەوە تا خەڵکی لەبەر ئەوە بەزەییان بە مندا بێتەوە؟ دەبێ من لە خاچ بدەن، دەبێ لە خاچم بدەن، نەک ئەوەی بەزەییان پێمدا بێتەوە!

---

١. هەمتر: هەمدیسان.

کەواتە لە خاچم بدە، ئەی دادپەروەر، لە خاچم بدە و ئەوسا بەزەییت پێمدا بێتەوە! من بە پێی خۆم دێم، مادام تینووی چێژ و خۆشی نیم، لەبەر فرمێسک و خەفەت دێم! تۆ، ئەی مەیفرۆش، لات وایە ئەم بتڵەی تۆ، چێژێکی بە من بەخشیوە؟ من، لە بنی ئەم بتەڵەدا لەدووی خەم دەگەڕێم، خەم... فرمێسک و خەفەت... جا هەر کە چەشتم، یەکسەری دەستم کەوت! ئەو کەسە بەزەیی بە ئێمەدا دێتەوە کە بەزەییەکەی هەمووانی گرتووەتەوە و، ئەو کەسەش کە ئاگاداری دڵی هەمووانە، تەنیا تاقە کەسێکە و ئەویش هەمان دادپەروەرە. ڕۆژی قیامەت، ئەو دێ و دەپرسێ، *کوا ئەو کچەی کە خۆی فرۆشت لەبەر خاتری زڕدایکە بێبەزەییە سیلاوییەکەی و منداڵە بچووکەکانی غەریبەیەک؟ کوا ئەو کچەی کە دڵی بە باوکە زەمینییەکەی سووتا... باوکێکی کە هەمیشەمەستێکی چەپەڵ بوو و وازی لە خووە ئاژەڵانەکەی نەدەهێنا؟* ئەو دێ تا بڵێ، *لێم نزیک بەرەوە، جارێک لە تۆ خۆش بووبووم... لێت خۆش بووبووم یەک جار... ئێستەش لە گوناهە بێژمارەکانت دەبەخشرێی، چونکە تۆ ئێجگار بەسۆز بووی*[1]... جا ئەو سۆنیاکەی من دەبەخشێ، لە سۆنیاکەی من خۆش دەبێ، دڵنیام کە لێی خۆش دەبێ. کە ئەمرۆ بینیم، لە قووڵایی دڵمدا هەستم بەمە کرد! ئەوەی کە لێپرسینەوە لەگەڵ هەمووان دەکا و دەبەخشێ؛ بە پاک و ناپاکەوە، بە دانا و بێمایەوە... جا کە هەموو کارێکی براندەوە، ڕوو دەکاتە ئێمە و بانگ دەکا کە، *ئێوەش لێمان نزیک ببنەوە! ئێوە، ئەی سەرخۆش و لاوازەکانی من، ئەی کەسانێ کە شەرم ڕێی نەکەوتووەتە دڵتانەوە!* جا ئێمەش پێکڕا بەرەو پێش هەنگاو دەنێین، ئیدی تەریق نابینەوە و لەوێ لە بارەگایدا ڕادەوەستین. جا ئەو دەڵێ، *ئێوە لە بەرازەکانن و شێوەی*

---

١. ئاماژەیە بە ئینجیلی لوقا، پاژی ٧، ئایەتی ٤٧؛ *لەبەر ئەوەیە کە ئەو هێندە بەسۆزە، ئاخر لە گوناهە بێژمارەکانی بەخشراوە. هەر کەسێکیش کەمتر ببەخشرێ، کەمتر بەسۆزە.* «و. ف»

*ئەوتان هەیە و هەڵگری نیشـــانەی تایبەتیی ئەویشـــن![1] وەلێ ئێوەش وەرنە پێش!* دانـایـان و هێژایـان بەو دەڵێن، *ئەی پەروەردگـار، بۆ لە بارەگەی خۆتدا پێشـــوازی لەم جۆرە مرۆڤانە دەکەی؟* جا ئەو دێتە وەلام، *ئەی دانایان و ئەی پیاوخاســـان! من بۆیە پێشـــوازی لەمانە دەکەم کە هیچ کامیان خۆی بە شـــیاوی ئەم لێبوردەییە نەزانیبوو...* ئەوسا ئەو باوەشمان بۆ دەکاتەوە و ئێمەش لە بارەگەی ئەو مەزنەدا دەکەوینە ســـەر زەوی... فرمێســـک دەڕژین... جا لە هەموو شـــتێ تێدەگەین! ئەوە ئەو کاتەیە کە ئیتر لە هەموو شـــتێ تێدەگەین!... جا هەمووان دەرک دەکەن... کاترینا ئیڤانۆڤناش هەر وا... تەنانەت ئەویش دەرک دەکا... ئاە، ئەی باوکە، مەلەکووتی تۆ هەر پایەدار بێ![2]

مـارمیلادۆڤ کە ئەمـانەی گوتن، مـاندوو و بێهـاز خۆی بەســـەر نیمکۆتەکەدا دا و ئیدی تەماشـــای کەســـی نەدەکرد، دەتگوت ئاگای لە دەوروبەری نییە و لە قوولایی بیر و خەیاڵدا نغرۆ بوو. قســـەکانیشـــی کاریگەر بوون و بۆ خولەکێک بێدەنگی بەســـەر ئامادەبوواندا زاڵ بوو، وەلێ زۆر زوو پێکەنین و جوێن دەستیان پێ کردەوە:

– بەخێر بێیتەوە، پاساوت هێنایەوە!

– قسەی قۆڕ!

– کارمەند و شت وایە ئیتر!

---

٢. ئاماژەیە بە ئینجیلی موکاشـــەفە، پاژی ١٣، ئایەتی ١٥ و ١٦؛ *ئەو تەنانەت توانیی گیان بە بەر ئەو پەیکەرەدا بکات تا بتوانێ بێتە گۆ؛ هەروەها سزای مەرگیش بەسەر ئەو کەســانەدا بســەپێنێ کە ئەویان نەدەپەرســت. وێڕای ئەوەش، گەورە و بچووک، هەژار و دەوڵەمەند، کۆیلە و ئازادی ناچار کرد تا نیشانەیەکی تایبەت بە دەست یان تەوێڵی ئەوەوە بنێن.* «و. ف»

١. ئاماژەیە بە دوعای مەسیح لە *ئنجیلی لوقادا*، پاژی ١١، ئایەتی ٢؛ هەروەها *ئنجیلی مەتا*، پاژی ٦، ئایەتی ١٠. «و. ف»

جا نازانم چی و چی...

مارمیلادۆڤ سەری هەڵبڕی و ڕووی کردە ڕاسکۆڵنیکۆف:

– با لێرە بڕۆین، کاکە گیان. من ببەن... خانووی *کۆزل*... ئەولای ئەم گۆڕەپانە. ئیتر کاتیەتی... کاتی ئەوەیە بچین بۆ لای کاترینا ئیڤانۆڤنا...

ڕاسکۆڵنیکۆف دەمێک بوو دەیویست بڕوات و خۆیشی هەر نیازی وا بوو یارمەتیی مارمیلادۆڤ بدات. دەرکەوت جەنابی تەنیا توانای قسەکردنی هەیە و بە زۆر دەتوانێت خۆی بە پێوە بگرێت، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە کێشی قورسی خۆی بەسەر کوڕە گەنجەکەدا دا. دەشیا دووسەد سێسەد هەنگاوێک ڕێ بکەن. دەتگوت تا لە ماڵ نزیکتر دەبوونەوە، دڵەڕاوکێ و ترس توندتر بەرۆکی پیاوە سەرخۆشەکەی دەگرت. زۆر دڵخورتانە ورتاندی:

– ئێستە ترسی من لە کاترینا ئیڤانۆڤنا نییە، تەنانەت ئێستە ترسی ئەوەشم نییە کە بەنیاز بێ چنگ بە قژمدا بکا و ڕایکێشێ! چش لە قژ!... قژی چی، کەشکی چی! خۆم ئەمە دەڵێم! چی لەوە باشتر، با لە بنڕا دەریبهێنێ، لەم شتانە ناترسێم... من... من لە چاوەکانی دەترسێم... ئەرێ... چاوەکانی... لەو پەڵە سوورانەی سەر ڕووخساری دەترسێم و... لەو هەناسەبڕکێیەشی تۆقیوم... بێگومان بینیوتانە سیلاوییەکان چۆن دەکەونە هەناسەبڕکێوە؟... بەتایبەت ئەو کاتانەی کە تووڕە بووبن... لە گریانی مناڵەکانیش دەترسێم... ئاخر، گەر سۆنیا نانی پێ نەگەیاندبن... نازانم چی دەبێ! بە ڕاستی نازانم چاریان چییە! لێدانیش من ناترسێنێ... ئەمە بزانە، کاکە گیان، ئەوە هیچ کە لێدان بۆ من ئازارێکی نییە، بگرە مایەی شادیشە... خۆ من بێ لێدان ناحەوێمەوە. لەوە باشتر هەر نییە. لێگەڕێ با لێم بدا، با دڵی ئاو بخواتەوە و دامرکێتەوە... لەوە باشتر نییە... گەیشتین، لێرانەیە. خانووی

کۆزیلەکان. کابرا قوفڵسازە، ئەڵمانییە! لە دەوڵەمەندەکانیشە.... بمبەنە ژووری!

لە ڕێگەی هاتنەژوورەوەی گۆڕەپانەکەدا وەژوور کەوتن و چوونە نهۆمی چوارەم. تا زیاتر سەر دەکەوتن، پلیکانەڕێکە تاریکتر دەبوو. ئیدی نزیکەی کاتژمێر یازدەی شەو بوو و گەرچی لەو وەختانەی ساڵدا، پیتەربورگ شەوی نییە[1]، کەچی سەرەوەی پلیکانەکان تەواو تاریک بوو. لە سەری سەرەوەدا، پاش دواهەمین پلیکان، گەیشتنە دەرگەیەکی بە دووکەڵسواخدراوی کراوە. ئیدی ژوورێکی لەوە هەژارانەتر بوونی نەبوو. درێژاییەکەی دە هەنگاوێک دەبوو و بنەمۆمێکیان تێدا داگیرساندبوو. هەر لە بەردەرگەکەدا دەکرا هەموو ژوورەکە ببینیت. هەموو شتێک شپرزە بوو، بەتایبەت جلەکۆنەی منداڵەکان. چەرچەفێکی شڕیان لە لایەکی ژوورەکەدا هەڵواسیبوو کە پێدەچوو لەپشتییەوە تەختەخەوێک هەبێت. ژوورەکەش هیچی تێدا نەبوو بێ لە دوو کورسی و قەنەفەیەکی پواو بە ڕووکێشێکی مشەماییەوە، لە بەردەمیشیدا مێزێکی بچووکی موبەق کە نە ڕەنگ کرابوو و نە چەرچەفێکی بەسەرەوە بوو. مۆمدانێکی تەنەکەییش لەلایەکی مێزەکەوە بوو کە بنەمۆمێکی بەسەرەوە بوو و خەریکی دواهەمین ترووسکەترووسکەکانی بوو. وا دیار بوو ژوورێکی تەواو لە بەردەستی خێزانەکەی مارمیلادۆڤدا بێت نەک تەنیا سووچێک، بەڵام ژوورەکەیان لە بنەڕەتەوە ڕێڕەوێک بوو. ئەو دەرگەیەی کە دەچووەوە سەر کونەمشکەکانی دیکەی خانووەکەی ئامالیا لیپیڤیخزیل، لاونیو بوو و لەپشت دەرگەکەشەوە هەراوهوریار و

---

١. پیتەربورگ بەهۆی هەڵکەوتەی جووگرافیی تایبەتییەوە، هاوینان تاریکیی شەو باڵی بەسەردا ناکێشێ و، هەواکەی بە درێژایی ماوەی شەوانەڕۆژ، یان ڕۆشنە یان وەک بوولێڵی بەیانیان وایە. لەبەر ئەوە، شەوانی سەرەتای وەرزی هاوین بە *شەوە ڕۆشنەکان* ناو دەبەن. «و. ف»

نەڕەنەڕ و قاقا دەهات. خەریکی یاریی وەرەق و چاخواردنەوە بوون و جاروباریش جنێوی پیس دەبیسترا.

ڕاسکۆلنیکۆف هەر لە بەردەرگەدا کاترینا ئیڤانۆڤنای ناسییەوە. ژنێکی هێندە داوەشاو بوو کە وێنای نەدەکرا، وەلێ دریژکۆلە و خۆشئەندام، هێشتا قژە خورماییە جوانەکانی مابوونەوە و هەر بە ڕاستی سەر کولمی پەڵەی سووری پێوە بوو. ژنە بە ژوورە بچووکەکەدا خەریکی سەر و خوارکردن بوو. لێوی قلیشابوو، هەناسەی سوار بووبوو و بە حاڵ دەردەهات و دەستەکانیشی بە سنگییەوە دەگوشین. بەهۆی تاوە چاوانی دەبریقانەوە، وەلێ نیگای تیژ و بێجووڵە بوو، تروسکایی ئەو بنەمۆمەی کە دەکەوتە سەر ڕووخساری سیلاوی و پەشێوی، وێنەیەکی جەرگبڕی دەئافراند. لە بەرچاوی ڕاسکۆلنیکۆفدا وەک سی ساڵەیەک دەردەکەوت و هەر جۆرێک بیرت لێ دەکردەوە، مارمیلادۆڤ هاوشانی ئەو نەبوو. کە چوونە ژوورەوە، هیچی نەبیست و بە هاتنیانی نەزانی. دەتگوت لە جیهانی نێوان خەو و بێداریدایە، نە هیچی دەبیست و نە هیچی دەدیت. وێڕای هەوای قورس و گەرمی ژوورەکە، پەنجەرەشیان نەکردبووەوە. پلیکانەکە بۆگەنی لێوە دەهات، کەچی دەرگەی ژوورەکە لەسەر پشت بوو. لە ژوورەکانی پشتەوەشڕا دووکەڵی تووتن هێرشی دەهێنایە سەر ژوورەکە و ژنەی سیلاویی دەخستە کۆکە، کەچی ژنە هەر دەرگەکەی پێوە نەدەدا. بچووکترین منداڵ، کچۆڵەیەکی کەم تا زۆر شەش ساڵە، بەسەر زەوییەوە خەوتبوو؛ خۆی گرمۆڵە کردبوو و سەری بە قەنەفەکەوە نابوو. کوڕێژگەیەکیش، یەک ساڵێک گەورەتر، بەدەم گریانەوە لە سووچێکی ژوورەکەدا کزی کردبوو و سەراپای هەڵدەلەرزی، وەک ئەوەی کە تازە لێدانی خواردبێت. کچۆڵەیەکی گەورەتری نزیکەی نۆ ساڵانیشی لێ بوو، وەک لوولەی نێرگەلە، کە

تەنیا شرە ژێرکراسێکی لە بەردا بوو، لەگەڵ پۆپەشمینێکی[1] تاڵکێشبوو بەسەر شانە ڕووتەکانییەوە. پێدەچوو دوو ساڵێک لەوەوبەر ئەو ڕووپۆشەیان بۆ دووریبێت، چونکە لەو ساتەدا بە زۆر تا سەر ئەژنۆکانی دەهات. ئەویش لە لایەکی ژوورەکە و لای برا بچووکەکەیەوە وەستا بوو و دەستە وشکە تەختەئاساکەی لە ملی ئاڵاندبوو و شتێکی بە گوێیدا دەورتاند. پێدەچوو بیەوێت کوڕێژگەکە هێور بکاتەوە و بەوپەڕی توانایەوە هەوڵی دەدا نەهێڵێ هەنسک بدات و هەمدیسان نووزەی بەرز بێتەوە و، هاوکات تۆقیوانە، بەو چاوە گەورە و ڕەشانەیەوە (کە لە ڕووخسارە چکۆلە و تۆقیو و لاوازەکەیدا، گەورەتریش دەیاننواند) وریای دایکی بوو. مارمیلادۆڤ نەچووە ژوورێ، بەرەو پێش پاڵی بە ڕاسکۆلنیکۆفەوە نا و خۆیشی هەر لەوێ، لە ئاستانەکەدا، کەوتە سەر ئەژنۆ. کاترینا ئیڤانۆڤنا کە چاوی بە کوڕە غەوارەکە[2] کەوت، لەبەردەمیدا بە حەپەساوی وەستا. پاشان، کتوپڕ هاتەوە سەر خۆی و وەک ئەوە وابوو لە خۆی بپرسێت ئاخۆ ئەو کوڕە لەوێدا چی دەکات. وەلێ وەک هەمیشە وای بە بیردا هات کە ئەویش کاری بە کەسێکی دی هەیە و دەیەوێت بە ژوورەکەی ئەواندا ڕابوورێت. بەم ئەنجامگرییە، ئیدی سەرنجی غەوارەکەی نەدا و چوو تا دەرگەی دەرەوە پێوە بدات... جا کتوپڕ چاوی بە مێردەکەی کەوت کە لەوێ کەوتووەتە سەر چۆک و ئەوسا شاتاندی:

– ئێێێێی! خۆ دواجار گەڕایەوە! ئەی شەیتانی نارەسەن!... کوا پارەکان؟ ئادەی گیرفانەکانت خاڵی کە! خۆ ئەمە جلەکانی خۆت نین! کوا جلەکانت؟ کوا پارەکان؟ قسە بکە، یەڵا!

---

١. پۆپەشمین: شەمەو؛ شەمەد؛ پێچەفێکی زۆر تەنک لە کەتان یان پەموو، کە هاوینان لە کاتی نووستندا بە خۆدا دەدرێت.

٢. غەوارە: غەریبە؛ بێگانە.

خۆی بەسەر مێردەکەیدا دا تا چاک بیپشکنێت. مارمیلادۆڤ، دەمودەست بە ملکەچی و قایلبوونەوە دەستەکانیی والآ کردن تا کاری پشکنینی گیرفانەکانی بۆ ژنەکەی ئاسانتر بکات. وەلێ گیرفانی یەک کۆپیکیشیان تێدا نەمابوو. ژنە هاواری کرد:

– ئەی کوا پارەکان؟ خوایاااا، یانی هەموویت دایە ئارەق؟ سندووقچەکەمان دوازدە ڕۆبڵی ڕێکی تێدا بوو!

کتوپڕ هەر وەک شێت دێوا و چنگی بە قژی مێردەکەیدا کرد و بە ژوورەکەدا ڕایکێشا. مارمیلادۆڤیش کارئاسانی بۆ کرد، کەساسانە لەسەر ئەژنۆ بەدوایدا دەخشا. لە بارێکدا کە قژی لە چنگی ژنەدا بوو و تەنانەت جارێکیشیان تەوێڵی کوتای بە زەویدا، هاواری کرد:

– دەبینن، چەندە چێژی لێ دەبەم! هیچ ئازارێکی نییە، واااا چێژ دەبەم، کاکە گیانم...

ئەو کچۆڵەیەی کە بەسەر زەوییەوە خەوتبوو، هایی بووەوە[1] و کەوتە گریان. کوڕیژگەکەش لە سووچەکەوە نەیتوانی بەر بە خۆی بگرێت، هەڵلەرزی، زریکاندی و تۆقیوانە، کە دەتگوت تووشی هەڵمەتی فێ بووە، خۆی هاویشتە باوەشی خوشکەکەی. کچە گەورەکەشی، لەنێوان خەو و بێداریدا، وەک بی کەوتە لەرزین.

ژنەی داماو لەوپەڕی بێهیواییدا هەر وا دەیقیژاند:

– ئەی خواایە، هەمووی خواردووە! تا دوا پەنابای داوە بە ئارەق! خۆ جلەکانیشی فەوتاندوون! ئەمانەش برسییانە! برسییانە!

ئاماژەی بۆ منداڵەکان کرد و دەستەکانیی هەڵگلۆفین:

– ئای، سندان لەم ژیانە نەفرەتییە دا!

---

١. هاییبوونەوە: بێداربوونەوە؛ بەئاگاهاتنەوە؛ هەستان لە خەو.

لەناکاو بەگژ راسکۆڵنیکۆفدا چوو:

– ئەی ئێوە! باشــە ئێوە تەریق نابنەوە کە لە مەیخانە هەســتاون و هاتوونەتە ئێرە؟ پێکەوە ئارەقتان خواردووەتەوە، ئەریَ؟ یانی هاوپیاڵەی بووی! ون بە لە بەرچاوم!

گەنجەکە نقەی لێوە نەهات و ویســــتی خێرا بۆی دەربچێت. لەم قەرقەشــەیەدا، دەرگەی ژوورەوەیان خســتبووە ســەر پشــت و چەند کەســێک بە کونجکۆڵییەوە ســەریان دەکێشــایە ژووریَ، بە پێکەنین و رووداماڵراوییەوە، جگەرە یان سەبیلبەدەم و شەوکڵاولەسەر، ملیان درێژ کردبووە ژوورەکەوە. دەکرا قەڵافەتکەلێک ببینیت کە جلوبەرگی کراوەی خەو یان پۆشــــاکی پانوپۆریـان لە بەردا بوو، هەندێکیش وەرەقەلەدەست. کاتێک مارمیلادۆڤ بەسەر زەوییەکەدا رادەکێشرا و هاواری دەکرد کە چێژ دەبات، ئەوانیش بە شـــــادییەکی تایبەتییەوە پێدەکەنین. تەنـانەت خەریـک بوون بەرەبەرە لارەلار دەهـاتنە نـاو ژوورەکە. دواجار هاوارێکی شـەیتانیی هەرەشـەئامێز بیسـترا، ئەمەیان ئیدی ئـامـالیـا لیپیڤیخزل بوو کە بەنێو دراوســـێکـانـدا رێی خۆی دەکردەوە و دەهاتە ژووریَ تا بە شـێوازی خۆی دۆخەکە سـەقامگیر بکاتەوە و ئیدی بە قسەی ناشیرین و جنێوی پیس و هەرەشەکانی، کە دەبێت ژوورەکە چۆڵ بکەن و بەیانی جێی بهێڵن، بۆ ســـەدەمین جار لەشــی ژنەی دەهێنایە لەرزین. راســکۆڵنیکۆف توانیی کاتی رۆیشــتن، دەست بە گیرفانیدا بکات و چەند سکە مسێک کە بە دەستییەوە هات و بـاقیی رۆبڵێکی مەیخـانەکە بوو، دەربهێنێت و بێدەنـگبێدەنگێـک لەسەر لێوار پەنجەرەکەی دابنێت. پاشان، کە گەیشتە پلیکانەکان، رای گۆڕا و ویستی بگەڕێتەوە.

لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *ئـای لەو گەمژەییەم! خۆ ئەوان سۆنیایان هەیە، ئەوە منم کە ئاتاجم!* بەڵام خۆیشی تێگەیشت کە ئیدی ئێســــتە ناکریَ بگەڕێتەوە و پارەکە هەڵبگرێتەوە و، ئەگەریش بکرێت،

ئەو کارەی لێ ناوەشێتەوە. دەستێکی ڕاوەشاند کە یانی پاشگەز بووەتەوە و بەرەو ماڵێ کەوتە ڕێ. کە هەنگاوی نایە سەر شەقامەکە، تیزخەندێکی چزووداری کرد: *ئاخر سۆنیاش سوورا و سپیاوی دەوێ دەی... خۆ پاکوخاوێنیش خەرجیی هەیە... ئمممم! وەلێ ڕەنگە ئەم سۆنیا گیانە ئەمڕۆ سوڵتاح نەکا، چونکە کارەکەی ئەویش هەوراز و نشێوی خۆی هەیە... ئاخر دەبێ داو بنێتەوە، بەدوای نێچیری چەورەوە بێ... بازرگانیی ئاڵتوونە ئیتر... کەواتە گەر ئەو پارەیەی من نەبێ، بەیانی نانەڕەقەشیان دەست ناکەوێ! هەی ئافەرین، سۆنیا خاتوون! ئەمانە چ مریشکێکی هێلکە ئاڵتوونییان پەروەراندووە و وا سوودی چاکیشی لێ دەبینین! هەر بە ڕاستی خەریکن نانی ئەو دەخۆن و بە لاشیانەوە ئاساییە! سەرەتا دوو دڵۆپە فرمێسکیان ڕشتووە و پاشانیش بەلایانەوە ئاسایی بووەتەوە! ئەم مرۆڤە چەپەڵە بە هەموو شتێک ڕادێ!*

فکر و خەیاڵ بردییەوە.

خۆنەویستانە بە دەنگێکی بەرز کە لە دەمی دەرچوو: *وەلێ ئەی ئەگەر بە هەڵەدا چووبم؟ ئەی ئەگەر مرۆڤ و هەموو ئادەمزاد و توخمی ئینسان، سووک و چەپەڵ نەبن؟ ئەوسا تاقە شتێک کە دەمێنێتەوە تەنیا دەمارگیرییەکی کوێر و کێویانەیە کە بە گوێماندا دراوە و، لە بنەڕەتەوە، هیچ بەربەستێکیش لەئارادا نییە. ڕاستییەکەشی هەر ئەوەیە!...*

## سێ

ڕاســــکۆڵنیکۆف بۆ ڕۆژی دواتر درەنگ خەبەری بووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خەوێکی پەرێشانی هەبوو و هێشتا نەهاتبووەوە سەر خۆی. گرژ و مۆن و تووڕە چاوەکانیی هەڵهێنان و بە بێزارییەوە ســـەیرێکی ژوورەکەی کرد، لەوپەڕی خراپیدا بوو. چواردیوارییەکی بچووک بوو بە درێژایی شەش هەنگاو و کاغەزدیوارییەکی هەڵوەریوی تۆزاوی کە زەرد دەچووەوە و بنمیچێکی هێنـدە نزم کە قوڕی بەســــەر هەر کەسێکدا دەکرد کە بالای بەرز بێت، ئاخر لە هەر ساتێکدا بۆی هەبوو سەرت بەری بکەوێت. ناوماڵەکەشی شتێکی لەم دۆخە نەگەڕابووەوە: ســێ کورســیی شــەقوشــڕ کە پێویســتییان بە چاککردنەوە هەبوو، مێزێکی ڕەنگکراو لە لایەکی ژوورەکەوە کە تێنووس و پەرتووکی بەسەردا پەرش کرابوون (چینە تۆزی سـەر تێنووس و پەرتووکەکان هاواری دەکرد کە چەندان ڕۆژە دەستیان بەر نەکەوتووە) و دواهەمین کەرەســــتەش کە قەنەفەیەکی گەورەی بێکەڵک بوو و نیوەی پانتایی ژوور و دیوارەکەی داگیر کردبوو. ئەم قەنەفەیەی کە ڕۆژانێـک بەرگێکی گوڵداری هەبوو و ئێســـتاکەش ئەو بەرگە شـــڕوشـــیتاڵی دەرهـاتبوو، بە تەختەخەوی گەنجەکە دەهـاتە ئەژمـار. زۆربەی کـات، بەبێ جلگۆڕین و بێ پێخەف خۆی بەســــەر قەنەفەکەدا دەدا و پاڵتۆ تاڵکێشبووەکەی سەردەمی خوێندکاریی لە خۆیەوە دەپێچا. سەریشی دەخســتە ســەر پشــتییەکی بچووک و هەرچی جلی لەبەرکراوی پیس یان پاکی هەبوو، دەیئاخنییە ژێر پشــتییەکە تا ژێرســەری بەرزتر بێت. مێزێکی گچکەش لەبەردەم قەنەفەکەدا بوو. ئیدی دوور بوو پیاو لەمە

زیاتر تووشی نەداری ببێت یان هێندە داماوانە بژی، وەلێ ڕاسکۆلنیکۆف لە بارێکدا بوو کە ئەم شتانە بێتاقەتیان نەدەکرد و تەنانەت پێدەچوو بەلاشییەوە ئاسایی بن. وەک کیسەڵێک لە قەپاغی خۆیدا کزی کردبوو و لە خەڵکی دابڕابوو. تەنانەت هەر ئەوەندە بەس بوو کە خزمەتکاری بیناکە کە ئەرکی ئەوە بوو بەو ڕابگات و جاروبار سەرێکی لێ بدات، ببینێ تا ڕەنگی زەرد ببێت و لەرزی لێ بنیشێت. ئەو دەروونشێواوانەی کە نەخۆشیی واسواسییان هەیە و هەموو بیر و هۆشیان لە بابەتێکی تایبەتدا چڕ دەکەنەوە، تووشی ئەم بارانە[1] دەبن. دوو حەفتەیەک دەبوو کە خاوەنماڵ خواردەمەنیی بۆ نەناردبوو و ڕاسکۆلنیکۆفیش گەرچی لەم ماوەیەدا بە برسییەتی سەنەری نابووەوە، کەچی هێشتا ئەوەی بە مێشکدا نەهاتبوو کە دەبێت بچێتە خوارێ و بابەتەکە لەگەڵ خاتووندا چاروبڕ بکات. ناستاسیا، چێشتلێنەر و تاکە خزمەتکاری خاوەنماڵ، تا ڕادەیەک لەم بارە شێتانەیەی کرێچییەکە ڕازی بوو و تەنانەت ئیدی ژوورەکەشی خاوێن نەدەکردەوە، مەگەر تەنیا گسکێکی ئاسایی، کە ئەویش خەمساردانە بوو و هەندێک جاریش حەفتەیەک زیاتری پێدەچوو تا لێی بدات. ئێستاکەش هەر ئەم ناستاسیا خاتوونە بوو کە بە ئاگای هێنا و بە بناگوێیدا قیڕاند:

– هێی! وا نیوەڕۆیە! چایم بۆ هێناوی! خۆ فنجانێ چایت دەوێ، ها؟ ئەوە چییە بوویتە پێستێک و چوار چڵ ئێسقان!

کرێچییەکە چاوی هەڵهێنا، ڕاچەنی و دواجار ناستاسیای ناسییەوە. هێواش و وەک ئەوەی ئێشی هەبێت، بە زۆر هەستایەوە و پرسیی:

– کێ چای ناردووە؟ خاوەنماڵ؟

– خەیاڵت خاوە!

---

١. بار: حاڵەت؛ دۆخ.

ناسـتاسـیا چایە کۆنەکەی لە قۆرییەکی ترەکیودا خسـتە سـەر مێزەکەی بەردەمی و دوو کڵۆ شەکری زەردبووشی خستە ناوییەوە.

کوڕەی گەنج کە لە دوێنێشـەوەوە بەو جلەوە خەوتبوو، دەسـتی بە گیرفانیدا کرد و مشتێک سکەی مسیی دەرهێنا:

– ها ناسـتاسـیا، ئەمانە بگرە تکایە. بچۆ نانم بۆ بکڕە. گەر بتوانی بڕێک باسترمە بکڕی زۆر باش دەبێ، گەر هەرزانەکەشی بکڕی ئەوە هەر زۆر باشترە!

– هەر ئێستە نانت بۆ دێنم، وەلێ ناتەوێ لەجێی باسترمە شۆربای کەلەرم بخۆی؟ خۆش بووە ها! دوێنێ لێم نا. بۆم خستییە لاوە، وەلێ دێر[1] گەڕایەوە. زۆر باش بووە.

کە شـۆربای کەلەرم گەیشـت، کرێچییەکە دانیشـت و دەسـتی کردە خواردنی، ناسـتاسـیاش لەتەنیشـتی و لەسـەر قەنەفەکە دانیشـت و دەستی کردە زۆربڵێیی. کچەتیوە لادێیی بوو و عاشقی چەنەبازی:

– پراسکۆڤیا پاولانا دەیەوێ لای پۆلیس شکاتت بکا.

گەنجەکە ناوچاوی گرژ کرد و گوتی:

– بۆچی پۆلیس؟ چیی دەوێ؟

– خۆ پارە نادەی، ژوورەکەش چۆڵ ناکەی! دەی ئیتر ڕوونە چیی گەرەکە!

گەنجە ددانەڕیکەی کرد و لەژێر لێوەوە بۆڵاندی:

– دە فەرموو، هەر ئەمەمان مابوو! ئێسـتە کاتی ئەوە نییە!... جا لەنێو ئەم بگرەوبەردەیەشدا...

---

١. دێر: درەنگ.

بە دەنگی بەرز لەسەری ڕۆیشت.

– بە ڕاستی ئەم ژنە گەمژەیە! خۆم ئەمڕۆ سەرێکی لێ دەدەم و قسەی لەگەڵ دەکەم.

– ئەوە هیچ کە گەمژەیە. وەک ئەو شتەی کە لە منیشا هەیە. وەلێ تۆیەک کە شای ئاقڵانی بۆچی لیرە هەروەک گونی کەوتووی و کەڵکی هیچ کەس ناگری! پێشتر خۆ دەتگوت وانەی تایبەتی بە منداڵان دەڵێیەوە، ئەی ئێستە بۆ هیچ ناکەی؟

ڕاسکۆڵنیکۆف، خۆی مۆن کرد و بە بێزارییەوە وەڵامی دایەوە:

– وا خەریکی هەندێ کارم...

– هەندێ کار؟

– دەی کار ئیتر...

– چ کارێ؟

گەنجەکە ئێستێکی کرد و بەوپەڕی جددییەتەوە گوتی:

– بیرکردنەوە.

ناستاسیا لەناو پێکەنین پچڕا. لەو کەسە خۆشپێکەنینانە بوو کە ئەگەر بتخستبا پێکەنین، بەبێ دەنگ پێچی دەدایە خۆی و سەراپای بە چەشنێک دەلەرییەوە کە تەنانەت هەندێک جار دەڕشایەوە. دواجار توانیی بڵێ:

– ئەی ئەم بیرکردنەوەیە پارەیەکی چاکیشی تێدایە؟

– کە پێڵاوت لە پێدا نەبێ چۆن بڕۆی وانە بە منداڵی خەڵکی بڵێیتەوە. تف لەم کارەش.

– ئەمە تفی هەورازە و شەق لە بەختی خۆت دەدەی.

– خۆ بۆ وانەی تـایبەتی پـارەیەکی وات نـادەنێ! دەی ئەو دوو پەنابایەش بە کەڵکی چی دێ ئاخر؟

شێوازی قسەکردنی گەنجەکە بە چەشنێک بوو کە دەتگوت خەریکە وەڵامی بیرکردنەوەکانی خۆی دەداتەوە، جا بە سەرکۆنەکردنیشەوە.

– وا بزانم بەتەمای لە پڕێکدا ببیە کوڕێ، ها؟

ڕاســکۆڵنیکۆف نیگایەکی ســەیری تێکرت، ئێســتێکی کرد و کتوپڕ لێبڕاوانە وەڵامی دایەوە:

– بەڵێ، بەتەمای ئەوەم.

– هێواش کاکە، تۆزێ لەســەر خۆ! منت ترسـاند! ئەرێ نانەکەت بۆ بکڕم یان نا؟

– بە ئارەزووی خۆت!

– ئەی هـاوار، خۆ هەر بیریشــم نەبوو! دوێنێ کە لێرە نەبووی نامەت بۆ هات.

– نامە؟ بۆ من؟ لە کێوەیە؟

– ئەمەیـان نـازانم. لە گیرفـانی خۆمـدا ســـێ کۆپیکم داوەتە پۆستەچییەکە. خۆ دەمدەیەوە؟

ڕاسکۆڵنیکۆف زۆر خرۆشابوو:

– بۆ خاتری خوا بیهێنە! نامەکە بێنە! ئەی خوایە!

بۆ خولەکێک دواتر نامەکەی لە دەستدا بوو. سۆسەکردنەکەی راست بوو. لە دایکییەوە بوو، لە دەڤەرەکەیانەوە[1]. کە نامەکەی وەرگرت، ڕەنگی پەڕی. دەمێک بوو هیچ نامەیەکی پێ نەگەیشتبوو، وەلێ کتوپڕ هەستێکی دیکەش چنگی بە دڵیدا کرد.

– بۆ خاتری خوا بڕۆ، ناستاسیا. سێ کۆپیکەکەت هەڵگرە و بڕۆ. لێگەڕێ با تەنیا بم.

نامەکە بە دەستییەوە دەلەرییەوە، نەیدەویست لەبەردەم ناستاسیادا بیکاتەوە. حەزی دەکرد هەر خۆی و نامەکە بن. کە ناستاسیا چووە دەرێ، توند نامەکەی بە لێوییەوە نووساند و ماچی کرد. ماوەیەکیش لە ناونیشانی نێرەر و ئەو دەستخەتە بچووک و لارووێرە ئاشنایە راما؛ دەستخەتی دایکی ئازیزی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان کوڕەکەی فێری خوێندن و نووسین کردبوو. خاوەخاوێکی کرد. تەنانەت وا دیار بوو کە دەشترسێت. دواجار هەڵی پچڕی؛ نامەیەکی دووروودرێژ بوو، بە کێشی دووهێندەی نامەی ئاساییەوە. دەستخەتێکی ورد بەر و دوای دوو پەڕەی گەورەی پڕ کردبوو. دایکە نووسیبووی:

> ڕۆدیای ئازیزم، کوڕەکەم! دوو مانگ زیاتر بەسەر دواهەمین جاردا تێپەڕیوە کە نامەم بۆ نووسیبێت و ئەمەش نارەحەتی کردووم و تەنانەت هەندێ شەو فکر و داڵغەی ئەوە نامێڵێ خەوم لێ بکەوێ! وەلێ دڵنیام کە لەم بێدەنگییە نەویستراوەدا من بە گوناهبار نازانی! ڕۆدیای ئازیزم، کوڕەکەم! تۆ دەزانی کە چەندم خۆش دەوێی، من و خوشکەکەت، *دونیا*، تەنیا تۆمان هەیە. تۆ هەموو شتێکی ئێمەی! تاکە هیوای بۆ ئارامیی گیانمان! هەر خوا دەزانێ کە چیم چەشت کاتێ بیستم چەند مانگێکە وازت لە زانکۆ

---

[1]. لێکۆڵەرانی دۆستۆیفسکی باوەڕیان وایە کە مەبەستی ئەو لە زادگەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ، بێ گومان *ریازان*ـە کە سەد کیلۆمەترێک لە باشووری خۆرهەڵاتی مۆسکۆوە دوورە. «و. ف»

هێناوە، بەهۆی ئەوەی کە دەرەقەتی خەرجییەکەی نەهاتوویت و، لە لایەکی تریشـــەوە، ئیتر هیچ هەواڵێک لە وانەی تایبەتی و ئەو کاروبارانە نییە کە نانێکیان پێ پەیدا دەکەی! وەلێ من چۆن دەمتوانی دەســتت بگرم، جا بەو برە پارە ســەدوبیســت ڕۆبڵییە برانەیەی[1] ســـــاڵانەش؟ ئیتر ئەوە خۆت دەزانی، ئەو چواردە ڕۆبڵەی کە چوار مانگ لەمەوبەر بۆم ناردی، بە پاڵپشـــتیی ئەم برانەیە لە *ئافاناســـی ئیڤانۆڤیچ ڤاخرۆشـــینی* بازرگان و دراوســـێمانم وەرگرتبوو کە پیاوێکی دەســـتودڵباشـــە و هاوڕێی باوکیشـــت بووە. وەلێ تا ئەو کاتەی قەرزەکەمان پاک دەبێتەوە، بۆ وەرگرتنی برانەکە وەکالەتم بۆ کردووەتەوە. خۆیشـــم ناچار دانم بە خۆمدا گرت تا ئێســـتە کە ئیتر حســـێبەکەمان پاک بووەتەوە. بە درێژایی ئەم ماوەیە هیچ پارەیەکم نەبووە تا بۆتی بنێرم. وەلێ سوپاس بۆ خوا کە ئێستە شتێکم هەیە، ڕەنگە بتوانم پـارەیەک بنێرم. جـا هۆکـارێکی تریشـــمـان هەیە بۆ ئەوەی ســـوپاســـگوزاری بەخت و ناوچاوانمان بین، کەواتە دەمودەســـت بۆت ڕوون دەکەمەوە. ســـەرەتا ئەوەیە کە، ڕۆدیای ئازیزترینم، خوشـــکەکەت (شـــتی وات بە خەیاڵدا نایێ) وا مانگ و نیوێکە لەگەڵ مندا دەژی و ئیتر بڕیار وایە لێکیش جیا نەبینەوە. سوپاس بۆ خوا ئاستەنگەکان کۆتاییان هاتووە، بەس لە سەرەتاوە دەست پێدەکەم تا بزانی دۆخەکە چۆن بووە و تا ئێستە چ شـتگەلێکمان لێت شـــــاردووەتەوە. دوو مانگ و نیو لەمەوبەر کە نامەت بۆ نووســـیم و بیســـتبووت دونیا لە ماڵی *ســـڤیدریگایلۆڤ*دا هەموو جۆرە بەدئاکاری و بێڕێزییەکی پێ دەکرێ و داوای ڕوونکردنەوەی ڕێکوڕاستت لە من کرد، دەمویست بنووسم، وەلێ من دەشیا چی بنووســـــم؟ خۆ گەر هەموو بەســـــەرهاتەکەم بۆ بگێڕابایتەوە بە ئەگەرێکی زۆر وازت لە کار و ژیانت دەهێنا و خۆت دەگەیاندە ئێرە. بە پێیش بووبا هەر خۆت دەگەیاند، ئاخر من باش شارەزای

1. ئەو مووچەیەی کە دەوڵەت بە بنەماڵەی کارمەندی مردووی دەدات.

کەســـایەتی و هەســـتەکانی تۆم و دەزانم هەرگیز لێناگەڕێی ســـووکایەتی بە خوشـــکەکەت بکرێ. من دەشـــیا چی بکەم لە کاتێکدا کە هیچم لەدەســـت نەدەهات؟ جا بۆ من ئەوکات هەموو بەسەرهاتەکەم دەزانی؟ کێشەی سەرەکی لەسەر ئەوە بوو دونیا گیان پارســـاڵ کە وەک مامۆســـتای ماڵەوە لەوێ دامەزرا، وەک یارمەتی ســـەد رۆبڵ پێشـــەکیی وەرگرت (بەو مەرجەی مانگانە لەســـەر مووچەکەی لێی ببڕن) و هەر بە ڕاســـتی هیچ ڕێگەیەک نەبوو تا بەر لە دانەوەی قەرزەکەی، ئەو ماڵە جێ بهێڵێ. بۆ ئەوە پێشـــەکییەکەی وەرگرت (ئێســـتە ئیتر بە بێخەمی دەتوانم هەموو شتێکت بۆ باس بکەم، ئەی رۆدیا گرانقەدرەکەی من!) تا شەست رۆبڵ بۆ تۆ بنێرێ، ئاخر ئەو کاتانە زۆر بۆ پارە دامابووی. کە بۆم نووسیی ئەم پارەیە، پاشـەکەوتی دونیا گیانە، ڕاست نەبوو و تەنیا دەمویســـت تۆ ئاســـوودە بی. وا ئێســـتە خەریکم هەموو ڕاســـتییەکەت بۆ دەنووســـم، چونکە لە خوا بە زیـاد بێ وا دەرووێکمـان لێ دەکرێتەوە و دۆخەکە بـاش دەڵێ! تۆش دەبێ بزانی کە دونیا چەندە عاشقانە خۆشتی دەوێ و هەر بە ڕاستی دڵی خوشکەکەت لە زێڕە! ئەم بەڕێز سفیدریگایلۆفە سەرەتا هەر بە ڕاستی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دونیا گیاندا خراپ بووە و لەسەر مێزی نانخواردن دایمە تەشەری لێ داوە و قسەگەلێکی نەشیاوی بەرانبەر دونیا کردوون... نامەوێ باسی ئەم وردەکارییە بەئازارە بکەم، ئاخر دەترســـم لە کاتێکدا کە ئیتر هەموو ئەم شـــتانەمان تێپەڕاندوون، بە خورتوخۆڕایی بێتاقەتت بکەم. بە کورتییەکەی وێڕای هەڵسـوکەوتی خۆشـەویسـتیئامێزی مارفا پیترۆڤنای ژنی بەڕێز ســـڤیدریگایلۆف، هەروەها ڕێزی هەموو نیشـــتەجێیانی ماڵەکە بەرانبەر دونیا، کاتێ ئەم سفیدریگایلۆڤە تاسەی سەردەمی ئەفسەریی کردووە و بە گوزەیەک مەشرووبەوە بۆی دانیشتووە، ئیتر حاڵی دونیا زۆر خراپ دەبێ. بەس دەتوانی وێنای بکەی کە دوایی دەرکەوتووە توومەز ئەم خوێڕیلە گێژوویژە چـاوی بەدوای دونیـاوە بووە، وەلێ بە ڕق و توورەیی ئـارەزووەکەی

خۆی پەردەپۆش کردووە؟ ڕەنگە تەنانەت خۆیشـــی خەجاڵەت بووبێ کە بەو تەمەنەوە و لەنێو مـاڵومنـاڵـدا وەهـا خەیـاڵێکی نابەجێی کەوتووەتە ســەر و جا ئەوســا تووڕەییەکەی بەســـەر دونیادا ڕشتووە. ڕەنگە سـووکایەتی و تووڕەییەکەشـی بەرانبەر بە دونیا تەنیا بۆ شـــاردنەوەی ڕاســـتیی بەســـەرهاتەکە بووبێ لەوانی تر. بەهەرحاڵ، دواجار نەیتوانیبوو زیاتر خۆی بگرێ، جا زات دەداتە بەر خۆی و دەچێ بەدوای دونیـادا، ئەوســـا بە پێشنیارێکی ڕاشکاو و بێشەرمانە و دونیایەک بەڵێن کە ئامادەیە دەســت لە هەموو شـتێ بەر بدا و گوایە ئەو لەگەڵ خۆیدا بەرێ بۆ لادێیەکی تر یان تەنـانەت گەر بیەوێ بۆ هەندەران! دەتوانی وێنـای ئەوە بکەی کە دونیا کەوتووەتە چ ئەشـــکەنجەیەکەوە؟ خوشـکەکەت خۆ نەیتوانیوە دەمودەسـت واز لە ئیشـەکەی بێنێ، ئاخر هەر بە تەنیا مەسەلە پارە و کێشەی ماددی نەبووە. دۆخی مارفا پیترۆڤناشی لە بەرچاو گرتووە کە نەکا گومانی بۆ دروست ببێ و بە مەســەلەکە بزانێ و ئاژاوە بکەوێتە خێزانەکەوە. چونکە گەر قســـەوقســـەڵۆکێک بهاتبا ئارا، ئەوســـا دونیاش دەکەوتە زەلکاوی ڕســـوایی و، جا وەک دەشـــڵێن، دەتوانیت دەرگەی دەروازە دابخەی، وەلێ هەرگیز نـاتوانی دەرگەی دەمی خەڵکی دابـخەی! هەزار و یەک هـۆکـاری تـریـش لەئـارادا بـوون و کورتییەکەی ئەوەیە کە دونیـا لانیکەم تـا شـــەش حەفتەش نەیدەتوانی تەنانەت بیر لە جێهێشتنی ئەو ماڵە ترسناکە بکاتەوە. خۆت بـاش دونیـا دەنـاســـی، دەزانی کچێکی چەنـدە ژیر و قورسـوقۆڵە. بەرگەی خراپترین شـتەکانیش دەگرێ و تەنانەت لە تۆقێنەرترین هەلومەرجەکانیشـــدا زەین و بیری هێندە باش کار دەکەن کە لە بڕیاردانیدا ناشـــێوێ و دەزانێ کاری خۆی بکا. تەنانەت بۆ منێکیش کە دایمە پەیوەندیمان لەگەڵ یەکتریدا هەبوو و لە هەموو شـــتێکی ئاگاداری دەکردمەوە، هیچی لەبارەی ئەم بەســـەرهاتەوە نەنووســـی تا نەکا خەفەتی پێ بخۆم. دواجار بە دیوێکدا شـــکایەوە کە پێشـــبینیی نەدەکرا: مارفا پیترۆڤنا بە

هەڵکەوت دەبیســــتی کە مێردەکەی وا لە باخدا لەبەردەم دونیا گیـانـدا کەوتووەتە پـاڕانەوە و بە کورتییەکەی هەڵە تێـدەگـا و دەیکاتە ســـــووچی دونیا و وای بۆ دەچێ کە هەموو شــــتێ لە ژێرسەری ئەودایە. وای کە هەر لەوێ و لە باخەکەدا چ گۆبەنێک نراوەتەوە و هەرچەند دونیا هەوڵی دابوو لە ڕاســتیی بابەتەکەی تێبگەیەنێ، کەچی تەنانەت ئامادە نەبووە یەک وشــەش ببیســتێ. جا خۆشــی دەیکاتە شــاتەشــات و پڕ بە گەرووی بەســـەریدا دەقیژێنێ و دواجاریش بڕیار دەدا دونیا بگەڕێنێتەوە لای من، جا بە ســووک و ڕسـوایی و بە سـواریی عەرەبانەیەکی ڕەعیەتەکان، کە کەلوپەل و جل و لێفە و شـــــتەکانیان فڕێ دابوونە ناوی و، کچەی داماوی بێگوناح، جنێوپێدراو و ئاوڕووتکاو ناچار دەبێ لە بەر بارانێکی بەلێزمەدا یازدە کیلۆمەتر لەگەڵ عەرەبانەلێخوڕێکی لادێییدا بە ســواریی عەرەبانەیەکی بێســابات ببڕێ و بێتەوە ماڵ! ئێستە بیری لێ بکەوە، لە وەڵامی نامەکەی دوو مانگ لەمەوبەری تۆدا، دەشــیا چی بنووســـم؟ دەبوو باســـی چیت بۆ بکەم؟ خۆم گەلێک تێکشــکاو و هیواڕاو بووم و زاتیشــم نەبوو ڕاســتییەکەی بە تۆ بڵێم تا نەکا بێتاقەت ببی و خەم و خەفەت داتبگرێ، ئەی ئازیزترینەکەم! خۆ هیچیشــت لەدەســت نەدەهات و هەر بە تەنیا خۆت دەخواردەوە، بێ لەوە، دونیا گیانیش ســـوێندی دابووم کە باســـــی نەکەم. بە کورتی، وەهـا داخێک بە دڵمدا چووبوو کە نەمـدەتوانی هەســـــتم و بە قســـــەی گاڵتەجاڕانە کاغەزەکە پڕ بکەمەوە. یەک مانگی تەواو، سەرانسەری شار، پاشەملە باسیان دەکردین و وای لێهـات کە من و دونیـا لەبەر ســــــەیرکردن و چەقچەقی پڕ لە ســـــووکایەتی و لۆمەیان تەنانەت نەتوانین بچینە کڵێســـا و دوعا بکەین. هەندێکیشــیان ڕووبەڕوو زۆر ئاســـایی و بەوپەڕی ڕووقایمییەوە قســـــەی خۆیانیان دەکرد. ناســـــیاوان خۆیان تێنەدەگەیاندین و تەنانەت بەرەبەرە لە شـــــەقامدا وەڵامی سڵاویان نەدەدایەوە. پاشانیش تێگەیشتم کە چەند وردەکاسب و فەرمانبەرێک دەیانویســـــت ســــــووکایەتیمان پێ بکەن و قیر لە

دەرگەکەمان بسـووون[1] و، بە کورتی، وای لێ هات خاوەنماڵ کەوتە هەڵاوهوریا تا جوابمان بکا و ماڵەکە چۆڵ بکەین و بڕۆین. هەموو ئەم چارەڕەشیانەش لە سایەی مارفا پیترۆڤناوە بوون کە لە هەموو شـوێنێ دادەنیشـت و هەرچیی بە دەمدا دەهات، بە دونیای دەگوت. مارفا پیترۆڤنا کەم تا زۆر هەموو خەڵکی شـار دەناسێ و ئەو مانگەش ڕۆژ نەبوو نەیێتە شار. جا حەزیشی لە زۆربلێییە، بەتـایبەت گەر لەبـارەی مـاڵ و ژیـان و مێردە ئازیزەکەیەوە بێت. خۆ ئەوە لای هەر کەسێ خراپەی مێردەکەی دەڵێ و، خوا دەزانێ کە، ئەم کارە گوناحە. بەهەرحاڵ، زۆر زوو توانیی ئەم قسەڵۆکە نەک هەر تەنیا بە شاردا بەڵکە بە پەرتاپەڕی وڵاتدا بڵاو بکاتەوە. من خۆ لەپێ کەوتم و تووشـی نەخۆشـی بووم، بەس دونیا بەهێز بوو و بڕیا دەتدی کە چۆن لەبەرانبەر هەموو شتێکدا خۆی ڕادەگرت و تەنانەت دڵی منیشی دەدایەوە و ئەرخەیـانی دەکردمەوە کە هەموو ئەمـانە تێدەپەڕن و دۆخەکە باش دەبێتەوە! فریشـتەیە، ئەم کچە! ئاقیبەت خوا بەزەیی پێماندا هـاتەوە و ئـازارمـان دوایی هـات، چونکە وا دیـار بوو بەڕێز سـڤیدریگایلۆڤ دووبارە بە خۆیدا چووەتەوە و تۆبەی کردبوو. وا بزانم دڵیشی بە سۆنیا سووتابوو کە ئاوها توانیی بە بەڵگە و پاساو مارفا پیترۆڤنا ڕازی بکا کە سووچی دونیا نەبوو. بەڵگەی سەرەکیش نامەیەک بوو کە دونیا، زۆر دەمێک بەر لەوەی ئەوان لە باخەکەدا پێکەوە ببینێ، بە ناچاری بۆ بەڕێز سـڤیدریگایلۆڤی نووسـیبوو تا پێشـنیاری بەڵێنە شـاراوەکەی ڕەت بکاتەوە. دونیا کە ئەوێ جێ دەهێڵێ، نـامەکە هەر وا لای سـڤیدریگـایلۆڤ مابووەوە، لەو نامەیەدا دونیا بەوپەڕی تووڕەیی و ڕاشکاوییەوە، کە نیشـانی دەدات چەندەش لەسـەر دڵی گران بووە، سـەرکۆنەی هەڵسـوکەوتی بێشـەرمانەی سـڤیدریگایلۆڤ لەبەرانبەر مارفا

---

[1] ١. بەپێی لێکۆڵینەوەکانی *پاول مێلنیکۆڤ*، فەرهەنگناسـی سـەدەی نۆزدەیەم، قیرسووواندن لە دەرگەی ماڵ بە مانای بێئاوڕوویی کچی ماڵەکە بوو. «و. ف»

پیترۆڤنادا دەکات و بیری دەهێنێتەوە کە ئاخر بە ناخێری گیانی پیاوە و سەرپەرشتی خێزانێک دەکا. لە کۆتاییشدا پێی دەڵێ کە ئەوە ئەوپەڕی ناپیاوی و دڵڕەقییە کە ئاوها لەگەڵ کچێکی بێدەرەتان و چارەڕەشدا خراپ بێ و ئەشکەنجەی بدا. بە کورتییەکەی، ڕۆدیای ئازیزم، کوڕەکەم، ئەم نامەیە هێندە پاک و کاریگەر نووسراوە، کە یەکەمین جار خۆم خوێندمەوە، هەر خوا دەزانێ کە چۆن فرمێسک بە چاومدا هاتە خوارێ و هێشتاکەش ناتوانم بەبێ گریان یەک دێڕی بخوێنمەوە. هەڵبەتە؛ پاشانیش خزمەتکارانی ماڵەکە لە بەرژەوەندیی دونیادا شایەتییان دا، چونکە وەک دیارە، ئەوان زۆر زۆر لەوە زیاتریان دیبوو و بیستبوو کە سڤیدریگایلۆڤ بیری لێ کردووەتەوە. مارفا پیترۆڤنا سەرەتا بە جۆرێ دەحەپەسێ کە خۆی پێمانی گوت *ئەسڵەن کەوتبووە حاڵی مەرگەوە*، وەلێ ئیتر هیچ گومانێکی لەوە نەما کە دونیا گیانی ئێمە بێگوناحە. هەر لەبەر ئەوەیە کە بۆ سبەینێکەی، کە دەکاتە یەکشەممە، ڕاستەوڕاست چووەتە کڵێسا و کەوتووەتە سەر ئەژنۆ و بەدەم فرمێسکرشتنەوە لە خوا لالاوەتەوە کە توانای تێپەڕاندنی ئەو تاقیکردنەوە گەورەیەی بداتێ و یارمەتیی بدا تا قەرزەکەی لەئاست دونیادا پاک بکاتەوە. پاشان، بێ ئەوەی لەسەر ڕێگەکەیەوە سەردانی هیچ شوێنێکی تر بکا، یەکسەر هاتە لای ئێمە، هەموو شتێکی بۆ باس کردین و خوا دەزانێ چ شێوەنێکی نابووەوە و لەوپەڕی پەشیمانیدا دونیای گرتە باوەش و داوای لێبوردنی لێ کرد. هەر بەیانیی ڕۆژی هەمان یەکشەممە لای ئێمەوە ڕۆیشت تا لە دەرگەی یەک بە یەکی ماڵەکانی شار بدا و بەدەم گریانەوە باسی پاکی و چاکیی دونیا گیانی ئێمە بکا. دەیویست هەمووان لە نەفسبەرزی و هەست و هەڵسوکەوتی شکۆداری ئەم کچە ئاگادار بکاتەوە. هەڵبەتە وا دیار بوو تەنیا هەر بەمەندە ڕازی نییە، چونکە ئەو نامەیەشی نیشانی هەمووان دا کە دونیا گیان بۆ بەڕێز سڤیدریگایلۆڤی نووسیبوو، بە دەنگی بەرزبەرز دەیخوێندەوە و تەنانەت دەرفەتی دا لەسەریشی

ڕوونووس بکەنەوە (کە لام وایە ئەمەیـان زیـادەڕۆیی بوو). ماڵەوماڵکردنی شـــار چەند ڕۆژێکی خایاند و، ئاخر کەســـانێک هەبوون زیز بووبوون کە بۆچی ئەوانی پەڕانـدوون، جا دەبوو پێڕستێک لە ناوی ئەوانە بنووسـێ کە سەردانی نەکردوون و بە ســـەرە بچێتە لای هەموویـان. بە کورتی، مـارفـا پیترۆڤنـا کە دەچووە هەر شـــوێنێ، خەڵکی چـاوەڕێی بوون. تەنـانەت دەشـــیانزانی کە بڕیـارە چ ڕۆژێ و لە کـامە مـاڵـدا نـامەکە بخوێنێتەوە و، جا ئەوەش پێش دەهات کەسـانێک گەرچی پێشـتر چەنـدان جـار هەم لە مـاڵی خۆیـان و هەم لە مـاڵی هـاوڕێ و ناســیاوانیاندا نامەکەیان بیســتبوو، دیســـان بچنەوە ئەو ماڵە و دابنیشـــن و گوێ بگرنەوە. بە بۆچوونی تایبەتیی من بەشـــێکی زۆری ئەم بەزموڕەزمە نـاپێویســـــت بوو، وەلێ چی بکەین، کەســـایەتیی مارفا پیترۆڤنا وایە ئیتر. بەهەرحاڵ، ناوی دونیای لەو لەکەیە پاک کردەوە و بۆ تاهەتا پەڵەی ڕەشـی ئەم مەســـەلە پڕوپووچەی نـا بە تەوێڵی مێردەکەی خۆیەوە، کە تـاوانبـاری ســـەرەکیی بەســـەرهاتەکەیە. تەنانەت وای لێ هاتووە کە منیش بەزەییم بەو پیاوەدا دێتەوە. کابرا گێژوێژە، وەلێ پێویست نەبوو هێنـدە خراپ بەســـەریـدا بشـــکێنرێتەوە. لە لایەکەوە، دونیـا دەمودەســـت پێشـــنیاری زۆری بۆ کرا تا لە ماڵاندا وانە بڵێتەوە، وەلێ ئیتر هیچ کـامیـانی پەســـەنـد نەکردن. بە کورتییەکەی هەمووان دونیایان بردە ئاســـمان و حورمەت و ڕێزیان لێ نا. ئەمە و زۆر شـتی تر پێکڕا بە جۆرێ دۆخەکەیان بۆ گۆڕیین کە دەکرێ بڵێین خەریکە ژیـانمـان ئـاراســـتەیەکی تر وەردەگرێ. ڕۆدیای ئازیزم، کوڕەکەم، ئێسـتە دەمەوێ ئاگادارت بکەمەوە کە دونیا داواکارێکی هەیە و بە ئەرێش وەڵاممان داوەتەوە. ڕاســـتە بێ وەرگرتنی ڕای تۆ کارەکانمان ڕایی کردوون، وەلێ بەدووری دەزانم لە من و خوشکت نیگەران بی. خۆت کە لە هەلومەرجەکە تێگەیشـتی، دەزانیی کە نەدەکرا داوا بکەین جارێ ڕاوەسـتین و هەموو شـــتێ دوا بخەین تا وەڵامێ لە تووە بگا. هەر چۆنێک

بووه، تۆش له دوورڕا نەتدەتوانی داوەرییەکی زۆر ڕاست بکەی. مەسەلەکەش بەو جۆرەیە کە دەینووسم. ئەوەی ڕاستی بێ داواکارەکەی دوینا ڕاوێژکارێکی پلەبەرزی دادگەیە بە ناوی *پیۆتەر پیترۆڤیچ لوژن*، کە لە خزمە دوورەکانی ئەم مارفا پیترۆڤنایەیە و خودی مارفاش زۆری هەوڵ دا تا ئەم کارە سەر بگرێ. لوژن لەڕێی مارفا پیترۆڤناوە چەند ئاماژەیەکی کردبوو کە حەز دەکا ئێمە بناسێ. ڕۆژێکیان هاتە ئێرە، قاوەیەکی لەگەڵ ئێمە خواردەوە و میوانداریییەکی زۆر ئاوڕوومەندانەی لێ کرا. بۆ بەیانییەکەی نامەیەکی نارد و زۆر بە ڕێز و حورمەتەوە خواستی خۆی خستە ڕوو و داواشی کردبوو وەڵامێکی جددی و خێرای بدرێتەوە. کابرا بازرگانە، سەرقاڵی کارە و دایمەیش لە سەفەردایە و، جا لەبەر ئەوەی دەبوو خێرا بەرەو پیتەربورگ بکەوێتە ڕێ، دەیگوت بۆ ئەو هەر خولەکێک بایەخی خۆی هەیە. هەڵبەت ئێمەش لە سەرەتاوە زۆر حەپەساین، بە جۆرێ لە جۆرەکان شتەکان خێرا و چاوەڕوانینەکراو بوون. بە درێژایی ڕۆژ لەگەڵ دونیا سەرگەرمی ئەم مەسەلەیە و سەنگوسووکردنی بووین. پیاوێکی جێمتمانەیە و دەستی لە گیرفانی خۆیدایە؛ چەند کارێکی هەیە و بۆخۆی سامانێکی پێکەوە ناوە. جا، ڕاستە کە چلوپێنج ساڵی تەمەنە! وەلێ ڕوواڵەتێکی دڵنشینی هەیە و هێشتا بەردڵی ژن و شتی وا دەگرێ. بە کورتییەکەی زۆر ماقووڵ و شیاوە، گەرچی تەنیا ڕەنگە لە یەکەمین بەرکەوتندا وا دەربکەوێ کە وەک بڵێیت کەمێک مۆن و بەفیزە. ڕۆدیای ئازیزم، کوڕەکەم، دەبێ داوات لێ بکەم گەر هەر کات ئەوت لە پیتەربورگدا بینی (چونکە بێگومان لە داهاتوویێکی نێجگار نزیکدا یەکتری دەبینن) وەک خووی هەمیشەییت زوو داوەریی لەسەر نەکەی، ئاخر ئەم کەسە جۆرێکە و لەوانەیە بە یەکەمین بینین هێندە نەچێتە دڵەوە. هەڵبەتە تەنیا وەک پارێزێک ئەمەت پێ دەڵێم و، خۆم دەزانم کە لوژن کاریگەرییەکی باشت دەخاتە سەر. خۆی نەریتیش وایە کە هەر کەسێ بیەوێ کەسێکی تر بناسێ، دەبێ بە پارێز و

وریاییەوە هەنگاو بنێ، نەکا هەڵەیەکی لێ بوەشـــێتەوە یـان هەڵسوکەوتێکی دەمارگیرانە بکا، ئاخر دواتر ئەم جۆرە شتانە بە ئاسـتەم دێنەوە ڕاسـتە. بە کورتییەکەی زۆر شـت هەن نیشـانی دەدەن کە پیۆتەر پیترۆڤیچ لوژن کەســێکی جوامێرە. هەر لە سـەرەتاوە گوتی کە گەرچی ئەو خەریکی کاروکاسـبییە، وەلێ لە زۆر ڕووەوە، بە گوتەی خۆی، لەگەڵ *بیر و بۆچوونی نەوەی گەنجی ئێمەدا*[1] ناکۆک نییە و دژمنی ســـەرســـەختی هەر جۆرە دەمارگیری و خوڕافاتێکە. بە گشـــتی قســـەی زۆری کرد، جا، تۆزێکیش خۆپەســەند دیارە و لەوەش کە ببێتە دەمراسـتی کوڕ، چێژ دەبا، وەلێ دەی، خۆ ئەمە تاوان نییە. هەڵبەتە من ســەرم لە زۆربەی قسەکانی دەرنەکرد، وەلێ دونیا بۆمی ڕوون کردەوە کە گەرچی لوژن زۆری نەخوێنـدووە، بەس مرۆڤێکی زیرەک و نەرمونیانیش دیارە. خۆ خۆت باش خوشـکەکەت دەناسـی ڕۆدیا گیانم. کچێکە دەزانێ چی دەکا و ژیر و خۆڕاگر و قورسـوقوڵە، هەڵبەتە بە دڵێکی پڕ لە گوڕوتینەوە، کە من خۆم چاک شارەزاییم. لە پەیوەندییەکەی ئەواندا وەها عەشــقێک لەئارادا نییە، وەلێ خۆ دونیـا هەر بە تەنیـا کچێکی ژیر نییە، نەجیـب و پـاکیشـــە و بەختەوەرکردنی مێردەکەی بە ئەرکی خۆی دەزانێ. لوژنیش بەختەوەریی هاوسەرەکەی بە لاوە گرنگە و، خوا هەڵناگرێ، ئێمە شتێکمان لەودا نەدیوە کە پێچەوانەی ئەمە بسـەلمێنێ؛ سـەرەڕای ئەوەی خۆشـــم دانی پێدا دەنێم مەســـەلەکە زوو بڕایەوە. کابرا کەسـێکە سـەری لەنێو حسـێب و کتێبدایە و بێگومان خۆی باش تێدەگا کە دونیا گیان تا زیاتر لای ئەو بەختەوەر بێ، ژیانی ژن و مێردایەتیی خۆیشـــی بەختەوەرانەتر و پتەوتر دەبێ. لەبارەی دژیەکیی کەسایەتی یان خوو و نەریتی سەیروسەمەرەی دێرین یـان تەنـانەت نـاکۆکی لە بیروبـاوەڕدا (کە خۆت دەزانی، لە

---

١. ئاماژەیە بە بیر و باوەڕە نیهلیسـتییەکانی لاوانی ئەو سـەردەمە کە ڕەدکەرەوەی بوونی خواوەند، ڕۆح و تەنانەت بەها سوننەتییەکانیش بوون. «و. ف»

سـەرکەوتووترین هاوسـەرگیرییەکانیشـدا هەر دێنە پێش) دونیا گیان دەڵێ ئەوەیان با دابنرێ بۆ خۆی و نابێتە کێشـــە و تا ئەو کاتەی راسـتگۆیی و ویژدان لەنێوانیاندا بێ، دەتوانێ بســـازێ. ئەوەی راسـتی بێ لە یەکەمین دیداردا من لوژنم زۆر راشـکاو و رەق هاتە بەرچاو، وەلێ رەنگە ئەمە زیاتر لەبەر راسـتگۆییەکەی بێ و بێگومان هەر واشـــە! لە دووەمین دیداردا کە ئیدی داوای زەماوەندەکەی پەســـەند کرابوو، قســـە قســـەی بەدوادا هات و ئاماژەی پێ کرد کە تەنانەت بەر لە دونیاش نیازی وا بوو کچێکی رەسەن وەلێ بێ پاشتێلانە بهێنێ، یانی کەسێ بێنێ کە سارد و گەرمیی رۆژگـاری چەشــتبێ و پێزان بێ. بەدوایـدا گوتی کە هەڵبەتە مێرد نابێ لەژێر منەتی ژنەکەیدا بێ و زۆریش باشــە کە ژن، مێردەکەی بە سـەرووەری خۆی بزانێ. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێم کە بە میهرەبـانی و نەرمییەوە ئەمـانەی گوتن و... منیش لێرانەدا تەنیا بابەتی گشـتیی باســەکەم بیر دێتەوە، نەک کتومت رســـتەکانی لوژن. وا دیار بوو کە ئەم قســـەیەی لە گەرمەی گفتوگۆدا لە دەم دەرپەڕی و پێشـتر هیچ بیری لێ نەکردبووەوە. بەس دواتر هەوڵی دا راستی بکاتەوە و دەنگیی هێواشتر کردەوە، بەس بە بۆچوونی من هێشـتا هەر زۆر رەق بوو و ئەوەشـم بە دونیا گوت. کەچی دونیا کەمێک بێتـاقەتـانە وەڵامی دامەوە کە، *قســـە و کردەوە مەودایەکی زۆریان لەنێواندایە* و لاشـــم وایە قسەیەکی ماقووڵی کرد. دونیا گیان بەر لەوەی بڕیاری خۆی بدا، بە درێژایی شـــەو هایی بوو و وای دەزانی من خەوتووم. چەند جارێک لە خەو راچڵەکی و هەتا بەیانی ژوورەکەی پێوا. ئاقیبەت لەبەردەم کۆتەڵی پیرۆزدا کەوتە سـەر ئەژنۆ و تا ماوەیەکی زۆر لە دڵەوە دوعـای کرد. کە بەیـانی داهـات پێی گوتم ئیتر یەکلایی بووەتەوە. لە چەند دێڕێکی سـەرەوەدا بۆم نووسـییت کە پیۆتەر پێترۆڤیچ لوژن لەسـەر سـەفەرە بەرەو پیتەربورگ. چەند کارێکی

گرنگی هەن و بەتەمایە نووسینگەی پاریزەریش بکاتەوە[1]. دۆسیەگەلی زۆری دادگەشی لەژێر دەستدا بووە و هەیە و هەر چەند رۆژێک لەمەوبەر بوو کە لە دادگاییەکی گرنگدا سەرکەوتوو بوو. ئەوەی راستی بێ، دێتە پیتەربورگ، چونکە وا دیارە دۆسیەیەکی گرنگی لە ئەنجوومەنی پیراندا هەیە. رۆدیای ئازیزم، کورەکەم، ئەمانە لە هەر لایەکەوە بگری دەکرێ بۆ تۆ یارمەتییەکی گەورە بن. من و دونیا بەم ئەنجامە گەیشتووین کە تۆ هەر لەمرۆوە دەتوانی خۆت بە خاوەنی کاری تازە بزانی و ئیتر لەبارەی داهاتووی بوارەکەشتەوە بێخەم بە، تەنیا گەر خوا ویستی لەسەر بێ و هەموو شتێک بە خێر و خۆشی ببڕێتەوە. ئەمە بێ لە چاکە و بەخششی خواوەند بۆ خێزانەکەی ئێمە هیچی تر نییە. خۆ ئەم بابەتە هەموو بیر و هۆشی دونیای داگیر کردووە. ئەوەی راستی بێ بە جۆرێک لە جۆرەکان ئەمەمان بە گوێی پیۆتەر پیترۆڤیچیشدا داوە. ئەویش بە پارێزەوە دەستپێشخەریی کرد و گوتی هەڵبەتە کاری نووسینگە بەبێ سەرقەڵەم رایی نابێ و وا باشە پارە بدرێتە *خۆمانە* نەک بێگانە، بەو مەرجەی *خۆمانە* شارەزا و دڵسۆز بێ (جا لە تۆ دڵسۆزتری دەست دەکەوێ!)، وەلێ تەنیا خەمی ئەوەی بوو کە نەکا وانە و زانکۆ بە تەواوی کاتی تۆیان گرتبێ و دەرفەتی پەرژانە سەر کاری نووسینگەت نەبێ. ئێمە ئیتر لەسەری نەرۆیشتین، بەس خوێندن و داهاتووی تۆ بە تەواوی بیر و هۆشی دونیای داگیر کردووە. چەند رۆژێکە گرتوویەتی بەم مەسەلەیەوە و وا ئێستەش نەخشەی داهاتووتی کێشاوە و بە تێپەربوونی کات دەبیتە هاوکاری پیۆتەر پیترۆڤیچ و تەنانەت بەرەبەرە هاوبەشیش، بەتایبەت لەبەر ئەوەی کە خۆت وا یاسا دەخوێنی!

---

١. پارێزەریی تایبەتی دوای چاکسازییە یاساییەکانی سالی ١٨٦٤ هاتە ئارا کە لە رووسیادا بووە باو و لێرانەدا لوژینی هەلپەرست بەدوای قۆستنەوەی ئەم دەرفەتەوەیە. «و. ف»

بە تەواوی هاوڕایم و منیش لەلایەن خۆمەوە پڕ بە دڵ پاڵپشــتی ســـەرلەبەری ئەو ئاوات و ئارەزووانەم کە دونیا گیان بۆ تۆیان دەخوازێ. لام وایە، هەموو ئەمانە ڕێیان تێدەچێ. وێڕای تۆزێ خۆدزینەوەی هەنووکەیی (هەروەهـا شـــیاوی دەرکپێکردن)ی پیۆتەر پیترۆڤیچ، دونیا بڕوای وایە لەڕێی ئەو کاریگەرییە باشەی کە دەیخاتە سەر مێردی داهاتووی، بە هەموو ئەم شتانە دەگەین و گەلێکیش گەشـــبینە! هەڵبەتە هۆشـــمان لای ئەوەش بوو کە خوانەخواسـتە شـتێک لەم فکر و خەیاڵانەمان لەبەردەم خودی پیۆتەر پیترۆڤیچـدا لە دەم دەرنەچێ، بەتـایبەت لەبـارەی بەشـداریکردنی تۆ لەگەڵیدا لە کاری یاسـا و مافدا. ئاخر دەزانی چۆنە، ئەو کەسـێکی تەواو بەحسـێبوکتێبە و ڕەنگە ئەمە بە خەیاڵپلاوییەکی پووچ بزانێ و ئەوەندەش کەیفی پێی نەیێ. بەپێی ئەم سیاسـەتە، نە من و نە ئەو، لەم بارەیەوە یەک وشـەشـمان لای لوژن نەدرکاند کە چەندە هیواداریین بۆ دابینکردنی خەرجیی خوێندنەکەی تۆ یارمەتیمان بدا. لەبەر دوو هۆکاریش هیچمان نەگوت. یەکەمیان ئەوەیە کە هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە هەر وا دەبێ و ڕەنگە لوژن خۆی بە کورتی و پووختی وەها پێشـنیارێ بکا (تۆ بڵێیت ئەو قسەی دونیا گیان بشکێنێ!)، بە ئەگەرێکی زۆر تۆ لە نووسینگەدا دەبیتە دەستەڕاستی و ئەمە ئیتر بە یارمەتیی ماددی حســێب ناکرێ، بەڵکە مافێکی ڕەوای خۆت دەبێ. دونیا گیان دەیەوێ بەم جۆرە کارەکان بچنە پێش و منیش بە تەواوی لەگەڵ خوشـکەکەتدا هاوڕام. دووەمین هۆکاریش ئەوەیە کە من سـوور بووم لەســـەر ئەوەی تۆ و لوژن لە یەکەمین دیدارتاندا هاوشـــان بن. دونیا لای پیۆتەر پیترۆڤیچ تاریفی[1] تۆی دەدا و ئەویش دەیگوت بۆ ناســـینی مرۆڤەکان دەبێ خۆت بەتایبەت لە نزیکەوە چـاوت بە بەرانبەرەکەت بکەوێ و زیـاتریش وای پێ باشــە کاتێک تۆی بینی، خۆی بڕیارت لەســـەر بدا. لە لایەکەوە،

١. تاریفدان: ستایشکردن؛ پیاداهەڵدان؛ باسکردن بە چاکە.

ڕۆدیـای ئـازیزی من، ئەی گرانقەدرترینەکەم، بە هەزار و یەک هۆکار لام وایە (هەڵبەتە هیچیەک لەم هۆکارانە پەیوەندییەکیان بە پیۆتەر پیترۆڤیچەوە نییە و هۆکاری تایبەتیی منن و لەوانەشە تەنیا بیروخەیاڵ و بروبیانووی پیریژنێک بن و بەس) باشـــترە کاتێک ئەوان زەماوەندیان کرد، نەچمە لایان و بە تەنیا بۆ خۆم بژیم. لەوەدا گومانم نییە کە بە ڕێز و شـانازییەوە خوڵکم دەکا و دەڵێ بڕیار نییە هەرگیز لە کچەکەتـان جیا ببنەوە. ئەگەریش تـا ئێستە هیچی نەگوتووە، ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە هیچ پێویست نەبووە باسی ئەو مەسەلە ڕوونە بکرێ. بەس ئەوەی ڕاستی بێ، تەنانەت ئەگەر بشیڵێ من هەر قەبووڵی ناکەم. چون چەندان جار دیومە کە زاواکان، لە ناخی دڵەوە کەیفیان بە خەســــووەکانیان نەهاتووە. خۆ منیش بە هیچ جۆرێک نامەوێ ببمە سەرباری هیچ کەســێک و وام پێ باشـــە بە ئازادی بژیم، لانیکەم تا ئەو کاتەی نانەڕەقەیەکم هەیە بیخووســــێنم و منالانێکی ئازیزی وەک تۆ و دونیا گیان. ئەگەر بکرێ، لە شوێنێک دەژیم کە لە هەردووکتانەوە نزیک بم… ئاخر، ڕۆدیا گیانم، باشترین بەشم خستووەتە کۆتایی نامەکەوە! ڕۆدیای ئازیزم، کوڕەکەم، ئایا دەزانی کە ڕەنگە زۆر زوو، هەمدیســـان پێک شـــاد ببینەوە و دوای ســـێ ســـاڵی ڕەبەق دووری، یەکتری لە باوەش بگرینەوە! ئەوە بڕیارێکی بنجبڕانەشی لەســـەر دراوە کە من و دونیا بێینە پیتەربورگ. کتومت کاتەکەی نـازانم، وەلێ هەر بەم زووانە… ڕەنگیشـــــە هەر لەم حەفتەیەدا. جـارێ هەموو شـــــتێ بە بەرنـــامەی پیۆتەر پیترۆڤیچەوە بەســـــتراوەتەوە. بڕیار وایە هەر کە لە پیتەربورگ کۆڵ و باری خســـــت، هەواڵمـان بۆ بنێرێ. ئەویش لەبەر هۆکـاری خۆی، تامەزرۆیە و دەیەوێ کات بەفیڕۆ نەدا و ڕێوڕەســـــمی زەماوەند لە یەکەمین دەرفەتی دوای ڕۆژووی مـانگی هـاوین بەڕێوە ببـا، یانیش ئەگەر نەکرا، دەمودەست دوای جەژنی هەڵکشانی مریەمی

پیرۆز[1]. ئای من چەندە بەوە دڵخۆشـــم کە بڕیارە بتگوشـــم بە دڵمەوە! دونیا هێندە تاســـەی دیداری تۆیەتی کە ســـەرەوتی لێ بڕاوە و تەنانەت جارێکیشـــان بە گاڵتەوە گوتی هەر ئەو تاقە هۆکارەی بەســـە تا زەماوەند لەگەڵ پیۆتەر پیترۆڤیچدا بکا! فریشـــتەیە، ئەم دونیایەی ئێمە! خوشـــکت نەیویســـت هیچت بۆ بنووسێ و تەنیا دەڵێ ئەوەندە قسەی پێیە بۆت و قسەکانیشی ئەوەندە زۆرن کە ئەسڵەن بۆ ئەوە ناشـێن دەســت بداتە قەڵەم. ئاخر خۆ ناتوانی بە چەند دێڕێک هەموو قسەکانت بکەی و تەنیا خۆت بێتاقەت دەکەی. دەڵێ لەلایەن منەوە بۆی بنووســـە لە باوەشی دەگرم و ماچی بێژماری بۆ دەنێرم. ڕاستە کە زۆر زوو بە یەکتری شـاد دەبینەوە، وەلێ دەمەوێ هەر لەم ڕۆژانەدا، هەر چەندە بوو، پارەت بۆ بنێرم. ئێستە کە هەمووان زانیویانە بڕیارە دونیا گیان ببێتە ژنی پیۆتەر پیترۆڤیچ، کتوپڕ سەنگی منیش بەرز بووەتەوە و ئێســـتە ئیتر دڵنیام کە ئافاناســـی ئیڤانۆڤیچ بە پـاڵپیشـــتیی برانەکەم، لانیکەم حەفتـاوپێنج ڕۆبڵێکم دەداتێ و دەتوانم بیســتوپێنج یان تەنانەت هیچ نەبێ ســی ڕۆبڵت بۆ بنێرم. گەر لەبەر خەرجیی سەفەرەکەمان نەبا ئەوە زیاترم بۆ دەناردی. هەڵبەتە پیۆتەر پیترۆڤیچ بەشـــێک لە خەرجیی ســـەفەرەکەی پیتەربورگمانی لە ئەستۆ نا و خۆی پێشـنیاری کرد کە جانتاکان و ســـنـدووقە گەورەکەمـان لەڕێـی یەکێـک لە هـاوڕێ و ناســـیاوەکانییەوە بنێرێ، وەلێ دەبێ پارەیەک وەلا بنێین تا هیچ نەبێ بەشـی چەند ڕۆژی ســەرەتامان بکا. خۆ ناکرێ بە گیرفانی خـاڵییەوە بێینە پیتەربورگ! هەروا بێتەوە، من و دونیـا گیـان دانیشـتین و ورد و درشـتیمان حسـێب کرد و تێگەیشـتین بڕیار نییە خەرجیی ئەم سەفەرە ئەوەندەش زۆر بێ. لە ماڵی ئێمەوە تا ئێســـتگەی شـــەمەندەفەر تەنیا نەوەد کیلۆمەترە و بۆ ئەوەی

---

[1]. لەســەر بنەمای ڕۆژژمێری کلێسـای ئۆرسـۆدۆکس، ئەم جەژنە دەکەوێتە پازدەی ئابەوە و بەر لە بەڕێوەچوونی، دوو حەفتە ڕۆژوو دەگیرێ. «و. ف»

تووشـــی هیچ کێشـــەیەک نەبین، هەر لە ئێســـتەوە لەگەڵ گالیســـکەوانێکی ناســـیاو ڕێک کەوتووین. لەوێش بەدواوە لەگەڵ دونیا گیان لە فارگۆنی نمرە ســـێدا بە خۆشـــی ڕایدەبوێرین تا دەگەین. هەر لەبەر ئەوەش دەتوانم نەک هەر تەنیا بیســـتوپێنج ڕۆبڵ، بگرە ســـی ڕۆبڵیشـت بۆ بنێرم. دەی، لام وایە ئیتر بەسـەـ؛ دوو پەڕەی گەورەم هەر لە ســـەرەوە تا خوار ئەمدیو و ئەودیو ڕەش کردەوە و ئیتر شوێنی بەتاڵ نەماوە؛ هەموو ئەوەم نووسی کە بۆمان پێش هاتبوو و، ئای کە چەندە قســـەی نەگوتراویشـــم ماوە! ئێستە ئیتر، ڕۆدیای ئازیزترینم، کاتی دیدارمان، کە زۆریش نزیکە، بە باوەشـــمەوە دەتگوشـــم و دوعای خێرت بۆ دەکەم. ڕۆدیای ئازیزم، کوڕەکەم، عاشـــقانە خوشـــکەکەتت خۆش بوێ، وەک چۆن ئەویش هەر وا تۆی خۆش دەوێ. بزانە کە بێڕادە تۆی خۆش دەوێ و تەنانەت زیاتر لە گیانیشـــی. فریشـــتەیە ئەم دونیـایەی ئێمە. ئەوە تۆش هەموو شـــتێکی ئێمەی، ڕۆدیـای ئازیزترینم؛ تۆ هیوا و سرەوتی گیانی ئێمەی. ئەگەر تۆ بەختەوەر بی، ئێمەش بەختەوەرین. ڕۆدیـای ئـازیزم، کوڕەکەم، ئـایـا تۆ هێشـتاکەش هەر دوعاکانت دەکەی؟ هێشـتاش بڕوات بە سـۆز و بەخشندەیی پەروەردگار و ڕزگارکەرەکەمان هەیە؟ ترسی ئەوەم لە دڵدا نیشـــتووە کە نەکا بێباوەڕیی ئەم ســـەردەمە تۆشـــی گرتبێتەوە؟ جا ئەگەر وا بی، کوڕەکەم، ئەوا دایکت دوعـات بۆ دەکـا. ڕۆدیـای ئـازیزم، کوڕەکەم، بیرتە ئەو کـاتـانەی کە منـاڵ بووی و هێشـــتا باوکت زیندوو بوو، لەســـەر ئەژنۆکانی من دادەنیشتی و بەو ئاوازە منالانەیەتەوە دوعاکانتت دەکردن و وای کە ئەوســـا هەموومان چەندە بەختەوەر بووین! خوا ئاگاداری تۆ بی، یان ئەوەی کە بەهیوای دیدار بەم نزیکانە! توند لە باوەشـــت دەگرم و ماچی بێژمارت دەکەم.

دایکت بە قوربانت

*پولخیریا*

ئەو ساتەی ڕاسکۆڵنیکۆف دەستی بە خوێندەوەی نامەکە کرد، هەر لە یەکەم دێڕەوە ڕووخساری بە فرمێسک خووسا، بەڵام کە گەیشتە کۆتاییەکەی، ڕەنگی ڕووی پەڕی، ڕووخسار کرژ بوو و ژارخەنێکی قورس کەوتە سەر لێوی. سەری خستە سەر پشتییە کۆنە و تەنکەکەی و کەوتە فکر و خەیاڵەوە و ماوەیەک داڵغەی لێدا. دەتگوت دڵی وا لە سنگییەوە دێتە دەر و مێشکی جەنجاڵ بوو. دواجار دەتگوت لەتاو تەنگیی ئەو ژوورۆچکە داڕزیوەیە کە زیاتر لە سندووق یان دۆلابچەیەک دەچوو کە هەناسەی سوار بوو. هەم چاو و هەم مێشکی پێویستییان بە کەشێکی کراوەتر بوو. پڕی دایە کڵاوەکەی و چووە دەرێ. ئەم جارەیان ئیدی باکی بە بینین یان نەبینینی هیچ کەسێک لە پلیکانەکاندا نەبوو و بە گشتی ئەو بابەتەی بیر چووەوە. بە پەلە و جۆرێک کە وەک ئەوەی کارێکی فرە گرنگی هەبێت، لە ڕێگەی شەقامی *وازنی‌سێنسکی‌*یەوە بەرەو دوورگەی *واسیلیێفسکی* چوو، بەڵام وەک هەمیشە، هۆشی لەسەر ڕێگەکەی نەبوو. لەژێر لێوەوە دەیورتاند و تەنانەت جاروباریش بە دەنگی بەرز خۆی دەدواند و ڕێبوارانی سەرسام دەکردن. بێگومان وایان دەزانی کابرا سەرخۆشە.

## چوار

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە خوێندنەوەی نامەکەی دایکی تەواو بێتاقەت بوو. تەنانەت لەو کاتەش کە خەریکی خوێندنەوەی نامەکە بوو، باش دەیزانی چی لەئارادایە و دەستبەجێ لە زەینی خۆیدا بابەتەکەی بڕاندبووەوە... هەموو قسەی ئەوەندە بوو کە *ئەمانە مەگەر بەسەر تەرمی مندا ڕابوورن و زەماند بکەن؛ چاوی کاکە لوژنیش دەرهات!*

بەدەم بزەیەکی تاڵەوە و لە بارێکدا کە پێشوەختە تامی شیرینی بڕیارەکەی دەچەشت، لەژێر لێوەوە گوتی: *هەموو شتێ وەک ڕۆژ ڕۆشنە... نەخێر، دایە گیان! نەخێر، دونیا خاتوون! ناتوانن مەمکەمژە لە دەمی من بنێن! تۆ تەماشا، ئەم خاتوونانە داوای لێبوردنیشیان کردووە کە ڕای منیان وەرنەگرتووە و بەبێ من هەموو شتێکیان بڕاندووەتەوە! ئەوە منیش بە ئەگەرێکی زۆر ڕازیم و هیچ لارییەکم نییە! وایان زانیوە کە ئیتر ڕێی تێناچێ ئەو بەڵێن و قەرارە تێک بدرێ. جا دەیبینین! تەماشا ئەو پاساو و بیانووانەی کە دایانتاشیون کە بە حساب پاکانەی پێ بکەن! خۆیانواتەنی سەوداکارە و سەرقاڵی کار و دایمەش لە سەفەردا!!! کاکی بەرز و بەڕێزم هێندە سەریان بە بازرگانییەوە قاڵە کە تەنیا لە گالیسکەی نامەبەر و ناو فارگۆنی شەمەندەفەردا کاتی ژنهێنانیان هەیە؛ بۆ وا نەبێ؟ بە هیچ شێوەیەک دوور نییە! نەخێر، دونیا خاتوون، من بەم ئاسانییە کڵاوم نانرێتە سەر و دەزانم بۆ هێندە تامەزرۆی قسەم لەگەڵ بکەی؛ چاکیش دەزانم ئەو شەوەی کە خەوت زڕاوە و ژوورەکەت پێواوە کتومت بیرت لە چی کردووەتەوە و کاتێ لەتەنیشت تەختەتەختەوەکەی دایکمەوە و لەبەردەم*

کۆتەڵی پیرۆزدا کەوتوویتە سەر ئەژنۆ چ دوعایەکت کردووە! ئەوە لە هەموو کەسێ ناوەشێتەوە! ئممم... یانی بڕیارەکە ئەملا و ئەولای تێدا نییە، ها؟ کەواتە ئێوە، دونیا خاتوونی مێژا، بەوپەڕی خۆشحاڵی و ڕازیبوونەوە ئامادەن داوای زەماوەندی ئەم بەڕێزە پەسەند بکەن؛ وەک خۆتان دەڵێن کاکی سەوداکار و ئەهلی حسێب و لۆژیک، کە سەرمایەشی هەیە (هەڵبەتە هەر خۆی سامانێکی پێکەوە ناوە؛ ئاوها بڵێین بەڕێزانە و ئاوڕوودارانە و زۆریش کاریگەرترە!) جا وا دیاریشە لە دوو شوێندا کاری هەیە، لەگەڵ بیروبڕوای نەوەی ئێمەشدا ناکۆکییەکی نییە (دایە خاتوونم ئاوهای نووسیوە). ئەوە دونیا خاتوونیش خۆیان دەرکیان بەوە کردووە کە ئەو بەڕێزە نەرمونیان دیارە! کەواتە زاواکەمان بێخەوشە ئیتر! وا دیارە هەر لەبەر ئەمانەیە کە دونیا نیازیەتی شووی پێ بکا. ئای کە باشە! بێوێنەیە!... تەنیا لەوە تیا ماوم کە بۆچی دایکم قسەی نەوەی تازە و ئەم جۆرە شتانەی هێناوەتە ناوەوە؟ تەنیا ویستوویەتی ئەم خوێڕیلەیە بە من بناسێنێ، یان پاڵنەرێکی گرنگتری هەبووە و ویستوویەتی بەڕێز لوژن لای منیش خۆشەویست بکا؟ ئەی نەرمەبڕینە! شتێکی دیکەش هەیە کە زۆرم حەز لێیە سەری لێ دەربکەم. یانی خودی ئەو ڕۆژە و شەوەکەی و ڕۆژانی دواتریشی چەندە لەگەڵ یەکتری ڕاستگۆ بوونە ئەم دایک و کچە؟ بە تێروتەسەلی لێی دواون، یان تێگەیشتوون کە بیر و دڵیان یەکە و ئیتر چ پێویست دەکا قسەیەکی لەبارەوە بکەن؟ لام وایە دووەمیان ڕاستە. بە دەقی نامەکەدا دیارە کە دایە لای وا بووە کابرا فرە ڕەق و ڕاشکاوە. پاشانیش کە دایکی دڵسافی ئێمە بڕیار دەدا تێگەیشتنی خۆی لەگەڵ دونیادا بخاتە بەر باس، دیارە کە دونیاش تووڕە بووە و بە بەدخووییەوە وەڵامی داوەتەوە! بەڵێ دەی، هەر کەسێکی تریش با هەر پێی تێک دەچوو! هەموو شتێ وەک ڕۆژ ڕۆشنە و هیچ پێویستیش ناکا کەس پرسیارگەلی گەمژانە بخاتە ڕوو و بە وردەکاریی بێبایەخەوە بگرێ... بەتایبەت لەبەر ئەوەی بڕیار

*دراوە و هیچ قســـەیەکی تێدا نییە. ئاخر، ئەمەش بووە قســـە کە بێن و بە منی بڵێن؟ ڕۆدیای ئازیزم، کوڕەکەم، عاشقانە خوشکەکەتت خۆش بوێ، هەر بەو جۆرەی کە ئەو تۆی خۆش دەوێ. بزانە کە بێڕادە تۆی خۆش دەوێ و تەنانەت زیاد لە گیانیشـــی. ئەمە هاواری ویژدانیەتی، بێگومان! ویژدانی وا بە نهێنی و لە ناوەوەڕا دەیخوا کە بۆچی ڕازی بووە کچی خێزان، لەبەر خاتری کوڕی خێزان خۆی بکاتە قوربانی. ئەوە تۆیش هەموو شتێکی ئێمەی، ڕۆدیای ئازیزم؛ تۆ هیوا و ئارامیی گیانی ئێمەی. ئاخخخخ، دایە، دایە!*

ڕاســـکۆڵنیکۆف لە داخاندا هەڵچووبوو و لەوانەیە گەر لەو ســـاتەدا لوژنی لەلا با، خۆیانواتەنی *زاواکەیانی*، بیخنکاندبا. شـــوێن فکرەکانی سەری کەوت کە هەر وەک گێژاو لە مێشکیدا سەریان لەدووی یەکدی نابوو و لەسەری ڕۆیشت: ئمممم، *ڕاستە، مرۆڤ گەر بیەوێ کەسێکی تر بناسێ، دەبێ بە وریایی و پارێزەوە هەنگاو بنێ، نەکا هەڵەیەک بکا یان هەڵسوکەوتێکی دەرمارگیرانەی لێ بوەشێتەوە؛ وەلێ گومانی تێدا نییە کە ئەم کاکە لوژنەی ئێمە چ ماڵێکە و شـــتێکی ئەوەندە ئاڵۆزیش نییە. وەک دەڵێن ســـەوداکاریشـــە و ئەوە نەرمونیانیش دیارە. ئەمەش مایەی پێکەنین نییە! کۆڵ و بار و جانتاکانیشـــی لە ئەســـتۆ گرتوون و پارەی هێنانیان دەدا! بۆ دەکرێ گومان لە دەستوبڵاباشیی وەها مرۆڤێ بکەی؟ ئەوە بووکێ و دایکەکەشـــی لای عەرەبانەلێخوڕێکی ناسـیاویان عەرەبانەیان بە کرێ گرتووە و بڕیارە لەسەر کا دانیشن (خۆشم هەر وا سـەفەرم دەکرد بە ناخێری گیانم!). گوێشـیان لێ نییە و هەر نەوەد کیلۆمەترێکە! لەگەڵ دونیا گیان لە قەمارەی*[1] *نمرە سێدا ئەو چەند سەد کیلۆمەترە بە خۆشـــــی تـا ئەوێ دەبڕین! گومـان حەدی نییە بەلای ژێرییەکەیاندا بچێ: بەقەد بەڕەکەت پێ ڕاکێشـــە! وەلێ چۆن جەنابی پایەبەرز، کـاکە لوژن؟ لای خۆی ئەو دەزگیرانتە... خۆ نـاکرێ لەوە*

---

١. قەمارە: کووپە؛ هەر یەکە لە ژوورگەلی تایبەتیی گەشتیار لە شەمەندەفەردا.

بێئاگا بی کە دایکی پێشـوەختە بۆ خەرجیی سـەفەر لەسـەر حسـابی برانەکەی قەرزی کردووە؟ هەڵبەتە ئەمە مـامەڵەیەکی بـازرگـانیی دوولایەنـانەیە بە بەش و سـوود و زیـانی یەکسـانەوە؛ کەواتە خەرجییەکە پەنجا بە پەنجایە و هەر کەسـەو پشـکی خۆی. بەڵێ دەی، برامان برایی و کیسـەمان جیایی! بەس لێرانەشـدا وەک دەڵێن کاکی سـەوداکار بە لای خۆیدا ڕایکێشـاوە! مێتانی بار لە خەرجی سـەفەری ئەو دوو کەسە هەرزانترە و تەنانەت لەوانەشە بۆ ئەو بکەوێتە بەلاش. یانی دایکم و دونیا هەر بە ڕاستی نازانن مەسەلە چییە یان نایانەوێ بزانن؟ وا دیارە ڕازیشن، تەواو ڕازی! جا هەڵبەتە ئەمە سەرەتاکەیەتی، جارێ خۆشـاییەکەی ماوە! مەسـەلە، ڕەزیلی نییە؛ باس باسـی چاوبرسـییەتی و پارەپەرسـتیش نییە، مەسـەلە شـێوازی بەیانکردنی بـابەتەکەیە بە گشـتی! ئەم شـێوازی بەیـانکردنە، بۆ کـاتی دوای زەماوەندکردنە و ئەمە هەمووی ئاماژەیە... باشـە ئێستە دایە گیان بۆ ئاوها کەوتووەتە پەخشـانوتەخشـانکردن؟ خۆ بە گیرفانی خالییەوە دەگەنە پیتەربورگ! داماوی وا هەڵبەتە مەبەستیشـی لە پارە دووسـێ ڕۆبلە، یان بە گوتەی ئەو پیرێژنە قرچۆلە دوو ئەسکەناسی گچکۆکە!... ئمممم! وای زانیوە دەکرێ بە وەها پارەیەک لێرە بژی؟ لە لایەکیشەوە لەبەر هەر هۆکـارێک بێ توانیویەتی بڕوا بە خۆی بهێنێ کە نـاکرێ دوای زەماوەندی دونیا، لەلای ئەو بمێنێتەوە، بگرە لە دەستپێکیشەوە. گومانی تێدا نییە کە ئەم کاکی دەستودڵباشە شتێکی لە دەم دەرچووە و دەسـتی ئاشـکرا بووە و دایکیشـم خەمی لێ نیشـتووە و دەیەوێ بیشـارێتەوە و دەڵێ من پەسـەندی ناکەم! بۆ ئەم چۆن تێکەیشـتووە و بۆ ئەم مەبەستە پشت بە چی یان کێ دەبەستێ ئاخر؟ هەڵبەتە پشت بە سەدوبیست ڕۆبلی براتەی سالانە، ئەوە جا بەو برە قەرزەی بەڕێز ئافاناسی ئیڤانۆڤیچیشەوە؟ جا بە دڵنیاییەوە شال دەچنێ و سەرەقۆل دەدوورێتەوە تا چاوە پیرەکانی کوێر بکا. وەڵێ دەزانم بەم کارەش ئەوپەڕەکەی ئەگەر سـالی بیسـت ڕۆبلی دەسـت بکەوێ. کەواتە لەم

*نێوەندەدا، پشت بە سەخییەتی و هەستە باڵاکانی لوژن دەبەستن: لەوەدا بێگومانم کە بە ڕێز و شانازییەوە خولکم دەکەن! نەیخۆی تاڵە! دلە پاک و شیلەرسیفەتەکان[1] وان ئیتر: تا دوا سات مریشکەکەیان بە قاز دەبینن و تا کۆتایی ئاواتیانە هەموو شتێ ڕاست دەرچێ و نامێلێن خەیاڵێکی خراپیان بە مێشدا بێ. کاتێکیش تێگەیشتن دۆخەکە باش نالێ، ئامادە نین قەبوولی بکەن و بە ڕووی خۆیانیدا بێنن. تەنانەت بیرلێکردنەوەشی ئەشکەنجەیان دەدا و بە هەردوو دەست حەقیقەت وەلا دەنێن تا ساتێک ئەو کەسەی کە کردوویانە بە بتی خۆیان، نیشانیان دەدا دونیا بە دەستی کێوەیە! ئممم، یانی ئەم بەڕێز لوژنە، مەدالیا، نیشانەیەک شتێکیشی وەرگرتووە؟ ئەوە بێگومان مەدالیای ئانا وا بە شوێنقۆپچەکەیەوە و لەو میوانیانەدا کە وەک دەڵێن تایبەت بە سەوداکارانن، بەوپەڕی شانازییەوە دەریدەخا![2] بێگومان لە زەماوەندەکەشیدا مەدالیا بە خۆیەوە دەکا! سندان لە خۆت و مەدالیاکەشت بدا!... ئێستە دایکی ئێمە، کە خوا لێی خۆش بێ، بسرووشتی ئاوهایە! باشە دونیا چی؟ ئەی دونیا، ئازیزی دلم، خۆ من چاک تۆ دەناسم! دواهەمین جار کە یەکتریمان بینی نۆزدە ساڵت تەواو کردبوو. ئەو کاتەش هەر چاک ناسیمی. وا ئێستە دایە دانیشتووە و نووسیویەتی دونیا دەتوانێ بەرگەی زۆر شت بگرێ! بەلێ، خۆم چاک ئەمەم دەزانی و پێشتریش دەمزانی کە دەتوانێ؛ هەر لە دوو ساڵ و نیو لەوەوبەرەوە دەمزانی و لەو ڕۆژانەوە بیرم مەژغوولە، مەژغوولی ئەو بابەتەی کە دونیا دەتوانێ بەرگەی زۆر*

---

١. ئایدیالیستیی شیلەر دایمە لە بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکیدا کراوەتە ئامانجی تانە و تەشەر، بەتایبەت ئەو بانگەشەیەی کە *جوانی دەمانکەیەنێتە ئازادی*. «و. ف»

٢. ئاماژەیە بە نیشانەکانی ئانای پیرۆز: نیشانەی ئانای نمرە یەک بە قەیتانێک بەسەر شانەوە دەبەسترێت، ئانای نمرە دوو بە شێوەی خاچ بە ملەوە شۆڕ دەکرایەوە، ئانای نمرە سێ بە قردێلەیەکی بچووک بە سنگەوە دەبەسترا و چوارەمین نمرەشیان تایبەت بوو بە شوێنقۆپچەوە. «و. ف»

شت بگرێ. باشە، گەر ئەم کچە بتوانێ بەرگەی بەڕێز سفیدریگایلۆف و ئەو هەموو نەهامەتییە بگرێ، کەواتە توانایەکی زۆری هەیە. وا ئێستاکەش بە یارمەتیی دایە گیان ئەم خەیاڵەی خستووەتە سەری خۆیەوە کە دەتوانێ لەگەڵ بەڕێز لوژنیشدا هەڵبکا؛ لوژنێک کە حەز دەکا لەبارەی شیاوتربوونی هاوسەرێکەوە کە مێردە سەرەوەرەکەی لە هەژاری نەجاتی داوە، وتار بدا و هەر لە یەکەمەین ساتی یەکترناسینیدا بێشەرمانە باسی ئەوە دەهێنێتە ئاراوە. باشە گریمان ئەم بەڕێزە وێڕای مەنتیقیبوونی زۆر قسەی کردووە (تەنیا پەشۆکاوە تا هەر لە سەرەتاوە یەکلایی بکاتەوە)، ئەی دونیا، خودی دونیا چی؟ خۆ دەستی ئەم کەسەی بۆ ئاشکرا بووە و دەبێ دواتر لەگەڵ ئەودا بژی. ئەمە کچێکە ئەگەر ناچار بێ نانی ڕووت دەخوا و ڕۆحی نافرۆشێ، چ جا بێتە سەر ئەوەی کە ئازادیی ئاکاریی بکاتە قوربانیی ژیانێکی خۆشگوزەرانانە! تەنانەت نایکاتە قوربانیی هەموو ویلایەتی شلیسوگهوشتالین[1]، چ جا بکا بەم لوژنە خوێڕییە! نا، ئەو دونیایەی کە من دەمناسی ئاوها نەبوو و... هەڵبەتە مێشتاکەش هەر نەگۆڕاوە! نەفرت لەوەش نکوولی لێ دەکا کە پاساوەکەشی هەڵکردنە لەگەڵ کەسانی وەک سفیدریگایلۆفی دەیریکەردا! زۆر دژوارە بەتەما بی هەر ساڵەو لە شارێکەوە بەدوای ئیشی مامۆستاییدا بچیتە شارێکی تر کە سالی بیست ڕۆبڵێک زیاتریشی تێدا نییە، بەس سەرەڕای هەموو ئەوەش، دەزانم کە خوشکم وای پێ باشترە بچێتە مەزرایەک و لەگەڵ ڕەشەکان یان لتونیاییەکاندا[2] ئیش بکا و ڕەنجبەری ئەڵمانییەکان بێ،

---

١. دانیمارک، ئەتریش و پروس دەمێک لەسەر ئەم ویلایەتە مشتومڕیان بووە تا ئەوەی کە سەرئەنجام، لە کۆتایی شەڕی نێوان ئەتریش و پروسدا، پروس ئەوێی کۆنترۆڵ کرد. «و. ف»

٢. دۆخی ڕەشپێستانی ئەمریکایی و جوتیارانی لتونیایی و بەراوردکردنی ئەوان لەگەڵ سێرفەکان (وەرزێرەکان)دا لە ڕووسیا، لە باسە گەرمەکانی ئەو سەردەمە بوو. «و. ف»

تەنیا ڕۆحی نەفرۆشــێ و لەبەر خاتری پەیوەندی لەگەڵ کەسـێکدا کە ڕێزی لێ نانێ و هیچ خاڵێکی هاوبەشـیان لەنێواندا نییە، ئاکاری خۆی نەخاتە ژێر پرسـیارەوە، جا بەتایبەت بۆ پەیوەندییەکی هەمیشـەیی و لەبەر سوودی کەسێ! ئەم کاکە لوژنە تەنانەت ئەگەر زێڕی پووختە و یەک پارچە ئەڵماســیش با، دونیا هەر ســەری نەدەهێنایە ڕاسـتە و نەدەبووە ژنی یاسایی! ئەی ئێستە بۆچی قایل بووە؟ ئەم قەشمەریاتە یانی چی؟ کلیلی ئەم مەتەڵە لە کوێیە؟ بێگومان هەموو شـــتێ ڕوونە: تەنانەت لەبەر خاتری بەرژەوەندیی کەســـێ و خۆشــگوزەرانی یان تەنانەت نەجاتبوون لە کوێرەوەری خۆی نافرۆشـێ، ئەگەر وا خەریکە خۆی دەفرۆشــێ ئەوا لەبەر خاتری کەسـێکی ئازیزیەتی کە لە ناخی دڵییەوە خۆشـــی دەوێ! مەســـەلەکە ئەمەیە: ئەم کچە خەریکە لەبەر خاتری دایک و براکەی خۆی دەفرۆشــێ و هەموو شــتێکیش دەکاتە قوربانی! دەی بەڵێ، لەم جۆرە هەلومەرجانەدا ئیتر هیچ شـتێک نابێتە ڕێگرمان، تەنانەت هێزی جیاکردنەوەی ڕاســـت و هەڵەش لە خۆماندا دادەمرکێنینەوە و ئـازادی و ئـارامی و ویژدان، هەر هەمووی پێکڕا دەخەینە مەزادەوە؟ هەر ئەوەندەی کەسـانی خۆشـەویستمان شـاد و ڕازی بن، ئیتر ژیانی خۆمان بە توون! تەنانەت بە فەلســـەفەڕێســـی پاســـاویشـــی بۆ دەهێنینەوە، لە یەســـوعی و شـــتیشـــەوە بێ وانە وەردەگرین و تا ماوەیەک بێخەمین و بەوە خۆمان قایل دەکەین کە هەموو ئەمانە لە خزمەت ئامانجێکی باڵادا بوون و ڕێگەیەکی ترمان شـــک نەبردووە[1]. ئێمەی ڕووســـی، کشـــتمان هەر واین و هەموو شتێکیش ئاشکرا و ڕوونە. دیاریشـە ئەم بێنەوبەردەیە لەپێناو کێدایە:

---

١. ئاماژەیە بە ئاکارگەرایی ڕێژەیی یەســـوعییە کاتۆلیکییەکان و ئەو دروشـــمە بەناوبانگەیان کە ئامانج پاکانە بۆ کەرەستە دەکات. دژەکاتۆلیکیبوونی دۆستۆیفسکی لەو ســـەردەمە و بەتایبەت بەدوای هەســـتانی پۆڵەندییەکان لە ســـاڵی ١٨٦٣دا بە تەواوی دەرکەوت. «و. ف»

جەنابی ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ ڕاسکۆلنیکۆف و هیچ کەسێکی تر! تۆ بیری لێ بکەوە: چ بەختێک لە دەرگەی ماڵمانی داوە، دەتوانین دڵخۆشـــی بکەین، درێژە بە خوێندنەکەی بدا، لە نووســـینگەیەکی پارێزەریشـــدا ببێتە هاوبەش، بە کورتییەکەی بە جۆرێ لە جۆرەکان داهاتووی دابین دەکەین! دووریش نییە ڕێز و پارەیەک پەیدا بکا و بۆ خۆی ببێتە شـــتێک! ئەی لەم نێوەندەدا دایکم چی؟ خۆ ئەو گرنگ نییە، ئەوە تەنیا ڕۆدیایە کە گرنگە، ڕۆدیای گرانقەدر و ســـۆمای چاوان! هەرچیش بۆ ئەو ســـۆمـاییە بکەی هێشـــتـا هەر کەمە، بە کردنەقوربـانیی ئەو کچەشـــەوە! هاوار لەم دڵە نەرم و بێویژدانانە! کەواتە نابێ بە چاوی ســووک لە چارەنووســـی ســۆنیا بڕوانین! ســۆنیا، ســۆنیا... تا دونیا دونیایە، ســۆنیاش هەیە! وەلێ ئێوە هەردووکتان وەک دەڵێن باش ئەم خۆکردنەقوربانییەتان سەنگوسووک کردووە؟ ها؟ خۆتان لەژێر باریدا ڕادەگرن؟ هەر لە بنەڕەتەوە ســوودێکی هەیە؟ لۆژیکییە؟ هیچ دەزانی، دونیـا خـاتوون، شـــووکردن بە لوژن هیچ جیـاوازییەکی لەگەڵ چارەنووســی ســۆنیادا نییە؟ بەڵێ، دایە دەڵێ لە پەیوەندیی ئەواندا هیچ عەشـقێک لەئارادا نییە، وەلێ نەک هەر بە تەنیا وەها عەشـقێک، ئەگەر ڕێزێکیش لەئارادا نەبێ و لەبری ئەوە ڕق و ســـووکایەتی و قێز بێ... ئەوسا چی؟ دەی کەواتە هەمدیسان دێینەوە سەرەتا، هەرچۆنێک بووە دەبێ پاکوخـاوێن بێ. ڕازی نین؟ تێدەگەی ئەم جۆرە پاکوخـاوێنییە یـانی چی؟ تێـدەگەی؟ دەزانی کە پـاکوخـاوێنبوون بە لۆژیکی لوژن کتومت هەمان کاری ســۆنیایە و بگرە لەوەش دزێوتر؟ بەهەرحاڵ، تۆ، دونیـا گیـانم، تۆ ئەوە لەپێنـاو تەمەنێک خۆشـــگوزەرانی و نـاز و نیمعمەتدا دەکەی، وەلێ مەســـەلەی ســـۆنیا هەر بە تەنیا تیانەچوون لەبەر برســـییەتی و زیندوومانەوەیە! پاکوخـاوێنی خەرجیی دەوێ، دونیا؛ خەرجییەکی زۆریشـــی دەوێ! جا ئەی گەر دواتر دەرکەوت تۆ بەرگەی ئەم دۆخە ناگری و تۆبەت کرد؟ ئاهـــــ ئای بۆ ئەو داخ و خەفەت و نەفرەت و گریانە شـــاراوانەی کە دێنە ئارا... ئاخر، خۆ تۆ

*مارفا پیترۆڤنا نیی، ئەوی؟ ئەی ئەوسا چی بەسەر دایکماندا دێ؟ ئەم ژنە هەر لە ئێستەوە درِدۆنگ و بێتاقەتە؛ ئەی ئەوسا چی؟ کە پەردە هەڵمارا و هەموو شـــتێ دەرکەوت، چی؟ ئەی من چی؟... تۆ منت بە چی زانیوە؟ نا، من قوربانیدانی تۆم ناوێ، دونیا... وەها قوربانیدانێکم ناوێ، دایە! سەرەتا دەبێ من بنێژن جا بچن بەدەم زەماوەندەکەتانەوە! قەبوولی ناکەم! هەتا زیندوو بم قەبوولی ناکەم! مەگەر بەسەر تەرمی مندا رابوورن!*

راســـکۆلنیکۆف کتوپڕ هاتەوە ســـەر خۆی و لەو جێیەدا مت بوو: *یانی مەگەر تۆ بنێژن؟ ســـەرەتا بەســـەر تەرمی تۆدا رابوورن؟ بۆ نموونە جەنابی پایەبەرزت چییت لەدەست دێ؟ یانی ناهێڵی هەنگاوێ بنێن؟ باشـــە، تۆ چۆنچۆنی مافی وەها کارێک بە خۆت دەدەی؟ ج شـتێکی باشـترت پێ بەخشـین کە وا ئێسـتە خۆت بە خاوەنی وەها مـافێک دەزانی؟ بەڵێن دەدەی کە ژیـان و داهـاتووت، کـاتێ کە خوێندنەکەت تەواو بوو و پێگەیەک، پیشەیەک، شتێکت بەدەست هێنا، بۆ ئەوان تەرخان کەی؟ پێشـــتریش لەم حەکایەتانەت کردن و بێ لە قسەی پووچ هیچی تر نین... ئێستە چی؟ دەبێ هەر ئێستە و هەر لێرە شتێ بکەی، تێدەگەی؟ جا جەنابی پایەبەرز ئێستە بەتەمای چی بکەی؟ ئێسـتاکەش هەر ئەوانن کە سـکت پڕ دەکەن. دەزانی ئێسـتاکەش ئەم برە پارەیەی کە دەگاتە دەستت هەر لەسەر حسێبی ئەو سەد رۆبڵ برانەیە و پێشەکییەکەی سڤیدریگایلۆڤە؟ جەنابی ملیۆنێری پارەنەدیو، ئەی گەورە و بەرپرسی خێزان، تۆ چۆن دەتەوێ لە شەڕی کەسانی وەک سـڤیدریگایلۆڤ و ئافاناســی ئیڤانۆڤیچ ڤاخرۆشـین بیانپارێزی؟ بێگومان دە سـالی تر، ها؟ وەلێ دە سـالی تر نابا دایکت بە چنینی ئەو شالانە کوێرایی دادێ، جا گەر بەر لەوەی فرمێسک چاوەکانی یەکلایی نەکەنەوە! بە ئاو و نانی رووت نەخۆش دەکەوێ و تیا دەچێ. ئەی*

*خوشکەکەت چی؟ باشە تۆ چووزانی کە تا دە سال یان هەر لەم دە سالەدا بڕیارە چیی بەسەر بێ؟ دەزانی؟*

بەم پرسیارە یەک لەدوای یەکانە خۆی دەیری دەکرد، ئەشکەنجەی خۆی دەدا و ئەوەش هیچ کە دەتگوت چێژیشی پێ دەبەخشی. هەڵبەتە هیچ کام لەم قسانە نوێ نەبوون و لە غەیبەوەش دانەبەزیبوون؛ کۆمەڵێک نەخۆشیی کۆن و دێرین بوون کە لەمێژە چنگیان نابووە دڵی و لەتوپەتیان کردبوو. ڕەگی ئازار و شڵەژاویی ئەمڕۆی، لە ڕابردووە دوورەکاندا بوو، کە بەرەبەرە گەشەی کردبوو و بەرهەمەکەشی پرسیارێکی تۆقێنەر و وەهماوی و نامۆ بوو کە زەین و دڵیی دەکرۆشت و وەڵامێکی دەویست. نامەکەی دایکی وەک برووسکەیەک بە گیانیدا تێپەڕیبوو. بە ڕوونی دیتبووی کە هەر بە تەنیا خەم و خەفەت سوودێکی ئەوتۆیان نییە و ناتوانێت هەر دابنیشێ و بیر بکاتەوە کە بۆچی هیچ وەڵامێکی بۆ پرسیارەکانی دەست ناکەوێت. دەبوو کارێک بکات، تا زووتر بیکات درەنگە. بە هەر نرخێک بووە دەشیا بڕیارێک بدات و کارێک بکات، جا هەر کارێکیش با... یان ئەوەتا...

کتوپڕ شێتانە قیراندی: *یان ئەوەتا دەست لە هەموو ژیانت بشۆیتەوە! دەبێ سەرم شۆڕ بکەم و بە یەکجاری چارەنووس بەم جۆرەی کە هەیە پەسەند بکەم و ماباقیی شتەکانیش لە خۆمدا کپ بکەمەوە. دەبێ دەست لە مافی هەڵبژاردن و عەشق و ژیان بشۆمەوە. لەوە تێدەگەن کە مرۆڤ شوێنێکی نەبێ ڕووی تێبکا یانی چی؟* مارمیلادۆڤ دوێنێ ئەمەی لێ پرسیبوو و ئێستە کتوپڕ بیری هاتەوە. *ئاخر مرۆڤ هەر دەبێ لانیکەم لە شوێنێکدا کەسانێکی خەمخۆری هەبێ!*

گەنجەکە لەناکاو بە توندی ڕاچەنی؛ هەمدیسان یەکێک لە بیرەکانی دوێنێی هەروەک چەخماخە هێرشی هێنابووە سەر زەینی. بەڵام ئەوە

خێرایی هێرشـــی ئەو بیرە نەبوو کە ڕایتەکاند. دەیزانی و هەســتیشــی کــردبــوو کە ئەو بــیــرە بەبــێ دوودڵــی دەگەڕێــتەوە و تەنــانەت چاوەڕوانیشــی کردبوو. وەلێ ئەم بیرە تەنیا تایبەت نەبوو بە دوێنێوە. جیاوازییەکەی ئەوە بوو کە مانگی پێشـــــوو یان تەنانەت دوێنێ، لە حەزێک بەولاوە زیاتر نەبوو، وەلێ ئێستە... ئێستە ئیدی نەک خۆی لە شێوەی حەز، بەڵکە لە شێوەیەکی تازە و هەڕەشەئامێز و تەواو نامۆدا نیشـــان دابوو. ڕاســـکۆڵنیکۆف کتوپڕ لێی تێگەیشـــت و... وەک ئەوەی گوررزێکیان لە سەری دابێت، هەموو شتێک لە بەرچاویدا ڕەش داگەڕا.

بە شـــپرزەییەوە تەماشـــایەکی چواردەوریی کرد و چاوی بەدوای شـــتێکەوە بوو. دەبوو چەند ســـــاتێک دابنیشـــێت و هەر بۆ ئەوەش بەدوای نیمکۆتێکـدا دەگەڕا. لەو کـاتەدا خەریـک بوو بە بولواری کاناگواردیادا ڕادەبوورد. ســـەد هەنگاوێک لە پێشـــترییەوە نیمکۆتێکی بەدی کرد. تـا دەیتوانی هەنگـاوەکـانیی خێراتر کردن، وەلێ هەر لەو مەودایەدا پێشـــــهاتێکی بچکۆلە ڕووی دا کە تـا چەنـد خولەکێک بە تەواوی هەست و هۆشی گەنجەکەی بەرەو خۆی کێش کرد.

هەر لەو بێنەوبەرەیەدا کە چاوی بەدوای نیمکۆتێکەوە بوو تا چەند خولەکێک لەسـەری دابنیشێ، ژنێکی گەنجی بینی کە بیست هەنگاوێک لە پێشـــیەوە دەڕۆیشـــت، وەلێ ســـەرەتا تەنیا بە ڕادەی ئەو شـــتانە سەرنجی ڕاکێشا کە بە خێرایی بە بەرچاویدا ڕادەبوردن. چەندان جار ئەوە ڕووی دابوو کە کاتی گەڕانەوە بەرەو ماڵ، بە ڕەهایی نەزانێت لە چ ڕێگەیەکەوە دەڕوات و تەواو خووی بەم جۆرە ڕێکـردنەوە گرتبوو. وەلێ شـــتێکی تایبەت لەو ژنەدا بوو کە دەســـتبەجێ بووە مایەی سەرنجدانی و بەرەبەرە هەموو هەست و هۆشیی بەرەو خۆی ڕاکێشـا؛ سـەرەتا بە پێچەوانەی حەزی خۆی و تەنانەت بە شـێوەیەکی بێزارکەر زیانەخرۆیانە، وەلێ کەمێک دواتر ئەم هێزی ڕاکێشانە بەهێز و بەهێزتر بوو. حەزێکی کتوپڕانە یەخەی گرتبوو تـا لەوە تێبگـات چ

شـــتێک لەو ژنەدا هەیە کە تا ئەم ڕادەیە نائاســـاییە: لە لایەکەوە زۆر گەنج دەهاتە بەرچاو و لە لایەکی دیکەشـــەوە لەو کەشـــە تێندارەدا، هیچی نەکردبووە ســـەری؛ نە چەترێکی بە دەســـتەوە بوو و نە دەســـتکێشـــێک و، ســـەرباری ئەمانەش، بە شـــێوەیەکی گاڵتەجاڕانە دەستەکانیی ڕادەوەشـاندن. کراسـێکی ئاوریشـمیی سـووکی کردبووە بەری کە ئەویش بارێکی ئاسـایی نەبوو، دەتگوت ڕێک هەڵنەپێکرابوو. سەرەوەی داوێنی، لە پشتەوە و لە بەشی کەمەریدا دڕابوو و پارچەی دڕاو لەپشـــتییەوە شـــۆڕ بووبووەوە. دەســـڕێکی بچووکی بە ملە ڕووتەکەیەوە ئـالانـدبوو، وەلێ ئەویش خوار و لابەلا بوو. هەموو ئەمـانە لە لایەک، کچە خۆی بە پێوە نەدەگرت و بەلادا دەچوو و تەنانەت بەرەو ئەملا و ئەولایش ســـاتمەی دەدا. کچۆڵەکە دواجار توانیی هەموو سـەرنجی ڕاسـکۆڵنیکۆف بۆ خۆی ڕابکێشـێ. ڕێک لای نیمکۆتەکە گەیشـــتە لای کچە، بەڵام کتوپڕ کچە لەلایەکی نیمکۆتەکە بێهەپوگۆ کەوت، ســـەری بە پاڵپشـــتی نیمکۆتەکەوە نا و بە جۆرێک وەک بلێیت برســـتی لێ براپێت، چاوەکانیی نووقاندن. ڕاســـکۆڵنیکۆف هەر کە لە نزیکەوە کچەکەی بینی، تێگەیشـــت مەســـتی مەســـتە. تووشـبوونی وەها دیمەنێک نائاســـایی و ئەقڵنەبڕ بوو، تەنانەت کەوتە گومانیشـــەوە کە لەوانەیە بە هەڵەدا چووبێت. ڕووخســـاری کچێکی ئێجگار گەنجی لە بەرچاودا بوو، شـــازدە یان تەنانەت پازدە ســـاڵە، وردیلە و ئاڵ و جوان وەلێ بە ڕوواڵەتێکی داگیرساو و هەڵئاوساوەوە. پێنەدەچوو بزانێت خەریکی چییە. لاقی نابووە ســـەر لاق و لەم بارەدا زیاد لە ڕادەی پێویست قاچی بەدەرەوە بوو. بە باری ســـەروســـیمایدا دیار بوو کە هەر ناشزانێت لە ماڵەوە نییە و وا لەسەر شەقامە.

ڕاسکۆڵنیکۆف دانەنیشت، وەلێ نیازیشی نەبوو وازی لێ بهێنێت و بڕوات. بەم پێیە، هەر وا سەرسووڕماو لەبەردەم کچەدا ڕاوەستا. ئەم بولوارە هەمیشـــە قەڵەباڵقییەکی وای نەبوو، بەڵام لەو کاتانەی ڕۆژدا،

لەنێوان کــاتژمێر یەک و دووی نێوەڕۆ و لەو کەشــــە تینـدارەدا، باڵندەشـــی پێدا نەدەفڕی. وێڕای ئەوەش، هەر لەو چۆڵاییەدا، چەند هەنگـاوێـک لەولاترەوە پیـاوێـک لە لایەکی دیکەی بولوارەکەوە ڕاوەستابوو و سەروسەکوتی هاواری دەکرد کە لەبەر چەند هۆکارێک فرە نامەزرۆیە لە کچەکە نزیک بێتەوە. دیارە ئەویش پێشـــتر کچەی کردبووە ئامانج و دەیویست خۆی بگەیەنێتە ئەو، کەچی ڕاسکۆلنیکۆف لەســـەر ڕێگەکەی قوت بووبووەوە. ئێســـتاکەش وا تیری ســـەرنجی ڕقاویی خۆی لە گەنجەکە دەگرت، وەلێ هاوکات نەیدەویست سەرنجی ئەو ڕابکێشێت و نەسرەوتانە چاوەڕێ بوو ئەم بەرەڵای مووی لووتە ڕێگەکەی بگرێتە بەر و بڕوات. هەموو شـــتێک ڕوون و ئاشــکرا بوو. کاکی بەڕێز سی ساڵێک دەبوو؛ کەتە و چوارشانە و تەنانەت خەپەش بوو، نموونەی بێوەیی، بە لێوێکی ســـوور و ســـمێڵن و تەرپۆش کە دەستێکی باشی بە خۆیدا هێنابوو. خوێن بەری چاوی ڕاسکۆلنیکۆفی گرت و حەزێکی بێڕادەی تێـدا وورووژا بۆ ئەوەی لە هەر ڕێیەکەوە بووە ئەو تەرپۆشە سووکوچرووک بکات. جاری وازی لە کچە هێنا و چووە گیانی کاکی بەڕێز. پەنجەکانیی کردنە مســـت. لە تووڕەییان دەمی کەفی کردبوو، کەچی بە بارێکی پێکەنیناامێزەوە هاواری کرد:

– هێی، جەنابی سڤیدریگایلۆڤ![1] بەدوای چییەوەی؟

---

١. سڤیدریگایلۆڤ وێڕای ئەوەی کە ناوی خاوەنکاری پێشووی دونیایە، پێشینەیەکی سەرنجڕاکێشیشی هەیە. لە ساڵانی ١٨٦٠دا گۆڤاری پکر، بە تەنز، سیمای پیاوێکی شارستانیی بە ناوی سڤیدریگایلۆڤەوە ئافراند کە ڕابردوویەکی ڕەشی هەبوو و دیار نەبوو ڕەگ و ڕیشەکەی لە کوێوەیە. سڤیدریگایلۆڤ کەسایەتییەکی ئەشکەنجەدەری هەبوو و وەک کرم بەرەو ڕۆحی کەســـی بەرانبەرری دەخشـــا. لە لایەکی دیکەوە، دەشـــێت ئاماژە بێت بە ســـڤیدریگایلۆڤی شـــازادەی لتونیایی ســـەدەی پازدەیەم، کە مۆتەکەی ئۆرســـۆدۆکســـەکان بوو و دەکرێت لە هەڵبژاردنی ناوی کەســـایەتیی ئەم ڕۆمانەدا ڕۆڵی هەبووبێت. «و. ف»

کابرا کە حەپەسان و لووتبەرزیی لە یەک ئاستدا بوون، برۆی ویک هێنانەوە و پرسیی:

– تێنەگەیشتم، مەبەستت؟

– ون بە، مەبەستم ئەوەیە!

– چۆن دەوێری، خوێڕی!...

کابرا ئەمەی گوت و قامیچییەکی بەرز کردەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف بەگژیدا چوو؛ چەپ و ڕاست مسی بۆ کابرا دەوەشاند و ئەسڵەن ئەوەی بە خەیاڵدا نەدەهات کە ئەو قەڵافەتە زلە دەرەقەتی دووی وەک ئەو دێت. ڕێک لەو کاتەدا یەکێک لە پشتڕا ڕاسکۆڵنیکۆفی گرت؛ پاسەوانێک خەریک بوو جیای دەکردنەوە.

– بەسە ئیتر، بەڕێزان. تۆزێک ڕێزی خۆتان بگرن و بە بەرچاوی خەڵکییەوە پێکدا هەڵمەگژێن! کێشەتان چییە؟ ئادەی، ئێوە کێن؟

دواهەمین ڕستەی بە ڕووخسارێکی مۆنەوە لە ڕاسکۆڵنیکۆف پرسی کە سەروسیمای سەرنجی ئەوی ڕاکێشابوو. ڕاسکۆڵنیکۆفیش لە پاسەوانەکە ورد بووەوە. لەبەردەمیدا چاوی بە ڕووخساری نەترسی پاسەوانێک کەوت کە سمێڵ و زوڵفەکانی سپیی دەچوونەوە و نیگایەکی سەرنجڕاکێشی هەبوو. ڕاسکۆڵنیکۆف دەستی پاسەوانەکەی گرت و بە تینوتاوەوە گوتی:

– ئای کە باشە، خۆ من لەدووی ئێوە دەگەڕام! من تا ئەم دواییانەش خوێندکاری زانکۆ بووم، ناوی بنەماڵەییشم ڕاسکۆڵنیکۆف... تۆش بیزانی خراپ نییە!

ئاوڕی دایەوە و ئەمەی دوایی بە کابرای کەتە گوت. پاشان لە بارێکدا کە هەر وا پاسەوانەکەی بەرەو نیمکۆتەکە ڕادەکێشا، لەسەری ڕۆیشت:

– لەگەڵم وەرن با نیشـــانتانی بدەم... خۆتان ببینن، ئەم خاتوونە مەســـتی مەســـتە. بەر لە هاتنی ئێوە خەریک بوو بە بولوارەکەدا تێدەپەڕی. خوا دەزانێ ســەر بە چ خێزانێکە؛ تەنیا پێناچێ ئالوودە بێ. زیاتر وا دەردەکەوێ لە شــوێنێ مەشــروبیان دەرخوارد دابێ و لە خشــتەیان بردبێ... یەکەمین جاری بووە، تێدەگەن؟ پاشــانیش فڕێیان داوەتە سەر شەقام. فەرموون، تەماشای دڕاویی کراسەکەی؛ تەماشا چۆن پێوەی شــۆڕ بووەتەوە! پێناچێ خۆی جلەکەی لە بەر کردبێ. یەکێک جلی لە بەر کردووە، جا بە شــپرزەیی و ســەرپێییش.... ئەمە ئیشـــی ژنە نەک پیاو! بە تەواوی دیارە. جا گوێ لەمە بگرن. من ئەم زلحۆلە، کە هەر ئێسـتە بە گژیدا چووبووم، هیچ ناناسـم؛ تا ئێسـتەش چـاوم پێی نەکەوتووە. وەلێ ئەویش هەر ئێســـتە خەریـک بوو بە بولوارەکەدا تێدەپەڕی و تەماشای کرد کچە سەرخۆش و بێهۆشە. جا ئێسـتەش سـوێی بووەتەوە بۆ ئەوەی بچێتە لای و هەڵیبسـتێنێتەوە. ئێســـتە باشـــە کە وا دەبینێت کچە لە چ دۆخێکدایە! هەڵبەتە دەیەوێ کێشـــی بکاتە شـــوێنێکەوە... گومانم نییە! بڕوام پێ بکەن. بینیم چۆن چاوی تێبڕیوە و شوێنی هەڵدەکا، بەس من بەرم پێ گرت و ئێستەش وا چاوەڕێیە من بڕۆم تا... تەماشـــا، تۆزێک چووەتە ئەولاتر؛ ســـەیر کەن چۆن لەوێ ڕاوەســـتـاوە کە هـایهـای خەریکی پێچـانەوەی جگەرەیە؟ چۆن دەتوانین بەری پێ بگرین؟ بـاشـــە چۆن ئەم کچە بگەیەنینەوە ماڵەکەی؟ چارەیەکی بکەن!

پاسەوان، فرە زوو تێگەیشت بابەتەکە چییە. مەسەلەی کابرای خەپە هێندە ئاڵۆز نەبوو، وەلێ ئەی کچەکە؟ چەمییەوە تا باشـــتر ســـەیری بکات؛ هەســـتی خەمخۆرییەکی ڕاســـتەقینە گەڕابووە ڕووخســـاری. سەرێکی لەقاند و گوتی:

– چ دۆخێکە، مایەی شەرمەزارییە! خۆ ئەمە هێشتا مناڵە! بێگومان لە خشتەیان بردووە و هیچ پاساوێکی تری نییە. هێی، خانمخاس، گوێ بگرن...

ڕوو لە کچە درێژەی داین:

– دەکرێ بپرسم لە کوێ دەژین؟

کچە چاوانی ماندوو و وڕی هەڵهێنان، مت و خەمۆک تەماشای لێکۆڵەرانیی کرد و بە دەست ئاماژەیەکی کرد کە وازی لێ بهێنن.

– وەرن...

ڕاسکۆڵنیکۆف گیرفانەکانیی پشکنین و دواجار بیست کۆپیکیی دەرهێنا:

– فەرموون. گالیسکەی بۆ بەکرێ بگرن و ناونیشانەکەی بدەنە گالیسکەوانەکەی. ناونیشانەکەی بزانین، کێشەکە چارەسەر دەبێ!

پاسەوان پارەکەی وەرگرت و هەمدیسان پرسیی:

– ئێ، خانمخاس؟ تەماشا، دەمەوێ گالیسکەتان بۆ بگرم و خۆشم لەگەڵتان بێم. دەبێ بتانبەمە کوێ؟ ها؟ لە کوێیە ماڵتان؟

کچۆڵەکە دووبارە بە دەست ئاماژەی لاچوونی بۆ کردن و ورتاندی:

– دە لاچن!... چەپەڵینە!...

پاسەوان هەمدیسان لەتاو شەرمەزاری و داخ و پەستی سەرێکی بادا و گوتی:

– هەر بە ڕاستی مایەی شەرمەزارییە! شوورەییە، خاتوون! ئەمە چ بەزمێکە!

کە ئەمەی گوت، بەرەو لای ڕاسکۆلنیکۆف وەرسووڕا و جارێکی دی لێی ورد بووەوە؛ ئەویش لەلایەکەوە جلە شڕەکانی بەری و پارەبەخشینەکەی یەکیان نەدەگرتەوە و مایەی سەرسامی بوون! پاسەوان پرسیی:

– ئەری، ئەم خاتوونە گەنجەتان زۆر دوورتر لێرەوە دۆزییەوە؟

– خۆ من گوتم، بە بەردەم مندا ڕادەبرد و لەتری دەدا، ڕێک ئالێرەدا، هەر ئالەم بولوارەدا. وەلێ هەر کە گەیشتە نیمکۆتەکە، بە پشتدا کەوت.

– خوایە، خوایە گیان! خۆ لەم دونیایەدا شەرم و حەیا باری کردووە! ئاخر کچێکی هێندە گەنج و ئاوها سەرخۆش! هەبێ‌ونەبێ لە خشتەیان بردووە، هەر ئەوەیە! تەماشای، تەنانەت جلەکەشی دڕاوە... چ بەدڕەوشتییەک لەم ڕۆژانەدا بڵاو بووەتەوە! دەبێ لە خێزانێکی ڕێکوپێکیش بێ... بەس لە هەژارە هەژارەکانیان؛ لەم ڕۆژانەدا ژمارەیان گەلێک زۆر بووە! بە ڕووالەت لە نازپەروەردەکانە، ڕێک دەڵێی کچە خانەدانە!

جا پاسەوان هەمدیسان بەرەو لای کچە داچەمی.

پێدەچوو خۆیشی چەند کچێکی هەبن کە پەروەردەیان هەر بەم جۆرە بێت، وەک *خاتوونانی گەنج و نازپەروەردە*، خۆشڕەفتار و بە جۆرەها هەڵسوکەوت و مەکرونازی باوەوە...

ڕاسکۆلنیکۆف پێداگریی کرد:

– گرنگ ئەوەیە نەهێڵین ئەو کابرا خوێڕییە کاری خۆی بکا. یانی هەر بە ڕاستی بڕیارە لێگەڕێین ئەمەش کچۆڵەکە بەکار بهێنێ؟ کوێریش دەزانێ کابرا بەدوای چییەوەیە! تۆ تەماشای نارەسەنی وا... هێشتا لەوێیە و هەر ناڕوا!

– ڕاسکۆڵنیکۆف دەنگیی هەڵبڕی و خەریک بوو ڕاستەخۆ ئاماژەی بۆ کابرای نەناســــراو دەکرد. ئەویش دەنگیی بیســــت و خەریک بوو هەمدیســـان هەڵبچێتەوە، بەس وای بە باشــتر زانی هیچ نەڵێت و تەنیا بە نیگایەکی سووکایەتیئامێز ڕازی بێت. پاشان، لەسەرخۆ، دە دوانزە هەنگاوێکی بەرەو دواوە نا و دیسان ڕاوەستایەوە.

پاسەوان بیری کردەوە و هاتە وەڵام:

– بۆ ناکرێ بەری پێ بگیرێ... تەنیا گەر ئەم خاتوونە بە ئێمەی دەگوت دەبێ بیبەین بۆ کوێ... هێی، خانمخاس؟ خاتوون؟

پاسەوان هەمدیسان بەسەر کچەدا چەمییەوە.

کچە لەپڕ بە تەواوی چاوی کردەوە و وەک ئەوەی دواجار خەریک بێت لە شــتانێک تێبگات، نیگایەکی جددی و دووروودرێژی گرتە ئەوان، لەســەر نیمکۆتەکە هەســتایەوە و ئەم جارەیان بەو ئاراســتەیەدا کەوتە ڕێ کە لێوەی هاتبوو. جارێکی دی باسکەکانیی ڕاتەکاندن و گوتی:

– دە وازم لێ بێنن، بێکارە و خوێڕیینە!

کچە بە پەلە کەوتە ڕێ، گەرچی ئەم جارەشــیان هەر وەک پێشــتر لەتری دەدا. کابرای جڵف و تەرپۆشـــــی خەپەش لە لایەکی دیکەوە کەوتە شوێنی و چاوی لێ لانەدەدا.

– بەری پێ دەگرین، بێخەم بە.

پاســـەوان، لێبڕاوانە ئەمەی گوت و خۆی شـــوێن ئەو دوو کەســـە کەوت. بەدەم هەڵکێشانی ئاهەوە دووبارەی کردەوە:

– خوایە، خوایە گیان! ڕوو لە هەر لا دەکەی، بەدڕەوشتی هەرایەتی.

ڕێک لەو ساتەدا، ڕاسکۆڵنیکۆف هەستی کرد شتێک گەستی و لە ساتێکدا دەتگوت بوونی ژێراوژوور بوو. بەدوای پاسەوانی سمێڵندا هاواری کرد:

– هێی گوێ بگرن!

پاسەوانەکە وەرسووڕا.

– ئەسەڵەن وازی لێ بێنن! بە ئێوە چی؟ گوێی مەدەنێ، لێ گەڕێن بۆ خۆی ڕابوێرێ.

جا بە دەست ئاماژەی بۆ تەرپۆشەکە کرد و درێژەی پێ دا:

– لێی گەڕێن بە ئێوە چی ئاخر؟

پاسەوان لە مەبەستەکەی تێنەگەیشت و هەر وا حەپەساو تەماشای دەکرد. ڕاسکۆڵنیکۆف لە قاقای پێکەنینی دا.

– خوا هاوار!

پاسەوان ئەمەی گوت و بە قەڵسی دەستێکی ڕاوەشاند و دوای کچۆڵە و تەرپۆشەکە کەوت؛ بە ئەگەرێکی زۆر بە شێت یان تەنانەت بە شتێکی خراپتریش لە ڕاسکۆڵنیکۆف تێگەیشتبوو.

ڕاسکۆڵنیکۆف کە تەنیا مایەوە، تووڕانە بۆڵاندی: *دە فەرموو، بیست کۆپیکەکەی منیشی برد! وایە دەی، دەتوانێ ئەوەندەش لەو خوێڕیلەیە وەربگرێ و کچۆڵەکەی پێشکەش بکا و مەسەلەکە دەبڕێتەوە! باشە من کتومت خەریکی چ لاژکەلاژکێ بووم؟ بە ئاخێری گیانم دەمویست یارمەتیی بدەم؟ باشە من و یارمەتی؟ ئەرێ من مافی ئەوەم هەیە یارمەتیی کەسێک بدەم؟ لێگەڕێ با هەر بە زیندوویی یەکتری هەڵبلووشن، من لەم نێوەندەدا کێم پێ دەڵێن؟ بە چ مافێک ئەو بیست کۆپیکەم فەوتاند؟ باشە ئەو پارەیە هی خۆم بوو؟*

سەرەڕای ئەو قسە زلانە، تەواو هەستی بە داماوی دەکرد. لەسەر نیمکۆتە چۆڵەکە دانیشـت و زەینی لێوڕێژ بوو لە هەرا و شـپرزەیی. لەو ساتەدا تەنانەت بە دژواری دەیتوانی بیر لە شتێک بکاتەوە. حەزی دەکرد لە بێئاگایی و فەرامۆشـییەکی تەواودا بێت. تەنیا دەیویست هەموو شتێکی بیر بچێتەوە و پاشـان کە بەئاگا هاتەوە، سـەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە...

تەماشـایەکی لایە چۆڵەکەی نیمکۆتەکەی کرد و بە خۆی گوت: *ئای کچەی داماو! دواجار کە دێتەوە سـەر خۆی، دەداتە پرمەی گریان و پاشـانیش بەسـەرهاتەکە دەگاتەوە گوێی دایکی... دایکەش سـەرەتا پرشـەقی دەکا، دەیداتە بەر قامچی و ڕەنگە لە ماڵیش وەدەری نێ... ئەگەریش وەدەری نەنێ، داریا فرانتسۆڤنا بۆ تایین دەبێ تا سۆسەی مەسـەلەکە بکا و بیرڤێنێ؛ کچەش لەوەدوا بەرەڵای نێو شـار دەبێ... پاشـانیش دەکەوێتە نەخۆشـخانەوە... ئاخر کچێکی خێزاندار کە بە نهێنییەوە دەسـت بداتە بەدئاکاری، ئاقیبەتەکەی لەمە باشـتر نابێ... ئەرێ، دوای ئەوەش هەمدیسان نەخۆشخانە... خواردنەوە... مەیخانە و دیسان هەزار نەخۆشی و دەرد و نەخۆشخانە... دووسێ ساڵ نابا بە تەواوی دەفەوتێ! ژیانی لە هەژدە نۆزدە ساڵیدا لەدەست چووە... بۆ کەممان لەم جۆرە کچانە دیون؟ چییان بەسـەر هات؟ هەر هەموویان ڕێک بەو دەردە چوون! ئـاخخخخ! جـا بە چی دەچێ؟ بە ئێمەیـان گوتووە ڕەوشـەکە ئاوهایە. گوتوویان هەر سـاڵەو لە سـەدا فڵان و فیسار ڕێژە بەتایبەتی دەبێ ئەم ڕێیە بگرنە بەر*[1]... *جا هەر خوا دەزانێ*

---

١. ئاماژەیە بە بڵاوبوونەوەی بەرهەمێکی وەرگێڕدراو بۆ سـەر زمانی ڕووسـی کە دەنگ و هەرایەکی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا، بەرهەمی باوکی زانسـتی ئامار و بنیادنەری ڕەسـەدخانەی برۆکسـل، *ئادۆلف کوتلەری بەلجیکی* لە سـاڵی ١٨٦٥دا و، هەروەها سـەرکەوتنی سـەرتاسـەریی شـەپۆلی ئەڵمانیی تیۆریی ئادۆلف ڤاگنەر، کە بڕوای وا بوو ژمارە و شێوازی پۆلێنکردنی تاوان، خۆکوژی، هاوسەرگیری و تەڵاق دەکرێ بە شێوەیەکی ئێجگار ڕێکوپێک پێشبینی بکرێن. «و. ف»

*کامە ڕێگەی تر... دەبێ بچن ملیان بشکێنن تا ئەوانی تر ئاسوودە بن و بێزار نەکرێن. لە سەددا! دەربڕینێکی چەندە خۆشیشان هەیە؛ زۆر ئارامیبەخش و زانستی! ئەڵێ ئیتر، هەر ئەوەندە ئەم دەربڕینە ببیستی، ئیتر بە خۆت دەڵێی سەیرە، چەندە بەپاساو و لۆژیکیشە، باشە تا ئێستە خەمی چیت بوو! ئێستە گەر دەربڕینێکی ئاسایی تر با، لەوانە بوو کەمێک ئازاری پێ بگەیاندبای... وەلێ مادام لە سەددایە، ئیتر زۆر قاییلکەرە... باشە ئەی ئەگەر دونیاش ئاقیبەتەکەی ئەم لە سەددایە بێ... ئێستە گەر ئەم لە سەددایەش نەبێ، ئەو لە سەددا... بۆ مەگەر جیاوازییەکی هەیە؟*

کتوپڕ کەوتە بیرکردنەوە: *باشە من ئێستە بەرەو کوێ بەڕێوە بووم؟ سەیرە ها.* بێگومان *هاتنەدەرەوەکەم هۆکارێکی هەبوو. کە نامەکەم خوێندەوە دەمودەست کەوتمە ڕێ... ئەها، خەریک بووم بەرەو دوورگەی ڤاسیلیێفسکی دەچووم، تا چاوم بە ڕازومیخین بکەوێ؛ ئەری کاکە، خەریک بووم بەرەو ئەوێ دەچووم... بیرم هاتەوە؛ وەلێ بۆ دەچوومە ئەوێ؟ لەم بێنەوبەرەیەدا بۆ دەبێ کەلکەڵەی بینینی ڕازومیخینم کەوتبێتە سەر؟ بە ڕاستی سەیرە!*

ڕاسکۆڵنیکۆف بە هەڵسوکەوتی خۆی حەیران بوو. ڕازومیخین یەکێک بوو لە هاوڕێ دێرینەکانی زانکۆی. ئەوەی خۆش بوو کە ڕاسکۆڵنیکۆف لە زانکۆدا هیچ هاوڕێیەکی نزیکی نەبوو. مەودای نێوان خۆی و ئەوانی دیکەی دەپاراست، نە سەردانی کەسی دەکرد و نە تاقەتی پێشوازیکردنی کەسی هەبوو. زۆر زوو هەمووانی لە خۆی دەتەراندن. ڕووی لە دیدەنی و قسە و گاڵتەوگەپ و ڕابواردن وەرگێڕابوو. بەڵام لە خوێندنەکەیدا کەمتەرخەمیی نەدەکرد و لەبەر ئەوەش سەنگێکی لەنێویاندا هەبوو، بەس هیچ کەس لە دڵەوە خۆشی نەدەویست. زۆر دەستکورت بوو و بێڕادەش لووتبەرز، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە پەیوەندییەکی قووڵی لەگەڵ کەسدا نەدەبەست.

دەتگوت نهێنییەکی هەیە و دەبێت بیشـارێتەوە. تێگەیشـتنی هەندێک لە هاوپۆلەکانی وا بوو کە بەو پێیەی لای وایە زانیاری و بیروبڕواکانی خۆی لە سـەرووی هی ئەوانی دیکەوەن، ئیدی بە چاوی منداڵێکەوە لێیان دەڕوانێت و بیروبڕوا و حەزەکانی ئەوانیش زۆر لە خوارەوەی هیکانی خۆیەوە دەبینێتەوە.

لەم نێوەندەدا هەر نەزانرا چۆن لەگەڵ ڕازومیخیندا سـازاوە، وا نەبوو بڵێیت لەگەڵ یەکدیدا بکرێن، مەسـەلە ئەوە بوو کە تەنیا لەوەوە نزیکتر بوو و زیـاتر لەگەڵی دەدوا. گەرچی لەگەڵ ڕازومیخینـدا هەر دەبوو وا بێت. مرۆڤێک بوو دڵخۆش و بەکەیف و تا ڕادەی سـادەیی نەرمونیان، کە هەڵبەتە لەپشت ئەم سـادەییەوە ڕۆحێکی قووڵ و چاک شـارابووەوە. باشـترین هاوڕێکانی چاک لەمە تێگەیشـتبوون و هەمووانیش خۆشـیان دەویسـت. هەندێک جار گێژوویژ دەردەکەوت، وەلێ بە هیچ شـێوەیەک مرۆڤێکی دەبەنگ نەبوو. ڕوواڵەتی گەلێک سـەرنجڕاکێش بوو: لاواز و باڵابەرز بە قژێکی ڕەش و ڕیشـێکی هەمیشە نەتاشراوەوە. بە شتی بێمانا هەڵدەچوو و بە هێزی باسکیش بەناوبانگ بوو. بۆ نموونە شـەوێک کە لەگەڵ هاوڕێیانی لە دەرەوە خەریکی ڕابواردن بوون، بە یەک بۆکز ملئەسـتوورێکی تەختی زەوی کردبوو. وەک ئاو ئارەقی دەخواردەوە، بەس هاوکات دەشـیتوانی بە هیچ شـێوەیەک نەخواتەوە. بڕێک جـار لە ڕابواردنـدا زیـادەڕەویی دەکرد، بەڵام وەک دەڵێن هەمیشـە جڵەوی لەدەسـتی خۆیدا بوو. ڕازومیخین تایبەتمەندییەکی سەرنجڕاکێشی دیکەشی هەبوو و ئەویش ئەوە بوو کە هیچ نامورادییەک نەیدەتوانی بیشڵەژێنێ و پێدەچوو هیچ دۆخێک بۆ ئەو هێندە نالەبار نەبێت کە بتوانێت بە چۆکیدا بهێنێت. ئەگەر پێویست با، ئەوا لەسـەر بانەلێژە شـەوی دەکردەوە و بەرگەی ئەوپەڕی برسییەتی و سەرمای زەمهەریری دەگرت. سامانێکی نەبوو تا پێوەی بنازێت، وەلێ هەر چۆنێک با بە تاقی تەنیا خەرجیی خۆی

پەیدا دەکرد و هەر وردەکارێکی بۆ بهاتبا پێش دەیکرد و هەزار و یەک ڕێگەی دەدۆزییەوە تا پارەیەکی دەسـت بکەوێت. سـاڵێکیان بە درێژایی زسـتان هەر لە دەسـتپێکەوە تا کۆتا کوانووی ژوورەکەی دانەگیرسـاند و پاسـاویشـی ئەوە بوو کە ئاوها بۆی باشـتر بووە، چونکە مرۆڤ لە سـەرمادا خۆشـتر دەتوانێت بخەوێت. ئەویش ناچار بووبوو لەم دواییانەدا بە کاتی واز لە زانکۆ بهێنێت و ئێستە بەوپەڕی توانایەوە تەقەللای بوو پارە کۆ بکاتەوە و دۆخەکە بگەڕێنێتەوە سـەر باری جاران و بتوانێت درێژە بە خوێندنەکەی بدات. لانیکەم چوار مانگێک دەبوو کە ڕاسکۆلنیکۆف ئەوی نەدیتبوو و ڕازومیخینیش هەر نەیدەزانی هاوڕێ دێرینەکەی لە کوێ دەژی. دوو مانگ و شـتێک لەوەوبەر هێندەی نەمابوو لە شـەقامدا لووتیان بە لووتی یەکدییەوە بتەقێ، کە ڕاسـکۆلنیکۆف ڕووی وەرگێڕابوو و تەنانەت چووبووە ئەوبەری شـەقامەکەش تا نەیبینێت. ڕازومیخینیش وێڕای ئەوەی هاوڕێکەیی بینیبوو، ئاسایی بەلایدا ڕابردبوو تا بێزاری نەکات.

## پێنج

ڕاسـکۆڵنیکۆف هەر وا خەریکی بیرکردنەوە بوو: *بەڵێ، ماوەیەک لەمەوبەر بوو کە دەمویست لەبارەی کارەوە پرسیار لە ڕازومیخین بکەم، تا بزانم دەتوانێ فێرخوازێ، کارێ، شـتێکم بۆ بدۆزێتەوە یان نا... وەڵێ ئێسـتە دەتوانێ چیم بۆ بکا؟ گریمان وانەی تایبەتیشـی بۆ دەسـتەبەر کردم، ئەسـڵەن گریمان دواهەمین سـکەی گیرفانیشـی، هەڵبەتە ئەگەر پارەیەکیشـی هەبێ، لەگەڵمدا بەش کرد و منیش بتوانم پووتێ بکڕم و ڕاسـپێرم جلەکانم پینە بکەن تا بکرێ وانە بە منداڵی خەڵکی بلێمەوە... ئمممم... باشـە، ئەی دواتر؟ ئەم تۆزە پارەیە چ کەڵکێکی من دەگرێ؟ بۆ مەگەر کەلێنێک پڕ دەکاتەوە؟ ئیتر لەمە گاڵتەجاڕانەتر نییە کە بکەومە ڕێ و بچمە لای ڕازومیخین...*

ئەم پرسـیارەی کە بۆچی بەرەو لای ڕازومیخین کەوتووەتە ڕێ، تەنانەت زیاد لەوەش کە بیری لێ دەکردەوە، ڕاسـکۆڵنیکۆفی پەسـت کردبوو و بیری لە تەقەللایەکی دژواردا بوو تـا مـانـایەکی قووڵتر بۆ ئەم بڕیارە بە ڕووالەت ئاساییە بدۆزێتەوە.

*باشـە، یانی ئێسـتە هەر بە ڕاسـتی من چاوەڕێ بووم ئەم ڕازومیخینە دەربەدەرە هەموو کێشـەکانم چارەسـەر بکا؟ یانی ڕازومیخین ڕێگەچارەی ئەم هەموو سەرئێشەیەی من بوو؟*

سـەرسـامانە ئەمانەی لە خۆی دەپرسـین و هەر وا خەریک بوو بیری دەکردەوە و تەوێڵی دەسـڕی کە کتوپڕ پێشـهـاتێکی چاوەڕواننەکراو ڕووی دا. بێ پێشـەکی و دەتگوت کەم تا زۆر بە

هەڵکەوت و بەدوای ئیســـتێکی درێژدا، خۆبەخۆ بیرێکی ئێجگـار سەیروسەمەرەی بە مێشکدا هات. پاشان کتوپڕ لەوپەڕی ئاسوودەیی و وەک ئەوەی بڕیاری کۆتایی دابێت، هاتەوە ســـەر خۆی: ئمممم... *ڕازومیخین. ئەوە هەر دەچمە دیدەنیی ڕازومیخین، بێگومـان دەچم... وەلێ ئێســـتە نا... هەر دەچم بۆ لای... بۆ ڕۆژی دوایی دەچم، ڕۆژی دوای ئەو مەســـەلەیە؛ کاتێک کارەکە ئەنجام درابێ و هەموو شـــتێ سەرلەنوێ دەستی پێ کردبێتەوە...*

کتوپڕ هاتەوە سەر خۆی.

لەســەر نیمکۆتەکە ڕاپەڕی و هاواری کرد: *دوای ئەو مەسەلەیە! بۆ مەگەر دەکرێ؟ نەکا هەر بە ڕاستی ئەوە ڕوو بدا؟*

لە نیمکۆتەکە جیـا بووەوە و بەدەم هەنگـاونـانەوە دوور کەوتەوە. کەم تا زۆر ڕای دەکرد. ویســـتی بەرەو ماڵ بگەڕێتەوە، وەلێ کتوپڕ خەیـاڵی گەڕانەوە بۆ مـاڵ دڵیی لە بێزاری کەیل کرد، ئـاخر هەر لەو کونەمشـکە تۆقێنەرەدا، لە هەمان ئەو سـندووقماڵە پەرپووتەدا بوو کە لە مـاوەی مـانگی ڕابردوودا ئەو خەیـاڵە ڕەگی داکوتی و کەوتبووە ســـەر پێ. لەبەر ئەوە درێژەی بە ڕێگەکەی دا و لێگەڕا پێیەکانی بۆ هەر کوێ کە دەیانەوێ، بیبەن.

هەڵچوونەکەی ئیدی بارێکی تاداری هەبوو و کەم تا زۆر لەرزیشی لێ هاتبوو، بە جۆرێک کە لەو گەرما تاقەتپڕووکێنەدا خەریک بوو ڕەق دەبووەوە. دەتگوت هێزێک هەر بە زۆر لە نـاخەوە نـاچـاری کرد لە تەقەللایەکی نائاگایانەدا، بەوپەڕی ســـەرنجەوە لە هەر شـــتێک ورد ببێتەوە کە بەلایدا تێدەپەڕی؛ دەتگوت زۆر لەســـەر ئەوە ســـوورە کە هەست و هۆشی خۆی شپرزە بکات و بە بابەتێکی دیکەیەوە مەژغوڵ بکا، بەڵام هێندەش سەرکەوتوو نەبوو و هەر وا لە بیرکردنەوەدا نغرۆ بوو. کە لەنـاکـاو بە تەکـانێک ســـەری هەڵدەبڕی و لە چواردەوریی

دەڕوانی، دەمودەســـت بیری دەچوو کە ئاخۆ بیری لە چ بابەتێک دەکردەوە و تەنانەت بەتەمابووە لە چ ڕێگەیەکیشـــەوە بڕوا. بەم دۆخەوە لە سەرێکی دوورگەی ڤاسیلییێفسکییەوە بەرەو ئەوسەری دیکەی چوو، هەنگاوی نایە قەراخ نێڤای بچووکەوە، لە پردەکە تێپەڕی و بەررەو لای دوورگەکان بای دایەوە[1]. سەرەتا بینینی ئەو سەوزایی و جوانییە بۆ چاوانی ماندووی ئەو، کە بە بەرد و خشـــت و بینای گەورە و هەناســـەبڕی یەک لەدوای یەک خووی گرتبوو، خۆش بوو. شـــەقامە تاریک و تەســـکەکان، بۆگەنی و مەیخانەکان و هەر هەموو ئەمانەی جێ هێشتبوون. وەلێ تەنانەت ئەم هەستە نوێ و خۆشە زۆر زوو بووە مایەی ئازار و پێی قەڵس بوو. جاروبار لەبەردەم ئەو ئێلاخانەدا دەوەســـتا کە بە گوڵ و گیا ڕازێندرابوونەوە، جا لەملا و ئەولای پەرژینەکانیانەوە ملێکی درێژ دەکرد. ژنانێکی دەبینین بە جلی کەشـــخەوە کە لە هەورەبان یان بەرهەیوانی ئەوپەری ئێلاخەکاندا دانیشـــتبوون و منداڵانێکیش کە لە باخەکاندا بەمســـەر و بەوســـەردا ڕایان دەکرد. گوڵەکانیان زیاد لە هەر شـتێکی دی سـەرنجیان ڕاکێشـا و زۆربەی کاتەکەی بە سـەیرکردنی ئەوانەوە بەسـەر برد. لە ڕێگەدا، گالیسکەگەلی ڕازاوە و شکۆدار، هەروا ژنان و پیاوانێکیش کە بەسەر ئەسپەوە بوون، بەتەنیشـتیدا ڕابردن. سـەرنجی کونجکۆڵی بەدوایاندا ڕایدەکرد، بەڵام تەنانەت پێش ئەوەی لە بەرچاوی بزر بن، بیری دەچوونەوە. لە شوێنێکیش ڕاوەستا تا پارەکەی بژمێرێت و تەماشای کرد سی کۆپیکی پێیە. *بیست کۆپیکم دایە پاسەوانەکە، سێ دانەش بە ناســـتاســـیا بۆ نامەکە، کەواتە دوێنێ چلوحەوت یان تەنانەت پەنجا کۆپیکم داوەتە خێزانی مارمیلادۆڤ*. لە کاتی حســـێبوکتێبکردندا ئەم بیرانەی بە مێشـکدا ڕابردن، وەلێ هەر زوو بیری چووەوە کە هەر لە

---

[1]. کۆمەڵە دوورگەیەک لە باکووری دەڵتای ڕووباری نێڤادا کە لەڕێی باشـــوور و تێپەڕین بەسەر پردی تۆچکۆف و دوورگەی پیترۆفسکیدا دەیانگەیتێ. «و. ف»

بنەڕەتەوە بۆچی پـارەکەی لە گیرفـانی دەرهێنـاوە. کە بە بەردەم خواردەمەنیفرۆشـییەکدا تێپەڕی، جا بیری هاتەوە کە چەندی برسـییە. چووە ژوور و پێکێک ڤۆدکا و بابۆڵەیەکی خوارد، کە هەڵبەتە نیوەی بـابۆڵەکەی لە دەرێ و بەدەم ڕێوە تەواو کرد. دەمێک بوو ڤۆدکای نەخـواردبـووەوە و گەرچی لە پێکێـک زیـاتریش نەبـوو، کەچـی دەســـتبەجێ کـاریگەریی لەســـەر دانـا. کتوپڕ پێی قورس بوو و خەواڵوویییەکی قورس زۆری بۆ هێنـا. بەرەو مـاڵێ ملی ڕێگەی گرتە بەر، وەلێ هێشـــتا نەگەیشـــتبووە دوورگەی پیترۆفســـکی، لەتـاو ماندوویەتی بڕسـتی لێ بڕا، لە ڕێگەی سـەرەکی لای دا و لەنێو چەند دەوەنێک و لەسەر سەوزاییەک بێهەپوگۆ خەو بردییەوە.

لەو جۆرە بارە نەخۆشـیئامێزانەدا، بە زۆری خەونەکان زێدە سـەیر بەرهەست و ڕوون و هەتا بڵێیت لە ڕاستی دەچن. ڕەنگە دیمەنەکەیان بێڕادە ســـامناک بێت، وەلێ زەمینە و ڕانان و ڕەوتی ڕووداوەکان هێنـدە بـاوەڕپێکراون و وردەکـارییەکـان بە چەشـــنێک بێخەوش و چـاوەڕوانینەکراون و، هێنـدەش هونەرمەنـدانە و یەکـانگیرن، لەگەڵ وێنایەکی گشـــتیدا ئاوێتەن کە خودی ئەو کەســـەی خەونەکەی دیوە، گەرچی هونەرمەندێک بێت لە ئاستی پووشـکین یان تۆرگنێڤدا، کەچی هەر ناتوانێت لە کاتی بێداریدا ئەوانە بئافرێنێ. ئەو خەونە شـــاز و نەخۆشـیئامێزانە هەمیشـــە تا ماوەیەکی زۆر لە یادگەدا دەمێننەوە و کاریگەرییەکی قووڵ لەســـەر مێشـــکی ئەو تاکە بێزار و پەرێشـــانە دادەنێن.

مۆتەکەیەکی تۆقێنەر بوو. ڕاســـکۆڵنیکۆف لە خەونـدا بینیی گەڕاوەتەوە بۆ ســـەردەمی منداڵی و لە شـاره بچووکەکەی خۆیاندایە. شەش‌حەوت ساڵانە و دەمەوئێوارەی ڕۆژێکی پشوو لەگەڵ باوکی لە دەوروبەری شـــاردا پیاســـە دەکات. ڕۆژێکی گرژ و ناخۆش بوو. دیمەنەکە ڕێک بەو جۆرەیە کە لە زەینیدا چەسپیوە؛ تەنانەت دەشکرێ

بڵێین یادگەی ئەو دیمەنەکەی چەندان جار لەوەی کە لە خەونەکەدا دەیدیت، کەمڕەنگتر کردووەتەوە. شار، وەک ئەوەی لە لەپی دەستیدا بێت، لە بەرپێیدا بەرین بووبووەوە و تەنانەت تاقە داریکیشیان ناکەوێتە بەرچاو؛ تەنیا لە ئاسۆیەکی فرە دوورەوە، کە لکاوە بە ئاسمانەوە، دارستانێکی بچووک ڕەش دەکاتەوە. چەند هەنگاوێک لەولاتری دواهەمین بێستانی شارەوە، مەیخانەیەک هەیە، مەیخانەیەکی گەلێک گەورە کە دایمە کاریگەرییەکی ناخۆشی لەسەر ئەو هەبوو و تەنانەت وەختێک لەگەڵ باوکی بە پیادەڕەوی بە بەردەمیدا ڕادەبردن، دەیترساند. دایمەی خوا ئاپۆڕایەک لەوێ جمەی دەهات کە هەمیشە قیڕوهوڕ بوو و قاقا و جنێو و گۆرانیی گوێکەڕکەری ناقۆڵا و بێزارکەر و شەڕ و هەرای نەبڕاوە. لە دەرەوەشیدا ئەوە هەمیشە کەسانێکی بەدمەست و ترسناک ئامۆشۆیان بوو... بە جۆرێک کە هەر کات بەوان دەگەیشتن، ڕاسکۆلنیکۆف لەرزی لێ دەنیشت و خۆی بە باوکییەوە دەنووساند. لە نزیک مەیخانەکەوە باریکەڕێیەکی هەمیشە تۆز و خۆڵاوی گالیسکەڕەوی هەبوو و خاکەکەشی هەر وەک قیر ڕەش بوو. ئەم ڕێگەیە قەمچ و پێچێکی زۆری تێ دەکەوت و دوای سێسەد هەنگاوێک بە دەستەڕاستدا دەگەیشتە گۆڕستانی شار. ڕێک لە ناوەڕاستی گۆڕستانەکەشدا کڵێسایەکی بەردین هەبوو بە گومەزێکی سەوزەوە. ڕاسکۆلنیکۆف ساڵی دوو جارێک لەگەڵ دایک و باوکیدا دەچووە ئەوێ تا لە ڕێورەسمی دوعایەکدا کە بە یادی دایەگەورەیەوە بەڕێوە دەچوو، بەژداری بکات؛ داپیرەیەک کە ساڵانێک لەوەوبەر کۆچی دوایی کردبوو و ڕاسکۆلنیکۆف هەرگیز ئەوی نەبینیبوو. هەمیشەش دەورییەکی سپیی کۆتیایان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد کە دەسرێکیان بەسەردا دابوو. کۆتیاکەیان بە برنج و شەکرد دروست

دەکرد و بە کشمیشیش نەخشی خاچێکیان بەسەریەوە دەکێشا[1]. عاشقی ئەم کڵێسا و کۆتەڵە کۆنانە بوو کە زۆربەیان چوارچێوەیان پێوە نەبوو و هەروەها شەیدای قەشە پیرەکەشی بەو سەرە لەرزۆکەیەوە. گۆڕێکی بچووک لە نزیک کێلی گۆڕی داپیرەیەوە بوو، کە گۆڕی برا بچووکەکەی بوو و بە شەش‌مانگی مردبوو و ڕاسکۆلنیکۆف هیچ هەست و وێنایەکی لەبارەی ئەوەوە نەبوو و تەنانەت بیریشی نەدەهاتەوە، وەلێ پێیان گوتبوو کە برایەکی بچووکی هەبووە و، لەوەودوا، هەر کات کە سەردانی گۆڕستانی دەکرد، بە ڕێز و شەرمەوە خاچێکی بۆ ئەو گۆڕە بچووکە دەکێشا و دەچەمییەوە و ماچی دەکرد. وا ئێستە لە خەونیدا دەیبینی لەگەڵ باوکی بە بەردەم ئەو مەیخانەیەدا تێدەپەڕن و بەتەمان لەو ڕێگە خاکییەوە بچن بۆ گۆڕستان. خۆی بە دەستی باوکییەوە لکاندووە و هەیتاهەیتا لا دەکاتەوە و تۆقیوانە لەو مەیخانەیە دەڕوانێت کە دۆخێکی تایبەت سەرنجی ڕادەکێشێت: وەک ئەوەی جەژنێک لەئارادا بێت، هەموو جۆرە مرۆڤێکی لێیە، کۆمەڵێک ژنی عەوام بە جلی کەشخەوە و ژنگەلێکی لادێییش لەگەڵ مێردەکانیاندا. هەمووان خەریکی خواردن و خواردنەوەن و کەم تا زۆریش سەرخۆشن. عەرەبانەیەکی سەیریش لەوێ لەبەردەم دەرگەی مەیخانەکەدایە؛ لەو عەرەبانە گەورانەی کە بە ئەسپە بارکێشە شەشدانگەکانیانەوە دەبەستن و بار و داریلە[2] شەرابیان پێ دەبەن. هەمیشە حەزی لە تەماشاکردنی ئەم ئەسپە کەتە و یاڵدرێژ و لاقئەستوورانە بوو کە هەنگاوی هاوئاهەنگ دەنێن و تەپە بارێک لەگەڵ خۆیاندا کێش دەکەن و هەر بە خەیاڵیشیاندا نایێت و

---

١. کۆتاییان بۆ ڕێوڕەسمی بەسەرکردنەوە دەبردە گۆڕستان و کڵێساکان. *باریس تیخامیرافیش* لە شرۆڤەکەیدا ئاماژەی بە یادگاریی سەرسوڕهێنی منداڵیی ڕاسکۆلنیکۆف (شیرینیی خاچ) کردووە. «و. ف»

١. داریل: دەفری گەورەی دارین بۆ تراو؛ کووپەداری سەرگیراو.

وەک ئەوەی کە کێشکردنی باریان لە ڕێکردنی بێ بار بەلاوە ئاسانتر بێت! وەلێ دەتگوت ئەم جارەیان جیاوازە و سەیر ئەوە بوو کە ماینێکی ئاڵی بچووکیان کە تەنیا پێست و ئێسقانەکەی لێ مابووەوە، بەم عەرەبانە گەورەیەوە بەستبوو؛ ماینێکی کەنەفتی لادێ، لەوانەی کە زۆر جار بینبوونی لەژێر کۆمای هێزم و گژوگیادا پڕووکابوون، بەتایبەت گەر عەرەبانەکە لە قوڕ یان چاڵێکدا چەقیبووبا. لەو هەولومەرجانەدا، لادێییەکان دڵڕەقانە بە قامچی دەکەوتنە گیانی و هەندێک جاریش تەنانەت ڕاستەوخۆ بە قەپۆز یان چاویاندا دەکێشا و ڕاسکۆڵنیکۆف بە بینینی ئەم دیمەنانە هێندە خەفەتی ئەسپەکانی دەچووە دڵەوە کە وەخت بوو لە پرمەی گریان بدات و دایکیشی زۆر جار ئەوی لە بەرپەنجەرەکە دوور دەخستەوە. وەلێ ئێستاکە کتوپڕ بووبووە هەراوهوریایەکی ناجۆر: جووتیارە ملهووڕە سەرخۆش و پاتاڵەکان، کە کراسی سوور و شینیان لە بەردا بوو و کۆتی ئەستووریان بە شانیاندا دابوو، بە بالالایکای[1] دەستیانەوە و بەدەم نەڕاندن و گۆرانیگوتنەوە لە مەیخانەکان وەدەر دەکەوتن. یەکێکیان کە هێشتا گەلێک گەنجە و ملئەستوور و ڕووخسارێکی پانی هاوڕەنگی گێزەری هەیە، هاوار دەکات:

– سەرکەون، یەڵا! هەر هەمووتان دەگەیەنم. یەڵا دانیشن با بڕۆین!

وەلێ ئەوانی دی بە قاقا و نەڕەوە هەر یەکەو شتێک دەڵێت:

– ئا بزانم، یانی تۆ دەتەوێ هەر بەم ماینە ئێمە بگەیەنی!

---

١. Balalaika: ئامێرێکی مۆسیقی ڕووسیی میلییە، لە تەختە دروست دەکرێت، بە زۆری سێ تاڵ یان چوارژێیە، دوو ژێی یەکەم هەمان دەنگ دەردەکەن و ژێی سێیەم دەنگێکی جیا و تەواو، ژێی چوارەمیش دەنگێکی بەرزتر لەوانەی پێش خۆی. «و. ک»

– میکۆلکا، دەڵێی تەواو نیی! ئاخر یانی بڕیارە ئەم پیرەماینە مردۆخە وەها عەرەبانەیەک ڕاکێشێ؟

میکۆلکا هەمدیسان هاوار دەکاتەوە:

– یەڵا، سەرکەون، هەمووان دەگەیەنم!

خۆی بەر لە هەمووان باز دەداتە ســەر عەرەبانەکە، هەوســارەکە دەگرێتە دەست و قیت لە سەرەوە دادەنیشێت و دەقیڕێنێت:

– *ماتڤی* ئەسپە سوورەکەی بردووین و تەنیا ئەم ماینە پیرە هەیە کە دیقی پێ کردووم، ڕەفیقان... هەر دەڵێی قیروســـیای لێ بکەم و بیکوژم! ڕاگرتنیشی هەر خەسارکردنی پارەیە، حەیف بۆ ئەو لەوەڕە! دەڵێم ســـەرکەون دەی! ئێســـتە دەیبینن، وەهـا دەیخەمە غـار کە چوارناڵتان بۆ بکا!

قامچی دەردەهێنێ و بە خەیاڵی قامچیکاریی ماینە بەستەزمانەکەوە کەیف دەکات. ئەوانی دیکەش دەکەونە پێکەنین و هەڵاوهۆســـە و هەر کەسەو شتێک دەڵێ:

– باشە، بۆ نا؟ با سەرکەوین!

– ئەرێ، بیستت؟ چوارناڵ!

– گرەو دەکەم دەساڵێک دەبێ چوارناڵی نەکردووە!

– دەی ئێستە دەیکا!

– ڕەفیقـان، بەزەییتـان پێیدا نەیێتەوە؛ هەر کەســـەو قـامچییەک دەربێنێ و ئامادە بێ!

– ئەها، دەی لێی دە!

هەمووان بەدەم قاقالێدان و تانە و تەشـــەرەوە ســـەر عەرەبانەکەی میکۆلکا دەکەون. شەش کەس سوار بوونە و هێشتاکەش شوێن هەیە. ژنێکی قەڵەو و گۆناسووریشیان لەگەڵ خۆیان سەرخستووە. ژنەتیوە کراســـێکی کەتانی ســـووری پۆشـــیوە، ســـەرپێچێکی بەزەنگیانەی گۆشەداریشی بە سەرەوەیە و پووتێکی چەرمی لە پێدایە، گوڵەبەڕۆژە دەترووکێنێ و دەتریقێتەوە. هەموو ئەوانەی لەوێ کۆبوونەتەوە پێـدەکەنن. بۆ مەگەر دەکرێ پێنەکەنن؟ مـایینێکی پیر و کۆڵەواری باربردن لەژێر ئەو بارە قورســەدا و چوارناڵ؟! دوو گەنج کە لەســەر عەرەبانەکەن هەر یەکەو قامچییەک دەردەهێنن تا یـارمەتیی میکۆلکا بدەن. یەکێکیان هاوار دەکا: *هێی! یەڵا بەڕێ کەوە!* بەســـتەزمانی وا هەموو توانای جەستەی کۆ دەکاتەوە تا عەرەبانەکە ڕابکێشێت، وەلێ تەنانەت پێشـــی بۆ ناجووڵێت چ جا چوارناڵی پێ بکات؛ کورتەهەنگاو هەڵدەهێنێتەوە و دەنرکێنێ و لەژێر بارانی گورزی ســـێ قامچیدا پتر پشـــتی دەنووشـتێنێتەوە. دەنگی پێکەنینی کەسـانی ناو عەرەبانەکە و ئەوانی دی زیـاتر بەرز دەبێتەوە، وەلێ جوێن بەرچـاوی میکۆلکـای گرتووە و گورزەکانی توند و توندتر بەر پشـــتی ئاژەڵەکە دەکەون، دەڵێیت هەر بە ڕاستی بڕوای وایە کە ماینە پیرەکە دواجار دەکەویتە غار. گەنجێکی دیکە کە کەیفی بەم بەزمە هاتووە، لەنێو ئاپۆڕاکە هاوار دەکات:

– کاکە، بوەستن وا ئێمەش هاتین!

میکۆلکا دەقیرێنێ:

– تۆش ســـەرکەوە! هەمووتـان بێن! دەبێ هەمووان ببـا، گەرنـا ئەوەندەی لێ دەدەم تا دەتۆپێ!

هێندەی قامچی لێ دەدا و لێ دەدا کە ئیدی لەو بارە شـــێتانەیەدا نازانێت کە بە چی و چۆن زیاتر لێی بدات.

راسکۆلنیکۆف ڕوو لە باوکی دەڵێت:

– باوکە، باوکە گیان! ئەمانە خەریکی چین، باوکە؟ باوکە گیان، وا ئەو ئەسپە داماوە دەکوژن!

– وەرە بڕۆین، کوڕم، با بڕۆین! ئەمانە تەنیا کۆمەڵێ گەمژەی سەرخۆشن و خەریکی قەشمەریاتن. با بڕۆین، کوڕم. لایان لێ مەکەوە!

باوکەکە ئەمە دەڵێت و هەوڵ دەدات کوڕەکە هێور بکاتەوە و بیبات، وەلێ ئەو دەستی لە نێودەستی باوکەکەی ڕادەپسکێنێ و بە عەزرەتەوە بەرەو لای مایین و عەرەبانەکە هەڵدێت. وەلێ مایینە هەناسەساردەکە ئیدی برستی لێ براوە. تەقەللا دەدات و هانکەهانکیەتی. دووبارە دەوەستێتەوە، جارێکی دی زۆر لە خۆی دەکات و بە لادا دەچێت. میکۆلکا دەقیرێنێ:

– ئەوەندەی لێ دەن تا مردار دەبێتەوە، خۆی ئەمەی دەوێ! ئەوەندەی لێ دەدەم هەر نەبێتەوە!

پیرەمێردێک لەنێو ئاپۆڕاکەدا هاوار دەکات:

– تۆ لە خوا ناترسی، خوێڕیی شێت؟

دەنگێکی دی درێژەی پێ دەدات:

– ئاخر ئەم پیرەمایینە چۆن بارێکی هێندە قورس ڕاکێشێ؟

کەسی سێیەم دەقیرێنێ:

– کاکە خۆ کوشتت!

– بە ئێوە چی! ماڵی خۆمە؛ ماڵی خۆمە و چیم بوێ لێی دەکەم! سەرکەون، لەگەڵ هەمووتانمە. دەبێ چوارناڵ بکا!

شەپۆلی پێکەنینێکی کتوپڕانە هەموو شتێک لە خۆیدا نغرۆ دەکات. ماینە پیرەکە ئیدی بەرگەی ئەو هەموو قامچییە یەک لەدوای یەکە ناگرێت و هەناسەسارد و شەکەت دەکەوێتە لەقەوەشاندن. تەنانەت پیرەمێردەکەش ناتوانێت بەر بە بزەی تاڵی سەر لێوی بگرێت و هەر بە ڕاستیش ئەوە شتێکی سەیرە کە ماینێکی هێندە پیر و کەنەفت لەقە بوەشێنێت!

دوو هەرزەکار لە ئاپۆڕاکەدا وەدەر دەکەون، هەر یەکەو قامچییەکی بە دەستەوەیە و بەرەو ماینە پیرەکە هەڵدێن تا لە لاکانیشەوە لێی بدەن و لە دوو لاوە هەڵدەکوتنە سەری. میکۆلکا دەقیڕێنێ:

– ئاوا، دە لێی دەن، لە قەپۆزی دەن، لە چاوەکانی... لێدەن، بە چاوەکانیدا بکێشن!

یەکێک لە عەرەبانەکەوە هاوار دەکات:

– با گۆرانییەک بڵێین، ڕەفیقان!

هەموو ئەوانەی کە سواری عەرەبانەکەن، لەگەڵ ئەودا، پێکڕا بە دەنگێکی ناساز گۆرانییەک دەڵێن؛ جا زرنگەزرنگی گەواڵێک هەڵدەستێ و بێدەنگی دەشکێنێت. ژنەی ناو عەرەبانەکەش هەر وا خەریکی تروکاندنی گوڵەبەڕۆژەیە و دەتریقێتەوە... ڕاسکۆڵنیکۆف بەلای عەرەبانەکەدا ڕادەکات، لێیان نزیک دەبێتەوە و دەبینێت کە چۆن قامچی بە چاوی ماینەکەدا دەکێشن، ڕێک بە چاویدا! ڕاسکۆڵنیکۆف دەست دەکاتە گریان؛ دەتگوت دڵی وا خەریکە دێتە دەرێ و لافاوی فرمێسک هەڵدەستێت. لێدانی یەکێک لە قامیچیبەدەستەکان بەر ڕووخساری دەکەوێت، وەلێ هەست بە هیچ ناکات. بەرەو لای ئەو پیرەمێردە ڕیشسپییە ڕادەکات و پیرەمێردیش بە ناڕەحەتییەوە سەر با دەدات. ژنێک دەستی دەگرێت و هەوڵ دەدات کێشی بکاتە لاوە،

وەلێ هەمدیسان خۆی ڕادەپسکێنێ و ڕادەکاتە لای ئەو مایینەی کە بە تەواوی هێزی لێ براوە بەڵام بە زۆر خەریکە جووتە دەوەشێنێ.

میکۆلکا لە ڕقاندا هاوار دەکات:

– شێت بووی، ئاژەڵ، ها؟

قامچییەکە دەخاتە سەر زەوی، بەسەر عەرەبانەکەدا دەنووشتێتەوە و لەناویدا تیرە ماڵبەندێکی گەورە ڕادەکێشـــێتە دەر و بە هەردووک دەست لە سەرێکەوە دەیگرێت و بەوپەڕی توانایەوە بەرزی دەکاتەوە و بە تەپڵەسەری مایینە چارەڕەشەکەیدا دەدات.

کەسانی چواردەوری هاوار دەکەن:

– ئەوە کەللەی وردوخاش دەکا!

– هاکا کوشتی!

میکۆلکا بە هەموو هێزییەوە تیرەکە دەوەشێنێ و دەقیڕێ:

– هی خۆمە!

جا دەنگی لێدانێکی توند بەرز دەبێتەوە.

لەنێو کەسانی سەر عەرەبانەکەدا هاوارێک هەڵدەستێ:

– لێی دە، لێدە، وازی لێ نەهێنی!

میکۆلکا بۆ دووەمین جار تیرەکە بەدەوری سەریدا دەسووڕێنێتەوە و گورزێکی ســـــامنـاکی دیکە بە نـاوقەدی بـاریکینە کۆڵەوارەکەدا دەکێشێت. مایینەکە لەسەر بەشی خوارەوەی جەستەیدا دەگلێت، وەلێ هەمدیسـان هەڵدەسـتێتەوە و هەوڵی ڕاکێشـانی عەرەبانەکە دەدات. بە دواهەمین تۆســـقاڵی ئەو توانایەی کە بۆی ماوەتەوە، جارێک لەملاوە زۆر دەکات و جارێکی دی لەولاوە و هەوڵی خســـتنەڕێی عەرەبانەکە

دەدات، وەلێ شـــەش قـامچی لە هەموو لایەکییەوە گورزبـارانیـان کردووە. تیری ماڵبەندەکە بۆ سـێیەمین جار بە هێزەوە بەرز دەبێتەوە و دادێتەوە و پاشـــان گورزی چوارەمیش. میکۆلکا لەوە دەیری بووە کە نەیتوانیوە بە یەک لێدان مایینەکە بکوژێت.

یەکێک لەنێو ئاپۆڕاکەوە هاوار دەکات:

– چەندە گیانسەختیشە!

یەکێکی دی لە تەماشاکەرانی دیمەنەکە دەقیڕێنێ:

– ئێستە دەکەوێ، ڕەفیقان! ئەوەندەی نەماوە نەجاتی بێ!

سێیەم هاوار دەکات:

– دە تەورێ بێنن و تەواوی کەن!

میکۆلکا شێتانە دەقیڕێنێ:

– ئێستە نیشانت دەدەم! ئا لاچن لەوێ!

ماڵبەنەکە فڕێدەدات و جارێکی دی دەچێت و بەســەر عەرەبانەکەدا دەنووشـــتێتەوە و ئەم جارەیان شـــیشـــێکی ئاســـنین دەردەهێنێ و دەنەڕێنێ *ئا بڕۆنە دواوە!* جا بە ئەوپەڕی توانای خۆیەوە بەو ماییـنە کلۆڵەدا دەکێشـــێت. گورزێکی هێندە کوشـــندەی پێدا دەکێشـــێت کە مـاییـنەکە دەکەوێتە لەتردان و وەختە بکەوێت، هەمـدیســـــان هەوڵی ڕاکێشـــانی عەرەبانەکە دەداتەوە، وەلێ جارێکی دی شـــیشـــەکە بەر ناوقەدی دەکەوێت و ئەم جارەیان وەک ئەوەی هاوکات لە هەر هەر چوار پێیـان دابێـت، تەختی زەوی دەبێـت. میکۆلکـاش لەوپەڕی گێژووڕیدا لەسەر عەرەبانەکەوە باز دەداتە خوارێ و دەقیڕێنێت:

– یەکجاریی بکەن!

چەندان کەسی دیکەش بە ڕووخسارگەلی سوور و سەرخۆشانەوە هەرچییان بە دەســـتەوە دێت، هەر لە قامچییەوە بیگرە تا دەگاتە تەختەدار و شـــیش، هەڵیدەگرن و بەرەو ئاژەڵە نیوەگیانەکە شـــاڵاو دەبەن. میکۆلکا لە لایەکەوە دەوەستێت و میلەکە بە پشتیدا دەکێشێت. ماینەکە قەپۆزی دەخاتە سەر زەوی، هەناسەیەکی قورس هەڵدەکێشێ و گیان دەدات. لەنێو ئاپۆڕاکەوە دەنگێک هەڵدەستێت:

– یەکجاری بوو!

– دەی، خەتای خۆی کە چوارناڵی نەکرد!

میکۆلکا بە چاوانی گۆمی خوێن و شیشەبەدەست لەوێ ڕاوەستاوە:

– ماڵی خۆمە!

دەڵێیت زۆر بەداخە بۆ ئەوەی کە هیچ شتێکی دیکەی لە بەردەستدا نییە، تا لێی بدات. لەنێو ئاپۆڕاکەوە چەند دەنگێک هاوئاواز بەرز بوونەوە:

– لە خوا نەترسای؟

بەڵام کوڕەی داماو لەســـەر خۆی نییە. دەزریکێنێ و بەرەو لای ماینەکە دڕ بەو ئاپۆڕایە دادەدات. دەستەکانی بە دەوری دەموقەپۆزی خوێناویی ئەودا دەهێنێت و ماچی دەکات؛ چاو و لەوسی ماینەکە ماچ دەکات. پاشان پرتاوێک دەکات و بە بۆگزە بچووکەکانییەوە پەلاماری میکۆلکا دەدات. ڕێک لە هەمان کاتدا، باوکی کە بەدوایدا ڕادەکات، دواجار دەیگرێت و لەنێو ئاپۆڕاکە دەیباتە دەرەوە.

– وەرە، وەرە بڕۆینەوە ماڵێ!

– باوکەلێ! ئاخر بۆچی کوشتیان... بۆچی؟

بەدەم فرمێسکبارانەوە ئەمانە دەڵێت، وەلێ هەناسەی سوارە و وشەکان لەو سنگەیەوە کە هەر دەڵێیت هاکا شەقی برد، حەسرەتبارانە دێنە دەرێ. باوکی دەڵێت:

– هیچ نییە، کوڕم! ئەمانە تەنیا کۆمەڵێ سەرخۆشن و خەریکی قەشمەریاتن. پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە!

دەستەکانی بە دەوری قەدی باوکیدا دەئاڵێنێت، بەڵام دڵی شکاوە.

دەیەوێت هەناسەدانی ئاسایی ببێتەوە و هاوارێک بکات، کە کتوپڕ لە خەو ڕادەچڵەکێت. ڕاسکۆلنیکۆف لە ئارەقەیەکی ساردا لە خەو ڕاچڵەکی. ئارەقە بە قژەکانیدا دەهاتە خوار و تووشی هەناسەبڕکێ بووبوو. تۆقیوانە کەمێک خۆی بەرز کردەوە، لەژێر دارێکدا دانیشت و لە بارێکدا کە هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا، گوتی:

– سوپاس خوایە! مۆتەکە بوو! باشە من دەردم چییە؟ نەکا تام لێ هاتبێ... ئای لەو خەونە تۆقێنەرە!

سەراپای لەشی کفت و کوتراو بوو و ڕۆحیشی ڕەش و پەرێشان. ئەنیشکەکانیی خستنە سەر ئەژنۆکانی و دەستەکانیشی بە سەریەوە نان. *خوایە! یانی هەر بە ڕاستی من، هەر بە ڕاستی من تەور هەڵدەگرم و دەیکێشم بە سەری ئەو پیرێژنەدا؟ یانی هەر بە ڕاستی پێم دەخەمە خوێنی گەرمی ئەوەوە، بە زۆر قوفڵی ئەو سندووقە دەکەمەوە، دزی دەکەم، هەڵدەلەرزم و خۆم دەشارمەوە، جا گەوزاو لە خوێنیشدا و... تەوربەدەست؟ خوایە، ئەی پەروەردگار، یانی هەر بە ڕاستی ئەوەم لێ دەوەشێتەوە؟*

*بەدەم گوتنی ئەمانەوە وەک بی دەلەرزی.* جارێکی دیکەش خۆی بەرز کردەوە و وەک ئەوەی تەواو تاسابێت، درێژەی پێ دا: *ئای لەو قسە قەڵبوقۆڕانە! خۆ من هەر خۆم دەمزانی کە ئەوەم لێ ناوەشێتەوە و پیاوی ئەوە نیم، ئەی بۆچی بە درێژایی ئەم هەموو ماوەیە خەریکم خۆم ئەشکەنجە دەدەم؟ دوێنێ، هەر دوێنێ کە ڕۆیشتم گوایە مەشقی لەسەر بکەم، زۆر باش تێگەیشتم کە دەرەقەت نایێم و لەژێر ئەو*

*بارەدا دەپلیشێمەوە... کەواتە بۆچی وا هەمدیسان بیری لێ دەکەمەوە؟ چۆن دەکرێ هێشـــتا هەر ڕاڕا بم، ها؟ ئەی دوێنێ کە لەو پلیکانانەوە هاتمە خوارێ، نەمگوت ســـەرلەبەری ئەم بیر و خەیاڵانە تاوانن؟ ئەی نەمگوت ئای لەو کارە چەپەڵە؟ تەنانەت وێناکردنیشـی وەهای تۆقاندم کە نەخۆش کەوتم! نـا کـاکە، من پیـاوی ئەوە نیم، دەرەقەت نـایێم! گریمان هەموو نەخشــــە و وردەکارییەکانم لەجێ بن و هەر بڕیارێک کە لەم مانگەدا داومە وەک ڕۆژ ڕۆشـن و دوو کەڕەت دوو یەکسـانە بە چوار بن... وەلێ خوایە، لەگەڵ ئەوەشـــــدا هەر زاتیم نییە. دەزانم، کۆتاییەکەی هەر تێدەکەوم! دەزانم کە دەرەقەت نایێم! ئەی بۆچی هەر وا خەریکم پێچ دەدەمە خۆم؟*

هەستایەوە، بە سەرسووڕماوی ڕووانییە چواردەوری، وەک ئەوەی خۆشـی نەزانێت بۆچی هاتووەتە ئەوێ. بە ئاراسـتەی پردی تۆچکۆف کەوتە ڕێ. ڕەنگی بە ڕووەوە نەبوو، چـاوی دەکزایەوە و ئـازای ئەندامی لەتاو کوتراوی چڵی دەدا، بەس دەتگوت هەناسەدانی ئاسـانتر بووە. هەسـتی دەکرد لە شەڕی بارێکی تۆقێنەر و قەدشکێن کە لەمێژ بوو لە کۆڵی نـابوو، نەجـاتی بووە و وەک ئەوە وابوو ڕۆحیشـــــی سووکباڵ و هێور بووبێتەوە. دوعای کرد: *خوایە خۆت ڕێگەی ڕاستم نیشان بدە و منیش واز لەم فکرە نەفرەتیانە دەهێنم.*

کاتی تێپەڕین بەســـەر پردەکەدا، ئارام و ئاســـوودە ســـەیری ئاوی ڕووباری نێڤا و زەردەپەڕی خۆری درەوشاوەی کرد. وێڕای بێهازیی جەسـتەیی، بە هیچ شـێوەیەک ماندوو نەبوو. دەتگوت ئەو دمەڵەی[1] کە مانگی ڕابردوو بەسەر دڵییەوە ڕوابوو، پێگەییوە و دەمی کردووەتەوە. ئیدی ئەوە ئازادی بوو! ســـەربەســـتی بوو! ئێســـتە ئیتر لە ســـیحر و جادووی هەموو خەیاڵات و فریوە نەفرەتییەکان ڕزگاری بووبوو!

---

١. دمەڵ، دومەڵ: جۆرە برینێکی بەسوێیە لە جەستە دەردێ.

دواتر هەر کاتێک کە خولەک بە خولەک و هەنگاو بە هەنگاو و خاڵ بە خاڵ بیری لەم بڕگەیە و ئەوە دەکردەوە کە لەو ڕۆژانەدا بەسەری بردبوو، پێشهاتێکی تایبەت زیاتر لە هەر شت زەینیی گیرۆدە دەکرد، بابەتێک کە لە ڕاستیشدا هێندە سەیر نەبوو، وەلێ دواتر ئەوەی بە دیاریکەری ئاقیبەتی خۆی دەزانی. بابەتەکەش ئەوە بوو کە هەر لە بنەڕەتەوە بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی لەوە تێبگات یان پاکانە بۆ خۆی بکات کە بۆچی ئەو ڕۆژە لە ڕێگەی بازاری سێنایاوە گەڕاوەتەوە ماڵێ، ئاخر خۆ ئەو هیچ ئیشێکی بەوێ نەبوو و بەو شەکەتی و بێتاقەتییەوە وا باشتر بوو کە لە ڕاستترین و کورتترین ڕێگەوە بگەڕێتەوە ماڵێ. ناکرێ بڵێیت بە تەواوی چەوتەڕێ بوو، بەڵام ڕێگەیەکیش نەبوو بە هەڵە خۆتی پێدا بکەیت و بە کەڵکی ئەویش نەدەهات. هەڵبەتە ئەوە ڕووی دابوو کە چەندان جار لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بەرەو ماڵ، نەزانێت لە چ شەقامگەلێکەوە ڕابردووە، وەلێ بۆ هەمیشە ئەوەی وەک مەتەڵێک لەلا مایەوە کە بۆچی و چۆن ئەم تووشهاتنە بە هەڵکەوتەی بازاری سێننایا دەبێت کتومت لەو ڕۆژ و کاتژمێر و ساتە تایبەتەی ژیانیدا بێت، تووشهاتنێک بەو گرنگی و چارەنووسسازییەوە بۆ ئەو لە شوێنێک کە بە هیچ شێوەیەک پێویست نەبوو پێیدا ڕابووربێت؟ بۆچی ڕێک لە کاتێکدا کە ئەو لە هەلومەرجێکی ڕۆحی و دۆخێکی پەرێشاندا بوو، وەها پێشهاتێک هاتە پێش کە زۆرترین و سەرەکیترین کاریگەریی لەسەر چارەنووس و ماوەی ژیانی ئەو دانا؟ هەر دەتگوت ڕێک لەوێ چاوەڕێیە تا ئەو دێت!

نزیکەی کاتژمێر نۆی شەو بوو کە گەیشتە گۆڕەپانی بازاری سێنایا. کاسبەکان خەریک بوون پشت مێز و ناو دوکانۆکە و دوکانەکانیان کۆ دەکردەوە تا ئیدی بەرەبەرە بگەڕێنەوە ماڵێ، یان دەرگەکانیان کڵۆم دەدان و کەلوپەلەکانیان دەهێنانە خوارێ و دەیانخستنە لایەکەوە تا لەگەڵ خۆیاندا بیانبەنەوە. موشتەرییەکانیش بەرەبەرە بڵاوەیان لێ دەکرد. لە گۆڕەپانی پیس و بۆگەنی بازاڕەکەدا،

نزیک چێشتخانەکانی نهۆمی خوارەوەی بیناکان و بەتایبەت پەڕانپەڕی مەیخانەکانی بازاری سێننایا، هەموو چەشنە کۆنەفرۆش و میوەفرۆشێکی گەڕۆک لێک دەئالان. ڕاسکۆلنیکۆف زۆربەی کات لە وەختی سووڕانەوە بێئامانجەکانی خۆیدا بەرەو ئەو شوێنانە ملی دەنا و لە دڵەوە کەیفی بەوێ و شوێنەکانی چواردەوری دەهات. لەوێ سپیالەکانی بەری نە دەبوونە مایەی سووکایەتی و نە شەرمەزاری، چونکە لەوێ هیچ کەسێک بە ئەندازەی سەرە دەرزییەک گرنگیی بەوە نەدەدا کە سەروسیمای مرۆڤ چۆنە. لە سەری کۆلانێکەوە، وردەواڵەفرۆشێک لەگەڵ ژنەکەیدا لەسەر دوو مێز شتەکانیان دانابوون و داو و قردێلە و لۆکە و دەسڕ و ئەم جۆرە شتانەیان دەفرۆشتن. ئەوانیش بەتەمای پێچانەوەی وردەواڵەکەیان بوون، بەڵام جارێ ڕاوەستابوون تا چەند ساتێک قسە لەگەڵ یەکێک لە ناسیاوەکانیاندا بکەن کە لە هەمان کاتدا هاتبووە لایان. ناسیاوەکەشیان هیچ کەسێک نەبوو بێجگە لە *لیزاڤێتا ئیڤانۆڤنا*، کە بە لیزاڤێتا ناویان دەبرد؛ خوشکی بچووکی هەمان ئالیۆنا ئیڤانۆڤنای بێوەژنی ڕاوێژکارێکی میری، هەمان پیرێژنی سووخۆر کە ڕاسکۆلنیکۆف ڕۆژی ڕابردوو چووبووە لای تا کاتژمێرەکەی بخاتە گرەوەوە و مەشق لەسەر نەخشەکەی بکات... دەمێک بوو کە زانیاریی تەواوی لەبارەی ئەم لیزاڤێتایەوە دەستخستبوو و تەنانەت ژنەکەش تا ڕادەیەک ئەوی دەناسی. لیزاڤێتا قەیرەکچێکی لەشناقۆلای سیوپێنج ساڵە و باڵابەرز، دەستوپێسپی، شەرمن و سەرکز و کەمێکیش بێئاوەز بوو. کەنیزێکی[1] ئەڵقەلەگوێی خوشکەکەی بوو و شەوڕۆژی بۆ ئەو دابووە دەم یەک، لەبەردەمیدا هەڵدەلەرزی و تەنانەت بە دەستییەوە شەقیشی دەخوارد. بوخچەلەدەست و دڕدۆنگ لەبەردەم وردەواڵەفرۆش و ژنەکەیدا ڕاوەستابوو و بە سەرنجەوە گوێی لێ

---

١. کەنیز: کەنیزە؛ کچ یان ژنی کۆیلە.

دەگرتن و ئەوانیش خەریک بوون بە گوڕوتینەوە بابەتێکیان بۆ باس دەکرد. ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ کە ئەوی دیت، هەستێکی نامۆ گیانیی تەنییەوە، وەک جۆرە سەرسامییەکی قووڵ وا بوو، گەرچی وەها دیدەنییەکیش بە هیچ جۆرێک مایەی سەرسووڕمان نەبوو.

وردەواڵەفرۆش خەریک بوو بە دەنگی بەرز دەیگوت:

– لیزاڤێتا ئیڤانۆڤنا، باوانەکەم، ئاخر بۆچی خۆتان بڕیار بۆ خۆتان نادەن؟ ئێوە بەیانی نزیکەی حەوت لێرە بن. ئەوانیش دێنە ئێرە.

لیزاڤێتا، پێدەچوو دوودڵ بێت و زۆر هێواش و تێفکرانە قسەی دەکرد:

– یانی بەیانی؟

ژنەی زۆڵی وردەواڵەفرۆشەکەش پەلەپەل چەنەی دەدا:

– ئەم ئالیۆنا ئیڤانۆڤنایەش باش چاوترسێنی کردووی ها! کە تۆ دەبینم خاتوون گیان، لەبەرخۆمەوە دەڵێم ئەم داماوە هەر دەڵێی منالە، بەبەیە! خوشکەکەشت خۆ خوشکی هەقودادت[1] نییە! توخوا سەیر کە چۆن پەرپیوەتە کۆڵت!

مێردەکەی بۆی سەندەوە:

– بۆ ئەم جارەیان پێویست ناکا هیچ بە ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا بڵێن. ئەم ئامۆژگارییەم لێ وەرگرن هیچی پێ نەڵێن و تەنیا هەڵسن و بێن. ئەم کارە شایەنی ئەوەیە و پاشانیش خوشکەکەتان خۆی تێدەگا کە شایەن بووە.

– ئێ، یانی بێم؟

– تەماشا، بەیانی کاتژمێر حەوت. لەلایەن ئەوانیشەوە کەسانێک دێن. ئیتر بڕیار لەدەست خۆتانە، ئازیز گیان.

ژنەکەی بۆی زیاد کرد:

– چایەکەش لەسەر ئێمە.

---

١. خوشکی هەقوداد: خوشکێک کە لە دایک و باوکەوە خوشکە.

لیزاڤێتا هەر وا خەریکی سەنگوسووککردنی بابەتەکە بوو:

– دەی باشە، دێم.

ئەمەی گوت و ویستی بڕوات. ڕاسکۆلنیکۆف لەم کاتەدا ئیدی تێپەڕی و شتێکی زیاتری نەبیست. بێدەنگ و بە شێنەیی بەتەکیاندا ڕابرد تا بتوانێت یەک بە یەکی قسەکانیان ببیستێت. سەرسووڕمانەکەی سەرەتای بەرەبەرە گۆڕابوو بۆ تۆقینێک کە وای دەکرد پشتی بتەزێت و تەزووی پێدا بێت. تەواو چاوەڕواننەکراو و کتوپڕانە تێگەیشتبوو کە سبەی، کاتژمێر حەوتی ئێوارە، لیزاڤێتا، خوشکی ئەو پیرێژنە سووخۆرە و تاقەهاوماڵی، لە ماڵەوە نابێت و، سەرئەنجام، ڕێک کاتژمێر حەوت پیرێژن *لە ماڵێ بە تەنیایە*.

ڕاسکۆلنیکۆف گەیشتبووە نزیک ماڵەکەی. بە سەروسیمای ئەوانەوە کە سزای گوللەبارانیان بەسەردا سەپێنراوە، خۆی بە ماڵەوەدا کرد. بیری لە هیچ شتێک نەدەکردەوە و توانای بیرکردنەوەشی هەر نەبوو؛ پڕاوپڕ هەستی دەکرد کە ئیدی نە جڵەوی ئەقڵ و نە لۆژیکیی لەدەستدایە و نە ئازادیی ویستیش. دەتگوت هەموو شتێک دواهەمین بڕیاری لەسەر دراوە و بڕێندراوەتەوە.

هەڵبەتە ئەگەر ساڵ تا ساڵیش چاوەڕوانی کاتێکی گونجاوی بکردبا و نەخشەکەشی ئامادە با، هەر بڕوای نەدەکرد کە وەها هەلێکی شازی بۆ جێبەجێکردنی نەخشەکەی دەست بکەوێت. هەرچۆنێک بووە، دژوار بوو ڕێک ڕۆژێک پێشتر، بەو وردییەوە و بەوپەڕی سەرکێشیکردنەوە، بەبێ پێویستکردن بە لێکۆڵینەوە و پرسیارکردنێکی گومانبزوێن، لەوە دڵنیا بێتەوە کە سبەینێ، لە فڵانە کاتژمێر، فڵانە پیرێژن کە پیلانی کوشتنی دانراوە، لە ماڵەوە بە تەنیا دەبێت.

## شەش

ڕاسکۆلنیکۆف دواتر بە هەڵکەوت تێگەیشت کە ئەو وردەواڵەفرۆشە و ژنەکەی کتومت لەبەر چی لیزاڤێتایان بانگهێشت کردبوو؛ بابەتێکی ئاسایی بوو و لە خۆیدا گرنگییەکی وای نەبوو. خێزانێک کە تووشی هەژاری بووبوون و لەم دواییانەدا هاتبوونە شارەکەی ئەوان، وردەواڵە جۆراوجۆرەکانیان دەفرۆشتن، جلوبەرگ و ئەم جۆرە شتانە و هەمووشی ژنانە بوو. جا لەبەر ئەوەی لە بازاڕدا ئەم جۆرە شتانە بە ئاسانی ساغ نەدەبوونەوە و پارەیەکی وایان لێوە بەدەست نەدەهات، بۆ ئەم مەبەستە بۆ کەسێک دەگەڕان و لیزاڤێتاش ئیشی ئەمە بوو. لە سەددا شتێکی وەردەگرت و دەستی دەکردە فرۆشتنیان. ئەزموونی چاک بوو و زۆریش ئیشی کردبوو. دەکرا متمانەی پێ بکرێت و لە لایەکی دیکەشەوە ویژدانارانە نرخی دادەنا و لەسەر قسەی خۆی دەمایەوە. بە گشتی کەمدو بوو و وەک چۆن باس کرا، شەرمن و سەرکزیش.

وەلێ لەم دواییانەدا ڕاسکۆلنیکۆف تووشی خەیاڵات بووبوو و بڕیار وا بوو کاریگەریی ئەم بارە نوێیە تا ماوەیەکی زۆر بەسەر ڕۆحییەوە بمێنێتەوە و تەنانەت کەم تا زۆر هەر نەشسڕێتەوە. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە بە گشتی لە بەسەرهاتەکەدا شتێکی سەیر و تەماوی و نەناسراوی بەدی دەکرد؛ بۆ نموونە ئاستی ئەو کاریگەرییە و ڕووداوگەلێکی تایبەت.

هەر ئەم زستانە، یەکێک لە ناسیاوانی، خوێندکارێکی زانکۆ بە ناوی *پۆکۆرێڤ* کە نیازی ڕۆیشتنی بۆ *هارکۆڤ* هەبوو، لە گەرمەی

گفتوگۆیەکدا، بە ئاماژەوە ناونیشـــانی پیرێژنی ســـووخۆر، ئالیۆنا ئیڤانۆڤنای دابووە ڕاسـکۆڵنیکۆف کە ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان قەلۆش[1] بوو و کاری گەیشتە خستنە گرەوی شتێک، بزانێ دەبێت ڕوو لە کوێ بنێت. ڕاســـکۆڵنیکۆفیش تا ماوەیەکی زۆر ســـەردانی ئەو پیرێژنەی نەکرد، چونکە هێشـــتا لە شـــوێنێکدا وانەی دەگوتەوە و بە جۆرێک لە جۆرەکان دەیتوانی خەرجیی خۆی پەیدا بکات. نزیکەی شـــەش حەفتە لەوەوبەر بوو کە ناونیشـانی ئەو پیرێژنەی بیر هاتەوە. دوو شـتی بۆ خســـتنەگرەوەوە هەبوون: کاتژمێرە دێرینەکەی باوکی و ئەڵقەیەکی زێڕینی بچووک کە ســـێ نقێمی[2] بەســـەرەوە بوو؛ ئەمەیان دیاریی ماڵئاوایی خوشـــکەکەی بوو. دونیا ئەڵقەکەی دابووە براکەی تا بە بینینی هەمیشـــە ئەوی لە یاد بێت. ســـەرەتا بڕیاری دا ئەڵقەکە بخاتە گرەوەوە. ڕێک هەمان ئەو کاتەی پیرێژنەکەی بینی و هەر لە یەکەمین ســـەرنجدا، ســـەرباری ئەوەی شـــتێکی وەهای لەبارەیەوە نەدەزانی، کەچی قەڵســـییەکی ســـەیر لەبەرانبەر ئەودا هەموو بوونیی تەنییەوە؛ *دوو دانە ئەسکەناسی گچکە*ی وەرگرتن و لەسەر ڕێگەی گەڕانەوەی، چووە مەیخانەیەکی بچکۆلە و وێرانەوە. داوای چای کرد، دانیشـــت و فکر و خەیـاڵ بردییەوە. وەک جووچکەیەک کە بیەوێـت ســـەر لە هێلکەکەیەوە بترووکێنێ، بیرێکی ئازاردەر بە کاسەی سەرییدا دەکوتی و چنگی بە ڕۆح و گیانیدا کرد. لە نزیکییەوە، لەپشـت مێزێکی چکۆلەی دیکەوە، خوێنـدکـارێکی زانکۆ کە نە دەینـاســـی و نە پێی وا بوو بینیویەتی، لەگەڵ ئەفســـەرێکی گەنج دانیشـــتبوون. یاریی بلیاردیان کردبوو و ئێستاکەش خەریکی چایخواردنەوە بوون. زۆر بە هەڵکەوت بەر گوێی کەوت کە ئەو خوێندکارە وا لەگەڵ ئەفســـەرەکەدا باســـی

---

١. قەلۆش: تاپلووچ؛ مایەپووچ.

٢. نقێم: جۆرە بەردێکە بۆ جوانی بە ئەنگوســـتیلە و گوارە و جۆرەها پۆشـــاکەوە دەکرێت.

ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا دەکات، کە فلانی بێوەژنی ڕاوێژکارێکی میرییە و پارە بە سوو دەدات و ناونیشانەکەشی لە فلانە شوێنە. ئەم مەسەلەیە بە لای ڕاسکۆلنیکۆفەوە زۆر سەیر بوو؛ ئاخر ئەویش هەر ئەو ساتە لای پیرێژنەکەوە گەڕابووەوە و وا ئێستاش یەکەمین شتێک کە دەیبیست، ناوی ئەو بوو! هەڵبەتە ئەمە تەواو بە هەڵکەوت بوو، وەلێ ڕاسکۆلنیکۆف نەیدەتوانی خۆی لە کاریگەریی سەیری ئەو ڕزگار بکات و ئێستاکەش دەتگوت وا دەستێکی غەیبی دەیەوێت چاکەیەکی لەبەرانبەردا بکات و ڕاستەوخۆ شتگەلێکی بە گوێدا بدات: خوێندکارەکە یەکسەر دەستی کردە قسەکردن و نووک تا نووکی ژیانی ئالیۆنای خستە ڕوو:

– تاکی نییە ئەم پیرێژنە. کەی بتەوێ پارەی لێ وەردەگری؛ سەروەتی جوولەکەیەکی هەیە. پێنجهەزار بە نەختی دەخاتە مشتت، وەلێ ئامادەیە لەسەر یەک ڕۆبلی شتەکە مامەڵەت لەگەڵ بکا! هاوڕێیانی خۆمان زۆر ڕۆیشتوونەتە لای. هەر ئەوەندە هەیە کە بەرانبەرەکەت قەحپەیەکە نەبێتەوە...

خوێندکارەکە لە درێژەی قسەکانیدا ڕوونی کردەوە کە سووخۆرەکە ژنێکی چەندە بێبار و بەدخوو و شوومە و چۆن تەنانەت گەر پارەکەی یەک ڕۆژیش دوا بکەوێت، ئیدی چاوت بە شتە لەگرەونراوەکەت ناکەوێتەوە. ژنەتیوە یەک لەسەر چواری نرخی شتەکە دەداتە کەسانی بەرانبەری، مانگانەش لە سەددا پێنج و بگرە حەوتیش سوود وەردەگرێ و لەم جۆرە قسانە. کابرای خوێندکار کە تازە دەمی گەرم بووبوو، هەر وا بێتەوە گوتی کە ئەم پیرێژنە وردیلە و دزێوە خوشکێکی هەیە بە ناوی لیزاڤێتاوە، کە هەق و ناهەق لێی دەدات و هەر دەڵێیت کۆیلەی بەپارەکڕاوی ئەوە؛ کەچی قەد و بالاشی لانیکەم مەتر و شەست دەبێ.

خوێندکارەکە قاقایەکی لێ دا و گوتی:

– هەر ئەوەمان نەدیبوو!

قسە چووەوە سەر لیزاڤێتا. دیار بوو کە خوێندکارەکە بە باسکردنی ئەو، شـــاگەشـــکە دەبێت و نـاتوانێت بەر بە پێکەنینی بگرێت و ئەفســەرەکەش ســەرتاپا بووبووە گوێ و داوای لە خوێندکارەکە کرد ئەم لیزاڤێتا خاتوونە بنێرێتە لای بۆ پینەوپەڕۆ و دوورینەوەی جل و لیفە و ئەم جۆرە شتانە.

راسـکۆلنیکۆف نەیهێشـت یەک وشـەی لەدەسـت دەربچێت و هەر لەوێ و هاوکات لە هەموو شتێک تێگەیشت. لیزاڤێتا، خوشکی بچووک و زڕی پیرێژنەکە بوو (دایکیان جیا بوو) و سیوپێنج سـاڵ بوو. شـەو و ڕۆژ لە خزمەت خوشکەکەیدا بوو؛ ئەوە چێشتلێنان و پاککردنەوە و کاروباری ماڵەوە لە لایەک، ئیشی دروومانیشی وەردەگرت و تەنانەت ڕووی زەویی ماڵی خەڵکیشی دەسڕی و هەرچیشی دەست دەکەوت، بە هەردوو دەست دەیهێنایە مشتی خوشکەکەی. نەیدەوێرا بەبێ مۆڵەتی ئەو هیچ کارێک پەســـەند بکات. پیرێژنەکە وەســـیەتنامەی خۆی نووسـیبوو و لیزاڤێتاش لێی بەئاگا بوو؛ بڕیار نەبوو یەک پەنابایش – بێجگە لە کەلوپەلی وەک چوارپـایە و کورســـی و چلوچێوی دی– دەســـت ئەو بکەوێت و ســـامانە ڕاســـتەقینەکە بۆ شـــادیی ڕۆحی پیرێژنەکە بخرێتە خزمەت پەرســـتگەیەک لە فلانە دەڤەر. لیزاڤێتـا قەیرەکچێکی عەوام و گەلێک ناقۆلاش بوو؛ بالاّ بەرزەکەی ناحەز بوو و پێیە درێژەکـانی دەتگوت لارن و دایمەش پێلاوێکی پـانوپلیشـــی چەرمبزنیی لە پێ دەکرد، بەلاّم بە گشـــتی کچێکی ڕێکپۆش و پاکوخاوێن بوو. ئەوەی کە لە بنەڕەتدا بووبووە مایەی سەرنجراکێشان و پێکەنینی خوێنـدکـارەکە، ئەوە بوو کە لیزاڤێتـا دایمەی خوا ورگی بەرەو سەرێ دەکشا...

ئەفسەرەکە بیری هێنایەوە:

– بەس خۆ گوتت ئەو ناقۆلایە!

– ئێ لەم سپیومپیانە نییە و هەر وەک سەربازی لەجەنگگەڕاوەش جل دەپۆشێ، وەلێ لە ڕاستیدا هێندەش ناشیرین نییە. ڕووخسار و چاوانی گەلێک دڵنشینن! هەر لەبەر ئەوەش زۆر کەس کەیفیان پێی دێ. هێندە هێمن و شەرمنە لە باسدا نایە؛ دەستەمۆ و بێوەی. بزەکەشی شیرینە.

ئەفسەر پێکەنی:

– دەڵێی خۆشت دڵت پێوەیەتی، ها؟

– دەزانی، کەیفم بە سەیروسەمەرەبوونی دێ. وەلێ مەبەستی قسەکەی من شتێکی دیکە بوو: گومانت نەبێ کە دەتوانم ئەو پیرێژنە چارە بکەم و پارەکانی خێت بکەم و دەستیشم نەلەرزێ!

خوێندکارەکە بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە ئەمەی دەگوت. هەمدیسان قاقای چاوقاییمانەی ئەفسەرەکە بەرز بووەوە و ڕاسکۆلنیکۆف موچڕکی پێدا هات و هەڵلەرزی. دۆخێکی سەیر بوو!

خوێندکارەکە بە گوڕوتینەوە لەسەری ڕۆیشت:

– لێگەڕێ با پرسیارێکی جددیت لێ بکەم. هەڵبەتە ئێستە گاڵتەم دەکرد، دە ئاخر هەر خۆت بڵێ، لە لایەکەوە ئەم پیرەسەگە دەبەنگە بێسوودە پیس و چەپەڵ و پەککەوتەیەمان هەیە، جا ئەوە هیچ کە کەڵکی کەس ناگرێ، بگرە بۆ هەمووانیش زیانبەخشە! خۆیشی نازانێ بۆچی زیندووە و هەناسە دەدات و ئەسڵەن هاکا ئەمڕۆ یان سبەی بە لادا هات و مرد... لە مەسەلەکە تێدەگەی؟

ئەفسەر، کونجکۆلانە لە هاوڕێ خرۆشاوەکەی ڕاما و وەلامی دایەوە:

– ئێ، وایە، ئەوە ڕوونە.

– هێشتا ماویەتی، باش گوێ بگرە. لەولاشەوە سەیری هەر لایەک دەکەی ژیان و بەختەوەریی هەزاران لاو کە هیچ کەســـێ یارمەتییان نـادا و پشـــتیـان نـاگرێ، بەفیڕۆ دەچێ! بەو پـارەیەی کە بۆ ئەو پەرســـتگەیەی تەرخان کردووە دەکرێ ســـەد و بگرە هەزار کاری چاکیش بکەی! بگرە ســـەد و هەزار کەســـیش بخەیتە ســـەر ڕێگەی ڕاست، چەندان خێزان لە سواڵ و جیابوونەوە و خراپە و چارەڕەشی ڕزگار بکەی تا نەخۆشـیی داوێنپیســی نەبێتە چارەنووسـیان... دەکرێ بە پارەی ئەم پیرێژنەتیوە هەموو ئەم کارانە بکەی! هەر بۆ ئەوە باشە بیکوژی و پـارەکەی هەڵگری و بیخەیتە خزمەت مرۆڤـایەتی و کارگەلێکەوە بۆ بەرژەوەندیی گشـــتی. ڕات چییە؟ یانی هەزار کاری چاک و دروســـت ناتوانێ تاوانێکی بێبایەخ بشـــواتەوە؟ بەڵێ دەی، ژیـانێک تیا دەچێ، وەلێ هەزاران ژیـانی تر لە فەوتـان ڕزگار دەبن. مەرگێک لەجێی ژیـانی دووبـارەی هەزاران کەس! یەک کەڕەت دوو یەکسانە بە چوارێکی سادە! باشە ژیانی ئەم مشەخۆرە پیرە چەپەڵ و دەبەنگە لەنێو بوونەوەراندا چ بایەخێکی هەیە؟ خۆ لە ژیانی ئەسپێیەک، قالۆنچەیەک شـــتێک زیاتر نییە. تەنانەت ئەوەندەش بایەخی نییە، ئەم ژنەتیوە هێنـدە بێبەزەییە، هەر بە کـاڵی دەتخوا. هەر چەنـد ڕۆژێـک لەمەوبەر تووڕە بووە و بە جۆرێک گازی لە پەنجەی لیزاڤێتای وەیلان گرتووە کە وەخت بووە بیقرتێنێ!

ئەفسەرەکە بۆچوونی خۆی دەربڕی:

–بە دڵنیاییەوە شـایەنی هەناســەدانیش نییە، وەلێ ئاخر، دەبێ لە بیری سرووشتیشدا بین.

– دەی، ئازیزی دڵەکەم، دەبێ چاکســازی لە ســرووشــتدا بکەی و ئـاراســـتەی بکەی، گەر وا نەبـا خۆ تـا ئێســـتە هەموومـان لە دەمارگیرییەکانماندا نغرۆ بووبووین و دونیاش هیچ مرۆڤێکی مەزنی تێدا نەمـابوو. خەڵکی بـاســـی ئەرک و ویژدان دەکەن و منیش هیچ

کێشـەیەکم لەگەڵ ئەرک و ویژداندا نییە؛ وەلێ کتومت مەبەستمان لەم دوو وشـەیە چییە؟ ئێسـتە بوەسـتە، پرسـیارێکی ترم لێت هەیە. گوێ بگرە.

– نا، ئێستە تۆ گوێ بگرە، ئەوە منم کە پرسیارێکم لێت هەیە!

– فەرمووا!

– تەماشـا، تۆ گەرم بووی و درووشـمی چاک دەدەی! بەس ئادەی بزانم، خۆت ئامادەی ئەو پیرێژنە بکوژی؟

– دیارە کە ئامادە نیم! من تەنیا لە دادپەروەری دەدوام نەک ئەوەی کە خۆم ئەم کارە بکەم...

– وەلێ بە بۆچوونی من تـا خۆت زاتی ئەنجـامـدانیـت نەبێ هیچ دادپەروەرییەکیش لەئارادا نییە! کەواتە هەسـتە با بچین دەسـتێکی تر یاری بکەین!

ڕاسکۆلنیکوف تووشی تاسانێکی بێڕادە بوو. هەڵبەتە ئەم قسانە لە جۆری هەمان ئەو دید و گفتوگۆ ئاسـایی و ڕۆژانەییانەی نەوەی نوێ بوون کە چەندان و چەندان جار لە هەموو شـوێنێک بیستبوونی؛ تەنیا بابەت و ڕووالەتەکەیان جیاواز بوو. وەلێ بۆ دەبێت *ئەو*، جا بەتایبەت *لەو کاتەدا*، ئەم گفتوگۆ تایبەت و بۆچوونانە ببیسـتێت... جا ئەمەش لە کاتێکدا کە هەمان ئەو فکرانە لە زەینیدا خەریک بوو ڕەگیان دادەکوتی! بۆچی ڕێک کـاتێـک کە دیـداری ئەو پیرێژنە تووی ئەم فکرەیەی لە زەینیدا چاندبوو، زۆر بە هەڵکەوت گفتوگۆیەکی لەبارەی ئەو –نەک هیچ کەسـێکی دیکە–وە دەبیست؟ ئەمەی بە شـتێکی نائاسـایی دەهاتە بەرچاو. ئەم گفتوگۆ سـەرپێییە لە مەیخانەدا، زۆرترین کاریگەریی بەسـەر ڕەوتی ڕووداوەکانی داهاتووی ژیانی ئەوەوە هەبوو. وەک ئەوەی هەر بە ڕاسـتی چارەنووس بڕیاری لەسـەر گشـت شـتێک دابوو بێت و ئاماژەگەلێک لەئارادا بووبن...

کە لە سـێناياوە گەڕايەوە ماڵێ، خۆی بەسـەر قەنەفەکەدا دا و بۆ ماوەی کاتژمێرێکی تەواو لەوێ بەبێ جووڵە دانیشت و بە ئاستەمیش چاوی دەترووسـکاند. دونیاش ئیدی تاریک داهاتبوو. گەرچی لە ماڵەوەدا مۆمی نەبوو، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە زەینیدا نەهات کە مۆم دابگیرسـێنێت. دواتر بە هیچ شـێوەیەک نەیتوانی ئەوە بزانێت کە ئاخۆ بە درێژایی ئەو ماوەیە بیری لە شـتێک کردووەتەوە یان نا. دواجار وەک جاری پێشـوو هەسـتی بە لەرزوتا کرد و کە ئەوەی بە مێشـکدا هات کە دەکرێت لەسـەر قەفەنەش بخەوێت، کەیفی سـاز بوو. زۆر زوو خەوێکی قووڵ و قورس وەک بارێکی تووش بەسـەر گیانیدا زاڵ بوو.

بە پێچەوانەی کـاتەکـانی دی، مـاوەیەکی زۆر خەوت و هیچ خەونێکیشـی نەبینی. بۆ سـبەینەکەی، ناسـتاسـیا کاتژمێر دەی بەیانی هـاتە لای و بە دژواری هـایی کردەوە. بە نـان و چـایەکەوە هـاتبوو ئەویش وەک هیکەی جاری پێشوو پاشماوە بوو. بە بێزارییەوە کردییە هەرا:

– دەک خەوی یەکجاریت بێ! خۆ دایمەی خوا خەوتووە!

ڕاسکۆڵنیکۆف بە ئاستەم نیوخێز[1] بوو. ژانەسـەری گرتبوو. هەوڵی دا هەسـتێتەوە سـەر پێ و بەرەو لایەکی دی بسـووڕێتەوە کە هەمدیسان کەوتەوە سەر قەنەفەکە. هاواری ناستاسیا بەرز بووەوە:

– خۆ هەمدیس خەوتەوە! ئەوە نەخۆشی؟

ڕاسکۆڵنیکۆف وەڵامی نەدایەوە.

– چای ناخۆیەوە؟

– دوایی.

---

١. نیوخێزبوون: هەستانەوە یان بەرزبوونەوە تا نیوە.

ئەم تاقە وشـــەیەی بە زۆر و بەر لەوەی پێڵووەکانی بکەونە ســەر یەک، گوت و بەرەو دیوار وەرســوورِا. ناســتاســیا ماوەیەک بە ژوور سەریەوە ڕاوەستا و پاشان لە هۆدەکە چووە دەرێ.

– ڕەنگە هەر بە ڕاستیش نەخۆش بێ!

کاتژمێر دوو بە جامێک شــۆرباوە گەڕایەوە. ڕاســکۆلنیکۆف نە لە جێی خۆی بزوا بوو و نە دەمیشـــی لە چایەکەوە دابوو. ئەم جارەیان ئیدی ناستاسیا لە بەردڵی گران بوو و بە توورەییەوە ئەوی ڕاوەشاند:

– ئەم هەموو خەوەت لە چییە تۆ!

دەیقیژاند و بە بارێکی بێزارانەوە تەماشـــای کرێچییەکەی دەکرد. ڕاســـکۆلنیکۆف بەرز بووەوە و دانیشـــت، وەلێ هیچی نەگوت و لە زەوی ڕاما. ناستاسیا پرسیی:

– ئەرێ چیت بەسەر هاتووە؟

هەر وەڵامی نەدایەوە. ناستاسیا ئێستێکی کرد و لەسەری ڕۆیشت:

– هیچ نەبێ بچۆرە دەرێ و ســـــوورِێک لێدە؛ باشـــە هەوایەک لە سەروسەکوتت بدا! هیچ دەخۆی یان نا؟

– دوایی.

ڕاسکۆلنیکۆف بە دەست ئاماژەی بۆ کچەکە کرد تا بچێتە دەرێ و بە بێهازییەوە گوتی:

– جارێ بچۆرە دەرێ تا دوایی!

ناســـتاســـیا ماوەیەکی کورت لە جێگەی خۆی مایەوە، خەمخۆرانە لەویی ڕوانی و پاشان چووە دەر. چەند خولەکێک دواتر ڕاسکۆلنیکۆف چاوی بە چای و شـــۆربا کەوت و تا ماوەیەک هەر وا پێیدا وڕ بوو. دواتر نان و کەوچکی هەڵگرت و دەستی بە خواردن کرد.

زۆر کەم و بێئیشتیها دووسێ کەوچکی خوارد. ژانەسەرەکەشی تۆزێک سرەوتبوو. پاشان، دووبارە لەسەر قەنەفەکە ڕاکشا، بەڵام ئیدی خەوی لێ نەکەوت و هەر وا بە ڕاکشاوی مایەوە و سەری بە پشتییەکەدا ڕۆبردبوو. دەتگوت یەک لەدوای یەک هەر خەونی دەبینی و هەر خەوێکیش لەوی دی سەمەرەتر. لە زۆربەی ئەم خەونانەدا خۆی لە شوێنێکی ئەفریقادا دەبینی؛ میسر بوو و دەتگوت لە شوێنێکی ئاقارئاسادایە. کاروانەکان باریان خستووە و حوشترەکانیش بە هێمنی وەرکەوتوون[1]؛ دارخورماکان بە ئەڵقەیەک درێژ بوونەتەوە. هەمووان خەریکی سکلەوەڕاندنن، وەلێ ئەو تەنیا ئاو دەخواتەوە؛ لە شەقەجۆیەک[2] کە ڕێک لەوێ و لەبەردەمیدا خوڕەی دێت، یەکبین ئاو دەخواتەوە. ئای کە ساردە ئەم ئاوە! ئای کە چەندە ناوازە و سەرسوڕهێنە ڕەنگی شینی ئەو ئاوە ساردەی کە بەنێو بەردی ڕەنگاوڕەنگدا هەڵدەقوڵێت و بەسەر لمی بریسکەدار و پاکی هەروەک زێڕدا دەدرەوشێتەوە و دەڕوات... کتوپڕ، زۆر ڕوون و بەرز، دەنگی زەنگی کاتژمێری بیست کە لە دەرەوە لێی دەدا و لە جێگەکەی دەرپەڕی و هاتەوە سەر خۆی. سەری هەڵبڕی و لە پەنجەرەوە ڕوانییە دەرێ. کە کاتەکەی لێک دایەوە، لەپڕ تەواو بەئاگا، بەرزەپا ڕاوەستا؛ ڕێک لە تۆ وابوو کەسێک بە هەردووک دەست گرتبووی و لە قەنەفەکەوە ڕایکێشابووە دەرێ. بە پادزە بەرەو لای دەرگەکە چوو، هێمن‌هێمنێک دەرگەکەی لاترەک کرد و گوێی هەڵخست تا بزانێت لە پلیکانەکاندا چ باسە. دڵی یەک بە خۆی بە سنگییدا دەکوتی. وەلێ بێدەنگییەکی ڕەها باڵی بەسەر پلیکانەڕێکەدا کێشابوو و دەتگوت هەمووان خەوتوون... گەلێک سەیر و گەمژانە هاتە بەرچاوی کە چۆن

---

[1]. وەرکەوتن: مۆڵین؛ وتەرەی؛ پشوودان یان کەوتن و خەوتنی ئاژەڵان.

[2]. شەقەجۆ: ماڵجۆ؛ بوارگەی گەورەی ئاوی کە ئاوەکەی لە یەکگرتنەوەی دوو یان چەند جۆگەلەیەکەوە پێک دێت.

توانیویەتی لە دوێنێ ئێوارەوە لەم دۆخی نێوان خەو و بێدارییەدا پاڵی لێ بداتەوە و نە خۆی تێک بدات و نە ئامادەکارییەک بکات... ئەمەش لە بارێکدا کە ڕەنگە هەر چەند ساتێک لەوەوبەر کاتژمێر شەش جار لێی دابێت. کتوپڕ شەپۆلێک چالاکیی نائاسایی و تادار و پەرێشان شوێنی خەواڵوویی و داهێزراوییەکەیی گرتەوە. هەڵبەتە پێویستی بە ئامادەکارییەکی تایبەتیش نەبوو. بە تەواوی سەرنجی خۆی چڕ کردبووەوە تا خەمی هەموو شتێک بخوات و هیچ نەپەڕێنێت، بەڵێ هێندە توند لێی دەدا کە بە ئاستەم دەیتوانی هەناسە هەڵبکێشێ. سەرەتا دەبوو ئەڵقەیەک دروست بکات و بە پاڵتۆکەیەوە بدوورێت، کە ئەمە خولەکێکیشی نەدەخایاند. دەستی بەژێر پشتییەکەی و ئەو جلانەدا کرد کە ئاخنیبوونییە ژێری و کراسێکی کۆنە و چڵکن و شڕی دەرهێنا. توانیی بە پارچەی پواوی کراسەکە، شریتێکی نزیکەی پێنج بە چل سانتیمی دروست بکات. لە ناوەڕاستەوە شریتەکەی دەق کرد و پاڵتۆ هاوینییە دەڵب و ئەستوورەکەی، کە بەرگەگر و تاکە جلی سەرەوە بوو، داکەند و دەستی بە دوورینەوەی هەردووک لای شریتەکە بە ناواخنی پاڵتۆکەوە کرد، ڕێک لەژێر ئەڵقەی بنباڵی چەپیدا. دەستی دەلەرزی، بەڵام توانیی کارەکە بکات و هێندەش بە جوانی دووریی کە وەختێک هەمدیسان پاڵتۆکەی پۆشییەوە، لە دەرەوەڕا هیچ دیار نەبوو. دەمێک بوو پارچە کاغەزێکی لە دەرزی و داوەوە پێچابوو و خستبوویە نێو چەکمەجەیەک تا لە بەردەستدا بێت. دیزاینی ئەڵقەکەش داهێنانی لێهاتووانەی خۆی بوو کە بڕیار بوو تەورەکەی پێوە بکات. ئاخر خۆ نەدەکرا تەوربەدەست بە شەقامەکاندا ڕێ بکات! نەشدەکرا هەر وا بیخاتە ژێر پاڵتۆکەیەوە، چون ئەوسا دەشیا بە دەست بیگرێت و زۆریش سەرنجی ڕادەکێشا. وەلێ ئێستە کە ئەڵقەیەکی درووست کردبوو، هەر ئەوەندە بەس بوو کە دەمی تیغەکە بەو ئەڵقەیەوە گیر بکات، ئیدی تەورەکە، زۆر بە جوانی لەژێر باڵییەوە شۆڕ دەبووەوە. جا لەم بارەدا گەر دەستیشی بە گیرفانەکانی

تەنیشتی پاڵتۆکەیدا بکردبا، دەیتوانی کلکی دەستەی تەورەکە بگرێت و نەهێڵێت تەکان بدات. پاڵتۆ پانوپۆڕەکەی هەر دەتگوت گوشـــــە و ڕێی تێنەدەچوو لە دەرێڕا دیـار بێـت کـاتێـک کە ئەو لەنـاو گیرفـانیـدا دەسـکەکەی گرتبێت. ئەم ئەڵقەیەش لەو شـتانە بوو کە ئەو هەر دوو حەفتە پێشتر بیری لێ کردبووەوە.

کە لەم کارە بووەوە، دەسـتی ماشـانـد و لە مەودای کەمی نێوان قەنەفە و ڕووی زەویی ژوورەکەدا کتوکوێرانە پەنجەکـانیی تـا سـووچێکی لای چەپ بردن و شـتێکی دەرهێنا کە زۆر لەمێژە ئامادە بوو و لەوێ شاردرابووەوە؛ بارمتەیەک بوو کە لە ڕاستیدا نەشدەکرا ناوی بنێیت بارمتە و، پارچە تەختەیەکی سـمـارتەکراو بە پانی و درێژیی قتووە جگەرەیەک. زۆر بە هەڵکەوت لە کاتی پیاسەکردنەکانیدا ئەو پـارچە تەختەیەی لە گۆڕاپـانێکـدا دۆزیبووەوە کە کـارگەیەکی تێدابوو. پاشـان خۆی وەرەقەیەکی ئاسـنینی تەنک و سـاغی پێوە لکاندبوو کە لەوانەیە پارچە کانزایەک شـتێک بووبێت و کەم تا زۆر هـاوکـات لەگەڵ پـارچە دارەکەدا لەسـەر شـەقامێکی ئەو نـاوەدا دۆزیبوویەوە. بەهەرحاڵ، ئەم دوو پارچەیەی (هەڵبەتە پەڕە ئاسنینەکە لە تەختەکە بچووکتر بوو) خستنە سەر یەک و بە بەنێک توند بەستنی. دواتر کاغەزێکی سـپیی بە پاکوخاوێنی و ڕێکوپێکی تێوە پێچاندن و جا هێندەی بەنپێچ کردن و گرێی لێ دان کە کردنەوەی ئاسـتەم بێت. ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا سـەرنجی پیرێژنەکە لەڕێی سـەرقاڵبوون بە گرێکوێرەکانەوە بە لاڕێدا ببات و ڕاسـکۆڵنیکۆف بتوانێت ئەوپەڕی سـوود لە دەرفەتەکە وەربگرێت. پەڕە ئاسـنینەکەشـی لە بنەڕەتدا بۆ قورسـترکردنی پـارچە تەختەکە زیـاد کردبوو تـا پیرێژن نەتوانێت دەمودەسـت سـۆسـەی ئەوە بکات کە بارمتەکە تەختەیە. بە درێژایی ئەم ماوەیەش لەژێر قەنەفەکەدا شـاردبوویەوە تا کاتی خۆی. هێشـتا

بـارمتەکەی تەواو ئـامـادە نەکردبوو کە لە دەرەوەی بینـاکەڕا کتوپڕ دەنگێک هات:

– دەمێکە لە شەش لای داوە!

– دەمێکە! وای خوایە!

ڕاســـکۆلنیکۆف پڕتـاوی کردە لای دەرگەکە و گوێی قوڵاخ کرد. پاشــان پڕی بە کڵاوەکەیدا کرد و بە پارێزەوە و هەروەک پشـیلەیەک بێدەنگ‌بێدەنگێک لە ســـێزدە پلیکانەکەی لای خۆیەوە داگەڕا. کاری مەترســـیدار، خێتکردنی تەورەکە بوو لە ناندینەکەدا[1]. دەمێکیش بوو ئەوەی یەکلایی کردبووەوە کە پێویســـتە بە تەور کـارەکە ئەنجـام بدرێت. هەروەها، چەقۆیەکی بچووکی باخەوانیشـــی پێ بوو، وەلێ هیوایەکی وەها بەو و بەتایبەتیش بە هێزی خۆی نەبوو و، لە ئەنجامدا، بڕیاری یەکلاکەرەوەی خۆی دابوو کە تەورەکە بەکار بهێنێت. ئەوەی ڕاســـتی بێـت پێویســـتە ئـامــاژە بە لایەنی تـایبەتیی بڕیـارە یەکلاکەرەوەکانی ئەو لەم نەخشـــە ئێجگار پڕمەترســـییەدا بکەین. بڕیارەکانی لایەنی هاوبەشـــی ســـەیریان هەبوو: تا یەکلاییکەرەوەتر دەبوون، لە بەرچاوی ئەودا ناڕوونتر و تۆقێنەرتر دەیاننواند. وێڕای هەموو کێشـمەکێشـە ئەشـکەنجەدەرە دەروونییەکانی، بە درێژایی ئەو مـاوەیە، هەرگیز و تەنـانەت بۆ ســـاتێکیش نەیتوانیبوو بڕوا بە کردەییبوونی نەخشەکەی بهێنێت.

گەر لە هەر ڕێیەکەوە بگەیشـــتبا جێیەک کە بیتوانیبا وردترین خاڵەکانیش لە بەرچاو بگرێت و هەموو ورکارییەکان جێبەجێ بکات و هیچ بەربەسـتێکیش بۆ لێبڕاوییەکەی لەئارادا نەبا، هەر ئەگەرێکی زۆر هەبوو تا بە گشـــتی لە بڕیارەکەی، وەک کارێکی نەکردە و تۆقێنەر، پاشـــگەز ببێتەوە. بەڵام هێشـــتاش وردەکاریی ئاڵۆز و ڕاڕایی و

---

١. ناندین: موبەق؛ مۆبەق.

مەســـەلەی یەکلاییەنبووەوە زۆر بوون. قۆنـاغی هەڵگرتنی تەورەکە ئاســایی بوو و بە هیچ شــێوەیەک خەمی لێ نەدەخوارد، چونکە هیچ کارێک لەوە ئاسانتر نەبوو. زۆربەی کات وا هەڵدەکەوت کە ناستاسیا دەمەوئێواران بۆ شـــتکڕین یان بۆ لای دراوســـێکانی دەچووە دەرێ. بەردەوامیش دەرگەکەی بە کراوەیی لەسەر گازی پشت جێ دەهێشت و لەســـەر ئەم بەزمەش هەمیشـــە لەگەڵ خاوەنماڵدا دەمەبۆڵەیان بوو. کەواتە تاکە کارێک کە دەشـــیا ئەو بیکات، ئەوە بوو کە لە کاتی خۆیدا بە دزییەوە بچێتە موبەق، تەورەکە هەڵبگرێت و کاتژمێرێک دواتریش (وەختێک کارەکەی تەواو کرد) بگەڕێتەوە و بیخاتەوە شـــوێنی خۆی. هەڵبەتە نەخشەکە لەم شوێنەشدا بڕێک سست بوو: ئەی دەبوو چیی بکردبا گەر دوای کاتژمێرێک بگەڕاباوە تا تەورەکە بخاتەوە شـــــوێنی خۆی و تەماشای بکردبا ناستاسیا لە موبەقەکەدایە؟ هەڵبەتە ئەوساکە دەشـــــیا تەنیا بە بەردەم موبەقەکەدا تێبپەڕێت و بچێتە ژوورەکەی و ڕابوەســـتێت تا ناســـتاســـیا بچێتەوە دەر. بەڵام گریمان ناســـتاســـیا تێبگەیشـــتبا کە تەورەکە لە شـــوێنی خۆیدا نییە و دەســـتی بکردبا بە گەڕان و هەڵانـانەوە. بەم جۆرە هەمووان دەکەوتنە گومـانەوە یـان لانیکەم ڕێ بۆ بەدگومانی خۆش دەکرا.

جا ئەمانە کۆمەڵێک وردەکاری بوون کە بیری لێ نەکردبوونەوە و دەرفەتی بیرلێکردنەوەشـیانی نەبووبوو. بە درێژایی ئەو ماوەیە بیری لای بابەتە ســەرەکییەکە بوو و بابەتە لاوەکییەکانی وەلا نان تا بەر لە هەر شـــتێک خۆی قایل بکات. هەرچۆنێک بووە، ئەم بابەتە نەکردە بوو یـان لانیکەم لە دیـدی ئەوەوە بەم جۆرە دەینوانـد. ئەســـڵەن نەیدەتوانی وێناشـــــی بکات بۆ نموونە کاتێک بێت، واز لە بیرکردنەوە بهێنێت و هەســـتێت و بچێت تا نەخشـــەکەی جێبەجێ بکات. تەنانەت مەشـقەکەی ئەم دواییانەشـی (باشـتر وایە بڵێین چاوپێداخشـاندن بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی شوێنەکە) تەنیا تاقیکردنەوەیەک بوو و لەگەڵ

خودی کارەکەدا زەوی تا ئاسمان جیاوازیی هەبوو؛ وەک ئەوە وابوو بڵێیت: *باشە، هەستە بچین با لانیکەم تاقیی بکەینەوە! خۆ لە دانیشتن و خەیاڵپلاوی چاکترە!* وەلێ دەمودەست بێز لە خۆت بکەیتەوە، دەرەقەت نەییت، تفێک ڕۆبکەیت و لە گۆبەنەکە ڕابکەیت. لە لایەکی تریشەوە، لێکدانەوەکانی بۆ دەستخستنی ڕێگەچارەیەکی ئاکاری بۆ پرسەکە، بێخەوش دەهاتنە بەرچاو. پاساوی فەلسەفە ئاکارییەکەی هیچ قسەیەکی تێدا نەبوو، فەلسەفەیەک کە هەروەک شمشێرێک تیژ بوو و تەنانەت تاقە ڕەخنەیەکی ویژدانیشی لەبارەی بڕیارەکەیەوە تێدا نەدەدۆزرایەوە، بەڵام لە دواهەمین هەنگاودا هەمدیسان دەستی لە بڕواکەی خۆی هەڵدەگرت و بە سەرسەختی و کەللەڕەقییەکی سەیرەوە کردوکۆشی بوو تا بیانوو و خەوشێک بدۆزێتەوە. هێندەش کتوکوێرانە بەدوای بیانووەوە بوو و بەردەوام بابەتەکەی دەگۆڕی وەک ئەوەی کەسێک ناچاری بکات و بەرەو ئەملا و ئەولای پەلکێش بکات. وەلێ ڕووداوەکەی ئەو ڕۆژەی دوایی کە بێ پێشەکی هاتبووە پێش و هەموو شتێکی لە چاوترووسکاندنێکدا ڕێک خستبوو، کاریگەرییەکی خۆنەخوازانەی خستە سەری؛ دەتگوت کتوکوێرانە و بێ هیچ نارەزاییدەبڕین و بەرگرییەک لە لایەن خۆیەوە، کەسێک چنگی بە دەستیدا کردبوو و بە توانایەکی سەروومرۆیی و بەرگەنەگیراوەوە ڕایدەکێشا. وەک ئەوە وابوو چمکێکی جلەکەی گیرابێتە پێچکی[1] مەکینەیەک و ئێستەش خەریک بێت کێشی بکاتە ناو خۆی.

لەو سەرەتایانەوە -هەڵبەتە دەمێک لەوەوبەر بوو- پرسیارێکی تایبەت خراپ زەینی قاڵ کردبوو: بۆچی هیچ تاوانێک نییە کە بە باشی سەرەداوەکانی خۆی سڕیبێتەوە و نەتوانرێت بە ئاسانی پەردەی لەسەر هەڵبماڵرێت؟ بۆچی کەم تا زۆر هیچ تاوانبارێک نییە کە بە ڕوونی لەدوای خۆیەوە سەرەداوی جێ نەهێشتبێت؟ ئەو

---

١. پێچک؛ تەگەرە؛ لڕ؛ خڕ؛ بازنەئاسایەک کە بە دەوری خولگەیەکدا دەسووڕێتەوە.

بەرئەنجامانەی کە بەرەبەرە دەســـتی کەوتبوون، ســـەرنجراکێش و جیاواز بوون، وەلێ بە ڕای ئەو کێشـــەی ســـەرەکی ئەوە نەبوو کە ناتوانرێت بە یەکجاری تاوان بشـــاردرێتەوە؛ گرنگترین هۆکار، خودی تاوانکارەکە بوو. تاوانباران، نزیکەی بەبێ هەڵاواردن، ڕێک لە کاتی خۆی و ساتی ڕوودانی تاواندا، تیا دەمێنن و تووشـی سسـتیی ژیری و ویسـت دەبن. لە ڕاسـتیدا، دۆخەکە بە تەواوی ئاوەژوو دەبێتەوە و ژیری و ویسـت شـوێنی خۆیان بۆ بیرپەرتییەکی نائاسـایی و منداڵانە چۆڵ دەکەن؛ ئەمە ڕێک لە کاتێکیشـــدا کە ئامادەیی ژیری و پارێز یەکلاکەرەوەیە! ســـەرەڕای ئەوەش، نەخۆشـــیی پووکانەوەی ژیری و سسـتیی ویست، وەک خۆرە دەکەوێتە گیانی ئەو و بێئامان لێی پیس دەکات و ڕێک کەمێک پاش ڕوودانی تاوان، دەگاتە ترۆپکی خۆی. ئەم ڕەوتە، ســاتێک بەر لە ڕوودانی تاوان و کەمێک دواتریش، هەڵبەتە بە کەس دەکەوێت، بەردەوامیی هەیە و، پاشـــانیش وەک نەخۆشـــییەکانی دی، کاتەکەی بەسـەر دەچێت. جا ئەوەی کە نەخۆشـی دەبێتە هۆکاری تاوان یان تاوان لەڕێی ســـرووشـــتەکەیەوە هاوڕێی شـــتێکی وەک نەخۆشـــییە، پرســـێک بوو کە جارێ هەســـتی نەدەکرد توانـای یەکلاکردنەوەی هەبێت.

بەم ئەنجامگریانە، گەیشـتە ئەو بڕوایەی کە ڕێی تێناچێت دەروونی ئەو هێندە نەخۆشـانە ژێراوژوور ببێت و ژیری و ویسـتی ناتوانن لە کاتی جێبەجێکردنی نەخشـەکەدا پشـتی تێ بکەن و بە دڵنیاییشـەوە وا نابێت. پاسـاوەکەشـی فرە سـادە بوو: خۆ نەخشـەکەی ئەو بە *تاوان* دانەدەنرا... نـاچینە نـاو ئەو ڕەوتە فکرییەوەی کە ئەوی گەیـانـدە ئەم ئەنجامەی کۆتایی؛ تا ئێرەش زۆری لەسەر ڕۆیشتووین. هەر ئەوەندە بەسـە کە بڵێین بەربەسـتە بەرهەسـت و کردەییەکانی کارەکە، بۆ ئەو دەکەوتنە دووەمین قۆناغەوە. هەر ئەوەندە بەسـە کە *بەبێ کەموکوڕی ژیری ویستی خۆم بپارێزم؛ کە کاتی پەرژانە سەر وردەکاری و بەشە*

*لاوەکییەکانی کارەکە هات، ئەو کێشـــانەش خۆبەخۆ چارە دەکرێن...* وەلێ هیچ هەواڵێک لەبارەی دەســتپێکردنی کارەکەوە نەبوو. ئەو هەر وا بڕوای بە بڕیاری بنجبڕانە و کۆتایی نەبوو و کە کاتی دیاریکراویش گەیشت، هیچ شتێک بەپێی بەرنامەکە بەڕێوە نەچوو و دەتگوت هەموو شتێک بە هەڵکەوت و کتوپڕانە بووە.

تەنانەت هێشتا نەگەیشتبووە خوار پلیکانەکان کە پێشهاتێکی ئێجگار ئاســـایی، ســـەرلەبەری مەزەندەکانیی شـــێواند. کە گەیشـــتە بەردەم موبەقەکە –دەرگەکەی وەک هەمیشـە لەسـەر پشت بوو– بە پارێزەوە تەماشـــایەکی ناوەوەی کرد تا نەکا لەو کاتانەی کە ناسـتاســیا لەوێ نییە، خـاوەنمـاڵەکەی لێ بێـت و، جـا ئەگەریش لەوێ نەبێـت، ئـاخۆ دەرگەی ئەپارتمانەکەی داخســتووە یان نا، نەبادا ســەرێک بکێشـێتە دەرێ و ببینێت. وەلێ کاتێک تەماشـــای کرد کە ناســتاســیا نەک هەر تەنیا لە ناندینەکەدایە، بگرە زۆریش ســەرقاڵی کارە، لە ســەرســامیان دەستبەجێ وشک بوو. ناستاسیا کە خەریک بوو جلە شۆراوەکانی لە سەبەتە دەردەهێنان و بەسـەر تەنافی جلەکانەوە هەڵی دەخستن، هەر کە چاوی بە ڕاسکۆڵنیکۆف کەوت، کارەکەی پشتگوێ خست و ڕووی کردە ئەو و هەر وا واقووڕ لێی ڕوانی تـا گەنجەکە بە بەردەم نـاندینەکەدا تێپەڕی. ڕاســـکۆڵنیکۆف نیگـای خۆی دزییەوە و وەک ئەوەی کە هەر هیچ نەبووبێت، درێژەی بە ڕێگەکەی دا. وەلێ ئیدی هەموو شـــتێک بڕابووەوە؛ تەورەکە خۆمان خۆش! زۆر پەســـت بوو. کاتی چوونەدەر بە دەرگەی ســـەرەکیدا، لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *توخوا سەیر کە، من چۆن ئەوەندە دڵنیا بووم کە ناستاسیا لەم کاتەدا بە دڵنیـاییەوە لە مـاڵ دەچێتە دەر؟ بۆچی، ئـاخر بۆچی ئەوەنـدە لە تەورەکە بێخەم بووم؟* وەڕەز بوو و تەنـانەت هەســـتیشـــی دەکرد ســـووکایەتیی پێ کراوە. لە پەســـتیان حەزی دەکرد تێر بەو دۆخە پێبکەنێت... قینێکی ناڕوون و ئاژەڵانە لە دڵیدا خرۆشا.

ڕێک لەبەردەم دەرگەی دەرەوەدا ڕاوەستا. بیرکردنەوە لەوەی کە بۆ گومانڕەواندنەوە بچێتە دەرێ و پیاسەیەک بکات، قەڵسی دەکرد و بە بیرکردنەوە لە گەڕانەوەش بۆ ژوورەکەی لەوە خراپتر دەبوو. هەر وا بێئامانج و گیرخواردوو، ڕێک ڕووبەڕووی ژووروچکەکەی قاپچیدا[1]، کە ئەویش دەرگەکەی دایمە کراوە بوو، ڕاوەستابوو و دەیبۆلاند: *ئای لەو بەختە، چ هەلێک بۆ هەمیشە لەکیس چوو!* کتوپڕ ڕاچەنی. تەنیا چەند هەنگاوێک لەوبەرترەوە، لە ژووروچکەی قاپچییەکەدا، بریقەی شتێک سەرنجی ڕاکێشا کە لەژێر نیمکۆتێکی تەختەییدا دەدرەوشایەوە. سەیری چواردەوریی کرد؛ کشومات بوو! بە پارێزەوە بەرەو لای ژووروچکەکە، دوو هەنگاو چووە خوارێ و بە دەنگێکی کز بانگی قاپچیی کرد. *لەوێ نییە؛ هەر زانیم! بەس پێناچێ زۆر دوور کەوتبێتەوە؛ هەر لێرە لە گۆڕەپانەکەدایە، ئاخر دەرگەکەی خستووەتە سەر پشت!* پرتاوی کرد و تەورەکەی کە لەنێوان دوو پارچە هێزمدا[2] بوو، لەژێر نیمکۆتەکە دەرهێنا (ئەو شتەی کە دەدرەوشایەوە، هەر ئەم تەورە بوو)؛ هەر لەوێ بە ئەڵقەکەی ژێربالییەوەی کرد، هەردووک دەستیی لە گیرفانەکانی نان و لە ژوورەکە هاتە دەرێ... تاقە کەسێکیش ئەوی نەدیت! ژارخەندێکی لارووێری کرد و لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *بە ئەقڵ نەکرا، بەس خۆ شەیتان نەمردووە!* دەتگوت ئەم پێشهاتە تازەیە گیانێکی نوێی بە بەردا کردووەتەوە.

بۆ ئەوەی سەرنج ڕانەکێشێ و هەڵسوکەوتی گومانبزوێن نەبێت، بەبێ پەلەکردن و بە هەنگاوگەلی نەرم و هاوئاهەنگەوە بە شەقامدا کەوتە ڕێ. بە دەگمەن سەیری ڕێبوارانی کرد و تەنانەت هەوڵی دا لە ڕووخساریان نەڕوانێت و هەتا دەکرێت سەرنج ڕانەکێشێت. لێرانەدا

---

١. قاپچی: دەرگەوان.

٢. هێزم: داری براوە و ئامادە بۆ سووتاندن.

بوو کە کڵاوەکەی بیر هاتەوە: *خوایە! تۆ بیری لێ بکەوە؛ تا دوێنێ و پێرێ پارەشم هەبوو و کەچی ئەم کڵاوە نەفرەتییەم نەگۆڕی!* لە ناخی دڵەوە خۆی بە نەفرەت کرد.

بە هەڵکەوت نیگای لاچاوی کەوتە سەر دوکانێک و کاتژمێرە دیوارییەکەی بینی: دە خولەکێک بەسەر حەوتدا تێپەڕیبوو. دەشیا دەستوبردی لێ بکات، وەلێ لە لایەکەوە ناچار بوو پێچ بکاتەوە و لە پشتەوەڕا لە بینای مەبەست نزیک ببێتەوە.

پێشتر کە ئەم قۆناغانەی لە زەیندا بەرجەستە دەکردن، هەندێک جار وای بۆ دەچوو کە لە کاتی دیاریکراودا ترسێکی زۆری لێ دەنیشێت. وەلێ هێندەش نەترسابوو؛ یانی هەر لە بنەڕەتەوە نەترسابوو. لەو ساتەدا زەینی گیرۆدەی بیرگەلی جۆراوجۆری ناپێویست بوو کە هیچ کامێکیشیان درێژەیان نەدەکێشا. کە بە تەک باخی یۆسۆپافدا تێدەپەڕی، بە قووڵی کەوتە ژێر کاریگەریی پێکهاتەی فوارە بەرزەکانی و ئەوەی کە ئەم فوارانە لە هەر گۆڕەپانێکدا هەبن، چۆن دەتوانن بە شێوەیەکی پەرجووئاسا هەوا نوێ بکەنەوە. بەرەبەرە بەو ئەنجامە گەیشت کە ئەگەر باخی هاوینەیان تا ناو مەیدانی مارس درێژ بکردباوە و تەنانەت بە باخەکانی کۆشکی میخاییلافسکییان بگەیاندبا، چەندە بێوێنە دەبوو و چ سوودێکیشی بە شار دەگەیاند. کتوپڕ کەوتە بیرکردنەوە لەوەی کە بۆچی لە شارە گەورەکاندا، مرۆڤەکان بەبێ هەڵاواردن، جا ئەمە گەر ئارەزوویکی سەیروسەمەرە بێت ئەوەی کە هەر بە ڕاستی پێویستی ئەوە بخوازێت، ڕاستەوڕاست بەرەو بەشگەلێکی شار دەچن کە نە باخێکیان تێدایە و نە فوارەیەک و هەر لەوێش ماڵ و ژیان پێکەوە دەنێن، شوێنگەلێکی پڕ لە پیسی و چەپەڵی و هەر جۆرە بۆگەنێک کە بیری لێ بکەیتەوە. پاشان وێڵگەڕییەکانی خۆی بە دەوروبەری سێنایادا بیر هاتنەوە و بۆ ساتێک

گەڕایەوە نێو دونیای ڕاستەقینە و بیری کردەوە: *ئای لەو جەفەنگیاتە! وا باشترە هەر بیر لە هیچ شتێ نەکەمەوە.*

بیرێکی دیکە هەر وەک برووسکە بە سەریدا ڕابرد: *بێگومان دەبێت ئەوانەش کە بۆ گوللەبارانیان دەبەن هەر وەها دۆخێکیان هەبێ... بیریان بە هەر شتێکەوە دەنووسێ کە بەلایدا تێدەپەڕن*[1]. هەڵبەتە ئەمە تەنیا پزیسکێک بوو و دەستبەجێ خەفەی کرد. کەم تا زۆر گەیشتبووە جێی مەبەست؛ ئەوەش بیناکە و دەرگەی چوونەژوورەوەی. کتوپڕ لە شوێنێکەوە دەنگی کاتژمێر هات. *یانی بووە حەوت‌ونیو؟ ڕێی تێناچێ؛ بە دڵنیاییەوە کاتژمێرەکە لەپێشە!*

بەخت هەر وا یاری بوو؛ لەبەردەم دەرگەکەشدا هیچ گرفتێکی بۆ نەهاتە پێش. لە ڕاستیدا وەک ئەوەی بڕیاری لەسەر درابێت، ڕێک لەو ساتەدا عەرەبانەیەکی گەورەی گژوگیا بەر لە ئەو چووە ژووری و بە تەواوی ئەوی لە کاتی چوونەژوورەکەیدا شاردەوە. عەرەبانەکە هێشتا بە تەواوی نەچووبووە نێو گۆڕەپانەکە کە ڕاسکۆڵنیکۆف وەک برووسکە بەرەو لای ڕاست فڕکەی کرد. لەولای عەرەبانەکەوە، دەنگ و هەرای چەند کەسێک دەهات کە هاواریان دەکرد و مشتومڕیان بوو،

---

١. یەکەمین ڕەنگدانەوەی بەشێک لە ڕۆمانێکی دڵخوازی دۆستۆیڤسکی لە دەقی *تاوان و سزادا*: *دواهەمین ڕۆژی سزادراوێک بە مەرگ*، نووسینی ڤیکتۆر هۆگۆ. هەر پێشنیاری خودی دۆستۆیڤسکی بوو کە براکەی ئەم بەرهەمەی ڤیکتۆر هۆگۆی لە ساڵی ١٨٦٠دا وەرگێڕایە سەر زمانی ڕووسی. بابەتەکە پەیوەندیی بە ئەزموونی تاکەکەسیی دۆستۆیڤسکییەوە هەیە کە لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٤٩دا چاوەڕوانیی گوللەبارانی دەکرد. ئەو کوێرەوەری و ئەشکەنجەیەی کە گێڕەرەوەکەی هۆگۆ تووشی بووە، لە بوونی ڕاسکۆڵنیکۆفدا گرنگییەکی دژیەکانە وەردەگرێت؛ ڕاسکۆڵنیکۆف وەک ئەوە وایە کە نەزانێت تاوان و سزاکەی لێک جیا بکاتەوە. ئەگەر دۆستۆیڤسکی یەکەمین نووسخەی ڕۆمانەکەی بخستبا بەردەست و شێوازی گێڕانەوەکە لەسەر زاری کەسی یەکەمەوە با، ڕەنگدانەوەی بارودۆخی پیاوە سزادراوەکەی هۆگۆ بەرچاوتریش دەبوو. «و. ف»

وەلێ هیچ کەســێک بەوی نەزانی و لە ڕێگەکەشــیدا کەســی تووش نەبوو. لەو کاتەدا زۆرێک لەو پەنجەرانەی کە بەســەر گۆڕەپانە شێوە چوارگۆشــەییە گەورەکەدا دەیــانـڕوانـی، کـراوە بـوون، وەلـێ ڕاسـکۆڵنیکۆف سـەری هەڵنەبڕی تا سـەیرێک بکات؛ زاتی ئەم کارەی نەبوو. ئەو پیلیکانەڕێیەی کە دەچووە ســـەر ئەپارتمانی پیرێژن لە نزیک دەرگەی دەرەوە بوو و دەشــیا دەمودەســت بەلای ڕاســتدا با بدەیتەوە. ساتێک دواتر، خۆی لە پلیکانەڕێکەدا بینییەوە...

هەناسـەیەکی هەڵکێشا و دەستی خستە سـەر دڵی کە خەریک بوو لە سنگییەوە دەهاتە دەرێ. دەسـتێکیشـی گەیاندە تەورەکە و جارێکی دیکەش شوێنەکەی توند کردەوە. لە پلیکانەکانەوە چووە سەرێ. نەرم و بەپارێز دەچوو و گوێی شـــل کردبوو. لەو کاتەدا پلیکانەڕێکە چۆڵ بوو و دەرگەکانیش دایمە داخرابوون و تەنانەت تاقە کەســـێکیشـــی نەدیت. ڕێک لە نهۆمی دووەمدا، ئەپارتمانێک خاڵیی بوو کە دەرگەکەی خرابووە سەر گازی پشت و بۆیەکارەکان لە ژوورەوە کاریان دەکرد؛ وەلێ ئەوانیش هیچ سـەرنجێکیان نەدا. چەند ساتێک ڕاوەستا، بیرێکی کردەوە و درێژەی بە ڕێگەکەی دا. *هەڵبەتە گەر ئەم بۆیەکارانە نەبان زۆر باشـــتر دەبوو وەلێ... وەلێ خۆ ماڵی پیرێژنەکە لە دوو نهۆم سەرترەوەیە.*

دواجــار گەیشـــتە نـهۆمی چوارەم، ئەوەش دەرگە و ئەوەش ئەپارتمانەکە لەبەرانبەریدا کە خاڵی بوو. بەو جۆرەی کە دەردەکەوت، پێدەچوو ئەپارتمانی نهۆمی ســـێیەمیش کە ڕێک دەکەوتە ژێر ماڵی پیرێژنەکەوە، خاڵی بێت. کارتی ســـەر دەرگەی ئەپارتمانە لابرابوو. بێگومان چۆڵیان کردبوو!... بە زۆر هەناســـەی بۆ دەدرا. بۆ ســـاتێک بیرێکی بە زەیندا هات؛ *بگەڕێمەوە و بچم؟* وەلێ پرســـیارەکەی خۆی بێ وەلام هێشتەوە و بە ئاراستەی ماڵی پیرێژنەکەدا گوێی شل کرد: بێدەنگییەکی مەرگبارێن باڵی کێشـابوو. پاشـان، بۆ ماوەیەکی زۆر و

بەوپەڕی سەرنجەوە لە پلیکانەڕێکەدا گوێی قولاخ کرد... بۆ دواهەمین جار باشباشێک چاوی بە چواردەوریدا گێڕا، خۆی کۆ کردەوە و قنج ڕاوەستا و تەنانەت جارێکی دیکەش لە شوێنی تەور و ئەڵقەکەی بنباڵی دڵنیا بووەوە. بیرگەلی جۆراوجۆر بە زەینیدا ڕابردن: *خۆ ئێستە زۆر ڕەنگپەڕیو نیم، ها؟ نەکا پێمەوە دیار بێ؟ ترسم لێ نیشتووە، ئەرێ؟ ئاخر مرۆڤێکی بەدگومانە ئەم پیرێژنە! چۆنە کەمێ دان بە خۆمدا بگرم تا دڵم هێور بێتەوە؟*

ئەوە هیچ کە دڵی هێور نەبووەوە، بە پێچەوانەشەوە، وەک ئەوەی دەستەنقەست بیەوێ ئیشەکە تێک بدات، هەر ساتەو توند و توندتر لێی دەدا... ئیدی خۆی پێ ڕانەدەگیرا، بە شێنەیی دەستی درێژ کرد و زەنگی لێ دا. نیو خولەک دواتر هەمدیسان زەنگی لێ دا و ئەم جارە، توندتر.

وەڵامێک لەئارادا نەبوو. زەنگلێدانی بێسوود کەڵکێکی نەبوو و ئەسڵەن کارێکی شیاویش نەبوو. بێگومان پیرێژن لە ماڵێ بوو، وەلێ تەنیا و بەدگومان. ڕاسکۆلنیکۆف تا ڕادەیەک شارەزای خوو و ڕەوشتی ئەو بووبوو... جارێکی دی توند گوێی بە دەرگەکەوە نووساند. یان هەستی شەشەمی گەنجەکە بەهێز بوو (کە هەڵبەتە ڕێتێچوونی ئاستەمە) یان هەر بە ڕاستی دەنگەکە باش دەهاتە گوێ، بەهەرحاڵ، کتوپڕ بیستی کە دەتگوت دەستێک خەریکی کلۆمەکەیە و دامەنێکیش لەپشت دەرگەکەوە خشەخشی بوو. کەسێک لەپشت دەرگەکەوە بوو و، ڕێک وەک خودی ئەو، گوێی بە دەرگەکەوە لکاندبوو...

ڕاسکۆلنیکۆف بەقەستی[1] جووڵەیەکی کرد و لەژێر لێوەوە شتێکی گوت تا وا دەرنەکەوێ کە خۆی شاردووەتەوە. دواتر، بۆ سێیەمین

---

١. بەقەستی: دەستەنقەست.

جار زۆر لەسەرخۆ و ئاسایی زەنگی لێدا. سەردەمانێک دواتر کە ئەم دیمەنەی بە ڕوونی دەهێنایە بەرچاوی، دەیبینی کە ئەو ســاتە تایبەتە بۆ هەمیشــە لە زەینیدا نەخشــێندراوە. خۆیشــی نەیدەتوانی تێبگات کە ئەو فێڵ و تەڵەکەیەی لە کوێوە هێنابوو، ئاخر لەو ســاتەدا وا دیاربوو کە زەینی وا بۆ چەند ســاتێک تاریک و لێڵ دەبێت و تەنانەت هەســتی بە دەســت و پێشــی نەدەکرد... دوای چەند ســاتێک بیســتی وا دەســتێک خەریکی ڕاکێشانی کڵۆمەکەیە.

## حەوت

ڕێک هەر وەک جاری پێشـــوو، دەرگەکە هێنـدەی پلەپەنجەیەک لاترەک بوو و دیسان جووتێک چاوی زیت و بەدگومان لە ناوجەرگەی تاریکییەوە لە ڕاســکۆلنیکۆف ڕامان. لێرانەدا بوو کە ڕاســکۆلنیکۆف شپرزە بوو و هێندەی نەمابوو تووشی هەڵەیەکی گەورە ببێت.

دەترسا پیرێژنەکە خۆف لەوە بکات کە لەگەڵ ئەودا بە تەنیا بێت و هیوایەکیشـــی بەوە نەبوو کە ســـەروســـەکوتی بتوانێت متمانەی ئەو بەدەســــت بهێنێت، لەبەر ئەوە بوو کە ئیدی دەســــتی درێژ کرد و دەرگەکەی بەرەو خۆی ڕاکێشـــا؛ تا نەکا پیرێژن لە ســـەری بدات و دووبـارە دەرگەکە دابخـاتەوە. پیرێژنەش کە ئەمەی بینی، دەرگەکەی بەرەو لای خۆی ڕانەکێشا، وەلێ دەسکەکەشی بەر نەدا و وەخت بوو ڕاســـکۆلنیکۆف بە دەرگەکەوە بەرەو پلیکانەکان پەلکێشـــی بکات. گەنجەکە کە بینیی پرێژن بەردەرگەکەی گرتووە و ناهێڵێت ئەو بچێتە ژووری، ڕاســتەوراســت بەرەو ڕووی چوو. پیرێژن تۆقیوانە کشـــایە دواوە؛ ویستی شتێک بڵێت کە دەتگوت نەیتوانی و لەو ڕاما.

– سڵاو، ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا...

هەوڵی دا هەتا پێی دەکرێت ئاسایی سەری قسەی لەگەڵدا بکاتەوە، بەڵام دەنگی، کە نەدەهاتە ژێر بار، لە گەروویدا شـکا و دەسـتی کردە لەرزین:

– من... شـــتێکم بۆ هێنـاون... وەلێ چـاکتر وایە بچینە ئەوێ کە ڕۆشنترە...

پیرێژنەکەی هەر لەوێ و لە ئاســـــتانەی دەرگەکەدا جێ هێشـــت؛ ســــەری داخســـــت و بێ فەرمووڵێکردن ڕێک چووە ناو ژوورەکە. پیرێژنەش بەدوایدا فڕکەی کرد و تازە زمانی بەر بووبوو:

– پەنا بە خوا! ئەوە مەسەلە چییە؟ تۆ کێی، کاکە گیان؟ چیت دەوێ لە گیانی من؟

– ئەوە چ قســـەیەکە، ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا... خۆ پێشـــتر بە خزمەتتان گەیشـــتووم... ڕاســـکۆڵنیکۆفم... فەرموون، ئەمەش ئەو بارمتەیەی کە ئەو ڕۆژە باسمان کرد و گوتم دەیهێنم...

ئەمەی گوت و بارمتەکەی پێ دا. پیرێژن ســـــەرەتا ســـــەیرێکی بارمتەکەی کرد و پاشــــان ڕێک چاوی لە چاوی میوانە ناوەختەکەی بڕی و بەوپەڕی ســــەرنج و بەدگومانییەوە هەڵیدەســـەنگاند. نزیکەی خولەکێک تێپەڕی. ڕاسـکۆڵنیکۆف تەنانەت هەسـتیشـی کرد کە نیگای پیرێژنەکە بریقەیەک لە گـاڵتەجـاڕیی تێـدایە، وەک ئەوەی لە هەموو شتێک تێگەیشتبێت. هەستی کرد دووبارە خەریکە دەحەپەسێت و کەم تا زۆر ترســـی تێگەڕاوە، یانی هێندە ترســـی لێ نیشـــتووە کە هەر ئەوەندە بەســە پیرێژن ســی چرکەیەکی دی هەر وا قروقەپ پێیدا واق ببێت تا ناچاری بکات بۆی دەربچێت. کتوپڕ خۆیشـــی گومانڕەشــــانە پرسیی:

– وەڵێ ئاخر بۆچی بە جۆرێک پێمدا واق بوونە وەک ئەوەی هەر نەمناسـن؟ گەر دەتانەوێ ئەوە بیگرن؛ ناشـتانەوێ دەیبەمە شـوێنێکی تر. کاتم نییە!

تەنانەت بە خەیاڵیشـیدا نەدەهات کە ئەمانە بڵێت و وشـەکان هەر وا نائاگایانە هاتنە ســــەر زمانی. پیرێژن خۆی کۆ کردەوە و پێدەچوو شـێوازی لێبڕاوانەی میوانەکە، بڕوابەخۆبوونی ئەویشـی گەڕاندبێتەوە. تەماشایەکی بارمتەکەی کرد و پرسیی:

– باشە پەلەت چییە، کاکە گیان؟... ئێستە ئەمە چییە؟

– یارۆ قتووە جگەرە زیوییەکە؛ جاری پێشوو پێم گوتن.

پیرێژن دەستی درێژ کرد و وەریگرت:

– ئەی بۆ وا ڕەنگتان پەڕیوە؟ تەماشـــا دەســـتی چۆن دەلەرزێ! لە گەرماوەوە دێنەوە، کاکە گیان؟

ڕاسکۆلنیکۆف بە شێوازێکی ڕەق وەڵامی دایەوە:

– تام لێیە.

لەســـەر قســـەکەی بەردەوام بوو، وەلێ وشـــەکان بە ســـەختی لە دەمییەوە دەهاتنە دەر:

– کە تیکە نانێکیش نەبێ بیخۆی، ئیتر بەدەســـت خۆت نییە، ڕەنگت دەپەڕێ.

هەمدیســـان خەریک بوو بڕست و توانای لەدەست دەدایەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی وا دەردەکەوت وەڵامەکەی شتێک لە ڕاستیی تێدا بێت و قایلکەر بوو، ئیدی پیرێژنەش بارمتەکەی وەرگت:

– ئەی ئەمە چییە؟

چاوی لە ڕاســـکۆلنیکۆف بڕیبوو و خەریک بوو با بلێین بارمتەکەی دەستیی سەنگوسووک دەکرد.

– هینە... قتووەجگەرە... زیوییە... خۆتان سەیرێکی بکەن!

– بەس خۆ لە زیو ناچێ... چییە ئەوەندە بەنپێچت کردووە!

پیرێژن لە بارێکدا کە هەر وا ســـەرقاڵی کردنەوەی بەســـتەکە بوو، بەرەو پەنجەرەکە وەرچەرخا تا ڕووی لە ڕۆشـــــنایییەکە بێت (وێڕای هەوای تاسێنەریماڵەکە، پەنجەرەکان پێوە درابوون)، چەند چرکەیەک

ڕاسـکۆڵنیکۆفی پشـتگوێ خسـت و پشـتی تێ کرد. ڕاسـکۆڵنیکۆف قۆپچەی پاڵتاوەکەی کردەوە و تەورەکەی ترازاند؛ وەلێ بە تەواوی دەرینەهێنا و بە دەستەڕاسی لەژێر پاڵتۆکەیدا هێشتییەوە. دەستەکانی گوێیان نەدەگرت و هەستی دەکرد لەگەڵ تێپەڕینی هەر چرکەیەکیشدا سڕ و وشکتر دەبن. ترسـا تەورەکەی لە دەسـت بخزێ و بکەوێتە خوارێ... جا کتوپڕ هەستی کرد سەریشی دەسووڕێ.

پیرێژن لەتاو تووڕەیی هاواری لێ هەسـتا و نیو هەنگاوێکی بەرەو لای ئەو نا:

– ئاخر ئەمە چییە کە ئەوەندەت پێچاندووە؟

ئیدی نەدەکرا تەنانەت چرکەیەکیش بەفیڕۆ بدات. ڕاسـکۆڵنیکۆف تەورەکەی هێنایە دەرێ و بە هەردووک دەستی بەرزی کردەوە. بەبێ ئەوەی بزانێت خەریکی چییە، سـووک و ئاسـان و کەم تا زۆر بەبێ ویسـت تیغی تەورەکەی بەسـەر سـەری پیرێژنەکەدا داهێنایەوە. دەتگوت هێزێکە لە دەرەوەی ئەوەوە، بەس هەر کە تەورەکەی بە یەک گوڕ داهێنایەوە، دووبارە هێز و بڕستی تێ گەڕایەوە.

پیرێژن وەک هەمیشـە سـەری ڕووت بوو و دەتگوت قژە تەنک و کاڵ و مەیلەو سـپییەکەشـی ڕۆنی لێ دەتکێ. قژی وەک کلکەمشـک پەلکە کردبوو و شانەیەکی ئێسکیی شکاوی لە زوڵفە پەلکەکراوەکانی دابوو کە لە پشـتەملییەوە دیار بوو. پیرێژنەکە هێندە کورت بوو، گورزەکە ڕێک بەر تەپڵەسـەری کەوت. هاوارێکی کزی کرد و کتوپڕ کەوتە سەر ئەژنۆ. تەنیا توانیی هەردووک دەستی بەرەو سەری ببات. بارمتەکەش هێشتا هەر بە دەستییەوە بوو. ڕاسکۆڵنیکۆف دووبارە بە هەموو هێزی خۆیەوە گورزێکی لێ دا و پاشـان دانەیەکی دیکەش، هەر هەمووشـی بە دەمی تەورەکە و ڕێک لە تەپڵەسـەری. خوێن بە جۆرێـک قوڵپەی کرد وەک ئەوەی پەرداخە ئـاوێکی ڕژیـان قلـپ

کردبێتەوە؛ پیرێژن بە پشـــترپا تەختی زەوی بوو. راســـکۆلنیکۆف هەنگاوێکی بەرەو دواوە نا، لێگەڕا بکەوێت و دەمودەســـتیش بەســـەر ڕووخســـــاریدا نەوییەوە: پیرێژن مردبوو. چـاوە زەقبووەوەکـانی دەتگوت دەیانەوێت لە کاسەوە بێنە دەر و تەوێڵ و ڕووخساری لەتاو کرژبوون پڕ لە چرچولۆچ بووبوو.

راسکۆلنیکۆف لەتەنیشت تەرمەکەدا تەورەکەی خستە سەر زەوی و یەکســـەر دەســـتی کردە پشـــکنینی بەرکی، هەمان گیرفانی لای دەســـتەڕاســـتی کە پیرێژن جاری پێشـــوو کلیلەکەی تێدا دەرهێنابوو. هەڵبەتە لەم کاتەدا هەوڵی دەدا جۆگەلە خوێنەکە دەســـتوپلی پیس نەکات. هەستوهۆشی بە تەواوی لەسەر خۆی بوو. زەینی ئیدی تاریک نەبوو و سەریشی نەدەسووڕا، وەلێ دەستی هەر وا دەلەرزی. دواتر ئەوەی بیری خۆی دەهێنایەوە کە چەندە بە ســـەرنج و واســـواســـی و پارێزەوە جووڵاوەتەوە تا نەکا خۆی خوێناوی بکات... خێرا کلیلەکانی لە گیرفانی پیرێژنەکە دەرهێنان؛ ڕێک وەک جاران یەک دەســـتە بوون، لەگەڵ هەمان تاکئەڵقە ئاســـنینەکە. بێ بەفیڕۆدانی کات، کلیلبەدەســـت فڕکەی کردە نـاو ژووری خەوتن. ژوورێکی فرە بچووک بوو لەگەڵ دۆلابێکی گەورەی پڕ لە کۆتەڵ. لایەکی دیکەی دیواری ژوورەکە، تەختەخەوێکی پانوپۆڕی زۆر پاکوخاوێنی لێ بوو، کە چەرچەفێکی بە پەمۆدووراوی ئاوریشـــمیی چلپارچەی بەســـەرەوە بوو. دۆلابەکە بە دیواری ســێیەمەوە لکابوو. ســەیر بوو: هێشــتا یەک بە یەک کلیلەکانی تاقی نەکردبوونەوە کە هەستی کرد کرژبوونێکی ســەمەرە ســەراپای تەنییەوە. جارێکی دیکەش وەسوەسەیەکی کتوپڕانەی کەوتە دڵەوە کە ئەســـڵەن واز لە هەموو شـــتێک بهێنێت و بۆی دەربچێت، وەلێ ئەم وەسوەسەیەش لە چاوترووسکاندنێکدا تێپەڕی، ئاخر ئیدی فرە دێری کردبوو. تەنانەت خەریک بوو تیزخەندێکی پێشکەشی خۆی دەکرد کە لەپڕ بیرێکی تۆقێنەری دیکە بەرۆکی گرت. کەوتە خەیـاڵاتەوە کە

دەکرێت هێشـــتا پیرێژنەکە زیندوو بێت و دەشـــێت لە هەر ســـاتێکدا بەهۆش بێتەوە. وازی لە دەســـتەکلیل و دۆلابەکە هێنا و بەرەو لای تەرمەکە فڕکەی کرد. تەورەکەی هەڵگرت و بەسەر سەری پیرێژنەکەوە بەرزی کردەوە، وەلێ لێی نەدا. هیچ گومـانێک لە مردنی پیرێژنەکەدا نەمابوو. هەمدیســـان بەســـەریدا چەمییەوە و لە نزیکەوە زۆر ورد تەماشای کرد و بە ڕوونی بینیی کە کەللەسەری شکاوە و تەنانەت لە لایەکیشـــەوە ورد بووە. وەختبوو پەنجەی لێ بـدات کە دەســـتی کشـــاندەوە. پێویســـتی بەوە نەبوو. لەم ماوەیەدا، لەســـەر ڕووی زەوییەکە گۆمەخوێنێکی بچووک کۆ بووبووەوە. کتوپڕ لە ملی پیرێژنەکەدا چاوی بە پەتێک کەوت. پەتەکەی ڕاکێشـــا، وەلێ پتەو بوو و نەپســـا، بەتایبەت لەبەر ئەوەی کە بە خوێن خوســـابوو. هەوڵی دا لە یەخەی کراسەکەوە ڕای بکێشێتە دەر، بەڵام دەتگوت پەتەکە گیراوەتە شـــتێک. پەســـت بوو و هێندەی نەمابوو هەمدیســـان تەورەکە هەڵبهێنێتەوە و لە هەمان شوێنی پەڕۆکەدا بەسەر جەستەی ژنەکەیدا بکێشێت و بیبڕێتەوە کە نەیوێرا. ماوەیەک کێشمەکێشی بوو تا دواجار بە تەواوی دەســـتی و تەورەکەی خوێناوی کردن و توانیی بێ ئەوەی تەورەکە بەر تەرمەکە بکەوێـت، پەتەکە ببڕێـت و ڕای بکێشـــێـت. سۆسەکەی ڕاست دەرچوو: کیفی پارە. پەڕۆکە دوو دانە خاچی پێوە کرابوو، یەکێکیان لە تەختەی قوبرســـی و ئەوی دیکەشـــیان مســـی، لەگەڵ کۆتەڵێکی گچکەی میناکاریکراو و ئەو کیفە بچووکەشـــی کە پێوەی کرابوو؛ کیفێکی بەچرچولۆچ و لێواردار و ئەڵقەیەکی ئاســـنینی گچکە. ڕاســـکۆڵنیکۆف بێ ئەوەی ســـەیری کیفەکە بکات، لە گیرفانیی ئاخنی و خاچەکانیشـــی فڕێدانە ســـەر ســـنگی پیرێژنەکە. ئەم جارەیان تەورەکەشـــی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و بە پرتـاو گەڕایەوە ژووری خەوتن. زیرەکردووانە چنگی بە دەســـتەکلیلەکانـدا کرد و دووبارە ســـەرقاڵی قوفڵ و کلیلەکان بووەوە. وەلێ بێســـوود بوو و ئەو کلیلانە بۆ قوفڵی کۆمێدەکە نەدەشـــیان. کێشـــە هەر بە تەنیا لەرزینی دەســـتی

نەبوو و خۆشـــی یەکراســت گێج کەوتبوو؛ بۆ نموونە دەیبینی فلانە کلیل بۆ قوفڵی کۆمێدەکە ناشـێت، کەچی وازی نەدەهێنا و دەیویســت هەر بە زۆر چەنـد جارێـک تـاقی بکـاتەوە. کتوپڕ بیری هـاتەوە کە کلیلێکی گەورەی ددانداریش لەگەڵ کلیلە بچووکەکان بە ئەڵقەکەوەیە و تێگەیشت ڕێی تێناچێت هی کۆمێدەکە بێت (جاری پێشووش دەرکی بەوە کردبوو)، بێگومان بۆ ســندووقچە جانتا یان شــتێک دەشــیا و هەرچییەک بوو، هەر لەو ناوەدا شـــاردرابووەوە. وازی لە کۆمێدەکە هێنـا و خۆی خزانـدە ژێر تەختەکەوە؛ دەیزانی کە پیرێژنـان ســندووقچەکانیان لەو جۆرە شــوێنانەدا حەشــار دەدەن. دۆزییەوە، خۆی بوو: ســـندووقچەیەکی تا ڕادەیەک گەورە لەژێر تەختەکەدا بوو بە درێژایی کەمتر لە یەک مەتر، کە دەرگە دەرپەڕیوەکەیان بە پێستێکی نەرمی ســـوور ڕووکێش کردبوو و لە چەند شـــوێنێکەوە گوڵمێخی پۆلایی گچکەی پێوە بوو. کلیلە ددانەکە بە ئاسانی بۆ سندووقچەکە شــیا و کردییەوە. هەر لەوێ، لەژێر چەرچەفێکی ســپیدا، پاڵتۆیەکی نەخشــونیگار سووری دروستکراو لە پێشـتی کەروێشـکی لێبوو و لەژێرییەوە کراسـێکی ئاوریشـمی و پاشـانیش شـاڵێک. پێدەچوو ژێر ئەمانەش هەر بە تەنیا جلوبەرگی لێ بێت. یەکەمین شــتێک کە بە زەینیدا هات ئەوە بوو کە دەســتەکانی بەو پاڵتۆ پێســتییە ســـوورە بسـڕێتەوە. تەنانەت ئەوەشـی بە زەیندا ڕابرد کە *ئەمە خۆی سـوورە، خوێنیش بەسـەر سـوورایییەوە دەرناکەوێ*. لەناکاو هاتەوە سـەر خۆی و تۆقیوانە بیری کردەوە: *خوایە، ئەوە ئەقڵم لەدەست داوە؟*

تازە دەســتی بەر جلوبەرگەکان کەوتبوو کە کاتژمێرێکی زێڕین لە توێی پاڵتۆ پێســتییەکەوە خزایە دەرێ. ڕاســکۆڵنیکۆفیش هەڵپەهەڵپ کەلوپەلەکانی دیکەی نێو سندووقچەکەی ژێروژوور کردن. بەڵێ، نێوان جلەکان چەندان پارچە زێڕی لێ بوو، وا دیار بوو هەمووشی بارمتەن: دەستبەند، زنجیر، گوارە، سنجاقی زێڕینی سـەر و ئەم جۆرە شتانە.

هەندێکیان بەرگ و قەپاغیان هەبوو و هەندێکی دیکەشـــیان تەنیا بە پـاکوخـاوێنی و ڕێکوپێکی کـاغەزی ڕۆژنـامەیـان لێوە پێچـابوون و شـــریتپێچیش کرابوون. کاتی بەفیڕۆ نەدا و دەســـتی کردە ئاخنینی گیرفانی پاڵتۆ و پانتۆڵەکانی بە زێڕ؛ تەنانەت بێ جیاکاری و بەبێ ئەوەی سـندووقچە و بەسـتەکان بکاتەوە، پڕی دەدانێ، وەلێ دەرفەتی ئەوەی نەبوو هەموویان هەڵبگرێت...

کتوپڕ بیسـتی لەو ژوورەی کە تەرمەکەی تێدا جێ هێشـــتبوو، وا کەســـێک ڕێ دەکات. لەجێوە وشـــک بوو و وەک مردوو جووڵەی لێ بڕا. هەموو شـوێنێک کشـومات بوو، دەتگوت تووشـی خەیالات بووە. کتوپڕ و ئەم جارەیان بەبێ هیچ دوودڵییەک، هاوارێکی کزی گەیشـــتە گوێ کە لە کورتەناڵەیەکی شـکاو دەچوو. پاشـان بۆ ماوەی یەک دوو خولەکێک بێدەنگییەکی ڕەها باڵی کێشا. ڕاسکۆڵنیکۆف لەسەر چیچکان و لەبەردەم سـندووقچەکەدا بە هەناســـە بەندکراوییەوە چاوەڕێ بوو. پاشـــان لەناکاو فڕکەیەکی کرد، پڕی بە تەورەکەدا کرد و لە ژووری خەوتنەکە چووە دەرێ.

لیزاڤێتـا، بە بوخچەی بنباڵییەوە، ڕەنگی وەک گەچ ســـپی بوو و پێدەچوو نەتوانێت زار هەڵبێنێت و هاوارێک بکات. کە ڕاســـکۆڵنیکۆفی بە تەورەوە بینی، ســـەرتاپای کەوتە لەرزە و دەموچاوی یەک پارچە کەشـــەنگ بوو؛ دەســـتی تا نیوە بەرز کردەوە و دەمی بەش بووەوە، وەلێ ئەم جارەشـــیان هاواری نەکرد. هێدیهێدی لە ڕاســـکۆڵنیکۆف دوور کەوتەوە و دوادوا پاشـــەکشـــەی کرد تا گەیشـــتە ســـووچی ژوورەکە؛ ڕێک لە چاوی ئەو ڕامابوو و ســـەرنجی لێ لا نەدەدا. بەڵام هەر هاواری نەکرد، وەک ئەوەی نەتوانێت بەشـــی پێویســـت هەناســـە هەڵبمژێت. ڕاســـکۆڵنیکۆف بە تەورەوە هەڵمەتی بۆ برد. لێوەکانی لیزاڤێتا گەلێک بەزەییبزوێن و ڕێک هەر وەک لێوی منداڵێک پێچیان دەخوارد کە شـتێک ئەوی ترسـاندبێت و لەو ترسـناکییەدا ڕامابێت و

ئامادەی قیژاندن بێت. لیزاڤێتای سیاچارە هێندە ساویلکە و تەرسەزاڵ و تۆقیو بوو، تەنانەت دەستەکانیشی بەرز نەکردنەوە تا دەموچاوی بپارێزێت، سەربارى ئەوەی کە لەو ساتە تایبەتەدا تەورەکە ڕێک لەبەرانبەر ڕووخسارییەوە بوو و دەکرا ئەمە تاکە جووڵەی سرووشتیی ئەو بێت! تەنیا دەستە چەپیی کە ئازاد بوو، کەمێک هەڵبڕی، جا نەک بەرەو ڕووخساری، بەڵکە بە شێنەیی بەرەو راسکۆڵنیکۆفی درێژ کرد، وەک ئەوەی بیەوێت بەرەو دوا پاڵی بنێت. تەورەکە بە دەمی تیژییەوە ڕێک چەقییە کەللەسەری و بەشی سەرەوەی تەوێڵیی هەتا نزیکەی تەپڵەسەر قڵیشاند. لیزاڤێتا دەستبەجێ تەختی زەوی بوو. راسکۆڵنیکۆف کە بە تەواوی کۆنترۆڵی لەدەست دابوو، بوخچەکەی هەڵگرت، وەلێ هەمدیسان فڕێی دا و ڕای کردە ڕاڕەوەکەوە.

تۆقین، تا دەهات زیاد و زیادتر بەرۆکی دەگرت، بەتایبەت دوای دووەمین کوشتن کە بە تەواوی چاوەڕواننەکراو بوو. تەنیا دەیویست تا زووە لەوێ هەڵبێت. گەر لەو ساتەدا بیتوانیبا باش ببینێت و بیر بکاتەوە، گەر بیتوانیبا پەی بەوە ببات کە کەوتووەتە چ هەلومەرجێکی سەختەوە و کارەکەی تا چ رادەیەک دەبەنگانە و تۆقێنەرانە و بێڕێچارەیە، گەر بیزانیبا ناچارە چ کۆسپێک لەبەردەمیدا لابدات و تەنانەت تووشی چ هەڵەکەلێک ببێت تا لەوێ دەرچێت و خۆی بگەیەنێتەوە ماڵێ، لەوانە بوو دەست لە هەموو شتێک بشواتەوە و بە پێی خۆی دەمودەست بچێتە لای پۆلیس و خۆی رادەست بکات؛ نەک لە ترسی لێکەوتەی کارەکەی، بەڵکە لەبەر ئەو ڕق و قینەی کە لەهەمبەر کارەکەی بۆی دروست بووبوو. هەر قین و قێز بوو و سات دوای سات لە دڵییەوە قوڵپەی دەکرد و دەهاتە سەرێ. گەر دونیاشیان پێ بدابا، ئامادە نەبوو کەرەتێکی دی بچێتەوە سەر ئەو سندووقچەیە یان تەنانەت پێش بخاتە ئەو ژوورانەوە.

وەلێ بەرەبەرە دەتگوت بە جۆرێک لە جۆرەکان هەست و هۆشی شپرزە بوو و کەوتە بیرکردنەوە؛ هەندێک کات ئەوەی بۆ پێش دەهات کە بیری دەچووەوە چیی کردووە و تەنانەت بابەتە سەرەکییەکەی فەرامۆش دەکرد و بە وردەکاریی لاوەکییەوە خەریک دەبوو. سەرباری ئەمانەش، کە چاوی بە موبەق و سەتڵی پڕ لە ئاوی سەر نیمکۆتەکە کەوت، بەشی ئەوە هۆشی لای خۆی بوو کە دەست و تەورەکە بشوات. دەستەکانی خوێناوی و لینج بوون. دەمی تەورەکەی لە ئاوەکە ژەنی. پارچەسابوونێک لە ژێرپیاڵەیەکی لێوپەڕیودا بەسەر لێواری پەنجەرەوە بوو. ڕاسکۆڵنیکۆف سابوونەکەی هەڵگرت و کەوتە شۆردنی دەستەکانی. کە بە جوانی دەستەکانیی شۆردن، تەورەکەشی لە ئاو دەرهێنا، دەمەکەی خاوێن کردەوە و نزیکەی سێ خولەکێکیش بە پەڵەخوێنەکانەوە خەریک بوو کە کەوتبوونە سەر دەسکی تەورەکە و چاکچاکێک بە سابوون ئەوانیشی شۆردن. پاشان بە جلەشۆراوێک کە لە موبەقەکەدا بەسەر تەنافێکەوە هەڵخرابوو، وشکی کردەوە و جا لەلای پەنجەرەکە بە وردی و بۆ ماوەیەکی زۆر کەوتە سەرنجدان لە تەورەکە. هیچ ئاسەوارێکی خوێنی پێوە نەمابوو، تەنیا دەسکی تەورەکە هێشتا تەڕ بوو. بە سەرنجەوە تەورەکەی لە ئەڵقەی ژێر بنەباڵییەوە گیر کرد و تا ئەو شوێنەی کە ڕۆشنایی کزی ناندینەکە دەرفەتی دەدا، لە پاڵتۆ و پانتۆڵ و پووتەکانیشی ورد بووەوە. بە یەکەمین سەرنج بە گشتی پاکوخاوێن دەردەکەوتن و تەنیا پووتەکانی پەڵەیان لێ نیشتبوو. پارچە پەڕۆیەکی کۆنەی خووساند و پووتەکانیی پێ سڕی؛ وەلێ دەیزانی کە لەوێ ناتوانێت بە باشی ببینێت و لەوانەیە شتێک کە زۆریش ڕوونە، چاوی نەیبینیبووبێت. لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستا و کەوتە بیرکردنەوە، بیرکردنەوەیەکی ئەشکەنجەدەر و ڕەش خەریک بوو لە ناوەوەڕا دەیتەنییەوە: بێگومان ئەقڵی لەدەست داوە؛ ئێستە نە باش دەتوانێت بیەڵگێنێت و نە بەرگریش لە خۆی بکات؛ ئەسڵەن لەو کاتەدا بە گشتی دەبوو کارێکی

دی بکات... لەبەرخۆیەوە ورتاندی، *خوایە! دەبێ ڕاکەم! ڕا!* جا بەرەو لای ڕاستی ڕاڕەوەکە فڕکەی کرد. بەڵام لەوێدا ترسێکی هێندە تۆقێنەر چاوەڕێی بوو کە بە هەموو تەمەنی تووشی شتی وا نەبووبوو.

ڕاوەستا و لە بەرانبەری خۆی ڕاما و نەیدەتوانی باوەڕ بەوە بکات کە دەیبینێت: دەرگەکە، دەرگەی دەرەوەی ئەپارتمانەکە کە لە ڕاڕەوەکەوە بەرەو ڕووی باداکەکە دەکرایەوە، یانی هەمان ئەو دەرگەیەی کە ڕاسکۆلنیکۆف خۆی کەمێک لەوەوبەر، دوای زەنگلێدان، لێیەوە هاتبووە ژوور، ئێستە بە ئەندازەی لەپە دەستێک ئاوەڵا بوو. نە کلۆمێک، نە قوفڵێک؛ جا بە درێژایی ئەو ماوەیەش! بێگومان پیرێژن بۆ پارێز دەرگەکەی بەدوای خۆیدا پێوە نەدابوو! خوای گەورە! خۆیشی بینیی کە لیزاڤێتا هاتە ژوورەوە! چۆن، ئاخر چۆن ئەوەی بە زەیندا نەهاتبوو کە دواجار ئەویش بە جۆرێک لە دەرگەکەوە هاتبێتە ژوور، خۆ ناکرێ بە دیوارەکەدا تێپەڕیبێت!

پڕتاوی کردە لای دەرگەکە و کلۆمی دا.

*وەلێ نا؛ خۆ دیسان هەر خەریکم بە هەڵەدا دەچم! دەبێ بڕۆم!*

کلۆمەکەی ڕاکێشا، دەرگەی کردەوە و لە باداکەکەدا گوێی هەڵخست.

تا ماوەیەک هەر گوێی گرت و گوێی گرت. لەو خوارەوە، تەنانەت ڕەنگە لە دەرگەی سەرەکیی بیناکەوە، هاتوهاواری دوو کەس دەهات کە خەریک بوون قسەی ناشیرینیان دەگوت. *ئەمانە دەردیان چییە؟* پشوودرێژانە چاوەڕێ ما. دواجار دەنگوهەراکە کپ بووەوە و هەموو شوێنێکیش ئارام؛ هەر کەسەو بە ڕێی خۆیدا ڕۆیشتبوو. ویستی لەو ناوە دەربچێت کاتێک کتوپڕ لە نهۆمی خوارەوە زرمەی کرانەوەی دەرگەیەک هات و یەکێک لە پلیکانەکانەوە چووە خوارێ و لەژێر لێوەوە فیکەشی لێ دەدا. بە زەینیدا ڕابرد، *چۆن کردوویانە بە*

*دەنگوهەرا!* هەمدیســــان دەرگەکەی پێوە دا و چاوەڕێ ما. دواجار هەنگەکان کپ بوونەوە و بێدەنگی باڵی کێشـــا؛ نزمترین دەنگێک نەدەهات. تازە خەریک بوو یەکەمین هەنگاوی بەرەو پلیکانەکان دەنا کە ئەم جارەیان سەرلەنوێ دەنگی پێیەکی بیستەوە.

دەنگی پێیەکە گەلێک دوور بوو، پێدەچوو لە خواری خوارەوەی پلیکانەکانەوە بێت. وەلێ دواتر فرە بە ڕوونی و ڕاشـــکاوی بیری دەهاتەوە کە لەگەڵ بیســـتنی دەنگی یەکەمین هەنگاو، گومانی بۆ ئەوە چووە کە ئەو کەســـە، لە نهۆمی چوارەم بەولاوە مەبەســـتی هیچ شـوێنێکی دیکە نییە؛ خەریک بوو بۆ لای پیرێژن دەهات. وەلێ بۆچی؟ باشە ئەو دەنگی پێیە تایبەتمەندی و مانایەکی دیاری هەبوو؟ ترپەترپی پێیەکە، قورس و یەکئاواز دەینواند و پەلەپەلێکیش لەئارادا نەبوو. دە فەرموو! گەیشـتە نهۆمی یەکەم و ئێسـتاکەش ڕاسـتەوڕاسـت وا دێتە ســـەرەوە و دەنگی پێیەکەش بەرز بووا ئیدی دەنگی هـانکەهـانکی هەناسـەی قورسـی کەسـەکەشـی دەبیسـت، ئەوەش نهۆمی سـێیەم... خەریک بوو بەرەو نهۆمی چوارەم دەهات! هەسـتی دەکرد سـەرتاپێی بەردە و لە جێوە وشـــک بووە، دەتگوت مۆتەکەی دەدیت کە یەکێک بەدواوەیەتی و کەم تا زۆر پێی ڕاگەیشتووەتەوە و دەیەوێت بیکوژێت، وەلێ ئەو هەر وا بە زەوییەوە چەسپیوە و تەنانەت ناتوانێت دەستیشی بجووڵێنێتەوە.

میوانە ناوەختەکە خەریک بوو لە نهۆمی ســێیەمەوە بەرەو چوارەم دەهات و جا لەو کاتەشـــدا بوو کە ڕاســـکۆڵنیکۆف خۆی لە زەوی هەڵکەند و توانیی خێرا بگەڕێتەوە ژووری و هێواش و بەبێ دەنگ دەرگەی پێوەی دا و کلۆمی کرد. ئێســـتە تەنیا غەریزە یارمەتیی دەدا. پاشـــان ڕێک لە هەمان شـــوێن و لەپشـــت دەرگەکەوە ڕاوەســـتا و هەناسەی لە سنگیدا بەند کرد. میوانە ناوەختەکەش گەیشتبووە پشت دەرگەکە. ئێســـتە هەردووکیان لەبەرانبەر یەکدیدا بوون؛ ڕێک وەک

پێشـــتر کە دەرگەکە، ئەو و پیرێژنەکەی لێک جیا دەکردنەوە و ئەو گوێی قولاخ کردبوو.

میوانە ناوەختەکە چەند جارێک پشـــووی وەرگرت. ڕاســکۆلنیکۆف لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە *کابرا ڕەنگە لە ســـەرزلەکان* بێت و توند تەورەکەی لە دەستیدا گوشی. بەڵێ، هەموو ئەمانە لە خەون دەچوون. میوانەکە زەنگێکی چاکی بۆ لێ دا.

ڕاســـکۆلنیکۆف هەر کە زایەڵەی زەنگە کانزاییەکەی بیســـت، دڵی ختوورەی کرد کە وا شـــتێـک لە ژوورەکەدا جمەجمییەتی؛ چەنـد خولەکێکیش زۆر بە هەتەر[1] گوێی بۆ شـــل کرد. کابرای نەناســـراو جارێکی دیکەش زەنگی لێدا و کەمێکیش ڕاوەســـتا، پاشـــان کتوپڕ دەیری بوو و کەوتە گیانی دەسـکی دەرگەکە. ڕاسـکۆلنیکۆف تۆقیوانە لە کڵۆمەکەی دەڕوانی کە تەکـانی دەدا و بیری کردەوە کە هـاکـا کڵۆمەکە دەرهات، چونکە بەو جۆرەی کە دەســـکەکە ســـەر و خواری دەکرد، وەها شـتێک هیچ بەدوور نەبوو. ویسـتی کڵۆمەکە لە شـوێنی خۆیـدا ڕابگرێـت، وەلێ بۆی هەبوو بەرانبەرەکەی تێبگـات کە لە ژوورەوە شـــتێک لەئارادایە. حەپەســـابوو و دووبارە هەســـتی کرد سەری دەسووڕێت: *هاکا کەوتم!* وەک برووسکە ئەم فکرەی بە زەیندا ڕابرد، بەڵام هەر لەو سـاتەدا نەناسـراوەکە دەسـتی بە گوتنی شـتێک کرد و ڕاسکۆلنیکۆف هاتەوە سەر خۆی.

– نـازانم لە ژوورەوە خەریکی چ نـامـاقوولییەکن؟ خەویـان لێ کەوتووە یان کەسێ خنکاندوونی؟ نەفرەتیینە!

کابرا کردییە هەرا، وەک ئەوەی لەناو داریلێکەوە بنەڕێنێ:

---

١. هەتەر: جددی؛ جیدی.

– هێێێێی، ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا، جادووگەری پیر! لیزاڤێتا ئیڤانۆڤنا، ژیکەڵە! دە بیکەنەوە! دەڵێی خەوی یەکجاریتانە، نەفرەتیینە؟

کابراله له تووڕەییان شـێت بووبوو و دە دوازدە جاری دیکەش بە هەموو توانایەوە توند پەتی زەنگەکەی ڕاکێشــا. پێدەچوو کەسـێکی دەستڕۆیشتوو بێت و لێرانەش وەک خۆمانەیەک دەهاتە ئەژمار.

هاوکات دەنگی پێیەکی سـووک و بە پەلەی دیکە کە زۆریش دوور نەبوو، لە پلیکانەوە هات؛ یەکێکی دی خەریک بوو دەهاتە سـەرێ و ڕاسـکۆلنیکۆف ئەسڵەن بە هاتنی نەزانیبوو. دووەمیان بە ڕووخۆشـی و دەنگی بەرزەوە ڕوو لە یەکەمیان کە هێشتا گرتبووی بە زەنگەکەوە، هاواری کرد:

– یانی کەس لە ماڵێ نییە؟ سڵاو، جەنابی کوخ!

ڕاسـکۆلنیکۆف خێرا بە زەینیدا هات: *بە دەنگیدا دیارە کە تەمەنێکی وای نییە!*

کوخ وەڵامی دایەوە:

– هەر خوا دەزانێ! خۆ من ئیتر وا دەرگەکەم لە بن هێنا! ڕووداری نەبێ ئێوە چۆن من دەناسن؟

– ئەی هاوار، پێمان ڕادەبوێری کوخ؟ پێرێ بوو کە سـێ دەسـتە بلیاردم بەدوای یەکدا لێ بردیتەوە... لە کافەی *گامبرینۆس*!

– ئەها!

– یانی لەوێ نین؟ سـەیروسـەمەرەینە! چ گاڵتەجارییەکە! تۆ بڵێی ئەم پیریژنە بۆ چ دۆزەخێ چووبێ ئاخر؟ ئیشم پێیەتی کاکە!

– منیش ئیشم پێیەتی، کاکە گیان!

گەنجەکە هاواری لێ هەستا:

– دەی ئێســـــتە چی بکەین؟ کەواتە دەبێت بچینە خوارێ. منیش خۆشیخۆشی هاتم دوو قرانێک دەست بخەم!

– ئەرێ، دەڕۆین، بەس بۆچی وادەی بە من دا؟ خۆی پێی گوتم لەم کاتەدا بێم. ئەو هەموو ڕێیەمان بڕیوە! ئێستە سەری بە چ کونێکدا کردووە؟ خۆ من ئەقڵم نایبڕێ، ئەم قرچۆڵەیە داڵ بۆ داڵ لە ســـووچی ماڵەوەدا جووڵە ناکا و لای خۆیەوە قاچێێشـــەی هەبوو! بەس فەرموو، ئێستە کتوپڕ هەستاوە بۆی دەرچووە!

– لە قاپچی بپرسین؟

– چی بپرسین؟

– بپرسین خانمخاس بۆ کوێ چووە و کەی دەگەڕێتەوە.

– ئمممم... خوا بە نەفرەتی کا... با بچین بپرســـــین؛ وەلێ خۆ ئەم ژنەتیوە ناچێتە هیچ کوێ ئاخر...

کوخ هەمدیسان گرتی بە دەرگەکەوە:

– بە توون! چار نییە؛ با بڕۆین!

گەنجەکە لەپڕ هاواری کرد:

– ڕاوەستە! سەیر کە؛ دەبینی کە دەرگەکە بەرەو خۆت ڕادەکێشی چۆن دەلەقێ؟

– ئێ مەبەستت؟

– ئەمە یانی قوفڵ نەدراوە و تەنیا لەپشـــــتەوە کلۆمیان کردووە. تەماشا چۆن دەلەقێ!

– ئێ؟

– کاکە بۆ تێناگەی تۆ؟ یانی یەکێکیان لەماڵەوەیە! گەر هەردووکیان لە دەرێ بان، بە کلیل دەرگەکەیان بەدوای خۆیاندا قوفڵ دەدا، نەک لە ناوەوە کلۆمی بدەن! تەقەتەقی ئەڵقەڕێزەکە دەبیستی؟ بۆ ئەوەی ئەڵقەڕێزی دەرگە کلۆم بدەی دەبێ خۆشت لە ژوورەوە بی... ئێستە حاڵی بووی؟ کەواتە لە ماڵێن و تەنیا دەرگەکە ناکەنەوە!

کوخ سەراسیمە بووبوو:

– سەیرە! وایە! کەواتە خەریکی چ ناماقووڵییەکن لە ژوورەوە؟

هەمدیسان بە توورەییەوە کەوتە گیانی دەسکی دەرگەکە.

گەنجەکە هەمتر هاواری کرد:

– دەست ڕاگرە! ئەوەندە ڕایمەکێشە ئیتر! هەبێ و نەبێ شتێک قەوماوە... تەماشا چەندە زەنگ و تەقەت لێدا، کەچی هەر نەیانکردەوە و نەیانکردەوە؛ کەواتە یان بووراونەتەوە هەردووکیان یان...

– یان چی؟

– تەماشا، دەچینە خوارێ و قاپچی دەهێنین. لێگەڕێ قاپچی خۆی چارەی بکا.

– باشە، هاوڕام!

پێکەوە بەڕێ کەوتن تا بە پلیکانەکاندا بچنە خوارێ.

– بوەستە! تۆ بمێنەوە. من ڕادەکەم و بە فرکەیەک قاپچی دەهێنم.

– بۆ بمێنمەوە؟

– تەنیا بۆ پارێزە، ئاخر ئەم کارە جێی گومانە!

– باشە!

– هەر بۆ زانیاریت، من وا خەریکی مەشــــقکردنم بۆ ئەوەی ببمە لێکۆڵەری دادگە[1]. بە تەواوی ڕوونە کە ئەم کارە جێی گومانە!

گەنجەکە بە گوڕوتینێکی زۆرەوە ئەمەی گوت و بە پلیکانەکانـدا چووە خوارێ.

کوخ هەر لەوێ مـایەوە و بە هێمنی گرتییەوە بە زەنگەکەوە و جارێکیش دەنگی لێوە هێنا. پاشـــان بە جۆرێک وەک بڵێت تەواو مێشکی قاڵە و خەریکی هەڵسەنگاندنە، چووە گیانی دەسکی دەرگەکە. هەر ڕای دەکێشـــا و بەری دەدا؛ دەیویســـت بە تەواوی لەوە دڵنیا ببێتەوە کە دەرگەی مـاڵەکە تەنیـا لە ژووری بە ئەڵقەڕێز داخراوە و قوفـڵ نەدراوە. بە هـانەهـانەوە داچەمی و چـاوی بە کونی کیلۆنی کلیلەکەوە نا، وەلێ کلیلەکە لە ناوە لە کونەکەدا بوو و هیچ نەدەبینرا. ڕاسکۆڵنیکۆف هەسـتا و تەوربەدەسـت ڕاوەسـتا. تووشـی جۆرێک لە شـــێتی بووبوو. تەنانەت ئامادە بوو هەر کە هەنگاویان نایە ژوور پەلاماریان بدات. چەندان و چەندان جار بە بیریدا هات دەســـتبەجێ هەموو شـــتێک ببڕێنێتەوە و هاوار بکات و لەپشــتڕا شــتێک بەو دوو کەســـە بڵێت کە لە دەرگەیان دەدا و ڕاوێژیان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد. هەندێک جاریش بە مێشـکیدا دەهات کە ســەر بخاتە ســەریان و پێیان ڕابوێرێت کە ناتوانن دەرگەکە بکەنەوە. وەک برووســـکە بە زەینیدا هات، *دە بیبڕنەوە ئیترا*

– باشە ئەمە بۆ کوێ چوو؟ خوا بە نەفرەتی کا...

کات وا تێدەپەڕی؛ خولەکەکان بەدوای یەکدا ڕادەبردن، وەلێ هیچ کەسێک دەر نەکەوت و کوخیش وەڕەز بوو.

---

1. پلەیەکی جددی لە سیستەمی دادگەی ڕووسیادا کە دوای چاکسازییەکانی ساڵی ١٨٦٤ لەسەر بنەمای پێگە هاوئاستەکانی فەرەنسا دانرابوو. «و. ف»

کتوپڕ هاواری کرد:

– دەک سندانت لێدا!...

پاشان لەوپەڕی پشووکورتیدا وازی لە ئەرکەکەی هێنا و بە پەلە و لە بارێکدا کە پووتە قورســـەکانیی بە پلیکانەکاندا دەکوتین، چووە خوارێ و دەنگی هەنگاوەکانی کپ بوونەوە.

*خوایە دەبێ چی بکەم؟*

ڕاسکۆڵنیکۆف ئەڵقەڕێزەکەی ڕاکێشا و درزێکی خستە دەرگەکەوە؛ هیچ دەنگێـک نەدەهــات. کتوپڕ، بێ هیچ بیرلێکردنەوە و بڕیــارێکی پێشـوەختە، هەنگاوی نایە دەر و تا ئەو شـوێنەی کە دەکرا دەرگەکەی چاک پێوە دا و ڕێی پلیکانەکانی بەرەو خوارێ گرتە بەر.

ســـێ پلیکان چووبووە خوار کە کتوپڕ دەنگێکی بەرز لە خوارێڕا بەرز بووەوە. دەبوو خۆی لە کوێ بنێت؟ هیچ شـــوێنێک نەبوو خۆی تێدا بشـــارێتەوە. هێندەی نەمابوو ڕابکاتەوە ســـەرێ و هەمدیســـان بچێتەوە ناو ئەپارتمانەکەی.

– ئەهۆو، حەیتە؟ بیگرە!

کەســـێک بەدەم هـاتوهـاوارەوە لە ئەپارتمـانێکی نهۆمی خوارەوە وەدەر کەوت و خۆ ڕاکردنیش شـتێکی ئاسـانە، لە پلیکانەوە بازی دایە خوارێ و بە دەنگێکی بەرزیش نەڕاندی:

– میتکا! میتکا! میتکا! ئەک خوا بە نەفرەتت کا!

نەڕەکە بە قیژوهوڕ کۆتـایی هـات؛ لە گۆڕەپـانەکەوەش دواهەمین دەنگ هات و ئیدی بێدەنگی. وەلێ هەر لەو کاتەدا چەند کەســـێک کە پەلەپەل و بە دەنگی بەرز دەدوان، ترپەترپ هاتنە ســـەر. ســـێ‌چوار کەســـێک دەبوون و ڕاســـکۆڵنیکۆف دەنگی زەنگداری گەنجەکەی ناسییەوە: *دە فەرموو، خۆیانن!*

لەوپەڕی بێهیواییدا چوو تا ڕاســتەوخۆ ڕووبەڕوویان ببێتەوە. چی *دەبێ با ببێ! گەر بێنە بەردەمم ئەوا فەوتاوم؛ نەشبێن ئەوا چارەڕەشم،* چونکە *ســەروســەکوتمیان بیر دەمێنێ!* خەریک بوو پێک دەگەیشــتن و تەنیـا یەک نهۆم مەودایـان لەنێواندا بوو کە کتوپڕ ڕێی ڕزگـاری لە بەرپێیدا ئاوەڵا بوو! دووسـێ هەنگاو ئەولاتر، لای ڕاسـتەوە، یەکێک لە ئەپارتمانەکان چۆڵ بوو و دەرگەکەشــــی کراوە؛ هەمان ئەپارتمانی نهۆمی دووە کە لە کاتی هاتنیدا، خەریکی بۆیەکردنی بوون و ئێســـتە هەر دەتگوت تەنیا لەبەر خاتری ئەو، ڕۆیشـــتبوون و بە چۆڵی بۆیان جێ هێشـــتبوو. بێگومـان هەر هەمـان ئەو بۆیەچیـانە بوون کە بەو دەنگوهەرایە ڕایــان کردبووە خوارەوە. زەوییەکە تــازە بۆیەی بەر کەوتبوو و لە ناوەڕاســتەکەشـیدا ســەتڵ و دەفرەڕەنگ و قەڵەمێکیان دانابوو. لە چاوترووســــکاندنێکدا فڕکەی کردە نێو ئەپارتمانەکەوە و لەپشت دیوارەکەیەوە خۆی حەشار دا؛ جا ڕێک لە کاتی خۆیشیدا. ئەو چەند کەســــەی تر کە گەیشـــتبوونە باداکەکە و خەریک بوون بەرەو نهۆمی چوارەم ســــەردەکەوتن و بە دەنگێکی بەرزبەرزیش قســــەیان دەکرد. ڕاســــکۆڵنیکۆف چاوەڕێ ما تا بڕۆن و پاشــــان بە پادزە لە ئەپارتمانەکە هاتە دەر و جا بەرەو خوار بۆی دەرچوو. پلیکانەڕێکە کەســــی لێ نەبوو. بەردەم دەرگەی دەرەوەش هەر وا چۆڵ بوو. بە هەڵەداوان لە دەرگەکەوە خۆی گەیاندە دەرێ و لە شـەقامەکەدا بەرەو لای چەپ بای دایەوە. باش دەیزانی ئێســـتە ئەوان لە ئەپارتمانەکەدان و لەوە حەپەسـاون کە بۆچی دەرگەیەک کە چەند خولەکێک لەوەوبەر داخرابوو، وا ئێســـتە کراوەتەوە؛ جا ئێســـتە لە تەرمەکان ڕاماون و خولەکێکیش ناخایەنێ تا تێبگەن کە بێ دوودڵی بکوژ چەند ســــاتێک لەوەوبەر لەوێ بووە و توانیویەتی خۆی لە شــــوێنێک بنێت و بە بەرچاوی ئەوانەوە بۆی بقووچێنێت. لەوانەشــــە گومـانیـان بۆ ئەوە بچێت کە لە کاتی چوونەسەرەوەدا، ئەو بۆ چەند ساتێک لە ئەپارتمانە چۆڵەکەدا خۆی شــاردووەتەوە. وەلێ گەر ژیانیشـــی لەســـەر دابنابا،

ئامادە نەبوو لەوە زیاتر پێ هەڵبگرێت؛ وێڕای ئەوەی کە هێشتا سەد هەنگاوێکیشی بۆ پێچی دواتر مابوو. *ڕەنگە وا باشتر بێ خۆم لە یەکێک لەم بەردەگایانە بنێم، یان لەژێر پلیکانێک شتێکدا خۆم بشارمەوە؟ نا، مەترسیدارە! چۆن تەورەکە فڕێدەمە لایەک؟ یان باشتر نییە گالیسکەیەک بگرم؟ ئای لەو نەهامەتییە! چ نەهاتێک بوو!*

دواجار گەیشتە پێچەکە و خۆی بە کۆڵاندا کرد؛ زیاتر مردوو بوو تا زیندوو. ئێستە ئیدی شوێنەکەی بێوەی بوو و خۆیشی دەیزانی کە کەمتر لەبەردەم مەترسیدایە، ئاخر لەوێدا خەڵک جمەی دەهات و ئەویش وەک دەرزییی ناو عەمارەکایەکی لێ دەهات. بەڵام ئەو ئەشکەنجانەی کە تووشی بوون، بە جۆرێک لەپێیان خستبوو کە بە زۆر دەیتوانی هەنگاو هەڵبهێنێتەوە. ئارەقە بە سەروڕوویدا دەتکا و ملی تەواو خوسابوو. کاتی ڕابردن لە ڕێژاوەکەوە، یەکێک هاواری کرد:

– چ بەدمەستێکی کابرا!

نیوە هۆشیار بوو و دۆخی هەر وا خراپ و خراپتر دەبوو. بەس دواتر بیری هاتەوە کە ئەو وەختەی لە ڕێژاوەکە تێدەپەڕی، چەندە لەوە ترسابوو کە ئەو دەوروبەرە تاکوتەرا خەڵکی لێیە و نەکا سەرنجی ڕاکێشابێت و هێندەی نەمابوو لە ترساندا یەکسەر خۆی بە کۆڵانەکەدا بکاتەوە. وێڕای ئەوەی کە بە زۆر خۆی بە پێوە گرتبوو، بای دایەوە و لە ڕێگەیەکی دیکەوە بەرەو ماڵەوە چوو.

کە لە دەرگەی سەرەکی تێدەپەڕی تا بچێتە نێو بیناکە، هەست و هۆشێکی وای نەبوو و لە پلیکانەکاندا تەورەکەی بیر هاتەوە. ئەو کارەی کە دەشیا بیکات ئێجگار گرنگ بوو: دەبوو تەورەکە بخاتەوە شوێنی خۆی، جا ئەوەش بەوپەڕی پارێزەوە تا کەس نەیبینێت. لە دۆخێکدا نەبوو لەوە تێبگات کە نەبردنەوەی تەورەکە بۆ شوێنی خۆی

لە بەرژەوەنـدیی ئەودایە و وا چـاکترە دوایی بەپێی دەرفەت لە شوێنێکی دیکەی بنێت.

لەگەڵ ئەمەشـــدا، هەموو شـــتێک بێ کێشـــە تێپەڕی. دەرگەی ژووروچکەی قـاپچی داخرابوو، وەلێ کڵۆمیـان نەکردبوو؛ کەواتە بە ئەگەرێکی زۆر قاپچی لە ژوورەوە بوو. لەو کاتەدا ئیدی نەیدەتوانی بە ڕێکی بیر لە شـــتەکان بکاتەوە، ســـەری داخســـت و ڕێک چووە بەردەم ژووروچکەکە و دەرگەی کردەوە. گەر قاپچی لێی بپرســـیبا شـــتێکت دەویســـت؟ هیچ دوور نەبوو تەورەکە دەربهێنێت و بیداتە دەســـتی. بەڵام قاپچی لەوێ نەبوو و ڕاســـکۆڵنیکۆف توانیی تەورەکە بخاتەوە ژێر نیمکۆتەکە و تەنانەت وەک پێشـــوو پارچە هێزمێکیشـــی خســـتە ســـەری. لە گەڕانەوەدا بەرەو ژوورەکەی تاقە کەســـێکیشـــی نەدیـت. دەرگەی ئەپـارتمـانی خـاوەنمـاڵیش داخرابوو. کە چووە ژوورەکەیەوە، هەر وا بە جلەوە خۆی هاویشـــتە ســـەر قەنەفەکەی. خەوی لێ نەکەوت و کەوتبووە دۆخێکی نیوەبێهۆشانەوە. گەر کەسێک دەرگەی ژوورەکەی بکردبـاوە و بهـاتبـا ژوورێ، ڕاســـکۆڵنیکۆف دەردەپەڕی و هـاواری لێ هەڵـدەســـتـا. زەینی تەژی بوو لە بیری پچرپچڕ و شـێواو و هەرچی هەوڵی دەدا نەیدەتوانی تەنانەت لەســـەر دانەیەکیشـــیان بەردەوام بێت یان ســـاتێک ســـەرنجی لەســـەر چڕ بکاتەوە...

## یەک

ڕاسکۆلنیکۆف بۆ ماوەیەکی زۆر هەر وا بە ڕاکشاوی مایەوە. جاروبار دەتگوت هایی دەبووەوە و تێدەگەیشت کە دەمێکە شەوە، وەلێ هەر بە خەیاڵیشیدا نەدەهات کە هەڵبستێتەوە. دواجار تەماشای کرد هەموو شوێنێک وەک ڕۆژ ڕۆشنە. هێشتا، لەسەر گازی پشت مات و پەرێشان بەسەر قەنەفەکەوە خەوتبوو. لە شەقامەوە دەنگەڵی گوێکەڕکەری تۆقێنەر و تیاماوانە دەهاتنە گوێ؛ قاووقیلێک کە هەر شەوەو دوای کاتژمێر دوو لەژێر پەنجەرەکەیدا دەیبیست و وا ئێستەش لە خەویان هەستاندبوو. بیری کردەوە: *دە فەرموو! هەمدیسان ئەو عارەقخۆرانە لە مەیخانەوە ڕژاونەتە دەرێ! کەواتە، لە دووش لای داوە...* کتوپڕ بە چەشنێک لە جێوە دەرپەڕی وەک ئەوەی کە دوودەستی ئەویان لە قەنەفەکە کردبێتەوە: *ها؟ یانی لە دووش لای داوە؟* لەسەر قەنەفەکە دانیشت و کتوپڕ هەموو شتێکی بیر هاتەوە. بێ پێشەکی، یەک بە یەکی ساتەکانی بیر هێنانەوە!

سەرەتا دڵنیا بوو کە خەریکە شێت دەبێت. لە سەرماندا خەریک بوو لە ناوەوە دەیبەست، وەلێ ئەم سەرمایە، لەرزوتایەک بوو کە چەند کاتژمێرێک پێشتر بەدەم خەوەوە کەوتبووە گیانی. وەها لەرزێکی لێ هات کە ددانەکانی دەیانویست لە دەمییەوە بکەونە خوار و ئازای ئەندامی هەڵدەلەرزی. دەرگەی کردەوە و گوێی هەڵخست: نیشتەجێیانی ئەو بینایە لە حەوت خەودا بوون. تەواو سەرسام لە خۆی و لە هەرچی لە ژوورەکەیدا بوو، ڕاما؛ ئاخر چۆن توانیبووی یەکسەر بێتە ژوور، دەرگەکەش کلۆم نەکات، ئەوە جلگۆڕین هەر هیچ،

تەنانەت کڵاوەکەشی لە سەر لانەبات و هەر وا خۆی بەسەر قەنەفەدا بدات! کڵاوەکە لە نزیک پشتییەکەوە کەوتبوو. *باشە گریمان کەسێک بهاتبا ژوور، ئەی ئەوسا گومانی بۆ چی دەچوو؟ هەڵبەتە وای دەزانی سەرخۆشم؛ وەلێ...* پرتاوی کردە لای پەنجەرەی بچووکی ژوورەکە؛ بەشی ئەوە ڕۆشن بوو کە بتوانێت پەلەپەل لە جلوبەرگ و سەراپای ورد ببێتەوە تا بزانێت ئاسەوارێک لە خوێن هەیە یان نا؟ وەلێ بەم جۆرە سوودێکی نەبوو. وێڕای ئەوەی کە لەتاو سەرمادا هەڵدەلەرزی، هەر سپیاڵێک کە لە بەریدا بوو، دایکەند تا یەک دوای یەک بە سەرنجەوە تەماشایان بکات. جلەکانی ئەمدیو و ئەودیو پێدەکردن و بەسەر هیچدا تێنەدەپەڕی، بەس لەبەر ئەوەی بڕوای بە خۆی نەبوو، دووسێ جارێک لە هەموویان ورد بووەوە. هیچی بەرچاو نەکەوت؛ بێ لە دەمپاچەی تاڵکێشبووی پانتۆڵەکەی کە لە خوێنێکی وشکەوەبووی خەستەوە هەڵکێشرابوو، ئاسەوارێک و تەنانەت دڵۆپێکیش لەئارادا نەبوو. تۆقیوانە چەقۆ گیرفانییە گەورەکەیی هەڵگرت و دەمپاچەی پواو و خوێنینی پانتۆڵەکەی بڕی. پێدەچوو هەر ئەوەندە بێت. کتوپڕ بیری هاتەوە کیفی پارە و ئەو کەلوپەلەی کە لە سندووقچەی پیرێژنەکەی دەرهێنابوون، هێشتا هەر وا لە گیرفانیدان و تەنانەت بیری لەوەش نەکردبووەوە کە دەریان بهێنێت و لە شوێنێک بیانشارێتەوە! هەر ئێستەش، لە کاتی وردبوونەوە لە جلەکانی، هەر بیری بۆ ئەوە نەچووا بۆچی؟ برووسکەئاسا هەمووی لە گیرفانی دەرهێنان و هەڵی ڕشتنە سەر مێزەکە. گیرفانیی خاڵی و تەنانەت هەڵیشی گێڕانەوە تا دڵنیا بێت کە هیچیان تێدا نەماوە و جا هەمووی بردنە سووچێکی ژوورەکە. لەوێ، لای دیوارەکە، کاغەزدیوارییەکی ڕزیو لە لایەکەوە دڕابوو و ڕاسکۆڵنیکۆف بێ بەفیڕۆدانی کات کەلوپەلەکانی لە کونی پشت کاغەزدیوارییەکە ئاخنین. *ئەوە تەواوە! ئیتر هیچ شتێک بە بەرچاوەوە نییە، تەنانەت کیفی پارەکەش!* دڵخۆش و قایل نیوخێز بوو و بە ماتی تەماشایەکی بندیوار و کونەکەی کرد

کە زیاتر لە جاران دەرپەڕیبوو. لەپڕ ســەراپای لەتاو ترس لەرزی لێ نیشت و هیوابڕاوانە ورتاندی: *هاوار خوایە! ئەوە چیم بەسەر هاتووە؟ لای خۆی شــوێنم بۆ کردوونەتەوە، ها؟ ئـاخر ئـاوها شــت دەشاردرێتەوە؟*

بۆ ئەم شـاردنەوەی جۆرە شـتانە بیری لە حەشـارگەیەکی شـیاو نەکردبووەوە. بە مێشــکیدا نەدەهات بێجگە لە پارە، شــتێکی دیکە لەئارادا بێت و هەر لەبەر ئەوەش پێشــوەختە ئامادەکاریی نەکردبوو. لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *ئێســتە بۆ نموونە، چ هونەرێکم نواندووە کە ئاوها شـاگەشـکە بوومە؟ باشـە ئاوها شـت دەشـاردرێتەوە؟ ئیتر ئەقڵم لە کار کەوتووە!*

لەتاو شـەکەتی لەسـەر قەنەفەکە کەوت و هەر لەو سـاتەدا لەرزێکی بەرگەنەگیراوی دیکەی لێ نیشــت. ئاگایانە دەســتی ماشــنی و پاڵتۆ ئەستوور و زستانییەکەی سەردەمی خوێندکاریی کە گەرم بەڵام شڕ و لەسەر کورسییەکەی تەنیشتییەوە بوو، ڕاکێشا و خۆی پێ داپۆشی. دەستبەجێ خەو و وڕێنە ئەویان هەڵلووشی و بێهەپوگۆ کەوت.

پێنج خولەکی پێ نەچوو لە جێگەکەی دەرپەڕی و وەک شـێت پڕی بە جلەکانیدا کرد. *ئاخر چۆن لە کاتێکدا کە مێشــتا میچم نەکردووە، ئاوها بە ئاسوودەیی بۆی خەوتووم؟ ئەرێ، ڕاستە: هێشتا ئەو شریتی ئەڵقەیەم لە بنەباڵەکەم نەکردووەتەوە! ئاخر دەکرێ وەها شـتێ لە بیر بکەی؟ وەها سـەرەداوێک!* ئەڵقەکەی لە جێوە دەرهێنا و بە پەلە کەوتە پارچەپارچەکردنی؛ پاشــان پارچەکانی ئاخنینە ژێر پشــتییەکەی و تێکەڵی مـابـاقیی جلوبەرگەکـانی کردن. *ئـاخر کێ دێ و گومـان لە پـارچەی جلە کۆنە دەکـا؟ هەر وایە! ئەرێ، ڕاســتە، ڕێـک وایە!* ڕاسکۆڵنیکۆف لەناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستا و بەردەوام ئەمانەی دووبارە دەکردنەوە؛ بە کۆســەرنجێکی ئەشـکەنجەدەرەوە هەســت و هۆشی دایە چواردەوری و دەرگە و دیوار و زەوی و دەیویست دڵنیا

بێت کە هیچ شـــتێکی لە بیر نەکردووە. ئەرخەیان بوو کە خەریکە هێزی زەینی و یـادگە و تەنـانەت توانـای زانینی دوو کەرەت دوو یەکســـانە بە چواریشـــی لەدەســـت دەدات و ئەمەش بۆ ئەو ئەشـکەنجەیەکی بەسـوێ بوو. *نەکا دەسـتی پێ کردبێت، نەکا هەر لە ئێســـتەوە خەریکم ســـزاکەی وەردەگرم؟ هەڵبەتە هەر ئەمەیە! دەی بێگومان!* دەمپاچە تـاڵکێشـــبوو و خوێناوییەکەی هەر وا بەســـەر زەوییەکەوە لەناوەراســـتی ژوورەکەدا کەوتبوو؛ بە بەرچاوی هەموو دونیـاوە! جـارێکی دیکەش، وەک ئەوەی هۆشـــی لای خۆی نەبێت، هاواری کرد: *باشە ئەوە من چ گلاراوێکمە؟*

پاشـــان بیرکردنەوەیەک هەر وەک مۆرانە کەوتە گیانی کە نەکا ســـەراپا و هەموو جلەکانی خوێناوی و پڕ لە پەڵەخوێن و ســـەرەداو بن، کەچی لە راســـتیدا خۆی نەزانێت و توانای بینینیانی نەبێت، لەبەر ئەوەی هێزی تێفکرین و توانای جیاکردنەوەی لەدەســـت داوە... زەینی کەیـل[1] بوو لە تـاریکی... لەپڕ بیری هـاتەوە کە کیفی پیرێژنەکەش خوێناوی بووبوو: *ها! کەواتە گیرفانیشم خوێناوی بووە؛ کیفەکە هێشتا خوێناوی بوو کە خستمە گیرفانمەوە!* لە چاوترووسکاندنێکدا گیرفانیی هەڵگێڕایەوە و بەڵێ! بەسەر هەوبەری گیرفانەکەوە چاوی بە پەڵەگەلی خوێن کەوت. ســەرکەوتووانە هەناســەیەکی قووڵی بە ئاســوودەییەوە هەڵکێشـا و بیری کردەوە: *باشـە، هێشـتا هەسـت و هۆشـمم لەدەسـت نەداوە و ئەوەندەش حەپۆل نیم! هێشــتا یادگەم بێکێشــەیە و مێشــکم کار دەکا، چونکە خۆم کەوتمە بیرکردنەوە لە خوێناوییبوونی گیرفانم! ئەوە لەرز و تایە کە ئەم بەڵایەی بەسـەردا هێناوم و بێهێزی کردووم؛ تەنیا چەند ســـاتێک فەرامۆشـــیی کاتی بوو و هیچی تر!* هەوبەری گیرفانی چەپیی ســەر تا ســەر دڕاند. هەر لەو ساتەدا ڕووناکی کەوتە سەر پووتی قاچی چەپی: بەسەر گۆرەوییەکەیەوە کە لە پووتەکەیەوە

---

١. کەیل: لێوانلێو؛ پڕاوپڕ؛ سەرڕێژ.

هاتبووە دەرێ، چەند پەڵەیەک بەرچاو دەکەوتن. بە شـــەق پووتەکەی داکەند: *دە فەرمووا خۆ نووکی نەفرەتیی گۆرەوییەکەشـــم خوێناوی بووە!* هەڵبەتە لەو ســـاتەدا خەمســـاردیی نواندووە و پێی خســـتووەتە حەوزچەی خوێنەکەوە... *ئێ، چی بکەم، خوایە؟ ئێســـتە چارەی ئەم گۆرەوی و گیرفان و دەمپاچەی پانتۆڵە چییە؟*

هەمووی بە دەســـتێک کۆ کردنەوە و هەر وا لە نـاوەڕاســـتی ژوورەکەدا ڕاوەستا. *بیانخەمە کوانووەکەوە؟ وەلێ یەکەمین شـوێنێک کە پێیدا بگەڕێن، کوانووەکەیە! بیانسـووتێنم؟ بە چی؟ خۆ شـقارتەشـم نییە بە ناخێری گیانم! نا، باشـــترە بچمە دەرێ لە جێیەک هەمووی* شـوێنبزر کەم. هەمدیســان لەســەر قەنەفەکە دانیشــتەوە و دووبارەی کردەوە: *ئەرێ، چارەی ئەوەیە؛ بەم جۆرە یەکســـەر هەموویم لە کۆڵ دەبێتەوە! هەر ئێســـتە بێ خاوەخاو دەیانبەم و خولەکێکیش بەفیڕۆ نادەم!*

بەڵام نەکرا. جارێکی دیکەش سەری بە پشتدا تلایە سەر پشتییەکە و بە گوررزێکی بەرگەنەگیراوی لەرزە، ڕەق هەڵهات. هەمدیسان دەستی درێژ کرد و پاڵتۆکەی ڕاکێشایەوە سەر خۆی. ماوەیەکی زۆر، تەنانەت تا چەند کاتژمێرێک، ئەم بیرە وازی لێ نەدەهێنا کە *دەبێ هەر ئێســـتە هەســتێ و ئەمانە لە جێیەک بێســەروشـوێن بکەی، درێژەی پێ مەدە؛ بڕۆ و لە کۆڵیان بکەوە. تا زوو بڕۆی درەنگە!* چەند جارێکیش هەوڵی دا لە جێگەکەی بەرز بێتەوە، وەلێ ئیدی توانـای نەبوو. تـا تونـد لە دەرگەکەیان نەدا، ڕانەچڵەکی. ناسـتاسـیا مسـتی بە دەرگەکەدا دەکوتی و دەیشاتاند:

– دە بیکەوە گەر هێشـــتا زیندووی! یانی خەوی ئەم وەیلانە هەر نەبڕایەوە؟ وازی لێ بێنی بە درێژایی ڕۆژ وەک ســـەگ بۆی دەنووێ! تەنیا ســـەگەکان ئاوها پاتاڵن! دە بیکەوە ئیتر کاکە، کاتژمێر لە دەش تێپەڕیوە!

– کێ ناڵێ چووەتە دەرێ؟

ئەمەیان دەنگی پیاوێک بوو. *ئەمۆ! دەنگی قاپچییە... باشە ئەمەیان چیی دەوێ؟* راسکۆلنیکۆف لە جێوە دەرپەڕی و دانیشت. دڵی بە چەشنێک خۆی بە سنگیدا دەکوتی کە هەستی بە ئازارەکەی دەکرد.

ناستاسیا رای پێچەوانە بوو:

– گەر چووبێتە دەرێ ئەی کێ دەرگەکەی لە ژووری کلۆم کردووە؟ ئێستە فێر بووە دەرگەکەشمان بۆ کلۆم دەکا؟ بێگومان دەترسێ بیدزن! دە بیکەوە، کەللەپووچ، یەلا هەستە!

*باشە چییان دەوێ لە گیانم؟ قاپچی لێرە چی دەکا؟ هەموو شتێ ئاشکرا بوو! دان بە خۆمدا بگرم یان دەرگەکە بکەمەوە؟ فەوتام...* راسکۆلنیکۆف بەرەو پێش داچەمی و کلۆمەکەی راکێشا. ژوورەکەی هێندە تەسک بوو کە بێ هەستانەوەش لەسەر قەنەفەکە دەیتوانی کلۆمەکە رابکێشێت.

سۆسەکەی راست بوو؛ قاپچی و ناستاسیا خاتوون.

ناستاسیا بە شێوازێکی تایبەت لێی دەڕوانی. راسکۆلنیکۆف تەماشایەکی ڕکابەرانە و گیرخواردووانەی قاپچیی کرد و ئەویش بێدەنگانە کاغەزێکی خۆڵەمێشیی دەقکراوی بەرەو لای درێژ کرد کە مۆرومۆم کرابوو و گوتی:

– بانگهێشتی بەڕێوەبەرایەتییە.

– کامە بەڕێوەبەرایەتی...

– بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس ئێتر. خۆ دیارە کامە بەڕێوەبەرایەتی.

– پۆلیس!... پۆلیس، بۆچی؟...

– من چووزانم! بانگهێشتیان کردووی، دەی باشتر وایە بڕۆی.

قاپچی بە ســەرنجەوە لێی ورد بووەوە؛ چاوێکیشــی بە ژوورەکەدا گێرا و جا وەرسوورا تا بڕوات.

ناســتاســیا کە بە درێژایی ئەو ماوەیە چاوی لە ڕاســکۆلنیکۆف لا نەکردبوو، گوتی:

– حاڵت خراپە، نا؟

قاپچیش بەر لە ڕۆیشــتن لای کردەوە و تەماشــایەکی ئەوی کرد. ناستاسیا درێژەی دایێ:

– لە دوێنێوە تای لێیە!

ڕاســکۆلنیکۆف وەڵامی نەدایەوە. نامەکە هێشــتا لە دەســتیدا بوو و نەشیدەکردەوە.

ناستاسیا کە بینیی بە چ ئەشکەنجەیەکەوە پێیەکانی لە قەنەفەکەوە شۆڕ دەکاتەوە، دڵی پێی سووتا و گوتی:

– پێویســت ناکا هەســتییەوە! تۆ خراپ نەخۆشــی و وا باشــە بەم حاڵە شـــــڕەتەوە نەچی. ئەو پەلەپەلەی پێناوێ. ئەی ئەوانە چین بە دەستتەوە؟

ڕاســکۆلنیکۆف تەماشـــای دەســـتەکانیی کرد: گۆرەوی و پارچەی دڕاوی هەوبەری گیرفانی و دەمپاچەی پانتۆڵەکانی لە دەستە ڕاستیدا بوون. یانی بە درێژایی ئەو ماوەیە هەر بەمانەوە خەوتووە! پاشان کە بیری لێ دەکردەوە، هــاتەوە یــادی کە لە گەرمەی ئەو لەرزوتـایەدا نیوەبێدار هەســـــتاوەتەوە و توند پارچەکانی لە مشـــتی نـاون و هەمدیسان خەوتووەتەوە.

– تۆخوا ســـەیر کە چ شـــەخەڵێک کۆ دەکاتەوە و لە باوەشـــیدا پێیانەوە دەنووێ! هەر دەڵێی گەنجینەی دۆزیوەتەوە...

ناستاسیا ئەمەی گوت و کەوتە پێکەنینە هیستریەکەی[1] خۆی.

ڕاسکۆڵنیکۆف دەمودەست هەموو شتێکی ئاخنییە ژێر پاڵتۆکەی و چاوی لە ناستاسیا بڕی. لەو ساتەدا مێشکی کاری نەدەکرد و نەیدەتوانی ژیرانە بیر بکاتەوە، تەنیا هەستی دەکرد بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ کەسێکدا ناکەن کە بیانەوێ دەستگیری بکەن.

– وەلێ... پۆلیس؟

– خراپ نییە چایەک بخۆیەوە ها! باشە؟ ئامادەیە.

ڕاسکۆڵنیکۆف لە کاتی هەستانەوەدا لەژێر لێوەوە گوتی:

– نا... وا دەڕۆم. هەر ئێستە بەڕێ دەکەوم.

– بەم حاڵە شڕەوە تا سەر پلیکانەکانیش بڕ ناکەی!

– دەڕۆم...

– کەیفی خۆتە!

ناستاسیاش بەدوای قاپچیدا ژوورەکەی جێ هێشت. ڕاسکۆڵنیکۆف کاتی بەفیڕۆ نەدا و دەمودەست فڕکەی کردە لای پەنجەرەکە تا لە بەر ڕۆشناییدا پارچەکان بپشکنێت. چەند پەڵەیەک هەن، بەس ئەوەندەش *زەق نین؛ قوڕ و پیسایی زۆریشی پێوە ماڵراوە و کەم تا زۆر کاڵ بووەتەوە. کەسێ کە گومانی نەکردبێ، ڕێی تێناچێ وا بزانێ خوێنە.*

---

١. پێکەنینی هیستریایی: بە جۆرێک لە نەخۆشی دادەنرێت کە تاکی تووشبوو بەو نەخۆشییە، بە شێوەیەکی خۆنەخوازانە و نائەنقەست بەرز پێدەکەنێت. پێکەنینی هیستریایی بە جۆرە دەربڕینێکیش دێتە ئەژمار کە دەکرێت لە دەقە جیاوازەکاندا بەرچاومان بکەوێت. لە دۆخگەلی جیاوازدا تاکەکان بێ ئەوەی نەخۆشیشیان هەبێت بە جۆرێکی هیستریایی پێدەکەنن. بۆ نموونە دوای خەڵەتاندنی ئەوانی دیکە پێکەنینی هیستریایی دەیانگرێت یان تەنانەت لە کاتی درۆکردن و بگرە پاش تۆڵەکردنەوەش. «و. ک»

*سوپاس بۆ خوا کە ناستاسیاش لەو مەودایەوە نەیدەتوانی هەستی پێ بکا!* پاشـــان بە لەرزەوە نامەی بانگهێشـــتەکەی هەڵپچڕی و دەســـتی کردە خوێنـدنەوەی؛ مـاوەیەک هەر خوێنـدییەوە و خوێنـدییەوە تـا دواجار لە مەبەســـتەکە تێگەیشـــت. تەنیا بانگهێشـــتێکی ئاســـایی بوو لەلایەن پۆلیســـــی ناوچەکەیانەوە، تا هەمان ڕۆژ کاتژمێر نۆونیو لە نووسینگەی سەرۆکلێکۆڵەری ناوچەکەدا ئامادە بێت.

بە وڕییەکی ئەشکجەدەرەوە پێچی دەدایە خۆی: *باشـە ئێسـتە کەی کاتی بانگهێشــت و ئەم جۆرە قســانە بوو؟ خۆ من تا ئێســتە دووپێم نەچووەتە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیســــەوە! ئەی بۆچی ڕێک ئەمڕۆ؟ ئای خوایە، هەر زوو بیرپێەوە و نەجات!* هێندەی نەمابوو بکەوێتە ســـەر چۆک و دوعا بکات، کەچی کتوپڕ دایە قاقای پێکەنین، پێکەنین بەوە نا کە بیری بۆ دوعاکردن چووە، بەڵکوو بە خۆی پێدەکەنی. لە بارێکدا کە بە هەڵپەهەڵپ جلی دەپۆشی، دیسان دەستی پێ کردەوە: *قیروسیا گەر پێوەش بم، ئەسلەن ئەوە کەی گرنگە!* کتوپڕ ڕاڕا بوو: *باشـە ئەم گۆرەوییە لە پێ بکەم یان نا؟ لە پێی بکەم پیســتریش دەبێ و هەرچی ســەرەداو و پەڵە هەیە دەسـڕێتەوە.* وەلێ هێشـتا گۆرەوییەکەی لە پێ نەکردبوو کە بە ترس و قەڵسییەوە دایکەند. وەلێ دواتر بیری هاتەوە کە گۆرەوییەکی دیکەی نییە. هەمدیســان هەڵیگرت و لە پێی کردەوە و پێکەنین گرتی. *هەموو شـتێک ڕێژەییە و تەنیا لەســەر ئەوە وەسـتاوە کە چۆن لێی بڕوانی.* لە بارێکدا کە ســـەرتاپای دەلەرزی کتوپڕ بیرێک وەک برووسکە بە سـەریدا هات کە هەڵبەتە پزیسـکێک بوو و ڕەگێکی قووڵی نەبوو: *دە فەرموو، لە پێم کرد! تەواو بوو ئێتر، لە پێم کرد!* وەلێ دەمودەســــــت دوای پێکەنینەکە، بێهیوایی یەخەی گرت و لەبەرخۆوە بیری کردەوە: *نـا، ئێتر بەرگە نـاگرم، نـاتوانم...* پێیەکانی کەوتبوونە لەرزین. ورتاندی: *دەبێ لە ترســــان بێ.* لەتاو تا ســــەری گێجی دەخوارد و ژانی دەکرد. کاتی داگەڕان بە پلیکانەکاندا هەر وا

لەگەڵ خۆیدا کێشمەکێشی بوو: *وایە دەی، فێڵەکەیان ئەمەیە! تەڵەیان بۆ ناومەتەوە، دەیانەوێ لەوێ پێوەم بکەن و سەرم لێ بشێوێنن! لە هەمووشی خراپتر ئەوەیە کە خۆشم سەرم شێواوە... نەکا قسەیەکی گەمژانەم لە دەم دەرچێ!...*

لە پلیکانەڕێکەدا بیری هاتەوە کە هەموو شتێکی هەر وا لە کونی پشت کاغەزدیوارییەکە ناوە: *ئەگەریشی زۆرە کاتێ من لەوێ نیم بەتایبەت بچنە ژووری و بیپشکنن.* کە ئەم بیرەی کەوتە سەر، لە جێوە وشک بوو. وەلێ بە چەشنێک دەستی لە خۆی شۆردبووەوە و، گەر بکرێت بەم جۆرە ڕوونی بکەینەوە، بە چەشنێک لە ئاست مەرگدا بێباک بووبوو، کە بە دەستڕاوەشاندنێکی خەمساردانە درێژەی بە ڕێگەکەی دا:

*وازی لێ بێنە، با هەر زوو ببڕێتەوە و لە کۆڵ بێتەوە!*

هەمدیسان گەرمای تاقەتپڕووکێنی شەقام؛ بە درێژایی ئەو چەند ڕۆژە تەنانەت دڵۆپە بارانێکیش نەباریبوو. دووبارە تۆزوخۆڵ و خشت و چیمەنتۆ؛ هەمتر بۆگەنی دوکان و مەیخانە؛ هەمان سەرخۆش و دەستگێڕە فینلەندییەکان و هەمان عەرەبانە نیوەشکاوەکان. هەتاو ڕاستەوخۆ بەر چاوی دەکەوت و تەماشاکردنی چواردەوری ئەشکەنجەی دەدا؛ هەستی دەکرد سەری دەسووڕێ. کەسێکی تادار کە بە قوڵەقوڵی گەرما هەنگاو بنێتە سەر شەقام، هەر وای بەسەر دێت.

کە گەیشتە پێچی شەقامەکە، بە موچڕک و هەژەکێکی[1] بەئازارەوە تەماشایەکی خوارەوەی شەقامەکە و *ئەو بینایەی* کردەوە... دەمودەستیش سەرنجیی لادا.

---

١. هەژەک: لەرە و شەکەی یەک لەدوای یەک و پەیتاپەیتا، بەتایبەت لە دەست و پێدا.

کە لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس نزیک بووەوە، بیری کردەوە: *گەر دەستگیرم بکەن، دوور نییە سووک و ئاسان هەموو شتێ بڵێم.*

بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس دووسەد سێسەد مەترێک لەپێشترەوە بوو. بەم دواییانەش گواستبوویانەوە نهۆمی چوارەمی بینایەکی تازەدروستکراو. ماوەیەکی زۆر لەوەوبەر، ڕاسکۆڵنیکۆف جارێکیان سەردانی بینا کۆنەکەی کردبوو، هەڵبەتە بۆ ماوەی چەند خولەکێک. کە لە دەرگەی سەرەکییەوە چووە ژوورێ، لە لای ڕاستییەوە چاوی بە پلیکانێک کەوت کە پیاوێکی دەفتەربەدەست لێیەوە سەر دەکەوت. *بێگومان ئەم کابرایە قاپچییەکەیەتی. کەواتە بەڕێوەبەرایەتی ئەلێرەیە.* جا بەپێی ئەم سۆسەیە ڕێگەی پلیکانەکانی گرتە بەر و سەرکەوت. نەیدەویست پرسیار لە کەس بکات.

کە گەیشتە نهۆمی چوارەم بیری کردەوە: *ئەسڵەن دەچمە ژوور، دەکەومە سەر ئەژنۆ و دان بە هەموو شتێکدا دەنێم.*

پلیکانێکی مەیلەو ستوونی بوو و تاریک و تەسک و لە هەموو لایەکییەوە ئاوێکی بۆپیس دەهات. دەرگەی موبەقی یەکەکان بە ڕووی باداکەکاندا دەکرانەوە و کەم تا زۆر بە درێژایی ڕۆژ لەسەر پشت بوو. هەر لەبەر ئەوەش هەواکەی تاسێنەر بوو. کۆمەڵێک فەرمانبەر بە دەفتەری بنباڵیانەوە دەترنجانە پلیکانەکان و سەردانیکەریش چ لە ژن و چ لە پیاو، هاتوچۆیان بوو. دەرگەی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس لەسەر گازی پشت بوو و ڕاسکۆڵنیکۆف چووە ژوورێ و هەر لەبەردەم دەرگەکەدا ڕاوەستا. چەند لادێییەک لە ژوورەوە بەدەم چاوەڕوانییەوە ڕاوەستابوون. لەوێش هەوا گەرم و تاسێنەر بوو و، سەرباری ئەوەش، بۆنی دڵتێکهەڵهێنی بۆیەی نوێ و ڕۆنی کۆنە لەو ژوورانەوەی کە تازە دیکۆریان گۆڕیبوون، بەر لووت دەکەوتن. کە هەندێک چاوەڕێ ما، بڕیاری دا بچێتە ژوورەکەی دی. ژوورەکان هەمووی بچووک و بنمیچ بەرز بوون. پشووکورتییەکی تۆقێنەر

بەرەو پێشەوە پاڵی پێوە دەنا و هیچ کەسیش حسێبی بۆ نەدەکرد. لە دووەمین ژووردا چەند سەرقەڵەمێک دانیشتبوون و دەیاننووسی، کە سەروسیمایان شتێکی وای لە هی ئەو نەگەڕابووەوە و بە گشتی کەسانێکی نائاسایی بوون. دواجار چووە لای یەکێک لە فەرمانبەرەکان.

– ئەمرێکتان هەبوو؟

ئەو نامەی بانگهێشتەی دایێ کە پێی گەیشتبوو.

فەرمانبەرەکە تەماشایەکی کاغەزەکەی کرد و پرسیی:

– ئێوە خوێندکاری زانکۆن؟

– بەڵێ، خوێندکاری زانکۆ بووم.

فەرمانبەرەکە، تەماشای ڕاسکۆڵنیکۆفی دەکرد، بەس ئەوەی ڕاستی بێت هەست و هۆشی لای ئەو نەبوو. تا بڵێیت پەرێشان بوو و لە نیگایدا هیچ جۆرە هەست و بیرێکی تایبەت نەدەخوێندرایەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف بیری کردەوە: خۆ *ئەمە شتێکی لێ دەرناهێنرێ؛ کابرا هەر بە فەرمی داخراوە.*

فەرمانبەرەکە ئاماژەی بۆ دواهەمین ژوور کرد:

– بچۆ ئەوێ بۆ لای سەردەفتەر[1].

ڕاسکۆڵنیکۆف چووە ئەو ژوورەی کە فەرمانبەرەکە گوتبووی (دەرگەی چوارەم)؛ ژوورێکی بچووک بوو و پڕ لە خەڵک کە هەڵبەتە سەروسیمایان لەوانە باشتر نەبوو کە لە دەرێ ڕاوەستابوون. کۆمەڵەکە دوو خاتوونیشیان تێدا بوو. دانەیەکیان جلێکی تازەی تا ڕادەیەک هەژارانەی لە بەردا بوو و لەپشت مێزێک و ڕووبەڕووی

١. سەردەفتەر: سەرپەرشتی نووسینگەی بەڵگەی فەرمی.

سەردەفتەر دانیشتبوو و شتێکی دەنووسی کە سەردەفتەر بۆی دەخوێندەوە. ئەوی دیکەشیان، ژنێکی کەڵەگەت و سینەپڕ بوو بە ڕووخسارێکی سوور و پەڵاوییەوە. جلەکانی ئێجگار ڕازاوە بوون و گوڵسینەیەکی بە گەورەیی یەک ژێرپیاڵە بە خۆیەوە کردبوو. لە سووچێکەوە ڕاوەستابوو و پێدەچوو چاوەڕێی شتێک بێت. ڕاسکۆڵنیکۆف نامەی بانگهێشتەکەی بۆ سەردەفتەر درێژ کرد و ئەویش چاوێکی پێدا خشاند و گوتی، *تاوێ ڕاوەستن* و درێژەی بە کاری خاتوونە تازیەدارەکە دایەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف ئاسوودەتر هەناسەی دا: *پێناچێ پەیوەندیی بەو مەسەلەیەوە هەبێ!* تا ڕادەیەک بڕوابەخۆبوونی گەڕایەوە و هەروا بەگژ خۆیدا دەچووەوە تا ئازا و هێمن بێت.

*تەنیا تۆزێک گەمژەیی و کەمتەرخەمیی ئاسایی بەسە بۆ پێوەبوونم! ئەممم!... ئاخ، ئێرە چەندە تاسینەرە!* لە درێژەدا بە خۆی گوت: *ئەم هەوایە خنکێنەرە... لە جاران خراپتر سەرم دەسووڕێ...* جا دووبارە بیری کردەوە...

دەیزانی لە ناوەوەیدا هەڵایەکی تۆقێنەر لەئارادایە. دەترسا جڵەوی لەدەست بدات و هەر لەبەر ئەوەش بوو کە هەوڵی دەدا خۆی بە شتێکەوە خەریک بکات و زەینیی لەسەر چڕ بکاتەوە، شتێک کە هیچ پەیوەندییەکی بە بابەتەکانی ئەو دواییانەوە نەبێت، وەلێ هەر نەیدەتوانی و نەیدەتوانی. بەڵام سەردەفتەر تەواو سەرنجیی ڕاکێشابوو؛ هیوادار بوو بتوانێت دزە بکاتە دەروونییەوە و لە ڕووخساریدا شتێک بخوێنێتەوە. کابرا زۆر گەنج بوو، نزیکەی بیستودووساڵێک، بە ڕوویکی ئەسمەری پڕ لە گوڕوتین کە لەچاو تەمەنیدا گەورەتر دەینواند. بەپێی مۆدێلی ڕۆژ جلی پۆشیبوو و تا ڕادەیەکیش دڵتەڕ؛ قژی چاک شانەکراویی لە تەپڵە سەرییەوە کردبووە دوو بەش و ڕۆنی لێ دابوون. چەند ئەنگوستیلەیەک لە پەنجە

پاکوخاوێنەکانیدا بوون و زنجیرێکی ئاڵتوونیش بە هێلەکەکەیەوە. ڕوو لە کەسێکی بیانیی ناو ژوورەکە بە فەڕەنسی چەند وشەیەکی فڕێدان کە هەڵەوپەڵەیەکی واشی نەبوو. پاشانیش فرە خۆمانەیی ڕوو لەو خاتوونەی کە ڕووخسارێکی سووورڕەنگی هەبوو و جلێکی کەشخەی پۆشیبوو و وێڕای ئەوەی کورسییەکی چۆڵ لەتەنیشتییەوە بوو و ئەو هەر وا بە پێوە بوو، گوتی:

– *لویزا ئیڤانۆڤنا*، لانیکەم فەرموون دانیشن.

– Ich danke.[1]

خاتوون ئەمەی گوت و فرە نەرم، بە خشەخشی ئاوریشمیی جلەکەیەوە لەسەر کورسییەکە دانیشت. جلە شینە کاڵەکەی بە داوێنی تۆڕیی سپیی وەک باڵۆنەوە دەوری کورسییەکەی گرت و کەم تا زۆر نیوەی ژوورەکەی داگیر کرد. ژوورەکە بە بۆنی ئەو کەیل بوو. خۆیشی لەوە تەریق دەبووەوە کە نیوەی ژوورەکەی داگرتووە و بەو جۆرەش بۆنی خۆشی لێ دێت و، وێڕای ئەوەی بزەیەکی بەئازار و مەراییکارانەی لەسەر لێو بوو، بە ڕوونی دیار بوو کە نیگەرانە.

خاتوونی تازیەدار دواجار کارەکەی تەواو کرد و هەستایەوە. هەمان کات، کتوپڕ بە دەنگوهەراوە، ئەفسەرێکی کەیفساز ترپەترپ هاتە ژوور و لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا کە دەینا، بە شێوەیەکی تایبەتیش شانەکانیی دەجوولاندنەوە. کڵاوە ڕەسمییەکەی خستە سەر مێز و لەسەر یەکێک لە ئەسکەملەکان دانیشت. خاتوونی بەباقوبریقی ئێمە هەر کە ئەوی بینی ڕاچەنی و شاگەشکانە دەستی کردە کڕنۆشبردن، وەلێ ئەفسەرەکە هەر حسێبیشی بۆ نەکرد و خاتوونیش نەیوێرا لەبەردەم ئەودا دیسان دابنیشێتەوە. ئەفسەری تازەهاتوو، یاریدەدەری لێکۆڵەری ناوچەکە بوو. سمێڵە خەنەییەکەی لە هەردوو لای

---

1. سوپاسگوزارم (ئەڵمانی).

ڕووخسارییەوە، بە ئاسۆیی هاتبووە دەرێ. ئەندامە بێڕادە وردەکانی ڕووخساریشی جگە لە ڕووقاییمی هیچ هەستێکی دیکەیان لێوە هەڵنەدەکرێندرا. ئەفسەر بە لاچاو و تا ڕادەیەک بێزارییەوە لە ڕاسکۆڵنیکۆف ڕاما؛ سەروسەکوتی گەنجەکەی ئێمە تا بڵێیت جێگەی داخ بوو، بەس سەرباری ئەو دۆخە شڕە، شێوازی بەرکەوتنی بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ڕووخسار و جلوبەرگیدا یەکی نەدەگرتەوە. ڕاسکۆڵنیکۆفیش لە کەمتەرخەمیان نیگایەکی هێندە ڕاستەوخۆ و درێژخایەنی گرتە ئەفسەرەکە، کە ئەو هەستی کرد دەستئەنقەست سووکایەتیی پێ دەکات.

– کارت چییە؟

ئەفسەر ئەمەی بە هاوارەوە گوت و پێدەچوو لەوە حەپەسابێت کە چۆن ئەم مرۆڤە پەڕپووتە لەتاو سامی نیگای ئەو ڕانەچەنیوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف کەوتە تەتەڵەکردن:

– بانگ کراوم... ئەم نامەیە...

سەردەفتەر وازی لە کاغەکانی هێنا و گورج خۆی هەڵقورتاند:

– بۆ وەرگرتنی فلانە بڕی قەرزی خوێندکار... فەرموون قوربان، خۆتان بیخوێننەوە!

جا بەڵگەنامەیەکی بەرەو لای ڕاسکۆڵنیکۆف فڕێ دا.

ڕاسکۆڵنیکۆف لەبەرخۆوە بیری کردەوە: *قەرز؟ قەرزی چی؟ وەلێ... کەواتە... مەسەلەکە ئەوە نییە!* خەریک بوو لە خۆشیان هەڵدەلەرزی. کتوپڕ هەستی ئاسوودەییەکی بێوێنە و لەوەسفبەدەر گیانیی تەنییەوە؛ بارێک بە کۆڵییەوە داگیرابوو.

ئەفسەر کە بە هۆکارێکی نادیار هەر وا زیاد و زیادتر قەڵس دەبوو، هاواری کرد:

– دەی، بفەرموون کە جەنابی پایەبەرزتان بڕیار بووە کاتژمێر چەند تەشریف بێنن؟ بۆ کاتژمێر نۆ بانگکراون... ئێستە وا نیوەڕۆیە!

ڕاسکۆڵنیکۆف بە دەنگی بەرز لەلای شانییەوە وەڵامی دایەوە:

– هەر چارەکێکە بانگهێشتنامەکەم پێ گەیشتووە.

ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ تووڕە بوو –کە بەلای خۆیشییەوە سەیر بوو– و چێژی لە تووڕەبوونەکەشی وەرگرت.

– هەر ئەوەی کە بەم نەخۆشـی و تایەوە هاتوومە ئێرە، بۆ خۆی زۆرە!

– باشە وا مەقیڕێنن، کاکە!

– من وا زۆر بە هێمنی قسـە دەکەم. ئەوە ئێوەن کە بەسەرمدا دەقیڕێنن. من خوێندکارێکم و ڕێ نادەم هیچ کەسێ هاوارم بەسەردا بکا.

ئەفسەر بە چەشنێک خۆی دەخواردەوە کە یەک خولەکی تەواو تەنیا توانیی منگەمنگ و پەرت قسەگەلێک فڕێ بدات و پاشان لە جێگەکە ڕاست بووەوە.

– ئا بێدەنگ بن! ئێوە لە بەڕێوەبەرایەتییەکی میریدان! بێشەرمی نەنوێنن، بەڕێز!

ڕاسکۆڵنیکۆف هاواری کرد:

– بۆ ئێستە ئێوە خۆتان لە بەڕێوەبەرایەتیی میریدا هاوارتان نەکرد! ئەوە هیچ کە هاتوهاوار دەکەن، جا جگەرەیەکیشتان بە دەستەوە گرتووە و بێڕێزی بە هەمووان دەکەن.

کە ئەمەی گوت هەستی بە قایلبوونێکی وەسفهەڵنەگر کرد.

سەردەفتەر بەدەم بزەوە سەیرێکی کرد. دیار بوو کە بە تەواوی لێی پڕە، جا دواجار هاواری کرد:

– ئەمەیان هیچ پەیوەندییەکی بە ئێوەوە نییە، بەڕێز! جاری ئێوە وەڵامی کاری خۆتان بدەنەوە. نیشانی بدەن، ئالێکساندەر گریگۆرییۆڤیچ. سکاڵایان لەسەر تۆمار کردوون. قەرزەکەتان نادەنەوە، جا لێرانەش نمایشی مرۆڤی بەڕێزمان بۆ دەکەن!

وەلێ راسکۆڵنیکۆف ئیدی گوێی نەدەگرت، توند چنگی بە کاغەزەکەدا کردبوو و هەموو بیر و هۆشی لای ئەوە بوو کە زۆر زوو بەرچاوی ڕوون ببێتەوە. جارێک خوێندییەوە و پاشانیش جارێکی دی؛ کەچی هەر تێنەگەیشت.

لە سەردەفتەری پرسی:

– ئەمە چییە؟

– بەڵێننامە بە واژۆی خۆتانەوە کە لەدەست خاوەنقەرزەکەتان بووە. یان پاکی دەکەنەوە، هەڵبەتە لەگەڵ هەموو خەرجی و تێچوو و شتەکانی تردا، یان بە نووسراو بەڵێننامەیەک لەبارەی کاتی دیاریکراوی قەرزەکەوە پڕ دەکەنەوە و لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێن دەدەن کە بەر لە دانەوەی قەرزەکە شار جێ نەهێڵن و نە ماڵومولکتان بفرۆشن، نە بشیشارنەوە. چونکە بەرانبەرەکەتان مافی ئەوەی هەیە ماڵومولکتان بفرۆشێ و بەپێی یاسا هەنگاوتان لەدژ بنێ.

– ئاخر... خۆ من قەرزاری کەس نیم!

– ئەوەیان ئیتر پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە. لێرە بەڵێننامەیەکمان لایە بە بڕی سەدوپازدە ڕۆبڵەوە کە بە ئامادەبوونی شاهێدیش پشتڕاست و واژۆ کراوە. هێناویانەتە لای ئێمە تا پارەکە وەرگرینەوە. ئێوە

خۆتـان نۆ مـانـگ لەمەوبەر، ئەم بەڵێننـامەیەتـان بۆ بێوەژنەی ڕاوێژکارێکی میری بە ناوی *زارنیتســـینا* پڕ کردووەتەوە و ئەوانیش ئەمەیـان داوەتە فەرمـانبەرێکی تر بە نـاوی بەڕێز چیبـ*ارۆف*. لەبەر ئەوەش ئێمە بانگهێشتمان کردن.

– ئاخر ئەم خاتوونە خاوەنماڵەکەی منە خۆ!

– ئێ، جا چییە؛ با خاوەنماڵتان بێ؟

ســـەردەفتەر بزەیەکی داخـدارانەی تەژی لە لووتبەرزیی کرد کە هاوکات ســـەرکەوتووانەش بوو؛ دەتگوت خەریکە بە ســـەربازێک کە یەکەمین جاریەتی ســـەرودڵی دەگرن، دەگوت: *ها، ئێستە حاڵت چۆنە؟* وەلێ ڕاسـکۆلنیکۆف کەی باکی بە بەڵێننامە و فەرمانی دانەوەی قەرز هەبوو! ئەسڵەن ئەوەی دەهێنا کە بۆشـی نیگەران بێت؟ ئەوەی دەهێنا تەنانەت بیریشـــی لێ بکاتەوە؟ ڕاوەســـتابوو، نامەکەی دەخوێندەوە، گوێی دەگرت، وەڵامی دەدایەوە و تەنـانەت خۆیشـــی پرســـیاری شـــتگەلێکی دەکرد، وەلێ ســـەرلەبەری ئەم کارانەی بەبێ ویســـت دەکردن. ڕۆحی کەیل بوو لە هەســـتی ســـەرکەوتووانەی ڕزگاری و بێوەیبوون لەو مەترســـییەی کە خەریک بوو هەڵی دەلووشـــی؛ لەو ساتەدا نە بیری لە داهاتوو دەکردەوە و نە لێکدانەوە و شیکردنەوەیەک لەئارادا بوو. هیچ هەواڵێکیش لە پێشـــگریمانە و ســـۆســـە و گومان لەئارادا نەبوو. نە گومانێکی هەبوو و نە پرســـیارێک. ســـاتێک بوو ســـەرڕێژ لە حەزێکی ســـادە و خۆڕســـک و دەگمەن. وەلێ هاوکات دەتگوت لە نووســـینگەکەدا زریانێک هەســـتاوە. ئەفســـەر یان هەمان یاریدەدەری لێکۆڵەری ناوچەکە کە هێشـــتا لەتاو بێڕێزیکردنەکەی ڕاســـکۆلنیکۆفدا پێچی دەدایە خۆی و دیار بوو گەلێکی ئارەزوو لێیە تۆڵەی شـــکۆی شـــکاوی خۆی بکاتەوە، کەوتە گیانی هەمان ئەو خاتوونە تەڕپۆش و جوانەی کە لە کاتی هاتنەژوورەوەی ئەفســـەرەوە بە بزەیەکی دەبەنگانەوە لێی ڕامابوو، جا کتوپڕ (هەر کە ئەو خاتوونە

تـازیەداره له نووســــینگه چووه دەرێ) بەوپەڕی هێزییەوە هـاواری بەسەردا کرد:

– هەی قەحپەی بێحەیا! دوێشەو هەمدیسان چی بووە لە ماڵەکەتدا، ها؟ هەمدیسان بەزم و بێحەیایی؟... مایەی شەرم و شوورەیی هەموو ئەو گەڕەکەی! هەمدیســـان ئارەقخواردنەوە و ئاژاوە. دەڵێی لەخواتە بتخەمە ژووریّ؟ دە جـار ئـاگـادارم کردیتەوە و نـاهێڵم بۆ جـاری یازدەهەم بۆی دەرچی! کەچی وا هەمدیســان ســـەروســـەکوتت لێرە دەرکەوتووەتەوە، ها؟

ڕاسکۆلنیکۆف تەنانەت کاغەزەکەی لە دەست کەوت و سەرسامانە لە خـاتوونی ســـیمـاجوانی ڕوانی کە ئـاوهـا بەو جۆرە بێڕێزانە هەڵســـوکەوتی لەگەڵدا دەکرا. وەلێ هەر زوو بە باســـەکەی زانی و تەنانەت کەیفیشی بە بابەتی ڕسواییەکە هات. بە حەزەوە گوێی دەگرت و دڵی پێوە بوو لە پێکەنین و قاقا بدات... دەمارەکانی ورووژابوون.

– ئیلیا پیترۆڤیچ!

ســەردەفتەر ئەفســەری بانگ کرد و شـێواوانە ویسـتی شـتێک بڵێت، وەلێ بەری بە زمـانی گرت، چونکە بە ئەزموون دەیزانی کە هیچ شتێک بێ لە گرتنی دەستەکانی، ئەفسەری هەڵچوو ڕاناگرێت.

خاتوونی ســیماجوان ســـەرەتا لەهەمبەر ئەم زریانەدا ســـەرتاپێ دەلەرزی؛ بەڵام ڕەنگە ئەوە بە شتێکی بڕواپێنەکراو بێتە بەرچاو کە تا قسـە و هەڕەشـەکان توندتر و زیاتر دەبوون، ڕووخسـاری ئەویش بە هەمان ڕادە نەرمونیان و دڵڕفێن دەبوو و بزەگەلی سـەرنجڕاکێشـتری پێشـکەشـی ئەو ئەفسـەرە دێوسـیفەتە دەکرد. سـرەوتی نەبوو، هەر وا دادەچەمی و بەرز دەبووەوە و پشووکورتانە چاوەڕێی دەرفەتێک بوو تا قسەکانی بکات. دواجار دەرفەتی دەست کەوت.

– بەڕێز گیان کاپتن، لە ماڵی مندا دەنگوهەرا و ئاژاوە نەبووە خۆ...

وەک ئەوەی نۆک هەڵڕێژێتە نێو دەفرێکەوە، بە هەمان شێوە تەتەتەت وشەکانی بەدوای یەکدا ڕیز دەکردن گەرچی شێوەدەربڕینێکی ئەڵمانیی خەستی بەسەردا زاڵ بوو، وەلێ بە بڕوابەخۆبوونەوە بە ڕووسی دەدوا.

– هیچ بێحەیاییەکیشم نەکردووە؛ ئەو بەڕێزانە سەرخۆش بوون کە هاتن. من ڕاستییەکەی دەڵێم، بەڕێز گیان کاپتن؛ من هیچ خەتایەکم نەبوو. من حورمەتدارم، بەڕێز گیان کاپتن، ماڵ و هەڵسوکەوتیشمان حورمەتی هەبووە، بە گیانی ئێوە؛ بەدوای ئاژاوە و بێحەیاییەوە نیم! کاتێکیش خۆیان هاتن، خراپ سەرخۆش بوون. گوتیان سێ بتڵی دیکەش بێنە و پاشانیش دانەیەکیان لاقی هەڵبڕی و بە پێ دەستی کردە پیانۆژەنین. ماڵەکەی من حورمەتی هەیە ئاخر! لێی دا و پیانۆکە ئیبادە بوو، ئاخر! زۆر ناشیرینە! منیش تەنیا پێم گوت کە زۆر ناشرینە ئاخر. پاشان بتڵێکی هەڵگرت و کەوتە گیانی هەمووی. منیش قاپچی بانگ کرد. کارڵ هات بۆ سەر. بەڕێزیشی یەخەی کارڵی گرت و کێشای بە ناوچاویا. کێشای بە ناوچاوی هانریتیشا. پێنج دانە زللەشی لە من دا ئاخر! دەی ئەم کارە زۆر ناشیرینە، ماڵەکەی من حورمەتی هەیە ئاخر! من قیژاند. بەڕێزیشیان پەنجەرەی ژوورەکەیان کردەوە و چوون لەسەر چوارچێوەکەی ڕاوەستان و وەک بەراز مرخەمرخیان کرد؛ حەیا نەمایەوە خۆ! چۆن ئاخر لە پەنجەرەوە ڕووەو شەقام وەک بەراز مرخەمرخ کرد! زۆر ناشیرینە ئاخر! کارڵ هات، کۆتەکەی گرت و ڕایکێشا لە پەنجەرەکەوە بۆ خوارێ. پاشان جلەکەی دڕا. من ڕاست گوت، بەڕێز گیان کاپتن! پاشان، بەڕێزی کردیە هەرا کە لەبەرانبەر ئەوە پازدە ڕۆبڵی دەوێ لە کارڵ. من خۆم پارە پێی دا، بەڕێز گیان کاپتن! هەمان کات من پێنج ڕۆبڵ بۆ کۆتەکەی دا! ئەم بەڕێزە، خۆی میوانێکی بێحەیایە و شوورەیی کرد هەمیشە. گوتی کارێک بکەم ببنە

گاڵتەجاڕی هەمووان. گوتی من دەدەمە ڕۆژنامەکان لەســـەر ئێوە نووسین!

– یانی کابرا نووسەریشە؟

– بەڵێ، بەڕێز گیان کاپتن! ئەم بەڕێزە، میوانێکی بێحەیا... ماڵەکەی من حورمەتی هەیە ئاخر!

– باشە ئیتر! بیبڕەوە! من خۆ پێم گوتبووی...

سەردەفتەر بە شێوازێکی مانادار دووبارەی کردەوە:

– ئیلیا پیترۆڤیچ!

ئەفسەر تەماشایەکی خێرای سەردەفتەری کرد و ئەویش لە وەڵامدا سەرێکی لەقاند.

– خانمخاس لویزا ئیڤانۆڤنای بەڕێز، کەواتە دیســـان دەیڵێمەوە و دواهەمین جارە کە ڕای دەگەیەنم...

جا درێژەی پێ دا:

– گەر تەنیا یەک جاری دی لەو ماڵە حورمەتدارەتاندا بێشەرمییەک بکرێ، خودی ئێوە دەنێرمە پشــت شــیشــی زیندان. ئەوە بەڕێزانەترین کاردانەوە دەبێ، تێگەیشتن؟ چەند خۆشە، ئەهلی قەڵەم و نووسەرێک لە مـاڵە حورمەتـدارەکەتـانـدا پێنج ڕۆبڵی لەبەرانبەر درانی کۆتەکەی وەرگرتووە، ها؟ ئەوەش نووسەر و شتی وا!

ئەفسەر سەیرێکی ڕقاوییانەی ڕاسکۆلنیکۆفی کرد.

– هەر لەم دوێنێ و پێرەیەدا، لە ڕێســـتۆرانتێکـدا فەرتەنەیەک نرابووەوە. نووسەرێک فراوێنی سندان کردبوو لەوێ، کەچی پارەکەی نەدەدا؛ دەیگوت لەجێی ئەوە *لە برگەیەکی تەنزەکەمدا ناوتان دەهێنم.* دانەیەکی تری لەم جۆرە، حەفتەی ڕابردوو ســواری کەشــتیی هەڵمی

بووه، دەمی دادڕیوە و جوێن و قسەی سووک نەماوە کە بە بنەماڵەی بەڕێزی ڕاوێژکارێکی پلەبەرزی میری و ژن و کچەکەی نەدابێ. چەند ڕۆژێک پێشتریش، هەمدیسان دانەیەکی تریشیان بە مست و شەق لە شـــیرینیفرۆشـــییەک کردبووە دەرێ. ئەم نووســـەر و ئەدەبیاتچی و خوێندکار و شـــتانە ئەئاوهان... هەی تف لە هەموویان! دەی ئیتر، فەرموو، تۆ فەرموو بڕۆ! خۆم ســـەرێکت لێ دەدەم... بەس ئیتر وریا بە! خۆ تێدەگەی؟

لویزا ئیڤانۆڤنا واقوڕماو و ڕێزدارانە ســـەری دانەواند، بە ڕاســـت و چەپدا کڕنۆشی بەخشییەوە و بەم جۆرە پشتاوپش خۆی گەیاندە لای دەرگەکە. وەلێ لەبەردەم دەرگەکەدا بەر ئەفســـــەرێکی بەژنجوان و ڕووخۆش و کراوە کەوت کە ســـــمێڵێکی جوان و پڕی هەبوو و ئەوە خودی ســـەرۆکپۆلیســـی ناوچەکە بوو؛ *نیکۆدیم فۆمیچ*. لویزا ئیڤانۆڤنا زیاتر واقی وڕما و تا زەوی نووشـــتایەوە و پاشـــان بە نازونووز و هەنگاوگەلی کورت و خێراوە، لە نووسینگەکە چووە دەرێ.

نیکۆدیم فۆمیچ ڕووەو ئیلیا پیترۆڤیچ گوتی:

—هەمدیســـان هەرا، هەمدیســـان بووەتەوە هەورەبرووســـکە و شـــریخە و تۆزوخۆڵ و زریانە! هەمدیســــان خەریکە دڵتان لە جێگەکەی دێتە دەردێ و تەواو هەڵچوون! دەنگوهەراتان تا خوار پلیکانەکان دەهات!

—دەی چی بکەین ئیتر!

ئیلیا پیترۆڤیچ، بە ئاوازێکی درێژ و بێباکییەکی فیزدارەوە ئەمەی گوت (کتومت گوتی چی بکـــ... ـــەین ... ئیـــ... تر)؛ جا چەند پەڕە کاغەزێکی هەڵگرتن و بەدەم ڕۆیشـــتن بۆ ســـەر مێزێکی دیکە، لەگەڵ نانی هەر هەنگاوێکدا شانەکانی لارەیەکی مەستانە و بەنازیان دەکرد.

– فەرموون؛ خۆتان ســـەرنجی ئەمانە بدەن، تکایە: کاکی بەڕێز، نووســـەر لێرەن، یان باشـــترە بڵێم خوێندکار، جا خوێندکاری وازهێناویش، کە قەرزی نەداوەتەوە، بەڵێننامەی واژۆ کردووە، لە کاتی خۆیدا ژوورە بەکرێکەی چۆڵ ناکا، بە ڕاست و چەپدا سکاڵای لەسەر تۆمار دەکرێ و، کەچی کاکم هەر خۆی نـاشـــکێنێتەوە و لەبەر جگەرەکێشـانێکی من لەبەردەم جەنابی پایەبەرزیاندا، سـکاڵایان هەیە! خۆشـــی ڕوو... ڕوو... دامـاڵراوێکە بۆ خۆی! فەرموون، تکـا دەکەم سـەیرێکی بکەن قوربان، مەبەسـتم ئەمەیانە... خۆیانن لە خۆشـترین بارێکدا کە ڕێی تێبچێ، قوربان!

– دەی هەژاری خۆ تـاوان نییە هـاوڕێ. وەلێ ئێمە هەمووومـان دەزانین کە تۆ زۆر پشـــووکورتی و تاقەتی قســـەکردنت نییە. دڵنیام شتێ بووە و تۆش لە بەردڵت گران بووە و قورس گرتووتە.

نیکۆدیم فۆمیچ میهرەبانانە بەرەو ڕاسکۆڵنیکۆف وەرسووڕا:

– بەس تۆش هەڵەت کردووە، برای من. ئەم هـاوڕێیەی ئێمە کەسـێکی گەورەیە؛ گومانت نەبێ. تەنیا نەگبەتییەکە ئەوەیە کە دایمەی خوا ئامادەی تەقینەوەیە... تەقینەوە! گەرم دادێ، تینی بەرز دەبێتەوە، قوڵەقوڵ دەکوڵێ و ئەوســـا ئیتر هیچ کەس ناتوانێ بەری پێ بگرێ! وەلێ لەژێر ئەم ڕوواڵەتە تووڕەیەیەوە دڵێکی زێڕینی هەیە! لە تابوورەکەماندا پێیان دەگوت *ڕاگری*[1] *هەڵەشە*.

ئیلیا پیترۆڤیچ گەرچی هێشتا مۆن و ڕووگرژ بوو، بەڵام تەواو بەم تاریفە هاوڕێیانە و باشە دڵخۆش بوو و هاواری کرد:

– چ تابوورێکمان هەبوو جا، ئای لەو تابوورە!

---

١. ڕاگر، ستوان، زابت.

ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ بە دڵیدا هات شتێکی فرە دڵخۆشکەر بە هەمووان بڵێت. بە ئاسانی سەری قسەی کردەوە و بێ پێشەکی ڕووەو نیکۆدیم فۆمیچ گوتی:

– ئێوە تاوێک خۆتان دەخەنە شوێنی من، جەنابی سەروان؟ گەر لەلایەن منەوە بێڕێزییەک ڕووی دابێ ئامادەم لەبەرانبەردا داوای لێبوردن لە هەمووان بکەم. وەلێ تەماشا کەن، من خوێندکارێکی دەستکورتم؛ نەخۆشم و لەژێر باری هەژاریدا پلیشاومەتەوە (کتومت ئەم دەربڕینەی بەکار برد). لە ئێستەشدا بە کاتی وازم لە خوێندنەکەم هێناوە، چونکە خەرجییەکەیم پێ نادرێ، وەلێ بڕیارە زۆر زوو پارەیەکم بێتە دەست... دایک و خوشکم لە پارێزگا... نیشتەجێن؛ پارەم بۆ دەنێرن و منیش حسێبەکە پاک دەکەمەوە. خاوەنماڵەکەشم ژنێکی دڵئاوایە، وەلێ هێندە لەوە تووڕە بووە کە وانە تایبەتەکانم لەدەست داون و چوار مانگی ڕەبەقیشە پارەم پێ نەداوە، تەنانەت ئیتر ئامادە نییە یەک ژەمە خۆراکیش بنێرێتە بەردەم دەرگەکەم... ئەوەی ڕاستی بێ ناشزانم مەسەلەی ئەم بەڵێننامەیەش چییە. دەیەوێ ئەم مۆڵەتنامەیە بەکار بهێنێ تا من پارەکەی بدەمەوە، بەس ئاخر، من لە کوێم بوو؟ خۆتان داوەری بکەن ئاخر!...

سەردەفتەر ئاماژەی کرد:

– وەلێ ئەم شتانە پەیوەندییان بە ئێمەوە نییە.

– بەڵێ قوربان، بەڵێ. تەواو هاوڕاتانم. بەس دەرفەت بدەن ڕوونکردنەوەیەک بدەم...

ڕاسکۆڵنیکۆف هەمدیسان لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو، جا نەک ڕوو لە سەردەفتەر. هێشتا ڕووی دەمی لە نیکۆدیم فۆمیچ بوو و ئەوپەڕی هەوڵی دەدا کە ئیلیا پێترۆڤیچیش قسەکانی بە هەند وەربگرێ، گەرچی ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی خۆی بە

کاغەزگەلێکەوە سەرقاڵ بکات و هەروا بە سووکایەتی و بێزارییەوە حسێب بۆ ئەو نەکات.

– دەرفەت بدەن پێتان ڕابگەیەنم کە من سێ ساڵێک دەبێ کرێچیی ئەم خاتوونەم و سەرەتا بڕیار بوو... یان هەر لە سەرەتاوە... باشە بۆ دانی پێدا نەنێم؟ لێتان نەشارمەوە سەرەتا بەڵێنم دا کچەکەی بخوازم. ئەمەش تەنیا لە چوارچێوەی قسەدا بوو نەک بە فەرمی! هەر بە ڕاستیش کچەم خۆش دەویست، هەرچەند نەدەکرا بڵێم عاشقی بووم. بە کورتییەکەی، گەنجی و هەرزەیی ئیتر... مەبەستم ئەوەیە کە خاوەنماڵ لەو ڕۆژانەدا پارەی چاکی بە قەرز دەدامێ و منیش... بە جۆرێک لە جۆرەکان بێسەروبەر دەژیام...

– وەڵێ نامانەوێ ئەم وردەکاری و بابەتە تایبەتیانەی ئێوە بزانین، کاکی گەورە؛ کاتمان لێ زیاد نییە تا ئاوها بەفیڕۆی بدەین!

ئەوە ئیلیا پیترۆڤیچ بوو کە ڕقئەستوورانە پەڕییە نێو قسەکانی و هەڵبەتە شێوازی دوانیشی سەرکەوتووانە بوو. بەڵام ڕاسکۆڵنیکۆف بە گوڕوتینەوە ملەجیڕەی[1]کرد، گەرچی بە یەکجاری قسەکردنی بۆ دژوار بووبوو:

– وەڵێ دەرفەت بدەن تکایە... دەرفەت بدەن. دەبێ ڕوونی بکەمەوە کە مەسەلەکە چۆن وای لێ هات. گەرچی لەلایەن خۆمەوە... تەواو هاوڕاتانم کە ئەم قسانە بەلاشن. وەڵێ پار ئەو کچە داماوە بە گرانەتا مرد، من هەر وەک جاران لەوێ مامەوە و کە خاوەنماڵ هات و لەو ئەپارتمانەی ئێستەیدا نیشتەجێ بوو، زۆر هاوڕێیانە پێی گوتم کە هیچ نەگۆڕاوە و هەر وا متمانەیەکی چاکی بە من هەبوو، تەنیا دەبوو بەڵێننامەیەکی سەدوپازدە ڕۆبڵیی بۆ پڕ بکەمەوە، کە بە حسێبی

---

١. ملەجیڕەکردن: ئینکاریکردن؛ سووربوون لەسەر کردنی کارێک یان مانەوە لەسەر قسە و بڕوایەک.

خۆیان بە گشـــتی دەیکردە کۆی ئەو قەرزەی خانمخاس کە لای من بوو. ســەرنج بدەن قوربان؛ کتومت ئەمەی گوت کە ئەگەر بەڵێننامەی بۆ پڕ بکەمەوە، چەند پارەم بویَ بە قەرز دەمداتێ و هەرگیزاوهەرگیز... قســـەی خودی خانمخاســـن ئەمانە!... بەڵێننامەکە وەلا دەنێ، تا ئەو کاتەی پارەیەکم بێتە دەست و حسێبەکە پاک بکەمەوە... وا ئێستاکەش، ڕێک لە کاتێکدا کە هیچ فێرخوازێکی تایبەتیم بۆ نەماوەتەوە و تەنانەت نانیشــم نییە بیخۆم، هەســتاوە و شــکاتی لێ کردووم! ئێســتە من چی بڵێم ئاخر!...

ئیلیا پیترۆڤیچ بێڕێزانە قسەی پێ بڕی:

– کاکی بەڕێز ئەم وردەکاریانەی بەســەرهاتە ســۆزدارییەکەی ئێوە پەیوەنــدییەکی بە ئێمەوە نییە. لێرانەدا تەنیــا دەبێ بە نووســـــراو بەڵێننامەیەک پڕ بکەنەوە. ئەوەی کە ئێوە ســەردەمێک عاشــق بوونە و چ جۆرە بەســـــەرهـاتێکی خەمنـاکتـان هەبووە، هیچ پەیوەنـدییەکی بە کارەکەی ئێمەوە نییە.

نیکۆدیم فۆمیچ ورتاندی:

– باشە کاکە، تۆش ئیتر زۆر ڕەقیت.

نیکۆدیم لەپشــت مێزەوە دانیشــت و دەســـتی کردە نووســـین و شەرمەزار دەینواند.

سەردەفتەر بە ڕاسکۆڵنیکۆفی گوت:

– بنووسن!

ڕاسکۆڵنیکۆف ڕووقاییمانە بە سەردەفتەردا هەڵشاخا:

– باشە من دەبێ چی بنووسم؟

– دەقەکەتان بۆ دەخوێنمەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف هەستی کرد سەردەفتەر دوای وتارە بەبرشتەکەی ئەو لالووت بووە و لۆمەکەرانە لێی دەڕوانی، بەڵام سەیر بوو کە کتوپڕ دەتگوت لەئاست تێگەیشتن و بۆچوونی ئەوانی دیکەدا بێباک بووبوو و ئەم گۆڕانە لەناکاوەش، لە ماوەی یەک خولەکدا ڕووی دا. گەر بە مێشکیدا بهاتبا کە بڕێک بیر لە کارەکەی بکاتەوە، بە دڵنیاییەوە خۆشی واقی لەوە وڕ دەما کە چۆن خولەکێک لەوەوبەر بەو جۆرە قسەی لەگەڵ ئەوان کردووە و هەستەکانیی بەسەردا باراندوون. باشە ئەو هەموو هەستە لە کوێوە هات؟ دڵی هێندە خاڵی بووبوو کە گەر لەو ساتەدا نەک کۆمەڵێک پۆلیس، بەڵکە گەر ئەوێ پڕ لە نزیکان و ئازیزترین کەسانیشی با، تەنانەت یەک قسەی گەرموگوڕی مرۆڤانەشی بە زماندا نەدەهات. هەستێکی ئەشکەنجەدەر و خەفەتبارانەی تەنیایی و دابڕان بەرانبەر هەموویان، لە قووڵایی ڕۆحیدا سەری هەڵدابوو. ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە دڵیدا ڕوویان دابوو، نە لەبەر ئەوە بوو کە ئیلیا پیترۆڤیچ سووکایەتیی بە هەستەکانیی کردووە و نە ئەوەش کە بەسەریدا سەر کەوتووە. ئێستە ئیدی باکی بە سووکایەتی و ئەم هەموو لووتبەرزی و بەخۆنازین و ئەفسەر و شتە و ژنانی ئەڵمانی و قەرز و بنکەی پۆلیس و شتی دیکە نەبوو! تەنانەت گەر دەستبەجێ فەرمانیان بدابا هەر بە زیندوویەتی بیسووتێنن، نقەی لێوە نەدەهات و دوور نەبوو تا سەریش گوێ لە خوێندنەوەی سزاکەی بگرێت. لە ناوەوەیدا شتێکی تەواو بێپێشینە و تازە و نەناسراو خەریکبوو ڕووی دەدا. وا نەبوو بڵێیت سەری لێ دەربهێنێ و تێی بگات، تەنیا ئێجگار ڕوون هەستی دەکرد کە ئاستەمە ئیدی بتوانێت زیاد لەمە دەستەوداوێنی مرۆڤەکان ببێت، نە بە شێوازێکی هەستیارانە، وەک ئەم هەڵچوونە هەستییەی دوایی و نە بە هیچ شێوازێکی دیکەش؛ تەنانەت گەر بەرانبەرەکانی برا و خوشکی خۆیشی بان لەبری ئەم ئەفسەرانە، هەر تکاو و داوایەک، تەنانەت لە هەلومەرجێکیشدا کە مەسەلەی مەرگ و ژیان لەئارادا با، تەواو

بێسوود دەبوو. تا ئەو ڕۆژە هەرگیز تووشی هەستێکی هێندە نامۆ و تۆقێنەر نەبووبووەوە. ئەو شتەی کە زیاد لە هەر شتێک ئازاری دەدا هەمان ئەو هەستە بوو، هەستی تێنەگەیشتن و سەرلێدەرکردنی؛ هەستێکی خۆڕسک و لەوانەیە بەئازارترین هەستێکیش بێت کە لە ژیانیدا پێی ئاشنا بووبێت.

سەردەفتەر دەستی کردە حونجەکردنی دەقی باوی بەڵێننامەکە، کە دەیگوت ئەو ناتوانێت قەرزەکەی بداتەوە و بەڵێن دەدات لە فلانە ڕێککەوتدا بیداتەوە، لە شار دەرناچێت، موڵکەکەی نافرۆشێت و هیتد.

کونجکۆلانە سەیرێکی ڕاسکۆلنیکۆفی کرد و گوتی:

– وەلێ خۆ ئێوە ناتوانن بنووسن، بە زۆریش پێنووسەکەتان گرتووە. نەخۆشن؟

– بەڵێ، سەرم دەسووڕێ. ئێوە بفەرموون، درێژەی پێ بدەن!

– تەواو بوو. تەنیا واژۆی بکەن.

سەردەفتەر کاغەکەی وەرگت و سووڕا تا بە کاری ئەوانی دیکەش ڕابگات.

ڕاسکۆلنیکۆف قەڵەمەکەی دایەوە، وەلێ لەبری ئەوەی هەستێتەوە و بڕوات، ئەنیشکی خستە سەر مێزەکە و بە هەردوو لەپی دەستی سەریی گوشی. بێ پێشەکی بە سەریدا هات کە دەستبەجێ هەستێتەوە و بچێتە لای نیکۆدیم فۆمیچ و نووک تا نووکی ڕووداوەکەی دوێنێی بۆ بگێڕێتەوە، پاشان لەگەڵ خۆیدا بیباتە ژوورۆچکەکەی و ئەو شتانەی نیشان بدات کە لە کونی بێخی دیوارەکەدا شاردوونیەتەوە. وەسوەسەکە هێندە بەهێز بوو کە لە جێیەکەی پرتاوی کرد تا بیرۆکەکەی جێبەجێ بکات، وەلێ شتێک بە مێشکیدا هات: *وا باش نییە زیاتر بیری لێ بکەمەوە؟... نا، ئیتر ئەملا و ئەولای پێناوێ. وا باشترە*

*ئەو بارە بە کۆڵمەوە داگرم!* بەڵام لە شوێنی خۆیدا وشک بوو و پێی بە زەوییەوە نووسا. نیکۆدیم پیترۆڤیچ سەرگەرمی قسەکردن بوو لەگەڵ ئیلیا پیترۆڤیچدا و ئەم بەشەی گوتوبێژەکەیان بەر گوێی راسکۆڵنیکۆف کەوت:

– رێی تێناچێ؛ هەردووکیان بەر دەدەن، تۆ سەرنج بدە. بەر لە هەر شتێک بە گشتی بەسەرهاتەکە لەگەڵ یەک نایێتەوە. گەر ئەوە کاری خۆیان بووە ئەی بۆچی رۆیشتوون و قاپچییان بانگ کردووە؟ بۆ ئەوەی خۆیان پێوە بکەن؟ یان بۆ نموونە ویستبێتیان ئەوانی تر بە لاڕێدا بەرن؟ نا دەی، ئەمە زۆر گاڵتەجارانەیە! لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو خوێندکارە، *پیستریاکۆف*، هەم قاپچییەکان و هەم ئەو ژنەی کە ویستوویەتی بچێتە ژوورێ، لەبەردەم دەرگەی سەرەکیدا بینیویانە. پیستریاکۆف لەگەڵ سێ هاورێیدا بەدەم پیاسەوە هاتووە، کە ئەوانیش لەبەردەم دەرگەی سەرەکیدا لێی جیا دەبنەوە. ئەویش تەنیا بە ئامادەبوونی هاورێکانی پرسیاری رێگەی لە قاپچییەکان کردووە. باشە گەر وەها نەخشە و بەرنامەیەکی هەبوبێت، راستەوخۆ دەچوو پرسیار لە قاپچییەکان بکا؟ کوخیش نیو کاتژمێرێک لە خوارەوە لە دوکانی زیوکاریدا بووە و پاشانیش چووەتە سەرێ بۆ ئەپارتمانی پیرێژنەکە. رێک چارەکی ویستووە بۆ هەشت کە چووە. ئێستە ئیتر خۆت لێکی بدەرەوە...

– ببوورن ها، وەلێ چ پاساوێک بۆ ئەم گومانە هەیە کە خۆیان وا دەڵێن سەرەتا لە دەرگەیان داوە کڵۆم بووە؛ کەچی بۆ سێ خولەک دواتر کە دەڕۆنە سەرێ، سەیر دەکەن دەرگەکە کراوەیە!

– دەی وایە ئیتر، کاکە گیان! بێگومان بکوژ لە ژوورێ بووە و دەرگەکەی بەسەر خۆیدا کڵۆم کردووە. دڵنیا بە دەیانگرت گەر ئەو کوخە گەمژەیە لە شوێنی خۆی بماباوە و بەدوای قاپچیدا نەچووبا خوارێ. بێگومان بکوژ ئەم دەرفەتەی قۆستووەتەوە و بێ ئەوەی هیچ

کەسێک ببینن، بۆی دەرچووە. کوخ پەیتاپەیتا خاچ دەکێشێ و دەڵێ *گەر لەوێ بمابامەوە، هەڵمەتی دەهێنایە دەرێ و تەواوی دەکردم!* هەر ئەوەندەی ماوە ڕێوڕەسمی سوپاسگوزاریی بۆ بگێڕێ بوودەڵەی وا، هاهاهاها!

– هیچ کەسێکیش بکوژی نەدیوە؟

سەردەفتەر کە لە شوێنی خۆیەوە گوێی دەگرت، گوتی:

– جێی سەرسوورمان نییە گەر هیچ کەسێکیش نەیدیبێ. کاکە بینا بینا نییە، کەشتیی نووحە.

نیکۆدیم فۆمیچ بە گوڕوتینەوە دووبارەی کردەوە:

– ڕۆشنە؛ هەموو شتێ وەک ڕۆژ ڕۆشنە!

ئیلیا پیترۆڤیچ لەسەر قسەی خۆی سوور بوو:

– نا دەی، کوێی ڕۆشنە؟

ڕاسکۆڵنیکۆف کڵاوەکەی هەڵگرت و بەرەو لای دەرگە چوو، وەلێ نەگەیشتە ئاستانەکەشی...

کە هاتەوە هۆش خۆی، تەماشای کرد بەسەر کورسییەوە دانیشتووە و کەسێک لەلای ڕاستەوە چاودێریی دەکات و کەسێکی دیکەش لەلای چەپییەوە ڕاوەستاوە کە پەرداخێکی زەردی پڕ لە ئاوێکی زەردڕەنگی بە دەستەوەیە. نیکۆدیم فۆمیچ لەبەرانبەریدا ڕاوەستابوو و خەمخۆرانە چاوی لێ بڕیبوو. ڕاسکۆڵنیکۆف هەستایەوە.

نیکۆدیم فۆمیچ بڕێک بە ڕەقی پرسیی:

– مەسەلە چییە؟ ئێوە نەخۆشن؟

سەردەفتەر هەمدیسان لەسەر جێگەکەی گیرسایەوە و دەستی کردەوە بە کارەکەی:

– کاتی پڕکردنەوەی بەڵێننامەکە بە زۆر پێنووسەکەی گرتبوو.

ئیلیا پیترۆڤیچیش لە جێگەکەیەوە هاواری لێ هەستا؛ خەریک بوو کاغەزەکانی ژێروژوور دەکردن:

– دەمێکە نەخۆشن؟

هەڵبەتە ئەو کاتەی ڕاسکۆڵنیکۆف کەوت، ئەویش هاتبووە پێشەوە تا ببینێت، وەلێ لەگەڵ هاتنەوەسەرخۆی نەخۆشەکەدا، گەڕابووەوە شوێنەکەی.

ڕاسکۆڵنیکۆف لە وەڵامدا ورتاندی:

– لە دوێنێوە.

– ئێوە دوێنێ لە ماڵ دەرچوون؟

– بەڵێ.

– بەم نەخۆشییەوە؟

– بەڵێ.

– کەی بوو؟

– دوای حەوت.

– ببوورن بۆ کوێ چوون؟

– شەقام.

– کورت و پوخت!

راسـکۆلنیکۆف، بە ڕەنگێکی سـپیی وەک گەچەوە، پەلە و پچڕپچڕ وەڵامی دایەوە، بەبێ ئەوەی چاوی ڕەش و تـاداری لە نیگـای ئیلیـا پیترۆڤیچ بدزێتەوە.

نیکۆدیم فۆمیچ ئاماژەی کرد:

– کابرا بە زۆر بە پێوە خۆی گرتووە کەچی تۆش...

ئیلیا پیترۆڤیچ بە دەنگێکی تایبەت گوتی:

– باشە.

نیکۆدیم فۆمیچ دەیویست نارەزایی زیاتر دەرببڕێت، بەڵام بینیی کە سـەردەفتەر زیت و هەتەر سـەیری دەکات و ئیدی قسـەیەکی نییە. کتوپڕ هەمووان بێدەنگ بوون. بێدەنگییەکی سەیر بوو.

ئیلیا پیترۆڤیچ کۆتایی بە کارەکەی هێنا:

– زۆر باشە، بەڕێز گیان. زیاد لەمە ڕاتان ناگرین.

راسـکۆلنیکۆف چووە دەرێ. لەدوای خۆیەوە گوتوبێژی پڕ لە جۆشوخرۆشی ئەوانی هاتە گوێ؛ دەنگی پرسیارکەری نیکۆدیم فۆمیچ لە هی هەموویان بەرزتر بوو. هەنگاوی نایە سـەر شـەقام، تەواو هاتەوە هۆش خۆی.

لە بارێکدا کە پەلەپەل دەگەڕایەوە بۆ ماڵ، لەبەرخۆیەوە دووبارەی دەکردەوە: *دێن بۆ پشـکنین، گومانی تێدا نییە. چەتەینە! هەبێ و نەبێ گومانیان لێ کردووم.* هەمدیسـان تۆقینەکەی جاران بەسـەریدا زاڵ بووەوە و سەرتاپێی تەنییەوە.

## دوو

*ئەی ئەگەر تا ئێستە دەستیان کردبێتە پشکنین؟ ئەی ئەگەر گەیشتم و تەماشام کرد وا لە ژوورەکەمدان؟*

بەڵام ئەوەش ژوورەکەی. بنیـادەمێکی لێ نەبوو و هیچ کەس تەنانەت سەرێکیشی نەکێشابووە ژوور. تەنانەت ناستاسیاش دەستی لە هیچ نەدابوو. وەلێ خوایە! چۆن ئەو هەموو شـتەی لە کونی دیوارەکەدا جێ هێشتبوو و ڕۆیشتبوو؟

پرتـاوی کردە سـووچی ژوورەکە و دەسـتی خزانـدە ژێر کاغەزدیوارییەکە؛ هەرچیی تێدا بوو دەریهێنا و لە گیرفانەکانیی ئاخنی. بە گشـتی هەشـت شـتی تێدابوو: دوو سـندووقچە کە گوارە یان وەها شتێکیان تێدا بوو کە تەنانەت تەماشاشی نەکرد تا بزانێت چین؛ چوار دانە قتوولەی چەرمیی گچکە؛ زنجیرێکیشی تێدا بوو کە ڕۆژنامەیەکیان لێوە پێچـابوو و پێـدەچوو نیشـانەیەک بێـت. هەمووی لە بەرگە جیاوازەکانی پاڵتۆ و گیرفانی ڕاسـتی پانتۆڵەکەیدا جێ کردنەوە و هەوڵی دا تا دەکرێت دایانبپۆشێت. کیفی پارەکەشی هەڵگرت. پاشان لە ژوورەکەی وەدەر کەوت و دەرگەکەشی بە کراوەیی جێ هێشت.

خێرا و لێبڕاو هەنگاوی دەنا و لەگەڵ ئەوەشـدا کە شـەکەت بوو، هێشتا هەر هەست و هۆشی لەجێی خۆیاندا بوون. دەترسا بێن بۆی. دەترسـا نیو کاتژمێرێکی دی، یان تەنانەت هەر یەک چارەکی دی، فەرمانی شـوێنکەوتنی دەر بکەن و، لە ئەنجامدا، بە هەر نرخێک بوو، دەیویست هەرچی بەڵگە و سـەرەداو هەیە بەر لە دەستبەسـەرکردنی

بیانسـڕێتەوە و لەناویان ببات. دەبوو تا ئەو کاتەی گوروتینێکی تێدایە و ئەقڵ و ژیریی لە شـــوێنیی خۆیدایە، هەموو کارەکان ڕێک بخات... بەس باشە دەشیا بۆ کوێ بچێت؟

مـاوەیەک لەوەوبەر ڕێگەکەی ڕوون بوو: *فڕێیـان دەدەیتە نـاو کەنداو*[1] *و، هەموو شتێ لە ئاودا شـوێنبزر دەکەی و تەواو و بڕایەوە!* هەر هەمـان ئەو شـــەوە پڕ لە وڕێنەیە ئەم بڕیـارەی دابوو، کە بە درێژایی چەندان و چەندان جار کەوتبووە سـەرییەوە کە هەسـتێت و بچێتە دەرێ: *هەسـتە و لە کۆڵی خۆتیان بکەوە. تا زووتر بێ درەنگە!* وەلێ دەرکەوت نەجاتبوون ئەوەندەش ئاسان نییە.

نێو کاتژمێرێک یان زیاتر بە قەراخ کەنداوی *یکاترینسـکی*دا هات و چوو و چەندان جار لەو پلیکانانە ڕاما کە تا بەردەم ئاوەکە بەرەو خوار درێژ دەبوونەوە، وەلێ ئەسڵەن پێی وا نەبوو بشێت نەخشەکەی سـەر بگرێت. یان کەڵەک[2] لەبەردەم پلیکانەکاندا دەوەسـتا و ژنان بەسـەرییەوە جلیان دەشـوشـت یان هەمیشـە بەلەمێکی لێ بەسـترابووەوە؛ لە هەموو لایەکەوە لافاوی خەڵکی هەسـتابوو. جا ئەوەش لەولا کە لە هەموو شوێنێکەوە بە بەرچاوانەوە بوو و بە باشی سـەرنجی ڕادەکێشـا؛ هەر بە ڕاسـتیش جێی گومان بوو کەسـێک بەتایبەت بچێتە خوارەوە، ڕاوەستێت و شتێک فڕێ بداتە نێو ئاوەکەوە. جا ئەی ئەگەر سندووقچەکانیش ژێر ئاو نەکەوتبان و هەر وا بەسـەر ئاوەکەوە بمابانەوە؟ هەڵبەتە هەر واش دەبوو. هەر ئێسـتەش و بەدەر لەم شـتانە، ڕێبواران کە دەگەیشتنە ئەو، پێیدا واق و وڕ دەمان و لێی

---

١. کەنداو: کەناڵ؛ دڕگە؛ ڕەهەند؛ ئاوەڕۆ؛ دڕناڵ؛ نۆکەن؛ جۆگە؛ جێگەی دەستکرد بۆ ڕۆیشتنی ئاو.

٢. کەڵەک: کەلێ؛ کەلەس؛ ئامێری پەڕینەوە لەسـەر ئاو، کە بە پێکەوەبەسـتنی چەند کۆتەرەدارێک و خێگە یان بەرمیل دروسـت دەکرێت. (لای خۆمان لە تەختە و چەند پارچە تەپەدۆرێکی گەورە دروست دەکرێت.)

ورد دەبوونەوە، وەک بڵێیت بێ لە چاودێریکردنی ئەو هیچ کارێکی دیکەیان نەبێت! بیری کردەوە: *هەر بە ڕاستت بۆ ئاوهایە؟ یان نەکا ئەوە هەر بە تەنیا لە بەرچاوی من ئاوها بێ؟*

دواجار ئەوەی بە مێشکدا هات کە لەوانەیە گەر بچێت بۆ لای ڕێژاوی نێڤا، ئەوا باشتر بێت. ئەوێ ئیدی ئاوها قەڵەباڵق نەبوو و کەمتر سەرنجی ڕادەکێشا. لە هەر ڕوویێکەوە بیرت لێ بکردباوە باشتر بوو، بەتایبەت لەبەر ئەوەی کە لەو ناوچەیەوە دوور بوو. تەنیا سەری لەوە سوڕ مابوو کە چۆنچۆنی نیو کاتژمێری تەواو دڵخورت و خەمۆک بە شوێنێکی ئاوها مەترسیداردا وێڵ بووە و پێشوەختە بیری لەمە نەکردووەتەوە. هەر بە ڕاستی چۆن تەنیا لەبەر بڕیارێک کە بەدەم خەو و وڕێنەوە داوبووی، نیو کاتژمێری تەواوی بەفیڕۆ دا؟ هەتا بڵێیت هۆشپەرت و زەینکوێر بووبوو و خۆیشی ئەمەی دەزانی. ئیدی دەبوو دەستوبردێکی لێ بکات.

شەقامی ڤازنیسێنسکیی گرت و بەرەو نێڤا کەوتە هەنگاونان، وەلێ لە نیوەی ڕێگەدا بیرێکی دیکەی بە زەیندا هات: *بۆچی نێڤا؟ باشە بۆچی ئاو؟ باش نییە دوورتر بکەومەوە؟ تا دوورگەکان بۆ نموونە؟ لەوێ هەرچی هەیە لە شوێنێکی چەپەکی ناو دارستاندا حەشاری دەدەم و لەژێر دەوەنێک شتێک... جا بۆی هەیە شوێنەکەشی دیاری بکەم، ئەوە باشتر نییە؟* گەرچی هەستی دەکرد ناتوانێت بە باشی سەنگوسووکی بکات و بڕیار بدات، وەلێ هەر بە بیرۆکەیەکی چاک دەهاتە بەرچاوی.

وەلێ وا دیار بوو ئەوێی بەنسیب نەبوو. کە لە ڤازنیسێنسکییەوە بەرەو گۆرەپان بای دایەوە، لە دەستە چەپییەوە گوزەرگەیەکی تەسکی بینی کە بەنێو دوو دیواری بێکڵاوڕۆچنەدا دەڕۆیشت و دەگەیشتە حەسارێکی داخراو. لە دەستەڕاستەوە دیوارێکی دۆغاوکراو و بێپەنجەرەی بینایەکی چوارنهۆمیی لێ بوو کە تا ئەو حەسارە درێژ

دەبووەوە و لە دەستەچەپیشەوە پەرژینێکی تەختەیی بزۆک هەبوو، کە هاوتەریبی دیوارە دۆغاوکراوەکە بیست هەنگاوێک دەڕۆیشتە ناو حەسارەکە و پاشان بەرەو لای چەپ بای دەدایەوە. حەسارێکی چۆڵ و چەپەکی پەرژیندار، بەڵام جۆرەها کەپەکی بینایی تێدا تەپە کرابوو. لەوپەڕی حەسارەکە و لەپشت پەرژینەکەوە، سووچی ژوورۆچکەیەکی لەبەرددروستکراوی کەڕووهەڵهێناوت بە بنمیچێکی نزمەوە بەرچاو دەکەوت کە پێدەچوو بەشێک بێت لە کارگەیەک؛ کارگەی عەرەبانەدروستکردن، دارتاشی یان شتێکی لەم جۆرە. بە گشتی حەسارەکە هەر لە دەرگەی سەرەکییەوە تا کۆتاکەی بە گەردی خەڵووز ڕەش داگەڕابوو. لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *دەبێ هەر لێرەدا کەلوپەلەکان بشارمەوە و زووش بۆی دەرچم.* کە بینیی هیچ کەسێک لە حەسارەکەدا نییە، لەسەرخۆ چووە ژوورێ و دەمودەست، هەر لە نزیک دەرگەی چوونەژووردا، پلوورێکی بینی کە فرە کات لە شوێنی کرێکار و عەرەبانەچی و شتی وادا دەخرێتە کار. لە سەرووی پلوورەکەوە، لەسەر پەرژینەکە بە گەچ و ڕێنووسێکی هەڵە ڕستەیەکی گاڵتەجاڕانەیان نووسیبوو: بە *دڵنیایی لێرە ڕا وەستان قە دەغەیە!* لێرانەدا هەتا بڵێیت دۆخەکە باش دیار بوو، ئاخر چوونەناو وەها حەسارێک بە هیچ شێوەیەکی گومانبزوێن نەبوو. *دەتوانم هەمووی لە سووچێک بنێم و بۆی دەرچم!*

لە بارێکدا کە وا جارێکی دی خەریکی سەیریکردنی چواردەوری بوو و دەستیشی بە گیرفانیدا کردبوو، تلەبەردێک سەرنجیی ڕاکێشا کە لەنێوان دەرگەی سەرەکیی حەسار و پلوورەکەدا پاڵی بە دیواری دەرەوەوە دابوو و کێشەکەی بیست سی کیلۆیەک دەبوو. لەپشت دیوارەکەشەوە شەقامێک هەبوو و دەیتوانی هاتوهاواری ڕێبواران ببیستێت، وەلێ هیچ کەسێک نەیدەتوانی لە دەرگەی سەرەکیی

حەســارەکەوە ئەو ببینێت، مەگەر لە شـــەقامەکەوە بهاتبا ژووری، کە هەڵبەتە ئەمەش ئەگەری کەم بوو. کەواتە دەبوو دەستوبردێک بکات.

داچەمییەوە و بە هەردووک دەست قەراخ تلەکەی گرت و بە هەموو هێزییەوە تلێکی پێ دا. قۆرتێکی بچووک لەژێر بەرەکەدا بوو و ڕاسکۆڵنیکۆف دەمودەست هەرچیی لە گیرفاندا بوو خستییە ناوییەوە. کیفی پارەکەشی خستبووە سەریان و چاڵەکە هێشتا پڕ نەبووبووەوە. لێواری بەردەکەی گرت و بە تەکانێک خستییەوە سەر باری سەرەتای، هەڵبەتە ئەم جارەیان کەمێک زیاتر لە جاران بە بەرچاوەوە بوو. ئیدی ڕاســـکۆڵنیکۆف کەمێک خۆڵی بە دەوری بەردەکەدا کرد و بە جوانی زەویی دەوری بەردەکەی پامال کرد، بە چەشـــنێک کە ئەســـڵەن هیچ دیار نەبوو.

پاشـان لە حەسـارەکە هاتە دەرێ و بەرەو گۆڕەپانەکە بای دایەوە. هەمـدیس کتوپڕ چێژێکی توند و بێئامـان و تەنـانەت بەرگەنەگیراو گیانیی تەنییەوە، هەمان ئەو هەسـتەی کە لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسدا تووشی بووبوو. *هەرچی ئاسەوار و سەرەداو هەبوو سڕیمنەوە! ئاخر کێ بە مێشـــکیدا دێ بێت و ژێر ئەم بەردە بگەڕێ؟ کێ؟ بە ئەگەرێکی زۆر لەو کاتەوەی بیناکەیان دروســـت کردووە، ئەم بەردەش لەوێ بووە و تا ساڵەها ساڵی دیکەش هەر لەوێ دەمێنێتەوە! جا گەر پێشی بزانن، ئەوســـا کێ دەیداتە پاڵ من؟ ئیتر تەواو و بڕایەوە! هیچ ســـەرەداوێ نەمایەوە!* پێکەنی. بەڵێ، ســـەردەمانێک دواتر بیری دەهاتەوە کە کەوتبووە پێکەنین، پێکەنینێکی کز و نیگەرانانە و بێدەنگ؛ بە درێژایی ئەو ماوەیەش کە خەریک بوو بە گۆڕەپانەکەدا ڕادەبرد، هەر پێدەکەنی. بەس کاتێک گەیشتە بولواری کاناگواردیا کە دوو ڕۆژ لەوەوبەر یارۆ کچە ســـەرخۆشـــەکەی لەوێ بینیبوو، پێکەنین بەســـەر لێوییەوە وشـک بوو و بیر و خەیاڵگەلی دیکەی بۆ هاتن. هەسـتی کرد چەندە ئەشـــکەنجەدەرە کە بیەوێت بەلای ئەو نیمکۆتەدا ڕابورێت،

هەمان ئەو نیمکۆتەی کە دوای ڕۆیشتنی ئەو کچە، لەسەری دانیشتبوو و فکر و خەیاڵ بردبوویەوە. دووبارەبینینەوەی پاسەوانەکەش شتێکی پەستکەر بوو؛ بیست کۆپیکیشی دابووە جەنابی بەرزوبەڕێزی، *ئەی نەفرەت لە زاتی!*

هەنگاوی دەنا و بە تووڕەیی و هۆشـپەرتییەوە لە دەوروبەریی دەڕوانی. وا دیار بوو ئیدی بیری بەدەوری خاڵێکی سەرەکیدا دەخولێتەوە. خۆی وای بیری دەکردەوە کە وەها خاڵێک هەر بە ڕاستی بوونێکی دەرەکیی هەیە و ئێستە، کتومت هەر ئێستە، بۆ دووەمین جار لە دوو مانگی ڕابردوودا ڕووبەڕووی بووەتەوە.

کتوپڕ هەڵمەتی قینێکی سڵ هەڵیکوتایە سەر ڕاسکۆلنیکۆف و لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *دەی سندان لە هەموو شتێک بدا! دەی قیروسیا کە ڕووی داوە! نەفرەت لەمانە و نەفرەت لەم ژیانە تازەیە! خوایە، هەموو شتێ چەندە دەبەنگانەیە!... تۆ تەماشا ئەمڕۆ چ درۆیەکم ڕیز کرد! چۆنچۆنیش مەراییم بۆ ئەو ئیلیا پیترۆڤیچە خوێڕییە کرد! ئەمەش گرنگ نییە! ئیتر هیچ شتێ بۆ من مانای نییە و زمانلووسی و ماستاوچییەتیش تۆزقاڵێک گرنگییان بەلامەوە نییە! خۆ دەردەکە ئەمە نییە! بۆ مەگەر کێشە ئەم شتانەن؟*

کتوپڕ لە جێی خۆیدا وشک بوو. پرسیارێکی تازە، تەواو چاوەڕواننەکراو و ئێجگار سادە توانای جووڵانی لێ سەندبوو و پیس زەینیی شێواندبوو: *گەر هەموو ئەم کارانە لەسەر بڕیاری خۆم بوونە نەک لە باری شێتیدا... هەروەها گەر هەر بە ڕاستی ئامانجێکی بەرهەست و دیارم لە کارەکەمدا هەبووە، ئەی باشە بۆچی تەنانەت سەیری ئەو کیفی پارەیەشم نەکرد و ئێستاش و ئێستاش نازانم چیم دەست کەوتووە کە لەپێناویدا ئەو هەموو نەهامەتییەم بە خۆڕایی کێشا و ئەم کارە پیس و نەگریسەم بەسەر خۆمدا هێنا؟ خۆ هەر*

*ئێستە بەتەمابووم کیف و شتەکانی تریش کە هەر نەمزانی چی بوون، بە دەستی خۆم فڕێدەمە ناو ئاو... مەسەلە چییە؟*

بەڵێ، کتومت ئەمە بوو، هەموو شتێک بەم جۆرە بوو. لە لایەکەوە، هیچ شتێک نەبوو کە پێشوەختە نەیزانیبێت و ئێستەش پرسیارێکی تازە هاتبێتە پێش، نە ئێستە و نە شەوەکەشی کە بەبێ تێفکرین و بێ دوودڵی بڕیار درا هەموو شتێک فڕێبدات، کەچی دەتگوت هاوکات بڕیارێکی دیکەش درا: ئەوەی هیچ گومانێک لەئارادا نییە، هەموو شتێک ئاساییە و هیچ ڕێگەیەکی دیکە لەگۆڕێدا نەبوو و دەشیا هەر بەم جۆرە بێت... بەڵێ، چاک هەموو شتێکی زانیبوو و تێگەیشتبوو، بێگومان تەنانەت دوێنێ، کە لەبەردەم سندووقچەی پیرێژنەکەدا کەوتبووە سەر چیچکان و خەریکی دەرهێنانی بەستەکان بوو، کارەکە ڕوون بوو... بەڵێ، مەسەلەکە هەر ئەوە بوو.

دواجار بەم ئەنجامە گەیشت: *هەمووی لەبەر ئەوەیە کە زۆر نەخۆشم. ئەم ماوەیە تووشی نارەحەتییەکی زۆر بووم و هەر خۆم خواردەوە و وا ئێستەش نازانم خەریکی چیم... دوێنێ و ڕۆژی پێشتریشی... بە درێژایی ئەم ماوەیە ئەوەندە خۆم نارەحەت کرد تا نیوەگیان بووم... چاک دەبمەوە و ئیتر خۆم نارەحەت ناکەم... بەس ئەی ئەگەر چاک نەبوومەوە؟ خوایە! ئیتر وا پەست دەبم بەدەست هەموو ئەم شتانەوە!* بێ وەستان درێژەی بە ڕێگەکەی دا. زۆری حەز لێبوو هۆشی بە شتێکی دیکەوە قاڵ بکات، وەلێ نەیدەزانی چی بکات و بە چ شتێکەوە بگرێت. هەستێکی تازە و لێڵ هەر ساتەو خەریک بوو زیاد و زیادتر بەسەریدا زاڵ دەبوو؛ قینێکی شووم و قووڵ بەرانبەر بە هەر شتێک کە لە چواردەوریدا بوو. ڕقی لە هەموو ئەوانە بوو کە لەسەر ڕێگەکەی قوت دەبوونەوە. بە ڕووخساریان، بە ڕێکردن و جووڵەی هەموویان پەست بوو. لە دۆخێکدا بوو کە ئەگەر

کەســـــێک شــــتێکی پێ بگوتبا، دوور نەبوو لا بکاتەوە و تفێک بکاتە ناوچاوانی و تێروپڕی لێ بدات...

که هەنگاوی نایە قەراخ نێڤای بچووک و نزیک پردی دوورگەی ڤاسیلی یێفسکی، کتوپڕ ڕاوەستا و بیری کردەوە: ئەی هاوار! خۆ لێرە دەژی، لەو بینایەدا! باشە ئەمە چۆن بوو؟ خۆ من وا دیسان بێ ویست هاتمەوە بۆ لای ڕازومیخین! دیسان هەمان بەزمە... زۆر سەرنجڕاکێشە بزانم مەبەســـــتێک لە هاتنەکەمدا هەبووە یان هەر وا بە هەڵکەوت لێرەوە ســـــەرم دەرهێناوە؟ واز بێنە، خۆ پێرێ بوو کە گوتم ڕۆژێ دوای ئەو مەســـــەلەیە دێم بۆ لای؛ ئێ وا ئێســـــتە هاتووم ئیتر! دەڵێی ناتوانم دوو هەنگاو سەرکەوم و سەرێکی لێ بدەم...

ڕاسکۆڵنیکۆف چووە نهۆمی پێنجەمی بینایەکە بۆ لای ڕازومیخین.

ڕازومیخین لە ماڵێ و لە ژوورۆچکەکەیدا تەواو سەرقاڵی نووسین بوو. خۆی دەرگەکەی کردەوە. چوار مانگێک دەبوو کە یەکدییان نەدیتبوو. ڕۆبێکی پواوی لە بەردا بوو و پێڵاوێکی بێ گۆرەویش لە پێیدا، ئەوە دەســـت و ڕووی نەشـــۆراو و ســـەروقژی بژاو و ڕیش و سمێڵی نەتاشراویش لەولاوە بوەستێ. لە ڕووخساریدا سەرسامی دیار بوو و هاواری کرد:

– ئەوە تۆی؟

لە ســـــەراپای هاوپۆلەکەی ورد بووەوە و پاش ئێســـــتێکی کورت، فیکەیەکی لێدا و گوتی:

– باشە ئەو دۆخە شڕە چییە؟ کاکە خۆ تۆ لە ئێمە وێرانتری!

تەماشـــــایەکی جلە پەڕپووتەکانی بەری ڕاســـــکۆڵنیکۆفی کرد و درێژەی پێ دا:

– وەرە بۆ خۆت دانیشە. دیارە کە ماندووی!

ڕاسکۆڵنیکۆف کە لەسەر قەنەفە پارچە مشەماییەکە[1] -کە ماڵی قەنەفەکەی خۆی ئاوا بێت!- دانیشـــت، جا ڕازومیخین تێگەیشـــت میوانەکەی نەخۆشە.

- ئای لەوە! خۆ هەر بە ڕاستی نەخۆشی ها! خۆت ئاگاداری؟

ویســـتی تریەی دڵی بگرێت کە ڕاســـکۆڵنیکۆف دەســـتی لادا و گوتی:

- لێگەڕێ، پێویســــــت نـاکـا. بۆیە هـاتووم بۆ لات کە... ئیتر فێرخوازی تـایبەتیم نییە و... دەمویســـــــت... بەس لێی گەڕێ، فێرخوازیشم ناوێ...

ڕازومخین کە بە سەرنجەوە لێی دەڕوانی، گوتی:

- دەزانی چییە، کاکە گیان؟ خەریکی وڕێنەکردنی.

- نا، وڕێنە نییە!

ڕاســـکۆڵنیکۆف هەســـتایەوە. کاتی ســـەرکەوتن بە پلیکانەکاندا تا نـاو ژوورەکەی ڕازومیخین، ئاگـادار نەبوو کە بڕیـارە ڕووبەڕوو دیدەنیی هاوڕێکەی بکات. ئێســـتە لە چاوتروســـکاندنێکدا دەتگوت لەوە تێگەیشتووە دواهەمین شتێک کە لەم دونیایەدا ئامادەیی بۆی هەیە، ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤەکانە. پەســـــت بوو و ئەو کاتەش کە خەریک بوو لە ئاســـــتانەی دەرگەی ژوورەکەی ڕازومیخینەوە هاتە ژوور، هێندە لە خۆی توورە بوو کە خەریکبوو دەخنکا.

کتوپڕ گوتی *ماڵئاوا* و بەرەو لای دەرگەکە چوو.

- بوەستە، ئا بوەستە بزانم، گاڵتەجاڕ!

ڕاسکۆڵنیکۆف هەمدیسان دەستیی لادا:

---

[1] مشەما: تەنراوێکە مۆم یان لاستیکی لێ درابێت تا ئاو نەدات.

– نامەویٚ.

– ئەی باشــە بۆچی هاتیتە ســەر؟ تێک چووی، ها؟ چیتە؟ گاڵتەمان پێ دەکەی؟ خۆ من ناهێڵم بەو دۆخە شڕەتەوە بڕۆی!

– کەواتە گوێ بگرە: لەبەر ئەوە هاتووم بۆ لات کە بێ لە تۆ هیچ کەســێ ناناســم کە بتوانێ... یارمەتییەکم بدا... لەبەر ئەوە هاتم کە تۆ لەوانی تر باشــتری، یانی شــتت بە مێشــکدا دەچێ و چاک دەتوانی مرۆڤ شەنوکەو بکەی... وەلێ ئێستە دەزانم کە هەر بە ڕاستی هیچم ناوێ، تێدەگەی؟ هیچم ناوێ... نە یارمەتیی هیچ کەســێکم دەوێ و نە دڵسۆزی... خۆمم و خۆم... تەنیام. دەی، بەسە ئیتر! وازم لێبێنە.

– ئاخر خولەکێ ڕاوەستە بزانم، شڕشێت! تۆ تەواو شێت بووی! بە من بێ دەڵێم بچۆ چی دەکەی بیکە. بەس ســـەیر کە، من ئیتر وانەی تایبەتی شـــک نابەم و هیچیش بۆم گرنگ نییە، وەلێ *خێرۆڤیمۆڤ* ناوێکی کتێبفرۆش هەیە سەد وانەی تایبەتیش دەهێنێ و من بە هەزار فێرخوازیش نایگۆڕمەوە! بە جۆرێ لە جۆرەکان خەریکی کاری چاپ و پەخشە و نامیلکەی زانستە سرووشتییەکان چاپ دەکا کە فرۆشیکی بەرچاویشــی هەیە! هەر ناونیشــانێک دونیایەک پارەی تێدایە. تۆ دایمە وات دەزانی من گەمژەم، وەلێ کاکی خۆم، بزانە کە لە منیش گەمژەتر هەیە! وا ئێســتە دەیەوێ پەل بۆ بابەتی پێشــکەوتووتر بهاوێ، گەرچی خۆی سەرە واوێک لە مێشکیدا نییە. خۆم دنەدەریم. ئەمەش دوو پەڕە و نیو لە دەقێکی ئەڵمــانی، کە لام وایە گەورەترین کڵاوچییەتیی سەدەیە. با کورت و پوخت بیڵێم، باسەکەی لەسەر ئەوەیە کە ئایا ژن مرۆڤە یان نا؟ جا لە کۆتاییەکەیدا ســـەرکەوتووانە دەیســـەلمێنێت کە بەڵێ، مرۆڤە![1] خێرۆڤیمۆڤ بەنیازە ئەم کارە بەبۆنەی پرســـی ژنەوە

---

١. حەز بۆ زانستە سرووشتییەکان و باس لەبارەی پرسی ژنەوە –ئازادیی ژنان، یەکسانیی ژن و پیاوان و هەلومەرجی جەستەیی ژنان– سالانی ١٨٦٠ لە ڕووسیادا

ئامادە بکات و منیش وا وەری دەگێڕم؛ ئەم دوو پەڕە و نیوە دەکەنە شەش لاپەڕە، ناونیشانێکی زلی نیولاپەڕەییشی بۆ پێکەوە دەنێین بە نیو ڕۆبڵی دەدەین. فرۆشێکی باشی هەیە! بۆ وەرگێڕانەکە هەر لاپەڕەو شەش ڕۆبڵ دەداتە من کە بە گشتی دەبێتە نزیکەی پازدە ڕۆبڵ کە پێشەکی شەشیم وەرگرتووە. کە ئەم کارە تەواو بوو، دەمانەوێ دەست بە وەرگێڕانی دەقێک لەبارەی نەهەنگەکانەوە بکەین. پاشان هەندێک لە بێزارکەرترین ڕسواییەکانی بەشی دووەمی کتێبی *دانپێدانانەکانی* ڕۆسۆمان دیاری کردووە بۆ وەرگێڕان. کەسێک بە خێرۆفیمۆفی گوتووە کە ڕۆسۆ شتێکی وەک *رادیشیفی* خۆمانە[1]. بێخەم بە منیش نامەوێ قسە لە قسەیدا بکەم؛ ملی بشکێ! دەی، ڕات چییە، دووەمین لاپەڕەی *ئایا ژن مرۆڤە*؟ تۆ وەریدەگێڕی؟ گەر ڕازیی، ئەوە دەقی ئەڵمانی و ئەوەش پێنووس و کاغەز؛ هەموو شتێکمان لە بەردەستدایە. ئەو سێ ڕۆبڵەش بگرە، چونکە لەو شەش ڕۆبڵەی کە پێشەکی وەرمگرتووە، سێ ڕۆبڵی دەبێتە بەشی تۆ. کە تەواوت کرد، سێ ڕۆبڵەکەی تریش وەردەگری. جا واش نەزانی کە من وا خەریکم خزمەتت دەکەم و لەم جۆرە قسانە. بابەتەکە تەواو پێچەوانەیە! کە هەنگاوت نایە ژووری، لەبەرخۆمەوە حسێبم کرد کە چۆن دەتوانی یارمەتیم بدەی. ئەوە من ڕێنووسەکەم گاڵتەجاڕانەیە و دوای ئەوەش هەندێک جار لە وەرگێڕانی ئەڵمانیدا گیر دەخۆم و لە کاتی ئیشکردندا،

---

پەرگیر بوو و ڕادیکاڵ و کۆنەپارێزەکان لەو بارەیەوە ڕێدۆزی جیاوازیان هەبوو. «و. ف»

١. ئاماژەیە بە *ئالێکساندر رادیشیف*، جەنگاوەر و دژی یاسای کۆیلەداری، دوورخراوەی بەناوبانگی ئەو سەردەمە و نووسەری کتێبی *گەشتێک لە پێتەربورگەوە بەرەو مۆسکۆ* کە ڕەنگە وا باشتر بێت ئەو بە ڕۆسۆی ڕووسیای ناو ببەین. نیکۆلای چیرنی سێفسکی، لە زۆربەی نووسینەکانی خۆیدا تاریفی ڕۆسۆی دەدا و وەرگێڕانی *دانپێدانانەکانی* ئەو لە ڕووسیادا، ساڵی ١٨٦٥ چاپ کرا. «و. ف»

سـەرپێیی شـت پێکەوە دەنێم و دەنووسـم و تاکە مایەی دڵخۆشـیم ئەوەیە کە بە گشتی بەرئەنجامەکەی باش دەبێ. گەرچی کێ چووزانێ، لەوانەشە خراپتر ببێ... دەی، ئێستە وەری دەگێڕی یان نا؟

ڕاسـکۆڵنیکۆف بێدەنگانە دەقەکەی وەرگرت، سـێ ڕۆبڵەکەشـی وەرگرت و تەنانەت بەبێ تاقە وشەیەکیش چووە دەرێ. ڕازومیخینیش حەپەساوانە بەدوایدا ڕامابوو. وەلێ ڕاسکۆڵنیکۆف کە گەیشتە نهۆمی یەکەم، وەرسـووڕا، پلیکانەڕێکەی گرتە بەر و هەمدیسـان چووەوە سەرێ بۆ لای ڕازومیخین و دەقە ئەڵمانی و سێ ڕۆبڵەکەی خستەوە سـەر مێزەکە. پاشـان بێ ئەوەی تەنانەت یەک وشـەش بڵێت، دووبارە ئەوێی جێ هێشتەوە.

ڕازومیخین دواجار بۆی بەدەمدا هات و هاواری کرد:

– ئەوە شـێت بووی؟ ئەرێ ئەوە تۆ چ گلاراوێکتە؟ بەتەمای چ ناماقوڵییەکی؟ منیش شـێت دەکەی ئاخر! خوا بە نەفرەتت کا، باشـە بۆچی هاتی بۆ لای من؟

– وەرگێڕان... وازی لێبێنە.

ڕازومیخین لە سەرێڕا قیراندی:

– ئەی چ قوررزەڵقورتێکت دەوێ؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بێدەنگ بە پلیکانەکاند چووە خوارێ.

– هۆۆۆۆو، لەگەڵ تۆمە! ئێستەماڵت لە کوێیە؟

هیچ وەڵامێک نەبوو.

– دەی دۆزەخ جێگەت بێ!

بەڵام ڕاسـکۆڵنیکۆف ئیدی هەنگاوی نابووە سـەر شـەقام. لەسـەر پردی نیکۆلاییفسکی هەمدیسان پێشهاتێکی ناخۆش هەست و هۆشی

هێنایەوە سـەر خۆی. گالیسـکەلێخوڕێک بە قامچییەکەی بێبەزەییانە کزەی لە پشتی هەستاند. هەڵبەتە گالیسکەلێخوڕ پێشـەکی دووسێ جارێک هاواری لێ کردبوو، ئاخر هێندەی نەمابوو بکەوێتە ژێر سمی ئەسـپەکانی گالیسـکەکەوە. گورزی قامچییەکە بە چەشـنێک ڕاسکۆڵنیکۆفی پەست کرد کە بە ڕقەوە خۆی گەیاندە قەدپاڵی پردەکە (ئەسـڵەن دیاریش نەبوو کە بۆچی ڕێک بە ناوەڕاسـتی پردەکە و شوێنی ئامۆشۆی گالیسکەکاندا ڕێی دەکرد، جا بەتایبەت لەو قەڵەبالقی و کەس‌بەکەسییەشدا). بەدەم تووڕەییەوە ددان و شەویلگەکانیی پێک گوشین. دەنگی پێکەنینی خەڵکیشی دەبیست کە دەیانگوت:

– هەقی بوو!

– کابرا هەر دەڵێی گیرفانبڕەکانە!

– خۆی کردووە بە سـەرخۆش و دەسـتەنقەسـت دەیەوێ خۆی بخاتە ژێر تایەی گالیسـکەوە... جا ئەوسـا وەرە و ئەو کێشـەیە چارە کە.

– ئەمەش بووەتە کاسـبیی کەسـانێ؛ جا ئەوسـا وەرە وەڵامیان بدەرەوە!

وەلێ لە هەمان ئەو کاتەی کە خۆی بەسەر قەدپاڵی پردەکەدا دابوو و دەسـتی بە پشـتیدا دەهێنا هەر وا وڕ و تووڕە لە گالیسـکەکەی دەڕوانی کە وا خەریک بوو دوور دەکەوتەوە، هەسـتی کرد کەسـێک پارەیەکی نایە مشتی. نیگای گواسـتەوە؛ پیرەژنێک بوو کە دەسـرێکی لە سـەرییەوە پێچابوو و پێڵاوێکی پێسـتبزنیی لە پێدا بوو، لەگەڵ کچێکی گەنجدا کە پێدەچوو منداڵی بێت، ئەویش کڵاوبەسـەر چەترێکی سەوزی بە دەستەوە گرتبوو.

– بیگرە، کوڕەکەم؛ بۆ خاتری مەسیح بیگرە!

ڕاسـکۆڵنیکۆف پارەکەی وەرگرت و دایک و کچە دریژەیان بە ڕێگەکەیان دا. سکەیەکی بیست کۆپیکی بوو. هیچ دوور نەبوو لەبەر ئەو حاڵ و دۆخەی کە ئەوی تێدا بوو، بە سـواڵکەرێکی تێبگەن کە وا خەریکە بە کۆلان و شەقامەکاندا خەریکی دەستپانکردنەوەیە. بێگومان ئەو بیست کۆپیکە لە سایەی سەری ئەو گالیسکەلێخوڕەوە بوو کە وای کرد دڵی ئەو ژنانەی بۆ ببێتە ئاو.

ئەو مشتەی قووچاند کە بیست کۆپیکەکەی تێدا بوو و دە هەنگاوێکی نا، ڕووی کردە نێڤا و لە کۆشکی ڕوانی. ئاسمان سایەقەی ساماڵ بوو و ئاوەکەش کەم تا زۆر شینێکی بریقەدار دەچووەوە کە لە نێڤادا بە دەگمەن ئەوە دەهاتە پێش. گومەزی کڵێسای گشتی کە لەسەر پردەکە و لە دووریی بیست هەنگاوێک لە پەرستگەکەوە بە جوانترین شێوە دەبینرێت[1]، لە بەر ڕۆشنایی خۆردا دەدرەوشایەوە و لەو هەوا سافەدا، دەکرا یەک بە یەکی تیفتیفەکانی بە ڕوونی ببینێت. کزەی قامچییەکە سـرەوت و ڕاسـکۆڵنیکۆف فەرامۆشی کرد و ئێستە وا بیرێکی نارەحەتکەر زەینیی قاڵ کردبوو کە سەر و بنیشی ئەوەندە ڕوون نەبوو. ڕاوەستابوو و جووڵەی نەدەکرد. تا ماوەیەکی زۆر لە ئاسۆ ڕاما. زۆر چاک شـارەزای ئەو ناوە بوو. کە دەچوو بۆ زانکۆ، هەمیشـە لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە سەدان جار بەبێ جووڵە لەوێدا ڕادەوەستا و لاڵ و کەڕ[2] بەو دیمەنە بێوێنەیەدا واقووڕ دەبوو و نزیکەی هەموو جارێکیش بەدیار ئەو هەستە ناڕوون و تەلیسـماوییەوە دۆش دادەما کە ئەو دیمەنە

---

١. ئاماژەیە بە کۆشکی زستانەیی و کڵێسای گشتیی ئیساکی پیرۆز و پەرستگەی نیکۆلایی پەرجووکەر، کە پەرستگەکە لە ساڵی ١٩٣٠دا کاول بوو. «و. ف»

٢. ئاماژەیە بە ئینجیلی مەرقۆس، برگەی ٩، ئایەتی ١٧ تا ١٥. *باوکێک کوڕەکەی خۆی کە ڕۆحێکی لاڵی هەبوو، دەهێنێتە لای عیسا. جا عیسا نەعرەتەی بەسەر ڕۆحەکەدا کرد و پێی فەرموو: ئەی ڕۆحی کەڕ و لاڵ، من فەرمانت پێ دەکەم ئەو جێ بهێڵێت و لەمەودواش مەچۆرەوە ناوی.* «و. ف»

دەیخستە سەری. سەرمایەکی سامناک بەر گیانی دەکەوت؛ ئەو دیمەنە شکۆدارە لەو ساتەدا بۆ ئەو خاڵی و بێگیان بوو. هەر جارێکیش کە لە تێگەیشتنی خەمناک و ورکەری خۆی بۆ ئەو دیمەنە سەری دەسوڕما و لەبەر ئەوەی متمانەی بە خۆی نەبوو، دۆزینەوەی هۆکارەکەی دوا دەخســــت. ئەو دڕدۆنگی و کێشــــە ئازاردەر و دێرینانەی بە ڕوونی دەهاتنە بەرچاو و وای بۆ چوو کە ئەســــڵەن بە هەڵکەوت نەبوو کە ئێستە خەریک بوو بیری لێ دەکردنەوە. هەنووکە هەتا بڵێیت سەیر و نائاســــایی بوو کە ڕێک هەر وەک جاران لە هەمان خاڵدا ڕاوەســــتێت، دەتگوت هەر بە ڕاســــتی لای وایە ئێســــتە کە لە هەمان شــــوێندایە، هەمان ئەو بیر و خەیاڵانەی جاران دایدەگرنەوە و لە هەمان ئەو بابەت و دیمەنگەلانە ڕادەمێنێتەوە کە جاران لێیان ڕامابوو... ماوەیەکی وا بەسەر ئەو ڕۆژانەدا تێنەپەڕیبوو. تەنانەت تا ئاستێکیش پێکەنین گرتی و هاوکات دڵی گوشرا. ئێستە ئیدی دەتگوت هەموو شتێک دوور و لە قووڵاییەکی ئەو خوارە و لەژێر هەنگــاوەکــانییەوە بە دژواری دەردەکەوت؛ ڕابردوو، بیروبۆچوونەکــانی ڕابردووی، کەڵکەڵەکــانی جاران و بیرۆکەکانی، بڕواکان و ئەو دیمەنە و خۆی و هەرهەمووی... هەســــتی دەکرد وا خەریکە دەفڕێت و بەرز بەرز دەبێتەوە و هەموو شــــتێک لە بەرچاویدا دەســــڕێتەوە. نائاگایانە دەســــتیی جوڵاندەوە و کتوپڕ ســــەرنجی چووە ســــەر ســــکەیەک کە لە مشــــتیدا بوو. مشــــتیی کردەوە، لە ســــکەکە ڕاما و بە تەکانێکی توندی دەســــت تووڕی دایە ئاوەکەوە و پاشــــانیش وەرســــووڕا و گەڕایەوە ماڵێ. وای دەهاتە بەرچاو کە لەو ســــاتەدا بە مقەســــتێک ڕایەڵی پەیوەندیی نێوان خۆی و هەموو شتێک و هەموو کەسێکی بڕیوە.

دەمەوئێوارە بوو کە گەیشــــتەوە مــاڵێ، یــانی لانیکەم شــــەش کاتژمێرێک شــــەقامەکانی پێوابوون. نەیدەزانی لە کوێ و چۆن خۆی گەیاندووەتەوە ماڵ. جلەکانیی داکەندن و وەک ئەســــپێک کە تا ئاســــتی

مردن غاراندبێتیان، هەڵدەلەرزی. بەو لەرزەوە لەسەر قەنەفەکە کەوت و پاڵتۆکەی ڕاکێشایە سەر خۆی و دەستبەجێ بێهۆش کەوت...

دونیا تاریک بوو کە قیڕەیەکی زراوبەر ڕایچڵەکاند. هاوار خوایە، ئەمە چ قیڕەیەک بوو؟ پاشانیش دەنگگەلی نائاسایی، ئاه و ناڵە، نەڕە، فرمێسک و کڕووزانەوە، تێهەڵدان و جنێوبارانێک کە لە تەمەنیدا نەیبیستبوو. وێنایەکی هێندە بەدفەڕانە و شەڕەنگێزییەکی وەها شێتئاسا بوو کە تەنانەت لە خەیاڵیشیدا جێگەی نەدەبووەوە. تۆقیوانە لە جێگەکەی دانیشت و وەخت بوو لەتاو ئەشکەنجە بێهۆش بکەوێت. وەلێ ئاژاوە و شیوەن و جنێوەکان تەشەنایان سەند. پاشان، لە بارێکی ئەقڵنەبڕدا دەنگی خاوەنماڵەکەیی هاتە گوێ. ژنەتیوە دەقریشکایەوە و دەیقیژاند و هێندە پەلەپەل و خێرا هەڵیتوپەڵیتی دەگوت و دەیناڵاند کە ڕاسکۆڵنیکۆف نەیدەتوانی تێبگات چی دەڵێت. بێگومان دەلالایەوە کە ئیدی لێی نەدەن، چونکە لە پلیکانەکاندا خەریکبوون دڵڕەقانە شەقکاریيان دەکرد. دەنگی تۆقێنەری لێدەرەکە هێندە دڕندانە و شەڕەنگێزانە بوو کە کەم تا زۆر لە خێسەخێس دەچوو، بەلام ئەویش خۆی خەریک بوو پەلەپەل و خێرا و ناڕوون، بە پچڕپچڕی شتگەلێکی دەگوت. ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ سەرتاپێی لەرزی لێ هات، ئاخر دەنگەکەی دەناسییەوە: دەنگی ئیلیا پیترۆڤیچ. ئیلیا پیترۆڤیچ لەوێ بوو و وا لە خاوەنماڵەکەی دەدا! وا داویەتە بەر لەقە و سەری بە پلیکاندا دەکوتێ... وەک ڕۆژ ڕۆشنە، بە دەنگ و قیڕوهوڕەکەدا دیارە! چی بووە؟ دونیا سەراونخوون بووەتەوە؟ دەیبیست کە وا کۆمەڵ کۆمەڵ لە نهۆمەکان و پلیکانەکانەوە دەڕژێنە دەرێ. دەنگی نیشتەجێکانی دەژنی[1] و پرتەوبۆڵە و تانەکانیان؛ زرمەی دەرگە و تەقەلێدانیان. *ئاخر بۆ، لەبەر چی؟ باشە وەها شتێ چۆن ڕێی*

---

١. دەژنی: دەبیست؛ ئژنی؛ ئژنەوێ. ژنین: بیستن؛ ژنیەی؛ ئژنیەی. لە هەورامییەوە وەرگیراوە و نازانم بۆچی ئێستە بە هەڵە (ژنەوتن یان ژنەفتن) بەکار دەهێندرێت!

تێدەچێ؟ هەیتاهەیتا ئەمانەی دەگوتنەوە و هەر بە جددی بڕوای کردبوو کە ئاوەزیی لەدەست داوە. وەلێ نا، هەموو شتێکی بە ڕوونی دەبیست!... بێگومان دواتریش سەرەی ئەو بوو. *تەواوە دەی، ئەم جارەیان لەسەر ئەو مەسەلەیەیە... لەسەر مەسەلەکەی دوێنێیە... خوایە!* تەنانەت نەیدەتوانی دەستیش هەڵبڕێت دەنا بێگومان دەرگەکەی کڵۆم دەکرد، هەرچەندە سوودێکی ئەوتۆشی نەبوو. تۆقین بە چەشنی دەستێکی سەهۆڵی دڵیی گوشی، ئەشکەنجەی دا و سڕی کرد... دواجار ئاژاوەکە پاش دە خولەکێک بەرەبەرە دامرکایەوە. خاوەنماڵ نووزە و ناڵەی دەکرد و ئیلیا پیترۆڤیچیش هەروا بەدەم هەڕەشەوە جوێنی پێ دەدا... وەلێ ئەویش دواجار وسکت بوو و ئیدی دەنگی نەما. *یانی ئاخرییەکەی ڕۆیشت؟ هاوار خوایە!* بەڵێ... وا ئێستەش خاوەنماڵ خەریکە دەڕوات، هەروا بەدەم فرمێسک و ئاه و ناڵەوە... دەرگەی ئەپارتمانەکەی توند پێوە درا... ئاپۆڕاکە پلیکانەڕێکەیان گرتە بەر و چوونەوە ماڵەکانیان و هێشتا هەر وا سەرسامانە قسە و باسیان بوو، یەکدییان بانگ دەکرد، هەندێک جار پڕ بە گەروو دەیانقیراند و بڕێک جاریش لەژێر لێوەوە ورتەورتێکیان دەکرد. ژمارەیان کەم نەبوو، کەم تا زۆر سەرلەبەری نیشتەجێیانی بیناکە ڕژابوونە دەرێ. *ئاخر خوایە!* چۆن *وەها شتێ ڕێی تێدەچێ؟ باشە بۆچی؟ بۆچی هەستاوە و هاتووە بۆ ئێرە؟*

ڕاسکۆڵنیکۆف هازلێبڕاوانە بەسەر نیمکۆتەکەدا شل بووبوو، وەلێ نەیدەتوانی چاو لێک بنێت. نیو کاتژمێرێکی لەو پەشێوییەدا بەسەر برد؛ هەستی تۆقینێکی بەرگەنەگیراو بوو کە تا ئەو ڕۆژە بەر شتی وا نەکەوتبوو. کتوپڕ شەوقێک درەوشایە ژوورەکەیەوە. ناستاسیا مۆمبەدەست بە دەورییەک سووپەوە هاتە ژوورێ. بە سەرنجەوە تەماشای ڕاسکۆڵنیکۆفی کرد و کاتێک بینیی بەئاگایە، مۆمەکەی خستە

سـەر مێزەکە و دەسـتی کردە دانانی ئەو شـمەکەی کە هێنابووی: نان و خوێ و دەوری و کەوچک.

– دەبێ لە دوێنێوە هیچت نەخواردبێ! بە درێژایی ڕۆژ خۆت بەملا و بەولادا کردووە و وا ئێستەش لەبەر تا هەڵدەلەرزی.

– ناستاسیا... ئەوە بۆچی لە خاوەنماڵەکەیان دەدا؟

ناستاسیا واقووڕ تەماشای کرد:

– کێ لە خاوەنماڵی داوە؟

– هەر ئێسـتە... نیوکـاتژمێریش نـابێ، ئیلیـا پیترۆڤیچی جێگری لێکۆڵەری نـاوچەکە، لە پلیکـانەکـانـدا... بۆ ئـاوهـا کەوتبووە گیـانی خاوەنماڵ... باشە بۆچی هاتبووە ئێرە؟

ناسـتاسـیا، قڕوقەپ و بە برۆی لێکهەڵکێشـراو، تا ماوەیەکی درێژ هەر وا سـەیری کرد. ڕاسـکۆڵنیکۆف بێزار بوو و تەنانەت لە نیگا پرسیارکەرەکەشی ترسا.

دواجار کەساسانە و بە دەنگێکی کز گوتی:

– ناستاسیا، بۆ قسە ناکەی؟

ناسـتاسـیا دواجار فرە هێور و وەک ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بدوێت، گوتی:

– هی خوێنە.

ڕاسـکۆڵنیکۆف وەک گەچ سـپی هەڵگەڕا، ڕووی کردە دیوارەکە و ورتاندی:

– خوێن!... چ خوێنێ؟...

ناســـتاســـیا هێشـــتا هەر وا لێی دەڕوانی و نقەی لێوە نەدەهات. دواجار زاری هەڵهێنا و لێبڕاو و دڵنیا گوتی:

– هیچ کەسێ لە خاوەنماڵی نەداوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف کە بە زۆر هەناسەی بۆ دەدرا، سەیرێکی ئەوی کرد.

– خۆم بیستم... نەخەوتبووم... ئەلێرە دانیشتبووم!

بە بارێکی کەساسانەترەوە درێژەی پێدا:

– تـا مـاوەیەکی زۆر هەر خەریـک بووم گوێم دەگرت. جێگری لێکۆڵەر هاتبوو... هەموانیش لە ماڵەکانیانەوە هاتبوونە دەرێ بۆ سەر پلیکانەکان.

– هیچ کەســـێ لێرە نەبووە. ئەوە خوێنە کە لە گوێیەکانتدا زەنگ لێـدەدا[1]. خوێن کە ڕێگەی نەبوو و مەیی، ئیتر مرۆڤ تێـک دەچێ... ئێستە پارووێ دەخۆی یان نا؟

ڕاســـکۆڵنیکۆف وەڵامی نەدایەوە. ناســـتاســـیا هەر وا لە ژوور سەرییەوە ڕاوەستابوو و لێی دەڕوانی.

– ناستاسیا گیان... ئاوێ، شتێ بێنە.

ناستاسیا چووە خوارێ و پڕ بە پەرداخێکی گڵینی سپی ئاوی هێنا. ڕاسـکۆڵنیکۆف ئیدی نەیزانی چی بووبوو، تەنیا بیری بوو کە چۆڕێک ئاوی ســـاردی خواردووەتەوە و هەندێکیش بەســـەر ســـنگیدا ڕژاوە. پاشان ئەوە بێهۆشی بوو کە پەردەی بەسەر ئەم دیمەنەدا دا.

---

١. پێدەچێ ئاماژە بێت بە گوتەیەکی خوداوەند لە کتێبی ئافراندندا، کە بەرگوێکەی قابیلە: چیت کردووە؟ خوێنی براکەت لە زەوییەوە هاوارم لێ دەکات.

## سێ

راسـكۆلنیكۆف هەڵبەتە تەواو بێهۆش نەبوو، وەلێ بە درێژایی ئەو مـاوەیە نەخۆش و تـادار كەوتبوو؛ تـاوێـك دەكەوتە ورێنەكردن و تاوێكیش هۆشیار دەبووەوە. دواتر زۆر شتی بیر هاتنەوە. تاوێك وای دەهاتە بەرچاو كەسـانێك دەورەیان داوە و دەیانەوێت بۆ شـوێنێكی بەن؛ ژمـارەیەكی دیكەش بەسـەریەوە چەنـدوچۆنیـان بوو و مشـتومڕەكە تەشـەنای دەسـەند. پاشـانیش كتوپڕ لە ژوورەكەیدا تەنیا دەمایەوە و هەمووان -كە لەو ترسـابوون- وازیان لێ هێنابوو و چووبوونە دەرێ؛ تەنیا جارناجارێك دەرگەكەیان لاترەك دەكرد تا سـەیرێكی بكەن. هەڕەشـەیان لێ دەكرد، پێكەوە پیلانیان بۆ دەگێڕا، پێدەكەنین و گاڵتەیان پێ دەكرد. بیری دەهاتەوە كە زیاتر ناسـتاسـیا لەتەك جێگەكەیەوە بووە و، لەگەڵ كەسـێكی دی، كە پێـدەچوو ناسیاوێكی نزیكی بێت، بەڵام نەیدەتوانی بە باشی بیر خۆی بهێنێتەوە و هەر ئەمەش پەرێشـانی كرد و تەنانەت خسـتیشـییە گریان. سـاتێك وای بە خەیـاڵدا دەهـات كە مـاوەی مـانگێكە لەوێ كەوتووە، وەلێ هەندێك جاری دیكەش وەك ئەوە وا بوو كە هەموو شـتێك لە ماوەی ڕۆژێكدا ڕوو بـدات. وێڕای ئەوەی كە شـتێكی تـایبەت لە زەینیدا نەمابووەوە، هەر سـاتەو پێچی دەدایە خۆی كە بێگومان خاڵێك هەیە كە ئەو لە بیری كردووە، شـتێك كە دەشـیا لە بیری بمێنێت. دڵەودوا[1] بوو و ئەشـكەنجەی خۆی دەدا، تا بەڵكە شـتێكی بیر بێتەوە. دەیناڵاند،

---

١. دڵەودوا؛ نیگەران؛ دڵخورت؛ پەشـێو؛ دڵگرانییەكی زۆر بەهۆی ترس یان دۆخێكی نالەبارەوە.

لە ڕقاندا خۆی دەخواردەوە و تۆقینێکی بەرگەنەگیراو یەخەی دەگرت. لەم کاتانەدا بوو کە دەکۆشـــا هەســـتێتەوە و هەڵبێت، وەلێ بەردەوام کەسـێک بەری پێ دەگرت و ئەویش وەک پێشـتر لاواز و بێهەسـت و هۆش بۆی دەکەوتەوە. دواجار بە تەواوی هاتەوە سەر خۆی.

نزیکەی دەی بەیانی بوو کە هاتەوە هۆش خۆی. کەشـوهەوا خۆش بوو، ژوورەکەی لەو کاتانەدا هەتاو دەیگرتەوە و تیشـــکی خۆر بەر دیواری لای ڕاست و سـووچی دەرگەکە دەکەوت. ناسـتاسـیا لەلایەوە ڕاوەسـتابوو و کەسـێکی دیکەش لەوێ بوو کە واقووڕ لێی دەڕوانی. ڕاسکۆلنیکۆف پێشـتر ئەوی نەدیبوو، گەنجێکی ڕیشـن بوو بە کۆتێکی کورتەوە کە لە پەیامنێرەکان دەچوو. خاوەنماڵیش لە لای دەرگەکەوە سـەری دەکێشـایە ژوورێ. ڕاسـکۆلنیکۆف بە دژواری بەرز بووەوە و ئاماژەی بۆ لاوەکە کرد:

– ئەمە کێیە، ناستاسیا؟

ناستاسیا گوتی:

– لام وایە هاتەوە هۆش خۆی!

لاوە نەناسراوەکەش دووبارەی کردەوە:

– هاتووەتەوە هۆش خۆی!

خاوەنماڵەکەش دەتگوت بەم ئەنجامە گەیشـتووە کە ڕاسـکۆلنیکۆف هەست و هۆشی گەڕاوەتەوە، چونکە دەرگەکەی پێوە دا و پێوار بوو. ژنێکی شـەرمۆک و دوور لە قسـەوباس بوو. تەمەنی چل سـاڵ بوو و سەروسیمای خراپ نەبوو؛ لەو خڕەڵە سنگپڕ و چاو و برۆ ڕەشانەی کە دەڵێیت قەڵەوی و تەمبەڵی نەرمونیانی کردوون، بەس هەتا بڵێیت شەرمن بوو.

ڕاسکۆلنیکۆف ڕووی کردە گەنجەکە:

– ئێوە کێن؟

وەلێ لەو کاتەدا، دەرگە کرایەوە و ڕازومیخین هێندە بەژنبەرز بوو، داچەماوانە هاتە ژوور و بە دەنگی بەرز گوتی:

– بابە ئێرە هەر دەڵێی هۆدەی کەشـــتییەکانە! ســـەرم هەر بەری دەکەوێ! ناویشـــیان لێ ناوە ئەپارتمان! کەواتە هاتیتەوە هۆش خۆت، کاکە، ها؟ هەر ئێستە لە *پاشا*[1] خاتوونمەوە بیست.

ناستاسیا گوتی:

– تازە هاتووەتەوە هۆش خۆی.

گەنجەی نەناسراو بەدەم زەردەخەنەوە پاتەی کردەوە:

– هەر ئێستە هاتەوە هۆش خۆی.

ڕازومیخین کتوپڕ ڕوو لە گەنجەکە پرسیی:

– ببوورن، بەڕێزتان؟ من ڕازومیخینم[2] و خۆشحاڵم. ڕازومیخین نا هـا! هەمیشـــە بە ڕازومیخین بـانگم دەکەن، وەلێ وڕازومیخینم، خوێندکارێکی خانەدان. ئەم پایەبەرزەش هاوڕێیەکی دڵســـۆزمە! ئەی ئێوە؟

---

١. پاشـا یاخود پاشـینکا، کورتکراوەی ناوی پراسـکۆڤیان، ئەم جۆرە کورتکردنەوانە بۆ دەربڕینی خۆشەویستی بەکار دێن. «و. ک»

٢. ڕازومیخین لە ڕەگی وشەیەکی ڕووسییەوە (بە واتای ئەقڵ و لۆژیک) وەرگیراوە و لەو ناوانەیە کە لە قوتابخانە ئایینییەکانی سەدەی نۆزدەهەمی ڕووسیادا قوتابیانی پێ بانگ دەکرا. پێشـــگری (پیتی «و») کە ڕازومیخین دەیخاتە ســـەر ناوەکەی و وڕازومیخینی لێ درووســـت دەکات، واتایەکی نزیکی دیکە دەداتە پاڵ ناوەکەی: کەسـێک کە ســوورە لەســـەر ئەوەی لە هەر ڕێیەکەوە بووە، وا لەوانی دیکە بکات لۆژیک پەسەند بکەن. «و. ف»

– من پەیامنێری نووســــینگەکەمانم، لەلایەن بازرگانێکەوە بە ناوی *سێلوپایێف* بۆ کارێک هاتوومەتە خزمەتتان.

– دەی فەرموون لەسەر ئەم کورسییە دانیشن.

ڕازومیخین خۆیشی لە لایەکی دیکەی مێزەکەوە دانیشت و ڕوو لە ڕاسکۆلنیکۆف درێژەی پێ دا:

– زۆر باش بوو دواجار هاتیتەوە هۆش خۆت، کاکی خۆم. چوار ڕۆژە دەمت بە ئاو و نانەوە نەداوە. ناچار بووین کەوچک کەوچک چای بە دەمتەوە بکەین. هەمدیسان ڕۆیشتووم و زۆسیمۆڤم هێناوەتە ژوور سەرت. خۆ زۆســیمۆڤت بیرە؟ پشــکنینێکی چاکی بۆ کردی و دەســـتبەجێش گوتی شــتێکی وات نییە و بە کورتییەکەی وابزانم لە ســەری دابووی؛ لەم کێشــــە پووچە دەمارییانە کە هۆکارەکەشــــی بەدخۆراکی و ئەم جۆرە شتانەیە. گوتی هەڵبەتە بیرە و تووری کێویت کەم خواردووە. وەلێ بە گشــتی وتی شــتێکی ئەوتۆ نییە، تێدەپەڕێ و چاک دەبیتەوە. پیاو هەق بڵێ ئەم زۆســـیمۆڤە شـــارەزایە! بۆ خۆی ناوبانگێکیشی پەیدا کردووە.

دووبارە ڕووی لە گەنجەکە کردەوە:

– دەی، با من کاتتان نەگرم! ئیشـــەکەتان بفەرموون؟ ڕۆدیا، ئاگاداری ئەوە دووەمین جارە کەسێ دەنێرنە لات. وەلێ جاری پێشوو کەسێکی تر هاتبوو، کە من قســەم لەگەڵ کرد و دۆخەکەتم بۆ ڕوون کردەوە. بە ڕاست ئەوەی ئەوجار کێ بوو؟

– ببوورن دەبێ بڵێم ســێ ڕۆژ پێشـــتر بوو، قوربان. *ئالێکســـی سیمیۆناڤیچ* هاتبوون، ئەوانیش لە نووسینگەکەی ئێمەدا کار دەکەن.

– وەلێ دەڵێی بە جۆرێ لە جۆرەکان لە تۆ وریاتر دیار بوو، پێت وا نییە؟

– بەڵێ، قوربان. ئەوەی ڕاستی بێ ئەوان زۆر لە من لێوەشاوەترن!

– ئەی دەمخۆش! دەی، بەردەوام بە.

کوڕە گەنجەکە ڕووی کردە ڕاسکۆڵنیکۆف:

– ئەوەی ڕاســـتی بێ، لەســـەر داوای دایکتان، لەلایەن جەنابی ئافاناسی ئیڤانۆڤیچ ڤاخرۆشینەوە، کە بێگومان ناویتان بیستووە، برە پارەیەکتان بۆ نێردراوە. ئێســـتەش گەر هاتوونەتەوە ســـەر خۆتان، قوربان، دەبێ سیوپێنج ڕۆبڵتان بدەمێ. جەنابی سیمیۆن سیمیۆنۆڤیچ وەک جاران و لەسەر داوای دایکت، ئەم برەیان لە جەنابی ڤاخرۆشین وەرگرتووە. خۆ ئەوان دەناسن، قوربان؟

ڕاسکۆڵنیکۆف فکر و خەیاڵ بردبوویەوە:

– بەڵێ... بیرمە... ڤاخرۆشین...

ڕازومیخین هاواری کرد:

– دەی، خۆ بیستتان کە ڤاخرۆشین دەناسێ! چۆن نەهاتووەتەوە ســـەر خۆی؟ دەبینم ئێوەش بۆ خۆتان کەســـێکی وریان ها! باشـــە! مرۆڤ خەنی دەبێ کە چوار قسەی ماقووڵ دەبیستێ.

– بەڵێ بەڕێز ئافاناسی ئیڤانۆڤیچ ڤاخرۆشین، پێشتریش لەســـەر داوای دایکتان هەر لەم ڕێیەوە پارەیان بۆ ناردوون و ئەم جارەشیان داواکەیانی پەســـەند کرد. چەند ڕۆژێ لەمەوبەر هەواڵیان بۆ ســـیمیۆن ســـیمیۆنۆڤیچ نارد کە سیوپێنج ڕۆبڵ بداتە ئێوە، قوربان. خێری پێوە بێ!

– ئەم *خێری پێوە بێیە* باشترین بەشی گوتەکان بوو، گەرچی لەو *دایکتانـــــ*ـەشدا باش بوون! دەی ئێستە فەرموون بزانم بە ڕای ئێوە: ئەمان هاتوونەتەوە سەر خۆیان یان نا؟

– من ئیتر قســـەیەکم نەماوە، قوربان. تەنیا بە داوای لێبوردنەوە دەبێ قەبزەکە[1] واژۆ بکا و تەواو...

– ئێســـتە ناوەکەیت بە خەتێکی شـــەڕەپشـــیلەیی لەژێرەوە بۆ دەنووسێ! چیتان پێیە، دەفتەر؟

– بەڵێ قوربان، دەبێ لە دەفتەرەکەدا واژۆ بکەن...

– بیـدەنە من. هـا، ڕۆدیـا، ئـادەی هەســـتەوە. من دەتگرم. ڕاســـکۆڵنیکۆفی بۆ واژۆ بکە. وەرە جاری ئەو پێنووســـەمان بۆ بگرە کاکە، پارە لەپێش دەرمانیشەوەیە!

ڕاسکۆڵنیکۆف پێنووسەکەی لادا:

– پێویست ناکا.

– چی پێویست ناکا؟

– واژۆ ناکەم.

– ئەی شەیتان بە نەفرەت بێ! خۆ بێ واژۆ ناکرێ!

– نایەوێ... پێویستیم بە پارە نییە...

– پێویستیێت پێی نییە؟ واز بێنە کاکە! قسەی قەڵبوقۆڕ دەکەی، خۆ من شـاهێدم! ئێوە مەحەپەسـێن، هیچ نییە... ئەمە سـەری دەسـووڕێ... با تازەش هاتبێتەوە هۆش خۆی، هەندێ جار هەر وا... ئێوە مرۆڤێکی تێگەیشـــتوون. من و ئێوە یارمەتیی دەدەین و دەســـتیی دەگرین و ئەویش واژۆ دەکا. وەرن!

– خۆ دەتوانم دوایی بێمەوە خزمەتتان، قوربان.

---

١. قەبز؛ دڤانەک؛ ڕەسید؛ نووسراوەیەک کە گرەنتیی شتێک لەلایەن نووسەرەکەیەوە دەسەلمێنێت.

– نا بەڕێز، پێی ناوێ! بۆچی ئەزیەتی دووبارە ئاخر؟ ئێوە کەسێکی تێگەیشـــتوون، ئـازیزم! دەی، ڕۆدیـا گیـان، میوانەکە ڕامەگرە... خۆ دەبینی دەمێکە چاوەڕێیە!

ڕازومیخین ئەمەی گوت و ئـامـادە بوو تـا دیســـان دەســـتی ڕاسکۆڵنیکۆف بگرێت و واژۆ بکات.

– واز بێنە کاکە! خۆم واژۆ دەکەم.

ڕاســـکۆڵنیکۆف پێنووســـەکەی گرت و قەبزەکەی واژۆ کرد. پەیامنێرەکەش پارەکەی دا و ڕۆیشت.

– براڤۆ![1] دەی کاکە، ئێستە حەز دەکەی شتێ بخۆی؟

ڕاسکۆڵنیکۆف گوتی:

– ئەرێ، برسیمە.

– ئەرێ سووپ ماوە؟

ناســتاســیا کە هەر لە ســـەرەتای بەزمەکەوە لەوێ ڕاوەســـتابوو، گوتی:

– سووپی دوێنێ ماوە.

– سووپ لەگەڵ وردەبرنج و پەتاتە؟

– کتومت.

– ئیتر لەبەرمە. کەواتە سووپ بێنە و چایەکەش بەزیاد کە.

– هەر ئێستە دەیهێنم.

---

١. براڤۆ: وشەکە فەرەنسییە و واتای 'ئافەرین' یان 'دەست خۆش' دەگەیەنێت. «و. ک»

راســـــکۆلنیکۆف بە مت و وڕی و تۆقینێکی ناڕوون و بێهۆکارەوە، تەماشـــــای ئەو دیمەنانەی دەکرد. بڕیاری دا بێدەنگیی لێ بکات تا بزانێت چی دێتە پێش. بیری کردەوە: *لام وایە لە باری وڕێنەکردندا نیم. پێدەچێ ئەمانە ڕاستی بن!...*

دوو خولەک دواتر ناسـتاسـیا سـووپی هێنا و گوتی چایەکەش زوو ئامـادە دەبێت. دوو دانە کەوچـک و دوو دەوری و خوێ و بیبەر و خەرتەلە و شـتی دیکەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو و بە کورتییەکەی وەها مێزێکی ڕازاندەوە کە دەمێک بوو شتی وایان نەبینیبوو. سفرەکەش لە پاکوخاوێنیان بریقەی دەهات.

– ناسـتاسـیای گیانی گیانان، خراپ نەبوو گەر پاشـا خاتوون دوو بتڵ بیرەشمانی بۆ بناردبا. زۆر خۆشە، بە گیانی خۆت!

ناستاسیا لەژێر لێوەوە گوتی:

– ئەی زمانلووس!

جا ڕۆیشت تا داواکە جێبەجێ بکات.

راســـــکۆلنیکۆف هەر وا حەپەســـــاو و لەژێر گوشـــــاردا پێیاندا واق بووبوو. ڕازومیخین لەســـــەر قەنەفەکە لە تەنیشـــتییەوە دانیشـــت؛ هەر وەک ورچێکی دەســـتوپێســـی باسـکی چەپی بە دەوری ملیدا ئاڵاند و ئەمەش لە کاتێکدا کە ڕاسکۆلنیکۆف دەیتوانی بی یارمەتیش دابنیشێت. پاشان بە دەستی ڕاست کەوچێک سووپی بە دەمی هاوڕێکەیەوە کرد؛ فووشی لێ دەکرد نەکا دەمی بسووتێت. وەلێ سووپەکە، شلوێ[1] بوو. ڕاسکۆلنیکۆف سەرسامانە بە چلێسییەوە کەوچکە شۆرباکەی قوت دا، بەدواشـــــیدا دووەم و ســـــێیەم. وەلێ ڕازومیخین کە چەند کەوچکە سووپێکی دیکەی دەرخوارد دا، کتوپڕ وازی هێنا و گوتی دەبێت پرس

---

١. شلوێ؛ ملەما؛ شیرتین؛ شلۆ؛ نە سارد و نە گەرم.

و ڕاوێژێک بە زۆســـیمۆڤ بکات تا بزانێت کە ئایا نەخۆش دەتوانێت زیاتر بخوات یان نا.

ناستاسیا بە دوو بتڵ بیرەوە هاتە ژووریَ.

– چایشت دەویَ؟

– ئەریَ.

ڕازومیخین گەڕایەوە سەر جێگەکەی خۆی و سووپ و گۆشتەکەی ڕاکێشـــایە بەردەمی و بە وەها ئیشـــتهایەکەوە دەیخوارد وەک ئەوەی سیَ ڕۆژ بێت دەمی لە هیچەوە نەدابێت:

– خێراکە ناستاسیا، دەی چایەکەش بگەیێنە! چونکە بەبیَ وەرگرتنی ڕای پسپۆڕانیش دەتوانیَ چای بخواتەوە! ئەوەش بیرەکە!

بە دەمی پڕ لە گۆشتەوە بە زۆر گوتی:

– با پێتی بڵێم، کاکەکەم، ڕۆدیا... چەند ڕۆژێکە لێرە فراوێن دەخۆم. هەمووشـــی لە ســـایەی پاشـــا خانی خاوەنماڵەکەتانەوەیە و هەر بە ڕاستی هەرچیی لەدەســت بیَ بۆمی دەکا. من داوای هیچم لیَ نەکرد، وەلیَ دەی، هەڵبەتە لاریشـــم نییە. بەخ بەخ... ناســـتاســـیا گیانم چایەکەشمانی هێنا. ناستاسیا، گیانەکەم، ئەریَ تۆ بیرە ناخۆیَ؟

– هەر خەریکی زمانلووسی بە!

– ئەی فنجانیَ چای؟

– چای شتێکی دیکەیە!

– کەواتە تێی کە. ئەسڵەن ڕاوەستیَ، خۆم تێیی دەکەم. تۆ دانیشە.

ڕازومیخین دوو فنجان چای تێکرد، وازی لە خواردەمەنییەکە هێنا و هەمدیسان لەسەر قەنەفەکە دانیشتەوە. وەک جاری پێشوو دەستی چەپی بە دەوری ملی نەخۆشـــەکەدا ئەڵقاند و بە کەوچک چای دایێ.

دیســـان لەگەڵ هەر کەوچکێکیشـــدا فووی لە چایەکە دەکرد و هێندە جـددیش وەک بڵێیـت فووکردن، بەشـــی ســـەرەکی و گرنگی چارەسەرکردنی هاوڕێکەیەتی. ڕاسکۆڵنیکۆف هیچی نەگوت و لاریشی نەبوو، گەرچی بەشـــی ئەوە هازی تێدا بوو کە بێ یارمەتی لەســـەر قەنەفەکە دابنیشـــێت و ئەوە بەدەســـتەوە گرتنی فنجان و کەوچکیش کارێکی هەر زۆر ئاســـانە، پێدەچوو تەنانەت بشـــتوانێت هەنگاوێک بە ژوورەکەشدا بنێت. بەڵام بە تەڵەکەیەکی سەرسوڕهێنەوە، ئەو بیرەی خستە مێشکییەوە کە وای بنوێنێت بێهێزە و بۆ ماوەیەکیش بێت هەر وا بە ڕاکشـاوی و بێهازی بمێنێتەوە و تەنانەت گەر پێویسـتیشـی کرد وای بنوێنێ کە هێشتا هەست و هۆشی بە تەواوی لەسـەر خۆی نییە و، ئینجا، گوێ قوڵاخ بکات تا بزانێت لە چواردەوریدا چ باســـە. وەلێ نەیدەتوانی بەســـەر هەســتی بێزارییدا زاڵ ببێت. دە دوازدە کەوچکێک چای خواردەوە، لەپڕ سـەریی لە قولاپی دەست و باسـکی ڕازومیخین قوتار کرد و لاســـارانە کەوچکەکەی لادا و کەوتە ســـەر ســـەرینەکە. ئێســـتە ئیدی پشـــتییەکی بەرگخاوێنی پەڕ ڕاســـتەقینەی لەژێر ســـەردا بوو. سەرنجی ئەم خاڵەشی دا و لە یادگەیدا گلی دایەوە.

– پاشا خاتوون دەبێ ئەمڕۆ مرەبای توودڕکیشمان بداتێ تا چای و توودڕک بدەینە میوانەکەمان.

ڕازومیخین ئەمەی گوت و لەســەر کورســییەکەی خۆی دانیشـت و دووبارە پەلاماری سووپ و گۆشتەکەی دایەوە.

ناستاسیا ژێرپیاڵەی خستە سەر پێنج پەنجەی و لەگەڵ کڵۆقەندێکی نێو دەمیدا چایەکەی قوت دا:

– باشە ئێستە توودڕکت لە کوێ بۆ بێنن؟

– دەی دیارە ئیتر، لە دوکان، خۆشـــەویســـتم. تەماشـــا ڕۆدیا، لەم ماوەیەدا کە تۆ بێهۆش کەوتبووی، زۆر شـــت ڕوویان دا. کاتێ تۆ

ناپیاوانه له ماڵەکەی من چوویه دەر و تەنانەت ناونیشانیشت بۆ جێ نەهێشـــتم، به جۆرێ پەســـــت بووم که گوتم هەر چۆنێک بووه دەتدۆزمەوه و ژیرت دەکەم. هەر ئەو ڕۆژه دەســـتم پێ کرد. نازانیت چەنده هەڵپەهەڵپه بەدواتدا دەگەڕام و چۆنچۆنی شــــوێنم هەڵکردی! ئەوه هیچ که ئێرەم بیر چووبوو، گەرچی هیچ کاتێ له بیرم نەبووه و ناونیشانیشم هەر لا نەبوو. لەبارەی شوێنه کۆنەکەشتەوه تەنیا ئەوەم بیر مـابوو که نزیکی پێنجڕیـانێک بوو، خـانووی *خـارلامۆفەکـان*. به هەزار دەردەســـەری جا توانیم خانووی ئەو خارلامۆفانه بدۆزمەوه و دواتریش دەرکەوت که ئەســـڵەن خارلامۆف نەبووه و *بوخا* بووه! ئەم دەنگانه چۆن ســـەر له پیاو دەشـێوێنن! ئیتر هەر به ڕاسـتی پەسـت بـووبـووم. بـۆ بەیـانـییەکەی گـوتـم خـۆ و بەخـت و چـووم بـۆ بەڕێوەبەرایەتیی تۆمارکردنی ناونیشـــانەکان و جا تۆ تەماشــــا! دوو خولەکی نەبرد دۆزیتیانەوه! لەوێ ناوت تۆمار کراوه.

– تۆمار کراوه؟

– ئەرێ، ئەی چی! نـاوەکەت هەبوو، کەچی هەر هەمـان ئەو ڕۆژه بەدوای ناوی جەنەراڵ *کابێلف*دا دەگەڕان که نەیاندەتوانی بیدۆزنەوه، یانی تا من لەوێ بووم نەیانتوانی! دەی، ئەم چیرۆکه دوور و درێژه! وەلێ هەر که پێم نایه ئەوێ، دەستبەجێ له هەموو شتێکت تێگەیشتم، کاکەکەم، ئێستەش هەموو شتێ دەزانم. گەر باوەڕ ناکەی له ناستاسیا بپرســــه. به نیکۆدیم فۆمیچ، ئیلیـا پیترۆڤیچ، قـاپچییەکه و بەڕێز *زامیۆتۆف*، یانی *ئالێکســاندەر گریگۆریێڤیچ زامیۆتۆف*، ســـەردەفتەری بنکەی پۆلیسـی ناوچەکەش ئاشـنا بووم... جا دواجار به پاشـا خان که هەڵبەته ئەویان تاجی ســـەری ئێمەیه. گەر باوەڕ ناکەی له ناســـتاســـیا بپرسه...

ناستاسیا بزەیەکی فرەزانانەی کرد و ورتاندی:

– بە زمانلووسی ئەوی دیل کردووە.

– ناستاسیا نیکیفۆراڤنا، تۆی خانمخاس نوقڵ و نەباتی!

تریقەی ناستاسیا بەرز بووەوە و گوژمێک لە پێکەنینە هیستیرییەکانی هەڵی کوتایە سەری:

– ئای ع توخمێکی تەڵەکەچییانەت هەیە تۆ!

کە گوژمی پێکەنینەکەی داکشا، دەمودەست گوتی:

– جا بۆ زانیاریت من نیکیفۆراونا نیم و پیترۆڤنام!

– ها! بە چاوان، بیرمان دەمێنێ، خانمخاس. دەی کاکەکەم، بە کورتییەکەی سەرت نەئێشێنم. مەبەستم ئەوە بوو کە شۆکێکی چاکی ئیلیکتریکی[1] هەروەک لافاو لە هەموو ئەم دەوروبەرە بدەم تا هەرچی خراپی و پیسی و دەمارگیریی شووم هەیە لە ڕەگەوە دەربێ، وەلێ پاشا خانم هات و ئاچمەزی[2] کردم. هەر بە ڕاستی، کاکەکەم، هەرگیز پێم وا نەبوو ئەوەندە... ئەوەندە نازەنین بێ ئەم ژنە! ڕات چۆنە، ها؟

ڕاسکۆڵنیکۆف نقەی لێوە نەهات، وەلێ لەو ماوەیەدا نیگای پەشێویی لە ڕازومیخین لا نەکرد و ئێستەش هەر وا تۆقیوانە لێی ڕامابوو.

ڕازومیخین بە بێدەنگییەکەی هیچ قەڵس نەبوو و وەک ئەوەی وەڵامی پرسیارێک پاتە بکاتەوە، درێژەی پێ دا:

---

١. لە وشەنامەی رووسیی چاپ ١٨٦٥دا وشەی ئەلکتریسیتە بەم جۆرە شی کراوەتەوە: شڵەیەکی بێکێش کە لە هەر ئۆرگانیسمێکی زەمینیدا دەست دەکەوێت. «و. ف»

[2] ئاچمەز: دۆخێک لە یاریی شەترەنجدا، کە وا دەکات هیچ داشێک نەتوانێت بجووڵێتەوە، چونکە دەبێتە هۆی کشبوونی. «و. ک»

– بەڵێ، هەتا دڵ حەز کا نازەنینە و لە هەر ڕوویێکیشـــەوە بیگری بێوێنەیە!

ناســـتاســـیا بەدەم گوێگرتن لەم قســـانەوە کەوتبووە فیلەفیل، هەمدیسان بە دەنگی بەرز گوتی:

– چ تەڵەکەچییەکە ئەمە!

– هەر بە ڕاستی حەیفە، کاکەکەم، کە تۆ هەر لە سەرەتاوە جێگەی خۆتت بە باشـــی خۆش نەکرد. خراپ ڕۆڵی خۆتت گێڕا. دەبوو لە لایەکی ترەوە لێی نزیک بیتەوە. ئاخر ئەو وەک دەڵێن کەســـایەتییەکی سۆسەکراوی هەیە! جا با دوایی باسی کەسایەتییت بۆ دەکەم!... هەر بە ڕاســـتی چۆن هێشـــتت بگاتە ئەوەی کە بوێری بۆ نموونە ئیتر خواردەمەنیت بۆ نەنێری؟ ئەی مەســـەلەی ئەم بەڵێننامەیە چی بوو؟ ئەقڵت لەدەســـت داوە کە بەڵێننامە واژ دەکەی و دەیخەیە بەردەســـتی خەڵکی؟ ئەی ئەم بەڵێنی زەمـاوەنـدکردنە لەگەڵ نـاتـالیـای کچیدا لە کوێوە هـات؟ خۆ دەبینی کە ئـاگـاداری هەموو شـــتێکم. وەلێ ئەمە بـابەتێکی هەســـتیـارە و خۆ منیش وەکو ولاخ ملم نـاوە و هەر دەیوروورژێنم! گوێی مەدەیە، ببوورە! وەلێ ئێســـتە کە قســـە هاتووەتە ســـەر کەریەتی، دەزانی ئەم پاشـــا خانمە بەو جۆرەش کەر نییە کە لە یەکەمین بینیندا دەردەکەوێ؟

ڕاسکۆڵنیکۆف لەژێر لێوەوە گوتی:

– بەڵێ...

نیگای لادابوو و بە زۆر وەڵامی دەدایەوە، وەلێ هەر چۆنێک بووە دەیزانی کە ئەوە لە بەرژەوەندیی خۆیدایە کە گفتوگۆکە درێژە بکێشێ.

ڕازومیخین، دڵخۆش لەوەی کە دواجار ناچاری کردووە وەڵامێک بداتەوە، هاواری کرد:

– خراپ دەڵێم؟ وەلێ خۆ، ئەوەندەش وریا نییە، ئەری؟ هەر بە ڕاستیش ئەم ژنە کەسایەتییەکی سەیروسەمەرەی هەیە! بە گیانی ئازیزت هەندێ جار خۆشم تیا دەمێنم... دەبێ چل ساڵێک تەمەنی بێ. خۆی ئێستە دەڵێ سیوشەشە و هەڵبەتە ناهەقیشی نییە! وەلێ سوێند دەخۆم کە لە دیدگەیەکی زەینی و میتافیزیکییەوە دەچمە ناو مەسەلەکە و داوەریی خانم گیانمان دەکەم؛ کاکەکەم، لەنێوان ئێمەدا نیشانەگەلێکی وەک جەبر پزیسکیان کرد! خۆ من هەر ناشزانم مەسەلە چییە! دەی، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە هەموو ئەمانە قسەی بەلاشن! مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەو کاتێ بینیویەتی تۆ ئیتر ناچیتە زانکۆ و وانەی تایبەتیشت وەلا ناوە و دەستە جلێکی ڕێکوپێکیشت لە بەردا نییە و لەگەڵ مردنی کچەکەشی ئیتر پێویست ناکا وەک خزمێک لێت بڕوانێ، ئیدی ترسی لێ نیشتووە. جا ئەوە تۆش دایمە خۆت لەم کونە ناوە و دەستت لە هاوڕێ دێرینەکانت شۆردووەتەوە و پەیوەندیت نەماوە. لەبەر ئەوەیە کە بڕیار دەدا لە کۆڵت بکاتەوە. دەمێک بووە فکر و خەیاڵی لای ئەمە بووە و هەموو مەسەلەکەش ئەوە بووە کە پارەکەی ویستووە. کاکە تۆ خۆت پێت گوتووە کە دایکت پارەکەی دەدا.

ڕاسکۆڵنیکۆف بە دەنگی بەرز و ڕوون گوتی:

– لەبەر کەریم بووە کە گوتوومە! دایکم خۆی خێری پێ دەشێ... درۆیەکم کرد بۆ ئەوەی کە هیچ نەبێ لێرە ڕامگرن و... جا شتێ خواردەمەنیشم بدەنێ.

– بەڵێ، تۆ کارێکی ژیرانەت کرد! بەس نەگبەتییەکە ئەوەیە کە ڕێک لەو کاتەدا سەروسەکوتی جەنابی چیبارۆف دەردەکەوێ. کابرا ڕاوێژکاری دەوڵەتە و سەری لەنێو حسێبوکتێبدایە. گەر بە پاشا گیان با، هەرگیز نەیدەهێشت وەها بیرێکی بە مێشکدا بێ، ئاخر ئەو زۆر لەوە شەرمنترە! وەلێ ئەو چیبارۆفە خۆ نازانێ شەرم و حەیا چییە و

هەر لە سەرەتاشەوە ئەوە دەخاتە بەرباس کە ئایا ڕێگەیەک هەیە تا پارەی ئەو بەڵێننامەیە بە کاشی لەو گەنجە وەربگرین؟ دەبینێ کە بەڵێ ڕێگەیەک هەیە! ئەم قەرزارەی ئێمە دایە گیانێکی هەیە کە ئامادەیە برسیەتی بکێشێ، وەلێ ڕۆدیا گیانی بە برانە سەد و بیستوپێنج ڕۆبڵییەکەی نەجات بدا. خوشکێکی هەیە کە ئامادەیە لەپێناو ئەودا تەنانەت کۆیلایەتیش بکا! کابراش سەیری کردووە ڕێک دەکرێ لەم ڕێگەیەوە گوشاری بخاتە سەر... باشە ئێستە بۆ پیش دەخۆیتەوە تۆ؟ سەیرکە، من ئیتر سەر و بنی هەموو کارەکانت دەزانم، کوڕە، هەمووی هی ئەوەیە کە لە وەختی دەزگیرانداریدا، گرێی دڵی خۆتت بۆ پاشا خاتوون کردووەتەوە. منیش بۆیە ڕووبەڕوو ئەمانەت پێ دەڵێم چونکە خەمی تۆمە. سەیرکە کاکە گیان، مەسەلەکە ئەوەیە کە مرۆڤێکی ڕاستگۆ و بەهەست دەڕوا و دڵی خۆی بۆ ئەوانی دی دەکاتەوە و جا مرۆڤی لێزانیش گوێ دەگرێ و گوێ دەگرێ، جا پاشان بە ساقی قووتت دەدا. دەی، پاشا خانم بەڵننامەکەت لەبری پارە دەداتە یارۆ و ئەویشت یەک خولەک بەفیڕۆ نادا، پڕتاوێک دەکا و بەڵێننامەکەت بەکار دەهێنێ. کە ئەمانەم بیستن بەتەما بووم شۆکێکی چاک لەو بوودەڵەیە بدەم و لە پەلوپۆی بخەم، تا بەشکوم دڵم ئاو بخواتەوە، وەلێ لەم نێوەندەدا من و پاشاخانم ڕێز و حورمەتێک لەنێوانمادا هاتبووە ئارا و، ئەوسا پێم گوت مەسەلەکە ببڕێنێتەوە و بەڵێنم دایێ کە تۆ پارەکەی دەدەیەوە. من بوومە بەرەستۆت[1]، کاکە، حاڵی بووی؟ چیبارۆفیشمان ئاگادار کردەوە، دە ڕۆبڵمان خستە بەردەستی و بەڵێننامەکەتمان لێ وەرگرتەوە. ئێستە من ئەو شانازییەم هەیە کە بەڵننامەکەتان پێشکەش بکەم، قوربان! پاشا خانم ئیتر متمانەی پێت هەیە. فەرموو، بیگرە. خۆت وا دەبینی کە دڕاندووشمە!

---

١. بەرەستۆ؛ بەرئەستۆ؛ بەرعۆدە؛ کەفیل؛ زامن؛ دەستوەر؛ دەستەبەر؛ دانەبەر.

ڕازومیخین بەڵێننامەکەی خستە سەر مێز. ڕاسکۆڵنیکۆف سەیرێکی کرد و ورتەی لێوە نەهات؛ تەنیا ڕووی بەرەو دیوارەکە وەرگێڕا. ئەم جارەیان ڕازومیخین ئیدی پەست بوو و کە خولەکێک تێپەڕی، گوتی:

– کاکی من، وا دیارە لەم نێوەندەدا من تەنیا خۆمم کردووەتە گاڵتەجاڕ. وام زانی بە باسکردنی ئاسمان و ڕێسمان سەرگەرمت دەکەم، وەلێ وا دیارە زاتر بێتاقەتم کردی و پەست بووی.

ڕاسکۆڵنیکۆف دوای یەک دوو خولەکێک بێ ئەوەی ڕووی لە دیوارەکە وەرگێڕێت، گوتی:

– تۆ بووی لە کاتی وڕێنەکردندا نەمدەتوانی بتناسمەوە؟

– بەڵێ، خۆم بووم. چاکیش دەیری دەبووی، بەتایبەت ئەو جارەی کە زامیۆتۆفم هێنابوو.

ڕاسکۆڵنیکۆف خێرا سەری وەرگێڕا و چاوی لە ڕازومیخین بڕی:

– زامیۆتۆف؟... یارۆی سەردەفتەر؟... بۆچی هێنابووتە ئێرە؟

– چ گلاراوێکتە دیسان؟... بۆ لە خۆڕا هەڵدەچی؟ من ئەوەندە لەلای تاریفتم دابوو، کە حەزی دەکرد پێت ئاشنا ببێ. گەر ئەو نەبا من چۆن دەمتوانی لەم شتانە تێبگەم ئاخر؟ کەسێکی ڕێکوپێکە ئەم زامیۆتۆفە... کەسی وەک خۆی نییە. ئیتر تەواو بووینەتە هاوڕێ؛ ڕۆژ نییە یەکتری نەبینین. با پێشت بڵێم، منیش بارم کردووە و هاتوومەتە ئەم دەوروبەرانە. نەتزانیوە؟ لەم چەند ڕۆژەدا بارم کردووە! یەک دوو جارێکیش پێکەوە چووین بۆ لای *لویزا ئیڤانۆڤنا*... خۆ لویزات بیر ماوە؟ لویزا ئیڤانۆڤنا؟

– بەدەم وڕێنەکردنەوە هیچم گوت؟

– هەندێ قسەت فڕێ دەدا! تۆ لەسەر خۆت نەبووی ئەسڵەن.

– چیم دەگوت؟

– چیم دەگوت یـانی چی؟ وڕێنە وڕێنەیە ئیتر... دەی، کـاکەکەم، ئیشمان زۆرە، نابێ کات بەفیڕۆ بدەین.

ڕازومیخین هەستایەوە و کلاوەکەی هەڵگرت.

– باست نەکرد کە چیم دەگوت؟

– چاک گیرت داوین! دەترسـێی سـڕوتڕی خۆتت ئاشـکرا کردبێ؟ خەمت نەبێ: هیچت لەبارەی کۆنتیشـــەوە[1] نەدرکاند! لەبارەی ســـەگی بۆڵداگ و هەندێ گوارە و زنجیر و دوورگەی کریســـتۆفســـکی و قاپیچییەکەوە وڕەوڕت دەکرد، ناوی نیکۆدیم فۆمیچ و ئیلیا پیترۆڤیچ، جێگری لێکۆڵەریشـــــت زۆر دەهێنـا. شـــتێکیش کە زۆر بەلاتەوە خۆشـــەویســـت بوو و چاوت بەدوایەوە بوو، ئەو گۆرەویە بۆگەنەت بوو! هەر شـینوشـەپۆڕت بوو کە *گۆرەوییەکەمم بدەنێ!* زامیۆتۆفیش ژوورەکەی ژێروژوور کرد تا گۆرەوییەکەت بدۆزێتەوە و بەو پەنجە بۆنخۆش و پڕ لە ئەنگوســـتیلانەیەوە، دایە دەســـتت. ئیتر ئەوســـا سـرەوایت و تا شـەو و ڕۆژێک ئەو شـتە شـڕوورە دڵتێکهەڵهێنەت لە خۆت دوور نەخســـتەوە. تەنانەت نەشـــمان دەتوانی لە دەســـتتی دەربهێنین. وا بزانم ئێســـتەش هەر وا لەوێ لەژێر دۆشـەکەکەدایە! جا پاشـــانیش هەر دەلالایتەوە کە دەمپاچەی پانتۆڵەکەت بدەینێ! جا ئێمەش بە ڕاستی سەرمان ئاوسابوو و نەماندەزانی چی دەڵێی. دەی، جارێ لێگەڕێ با بپەرژێینە سـەر کارەکەمان! سـیوپێنج ڕۆبڵمان هەیە. من جارێ دە ڕۆبڵی هەڵدەگرم و پاشـــان تا یەکدوو کاتژمێرێکی دی

---

[1]. بە ئەگەرێکی زۆر ئاماژەیە بۆ کۆنتیش ئانا فیدۆتاونای کورتەچیرۆکی *بی بی* پەیک کە بەرهەمی ئالێکساندەر پوشکینە و دۆستۆیفسکی ئەوی بە شاکاری چیرۆکە خەیالییەکان دادەنا. پێکچوونەکانی *گێرمان*ی پاڵەوانی *بی بی* پەیک و *ڕاسکۆلنیکۆف* هەمیشە بابەتی توێژینەی لێکۆڵەرانی ئەدەبیاتی ڕووسیا بوون. «و. ف»

حســـێبوکتێبێک دەکەین. لەســـــەر ڕێگەکەم زۆســـــیمۆفیش ئاگادار دەکەمەوە، گەرچی دەبوو تـا ئێســـتە دەرکەوتبـا. نیوەڕۆیە ئـاخر! ناستاسیا، تۆش تکایە تا من دەگەڕێمەوە، سەری لێ بدە، بزانە ئاوێک شـتێکی دەوێ بیدەیە دەسـتی. دەی وا ئێمە ڕۆیشـتین. خۆم بە پاشـا گیانیش دەڵێم چیمان پێویستە. جارێ خواحافیز!

– خۆ بە پاشا گیانیش بانگی دەکا! چ زۆڵێکە ئەمە!

ڕازومیخین کە لە ژوورەکە چووە دەرێ، ناسـتاسـیا ئەمەی گوت و دەرگەکەی لاترەک کرد و گوێی هەڵخسـت، بەڵام خۆی پێ ڕانەگیرا و بەدوایدا ڕایکردە دەرێ. ســـوێی بووبووەوە تـا بزانێت ڕازومیخین بەتەمایە چی بە خاوەنماڵ بڵێت. وەک ڕۆژ ڕۆشـــن بوو کە شــەیدای ڕازومیخین بووە.

هێشـــتا ناســـتاســـیا هەنگاوی لە ژوورەکە نەنابووە دەرێ کە نەخۆشـــەکە پەتۆکەی ســـەریی لادا و وەک شـــێتی پەتبڕ[1]، لە جێخەوەکەیەوە پرتـاوی کردە دەرێ. بە درێژایی ئەو مـاوەیە بە پشـــووکورتییەکی ســـووتێنەر و جاڕزکەرەوە چرکەی ژماردبوو تا ئەوان بچنە دەر و بتوانێت دەســت بە کارەکەی بکات... وەلێ بەتەمای چ کـارێـک بوو؟ ئێســـتە کە ئەوان ڕۆیشـــتوون، دەتگوت هەر بۆ قەشـــمەرییپێکردن، هەموو شـتێک خۆی لە زەینی دەشـارێتەوە: *خوایە، خۆزگە تەنیا تێدەگەیشـــتم بەو بەســـەرهاتەیان زانیوە یان نا؟ نەکا ئەمانە هەموو شـتێ بزانن و تەنیا بە ڕوومیدا نەهێنن؟ نەکا ئێسـتە کە لێرە کەوتووم، یارییان پێ کردبم و جا دواتریش بێنە ژوورێ و پێم بڵێن دەمێکە ئاشـکرا بوومە و ئەوان تەنیا خەریک بوون... دەی ئێسـتە دەبێ چی بکەم؟ ئائەمەم بیر چووە، هەر دەڵێی لە لاســـاریان بیرم*

---

١. شێتی پەتبڕ: شێتێک کە باری دەروونیی هێندە خراپ بێت، پێویست بێت چاودێری بکرێت.

*چووە... هەموو شــتێ کتوپڕ لە زەینمدا پەرتەوازە بوو، خۆ تا ســاتێ لەمەوبەر بیرم بوو!*

ڕاسـکۆڵنیکۆف گێژ و وڕ لە ناوەڕاسـتی ژوورەکەدا ڕاوەسـتابوو و بە تیامانێکی پڕئازارەوە لە چواردەوریی دەڕوانی. پاشـان ڕۆیشـت و دەرگەکەی کردەوە و گوێی هەڵخســـت، وەلێ ئەو شـــتەی کە بیری چووبوو ئەمە نەبوو. کتوپڕ وەک ئەوەی شـــتێکی بە زەیندا هاتبێت بەرەو لای کونی ژێر کـاغەزدیوارییەکە فڕکەی کردە ســـووچی دیوارەکە و کەوتە پشـــکنین. دەســـتی بە کونەکەدا کردبوو و لەدوی شتێک دەگەڕا، وەلێ ئەو شتەی کە زەینیی قاڵ کردبوو، ئەمەش نەبوو. بەرەو کوانووەکە ڕۆیشـــــت و خۆڵەمێشـــەکەی ژێروژوور کرد، دەمپاچەی تاڵکێشی پانتۆڵ و پارچەکانی هەوبەری گیرفانەکانی هێشتا هەر لە هەمان شـــوێنی خۆیاندا بوون. کەواتە هێشـــتا کوانووەکەیان نەپشـــکنیبوو! دواتر گۆرەوییەکەی بیر هاتەوە کە لەگەڵ ڕازومیخین باســـیان کردبوو. ڕاســـتی گوتبوو. لەوێ بوو، لەژێر لێفەی ســـەر قەنەفەکە[1]... بەس هێندە پیس و چڵکن بوو کە ئاســـتەمە زامیۆتۆف توانیبێتی دەرک بە شتێک بکات.

*ئۆووو! زامیۆتۆف!... بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس!... بۆ دەبێ بچم بۆ لای پۆلیس؟ کوا بانگهێشتنامەکە؟ ئاه، خوایە! تەواو سەرم لێ شێواوە، خۆ بانگهێشـــتنامە و پۆلیس جاری پێشـــوو بوو. بەڵێ، هەمان کاتیش گۆرەوییەکەمم بینی. وەلێ ئێســـتە... ئەم ماوەیە نەخۆش بوومە. بەس ئـاخر زامیۆتۆف بۆچی هـاتووە؟ ڕازومیخین بۆ هێنـاویەتییە ئێرە؟* لەژێر لێوەوە هەر بۆڵەبۆڵی بوو. دیسـان لەسـەر قەنەفەکە دانیشـتەوە: *مەســـەلە چییە؟ هێشـــتا هەر بەدەم تاوە خەریکی وڕێنەم یان هەموو شتێک ڕاستییە؟ وا بزانم ڕاستییە! ئەهاااا... بیرم هاتەوە! دەبێ ڕاکەم!*

---

١. دەبێت هەڵەیەک ڕووی دابێت، دەنا ڕازومیخین گوتی: «وا بزانم ئێستەش هەر وا لەوێ لەژێر دۆشەکەکەدایە!»، نەک لەژێر «لێفە»کەدا. «و. ک»

*ئەری، دەبێ برۆم! بێگومـان دەبێ ڕاکەم! ئەری وایە... بەس دەبێ بەرەو کوێ؟ ئەی کوا جلوبەرگەکەم؟ واااای، پووتیشـم نییە، یەکێ بردوویەتی! شـاردوویانەتەوە! یانی ئاوها! وەلێ پاڵتاوەکەم لێرەیە، وا دایارە بە خێری خۆیان ئەوەیان بۆ جێ هێشـتووم! پارەش لەسـەر مێزە، ئای کە باشـە! ئەوەش بەڵێننامە... پارەکە هەڵدەگرم و دەچم شوێنێکی تر بە کرێ دەگرم و ئیتر دەستیان پێم ڕاناگا!... تەواوە کاکە! وەلێ نا، ئەی بەڕێوەبەرایەتیی تۆماری ناونیشان؟ شوێنم هەڵدەکەن... ئەم ڕازومیخینە دەمدۆزێتەوە. وا باشـە ئەسـڵەن ڕاکەم بۆ شـوێنێکی دوور... شـوێنێکی زۆر دوور... دەچم بۆ ئەمریکا و سـندان لە هەموو ئەمانە دا! بەڵێننامەکەش دەبەم، بێگومان لەوێ بەکەڵکم دێ. چیی دیکە ببەم؟ وایانزانیوە من نەخۆشم! نازانن بە پێوەم و چاکیش دەتوانم ڕێ بکەم، هاهاها! لە نیگایاندا خوێندمەوە بە هەموو شـتێکیان زانیوە! هەر ئەوەندەی حسـێبە بچمە خوارێ!... بەس کێ نالێ لەوێ پاسـەوانیان دانەنـاوە؟ چییە ئەم، چـایە؟ خۆ بیرەش مـاوە، نیو بتـڵ بیرەی کەللەتەزێن!*

پڕی دایە بتڵەکە، هێشـتا پەرداخێک بیرەی تێدا مابوو. بە تاسـەوە هەمووی هەڵقوڕاند، دەتگوت خەریکە ئاگری ناو سـنگی دەکوژێنێتەوە. وەلێ خولەکێکیشـی نەبرد کە کاریگەریی بیرەکە گەییە سـەری و لەرزینێکی کز و تەنانەت چێژبەخش ستوونی پشتیی لەرزاند. ڕاکشا و لێفەکەی بە خۆیدا دا. بیرکردنەوە شپرزە و نەخۆشانەکانی هەر ساتەو لێکترازاوتر دەبوون و زۆر زوو هەسـتی خەواڵوویەکی دڵپەسـەند و سـووکی ئەوی لە خۆ گرت. زۆر ئاسـان و ئاسـوودە سـەری بە پشـتییەکەیـدا ڕۆبرد و لەبری پـاڵتۆ پەڕپووت و کۆنەکەی لێفە پینەکراوەکەی تونـدتر لە دەوری خۆی پێچـا، ئـاهێکی هەڵکێشـا و خەوێکی قووڵ و شیفابەخش بردییەوە.

بیستی کەسێک هاتە ژوورەوە و لە خەو ڕاچەنی. چاوی کردەوە و بینیی ڕازومیخین لە ئاستانەی دەرگەدا ڕاوەستاوە و لەوە دوودڵە کە ئاخۆ بێتە ژووری یان نا. ڕاسکۆلنیکۆف گورج لە جێگەکەی ڕاست بووەوە و دانیشت، جا بە چەشنێک لێی ڕاما وەک ئەوەی بیەوێت شتێک بیر خۆی بێنێتەوە.

– ئەها، یانی نەخەوتووی! ئەوە منیش هاتم!

ڕازومیخین ڕووەو خوارەوەی پلیکانەکان هاواری کرد:

– ناستاسیا بێنە ئەو بەستەیە! ئێستە کتومت حسێبەکەشیت پێ دەڵێم.

ڕاسکۆلنیکۆف دڵخورتانە چاوی بە چواردەوریدا خشاند:

– کاتژمێر چەندە؟

– بەڵێ دەی، ئێوە چاک خەوتن. عەسر بووە، ئیتر دەبێ شەش بێ. شەشکاتژمێر زیاتر خەوتی!

– خوایە گیان! چیم لێ قەوماوە؟

– جا بۆ نەخەوی؟ خۆ شتێکی باشە بۆت. ئەی پەلەی چیتە ئەوە؟ خۆ ژوانوموانت لەگەڵ کەسدا نییە؟ جارێ کات بۆ ئەو شتانە زۆرە! سێ کاتژمێر دەبێ چاوەڕێم بێدار ببیەوە، دوو جار هاتمە سەری و خەوت بە حەوت پاشاوە دەبینی. دوو جاریش چووم بەدوای زۆسیمۆفدا، کە لە ماڵەوە نەبوو کاکم! تۆ بیری لێ بکەوە! وەڵێ قەیدی نییە، خۆی دەردەکەوێ. چووم بەدەم ئیشەکانی خۆشمەوە. خۆ ئاگاداری، ئەمڕۆ وا بار دەکەم، دەچم بۆلای خاڵم. ئێستە ئیتر خاڵیشمانمان هەیە... باشە ئیتر، ئێستە بەستەکەم بدەیە، ناستاسیا. هەر ئێستە دەیکەینەوە... ئێستە حاڵەکەت چۆنە، کاکەکەم؟

– تەندروستم، هیچم نییە... ڕازومیخین، تۆ دەمێکە لێرەی؟

– خۆ پێم ڕاگەیاندی کە سێ کاتژمێر دەبێ لێرەم.

– نا، مەبەستم پێشترە.

– پێشتر چی؟

– لە کەیەوە هاتوچۆی ئێرە دەکەی؟

– ئەم بەیانییە تێروتەسەل بۆم باس کردی خۆ! بیرت نییە؟

ڕاسکۆلنیکۆف فکر و خەیاڵ بردییەوە. بەیانی بۆ ئەو وەک خەیاڵێک وابوو. خۆی نەیتوانی هیچ بیر بێتەوە و پرسیارکەرانە لە ڕازومیخینی دەڕوانی.

– ئمممم! بیری نایێ! هەر ئەو کاتە هەستم کرد کە دۆخت ئەوەندەش باش نییە... باشتر بووی کە خەوتی... خوا ئاگادارە باشتر بووی! بژیی! دەی با بپەرژێینە سەر کارەکەمان. سەیری ئێرەکە، هاوڕێ گیان.

ڕازومیخین دەستی کردە هەڵپچڕینی بەستەکە، کە وا دیاربوو زۆریشی بەلاوە سەرنجراکێش بوو.

– کاکەکەم، بڕوات هەبێ ئەم بابەتەم زۆر بەلاوە گرنگە، لە ناخی دڵمەوە دەیڵێم. دەبێ بتکەینە پیاوی ناو پیاوان! لە سەرەوە دەست پێدەکەین. دەی، تەماشای ئەم کڵاوە!

ڕازومیخین لە بەستەکەدا کڵاوێکی پاکوخاوێن –گەرچی هەرزان و ئاسایی–ی دەرهێنا:

– خۆم لە سەرتی دەکەم.

ڕاسکۆلنیکۆف بە بێزارییەوە لای دا:

– جارێ لێی گەڕێ دوایی تاقیی دەکەینەوە، کاتمان دەبێ.

– ڕۆدیا، کاکەکەم، مەیکەرەوە بە بەزم ها! دوایی نابێ، زۆریش درەنگە! منیش بە درێژایی شەو لەتاو دڵەڕاوکێ خەوم لێ نەدەکەوت، ئاخر هەر وا خۆوبەخت و بەبێ ئەندازە کرێم. شازە!

کڵاوەکەی نایە سەری ڕاسکۆڵنیکۆف و سەرکەوتووانە هاواری کرد:

– جوان بە سەرتەوە وەستاوە ها! پۆشاکی شیاوی سەر، یەکەمین بەشی جلوبەرگی هەر مرۆڤێکە کاکە گیان، بۆ خۆی بە جۆرێ لە جۆرەکان دەبێتە پێناسەی مرۆڤ. *تۆلستیاکۆڤ* لە هاوڕێیانی منە، هەر جار بە شوێنێکی گشتیدا ڕەد ببێ و ببینێ ئەوانی دیکە کڵاوی ئاسایی یان کاسکێتیان لە سەر کردووە، ناچار دەبێ کڵاوە لەگانییە فشەکەی خۆی دابگرێ. جا خەڵکی لایان وایە ئەو وەک ڕێزلێنانێک کڵاوەکەی دادەگرێ، وەلێ مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەو تەنیا شەرم لەو لەگانەی سەر سەری دەکات و هیچی دی، تەماشا ناستاسیا، لێرانەدا دوو جۆر کڵاومان هەیە، ئەم پالمێرستون[1]ـە...

لە سووچی ژوورەکەدا کڵاوە پانبووەوە و کۆنەکەی ڕاسکۆڵنیکۆفی هەڵگرتەوە و بە هۆکارگەلێکی نادیار، پێی دەگوت پالمێرستون:

– بۆ خوا بڵێ، ئەم پالمێرستونە باشە یان ئەم گەوهەرەی کە من کرێم! ئێستە سۆسەی نرخەکەی بکە، ڕۆدیا... چەندم پێ دابێ باشە، ناستاسیا؟

---

١. لە بنەڕەتدا بە خۆشیی سەرۆکوەزیری سەردەمی ئینگلیزستانەوە بە کۆتی درێژ و تەسکی پیاوانەیان دەگوت پالمێرستون نەک کڵاو. بە بۆچوونی سێرگی *بیلۆف* بە سەرنجدان لەوەی کە مۆدێلی کۆتی پالمێرستۆن لەو سەردەمانەدا بەسەر چووبوو، ڕازومیخینیش بە کڵاوی کۆنە و زۆر دێرینی ڕاسکۆلنیکۆف دەڵێت پالمێرستۆن. «و. ف»

کە ڕاسکۆلنیکۆف وەڵامی نەدایەوە، ڕازومیخین ڕووی کردە ناستاسیا.

دواجار ناستاسیا گوتی:

– دەبێ بیست کۆپیکت پێ دابێ!

– بیست کۆپیک، گەمژە گیان؟

ڕازومیخین کردیە هەرا، تەواو لە بەردڵی گران بوو:

– باشە لەم ڕۆژگارەدا چ شتێ هەیە بە بیست کۆپیک؟ تۆ خۆت بە بیست کۆپیک تفیش ناکەیتە ڕووی کابرا! هەشتا کۆپیک! تەنیا لەبەر ئەوەش کە لە سەر کرابوو بەم نرخە دایان! بەو مەرجە کڕیم تا کاتێ شڕووڕ بوو، ساڵی داهاتوو دانەیەکی تریشم بدەنێ... ئەرێ کاکە! دەی، ئێستە دەگەینە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە سەردەمی قوتابخانەدا وامان دەگوت! ئەم پانتۆڵە بووەتە مایەی شانازیی من، سوێند بە سەری تۆ!

پانتۆڵێکی سووکی هاوینەیی خۆڵەمێشیی خستە بەردەم ڕاسکۆلنیکۆف کە پێدەچوو لە توخمی پەڕم بێت.

– نە کونێک، نە پەڵەیەک، نە شتێ! ئەمەشیان لە بەر کراوە، بەس تا بڵێی ئاوڕوومەندانەیە. ئەوەش هێلەک لەگەڵی بپۆشی، وەک دواهەمین مۆدێل کردوومە بە قات! زۆریش باشترە کە لە بەر کراوە، نەرمتر بووە و زبرییەکەی نەماوە... ڕۆدیا، بە بۆچوونی من بۆ ئەوەی لەم دونیایەدا کاری خۆت باش بەرەو پێش ببەی، دەبێ ئاگاداری گۆڕانکاریی وەرزەکان بی. وەک دەڵێن: گەر لە کانوونی دووەمدا گیامارانە نەکڕی پارەکەی لە گیرفانتدا دەمێنێتەوە! ئێستەش مەسەلەی کڕینەکەی ئێمە هەر ئەمەیە. مەگەر هاوین نییە؟ دەی منیش جلی هاوینەم بۆ کڕی. پاییزیش پێویستیی بە جلی گەرمترە و هەر چۆنێک

بووە ناچار دەبی ئەمانە وەلا نێی، لەبەر ئەوە نا تۆ بتەوێ خۆت بە کەشـخەپۆش نیشـان بدەی، بەڵکوو لەبەر ئەوەی شـرووشـیتاڵیان پێوە نامێنێ. ئێسـتە بڵێ کردییە چەند؟ ڕات چییە؟ دوو ڕۆبڵ و بیسـتوپێنج کۆپیک! مەرجەکەشـــمانت بیر نەچێ، گەر هێندە لە بەریان بکەی تا بپوێن، ئەوا بە بەلاش دەسـتێکی دیکە وەردەگری! فیدیایف ئەسـڵەن ڕەوشـــی کارکردنی بەم جۆرەیە، گەر جارێک شـتێکیان لێ بکڕی، تا کۆتـای تەمەن ئێتر بێخەمیـت و یەک کۆپیکیش نـادەی، چونکە ئێتر خۆت ناتەوێ سەر بەوێدا بکەیتەوە. دەی، با ئێستە بێینە سەر پووت! ئەمەت لا چۆنە، ها؟ تۆزێ کۆن بووە، وەلێ زۆر باش بەشی دووسێ مانگێکت دەکا، کەولێ بیانی و دووریێنی بیانی! سەرقەڵەمی سەفارەتی ئینگلیزی حەفتەی پێشـوو دووریویەتی... تەنیا شـەش ڕۆژ ئەمەی لە پێ کردووە، وەلێ پـارەی پێویسـتـت بووە و فرۆشـتوویەتی. نرخەکەشی... ڕۆبڵ و نیوێکە. خۆشمامەڵە نەبووە؟

ناستاسیا بۆچوونی خۆی دەربڕی:

– وەلێ ڕەنگە بۆ پێی نەشێ!

– نەشێ؟ بە چیت زانیوین! دانیشە و سەیرکە تەنیا!

ڕازومیخین لە گیرفانیدا پووتە کۆنە و شـــەقارشـــەقارەکەی ڕاسکۆلنیکۆفی دەرهێنا کە شەپڵە قوڕێکی پێوە وشک بووبووەوە.

– خۆ هەر وا نەڕۆیشـتووم! سـەرەتا سـپاردم ئەندازەی ئەم دێوە بیابانییەیان گرت! بەڵێ، هەموو هەولێ خراوەتە گەڕ. مەسـەلەی لێفە و ئەم جۆرە شـــتانەشـــم لەگەڵ خاوەنماڵ گیانتدا براندەوە. فەرموو، ئەوەش سـێ دانە کراس... ڕاسـتە، ناچار بووم دەزوویەکەی بکڕم، وەلێ سەرەوە و یەخەکەی کتومت مۆدێلی ڕۆژە! دەی، کەواتە هەشتا کۆپیک بۆ کلاو، دوو ڕۆبڵ و بیسـتوپێنج کۆپیک بۆ پانتۆڵ و هێلەک، بە گشتی کردییە سێ ڕۆبڵ و پێنج کۆپیک. پووتەکەش ڕۆبڵ و نیوێکی

تێ چووە... ئاخر هەر دەڵێی لۆکە! بووە چوار ڕۆبڵ و پەنجاوپێنج کۆپیک. پێنج ڕۆبڵیش بۆ جلی ژێرەوە و ئەم شتانە... زۆربەی هەرزان کەوتووە. حسێبەکەمان کتومت بووە نۆ ڕۆبڵ و پەنجاوپێنج کۆپیک. چلوپێنج کۆپیکی وردەش لە دە ڕۆبڵەکەت ماوەتەوە. فەرموو بیگرە! باشە، سەرتاپا نوێ بوویتەوە، ڕۆدیا. پاڵتۆکەی خۆت هیچ کێشەی نییە، مۆدێلێکی تایبەتە بۆ خۆی! شتکڕین لەلای *شارمەر*[1] خۆ گاڵتە نییە! ئیتر بۆ گۆرەوی و شتی تریش خۆت دەزانی، چونکە هێشتا بیستوپێنج ڕۆبڵمان ماوە. لەبارەی پاشا گیان و کرێیماڵەکەشتەوە دڵ لە دڵ نەدەی. پێم ڕاگەیاندی کە ئێستە ئیتر لەلای ئەو متمانەت هەیە. ئێستە با کراسەکەت بگۆڕین، هیچ دوور نییە نەخۆشی لەم کراسەتدا هێلانەی کردبێ و کە فرێت دا، ساقوسەلیم ببیتەوە!

ڕاسکۆڵنیکۆف بە درێژایی ئەو ماوەیە بە قەڵسی گوێی لە کەفتولەفتی[2] ڕازومیخین گرتبوو کە هەوڵی دەدا هەواڵی جلکڕینەکەی بەدەم گاڵتەوە ڕابگەیەنێت و تاریفی بدات، جا ئێستەش ڕەدی کردەوە:

– وازم لێ بێنن! نامەوێ جل بگۆڕم!

ڕازومیخین وازی نەدەهێنا:

– کاکە، دە ئازارمان مەدە! یانی من بە گۆترە لە بەیانییەوە سووڕاومەتەوە؟ ناستاسیا، وەرە، ئێستە کاتی ئەوە نییە تۆش خۆت شەرمن کەی بۆ من! ئادەی وەرە یارمەتیم دە. ئەوە تەواوە...

وێڕای بەرگریکردنی ڕاسکۆڵنیکۆف، کراسەکەیان گۆڕی. بە پشتدا سەری نایە سەر پشتییەکە و چەند خولەکێک ورتەی لە خۆی بڕی.

---

١. لە باشترین و گرانبەهاترین بەرگدوورەکانی پیتەربورگ کە دۆستۆیفسکی خۆیشی مشتەریی بوو. «و. ف»

٢. کەفتولەت: هەوڵ یان کردوکۆشی درێژخایەنی جەستەیی یان زەینی.

لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *نەخێر، بەم زووانە لەدەستیان نەجاتم نابێ.*

دواجار لە بارێکدا کە نیگای لە دیوارەکە بوو، پرسیی:

– بە کامە پارە ئەمانەت کڕین؟

– یانی چی بە کامە پارە؟ بە پارەی خۆت ئیتر، ئەو پارەیەی کە پۆستەچی لەلایەن ڤاخرۆشینەوە هێنابووی، ئەو پارەیەی کە دایکت ناردبووی، کاکە گیان. ئەمەشت بیر چووەوە؟

ڕاسکۆڵنیکۆف دوای بێدەنگییەکی درێژخایەن و قورس گوتی:

– ئێستە بیرم هاتەوە.

ڕازومیخین بە بێتاقەتی لێی ڕوانی و ناوچاوی گرژ کرد.

دەرگە کرایەوە و پیاوێکی بەژنبەرز و چوارشانە هاتە ژووریّ کە ڕاسکۆڵنیکۆف وێنای سەروسیمای دەکرد.

ڕازومیخین هاواری لێ هەستا:

– زۆسیمۆف! ئای دیمانەت بە خێر!

## چوار

زۆسیمۆف قەڵەو و باڵابەرز بوو، بە ڕوومەتێکی پاکتاشراو و بێڕەنگ و هەڵماسیو و قژێکی خاوەوە. عەینەکلەچاو و ئەڵقەیەکی ئاڵتوونیی پانی لە پەنجە دەکرد. بیستوحەوت ساڵێک دەبوو. کۆتێکی خۆڵەمێشیی سووک و مۆدەی پانوپۆڕی لەگەڵ پانتۆڵێکی هاوینەیی و فێنکدا لە بەر کردبوو. هەموو پۆشاکەکەی بەرین و مۆدە و نوێ بوو. کراسە پاکوخاوێنەکەی هیچ عەیبێکی نەبوو و زنجیری کاتژمێرەکەی پان بوو و جووڵەکانیشی خاو و قورس، بە جۆرێک کە هەر دەتگوت بێهاز و تاقەتلێبڕاوە، هاوکات، وا دەردەکەوت کە هێندەش سەختگر نەبێت و گوشار لە خۆی نەکات. هەوڵی دەدا لووتبەرزیی خۆی ئاشکرا نەکات، وەلێ نەدەکرا و لە هەر هەناسەیەکیدا دیار بوو. هاوڕێ و ناسیاوان دەیانگوت زۆسیمۆف لەو کەسانەیە کە مرۆڤ وەڕەز دەکات، وەلێ چاک شارەزای کارەکەیەتی.

ڕازومیخین بە دەنگی بەرز گوتی:

– ئەمڕۆ دوو جار هاتمە دوات، کاکە... فەرموو، دەبینی کە هاتووەتەوە سەر خۆی!

– بەڵێ. وا دەبینم. دەی، ئێستە حاڵەکەت چۆنە، هاوڕێ، ها؟

زۆسیمۆف ئەمەی گوت و ورد ڕۆسکۆڵنیکۆفی هەڵسەنگاند، لەسەر قەنەفەکەی و لە خوار قاچییەوە دانیشت و هەوڵی دا تا دەکرێ شوێنەکەی خۆش بێت.

ڕازومیخین درێژەی پێ دا:

– کاکەمان خەمۆکە! بەر لە تۆ جلەکانیمان گۆڕی و هێندەی نەمابوو لێمان بکاتە فینگەفینگ.

– شتێکی ئاساییە. دەی مادام خۆی قایل نەبوو، دەکرا جلگۆڕین بخەنە کاتێکی تر... لێدانی دڵی خۆ بێکێشەیە! وەلێ هێشتا تۆزێ سەرئێشەت هەیە، ئەرێ؟

ڕاسکۆلنیکۆف لێبڕاوانە بە توورەییەوە گوتی:

– من باشم، هەتا دڵ حەز کا!

خۆی بەرز کردەوە و بە چاوانێکی درەوشاوەوە سەیری کرد، وەلێ لە هەمان کاتدا کەوتەوە سەر سەرینەکە و ڕووی لە دیوار کرد. زاسیمۆڤ واقووڕ لێی دەڕوانی و گوتی:

– هەر زۆریش باشە... هەموو شتێ باش بەرەو پێش دەچێ. هیچی خواردووە؟

بۆیان باس کرد و لێیان پرسی چی باشە بۆ نەخۆش تا بیخوات.

– پێویست بە پارێزێکی تایبەت ناکا. دەتوانێ هەموو شتێ بخوا... سووپ، چای... هەڵبەتە باش نییە قارچک و خەیار بخوا و ناشبێ بیدەنێ. گۆشتیش نەخوا باشترە... هەر ئەوەندەیە!

زۆسیمۆف و ڕازومیخین تەماشایەکی یەکدییان کرد:

– ئیتر حەبومەبیشی ناوێ. بەیانی خۆم دووبارە سەری لێ دەدەمەوە... لەوانەشە ئەمڕۆ هەمدیسان بێمەوە... بەس بە گشتی...

ڕازومیخین بڕیاری خۆی دابوو:

– تەماشا، سبەی عەسرەکەی دەیبەم بۆ پیاسە. دەچین تا باخی یوسوپۆف و پاشانیش دەوروبەری کۆشکی بلوورین.

– بە من بێ ســـــبەی لە ماڵێ نەیجووڵێنی، گەرچی... لەوانەشــــە کەمێ... باشە، بزانین چۆن دەبێ!

– ئەی هاوار، نەگبەتییەک هەیە، جارێ من دەبێ ئەمشــەو بەبۆنەی ماڵە تازەکەمەوە میوانداریيەک ڕێک بخەم، هەڵبەتە دوور نییە، دوو هەنگاوە. خۆزگە ئەمەش دەهاتە لامان، تەنانەت گەر بۆ ئەوەش بێ لەوێ پاڵکەوێ. خۆ تۆ دێی، ها؟

ئەمەی لە زۆسیمۆف پرسی و درێژەی پێدا:

– بیرت نەچێ! بەڵێنت دا کە دێی.

– باشە. بەس من درەنگتر دەگەم. ئەی چی ئامادەیە؟

– هیچ! چای و ماسی و ڤۆدکا و ماسیمان هەیە. کێکیشمان ئامادە کردووە... تەنیا چەند هاوڕێیەکی نزیکن.

– یانی کێ و کێ؟

– دەی ئەوانەی کە خەڵکی ئەوێن، کەم تا زۆر گشـــــتیان تازە و نائاشـــنان. هەڵبەتە بێ لە خاڵە، کە ئەویش بە تازە حســـێب دەکرێ و دوێنێ گەیشـــــتووەتە پیتەربورگ و هاتووە بەدەم کارەکانییەوە. پێنج ساڵ جارێ یەکتری دەبینین.

– کاریان چییە؟

– بە درێژایی تەمەنی کـارمەنـدی پۆســــتەوگەیـانـدن بووە لە دەڤەرەکاندا و داماوە دوور خراوەتەوە؛ ئێســـــتەش برانەیەکی کەم وەردەگرێ. تەمەنی شـەسـتوپێنج سـاڵە... شـتێکی وای نییە جێی باس بێ... بەس من خۆشـــــم دەوێ. پۆرفیری پیترۆڤیچیش دێ، لێکۆڵەری

بابەتی تاوانکاریی ئەم ناوچەیە... یاسـاناسـە[1]. خۆ خۆت ئەویان دەناسی.

– ئەم پارفێرییە خزموشتت نییە؟

– خزمێکی زۆر دوورە. بۆچی برۆک تێک ناوە؟ ئێسـتە لەبەر ئەوەی جـارێـک لەگەڵ کـابرا بەشـەڕ هـاتووی دەتەوێ نەیەیتە میوانییەکە؟

– من هەقم چییە بەسەر ئەوەوە...

– هەر زۆر باشە! دەی، چەند خوێندکارێک و مامۆستایەکیش هەن، کارمەندێک، مۆسیقارێک، ئەفسەرێک و زامیۆتۆف.

– کاکە تۆ سەرەتا تێم گەیێنە تۆ و ئەم...

زۆسیمۆف بەرەو لای ڕاسکۆلنیکۆف سەرێکی لەقاند:

– ئاخر چ شـتێ تۆ و ئەمە لەگەڵ کەسـێکی وەک زامیۆتۆفدا کۆ دەکاتەوە؟

– ئای لە خانەدانی وردسـەرنج! کەواتە باسـەکە بنەمایە!... تۆ بە جۆرێک لەسـەر بنەماکەت پەپکەت خواردووە کە دەڵێی ترسـی ئەوەت هەیە وەک ئیسـپرنگ لەژێرت دەرپەڕێ، تەنانەت لەوەش دەترسـی کە بە ئارەزووی خۆت بەرەو لایەکی تر بسـوورێی. تەماشـا، گەر بەرانبەرەکەم کەسـێکی باش بێ، هەر ئەوە بۆ من دەبێتە بنەما و ئیتر تەواو. منیش وا پێت دەڵێم ئەم زامیۆتۆفە وێنەی نییە.

---

1. وەک دەڵێن ئەم یاسـاناسـانە خوێندنیان لە کۆلێژی پاشـایی نموونەیی و نایابی مافی پەتەربورگ تەواو کردبوو کە لە سـاڵی ١٨٣٥دا دامەزرابوو. لێکۆڵەرانی پۆلیس زۆربەی ئەم پێگەیەیان نەبوو و ئەم خاڵەش کەسـایەتیی پۆرفێری ئاڵۆزتر دەکات. «و. ف»

– بابە کابرا بەرتیلخۆرە!

– دەی با بەرتیلخۆر بێ، بە من چی؟ خۆ من هەر بە خەیاڵیشـــیمدا نایێ...

ڕازومیخین بە توورەییەکی نائاســـاییەوە دەنگی هەڵبڕی و درێژەی پێ دا:

– کابرا وایە، جا خۆ من چەپڵەی بۆ لێنادەم. تەنیا دەڵێم ئەو لە خۆیدا کەســـێکی باشـــە. گەر بتەوێ بەم جۆرە هەموو شـــتێ لێک بدەیتەوە، ســـەیر دەکەی نەوەی مرۆڤی باش قڕی تێ کەوتووە! بۆ نموونە خودی من... دڵنیام بەو هەموو شـــانوشـــکۆیەمەوە پیازێک ناکەم... جا گەر تۆشم لەگەڵ بدەن!

– کەمت گوت! گەر من بم، نرخی دوو پیازت لەسەر دادەنێم!

– من نرخی تاقە پیازەکەشت بە زۆر لەسەر دادەنێم! خۆت هەزەلی مەکە، کاکی خۆم! ئاخر ئەم زامیۆتۆفە هێشـــتا منالە. من دەتوانم چنگ بە قژیدا بکەم و ڕایکێشم، ئاخر دەبێ ئەو لە بەردەستتدا بێ، خۆ حاڵی دەبی. گەر کەسێ لە خۆت بتارێنی ئیتر ناتوانی چاکسازیی تێدا بکەی، جا گەر کابرا منالیش بێ ئەوا پێویســـــتە دووهێندە لە خەمیدا بی. ئاخ بەدەســـت ئێوەی دەبەنگی پێشـــکەوتنخوازەوە کە هیچتان بە مێشـــکدا ناچێ! تێنـاگەن کە بێڕێزیکردن بەوانی تر تەنیـا تفی هەورازە... وەلێ گەر هێندەش دڵت پێوەیە بزانی، بەڵێ، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بابەتێک ئێمەی لێک نزیک کردەوە!

– دەی، کونجکۆڵی ئەوەم بزانم مەسەلە چییە!

– کـاکە بـۆیەچـییەک هەیە کە... خەریـکـیـن هەوڵ دەدەیـن لە گێرەوکێشـــەی دەربێنین! گەرچی ئێســـتە ئیتر نیگەرانییەک لەئارادا نییە

و لە مەترسی تێپەڕیوە. مەسەلەکە خۆی وەک ڕۆژ ڕۆشنە! ئێمەش تەنیا کارەکانمان خستنە سەر سکە.

– باشە ئەم بۆیەچیی بینایە لە کوێوە هات؟

– پێم نەگوتی؟ هەر بە جددی یانی پێم نەگوتی؟ کەواتە دیارە تەنیا سەرەتای بەسەرهاتی کوشتنی ئەو پیرێژنە سووخۆرەم بۆ باس کردووی... ئاخر لەم نێوەندەدا بۆیەچییەکەش پێوە بووە...

– خۆم بەر لەوەی بەسەرهاتی کوشتنی پیرێژنەکە بگاتە لای تۆ بیستبووم، تەنانەت سەرنجیشی ڕاکێشابووم... تا ئەوەی کە... لەبەر هۆکارێ... جیا لەوە، لە ڕۆژنامەشدا هەواڵەکەم خوێندەوە! وەلێ باشە...

ناستاسیا هەڕەمەکیانە پەڕییە ناو گفتوگۆکە و ڕوو لە ڕاسکۆلنیکۆف گوتی:

– لیزاڤێتایان کوشتووە.

ناستاسیا بە درێژایی ئەو ماوەیە لەوێ بوو و لە بەردەرگەکەدا گوێی دەگرت.

ورتەورتی ڕاسکۆلنیکۆف بە حاڵ بیسترا:

– لیزاڤێتا؟

– لیزاڤێتا دەی، کاکە هەمان ئەو ژنەی کە جلی دەفرۆشت، نەتدەناسی؟ دەهاتە ئەم خوارەش. جارێکیشیان کراسەکەتی پینە کرد.

ڕاسکۆلنیکۆف بەرەو دیوارەکە سووڕا و بەسەر کاغەزدیوارییە زەرد و چڵکنەکەوە، خۆی بە گوڵێکی سپیی ناشیرینەوە خەریک کرد کە هێڵی قاوەیی پێوە بوو و چووە بنجوبناوانی تا بزانێت چەند دانە پەڕەی هەیە، هەر پەڕەیەک چەند چەماوەی هەیە و چەند هێڵ. بە

چەشنێک دەست و پێی بێهەست بووبوو وەک ئەوەی هی خۆی نەبن و ئەسڵەن بڕابنەوە. هەوڵی نەدا بجووڵێت و هەروا کەللەڕەقانە لە گوڵە سپییەکە ڕاما.

زۆسیمۆڤ چەنەچەن بە ناڕەزایەتییەکی هەستپێکراوەوە قسەی بە ناستاسیا بڕی:

– ئەی لەم نێوەندەدا بۆیەچییەکە چییە؟

ناســـتاســـیا ئاهێکی هەڵکێشـــا و بێدەنگ بوو. ڕازومیخین هەر وا گەرموگوڕ درێژەی پێ دا:

– ئەی بە کوشتن تاوانبار کرا!

– یانی هیچ بەڵگەیەک شتێکیان لەسەر بۆیەچییەکە هەبوو؟

– بەڵگە؟ ئەرێ هەلاهەلا! بەڵگەیەکیـان هەبوو کە هەر بە بەڵگە نەدەچوو و ئێمەش کتومت بەدوای ئەوەوەین کە ئەمە بســـەلمێنین. وەک سـەرەتای ئەو جارەی لێ هاتووە کە ئەو دوو کەسـەیان تاوانبار کردن... ئەو کوخ و پیســـتریاکۆفە دەڵێم. هەر بە ڕاســـتی هەموو کارەکانیان دەبەنگانەن. ڕاسـتە ئێمە نە سـەری سـیرین و نە قونکی پیاز، وەلێ پیاو پەسـت دەبێ! لەوانەشـە ئەمشـەو پیسـتریاکۆف بێ... تەماشـا، ڕۆدیا، تۆش بێگومان بەسـەرهاتەکەت بیسـتووە، پێش ئەم نەخۆشـییەت بووە؛ تۆ ڕێک ڕۆژێ دواتری، کاتێ لە بنکەی پۆلیسـدا باسیان کردووە، تۆ کەوتووی...

زۆســـیمۆف زۆر کونجکۆلانە ســـەیری ڕاســـکۆڵنیکۆفی کرد. بەڵام ڕاسکۆڵنیکۆف وەرنەسووڕا.

زۆسیمۆف ئاماژەی پێ کرد:

– بەینی خۆمان بێ، هەر بە ڕاستی تیاماوم کە تۆی کونجکۆڵ چۆن دەچی و لە هەموو بابەتێکدا خۆت هەڵدەقورتێنی!

ڕازومیخین مستێکی بە مێزەکەدا کێشا و قیڕاندی:

– لەوانەیە کونجکۆڵ بم، وەلێ خۆ کابرا ڕزگار دەکەین، جا دەشبینی! درۆودەلەسەی ئەمانە لە خۆیدا هێندە ئازاردەر نییە. دەکرێ لە درۆ خۆش ببی. درۆ لە بنەڕەتەوە بابەتێکی دڵخۆشکەرە، چونکە ئەوپەڕی هەمووان دەگەیەنێتە حەقیقەت... بەس مرۆڤ ئەو کاتە دەبێ کە ئەمانە درۆ دەکەن و درۆکانی خۆشیان دەپەرەستن... ئەم پارفێرییە ڕێز و حورمەتێکی زۆری لای من هەیە، وەلێ... لات وایە بە بۆنەی چییەوە هەر سەرەتا بەلاڕێدا چوون؟ دەرگەی ماڵەکە سەرەتا کڵۆم کراوە، بەس کاتێ ئەو دووانە لەگەڵ قاپچی دەگەڕێنەوە سەرێ، کراوە بووە! کەواتە بەو ئەنجامە گەیشتوون کە کوخ و پیستریاکۆف بکوژن. یانی بە گشتی ژیرییان هەر ئەوەندە بڕی کردووە!

– جا پێویست ناکا تۆش دەیری ببی! تەنیا دەستبەسەرن، خۆ نەدەکرا هیچ بە هیچ بێ! من کوخی بوودەڵەشم دیوە. پێشتر کاروباری ئەوە بووە کە لای پیرێژنەکە ئەو شتانە بکڕێتەوە کە لە گرەو دەرنەهێنراون؟ ڕاستە؟

– ئەرێ، کابرا کڵاوچییەکە هەر نەبێتەوە. زۆرئەستێنیش[1] دەکا. لەم کارەدا وەستایە. بەس واز لە کوخ بێنە! دەزانی چی هارم دەکا؟ ئەو سیستمە پواو و دڵتێکەڵهێنەی سەردەمی چاخی بەردینیان!... دەکرا

---

١. زۆرئەستێن: ئەو کەسەی ماڵ و سامانی بەگێچەڵ، یان چەک و پسوولەی هەڵگەڕاوە، بە هەرزان لە خاوەنەکانیان دەکڕێت، تا لە ڕێی یاسا یان بە هەڕەشەوگوڕەشە بیکاتە پارە و قازانج بکات. لەبەرانبەر وشەی «شرخر»ی فارسی دامناوە.

ئەم دۆسـییەیە ڕەوشـێکی تازە لەگەڵ خۆیدا بهێنێ، دەکرێ تەنیا و تەنیا بە یارمەتیی زانیاریی دەروونناسانە شوێنپێی بکوژی ڕاستەقینە هەڵبکەی. دەڵێن *ئێمە دەسـتمان بە چەند ڕاسـتییەک ڕاگەیشـتووە!* وەلێ حەقیقەت بە تەنیـا ٤ کەلکێکی هەیە! نیوەی بـابەتەکە ئەوەیە بزانیت چۆن حەقیقەت لێک بدەیتەوە!

– یانی تۆ خۆت دەتوانی ڕێک لێکی بدەیتەوە؟

– ڕەنگە منیش بە تەواوی دەرەقەتی نەیێم، وەلێ خۆ ناکرێ بێدەنگ بی! بەتایبەت کاتێ کە هەستێکی بەهێز لە قووڵاییتدا هەیە و دەڵێ لەم نێوەندەدا کارێکت لەدەست دێ، تەنیا ئەگەر... ئاخ!... باشە وردەکاریی دۆسییەکە دەزانی؟

– من هێشتا چاوەڕێم مەسەلەی بۆیەچییەکە ببیستم.

– ئەها، ئەرێ! خۆی بەسـەرهاتەکە بەم جۆرەیە: سـەرلەبەیانیی سـێیەمین ڕۆژی دوای کوشـتنەکە کە پۆلیس هێشـتا یەخەی کوخ و پیسـترياکۆفی گرتبوو، بابەتێکی پێشـبینینەکراو ئاشـکرا بوو. جارێ با واز لەوە بێنین کە کوخ و پیسـتریاکۆف هەموو شـتێکیان ڕوون کردبووەوە و کارەکەشـیان زۆر ماقووڵ بوو. کابرایەکی لادێیی بە نـاوی دوشـکین کە لەبەرانبەر بینـاکەدا مەیخـانەیەکی هەیە، سندووقچەیەکی گەوهەرات دەهێنێتە لای پۆلیس کە یەک دوو گوارەی ئـاڵتوونی تێدا بووە و هەنـدێ هەڵیتوپەڵیت پێکەوە دەنێ کە *پێرێ، نزیکەی هەشتی شـەو*... ئێسـتە من کە خەریکی باسـکردنیم، تۆ ئاگات لای ڕۆژ و کاتەکەی بێ تەنیا! *بۆیەچییەکی گەڕۆک بە ناوی میکۆلای کە هەمان ڕۆژ دیسـان هاتبووەوە لای من، ئەم سـندووقچەی گوارە ئاڵتوونی و بەردینەی هێنا و لەبەرانبەردا داوای دوو ڕۆبڵی لێ کردم. پرسـیم لە کوێت هێناوە، گوتی لە شـەقام دۆزیومەتەوە. منیش ئیتر زۆر لەسەری نەڕۆیشتم*... ئاگاداری؟ وا کتومت بەسەرهاتی دوشکینت

بۆ دەگێڕمەوە... منیش ئەسکەناسێکم داین... مەبەستی ڕۆبڵێکە!... ئاخر بیرم کردەوە گەر لای من نەیخاتە ڕەهنەوە، بێگومان دەیبات بۆ شوێنێکی تر. کەواتە باشتر وایە لای خۆم بێ. ئاخر وەک دەڵێن خێر بۆ خوێش نەک بۆ دەروێش و بە خۆمم گوت گەر ئاقیبەت شتێکیش ئاشکرا بوو و قسەوباسێکم بەر گوێ کەوت، دەیبەم بۆ لای پۆلیس... هەڵبەتە ئەمانە هەموو قسەی بێسەروبەرەن و چیرۆکی داپیرەکانن. خوێڕییە درۆ دەکا وەک سەگ. من ئەم دوشکینە چاک دەناسم، بارمتە وەردەگرێ و ماڵی دزیاریش دەکڕێ و دڵنیا بە ئەو متومووروووە سی ڕۆبڵییەی بۆ ئەوە لە چنگی میکۆلای دەرنەهێناوە تا ڕادەستی پۆلیسی بکا. ترسی لێ نیشتووە، هەر ئەوەیە. بەهەرحاڵ ئەمە گرنگ نییە. با بگەڕێینە سەر بەسەرهاتی دوشکین... من هەر لە منالییەوە ئەم موژیکە دەناسم، میکۆلای دیمنتییێف، هاوشارمە، هەر دووکمان خەڵکی پارێزگەی زارایسکین، ریازانیین ئاخر. میکۆلای ئارەقخۆر نییە، وەلێ جاروبار گەرووێک تەڕ دەکا. دەمزانی لەو بینایەدا خەریکی ئیشە، لەگەڵ میتری خەریکی کاری بۆیاخ بوون. میتریش هاوشاریی ئێمەیە. بە کورتییەکەی هەر کە گەلاکەی لێ وەرگرتین، ورردی کردەوە، یەک دوو پێکێکی هەڵدا و باقیی پارەکەی هەڵگرت و بۆی دەرچوو. وەلێ لەو کاتەدا میتریی لەگەڵ نەبوو. ڕۆژێک دواتر بیستم کەسێ بە تەور ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا و خوشکەکەیی کوشتووە. ئەو دوو خوشکەم دەناسین. دەمودەست بە گومانەوە گوارەکانی میکۆلایم بیر هاتنەوە، ئاخر دەمزانی خوالێخۆشبووە بارمتەی وەردەگرت و پارەی بە قەرز دەدا. چوومە ناو بیناکە و ملوموشێکی چاکم کرد، هیچیشم بە کەس نەگوت. بەر لە هەر کەسێک پرسیم: میکۆلای لێرەیە؟ میتری لەوێ بوو و پێی گوتم کە میکۆلای زۆری خواردووەتەوە و لەگەڵ قووقەی کەلەشێر بە بەدمەستی هاتووەتەوە ماڵێ، وەلێ دە خولەکێک ماوەتەوە و هەمدیسان چووەتەوە دەر و ئیتر دەرنەکەوتووەتەوە. میتری ئەوی نەدیوەتەوە و خۆی کارەکەی تەواو کردووە. دەی، ئەوانیش هەر لەوێ

ئیشـیان دەکرد، لەبەردەم هەمان ئەو پلیکانەڕێیەدا کە دەچێتەوە سـەر شـوێنی کوشـتنەکە، یانی لە نهۆمی دووەم. لەگەڵ بیستنی ئەمانەشـدا هەر دەمم نەکردەوە و هیچم ئاشـــکرا نەکرد... ئەمە بەســـەرهاتی دوشـــکینە ها... وەلێ تا توانیم لەبارەی کوشـــتنەکەوە زانیاریم کۆ کردەوە و هەروا دوودڵانە چوومەوە ماڵێ. ئەمڕۆ هەشـــتی بەیانی... ڕۆژی سـێیەم بووە ئیتر، خۆ ئاگاداری... سـەیر دەکەم میکۆلای هاتە ژوورەوە، هەر وا بێهۆش بوو وەلێ نەک بەدمەســـتیش، یـانی کە دەتدواند تێدەگەیشت. بە کورتییەکەی هات و لەسەر سەکۆکە دانیشت و ورتەی لێوە نەهات. لەو کاتەدا مەیخانەکە مشـــتەرییەکی وای تێدا نەبوو، تەنیـا مشـــتەرییەکی غەوارەمـان هەبوو و دانەیەکی تر کە نـاســـیاوە و بەســـەر نیمۆکۆتەکەوە خەوتبوو و لەگەڵ دوو دانە شاگردماندا. من دەستم پێ کرد و گوتم: ئەرێ میتریت نەدیوە؟ گوتی: نا، نەمدیوە. گوتم: یانی لێرەش هیچ سـەرت لێ نەدا؟ گوتی: لە پێرێوە نا. گوتم: ئەی دوێنێشـــەو لە کوێ نووســـتی؟ گوتی: لە پێســـکی بووم، لەگەڵ پیاوەکانی کالۆمینســـکی. گوتم: ئەو گوارانەت لە کوێ هێنان؟ گوتی: لە شـــەقام دۆزیمنەوە (بە کورتییەکەی بە جۆرێکی ســـەیر وەڵامی دامەوە و سـەیری ناوچاوانیشـمی نەکرد). گوتم: بیسـتت هەر هەمان ڕۆژ عەســـرەکەی، ڕێک هەمان کاتژمێر، لە هەمان پلیکانەڕێدا چی بووە؟ گوتی: نا، نەمبیستووە. جا بە درێژایی ئەو ماوەیە گوێی لە بەسـەرهاتە گرت، چاوانی لە کاسـەوە دەرپەڕیبوون و ڕەنگیشـی ڕێک وەک گەچ ســـپی هەڵگەڕابوو. لە نووکەوە بۆ نووک بۆم گێڕایەوە. کڵاوەکەی هەڵگرت و هەســـتایەوە تا بڕوا. دەمویســـت جارێ ڕایگرم، گوتم: دەی جارێ ڕاوەســـتە میکۆلای! خۆ پێکێک هەڵدەدەی، ها؟ ئاماژەم بۆ شـــاگردەکەم کرد تا ئاگاداری دەرگەکە بێ و خۆیشـــم لەپشـــت پێشـــخوانەکە هاتمە دەر، وەلێ میکۆلای هەروەکوو تیر لە جێگەکەی دەرپەڕی و بۆی دەرچوو و تا پێچی سـەر شـەقامەکە چوو

*و خۆی بە کۆلانەکەدا کرد. ئیتر نەمبینی. بەمەش دڵنیای کردمەوە کە هەموو شتێ لە ژێر سەری خۆیدایە...*

زۆرسیمۆف گوتی:

– دەی، دیارە ئیتر...

– جارێ بوەستە! کۆتاکەی ببیستە. هەڵبەتە دونیا گەڕان بەدوای میکۆلایدا. دەستبەجێ دوشکینیشیان گرت و ماڵەکەیان پشکنی. میتریش دەستگیر کرا و پیاوەکانی کالومیسنکیشیان هەڵواسین تا شتێکیان لێ دەربێنن! دواجار پێرێ، میکۆلایان لە میوانخانەیەکی سەرەڕێدا دۆزییەوە، لە نزیک دەروازەی ئەوسەری شارەوە، دواتریش دەستبەسەریان کرد. وا دیارە چووەتە ئەوێ و خاچە زیوینەکەی لە ملی کردووەتەوە و ویستوویەتی لەبەرانبەریدا ئارەقی بدەنێ. مامەڵەکە دەکرێ، وەلێ چەند خولەکێک دواتر ژنێکی لادێیی دەچێتە گەوڕ و لە درزی دیوارەوە دەبینێ کە میکۆلای بە قایشەکەی ئەڵقەیەکی دروست کردووە و بە گیرەی میچەکەیەوە هەڵواسیوە، خۆی چووەتە سەر چەند پارچە تەختەیەک و هەوڵ دەدات ئەڵقەکە بکاتە ملی. ژنە دەیکاتە هەڵا و خەڵکی دەڕژێنە ژوورێ کە *باشە تۆ لێرە خەریکی چ ناماقوولییەکی!* میکۆلای دەڵێ: بمبەن بۆ بنکەی پۆلیس بۆ لای فڵان و فیسار، دان بە هەموو شتێکدا دەنێم. جا ئەوانیش دەیبەنە لای پۆلیس –یانی ئەم بنکەیە– جا لەگەڵ لەشکرێک خەڵکدا. هەرچی هەیە و نییە لێی دەپرسن، بۆ تەمەنی ئەوە دەڵێ کە بیستودوو ساڵمە و... هەزار شتی تریش. دەپرسن: *فڵانە ڕۆژ و لە فڵانە کاتژمێر کە لەگەڵ میتریدا خەریکی ئیش بوون، هیچ کەسێکتان لە پلیکانەکەدا نەبینی؟* دەڵێ: *بێگومان کەسانێ بە پلیکانەکەدا هاتوچۆیان دەکرد، وەلێ من سەرنجم نەدان.* دەپرسن: *هیچیشت نەبیست؟ دەنگوهەرایەک شتێک بۆ نموونە؟* دەڵێ: *نا بە خوا، شتێکی وامان نەبیست ئێمە.* دەپرسن: *بیستت، کە هەمان ڕۆژ بێوەژن و خوشکەکەیان کوشت و دزییان لە ماڵەکەیان*

کرد؟ دەڵێ: *نا بە خوا، هیچ ئاگادار نەبووم. یەکەمین جار پێری بوو کە لە زمانی دوشکینەوە بیستم.* دەپرسن: *ئەو گوارانەت لە کوێ بوون؟* دەڵێ: *لە پیادەڕێ دۆزیمنەوە.* دەپرسن: *بۆچی بە یانییەکەی لەگەڵ میتری نەڕۆیشتییە سەر ئیشەکەت؟* دەڵێ: *ئارەقخواردنەوە...* دەپرسن: *لە کوێ ئارەقت خواردەوە؟* دەڵێ: *لێرە و لەوێ و لە فلانە شوێن.* دەپرسن: *بۆچی لە مەیخانەکەی دوشکین هەڵهاتی؟* دەڵێ: *دەی لەوە ترسام نەکا بمگرن!* دەپرسن: *یانی گەر هەڵەیەکت نەکردبووبا و هەستت بە گوناحباری نەکردبووبا، ئاوا دەتۆقای؟* بە کورتییەکەی ڕەنگە بڕوا نەکەی، وەلێ پرسەکانیان وشە بە وشە ئەمانە بوون. دڵنیام کە ئەمانە بوون، چونکە وەک خۆی بۆیان گێڕامەوە و سەرچاوەی باوەڕپێکراوم هەیە! ناچێتە ئەقڵەوە! ڕات چۆنە؟

– دەی هەر چۆنێک بووە کۆمەڵێک بەڵگە لە بەردەستدان.

– خۆ ئێستە قسە لەسەر بەڵگە نییە! من دەڵێم باشە ئەوە چ جۆرە لێپرسینەوەیەک بووە، هەر بە ڕاست ئەمانە خۆیان بە چی دەزانن؟ ئێ میکۆلای دەخەنە بەر ئەشکەنجە و وەها گوشاری دەخەنە سەر کە ئەویش دانی پێدا دەنێ: *لە شەقام نەمدۆزییەوە، هەر لەو ئەپارتمانەدا دۆزیمنەوە کە لەگەڵ میتری خەریکی بۆیەکردنی بووین.* دەڵێن: *کەواتە جوان باسی کە.* میکۆلایش دەڵێ: *ئێ من و میتری بە درێژایی ئەو ڕۆژە خەریکی ڕەنگکردنی دیوارەکان بووین و ئیتر خۆمان کۆ دەکردەوە تا بڕۆین، میتری قەڵەمموەکەی هەڵگرت و بە دەموچاومیدا هێنا و هەڵهات و منیش بەدوایدا. کەوتمە دوای، دەنگمم هەڵبڕیبوو و هاوارم دەکرد. لە خوارەوەی پلیکانەکاندا خۆم بەناو قاپچی و چەند بەڕێزێکی تردا کرد. ڕێک بیرم نییە چەند کەس بوون. قاپچییەکە جوێنی پێ دام و قاپچییەکەی تریش دامیە بەر قسەی ناشیرین، ژنی قاپچییەکەش هاتە دەرێ و جنێوبارانی کردین. جا بەڕێزێک لەگەڵ خاتوونێکی قورسوقۆڵدا لە بەردەرگەی سەرەکیی بیناکەدا بوون، لە*

*جنێو و قســەی پیســی پایەبەرزیشــیان بێبەش نەبووین، ئاخر من و دیمیتری ڕێگەکەیانمان گرتبوو. چنگم بە قژی دمیتریدا کردبوو و لە زەویم دابوو و کەوتبوومە گیانی. دمیتریش چنگی بە قژی مندا کرد و کەوتە لێدانم. وەلێ هەموو ئەمانە هاوڕێیانە و بۆ گاڵتە و پێکەنین بوون، قوربان، نەک ئەوەی هەر بە ڕاســتی شــێت بووبین و تەمای شەڕکردنمان هەبێ. پاشان دیمیتری دوور کەوتەوە و بە شەقامەکەدا ڕای کرد، منیش کەوتمە دوای، وەلێ نەمتوانی بیگرم و تەنیا گەڕامەوە ناو بیناکە، چونکە دەبوو وردەکەلوپەلەکانمان کۆ بکەمەوە. دەســـتم کردە کۆکردنەوە و چاوەڕێی دیمیتری بووم، کە کتوپڕ لە ڕێڕەوەکەدا، ڕێک لە لایەکی نزیک دەرگەکەوە، پێم بەو ســندووقچەیەدا نا. ســەیرم کرد لەوێ کەوتووە و بە کـاغەز پێچراوەتەوە. کـاغەزەکەم کردەوە، چەند قولاپێکی بچووکی پێوە بوو. قولاپەکانیشــم کردنەوە و چاوم بە گوارەکان کەوت...*

ڕاسکۆلنیکۆف کتوپڕ قیڕاندی:

– لەپشـــت دەرگەکە؟ لەپشـــت دەرگەکەوە کەوتبوو؟ لەپشـــتییەوە یانی؟

نیگای ڕســـیو و تۆقاویی لە ڕازومیخین بڕیبوو. بە گوشـــاری دەستەکانی خۆی بەرز کردەوە و دانیشت.

ڕازومیخینیش ڕاچەنی:

– ئەرێ دەی، لەپشــت دەرگەوە... ئەوە چیت لێ قەوماوە؟ مەسـەلە چییە؟

– ڕاسکۆلنیکۆف بە کزی وەڵامی دایەوە:

– هیچ نییە!...

جا هەمدیسان کەوتەوە سەر سەرینەکەی و ڕووی بەرەو دیوارەکە وەرگێڕایەوە. گشـتیان تا ماوەیەک بێدەنگ بوون. دواجار ڕازومیخین سەیرێکی پرسئامێزی زۆرسیمۆفی کرد و گوتی:

– وەنەوز بردوویەتییەوە... بێگومان نیوەبێدارە...

زۆسیمۆف سەرێکی لەقاند و گوتی:

– دەی، بەردەوام بە. دواتر چی بوو؟

– دواتر بەتەمـای چی بێ؟ میکۆلای هەر کە گوارەکـان دەبینێ، میتری و کەلوپەلەکەی بیر دەچنەوە، کڵاوەکەی لەسـەر دەکـا و ڕادەکاتە لای دۆشـکین و هەر بەو جۆرەی کە دەزانین، ڕۆبڵێکی لێ وەردەگرێ. درۆ دەکـا کە گوارەکـانی لە شـەقامـدا دۆزیونەتەوە. پاشانیش چووە بۆ ئارەقخواردنەوە. لەبارەی تاوانەکەی پێشتریشەوە دووبـارەی دەکـاتەوە: *هیچ زانیـارییەکم نییە، تـا پێرێ تەنـانەت هەواڵەکەشـم هەر نەبیستبوو.* دەپرسـن: *ئەی کەواتە بۆچی تا ئێستە نەهاتوویتە لای پۆلیس؟* دەڵێ: *ترسـابووم!* دەپرسـێ: *بۆ دەتویسـت خۆت بخنکێنی؟* دەڵێ: *لەتاو خەیاڵات.* دەپرسـن: *خەیاڵاتی چی؟* دەڵێ: *کە تاوانبار بکرێم بە کوشتن.* دەی، هەموو مەسەلەکە ئەمە بوو. ئێستە بە ڕای تۆ، ئەم بەڕێزانە لەم بەسەرهاتەوە بە ئەنجامێک گەیشتوون؟

– ڕای هیچ کەسـێ گرنـگ نییە. دواجـار ئەوانیش ئێسـتە سـەرەداوێکیان بەدەسـتەوەیە، با هێندەش سـەرەکی نەبێ، وەلێ هەرچۆنێک بووە خۆ هەیە. حەقیقەتیش هەر حەقیقەتە. ناتوانن واز لەم جەنابی بۆیەچییە بێنن و بڕوا، بە ڕای خۆت شتی وا دەکرێ؟

– ئێسـتە ئەمانە تەنیا لەبەر ئەوە وەک بکوژ دەسـتگیریان کردووە کە قیراندوویەتی! هیچ گومانێکیشیان نییە.

– قسـەی قۆڕە. تۆش زیاد لە ڕادە هەڵچووی. ئەی گوارەکان؟ گەر ئەو گوارانە، کە لە سـندووقی پیرێژنەکەدا بوونە، لە هەمان ڕۆژ و هەمان کاتدا کەوتوونەتە دەستی میکۆلای، دەی کەواتە ئەمە هەر وا لە خۆڕا نییە! یانی ئەمە پەسـەند ناکەی؟ لە وەها دۆسـییەیەکدا، ئەمە لە خۆیدا زۆرە!

ڕازومیخین هاواری کرد:

– ئاخر چۆن بەم ئەنجامە گەیشـتن؟ چۆنچۆنی؟ خۆ تۆ، لای خۆی بە ناخێری گیانت پزیشکی و ئەرکت ئەوەیە سەرنجی مرۆڤەکان بدەی و زیاتر لە هەر کەسـێ توانا و دەرفەتت لەبەردەمدایە تا سـرووشـتی مرۆڤ بناسـی، تۆ چۆن بەم هەموو ڕوونکردنەوە و شـیکردنەوەیەوە لە کەسـایەتی و سـرووشـتی ئەم میکۆلا ماڵوێرانە نەگەیشـتی؟ هەر بە ڕاسـت یانی هەر لە سـەرەتای لێپێچینەوەکەوە تێنەگەیشـتی کە وەڵامەکانی میکۆلای کتومت ڕاسـت بوونە؟ گوارەکان هەر بە ڕاسـتی بەو جۆرە کەوتوونەتە دەسـتی کە بـاسـی دەکـا، یـانی پێی بە سندووقچەکەدا ناوە و پێی زانیوە و هەڵیگرتووەتەوە.

– سـەیرە، هەر بە ڕاسـتی! باشـە هەر خۆت نەبووی کە گوتت یەکەمین جار درۆی کردووە؟

– گوێ بگرە چی دەڵێم من، هۆشـت لام بێ! قـاپچی و کوخ و پیستریاکۆف و قاپچیی دووەم و ژنی قاپچیی یەکەم و ئەو ژنەتیوەش کە لە ژوورۆچکەی قاپچییەکە دانیشـتووە و کریۆکۆفـناوێک کە هەر هەمان کات لە گالیسـکە دابەزیوە و لەگەڵ چەند خانمخاسـێکدا کە باسکیان گرتووە بە دەرگەی سـەرەکیدا تێدەپەڕێ، یانی هەشـت تا دە شـاهێد، پێکڕا هـاودەنگن کە میکۆلای میتریی بە زەویـدا داوە و کەوتووەتە سـەری و تێی بەربووە، میتریش چنگی بە قژی میکۆلایدا کردووە و خەریکی لێدانی بووە. ڕێک لە ناوەڕاسـتی گۆڕەپانەکەدا

کەوتوون و ڕێگەکەیان گرتووە. لە هەموو لایەکیشـــەوە جنێوبارانیان دەکەن و ئەوانیش هەر وا بە گوتەی شاهێدەکان، *هەروەک منال* شوێن یەک کەوتوون و ڕایان کردووەتە سەر شەقامەکە. ئێستە چاک سەرنج بدە. کە بەسەر تەرمەکاندا چوون، هێشتا گەرم بوونە، بیستت؟ هێشتا گەرم بوونە! گریمان میتری و میکۆلای، یان تەنیا میکۆلای، ئەوانی کوشـتووە و چووەتە سـەر سـندووق و جانتاکە، یان هەر بە تەنیا لە دزییەکەدا بەژدار بووە، وەلامی ئەم پرســـیارەی من بدەرەوە: باری دەروونیی ئەم دوو کەســـە، قیرەوهوڕیـان، فیلەفیلی پێکەنین و دەســـتەویەخەبوونی منالانەیان لەبەردەم دەرگەی ســـەرەکیدا بە هیچ جۆرێ لەگەڵ تەور و خوێنڕێژی و تەڵەکەبازیی شـــەیتانانە و دزیدا یەک دەگرێتەوە؟ کوشـــتنەکە لە هەمان ئەو کاتەدا ئەنجام دراوە، نەک تەنانەت پێنج یان دە خولەک پێشـتری، چونکە تەرمەکان هێشـتا گەرم بوونە! کەواتە ئەوان لە هەمان ئەو کاتەدا کە تووشـی تاوانی کوشـتن بوونە، دەرگەی ئەپارتمانەکە دەخەنە ســـەر پشـــت، چونکە دەزانن خەڵکی دەســـتبەجێ دەڕژێنە ئەو نـاوە، مـاڵە دزیـارییەکەش دەخەنە لایەکەوە و وەک منال بەر دەبنە یەکتری و بەســەر زەوییەوە تەپاوتلە دەکەن و پێدەکەنن و سەرنجی دونیا بۆ خۆیان ڕادەکێشن؟ دەی ئەمە دەکرێ؟ دە دوازدە شـــاهێدیش هەن ســـوێند دەخۆن ئەم دیمەنەیان دیوە!

– هەڵبەتە مەســـەلەکە زۆر ســـەیرە! هەر بە ڕاسـتیش ڕێی تێناچێ، وەلێ...

– نـا، کـاکی خۆم. ئیتر *وەلێی* پێنـاوێ. گەر ئەو گوارانەی کە لە هەمـان ڕۆژ و کـاتژمێری تـاوانەکەدا کەوتوونەتە دەســـتی میکۆلای، بەڵگەیەکی گرنگ بێ لە دژی ئەو، گەرچی لام وایە ڕوونکردنەوەکەی وەک پێویســـت و بەکەڵکە و ناتوانرێ هەر بە جددی لەدژی بەکار بهێنرێن، ئەرێ، دەمویســـت بڵێم، گەر ئەمـانە بەڵگەیەکی گرنـگ بن،

کەواتە دەبێ ئەو ڕاســــتیانەش لە بەرچاو بگیرێن کە بێتاوانیی ئەو دەســـەلمێنن، بەتایبەت لەبەر ئەوەی کە ناکرێ نکۆڵییان لێ بکرێ. تۆ، بە ســەرنجدان لە باری یاساوڕێسـای دادوەریی ئێمە، لات وایە ئەوان پەسەندی دەکەن، یان ئەسڵەن لە هەلومەرجێکدان پەسەندی بکەن! ئەم مەسەلەیە لەبەر ئەوەی لە دیدگەی دەروونناسییەوە نەکردەیە، کەواتە بە حەقیقەتێکی بێچەندوچۆن ئەژمار دەکرێ و پاشـــانیش بێین و ئەو هەموو بەڵگە و شاهێدە بە با بدەین کە لە سکالانامەیەکدا لە دژی ئەو هەن؟ نا، دیارە کە پەســــەندی ناکەن. ڕێی تێناچێ پەســــەندی بکەن، چونکە ســـندووقچەی گەوهەراتەکەیان دۆزیوەتەوە و ئەو خوێڕییەش ویســـتوویەتی خۆی بخنکێنێ، لە بەرخۆیانەوە هەر بەو ئاســانییە بیر دەکەنەوە: *گەر تاوانێکی لێ نەوەشــاباوە و هەســـتی بە گوناحباری نەکردبا، هەڵبەتە ئاوها نەدەتۆقا!* جا تێبگە کە پوختەی مەســـەلەکە ئەوەیە و منیش هەر لەبەر ئەوە ئاوها هەڵچووم.

– بەڵێ، وا دەبینم کە هەڵچووی! ئەرێ بیرم چوو لێت بپرســـم، ئەسڵەن چ بەڵگەیەکیان بۆ ئەوە هەیە کە گوارەکان هی پیرێژنەکەن؟

ڕازومیخین ناوچاوی گرژ کرد و ئەوپەڕی ناڕەزایی لە دەنگیدا دیار بوو:

– ئەوە ئیتر ســەلمێنراوە کە ســندووقچەکە هی پیرێژنە بووە. کوخ ســـندووقچەی گەوهەراتەکەی نـاســــیوەتەوە و تەنـانەت نـاوی خـاوەنەکەشــــی گوتووە. کـابراش ســــەلمـاندوویەتی کە خـاوەنی سندووقچەکەیە.

– شــــتێکی خراپە. وەلێ خـاڵێکی دیکەش هەیە. ئەی کـاتێ لە ســـەرەتاوە، کوخ و پیســـتریاکۆف لە پلیکانەکانەوە دەچوونە ســـەرێ، هیچ کەسێ میکۆلای بینیوە؟ شایەتێک، بەڵگەیەک، شتێک هەیە؟

ڕازومیخین هەڵچووانە وەڵامی دایەوە:

– نا، هیچ بنیادەمێک میکولای نەدیوە و نەگبەتییەکەش ئائەوەیە! تەنانەت کوخ و پیستریاکۆفیش لە کاتی سەرکەوتن بە پلیکانەکاندا، سەرنجیان نەچووەتە سەر بۆیەچییەکان، لەوە گەڕێ کە ئەگەر بشیاندیتبان، شایەتیدانیان بایەخێکی وەهای نەدەبوو. گوتوویانە دیویانە کە دەرگەی ئەپارتمانەکە کراوەتەوە و وا دیاربووە لە ناوەوە خەریکی ئیش بوونە، وەلێ سەرنجێکی ئاوهایان نەداوە و ناتوانن بڵێن هەر بە ڕاستی کەسێک لەوێ خەریکی ئیش بووە یان نا.

– ئمممم!... کەواتە تاکە بەڵگە بۆ بەرگریکردن ئەوەیە کە ئەوان خەریکی لێدانی یەکتری و قەشمەریات بوونە. دەکرێ ببێتە گریمانەیەکی بەهێز وەلێ... خۆت ڕووداو و ڕاستییەکان چۆن لێک دەدەیەوە؟ گەر میکۆلای گوارەکانی لەوێ دۆزیونەتەوە، ڕاستیی مەسەلەکە چی بووە؟

– خۆم چۆن لێکی دەدەمەوە؟ چی هەیە تا لێکدانەوەی بوێ؟ هەموو شتێ ڕوونە! پێویستی بە لێکدانەوە نییە، تەواو دیارە، سندووقچەی گەوهەراتەکە هەموو شتێ ڕوون دەکاتەوە. بکوژی ڕاستەقینە گوارەکانی لێ کەوتوون. کاتێ کوخ و پیستریاکۆڤ لە دەرگە دەدەن، ئەو لە سەرەوە دەرگەی لەسەر خۆی کڵۆم کردووە. ئەم کوخەش، کە دیارە پوخیش نییە چ جای کوخ، لەپشت دەرگەکەوە چاوەڕێ نامێنێ و بکۆژەکەش فرکە دەکاتە دەر و بەرەو خوارێ هەڵدێ. خۆ هیچ ڕێگەیەکی دیکەی نەبووە بۆ هەڵهاتن. دەمودەست دوای ئەوەی کە میتری و میکۆلای لە ئەپارتمانەکە دەردەچن، بکوژ دەچێتە هەمان ئەپارتمان تا خۆی لە چاوی کوخ و پیستریاکۆف و قاپچییەکە بشارێتەوە. لەوێ ماوەتەوە تا قاپچی و ئەوانی دیکە بچنە سەرێ و هێندە ماتڵ بووە تا ئیتر دەنگیان نەماوە. پاشان سووک و ئاسان ڕێکەی گرتووەتە بەر و چووەتە خوارێ، ڕێک هاوکات میکۆلای و میتری ڕادەکەنە سەر شەقامەکە و ئیتر هیچ کەسێ لە گۆڕەپانەکەدا

نەبووە. پێدەچێ ئەویان دیبێ، وەلێ بەهەندیان وەرنەگرتووە. ئاخر دونیایەک خەڵک دەچێتە ناو ئەو بینایە و دێتە دەر. سندووقچەکەش ڕێک لە کاتێکدا لە دەستی کەوتووە کە لەپشت دەرگەی ئەپارتمانە خاڵییەکەوە گوێی هەڵخستووە و بە کەوتنی سندووقچەکەشی نەزانیوە، چونکە بیری بە شتگەلێکی دیکەوە قاڵ بووە. سندووقچەی گەوهەراتەکە بەڵگەیەکی بەهێزە کە نیشانی دەدا بکوژ لەوێ ڕاوەستاوە.. من ڕووداوەکان بەم جۆرە دەبینم.

– ئای لەو ژیرییە! نا، کاکی خۆم، تۆ بێتام زیرەکی. ئیتر ئەوە ئەوپەڕی زیرەکییە!

– ڕێک مەبەستت چییە، چۆن؟

– ئاخر هەموو شتێ زۆر ڕێکوپێکە و... پارچەی ڕووداوەکان زۆر بە وردی خراونەتە پاڵ یەک... بە جۆرێک لە جۆرەکان هەر دەڵێی شانۆنامەیە!

ڕازومیخین بە گوڕوتینەوە دەستی پێکرد:

– ئاخ کە!

وەلێ ڕێک لەم ساتەدا دەرگە کرایەوە و کەسێ هاتە ژوورێ کە بۆ هەموو ئامادەبووان نەناسراو بوو.

## پێنج

تـازە هـاتووەکە بەڕێزێکی تـا ڕادەیەک گەنج بوو، بەقەڵافەت، . ڕوواڵەتێکی وشک و ڕەق، بە سرووشتێکی واسواس و پارێزکارانەوە. هەر لە یەکەمین هەنگاودا، لە ئاســـتانەی دەرگەکەدا ڕاوەســـتا و بە حەپەســـانێکی دیار و دڵگرانانەوە واقووڕ کەوتە تەماشـــاکردنی چواردەوری؛ دەتگوت خەریکە لە خۆی دەپرســـێت *باشـــە ئێرە چ دۆزەخێکە؟* لەوپەڕی بێمتمانەیی و لە بارێکدا کە وا دیاربوو نیشـــانی دەدا ترســاوە و تەنانەت ســووکایەتیشــی پێ کراوە، ژووورە تەسـک و تاریک و نزمەکەی ڕاسکۆڵنیکۆفی (ژووری کەشتی) هەڵسەنگاند. هەر بە هەمان ســەرســووڕمانەوە لە ڕاسکۆڵنیکۆف ڕاما کە جلی دەرەوەی لە بەردا نەبوو و بە ســەروقژێکی بژاوەوە لەســەر قەنەفە پیســەکەی ڕاکشـــابوو و بەودا واق بووبوو. پاشـــان هەر بە هەمان لێبراوییەوە، بەژنی قلۆر و ســـەروســـیمای نارێکوپێک و ڕیشـــی نەتراشـــراوی ڕازومیخینی خســـتە ژێر زەرەبینەوە و ڕازومیخینیش بێ ئەوەی لە جێگەی خۆی بجووڵێت، ڕوودار و پرســـیارکەر چاوی لە چاوی تازەهاتووەکە بڕیبوو. بێدەنگییەکی قورس باڵی کێشـا و خولەکێکیشـی خایاند و، پاشـان، ڕێک هەر بەو جۆرەی گریمانەی دەکەین، ڕوواڵەتی دیمەنەکە گۆڕا. بەڕێز پـایەبەرزی تـازەهـاتوو کە وا دیـاربوو بە لەبەرچاوگرتنی ئەو نیگا ڕوونانە، فامیبوو گەر بیەوێت لەم ژوورەدا ئەوانی دی بڕەنجێنێ، هیچ شـــتێکی دەســـت ناکەوێت، کەمێک ڕووی کرایەوە و بەڕێزانە و هەر وا تا ڕادەیەک ڕەق و وشـــک ڕووی لە

زۆسیمۆف کرد و هەر وشەیەکی بە جەختلەسەرکردنەوەیەکی زیادەوە دەربڕی:

– جەنابی ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ ڕاسکۆڵنیکۆف، خوێندکار یان... کۆنە خوێندکار؟

زۆسیمۆف کورتە جووڵەیەکی کرد و بێگومان وەڵامی تازەهاتووەکەی دەدایەوە، تەنیا ئەگەر ڕازومیخین دەستپێشخەریی نەکردبا:

– ئەوەیانە کە لەسەر قەنەفەکە کەوتووە! ئەمرتان؟

گوتنی ئەم *ئەمرتان*ــە خۆمانەییە، بۆ خانەدانە پرکەشوفشەکە وەک ئەوە وابوو دواگوڵلەی پێوە بنێیت. خەریک بوو ڕووی لە ڕازومیخین دەکرد، وەلێ لە کاتی خۆیدا بەری بە خۆی گرت و هەمدیسان ڕووی لە زۆسیمۆف کردەوە.

زۆرسیمۆف لەژێر لێوەوە گوتی، *ئەمان ڕاسکۆڵنیکۆف*ن و ئاماژەی بۆ ئەو کرد. جا پاشان باوێشکێکی دوور و درێژی دا و تا بناگوێ دەمی دادڕی و تەمبەڵانە دەستی بە گیرفانی هێلەکەیدا کرد و کاتژمێرێکی ئاڵتوونیی گەورەی دەرهێنا کە بەرگێکی تایبەتی ڕاوچیانی هەبوو، جا کردییەوە تا بزانێت کاتژمێر چەندە و ئەوسا هەر بە هەمان تەمبەڵی و خاوییەوە، خستییەوە شوێنی خۆی.

خودی ڕاسکۆڵنیکۆفیش بە بێدەنگی لەسەر پشت کەوتبوو و مکووڕانە چاوی لە غەوارەکە کلا نەدەکرد، گەرچی نەشیدەزانی چی بە چییە. ئێستە کە ڕووی لەو گوڵە بێشێوەیەی کاغەزدیوارییەکە نەبوو، ڕەنگپەڕیوییە بێڕادەکەی دیار بوو و بە ڕووخسارییەوە ئاسەواری ئێش و ناسۆری دەبینرا، دەتگوت ڕێک لە هەمان ئەو ساتەدا نەشتەرگەرییەکی پرئازاری تێپەڕاندووە یان بە پێچکی ئەشکەنجەوە کردوویانەتەوە. بەڵام تازەهاتووەکە بەرەبەرە سەرنجیی

ڕاکێشا و جا بەدواشیدا سەراسیمەیی، بەدگومانی و تەنانەت ترسی تێدا وروو‌ژاند. زۆسیمۆف کە گوتی *ئەمان ڕاسکۆلنیکۆفن*، خۆیشی دەستبەجێ لە جێگەکەی ڕاپەڕی و لەسەر قەنەفەکە دانیشت و بە قین و دەنگێکی پچڕاو و کزەوە گوتی:

– بەڵێ، من ڕاسکۆلنیکۆفم. فەرمایشتێکتان هەبوو؟

میوانەکە بە سەرنجێکی زۆرەوە لێی ورد بووەوە و بە شێوازێکی پڕ لە شکۆ و کاریگەرەوە گوتی:

– منیش پیۆتەر پیترۆڤیچ لوژنم. هیوادارم و، هەڵبەتە چەند هۆکارێکیشم بۆ ئەم هیواداریە هەیە، کە ناوم بۆ ئێوە نائاشنا نەبێ؟

وەلێ ڕاسکۆلنیکۆف کە چاوەڕێ بوو شتێکی دیکە ببیستێت، بێباکانە و خەیاڵاوی سەیرێکی کرد و وەڵامی نەدایەوە، وەک ئەوەی یەکەمین جار بێت ناوی پیۆتەر پیترۆڤیچ لوژنی بەر گوێ بکەوێت.

لوژن کەمێک پەشۆکا:

– یانی تا ئێستە هەواڵتان پێ نەگەیشتووە؟ ڕێی تێناچێ!

ڕاسکۆلنیکۆف لە وەڵامدا، بە بێزاری سەری خستە سەر پشتییەکە و دەستەکانیی نانە پشت سەری و لە بنمیچەکە ڕاما. ترس و دڵەڕاوکێ بە ڕووخساری لوژنەوە دیار بوو. زۆسیمۆف و ڕازومیخین پرسیارئامێزانەتر لە جاران لەو ڕامان و لوژن دواجار نیشانەگەلی دڵگرانیی پێوە دەرکەوتن و زمانیشی گیرابوو:

– من... من لای خۆمەوە وام حسێب کرد نامەیەک کە دە ڕۆژ لەمەوبەر پۆست کرابوو، جا گەر نەشڵێین دوو حەفتە لەمەوبەر...

ڕازمیخین کتوپڕ پەڕییە نێو قسەکانی:

– باشـــه بۆ لەبەردەم دەرگەدا؟ گەر قســـەیەکتان هەیە، فەرموون دانیشـــن و قســـەکەتان بکەن. بۆ ئێوە و بۆ ناســـتاســـیا ئەوێ زۆر تەسکوترووسکە ئاخر! ناستاسیا، ئادەی خۆت لادە. فەرموون، ئەوەش کورسی، وەرنە ژوور!

ڕازومیخین کورسییەکەی کشاندە دواوە و مەودایەکی کەمی خستە نێوان ئەژنۆکانی و مێزەکەوە، خۆی وێک هێنایەوە تا میوانەکە بێتە ژوور. وەهاش هەموو شـتێکی ڕێک خسـت کە کەڵلەڕەقیکردن ئاسـتەم بوو. میوانەکە پەلە و بەدەم سـەرسـمدانەوە خۆی خزاندە ژووریێ. کە گەیشتە کورسییەکە، دانیشت و فرە ڕەشگومان لە ڕازومیخینی ڕوانی.

ڕازومیخین دەسبەجێ گوتی:

– جا پێویسـت ناکا ئێوە پێی تێک بچن! ڕۆدیا لانیکەم پێنج ڕۆژێک دەبێ کە نەخۆش بووە و تا و وڕێنە و ئەم جۆرە شـــتانە، بەس وا خەریکە بـاش دەبێتەوە و ئیشــــتهـاشـــی کراوەتەوە. ئەمـانیش دکتۆرەکەیانن، کە تازە پشـکنینیان بۆ کردووە. منیش هاوڕێیم و وەک خۆی خوێندکار بووم و وا ئێسـتەش پەرسـتاریی دەکەم. کەواتە گوێ بە ئێمە مەدەن، براڵە. شەرم مەکەن و قسەی خۆتان بکەن.

– سـوپاسـی ئێوە دەکەم. وەلێ نەکا لێرەبوونم و قسـەکردن لەگەڵ نەخۆشەکەمان بۆ ئەو باش نەبێ؟

ئەمەی لە زۆسیمۆف پرسی و زۆسیمۆف لەژێر لێوەوە گوتی:

– نـا، کێشـــە نییە. بەڵکوو بشـــبنە هۆی ئەوەی هۆشـــی لای نەخۆشییەکەی نەمێنێ و تەواو بێتەوە سەر خۆی.

جا هەمدیسان باوێشکی دا.

ڕازومیخین لەسەری ڕۆیشت:

– هەڵبەتە دەمێکە هاتووەتە هۆش خۆی، لە بەیانییەوە.

شێوازی قسەکردنی خۆمانەیی ڕازومیخین هێندە سادە و ساکار و ئاسـایی بوو کە لوژنینیش گوڕ و تینێکی بە بەردا هاتەوە، لەوانەیە تا ڕادەیەکیش بە بۆنەی ئەوەوە بووبێت کە ڕازومیخینی شـڕوشـێواو و گوێنەدەر خۆی بە خوێندکار ناساندبوو.

لوژن سەری قسەی کردەوە:

– دایە گیانتان...

ڕازومیخین بە دەنگوهەراوە گەرووی پاک کردەوە:

– ئح ئحمممم...

لوژن پرسیارئامێزانە چاوی لێ کرد.

– هیچ نییە. ئێوە بەردەوام بن.

لوژن شانی هەڵتەکاند.

– دایە گیانتان ئەو ماوەیەی کە من بە کاتی دراوسـێیان بووم، خەریـک بوون نـامەیەکیـان بۆ دەنووسـین. کە گەیشـتمە ئێرە دەسـئەنقەسـت ڕاوەسـتام تا چەند ڕۆژێک تێپەڕێ و پاشـان بێمە دیدارتان، تا دڵنیا بم کە ئێوە ئاگاداری هەموو هەواڵەکانن؛ وەلێ ئێستە دەبینم... سەیرە...

ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ تووڕە و پشووکورت هاواری کرد:

– دەزانم، دەزانم! کەواتە ئێوەن؟ هەمـان زاوای بەڕێز؟ بەڵێ، دەزانم!... پێویست بە خۆناساندنیش ناکا!

گومـان لەوەدا نەبوو کە ئەم جـارەیـان ئیدی لە دڵی لوژنی داوە، بەڵام بە ڕووی خۆیـدا نەهێنـا. تەواو گیرۆدەی ئەوە بوو بزانێت چ مەبەسـتێک لەپشـت ئەم قسـانەوەیە. بێدەنگییەک هاتە ئارا. هەر لەم ماوەیەدا، ڕاسـکۆڵنیکۆف کە هاوکاتی قسـەکردنەکە بەرەو لای ئەو

وەرسووڕابوو، لەپڕ هێندە کونپشکنانە[1] سەیری کرد کە وەک بڵێیت هێشتا بە باشی ئەوی نەدیوە یان شتێکی تازەی بە زەیندا هاتووە و هەر بەو مەبەستەشەوە خۆی بەرز کردەوە تا باشتر بتوانێت چاو لە لوژن ببڕێت. ئەوەی ڕاستیش بێت شتێکی تایبەت لە ڕووخسار و سرووشتی ئەم پیۆتەر پیترۆڤیچ لوژنەدا نەبوو، شتێک کە ببێتە هۆی ئەوەی *زاوایەتی‌ی* لێ بوەشێتەوە، گەرچی هەر وا کتوپڕ و هاکەزایی پاشناوی زاوای بە نسیب بووبوو. بەر لە هەر شتێک دیار بوو کە لوژن بەوپەڕی حەز و تامەزرۆییەوە ئەو دەرفەتە چەندرۆژییەی لە پایتەخدا قۆستووەتەوە تا بە باشی خۆی بۆ پێشوازیکردن لە دەزگیرانەکەی بڕازێنێتەوە، کە هەڵبەتە ئەمەش تاوانێک نییە و تەواو شیاوە. لە جوانتربوونی سەروسیما و ڕووالەتی ئاگادار بوو، وەلێ لەم هەلومەرجەدا دەکرا چاوپۆشی لە خۆپەرستیی زیاد لە ڕادەی بکرێت، دواجار لوژن ڕۆڵی *زاوای* لە ئەستۆدا بوو. سەراپای جلوبەرگەکەی ئاسەواری پلوپەنجەی بەرگدوورێکی شارەزای پێوە دیار بوو و جوانیش بوو، وەلێ فرە تازە دەردەکەوت و هەتا بڵێیت بێوێنە بوو. کڵاوە خڕە تازەمۆدێلەکەشی لۆک بوو و هەمان تایبەتمەندیی بەرچاوی جلوبەرگەکەیی هەبوو. لوژن بە پارێزێکی زۆرەوە کڵاوەکەی بە دەست گرتبوو و زۆر بەڕێزانەش لەگەڵی دەجووڵایەوە. مەسەلەی دەستکێشە وەنەوشەییە شازە ژوڤین[2]ـە ئەسڵەکانیشی هەر هەمان شت بوو، جا با ئەوەش بوەستێ کە دەستکێشی ژوڤین هی پۆشین نییە و دەبێت تەنیا بە دەستییەوە بگرێت و پۆزی پێوە لێبدەیت. جلوبەرگەکەی لوژن ڕەنگێکی کراوە و بەسەلیقانەی هەبوو. کۆتی هاوینەی بۆرکاڵی لە بەر کردبوو و

---

١. کونپشکن: کونجکۆڵ؛ فزووڵ.

١. دەستکێشی ژوڤین: مەبەست خاویر ژوڤینی فەرەنسییە (١٨٤٤-١٨٠١)، کە خەڵکی گرونۆبڵە. ئەو دەستگایەکی بڕین و دوورینی دروست کرد کە توانای بەرهەمهێنانی دەستکێشێکی زۆری مەتاتیی هێنایە ئارا. «و. ف»

پانتۆڵێکی هاوینەی کاڵیش لەگەڵ هێلەکێکی هاوئاهەنگ، کراسەکەشی لۆکی لۆک بوو و تەنک و سووک. بۆینباخەکەی کەتانی بوو و گەلێک ناسک بە خەتگەلێکی سوورکاڵەوە. گرنگترین شتیش ئەوە بوو کە هەموو ئەم جلوبەرگانە لە پێوتەر پیترۆڤیچ لوژن دەهاتن و جوان بە لەشییەوە ڕاوەستابوون. ڕووخساری تەڕوبڕ و تەنانەت سەرنجڕاکێشی هاواری دەکرد کە تەمەنی چلوپێنج ساڵێک کەمترە. سمێڵە ڕەشە تۆخەکەی لە هەردوو لاوە سێبەرێکی جوانی وەک پەراسووی مەڕی دەخستە سەر ڕووخساری و کە دەگەیشتە سەر چەناگەی بریقەدار و پاکتاشراوی، بە شێوەیەکی سەنجڕاکێش ئەستوور دەبوو. قژی تەنیا لێرە و لەوێ ماشوبرنجی بووبوو، وێڕای ئەوەی لە دەلاکخانەدا لوول کرابوو و داهێنرابوو، کەچی سیمایەکی گەمژانەی پێ بەخشیبوو؛ ئاخر قژی لوول هەمیشە مرۆڤ وەک ئەڵمانییەکان نیشان دەدات کە وەک ئەوەی ڕۆژی زەماوەندیان بێت. گەر شتێکی ناشیرین و قێزەون لە سەروسیمای کەم تا زۆر کەشخە و بەشکۆی ئەودا هەبا، ئەوا هۆکارگەلێکی دیکەی لەپشتەوە بوو. ڕاسکۆلنیکۆف کە ورد و بەبێ شەرم و ئەتەکیەت لە ڕووخساری بەڕێز لوژنی ڕوانی، بزەیەکی ناحەزانەی کرد و هەمدیسان کەوتەوە سەر پشت و وەک جاران چاوی لە بنمیچەکە بڕی. وەلێ بەڕێز لوژن کەوتە ددانەجیڕە و وا دیار بوو جارێ سوورە لەسەر ئەوەی چاو لەم هەڵسوکەوتە سەیروسەمەرانە بپۆشێت.

زۆری لە خۆی کرد تا بێدەنگی بشکێنێت و بەم جۆرە دەستی پێ کرد:

– زۆر بە داخەوەم کە ئێوە لەم دۆخەدا دەبینم. گەر ئاگادار بام کە ناساغن زووتر دەهاتم. وەلێ خۆتان ئاگادارن، کاروبار و هەزار جۆر سەرئێشەی تر! لە ئەنجوومەنی پیرانیش دۆسییەیەکی یاسایی گرنگم لە بەردەستە و ئەوە سەرقاڵیی تریش با بوەستێ. خۆتان بە ئاسانی

دەتوانن دەرکی پێ بکەن. دایە گیان و خوشــکیشــتان هاکا گەیشــتنە پیتەربورگ و چاوەڕێیانم...

ڕاســـکۆلنیکۆف وەرســـووڕا و پێدەچوو بیەوێ شـــتێک بڵێت؛ ڕووخساری دڵەڕاوکێیەکی تایبەتی نیشان دەدا. ئەمیش دەستبەجێ و کتوپڕ قســـەکانی وەســـتاندن و چاوەڕێ ما، وەلێ لەبەر ئەوەی ڕاسکۆلنیکۆف هیچی نەگوت، بەردەوام بوو:

– ... ئیتر بەم نزیکانە دەگەن. شوێنێکیشم بۆ مانەوەیان گرتووە...

ڕاسکۆلنیکۆف بە کزی گوتی:

– لە کوێ؟

– زۆر لێرەوە نزیکە. لە بینای باکۆلییڤدا ژوورم بۆ گرتوون.

ڕازومیخین چووە ناو باسەکەوە:

– ئەرێ، مەبەســتتان لە بینای باکۆلییفی ڤازنیسـنسـکییە. دوونهۆمە و بازرگانێک بە ناوی یوشینەوە بە کرێی دەدا، ڕۆیشتووم پێشتر.

– بەڵێ، ئەلەوێیە...

– شـــوێنێکی نـالەبـارە، پیس و بۆگەن و، لە هەمووی خراپتر، شــوێنێکی بەدناوە. لەوێ شــتی زۆر ڕوویان داوە و جۆرەها مرۆڤی نالەباری تێدا دەژین. منیش لەســـەر مەســـەلەیەکی ئابڕووچوون چووبوومە ئەوێ. وەلێ هەرچۆنێک بووە زۆر هەرزان دەکەوێ.

لوژن ئەمەی لە بەردڵ گران بوو و وەڵامێکی دەمکوتکەری دایەوە:

– ئەوەی ڕاســتی بێ، من خۆم لە پیتەربورگدا غەوارەم، ڕوونە کە نەمتوانی زانیـارییەکی ئەوتۆ بەدەســـــت بێنم. بەهەرحـاڵ، ئەو دوو ژوورەی کە گرتوومن زۆر خـاوێنن و خـاتوونـانیش مـاوەیەکی کەم دەمێننەوە... خانووشم گرتووە، بۆ ژیانی هاوبەشمان.

ڕوو لە ڕاسکۆڵنیکۆف درێژەی پێ دا:

– بەس جارێ سپاردوومە تۆژەن و پاکوخاوێنی بکەنەوە. خۆیشم ئەم ماوەیە لە شـــوێنێکی بەرتەســـک و بچووکدا لەگەڵ هاوڕێیەکم، ئاندرێی سیمیۆناڤیچ لیبیزیاتنیکۆفدا دەمێنمەوە. ئاخر لە بینای خاتوون لیپیڤیخزیلـدا ژوورێکی هەیە؛ هەر ئەم هـاوڕێیەم بوو کە بینـاکەی بۆکالییڤی‌ی نیشان دام...

ڕاسکۆڵنیکۆف بە هێمنی گوتی:

– یانی لیبیزیاتنیکۆف، ها؟

دەتگوت خەریکە شتێک بیر خۆی دەهێنێتەوە.

– بەڵێ، جەنابی ئاندرێ ســـیمیۆناڤیچ لیبیزیاتنیکۆف، فەرمانبەری وەزارەتخانەن. دەیناسن؟

ڕاسکۆڵنیکۆف وەڵامی دایەوە:

– نا... نایناسم...

– داوای لێبوردن دەکەن، لەبەر ئەوە پرســـیم کە وای بۆ چووم بیانناسن. سەردەمانێک سەرپەرشتی بووم. گەنجێکی باشە و زۆریش پێشـــکەوتوو. من تامەزۆری دیداری گەنجانم، مرۆڤ شـــتی تازەیان لێوە فێر دەبێ.

لوژن هیوادارانە تەمـاشـــای هەموو ئـامـادەبووانی دەکرد کە ڕازومیخین پرسیی:

– جا لە چ ڕوویەکەوە؟

لوژن بە چەشنێک وەڵامی دایەوە وەک ئەوەی کەیفی بە وەڵامەکەی هاتبێت:

– لە ڕووی گرنگترین و بنەڕەتیترین پرسەکانەوە! سەرنج بدەن، من دواهەمین جار دە ساڵ لەمەوبەر بوو کە هاتمە پیتەربورگ. سەرلەبەری چاکسازی و هزرە نوێ و شتە تازەدەرکەوتووەکان گەیشتوونەتە دەڤەرەکانیش، وەلێ بۆ ئەوەی هەموو شتێ لەوپەڕی ڕوونیدا ببینی، دەبێ بێیتە پیتەربورگ. من بڕوام وایە دەبێ نەوەی نوێمان و دۆخیان بەهەند وەرگرین... بەم جۆرە دەکرێ لە زۆر شت تێبگەین. لێرانە دان بەوەدا دەنێم کە زۆر خۆشحاڵم...

– لە چی؟

– ڕاستییەکەی، پرسەکەی ئێوە پانتاییەکی بەرفراوانی هەیە. لەوانەیە هەڵەش بم، وەلێ لام وایە دیدگەی بەرجەستەتر و هەستی ڕەخنەگرتن و کردەوەخوازی لەواندا زیاتر دەبینم...

زۆسیمۆف لەژێر لێوەوە گوتی:

– ڕاستە.

ڕازومیخین خۆی هەڵقورتاند:

– قسەی قۆڕە بەڕێز گیان! کردەوەخوازی کامەیە؟ بۆ کردەوەخواز هەر وا لە خۆڕا دروست دەبێ؟ خۆ ئاسمان دەمناکاتەوە و کردەوەخواز بخاتە خوارێ. لانیکەم ئێمە دووسەد ساڵە لە ژیانی کردەیی دابڕاوین و بەوە ڕاهاتووین کە هەنگاو هەڵنەهێنینەوە. هەڵبەتە هزر و بیرۆکە و ئەمانە لەوانەیە لەئارادا هەبن، ئەوەم قەبووڵە، وەلێ...

ڕووەو لوژن درێژەی پێ دا:

– بەڵێ، ئارەزووی چاکە بوونی هەیە، گەرچی لە جۆرە منالانەکەیدا. تەنانەت سەرەڕای ئەوەی کە دز و کلاوچی دەورەی داوین، تۆزە ڕاستگۆییەکیش ڕەنگە دەست بکەوێ! وەلێ کردەوەیەک لەئارادا نییە،

باوانم! مرۆڤێکی کردەوەخوازیش نابینرێ. ئەگەریش هەبێ ئەوا گای تەوێڵسپییە!

دیار بوو کە لوژن چێژ لەو باسە دەبات:

– هاوڕاتان نیم. هەڵبەتە مرۆڤ تووش دەبێ و هەڵە دەکا، وەلێ دەبێ چاوپۆشیی لێ بکرێ. دەبێ ئەو هەڵانە بە نیشانەی حەز و تاسەی ئەو بۆ گەیشتن بە ئامانج و گۆڕانکاری و سەرچاوەگرتوو لە ژینگەیەکی نائاسایی دەرەوە بزانین. ئەگەر گۆڕانکاری کەم بووە، دەی کاتیشمان هەر کەم بووە! ئەوە با باسی کەرەستە و پێداویستیش هەر نەکەین باشترە! لە دیدی کەسیی منەوە، گەر مۆڵەت بدەن ڕایگەیەنم... بڕوام وایە هەر ئێستەش پێشهاتی چاک ڕووی داوە و لە هەندێ ڕووەوە پێشکەوتن هەیە؛ بیرۆکەی بەنرخ و سوودگەیێنی تازە، کاری ئەدەبیی بەنرخ و نوێ لەبری ڕۆمانسییەت و خەیاڵپلاویی پێشووی نووسەران. ئەدەبیاتی ئێمە وا پێدەگا، زۆرێک لە دەمارگیرییەکانی خانمانی هەڵبژاردە لە ڕەگەوە هەڵکەنراون و ئێستە وا گاڵتەیان پێیان دێ... بە کورتی و پوختییەکەی: ئێمە خۆمان لە ڕابردوو دابڕیوە و ڕێگەی گەڕانەوەش نییە و هەر ئەمەش بە گومانی من کارێکی گەورەیە، قوربان...

ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ دەنگی لێوە هات:

– چەندە باشیش لە بەری کردووە! پێشنیاریش دەکا.

لوژن کە تێنەگەیشت ڕاسکۆڵنیکۆف چی دەڵێت، پرسیی:

– ببوورن، چیتان فەرموو، قوربان؟

وەڵامی نەدرایەوە.

زۆسیمۆف بە پەلە هاتە ناو باسەکەوە:

– زۆر پتەو و لۆژیکی فەرمووتان!

لوژن سەیرێکی قایلبووانەی زۆسیمۆفی کرد و لەسەری ڕۆیشت:

– لۆژیکییە. پەسەندی ناکەن، قوربان؟...

بە شـــێوازێکی ســـەرکەوتوو و دەمـــاربەرزانەوە ڕووی کردە ڕازومیخین و تەنانەت گەیاندییە شـــوێنێکیش کە هێندەی نەمابوو بە گەنجۆ بانگی بکات:

– دوای ئەم هەموو قســـانە قەبووڵتان نییە، کە دواجار برەو و پشـــکوتن، یان بە گوتەی ئەمڕۆییەکان، پێشـــکەوتنێک هاتووەتە ئارا؟ لانیکەم بە ناوی زانست و ڕاستیی ئابوورییەوە...

– ئەمانە گیروگرفتی ئاساییین!

– نا، ئاســـایی نین! بۆ نموونە تا ئێســـتە گەر بە منیان گوتووە *دراوســـێکەتـت خۆش بوێ* و منیش پەســـەنـدم کردووە، دەی، بەرهەمەکەی چی بووە؟

لوژن هەڵپەی بوو تا قسەکانی بکات:

– بەرهەمەکەی ئەوە بوو کە من کۆتەکەمم دەکردە دوو پارچە و دەمدایە دراوســـێکەم و هەردووکمـان نیوەڕووت دەماینەوە. ئێمەی ڕووســـەکـان خۆمـان پەنـدێکمـان هەیە دەڵێـت گەر دوای چەنـد کەروێشـــکێک بکەوی، هیچ کامیانت بۆ ناگیرێ! وەلێ زانســـت پێمان دەڵێ ســـەرەتا خۆتت خۆش بوێ، چونکە هەموو شـــتێکی ئەم دونیایە لەســـەر بنەمای بەرژەوەندیی کەســـییە. خۆتت خۆش بوێ و کارەکانت چاک ســـەرپێ بخە، ئیتر ئەوسا کۆتەکەشت نادڕێ! بنەمای ئابووریش دەڵێ تا کاروباری کەســـی لە کۆمەڵگەدا چاکتر ڕێکوپێک بکرێ، کۆتی نەدڕاویشـــمان کەمتر دەبێتەوە! یانێ تا کۆڵەکەکانی کۆمەڵگە پتەوتر بن، خۆشگوزەرانی و ئارامیی گشتیش چاکتر دەبێ! کەواتە من بە ماڵ

و ســـامانپێکەوەنان بۆ خودی خۆم، وەک دەڵێن ســـوود بە هەمووان دەگەیەنم و دەبمە هۆی ئەوەی دراوســـێکەم زیاتر لەو پارچە کۆتەی دەســـت بکەوێ؛ جا ئەمەش نەک وەک پێشـــتر لە شـــێوەی دەرۆزە و خێرپێکردنی کەســـی و بەهەڵکەوتدا، بەڵکە ئەمە لە ئەنجامی بووژانەوە و برەوســــەندنی هەموو کۆمەڵگەوەیە. ئەمە بیرۆکەیەکی ئاڵۆز نییە، وەلێ بەداخەوە زۆری خایاند تا دەستمان پێی ڕابگا. خەیاڵپەروەری و هەســتگەرایی بووبوونە بەربەســتی. گەرچی ســۆســەکردنی ژیرییەکی واشی ناوێ...

ڕازومیخین ڕەقوزبر قسەی پێ بڕی:

– زۆر داوای لێبوردن دەکەم هــا، منیش ژیرییەکی ئەوتۆم نییە، کەواتە واز لەم باســـە بێنین باشـــترە! من لە کردنەوەی ئەم باســـەدا مەبەســـتێکم هەبوو، وەلێ بە درێژایی ســـێ ســـاڵی ڕەبەق هێندە لەم چەنەبازییە ســــەرگەرمکەر و هێندە لە ڕەوتی بێکۆتای ئەم قســـە کلێشەیی و هەمیشەییانە وەڕەز بوومە کە سوێند بە خوا کاتێ ئەوانی تریش لێی دەدوێن، لە شەرمەزاریان سوور هەڵدەگەڕێم. ئاساییە، ئێوە بەو هەڵپەیە لە خەمی نمایشـــکردنی زانیارییەکانی خۆتاندا بوون و منیش هیچ سەرکۆنەتان ناکەم. دەکرێ لە یەکەمین بەرکەوتندا ئەمە بە تەواوی شـــیاوی لێخۆشـــبوون بێ! من تەنیا ویســـتم بزانم چیتان لە هەگبەدایە، ئاخر لەم دواییانەدا حەشـــاماتێک وەک کوللە و مێروو بەربوونەتە ئەم بیرە پێشـــکەوتنخوازانانە و دەســـت بۆ هەموو شـــتێ دەبەن، کرۆکەکەی لە بەرژەوەندیی خۆیاندا دەگۆڕن؛ هەموو هزر و ئامانجەکەیان پۆخڵ کردووە! ئەوەی پێویست بوو گوترا، بەڕێز!

لوژن ئەمەی پێ ناخۆش بووبوو و شێوازی قسەکردنەکەی گەلێک قورسوقۆڵانە بوو:

– داوای لێبوردن دەکەم، کاکی پایەبەرز، یانی خەریکن لەوپەڕی بێڕێزیدا دەڵێن کە من...

– ئۆۆۆۆو! کاکی ئازیزا... چۆن دەکرێ وەها بێشـــەرمییەک لە من بوەشێتەوە؟... دەی ئیتر، لام وایە بەسیەتی!

ڕازومیخین کۆتایی بە گوتوبێژەکە هێنا و دەمودەست ڕووی کردە زۆسیمۆف تا بچنەوە سەر باسەکەی پێشوو. لوژن بەشی ئەوە ئەقڵی پێ شـکا کە ڕازی بێت بە کۆتاییهێنان بە باسـەکە. بڕیاری دا زیاد لە چەند خولەکێک نەمێنێتەوە و زووتر بڕوات. بە ڕاسکۆڵنیکۆفی گوت:

– هیوادارم ئەم پێکناشـــنابوونە ســـەرەتاییەمان، بە چاکبوونەوەی ئێوە و بە لەبەرچـاوگرتنی هەنـدێ هەلومەرج، قووڵ و گەرموگوڕتر ببێ. زیاد لە هەر شتێکیش هیوای تەندروستیتان بۆ دەخوازم...

ڕاســـکۆڵنیکۆف تەنانەت ڕووشـــی تێ نەکرد. لوژن نیوخێز بوو تا بڕوات.

زۆسیمۆف بنجبڕانە ڕایگەیاند:

– تەماشا، هەر دەبێ یەکێ لە مشتەرییەکانی ئەویان کوشتبێ!

ڕازومیخین وەڵامی دایەوە:

– هیچ گومانێک لەوەدا نییە! ئەوە پۆرفێری هێشـتا هیچ بۆچوونێک نـاخاتە ڕوو، وەلێ وا خەریکە لێکۆڵینەوە لەگەڵ تـاک بە تـاکی ئەو کەسانەدا دەکا کە بارمتەیان لەلای بووە.

ڕاسکۆڵنیکۆف بە دەنگی بەرز پرسیی:

– لێکۆڵینەوە دەکا؟

– بەڵێ دەی، بۆچی؟

– هیچ.

زۆسیمۆف گوتی:

– چۆن دەستیان پێیان ڕاگەیشتووە؟

– کوخ هەندێکیانی ناسیون و پێی گوتوون، ناوی هەندێکیشیان بەسەر بەستەی بارمتەکانەوە بووە و چەند کەسێکیشیان خۆیان دەستپێشخەرییان کردووە.

– بەس هەر بە ڕاست، ئێمە تووشی چ چەقۆکێشێکی بەدفەڕی فێڵباز و شارەزا بووینە! چ زاتێکی هەبووە کابرا! لەوپەڕی بێباکیدا!

ڕازومیخین قسەی پێ بڕی:

– ئەسڵەن وا نییە! ئائەم بیرکردنەوەیە هەمووانی لە بابەتە سەرەکییەکە دوور خستووەتەوە! بەس من لەسەر ئەوە سوورم کە ئەم کابرایە ئەسڵەن فێڵباز نییە، شارەزاش نییە و بە ئەگەرێکی زۆر یەکەمین تاوانی بووە! ناکرێ گریمانەی ئەوە بکەین کە ئەمە تاوانێکی پێشوەختە پلانرێژکراو بووە و سەروکاریمان لەگەڵ تاوانبارێکی فێڵبازدا هەیە. بە پێچەوانەوە گریمانەی ئەوە بکەن کە کابرا بێئەزموون بووە و وەک ڕۆژیش ڕۆشنە کە خۆوبەخت توانیویەتی ڕابکا... بەختە ئیتر، گەر بەخت یارت بێ چیت بوێ دەیکەی، وایە؟ بە دووری دەزانم کابرا تەنانەت بیری لەوەش کردبێتەوە کە دەشێ کێشە و بەربەستی بێنە ڕێ! ئاخر تەماشا چیی کردووە! هەندێ گەوهەراتی بردوون کە هەمووی بایی دە بیست ڕۆبڵێک دەبن، گیرفانەکانی ئاخنیون و جلوبەرگ و شرەومرەی پیرێژنە و سندووقچەکەی ژێروژوور کردوون، کەچی هەزار و پێنجسەد ڕۆبڵ، بێ لە چەند ئەسکەناسێکی تر، لە سندووقێکی نێو چەکمەجەی سەرەوەی دۆلابەکەدا بووە! بە ناخێری گیانی نەشیزانیوە وەک مرۆڤ دزی بکا، تەنیا توانیویەتی مرۆڤ بکوژێ. گومان لەوەدا نییە کە یەکەمین تاوانی بووە، لە منی

وەرگرە، یەکەمین تاوان. شـــپرزە بووە و ڕاکردنەکەشـــی خۆوبەخت بووە، نەک بە بەرنامە و نەخشە.

لوژن هاتە نێو باسەکەوە و ڕوو لە زۆسیمۆف گوتی:

– لام وایە باسی کوژرانی ئەو پیرێژنە سووخۆرە دەکەن، ئەریّ؟

کڵاو و دەسـتکێشـەکەی بە دەسـتییەوە بوون و ڕاوەسـتابوو، بەڵام هەستی دەکرد بەر لە ڕۆیشتن بێگومان دەبێ چەند دانەیەک لە ڕستە ژیرانە و کورتەکانی خۆی بە باســـەکەدا بکات. بە ڕوونی دیار بوو تامەزرۆیە کاریگەرییەکی دڵخۆشکەر جێ بهێڵێت و هەمدیسان هەستی بەخۆنازینی بەسەر پاریزکارییەکەیدا زاڵ بوو.

– بەڵێ، بۆ ئێوەش بیستووتانە؟

– ئۆو، بەڵێ. لێرە بووم، بۆ دەکریّ نەمبیستبێ؟

– وردەکارییەکەشی دەزانن؟

– ناکریّ بڵێم وردەکارییەکەشـــی دەزانم، وەلێ خاڵێکی تر هەیە کە زۆر بۆم سەرنجراکێشترە. وەک دەڵێن خودی *مەسەلە سەرەکییەکە*. ئەو ڕاسـتییەی کە ڕێژەی تاوان لەلایەن چینە نزمەکانی کۆمەڵگەوە لە پێنج ساڵی ڕابردوودا زیادبوونێکی بەرچاوی بە خۆوە دیوە، لە لایەک؛ جـا دزی و ئـاگرنـانەوەی یەک لەدوای یەکیش لەملا و لەولاوە بـا بوەسـتێ. سـەیرترین خاڵ بە گومانی من ئەوەیە کە ڕێژەی تاوان بە هەمان ئەندازەش لە چینە بەرزەکانی کۆمەڵگەشـدا برەوی هەبووە. لە لایەکەوە دەبیسـتی خوێندکارێکی زانکۆ لە ناوەڕاسـتی جادەدا بەسـەر باری پۆسـتەچییدا داوە و دزیویەتی، لە لایەکی ترەوە دادەنیشـی و دەبیستی کە ژمارەیەکی سەر بە چینی سەرەوەی کۆمەڵگە، هەستاون و ئەسـکەناسـی تەزویریان لێداوە. هەر لەم دواییانەشـدا لە مۆسـکۆ دەستەیەکی خراپەکاریان گرتن کە بلیتی یانسیبی ساختەیان دروست

کردووه و یەکێک لە سەرگەورەکانیشیان مامۆستای مێژوو بووه![1] دواتریش ئەو سیاسییەی ئیمەیان لەبەر هۆکارگەلێکی ماددی کە هەر دیاریش نییە چین، گرت و کوشتیان... ئێستەش گەر ئەم پیرێژنە بە دەستی یەکێ لە کەسانی سەر بە چینی سەرەوەی کۆمەڵگە کوژرابێ (ئاخر خۆ موژیک و شت و خشڵ و زێڕی لە کوێ بوو تا وەک بارمتە دایبنێ)، ئەوسا چۆن دەتوانین پاکانە بۆ ئەم بێئاکارییە رووتەی بەشە شارستانییەکەی کۆمەڵگەکەمان بکەین.

زۆسیمۆف قسەی فڕێ دا:

– گۆڕانکاریی ئابووریش زۆر بووە...

ڕازومیخین لەسەر قسەکەی لوژن ڕۆیشت:

– چۆن دەتوانین پاکانەی بۆ بکەین؟ ئەسڵەن لەوانەیە هۆکارەکەی هەمان بێکردەیی و دژداماوییە[2] دێرینەکەمان بێ!

– مەبەستتان چییە؟

– ئەو مامۆستا مۆسکۆییەی ئێوە چ وەڵامێکی هەبوو بۆ ئەم پرسیارەی کە بۆچی ئەسکەناسی ساختەی لێداوە؟ گوتوویەتی: *دواجار هەر کەسەو خەریکە لە ڕێیەکەوە پارە لە گیرفانی دەئاخنێ، من دەمەوێ بە زووترین کات پارە بەدەست بێنم.* ئێستە من وشە بە وشەیم بیر نایێتەوە وەلێ پووختەی قسەی کابرا ئەوە بوو کە دەیەوێ لە پڕێکدا ببێتە کوڕێ، نەک بە ئیشکردن و بە کۆشش و خەسارکردنی تەمەنێک! ئێمە بە جۆرێک ڕاهێنراوین کە دەمانەوێ هەموو شتێ بە ئامادەکراوی بێتە بەردەستمان. بمانکەنە قەڵادۆشکان و بمانگێڕن و

---

[1] دۆستۆیڤسکی بە ئاماژەکردن بۆ ڕووداو و پێشهاتەکانی ساڵی ١٨٦٥ لایەنی بەڵگەنامەیی ڕۆمانەکە تۆخ دەکاتەوە. «و. ف»

١. دژداماوی: دەسەوەستانی؛ دەستوپێسپییەتی.

نانەکەشـــمان بۆ بجوون. پاشـــانیش کاتی خۆی[1] هات و دەســـتەکان ئاشکرا بوون.

– ئەی لەم نێوەندەدا ئەخلاقیات چیی بەســـەر دێ؟ جا وەک دەڵێن بنەماکان...

ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ پەڕییەوە نێو قسەکان و گوتی:

– جا تۆ بۆچی خەمی ئەم شتانەت لێ نیشتووە؟ خۆ ئەمانە لەگەڵ تیۆرییەکەتدا کۆکن!

– لەگەڵ تیۆرییەکەی مندا کۆکن؟

– دەی بەڵێ، ئەو تیۆرییەی کە هەر ئێســـتە کردبووتـانە چۆپیی دەستتان و گەر ڕێک و لۆژیکی بە ڕاست بگەڕێ، ئەنجامەکەی دەبێتە ئەم لەناوچوونەی خەڵکی...

لوژن هاواری کرد:

– بۆ خاتری خوا...

زۆسیمۆف گوتی:

– نا، وا نییە.

ڕاسـکۆڵنیکۆف ڕەنگپەڕیو ڕاکشـابوو، لێوی سـەرەوەی دەلەرزی و بە دژواری هەناسەی بۆ دەدرا.

لوژن لووتبەرز و خۆبەزلزان درێژەی پێ دا:

– دەبێ میانڕۆ بین، جا لە هەر کارێکیشدا بێ. تیۆرییە ئابوورییەکان خۆ مرۆڤ دنە نـادەن بچێ مرۆڤ بکوژێ. گەر گریمـانەکە ئەمە بێ کە...

---

۲. ئاماژەیە بۆ سیستمی ئاغا–ڕەعیەتیی ڕووسیا لە ساڵی ١٨٦١دا. «و. ف»

ڕاسـکۆلنیکۆف هەمدیسـان پەڕییەوە نێو قسـەکانی، دەنگی لەتاو تووڕەیی و هەروەها چێژی سووکایەتیکردن بە لوژندا دەلەرزی:

– کەواتە ڕاست بووە... ڕاستیان پێ گوتووم کە جەنابی پایەبەرز، هێشتا کاتژمێرێک بەسـەر ئەرێ‌گوتندا تێنەپەڕیوە، بە دەزگیرانەکەتت گوتووە دۆخە شـڕە ماددی و سـەرسـوڕهێنەرانەکەی تەواو دڵخۆشـی کردووی، چونکە وا باشترە مرۆڤ ژنێکی بێپاشتیلانە و پێزان بخوازێ و لە هەژاری دەریبهێنێ تا خۆی هەمیشـە لەسـەرەوە بێ و بتوانێ جڵەوی بکا و بەردەوامیش بیخاتە ژێر منەت و بە ڕوویدا بداتەوە کە ئەو نانبدەیەتی، ها؟...

لوژن کە لەتاو حەپەسـان سـوورسـوور بووبووەوە، هەڵچوو و ڕقاوی قیراندی:

– تۆبە خوایە! کاکی بەڕێز، چۆن قسـەکەی منت لای خۆتەوە... بەم جۆرە هەڵگەڕاندووەتەوە؟ من ببوورن، مۆڵەت بدەن دڵنیاتان بکەمەوە ئەو هەواڵەی پێتان گەیشـتووە، یان باشـتر بڵێم، پێتان گەیێنراوە، بێبنەمایە و ڕاسـت نییە و من... هەڵبەتە سـۆسـەی دەکەم کاری کێ بێ... بە کورتییەکەی... ئەمە گورزێکی... کوشـندەیە کە... دایە گیانی ئێوە... تەنـانەت پێشـتر بەوەم زانیبوو کە سـەرەڕای هەموو تایبەتمەندییە تەواو نـایـابەکانیـان، شـێوازی بیرکردنەوەیـان زۆر ڕۆمـانتیـک و بەجۆشـە. وەلێ هەرگیز پێم وا نەبوو تووشـی هەڵەتێگەیشـتنێکی لەم جۆرە ببێ و بەپێی تێگەیشـتنی خۆی بە هەڵە بابەتەکە لێک بداتەوە... هەر بە ڕاستی... بە ڕاستی...

ڕاسـکۆلنیکۆف سـەری لەسـەر پشـتییەکە بەرز کردەوە و نیگای ئاگرین و سەنگینی خۆی لەو بڕی:

– دەی دەزانی چییە؟ دەتەوێ پێت بڵێم؟

– چییە؟

لوژن بێ جووڵە ڕاوەستـــا و بە ســـیمایەکی بەرگریکارانە و ڕەنجاوەوە چاوەڕێ ما. چەند چرکەیەک بێدەنگی باڵی کێشابوو.

– یەک جاری تر... گەر تەنیا یەک جاری تر بێشـەرمیی وا بکەی و وشـــەیەک لەبارەی دایکمەوە بڵێی، لە پلیکانەکانەوە لنگاوقووچ هەڵت دەدەمە خوارێ!

ڕازومیخین قیڕاندی:

– ئەی هاوار، دیسان چ گلاراوێکتە؟

لوژن وەک گەچ سپی هەڵگەڕا و لێویی گەست:

– یانی ئاوها، قوربان؟

بڕگەبڕگە دەدوا و ئەوپەڕی هەوڵی دەدا خۆی کۆنترۆڵ بکات، وەلێ بە ئاستەم هەناسەی دەردەهات:

– هەر لە ســـەرەتاوە دەرکم بەوە کرد کە چارەی منتان ناوێت، بەس ڕاوەســتام تا ڕوونتر ببێتەوە و جوان حاڵی ببم. دەتوانم چاو لە زۆر شتی نەخۆشـێک بپۆشـم بەتایبەت گەر خزمیش بێ، وەلێ ئێوە... دوای ئەم مەسەلەیە... ئیتر هەرگیز...

ڕاسکۆڵنیکۆف قیڕاندی:

– من نەخۆش نیم!

– دەی ئەوە خراپترا!

– ئادەی، یەڵا بۆ دەرێ!

لوژن بێ ئەوەی گوتەکانی تەواو بکات، خەریک بوو بە زۆر لەنێوان مێز و کورسییەکەوە جێی بۆ خۆی دەکردەوە تا بڕوات. ئەم جارەیان

ڕازومیخین هەستایەوە تا ڕێی بۆ خۆش بکات. لوژن سەیری کەسی نەکرد و تەنانەت سەرێکیشی بۆ زۆسیمۆف نەلەقاند کە ماوەیەک بوو بە ئاماژە و ناڕاستەوخۆ داوای لێ دەکرد واز لە نەخۆشەکە بهێنێت؛ جا چووە دەرێ و کلاوەکەشی تەنیا کلاوەکەی تا سەر ئاستی شانەکانی داگرت، تا لە کاتی چەمینەوەی و چوونە دەرەوە لە دەرگەکەدا، بەر هیچ شتێک نەکەوێت. تەنانەت لە کاتی چوونەدەردا چەمانەوەی ستوونی بڕبڕەکانی پشتیشی ئاماژەیان بە پیسیی ئەو سووکایەتییە دەکرد کە پێی کرابوو.

ڕازومخین تیاماو سەری بادا و گوتی:

– چۆن توانیت وا بکەی؟ ئاخر تۆ چۆن هەڵسوکەوتی وا...

ڕاسکۆڵنیکۆف هەڵچووانە هاواری کرد:

– لە کۆڵم بنەوە، لەگەڵ هەمووتانمە، لە کۆڵم بنەوە! ناتانەوێ کۆتایی بە ئەشکەنجەدانم بێنن؟ من لێتان ناترسم! لە هیچ کەسێکیش ناترسم، ئێستە ئیتر لە هیچ کەسێ ناترسم. دەستم لێ هەڵگرن و دەورەم مەدەن! دەمەوێ تەنیا بم، تەنیا، تەنیا، تەنیا!!!

زۆسیمۆف ئاماژەی بۆ ڕازومیخین کرد:

– با بڕۆین.

– خۆ ناکرێ هەر وا جێی بهێڵین!

– با بڕۆین، وەرە.

زۆسیمۆف پێداگرانە قسەکەی دووبارە کردەوە و ڕۆیشت. ڕازومیخین ماوەی خولەکێک بیری کردەوە و پاشان دوای کەوت. زۆسیمۆف لە پلیکانەڕێکەدا گوتی:

– تەماشـــا، گەر بە قســـەی نەکەین لەوانەیە خراپتر ببێ. نابێ توورەی بکەی.

– چی بوو ئاخر کتوپڕ؟

– گەر بە هەواڵێکی باش شۆکی سۆزداریی لێ بدرابا، کارێکی باش دەبوو! سەرەتا باشتر بوو... دەزانی، ئەمە بیرێکی لە سەردایە! شتێکە کە لە زەینی دەرناچێ و زۆر خراپ وڕی کردووە... من لەوە دەترسم و لام وایە بێگومان دەبێ شتێک هەبێ...

– ڕەنگە بیری بەو کابرایە، بەو لوژنەوە قاڵ بووبێ! لە قســـەکانیا تێگەیشـــتم بڕیارە لەگەڵ خوشـــەکەی ڕۆدیا زەماوەند بکا و ئەویش ڕێک بەر لەوەی تووشـی نەخۆشی ببێ و بکەوێ، بە نامە هەواڵی ئەم بابەتەی پێ گەیشتووە...

– بەڵێ، جا ئەم خوێرییەش لە کاتێکی چەندە نالەباردا گەیشت! خوا بە نەفرەتی کا، لەوانەیە بەمە ســـەرلەبەری هەموو ماندووبوونمانی بە با دابێ! وەلێ ئاگاداری کە ڕاســـکۆڵنیکۆف لەبارەی هەموو شـــتێکەوە بێباک بووە؟ هەرچیش دەڵێی کاردانەوەی نییە، کەچی کتوپڕ ڕێک ئەو کاتەی باسی ئەو بکوژە دێتە ناوەوە، دەشێوێ، ئەرێ؟

ڕازومیخین هاوڕا بوو:

– ئەرێ، ئەرێ! منیش دەرکم بەوە کردووە! بۆی گرنگە، ترســیشـی لێ دەنیشـــێ. ئەو ڕۆژەش کە بە نەخۆشـــییەوە لە بنکەی پۆلیس هەواڵەکەی بیستووە، شۆک بووە و بووراوەتەوە.

– ئێوارە کە هاتمەوە زیاتر باسی ئەم بوورانەوەیەم بۆ بکە، چونکە منیش دەمەوێ شـتێکت پێ بڵێم. ئەم کەسـە زۆر سـەرنجی ڕاکێشـاوم! نیوکاتژمێری تر دەچم و سـەرێکی لێ دەدەم... ئاوسـان و هەوکردن و ئەم شتانە لەئارادا نین...

– سوپاست دەکەم! منیش لەو ماوەیەدا لای پاشا خاتوون دەمێنمەوە و ئاگاشم لە ڕۆدیا دەبێ، ناستاسیا دەنێرم سەری لێ بدا...

ڕاسکۆڵنیکۆف کە تەنیا مایەوە، تیاماو و بێزار لە ناستاسیای ڕوانی، وەلێ ئەو هەر وا خنەخنی دەکرد.

– ئێستە چای بێنم بیخۆیەوە؟

– با بۆ دوایی! خەوم دێ! لێگەڕێ تەنیا بم...

ڕاسکۆڵنیکۆف دەستبەجێ ڕووی کردە دیوارەکە و ناستاسیاش چووە دەر.

## شەش

بەڵام هەر کە ناستاسیا هەنگاوی نایە دەرێ، ڕاسکۆڵنیکۆف هەستا و دەرگەکەی کلۆم کرد، ئەو بەستەیەی کە ڕازومیخین عەسر هێنابووی و شمەکەکانی ناویی بە شانازییەوە ڕانابوون و هەمدیسان دەقی دابوونەوە، کردەوە و کەوتە خۆگۆڕین. سەیر دەهاتە بەرچاو وەلێ وا دیار بوو کتوپڕ هێور بووبووەوە و هیچ ئاسەوارێک لە وڕێنەکردنی شێتانە یان گورزی ئەو ترسەی کە لەم دواییانەدا یەخەی دەگرت، تێدا نەمابووەوە. بۆ یەکەمین جار خەریکبوو ئارامییەکی چاوەڕواننەکراو و تایبەتی دەچەشت. لە جووڵە ڕێک و ڕوونەکانیدا، ئامانجدارییەکی لێبڕاو دیار بوو. لەژێر لێوەوە بە خۆی دەگوت: *ئەمڕۆ، هەر ئەمڕۆ.* ئاگادار بوو کە هێشتا بێهێزە، بەڵام هەمان ئەو گوشارەی کە لێکەوتەی واسواسییەکی توند بوو –ئێستە لە ترۆپکی خۆیدا، لە شێوەی ئەو ئارامییە تایبەتییەدا دەرکەوتبوو– هێز و بڕوابەخۆبوونی بەو دەبەخشی. وێڕای ئەمەش خواخوای بوو لەسەر شەقام بە سەردا نەکەوێت. کە جلە تازەکانی پۆشین، سەیرێکی پارەی سەر مێزەکەی کرد و پاش تاوێک ڕاوەستان، بیستوپێنج ڕۆبڵی خستە گیرفانییەوە. چەند سککەیەکی مسیی باقیی ئەو دە ڕۆبڵەشی هەڵگرت کە ڕازومیخین بە جلی دابوو. بێدەنگانە کلۆمی ژوورەکەی کردەوە، چووە دەرێ، بە پلیکانەکاندا خزایە خوارێ و لە دەرگەی کراوەی موبەقەکەوە تەماشایەکی ژوورەوەی کرد. ناستاسیا کە پشت لە ئەو ڕاوەستابوو و ئاگری سەماوەری خاوەنماڵی دەگراند، هیچی نەبیست.

جا چ کەسێک بیری بۆ ئەوە دەچوو کە ئەو بەتەما بێت لە ماڵ دەرچێت؟ خولەکێک دواتر لەسەر شەقام بوو.

کەم تا زۆر کاتژمێر هەشت بوو و خۆر ئاوا دەبوو. هەوا هەر وا تاسێنەر بوو، وەلێ ڕاسکۆلنیکۆف تاسەدارانە هەوای بۆدڕن[1] و پڕ لە تۆز و خۆڵی شاری هەڵدەمژی. وەخت بوو سەری بسووڕێ. کتوپڕ لە نیگای تادار و ڕووخساری ژاکاو و ڕەنگپەڕیویدا وزەیەکی کێویانە درەوشایەوە. پێشتر بیری لێ نەکردبووەوە و ئێستەش نەیدەزانی بەرەو کوێ کەوتووەتە ڕێ؛ تەنیا ئەم بیرەی لە زەیندا بوو کە *هەر ئەمڕۆ دەبێ هەموو شتێ تەواو بێ، بە یەکجاری و بۆ تامەتا بەبێ ڕاوەستان. تا ئەمە نەکەم، ناگەڕێمەوە ماڵێ، لەبەر ئەوەی ئیتر ئامادە نیم بەو جۆرە بژیم.* چۆن دەیویست تەواوی بکات؟ بە چ بارێکدا دەشکایەوە؟ هەر بە ڕاستی وەڵامەکەی نەدەزانی و تەنانەت نەشیدەویست بیری لێ بکاتەوە. ئەو بیرەی لە زەینی دوور خستەوە، ئاخر هەر جۆرە بیرێک ئەشکەنجەی دەدا. تەنیا ئەمەی دەزانی و تەواو هەستی دەکرد کە دەبێت هەموو شتێک بگۆڕێت، بە بڕوابەخۆبوون و مکووڕییەکی پتەو وەلێ ناچارانەوە دووبارەی دەکردەوە: *جا چیش دەبێ، با ببێ.*

بەپێی خووی دێرینی، هەمان ڕێگەی گەڕانی جارانی خۆی بەرەو گۆڕەپانی سێننایا گرتە بەر. هەرزەکارێکی ڕەشتاڵ بە ئۆرگێکی دەستییەوە لەبەردەم دوکانێکی وردەواڵەفرۆشیدا ڕاوەستابوو و بە دژواری دەسکی کەرەستە مۆسیقییەکەی دەگێڕا و ئاوازێکی ئێجگار سۆزبزوێنی دەژەنی. هەرزەکارەکە، بەدەم گۆرانیگوتنی کچۆڵەیەکی پازدە ساڵەوە مۆسیقای لێدەدا کە لە پیادەڕێکەدا ڕووبەڕووی ڕاوەستابوو و سەروسیمای وەک هی خاتوونە خانەدانان بوو،

---

١. بۆدڕن؛ بۆسارد؛ بۆدڕ؛ هەوای تیژ و بۆنناخۆش.

داوێنێکی دەڵبی ئاشدار[1] و کۆڵوانەی لە بەردا و کڵاوێکی حەسیریشی بە پەڕێکی سووری ئاگرییەوە لە سەردا بوو، هەموویشی کۆنە و پواو. بە دەنگێکی دوورەگە و ناجۆری گۆرانیبێژانی گەڕۆکەوە، وەلێ تا ڕادەیەک دڵگیر و بەهێز، گۆرانیی دەگوت تا بەڵکوو لەو دوکانەدا پارەیەکیان دەست بکەوێت. ڕاسکۆلنیکۆف چووە تەک دوو سێ گوێگرەوە کە لەوێ ڕاوەستابوون، سککەیەکی پێنجکۆپیکیشی دەرهێنا و خستییە مشتی گۆرانیبێژەکەوە. کچۆڵەکە کتوپڕ لە ناوەڕاستی نۆتێکی درێژکراوە و هەستوورووژێندا، گۆرانییەکەی پچڕاند و بە هاوارێک ئاوازژەنی ئاگادار کردەوە کە بەسە و ڕوویان لە دوکانێکی دیکە نا. ڕاسکۆلنیکۆف ڕوو لە ڕێبوارێکی پیاوی نێوانساڵ کە لەپاڵیدا ڕاوەستابوو و لە کەسێکی دەستبەتاڵ دەچوو، گوتی:

– ئێوەش حەزتان لە گۆرانیی سەرشەقامانە؟

کابرا حەپەساو و حەیران تەماشای کرد و ڕاسکۆلنیکۆف گوتی:

– من زۆرم حەز لێیە.

وەلێ باری قسەکردنی ناکۆکییەکی سەیری لەگەڵ بابەتی باسەکەدا هەبوو.

– زۆر حەزم لەم گۆرانیانەیە کە لەگەڵ ئۆرگی شەقامیدا دەیانڵێن. بەتایبەت دەمەوئێوارانی سارد و تاریک و شێداری پاییزی. بێگومان دەبێ شێداریش بێ. کاتێک کە هەر دەڵێیت ڕێبواران هەموو ڕەنگیان سەوزە و نەخۆشن؛ یان تەنانەت لەوەش باشتر، ئەو کاتەی کە بەفر ڕێک لە ئاسمانەوە دادەکا و باشی نایێ. بێگومان تێدەگەن چی دەڵێم، ئەرێ؟ جا پاشانیش ڕووناکیی فانۆسەکانی سەر شەقام بەنێوان کلووە بەفرەکاندا دەدرەوشێتەوە...

---

[1]. ئاش؛ کوتراوی نیشاستە، کەتیرە یان جەوی کە لە قوماش یان کاغەزی هەڵدەسوون، ڕەپ و لووسی دەکات.

غەوارەکە لەژێر لێوەوە گوتی:

– نازانم، بەڕێز گیان... ببوورن...

لە پرسـیار و هەڵسـوکەوتی نائاسـایی ڕاسـکۆڵنیکۆف ترسـا و بە پانتایی شەقامەکەدا ڕابرد و پەڕییەوە ئەوبەر.

ڕاسکۆڵنیکۆف هەر ڕاستەوڕاست درێژەی بە ڕێگەکەی دا تا خۆی لەو شوێنەی مەیدانی سێننایادا بینییەوە کە ئەو ڕۆژە کابرای دەستگێڕ و ژنەکەی لەگەڵ لیزاڤێتادا ڕاوەسـتابوون و قسـەیان دەکرد، بەڵام ئێسـتا لەوێ نەبوون. کاتێک زانیی لە کوێیە، ڕاوەسـتا و چاوی لە چواردەوری کرد و ڕوو لە گەنجێک کە کراسـێکی سـووری لە بەردا بوو و لەبەردەم نانەوایەکدا باوێشکی دەدا، گوتی:

– ئەرێ لێرەدا دەستگێڕێک و ژنەکەی شتیان نەدەفرۆشت؟

گەنجەکە تەماشـایەکی تەواو لووتبەرزانەی ڕاسـکۆڵنیکۆفی کرد و وەڵامی دایەوە:

– هەموو جۆرە کەسێ لێرە کاسبی دەکا.

– ناوی چییە؟

– هەر ئەو ناوەی کە بەدەمییەوە لە ئاویان هەڵکێشاوە!

– نەکا تۆش خەڵکی زارایسکی بیت؟ کامە پارێزگە؟

گەنجەکە هەمدیسان لە ڕاسکۆڵنیکۆف ورد بووەوە:

– خەڵکی پارێزگەومارێزگە نیین ئێمە پایەبەرز، خەڵکی دەڤەرێکین! زیاتر کاکەم دەچوو بۆ گەشـت و من دایمە لە ماڵێ دەمامەوە، هەر لەبەر ئەوەشـە کە نازانم... ئێوەش تەشـریف بفەرموون و بمانبوورن، پایەبەرز!

– کافتیە ئەوەی سەرەوە؟

– ڕێستۆرانتە، سالۆنی بلیاردیشی لێیە؛ لەوێ تا دڵ حەزکا کچە شازادەشت دەست دەکەون... ئوف، ئوف، ئوف![1]

ڕاسکۆلنیکۆف لە مەیدانەکە تێپەڕی. ئەوبەری مەیدانەکە، ئاپۆڕایەک بە سەروسیمای لادێیانە پشت لە ئەو ڕاوەستابوون. دڕی بە چڕترین شوێنەکان دادەدا و لە دەموچاوەکانی دەڕوانی. دیار نەبوو بۆچی دەیەوێت قسە لەگەڵ هەموو خەڵکیدا بکات، وەلێ خەڵکەکە حسێبیان بۆ نەدەکرد و دەستەدەستە پێکڕا هاواریان دەکرد. ڕاوەستا، تاوێک بیری کردەوە و پاشان بەلای ڕاستدا بای دایەوە و لە پیادەڕێکەوە بەرەو ڤازنیێسنسکی چوو. کە لە مەیدانەکە تێپەڕی، چووە ناو کۆلانەوە...

چەندان جار بەو کۆلانەدا تێپەڕیبوو کە بەرەو مەیدانەکە پێچی دەکردەوە و دەچووەوە سەر شەقامی سادوڤایا. لەم دواییانەدا هەر کات دۆخی تێک دەچوو، حەزی دەکرد بچێت و بەو ناوەدا پیاسەیەک بکات، *تا بەڵکە دۆخی خراپتریش ببێت*. ئێستە هەنگاوی نایە ئەو لاکۆلانە و هیچ فکرێکیشی لە زەیندا نەبوو. لەوێندەرێ چەندان بینای پێکەوەلکاویان کردوونەتە مەیخانە و ڕێستۆرانتی هەرزانجان. ژنان یەک لەدوای یەک بە سەری ڕووت و جلی ماڵەوە، وەک ئەوەی ویستبێتیان تەنیا سەرێک لە دراوسێیەک بدەن، ئامۆشۆیان دەکرد و لەملا و لەولای پیادەڕێکەوە کۆمەڵکۆمەڵ ڕادەوەستان، بەتایبەت لەبەردەم ئەو پلیکانانەدا کە بەرەو سالۆن دەچوونە خوارێ و لەوێ ئیدی پێداویستیی شەلاتییەتی و کەیف و ڕابواردنی هەمەجۆر ساز

---

١. ئەم بینایە بوونێکی دەرەکیی هەیە و لە مەودای نێوان سێنایا و شەقامی کونیدا هەڵکەوتووە. لەو سەردەمەدا، دوو نهۆمی خوارەوەی بیناکە –ناوی مالین نیک بووە– ڕێستۆرانت و مەیخانە بووە و نهۆمی سێیەمیش سۆزانیخانە و لانەی خراپەکار و لاتولووتانی پیتەربورگی. «و. ف»

کرابوو. لە یەکێک لە ســـــالۆنەکانەوە هەراوهوریا و دەنگی گۆرانی و زرنگەزرنگی گیتار و هاوارگەلی ســـەرخۆشــانە تا ســـەر شـــەقامەکە دەهـات. کۆمەڵە ژنێک بەردەرگەکەیـان قەڵەبـاڵق کردبوو، هەنـدێک لەســـەر پلیکانەکان دانیشـــتبوون و بڕێکیش لەســـەر شـــەقام. ئەوانی دیکەش بە پێوە قســـەیان دەکرد. ســـەربازێکی ســـەرخۆش کە خەریکی جگەرەکێشـان بوو، لە نزیک ئەوانەوە بەســەر شـەقامەکەدا ڕێی دەکرد و قســـــەی پیســـــی دەگوت. وەک ئەوەی هەوڵی بدۆزینەوەی شـــوێنی مەبەستی بدات، وەلێ بیری چووە کە بەتەما بووە بەرەو کوێ بڕوات. دوو دەرۆزەکەریش بە گژ یەکـدیـدا چـووبـوون و بـوودەڵەیەکی بەدمەســـتیش لە ناوەڕاســـتی شـــەقامەکەدا تەخت بۆی ڕاکشـــابوو. ڕاســـکۆڵنیکۆف چووە نێو دەســـتەی ژنەکانەوە کە بە دەنگێکی گیراو قســـەیان دەکرد. ســـەریان ڕووت بوو و کراســـی کەتانی و پێڵاوی چەرمبزنییان لە پێدا بوو. چل ســـاڵەشـــیان تێدابوو، وەلێ هەندێکیان ئەوپەڕی حەڤدە ســـاڵێک دەبوون. کەم تا زۆر گشـتیشـیان بەرچاویان شین بوو.

سەیر بوو کە ئەو دەنگ و گۆرانی و هەراوهوریایەی کە لە سالۆنی خوارەوەی پلیکانەوە دەهات، ڕاسکۆڵنیکۆفی بەرەو خۆی ڕاکێشابوو... دەکرا ببیستیت کە کەسێک لە سالۆنەکەدا شێتانە خەریکی سەماکردنە و لەگەڵ ڕیتمی گیتار و دەنگێکی زیکن و تیژدا کە گۆرانییەکی باوی ئەو ڕۆژانەی دەگوت، لە جێوە پاژنە بە زەویدا دەکوتێت. ڕاسکۆڵنیکۆف لە بارێکدا کە بەرەو لای دەرگەی سەرەکیی سالۆنەکە چەمابووەوە و لە پیادەڕێکەوە بە کونجکۆڵی تەماشـــای ژووریی دەکرد، پەرێشـــان و خەیالاوی، زۆر جددیانە گوێی دەگرت.

*مێی / مێی / ئەی پاسەوانی جوان*

*لێم مەدە / دەی مەدە/ لە منی نوقسان*

گۆرانیبێژ بە دەنگە باریکەکەی دەیچڕی و ئەمەی دەگوت. راسکۆڵنیکۆف کەڵکەڵەیەکی سەیر کەوتبووە سەری تا تێبگات گۆرانیبێژەکە کتومت چی دەڵێت، وەک ئەوەی هەموو شتێک پەیوەست بێت بە ئەوەوە و هیچی دی.

بیری کردەوە: *دەڵێی بچمە ژووری؟ هەموویان سەرخۆشن و وا فیلەفیلی پێکەنینیانە. منیش بچم بخۆمەوە؟*

یەکێک لە ژنەکان لەوی پرسی:

– نافەرموونە ژووری، ئەی شازادەی نەرمونیان؟

دەنگی هێشتا ئاوازدار بوو و ناجۆریی دەنگی ئەوانی دیکەی تێدا نەبوو. لەنێو ئەو کۆمەڵەیەدا تاکە کەسێک بوو کە لێی نەسڵەمێتەوە.

راسکۆڵنیکۆف قەدی ڕێک کردەوە و لە کچەی ڕوانی:

– چەندە جوانیشی!

کچە زەردەخەنەی بەدەمەوە کرد، زۆر بەم تاریفەی دڵخۆش بووبوو.

گوتی:

– خۆتان جوانن.

ژنێکی دی بە دەنگێکی گڕ و پیاوانەوە گوتی:

– چەندە لاوازیشە، ئەم شازادەیە! ئەرێ، ئەوە تازە لە نەخۆشخانە هاتوویە دەر؟

لادێییەکی سەرخۆش کە کۆتێکی فشی لە بەردا بوو، بە زەردەخەنەیەکی هەرزە و فرەزانانەوە گوتی:

– سەیریان کە، بەو لووتە قوتانەوە دەڵێی هەمووی کچە جەنەراڵە! چەندە کەیفیان سازە!

– مادام هەر هاتووی، دە بچۆ ژووری!

– بە چاوان! گیییانەکەم، ئەی نازدار!

بوودەڵەکە چووە خواری.

ڕاسکۆڵنیکۆف بەڕێ کەوت تا ئەوێ جێ بهێڵێت کە کچە لە پشتەوەڕا هاواری کرد:

– هێی، کوڕە شازادە!

– چییە؟

کچە ئێستێکی کرد.

– لە هەر کاتێکدا بێ، خۆشحاڵ دەبم کاتژمێرێکتان لەگەڵ بەسەر بەرم، ئەی شازادەی نەرمونیان؛ وەلێ ئێستە شەرم دەکەم. ئەی سوارچاکی دڵنشین، شەش کۆپیکم بە دیاری دەدەیتێ شتێ بخۆمەوە!

ڕاسکۆڵنیکۆف چیی بە دەستەوە هات دایە کچەکە: سێ دانە سکەی پێنج کۆپیکی.

– ئاخخخخ! لەو شازادە دڵباشە!

– ناوت چییە؟

– گەر کارێکتان هەبوو، هەواڵی *دوکلیدا* بپرسن.

یەکێک لە ژنەکان بەرەو دوکلیدا سەرێکی جوولاند و گوتی:

– ئەمەش ئیتر بێتامی کردووە! نازانم چۆن دەتوانێ دەست لە خەڵکی پان بکاتەوە. گەر من بام دەبوومە دڵۆپێک ئاو و دەچوومە ژێر زەوی...

ڕاسکۆلنیکۆف کونپشکنانە تەماشایەکی خاوەنی دەنگەکەی کرد کە ژنێکی ئاوڵەڕوو و سیسالە بوو بە ڕووێکی ڕەش و شینەوە کە لێوی سەریشی هەڵئاوسا بوو. ژنە، تانەکەی بە شێوەیەکی هێمن و جددی وەشاندبوو.

ڕاسکۆلنیکۆف لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *لە کوێ بوو، خوایە؟... لە کوێ بوو دەمخوێندەوە کەسێ کە سزای مەرگی بەسەردا دراوە، کاتژمێرێ بەر لە مەرگ دەڵێ یان لانیکەم بیری لێ دەکاتەوە کە ئەگەر ناچار با بەسەر ڕەوەزێکی بەرزەوە بژی و بەسەر لێوارێکی هێندە باریکەوە بوەستێ کە هەر بە تەنیا شوێنی دوو پێی ببێتەوە... چواردەوریشی هەڵدێر و ئۆقیانووس بێ و ڕەشاتی و تەنایی و زریانی تامەتایی... جا ئەگەر بڕیاریش با سەرانسەری ژیانی لەو کەمە شوێنەدا بەسەر ببا، تەنانەت گەر بۆ هەزار ساڵ و تامەتاش بێ... هەر باشتر وایە بژی نەک بەو نزیکانە بمرێ! تەنیا و تەنیا لەبەر خودی ژیان، ژیان، ئەرێ، ژیان! جا چۆنییەتیشی گرنگ نییە، تەنیا زیندوو مان و ژیان! ئای لەو ڕاستییە سەیرە! خوایە، چ بەسەرهاتێکە! بوودەڵەیی مرۆڤ بێکۆتایە!... وەلێ ئەو کەسەش لەبەر وەها شتێ بە بەنیئادەم بڵێ بوودەڵە، خۆی لە هەمووان بوودەڵەترە!*

هەڵبەتە پاش ئێستێک دواهەمین دێڕی بۆ زیاد کرد.

گەیشتە سەر شەقامێکی دی.

*فەرموو، ئەمەش کۆشکی بلوورین!*[1] *ڕازومیخین کەمێک لەمەوبەر باسی دەکرد. بەس... چیم دەویست من؟ شتێکم دەویست ها! ئەها،*

---

١. لەو سەردەمەدا پیتەربورگ مەیخانەیەکی بەم ناوەوە لێ نەبوو، وەلێ هۆتێلی کریستاڵ پالاس (کۆشکی بلوورین) لەو ناوەدا بوو. لە لایەکی دیکەوە، بەپێی بۆچوونەکانی *فرانسوا شارل فوریە* (ن. ک. بەرهەمی فوریە: *تیۆرییەی یەکیەتیی جیهانی*، ١٨٤١) مرۆڤەکانی کۆمەڵگەی سۆسیالیستی لە کۆشکی بلووریندا دەژین کە

*ڕۆژنامە... زۆسـیمۆف گوتی هەواڵی کوشـتنەکەی لە ڕۆژنامەدا خوێندووەتەوە.*

چووە ناو ڕێستۆرانتێکی گەورە و پاکوخاوێنەوە کە چەندان ساڵۆنی کەم تا زۆر خاڵیی هەبوو. پرسیی ڕۆژنامەیان هەیە یان نا. دووسێ کەس خەریکی چایخواردنەوە بوون و لە ساڵۆنی پشتەوەشدا چوار پیاو لە دەوری یەکدی دانیشتبوون و شامپانیایان دەخواردەوە. ڕاسکۆلنیکۆف وای هاتە بەرچاو کە لەنێویاندا چاوی بە زامیۆتۆف کەوتووە، وەلێ لەو مەودایەوە نەیدەتوانی بڵێت سەد لە سەد خۆیەتی. بیری کردەوە: *کریمان زامیۆتۆفیشە، جا چییە؟*

شاگرد پرسیی:

– حەزتان لە ڤۆدکا هەیە، قوربان؟

– چایم بۆ بێنە. ڕۆژنامەشم دەوێ، هی پێنج ڕۆژ لەمەوبەر هەتا ئەمڕۆ. لە بەخششەکەشت بێخەم بە.

– بە چاوان، بەڕێز. ئەمە جاری ڕۆژنامەی ئەمڕۆ، قوربان! کەواتە ڤۆدکاتان نەویست؟

ڕۆژنامەی کۆن و چای پێکەوە هێنان. ڕاسکۆلنیکۆف دانیشت و دەستی کردە هەڵدانەوەی لاپەڕە.

---

هێمای نەمێنییە؛ هەروەها دەبێت ئاماژەی پێ بکەین کە دۆستۆیڤسکی لە گەشتی ساڵی ١٨٦٢دا بۆ لەندەن بینای کۆشکی بلوورینی لە *هایدپارک*دا بینی –کە بۆ نمایشگەی گەورەی ساڵی ١٨٥١ دروست کرابوو– هەروەها کاریگەرییەکی ئینجیلیی لەسەر ئەو دانا. «و. ف»

– ئیزلیر[1]، ئیزلیر، ئاتسـیتکی، ئاتسـیتکی، ئیزلیر، بارتۆلا، مەسـیمۆ، ئاتســـیتکی، ئیزلیر... دەک ســـندانتان لێدا! ئەها، ئەوەتا... ژنێک لە پلیکـانەڕێوە کەوتووەتە خوار، دوکـانـدارێـک ئـارەقخواردنەوە سـووتاندوویەتییەوە، ئاگرکەوتنەوە لە گەڕەکی پێسـکی، ئاگرکەوتنەوە لە فلانە شوێنی پیتەربورگ، هەمدیسان ئاگرکەوتنەوە لە فلانە گەڕەکی پیتەربورگ، هەمدیســـان ئاگرکەوتنەوە لە فلانە بەشـــی پیتەربورگدا... ئیزلیر، ئیزلیر، ئیزلیر، ئیزلیر، مەسیمۆ... ئەها، دۆزیمەوە...

دواجار ئەو شـتەی دۆزییەوە کە بەدوایدا دەگەڕا و دەسـتی کردە خوێندنەوەی. وشـەکان لە بەرچاویدا سـەمایان دەکرد، بەڵام تا کۆتایی بـابەتەکەی خوێنـدەوە و بە تـامەزرۆییەوە لە ژمـارەگەلی دیکەی ڕۆژنـامەکەدا بەدوای درێژەی بـاســـەکەدا گەڕا. کە کـاغەزەکـانی هەڵدەدانەوە، دەســـتەکانی بەهەڵپە و پشـــووکورتانە دەلەرزین. کتوپڕ یەکێک هاتە لایەوە و لەپشت مێزەکەوە دانیشت. ڕاسکۆڵنیکۆف سەری هەڵهێنا. بەڵێ، ئەوە زامیۆتۆفی سەردەفتەر بوو، سەروسیماشی لەگەڵ جاری پێشـوودا تۆسـقاڵێک جیاوازیی نەبوو، هەمان ئەنگوسـتیلەکان و هەمان کاتژمێری زنجیردار، قژی ڕەشی بریقەدار، تەپڵەسەری قڵیشاو و ڕۆنلێـدراو، هێلەکی جوان، چـاکەتێکی کـاڵەوەبوو و کراســـێکی چلکەســـوو[2]. کەیفی کۆک بوو، خۆ هەر هیچ نەبێ دەمی تا بنـاگوێ دادڕابوو و سـەرخۆشـانە بزەی دەکرد. ڕووخسـاری مەیلەو سـەوزی لەتاو ئەو شـامپانیایەی کە خوردبوویەوە، گەشابووەوە. سەراسیمە و

---

١. بازرگانی بەناوبانگ و خاوەنی باخەکانی ئاوی کانزایی دەســـتکرد کە لە ســـاڵی ١٨٤٠دا کرایەوە و لە ســـاڵی ١٨٦٠دا لە کاتی ســـەردانیکردنی دۆســـتۆیفسـکیدا، بە بۆنەی یاریی ئاگرین و نمایش و لایەنی دیکەی ســـەرنجڕاکێشـــەوە بەناوبانگ بوو. «و. ف»

١. چلکەسوو: چلکشۆر: بە ڕەنگ و ڕووی چلکنەوە بەهۆی باشنەشۆردن.

بە دەنگێکەوە وەک ئەوەی تەمەنێک بێ یەکدی بناســـن، دەســـتی پێ کرد:

– ئێ! ئێوە لێرەن؟ ڕازومیخین دوێنێ دەیگوت ئێوە بێهۆش لە جێگەدا کەوتوون. زۆر ســـــەیرە ها! منیش هـاتبووم چـاوێکم پێتـان بکەوێ...

ڕاســـکۆلنیکۆف کە دەیزانی دواجار زامیۆتۆف لەســـــەر مێزەکەی دایدەکوتێ، ڕۆژنامەی خســـتە لایەکەوە و بەرەو لای ئەو وەرچەرخا. بزەیەکی هێنایە سەر لێو کە دەکرا جۆرە توونەمەزاجی و وەڕەزییەکی نوێ لە بزەکەیدا بەدی بکەیت. هاتە وەڵام:

– ئـاگـادارم کە هـاتبووی. ئەرێ، بەدوای گۆرەوییەکەشـــمـدا گەڕابووی... دەتزانی ڕاسکۆلنیکۆف بە دڵێک نا و بە سەد دڵ عاشـقت بووە؟ پێی گوتم بەیەکەوە چوونەتە لای لویزا ئیڤـانۆڤنـا، هەمـان ئەو خانمخاســـــەی کە دەتویســـــت خۆتی لێ نزیک بکەیەوە و، لەبەر ئەو چاوت لە ڕاگرە هەڵەشـەکەتان دادەگرت و ئەویش هەر ئاگای لە دونیا نەبوو! بیرت هاتەوە؟ مەسەلەکە هەر زۆر ڕوون بوو!

– ئەو کابرایە تەواو سەرەڕۆیە!

– کێ؟ ڕاگری هەڵەشە؟

– نا، ڕازومیخینی هاوڕێتان.

– خراپ ڕای نابوێرن ئێوە ها، بەڕێز زامیۆتۆف! هاتنەژوورەوەی بەلاش لە شوێنگەلی ڕاقی. ئێستە لەوێ شامپانیاکەت بە ملی کێدا دا؟

– تەنیـا لەگەڵ چەنـد هـاوڕێیەک چەنـد پێکێکمـان هەڵـدا... کەچی ئێوەش دەڵێن بە ملی کێمدا دا!

ڕاسکۆلنیکۆف پێکەنی:

– چاک بۆتان کەوتووەتە ڕاسـتە! ئێوەومانان لەژێر بەردیشـدا بێ پارە پەیدا دەکەن!

بە پشتی زامیۆتۆفیدا کێشا و بۆی زیاد کرد:

– کێشـە نییە، کوڕە گیان! لە بەدخوازییان نییە کە ئەمە دەڵێم، تەنیا گاڵتەت لەگەڵ دەکەم، وەک قۆشـمەیی ئەو بۆیەچییەتان لەگەڵ میتری کە بەر بووبوونە یەکتری... هەمان دۆسیەی پیرێژنەکە...

– باشە ئێوە چۆن ئەم هەواڵەتان پێ گەیشت؟

– ڕەنگە لە تۆ زیاتریشی لەبارەوە بزانم!

– کەسـێکی سـەیرن بە ڕاسـتی... گومان دەکەم هێشـتا نەخۆش بن. نەدەبوو بێنە دەرێ...

– ئۆو! یانی لات وایە من کەسێکی سەیرم؟

– بەڵێ دەی. ئەی ئێستە چۆنە خەریکی خوێندنەوەی ڕۆژنامەن؟

– جا ڕۆژنامەخوێندنەوە چییە.

– هەمووی باسی ئاگرکەوتنەوەیە...

– نا، من هەواڵی ئاگرکەوتنەوەکانم ناوێن.

ڕاسـکۆڵنیکۆف لەم کاتەی گوتوبێژەکەدا تەماشـایەکی گوماناویی زامیۆتۆفی کرد و هەمدیسـان هەمان بزەی گاڵتەجاڕانە بەسـەر لێوەکانییەوە سەمای دەکرد:

– هەواڵی ئاگرکەوتنەوەم نەدەخوێندەوە. وەلێ دانی پێدا بنێ، ئەی گەنجۆکەی نەرمونیان، دانی پێدا بنێ خەریکە سـوێت دەبێتەوە بۆ ئەوەی بزانی خەریکی خوێندنەوەی چی بووم، ها؟

– ئەسڵەن هیچ حەز ناکەم بزانم؛ تەنیا پرسیارێک بوو. یانی نابێ پرسیاریش بکەین؟ ئێوە بۆچی ئەوەندە؟...

– ئادەی گوێ بگرن! ئێوە کەسێکی خوێندەوار و ئەهلی ئەدەبیاتن، ها؟

زامیۆتۆف خۆی کۆ کردەوە و شکۆدارانە گوتی:

– من لە ڕاستیدا تا شەشی ئامادەیی...

– پۆلی شەش! وای چۆلەکە خنجیلانەکەم! بەو قژە دادڕاوەی تەپلەسەر و ئەنگوستیلانەیەوە! مناڵە دەوڵەمەند! ئۆو، ئۆو! وای لەو کوڕەخاسە سەرنجڕاکێشە!

ڕاسکۆلنیکۆف پفێکی لە دەم دەرچوو و ڕێک بە ڕووی زامیۆتۆفدا تریقایەوە. زامیۆتۆف کشایە دواوە، هێندەی حەپەسابوو ئەوەندە زویر نەبووبوو و زۆر جددی دووبارەی کردەوە:

– هەر بە ڕاستی سەیروسەمەرەن ئێوە! وا بزانم هێشتا خەریکی وڕێنەکردنن!

– وڕێنە دەکەم؟ نا، ئەوە تۆی کە خەریکی قسەی پەرتی، ئەی مەلۆتکە! یانی من سەیروسەمەرەم، ها؟ جێسەرنجم بۆت، ئەرێ؟

– دەی بەڵێ.

– دەتەوێ پێت بڵێم چیم دەخوێندەوە و بەدوای چیدا دەگەڕام؟ تەماشا، سپاردم ڕۆژنامەکانی ئەم چەند ڕۆژەم بۆ بێنن. مەسەلەکە گوماناوییە، ها؟

– ئێ، مەسەلە چییە؟

– گوێقولاخی؟

– یانی چی، گویقولاخ؟

– لەوە گەڕێ دوایی بۆت ڕوون دەکەمەوە. وەلێ، کوڕیژگەی خۆم، دەمەوێ ڕایبگەیەنم... نا، باشتره *دانی پێدا* بنێم... نا، ئەوەش نابێ؛ من شاهێدی دەدەم و تۆش شاهێدمی. ئەرێ، شاهێدی دەدەم کە خەریکی خوێندەوە بووم، سەیرم دەکرد و دەگەڕام بەدوای...

ڕاسـکۆلنیکۆف چاوانیی زیت کردنەوە و کەمێکیش وەسـتا. دواجار قسـەکەی کرد، کەم تا زۆر ورتەئاسـا و بە جۆرێک کە خەریک بوو دەموچاوی بە دەموچاوی زامیۆتۆفەوە بنووسێنێ:

– خەریک بووم بەدوای هەواڵگەلی پەیوەسـت بە کوشـتنی ئەو پیرێژنەدا دەگەڕام؛ ئەسڵەن هەر لەبەر ئەو مەبەستە هاتمە ئێرە!

زامیۆتۆف تەنانەت چاویشـی نەترووسـکاند و هەروا پێیدا واقووڕ بوو، نە جوولەی دەکرد و نە ڕووخساریشی دەکشاندە دواوە. ئەوەی کە پاشـان زیاتر لە هەر شـتێک نائاسـایی هاتە بەرچاوی زامیۆتۆف، ئەو بێدەنگییە بوو کە لەنێوانیاندا هاتە ئارا و خولەکێکیشـی خایاند و بە درێژایی ئەو ماوەیەش لێک ڕامابوون.

زامیۆتۆف دواجـار گێرخواردوو و پشـووکورت، هـاواری بەرز بووەوە:

– دەی، جا چییە کە خەریکی خوێندنەوەی هەواڵگەلی پەیوەست بە کوشتنەکەوە بوون؟ پەیوەندیی بە منەوە چییە؟ ئێستە چی دەڵێی؟

ڕاسـکۆلنیکۆف هەر وا ورتەئاسـا و بێ ئەوەی گوێ بە قسـەکانی زامیۆتۆف بدات، لەسەری ڕۆیشت:

– هەواڵی کوشتن و دۆسییەی ئەو پیرێژنەی کە لە نووسینگەکەتاندا باس دەکرا، خۆ بیرتە... ئەو کاتەی لەوێ بوورامەوە. دەی، تێگەیشتی؟

– مەبەستتان چییە؟ دەبێ لە چی تێبگەم ئاخر؟

زامیۆتۆف بە زۆر قسەی دەکرد و بەرەبەرەش خەریک بوو ترسی لێ دەنیشت.

لەپڕ باری ڕووخســاری جددی و بێجوولەی ڕاســکۆلنیکۆف تێک چوو و ڕاســت، وەک چەند خولەکێک لەوەوبەر، یەکێک لە پێکەنینە هیســترییەکانی خۆی بە ڕوودا کرد؛ دەتگوت بە هیچ جۆرێک ناتوانێت جڵەوی خۆی بکات. یاردگاریی پەیوەســت بە ڕابردووە نزیکەکەیی بە ڕوونی و برووسکەئاسا هێنایەوە یاد، ساتێک کە تەوربەدەست لەپشت دەرگەوە ڕاوەســتابوو و کڵۆمەکە دەلەرزی و ئەوانەی دەرێ جنێویان دەدا و دەرگەکەیان دەلەقاند و ئەویش لەناکاو کەوتبووە ســەری هاواریان بەســەردا بکات، جنێویان پێ بدات و بیانداتە بەر گاڵتە و پێبکەنێت و دەست بکاتە قاقالێدان، قاقا و قاقا!

– ئێوە یان ئەقڵتان لەدەست داوە، یان ئەوەتا...

زامیۆتۆف کە کتوپڕ دەستی کردبووە قسەکردن، بە هەمان ڕادەش کتوپڕانە بێدەنگ بوو، دەتگوت بێ پێشــەکی بیرۆکەیەکی بە زەیندا هاتبوو و لەجێوە وشکی کردبوو.

– یانی چی؟ بۆ نموونە چی؟ دەی بیڵێ، خێراکە!

زامیۆتۆف تووڕە بوو:

– هیچ! هەر هەمووی بێمانایە!

هەردووکیــان بێــدەنــگ بوون. ڕاســکۆلنیکۆف دوای پێکەنینێکی هیســتریایی، کتوپڕ خەم دایگرت و داڵغەی لێدا. ئەنشــکیی نایە ســەر مێزەکە و ســەریشــی خســتە ســەر دەســتەکانی و پێدەچوو هەر بە تەواوی زامیۆتۆفی بیر چووبێتەوە. تا ماوەیەک بێدەنگی لەئارادا بوو. زامیۆتۆف گوتی:

– بۆ چایەکەتان ناخۆنەوە؟ خەریکە ساد بێتەوە ها!

– چی؟ چای؟ ئۆو، بەڵێ...

ڕاسکۆڵنیکۆف چایەکەی تام کرد و پارووە نانێکی نایە دەمی. کتوپڕ ڕووانییە زامیۆتۆف و دەتگوت هەموو شـــتێکی هاتووەتە بیر و ئیدی خۆی کۆ کردەوە. هاوکات بارە گاڵتەجاڕانەکەی ڕووخســـاریشـــی گەڕایەوە. جا هەمیدسان کەمێک چای خواردەوە.

زامیۆتۆف گوتی:

– بەم دواییـانە لەم جۆرە تـاوانـانە گەلێک زیـادیـان کردووە، هەر دوێنێ لە ڕۆژنامەی *هەواڵی* مۆســـکۆدا خوێندمەوە کە دەســـتەیەک خراپەکاریان لە مۆســـکۆدا گرتووە کە پارەی تەزویریان لێداوە، بە هەموو ئەندامان و دارودەستەکەیانەوە. بلیتی سـاختەی یانسـیبیشـیان دروست کردووە!

– ئۆو! بەس خۆ ئەمە زۆر کۆنە! مـانگێ لەمەوبەر هەواڵەکەیم خوێندەوە.

ڕاسـکۆڵنیکۆف لەسـەرخۆ وەڵامی دایەوە و بەدەم بزەوە بۆی زیاد کرد:

– یانی ئاوا، یانی بە بۆچوونی ئێوە ئەمانە تاوانکارن؟

– گەر تاوانکار نین، ئەی چین؟

– ئەوانە؟ کۆمەڵێ منداڵومەزمی گەلحۆن، نەک تاوانکار! پەنجا کەس لە دەوری یەکتری کۆ بوونەتەوە بەبۆنەی شـــتێکی ئـاوهـاوە! لەو گاڵتەجاڕییە! بۆ ئەو کارە ســـێ کەســـیش زۆرە، جا ئەمەش گەر هەر کەســـێکیان زیاتر لە خۆی متمانەی بەوی تریان هەبێ! هەر ئەوەندە بەسە یەکێکیان بەدەم سەرخۆشییەوە زار هەڵبێنێ و هەموو شتێ بە با بچێ! گەلحۆینە! چەند کەسێکی ناشییان ڕاسپاردوون تا بلیتەکانیان بۆ بفرۆشـــن! هەر ئەوەمان نەدیتبوو کە مرۆڤ بۆ وەها کارێ متمانە

بە کەسانی نەناسراو بکا! باشە گریمان ئەم گەلحۆیانە سەرکەوتوو بوون و هەر یەکەیان ملیۆنێکیشی لە باخەڵ نا، ئەی دواتر چی؟ خۆ هەر کامێکیان تا کۆتایی تەمەن بەوانی دیکەوە دەبەسترێتەوە. خۆ خۆکوشتنیان باشترە! خۆ ئەمانە هەر نەشیانتوانیوە بلیتەکان بکەنە پارەی نەخت! کابرا چووەتە بانک، پێنج هەزار ڕۆبڵی وەرگرتووە و دەستەکانی لەرزیان لێ نیشتووە![1] چوار هەزاری ژماردووە کەچی هەزاری کۆتای پێ نەژمێردراوە، هێندە پەلەی ئەوەی بووە کە پارەکە بئاخنێتە گیرفانی و بۆی دەرچێ. خۆ دیارە ئەمە گومانارییە! هەموو شتێ سووک و ئاسان لەبەر حەپۆلیی کەسێ تێک چوو! ئاخر وەها شتێ چۆن دەکرێ؟

زامیۆتۆف گوتی:

– دەپرسن چۆن دەکرێ دەست بلەرزێ؟ بەڵێ، هەر زۆریش ئاساییە! من تەواو دڵنیام کە شتێکی ئاساییە. ئێ، ئەوە ڕوو دەدا کە مرۆڤ ئیتر کۆنترۆڵ لەدەست بدا.

– یانی لەبەر وەها کارێ کۆنترۆڵ لەدەست بدا؟

– یانی گەر ئێوە بان خۆتان کۆنترۆڵ دەکرد؟ نا، من شتی وام نەدەتوانی. یانی بۆ سەد ڕۆبڵێک ئەزموونێکی هێندە تۆقێنەر بکەم؟ بە بلیتی ساختەوە بچیتە بانک... بانکیش ئیشی ئەوەیە کە موو لە ماست بێنێتە دەر و بەم جۆرە شتانە دەزانێ! نا، من ئەو زاتەم نەبوو بچمە بانک و وەها کارێ بکەم. گەر ئێوە بان دەچوون؟

---

١. بەسەرهاتێکی هاوشێوە لە دەیەمی ئەیلوولی ساڵی ١٨٦٥دا لە ڕۆژنامەکانی مۆسکۆدا چاپ بوو. «و. ف»

ڕاسکۆلنیکۆف هەمدیسان کەوتەوە سەری کە باسەکە بکاتەوە بە قەشمەریات. پشتی کەوتبووە لەرزین و دواجار دەستی بە قسە کردەوە:

– گەر من بام بە جۆرێکی تر هەڵسوکەوتم دەکرد. هەزار ڕۆبڵی یەکەمم سێ چوار جار لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر و هەمدیسان بە پێچەوانەوە دەژماردەوە و چاکچاکێک سەیری یەک بە یەکی ئەسکەناسەکانم دەکرد. پاشان دەستم دەدایە دووەمین هەزار و تا نیوەم دەژمارد، پەنجا ڕۆبڵییەکم دەردەهێنا و لە بەردەم ڕۆشناییدا ڕامدەگرت، پاشان ئەودیوی ئەسکەناسەکەشم دەدایە بەر ڕۆشنایی و تا گوایە بزانم تەزویر نییە. پاشان ڕووم دەکردە فەرمانبەری ئەودیو هۆدەکە و دەمگوت: *نەگبەتییە، هەر ماوەیەک لەمەوبەر یەکێک لە خزمەکانم بەبۆنەی ئەم ئەسکەناسە تەزویرانەوە بیستوپێنج ڕۆبڵ زەرەری کرد* و جا پاشانیش و دەستم دەکردە گێڕانەوەی بەسەرهاتی درۆیینە. کە دەگەیشتمە سەر هەزاری سێیەم، دەمگوت: *نا، ئەی هاوار، وا بزانم لێم تێک چوو. ببوورن، لام وایە لە کاتی ژماردنی هەزاری دووەمدا لە حەوسەڵەدا هەڵەم کرد، یانی نازانم*... هەزاری سێیەمم وەلا دەنا و هەمدیسان دەچوومەوە سەر هەزاری دووەم و ئیتر بەم جۆرە تا کۆتایی. کە لە ژماردنی هەمووی دەبوومەوە، ئەسکەناسێکم لە دووەمین سەفتەدا دەردەهێنا و دانەیەک لە سەفتەی پێنجەم و دەمدانە بەر ڕۆشنایی و هەمدیسان دەمپرسی، *دەکرێ ئەمانە بگۆڕن، تکایە؟* بە کورتی، بە جۆرێک فەرمانبەرەکەم بەگیر دەهێنا کە سەری لێ بشێوێ. جا دوای تەواوبوونی کارەکە و کاتێک کە دەچوومە دەرەوەی بانک، دەگەڕامەوە و دیسان دەمگوت: *ئەی هاوار، ببوورن*... جا لەبارەی شتێکەوە داوای لێبوردنم لێ دەکردن. گەر من بام بەسەرهاتەکە وا دەبوو.

زامیۆتۆف پێکەنی و گوتی:

– وای! ئەمە چ قســەیەکە دەیکەن! وەلێ ئەمە تەنیا قســەیە. دڵنیام بێتە ســەر کردەوە ئێوەش دەســت و پێتان دەکەونە لەرزین و پەنێنک دەدەن. بڕوام وایە نەک هەر من و ئێوە، تەنانەت تاوانکاری شارەزا و دەستلەخۆشۆردوویش ناتوانێ تا ئەم ڕادەیە لە خۆی دڵنیا بێ! با هەر دووری بۆ نەڕۆین، ئائەم پیرێژنەی کە لەم ناوەدا کوشــتیان. بکوژەکە هەر دەڵێی تەواو ســەری لێ شێواوە کە ئاوها بە ڕۆژی ڕۆشن خۆی خســـتووەتە ئەو مەترســـییەوە. موعجیزەیە کە ئاوها ڕزگاری بووە. وەلێ ئەویش دەســـتی کەوتووەتە لەرزین و دزییەکەی پێ نەکراوە و دواجار کۆنترۆڵی لەدەست داوە. بە کارەکەشیدا دیارە...

وا دیار بوو ڕاســـکۆڵنیکۆف ئەمەی پێ ناخۆش بوو و بەدخوازانە قسەکەی بۆ زامیۆتۆف سەندەوە و قیڕاندی:

– دیارە؟ دەی گەر ڕاست دەکەن، بۆچی دەستگیری ناکەن؟ کارێکی ئەوەندە قورســە! بە بۆچوونی ئێوە پارەخەرجکردن یان نەکردنی ئەو خاڵێکی زۆر گرنگە: ئەوەی کە بزانن هەر کەســـێ پارەی نەبووە و ئێستەش کتوپڕ دەست بکاتە پەخشانوتەخشان، کەواتە بێگومان لەژێر سەری ئەودا بووە! بەم جۆرە منداڵێک دەتوانێ بتان خەڵەتێنێ!

زامیۆتۆف وەڵامی دایەوە:

– ڕاســـتییەکەی ئەوەیە کە تاوانکاران هەمیشـــە وا دەکەن. کابرا ژیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە و ئاگایانە تووشی تاوانێک دەبێ؛ جا دەســـتبەجێ دەچێتە مەیخـانە تـا چۆڕێ بخواتەوە! لە کـاتی پەخشـانوتەخشـاندا دەسـتگیر دەکرێن، خۆ وەک ئێوە زیرەک و وریا نین! گەر ئێوە بان هەرگیز نەدەچوونە مەیخانە، ها؟

ڕاسکۆڵنیکۆف مۆنی کرد و نیگایەکی توندی گرتە زامیۆتۆف:

– دەڵێی پێی دڵخۆشی، ئەرێ؟ حەز دەکەی بزانی گەر من بام چیم دەکرد؟

ناڕازیانە ئەمەی پرسی.

بەڵام زامیۆتۆف جددی و لێبڕاو پرسیی:

– دەی بەڵێ، حەز دەکەم بزانم.

ڕووخسار و ئاوازی دەنگی هەتا بڵێیت جددی بووبوو.

– زۆر؟

– زۆر!

– باشە، گەر من بام...

ڕاسکۆڵنیکۆف دیسان ڕووخساریی لە ڕووخساری زامیۆتۆف نزیک کردەوە، پێیدا واق بوو و ورتەورت –بەس ئەم جارەیان زامیۆتۆف بەرگەی نەگرت و لەرزی لێ هات– درێژەی پێدا:

– گەر من بام بەم جۆرە هەنگاوم دەنا: پارە و گەوهەراتەکەم هەڵدەگرت، لەوێ دەردەچووم و ڕێک بەرەو شوێنێکی چەپەک دەکەوتمە ڕێ کە چواردەوری حەسار بێت و باڵندەشی پێدا نەفڕێ، بۆ نموونە لەو باخچانەی کە دەیانکەنە چیمەن یان شوێنێکی لەو بابەتە. سەرەتا بە حەسارەکەدا بۆ بەردێ دەگەڕام کە بۆ نموونە بیست سی کیلۆیەک کێشی هەبێ و لەو ڕۆژەوەی کە ئەو بینایە لەو ناوەدا دروست کرابێ، ئەو هەر لەوێ بووبێ. بەردەکەم تل دەدا، چونکە بێگومان لەژێر وەها بەردێکدا چاڵێک، شتێک هەیە. گەوهەرات و پارەکەم دەخستنە ناو چاڵەکە و بەردەکەشم وەک جاران تل دەدایەوە شوێنی خۆی و بە پێ گۆشارم دەخستە سەری و جا ملی ڕێم دەنا و دەڕۆیشتم. تا ساڵێک، دوو ساڵ تەنانەت سێ ساڵ دواتریش دەستم لەو پارە و گەوهەراتەوە نەدەدا. جا ئێستەش ئێوە

بچن و هەموو جێیەک بگەڕێن! دە فەرموون دەســـتگیرم کەن گەر دەتوانن!

– ئێوە هەر بە ڕاستی شێتن!

زامیۆتۆف ورتەورت ئەمەی گوت و خۆی لە ڕاســـکۆڵنیکۆف کە چاوی پشـکۆئاسـا دەدرەوشـایەوە، ڕەنگی تۆقێنەرانە پەڕیبوو و لێوی سـەرەوەشـی داگیرسـا بوو و دەلەرزی، بەرەو دوا دوور خسـتەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف تا دەکرا بەرەو زامیۆتۆف داچەمی، لێوەکانی کەوتبوونە لەرزین، بەس یەک وشـــەی لە دەم نەدەهاتە دەر. ئەم دۆخە ســـی چرکەیەکی خایاند. دەیزانی خەریکە چی دەکات، بەڵام نەیدەتوانی بەر بە خۆی بگرێت. وشـەیەکی تۆقێنەر بەسـەر لێوەکانییەوە دەلەرییەوە، ڕێک وەک کڵۆمی دەرگەی پیرێژنە ســـووخۆرەکە؛ بۆی هەیە لە هەر سـاتێکدا فڕکە بکات و دەربچێت، هاکا جڵەوی لەدەسـت دا و هەموو شتێکی ئاشکرا کرد.

– ئەی ئەگەر من پیرێژنە و لیزاڤێتام کوشتبن؟

دواهەمین ڕسـتەی خۆنەخوازانە لە دەم دەرچوو و هەمان سـات تێگەیشت کە چ هەڵەیەکی کردووە.

زامیۆتۆف هەراسان تەماشای کرد و ڕەنگی وەک گەچ سپی بوو و زەردەخەیەکی لارویر پەڕییە سەر ڕووخساری. پاشان بە کزی زاری هەڵهێنا:

– هەر بە ڕاستی شتی وا ڕێی تێدەچێ؟

ڕاسکۆڵنیکۆف نیگایەکی چەپەڵانەی تێگرت:

– ئادەی، یەڵا، دانی پێدا بنێ کە بڕوات کردبوو! بڕوات کرد، ئەرێ؟

زامیۆتۆف شپرزانە هاواری کرد:

– بڕوام بە یەک وشەشی نەکرد. ئێستەش کەمتر لە هەر سات بڕوا بە قسەتان دەکەم!

– دەســـتم کەشــف کردی، ئەی چۆلەکەی ژیکەڵە! کەواتە پێشـــتر بڕوات پێ کردبووم کە ئێستە کەمتر لە پێشوو بڕوام پێ دەکەی؟

تەواو دیار بوو کە زامیۆتۆف ناڕەحەت بووە؛ هاواری کرد:

– بە هیچ شـــێوەیەک! یانی ئێوە بە درێژایی ئەم ماوەیە خەریکی ترساندنی من بوون تا بەم ئەنجامە بگەن؟

– یانی بڕوا ناکەی؟ گەر ڕاســت دەکەی، کاتێ لە نووســینگەکەتان چوومە دەرێ، لە پاشــەملەمدا چیتان گوت؟ بۆ ئەو ڕاگرە هەڵەشــەیە دوای ئەوەی بوورامەوە دامییە بەر پرسیار؟... هێی، تۆ...

لە کاتی ئەو دەربڕینەی دواییدا هەستایەوە و کڵاوەکەی هەڵگرت و ڕوو لە گارسۆن هاواری کرد و پاشانیش درێژەی پێدا:

– ئەرێ کوا نامەی کردەوەکانمان[1]؟

گارسۆن ڕایکردە پێشەوە و هاتە وەڵام:

– هەموو سی کۆپیک.

– ها، ئەوەش بیســـت کۆپیک بەخشـــش. تەماشـــای ئەو هەموو پارەیە...

دەستی پڕ لە ئەسکەناسیی بەرەو زامیۆتۆف درێژ کرد:

– یەک دونیا ئەسکەناسی سوور و شین؛ بیستوپێنج ڕۆبلی تەواو. تۆ بڵێی ئەمانەم لە کوێ هێنابن، ها؟ ئەم جلە تازانەم لە کوێ بوون؟

---

١. دەربڕینێکی تانەئامێز و گاڵتەجارانەی ڕاســکۆلنیکۆفە، کە هۆکارەکەی ناڕوونە و لە بنەڕەتدا مەبەستی حسێبی خواردەمەنییەکانە. «و. ک»

بیرتە کە تەنانەت یەک کۆپیکیشم نەبوو. گومانم نییە کە لێپێچینەوەت لەگەڵ خاوەنماڵەکەشمدا کردووە. دەی، بەسە ئیتر. چەنەبازی بەسە! بەهیوای دیدار... هەر شاد بیت!...

ڕاسکۆلنیکۆف لە ساڵۆنەکە چووە دەرێ. لەژێر کاریگەریی جۆرێک لە هیستریای دڕندانەی ئاوێتە بە شادییەکی بەرگەنەگیراو سەرتاپێی هەڵدەلەرزی، وەلێ هاوکات خەمگین بوو و بە شێوەیەکی تۆقێنەرانەش ماندوو. ڕووخساری، وەک ئەوەی تازە لە نۆرەیەکی فێ نەجاتی بووبێت، کرژ بووبوو. سات دوای ساتیش ماندوو و ماندووتر دەبوو. هەر جووڵە و هەر پاڵنەرێکی وروژێنەری بچووک، دەمودەست ئەوی دەخرۆشاند و زیندووی دەکردەوە، وەلێ لەگەڵ نەمانی پاڵنەرەکەدا، خرۆشانەکەش بە هەمان خێرایی دادەمرکایەوە.

زامیۆتۆف کە تەنیا مابووەوە، تا ماوەیەکی درێژ تێفکرانە هەر لەوێ دانیشت. ڕاسکۆلنیکۆف نائاگایانە شۆڕشێکی خستبووە زەینی ئەوەوە و گریمانەکانی پێشووی لەبارەی ئەم بابەتەوە ژێراوژوور کردبوون و وای کردبوو بۆچوونێکی مکووڕانەشی بۆ دروست ببێت. بنجبڕانە بڕیاری دا:

– هەر بە ڕاستی ئەم ئیلیا پیترۆڤیچە گەمژەیە.

ڕاسکۆلنیکۆف هێشتا دەرگەی ڕێستۆرانتەکەی تەواو نەکردبووەوە کە لەسەر پلیکانەکان تووشی ڕازومیخین بوو کە ڕووبەڕوو دەهات. کەم تا زۆر تا لووتیان بە لووتی یەکدییەوە نەتەقی، یەکتریان نەبینی. چەند ساتێک هەر وا ڕاوەستابوون و لە سەرەوە هەتا نووکی پێ لە یەکدی ورد دەبوونەوە. ڕازومیخین لەڕادەبەدەر سەراسیمە بووبوو، پاشانیش بریقەی هەڵچوونێکی جددی لە چاوانیدا درەوشایەوە و پڕ بە قورگی نەڕاندی:

– کەواتە پایەبەرز تەشریفیان لێرەیە! لە جێخەوەکەت دەرچووی و منی دەبەنگ تەنانەت ژێر تەختەخەوەکەشت گەڕام! سەرتاسەری بانەکەشم پێوا! وەخت بوو لەبەر تۆ لە ناستاسیاش بدەم و... کەچی جەنابی بەرزوبەڕێزتان لێرەن. ڕۆدیا! ئەمە چ هەڵسوکەوتێکە؟ ڕاستییەکەی بڵێ ئاخر ئەم کارانە یانی چی؟ قسە بکە! لەگەڵ تۆمە، نابیستی؟

ڕاسکۆلنیکۆف هێمنانە وەڵامی دایەوە:

– یانی ئەوەی کە هەتا خوا حەز کا لێتان بێزارم و دەمەوێ تەنیا بم.

– دەتەوێ تەنیا بی؟ تۆیەک کە ناتوانی هەنگاو بنێی و هەر وەک مردوو بێڕەنگوڕوویی و هەناسەشت بۆ نادرێ، تەنیا بی؟ گەمژە خان!... ئێشت بە کۆشکی بلووری چی بوو کە هەڵساویت و ئەم هەموو ڕێیەت بڕیوە؟ قسە بکە، ئادەی!

– وازم لێ بێنە!

ڕاسکۆلنیکۆف ئەمەی گوت و هەوڵی دا بەتەنیشتیدا تێپەڕێت. ڕازومیخین کە ئیدی گەیشتبووە سەر لێوی، توند شانیی گرت:

– وازت لێ بێنم؟ ئاخر تۆ بەشەرێکی چەندە بێچاووڕووی کە من گیانم دەرچووە بەدەستەوە و ئێستەش پێم دەڵێی وازم لێ بێنە؟ دەزانی چیت لێ دەکەم؟ لە جێوە بەرزت دەکەمەوە، دەتکەمە نێو بوخچەیەکەوە، دەتدەمە بنباڵم و دەتبەمەوە ماڵێ و لەوێش دەرگەت لەسەر قوفڵ دەدەم!

ڕاسکۆلنیکۆف کە پێدەچوو تەواو هێمن بێت، بە دەنگێکی شێنەیەوە دەستی پێکرد:

– تەماشا، ڕازومیخین... هەر بە ڕاستی دەرک بەوە ناکەی کە من خۆشەویستی و مرۆڤدۆستیی تۆم ناوێ؟ ئەمە چ کارێکە تۆ دەتەوێ خۆشەویستیی خۆت لە کەسێکدا خەسار بکەی... کە تف دەکاتە هەر ئەرکێ کە تۆ بۆیت کێشاوە! باشە تۆ بۆچی کاتی نەخۆشکەوتنم سۆراخت کردم؟ گاهەس[1] من حەزم کردبێ بمرم. ئەی هەر ئەمڕۆ پێم نەگوتی تۆ خەریکە ئەشکەنجەم دەدەی و پێت... پێت پەستم؟ دەڵێی کەیفت بە ئەشکەنجەدانی خەڵکی دێ! بڕوات هەبێ ئەم کارانەت تەنیا جێگیربوونی تەندروستیم دوا دەخەن و هیچی تر، چونکە تەنیا و تەنیا ئەشکەنجەم دەدەن. هەر ئێستە خۆت بینیت کە زۆسیمۆف ڕۆیشت تا نەکا پێی توورە بم. تۆش بیکە خاتری خوا و لە کۆڵم بەوە! باشە تۆ چۆن مافی ئەوەت هەیە هەر بە زۆر چاودێریم بکەی؟ نابینی ئەقڵ و هەست و هۆشم لەسەر خۆیەتی؟ خۆت بڵێ چۆن قاییلت بکەم کە بەو خۆشەویستییەت کەساسم نەکەی؟ بەڵێ، من ڕەنگە پێزان نەبم، ڕەنگە کەم و بەدگەوهەر بم، دەی کەواتە وازم لێ بێنە! بۆ خاتری خوا وازم لێ بێنە! وازم لێ بێنە!

لەسەرخۆ دەستی پێ کردبوو و پێشوەختە چێژی لە دەربڕینی ئەو ڕستە ژەهراوییانەی دەبرد، وەلێ هەناسەسوار و بە بارێکی شێتانەوە قسەکانیی تەواو کردن، هەمان ئەو بارەی کە لە کاتی بەرکەوتنی لوژندا تووشی بووبوو.

ڕازومیخین خولەکێک هەر وا ڕاوەستا، بیرێکی کردەوە و دەستی بەسەر شانی ڕاسکۆڵنیکۆفەوە لابرد و تێفکرانە گوتی:

– بڕۆ ملت بشکێنە!

بەڵام لە بارێکدا کە ڕاسکۆڵنیکۆف خەریک بوو بەڕێ کەوێت، کتوپڕ قیڕاندی:

---

١. گاهەس: لەوانەیە؛ کێ نالێ.

– ڕاوەســـــتە! چـاک گوێ بگرە بزانە چیـت پێ دەڵێم. دەبێ بڵێم ئێوەومانان پڕن لە قســـــەی زل و هاشـــــوهووشـــــی پڕوپووچ! هەر ئێوەومانان، پشیلە بتانشێلێ وەک مریشکی کڕ فس دادەدەن و ناڵەتان دەگاتە ئاســـمان. تەنانەت هەرچی قســـەشـــتان هەیە لە نووســـــەرە بیانییەکانتانەوە دزیون. هەموو بوونتان بپشـــکنن ئاســـەواری ژیانێکی ســـــەربەخۆی تێدا نـادۆزنەوە! ئێوەومـانـانیـان لەجێی خوێن، ڕۆنی نەهەنگ درووست کردووە، ئاو بە دەمارەکاتاندا دەگەڕێ! هیچ کامتان پەســـەند ناکەم! لەژێر هەر هەلومەرجێکدا بێ ئامادەن ببنە هەر شـــتێ بێجگە لە ئادەمیزاد! بوەستە، وا قسەت لەگەڵ دەکەم!

ڕازومیخین کە بینیی وا ڕاســـــکۆڵنیکۆف بەتەمایە بڕوات، قینەکەی دووهێندە زیادی کرد و قیڕاندی:

– دەبێ هەر هەمووی ببیســـتی! دەزانی من ئەم عەســـرە بەبۆنەی خانووە تازەکەمەوە میوانیی ســـــاز دەدەم، لەوانەشـــــە هەر ئێســـــتە میوانەکان گەیشـــتبن، وەلێ من لەوێ خاڵمم بە تەنیا جێ هێشـــتووە. هەر ئێســـتە ســـەرێکم لێ دا و خێرا بۆی دەرچووم تا بێمە شـــوێنت و هەموویانم بە تەنیا جێ هێشـتن. ئاخ، گەر تۆ هێندە گەمژە نەبای، گەر گەمژەیەکی پڕوپووچ نەبـای، گەر کەرێکی ئـاولێڵنەکەر[1] نەبـای، ئـاخ، ئەگەر نووســـخەی ئەسڵی دەبووی نەک نووســـخەی ڕوونووســـکراو و وەرگێڕراو... تەماشا ڕۆدیا، چاک دەزانم کە تۆ ژیری، وەلێ گەمژەشی! گەر گەمژەش نەبای لەجێی ئەوەی بە شـــــەقامدا بســـــووڕێیتەوە، ئەم عەســـرە دەهاتییە ماڵی من! ئێســـتەش کە هاتوویتە دەرێ، ئیتر کار لە کار ترازاوە! لە ماڵەکەمدا جوان لەســـەر ئەســـکەملەیەکی گەرم و نەرم دادەنیشـــــێنم کە لە خـاوەنمـاڵەکەمم وەرگرتووە... فنجـانێـک چـای دەخۆیتەوە و چاوت بە چوار کەســــێک دەکەوێ.... یان هەر دەتوانی

---

١. کەرێکە ئاو لێڵ ناکا: مرۆڤێکی تەواو بێتەقڵ و ئاوەز. کەری ئاولێڵنەکەر: تەواو بێئاوەز و گەمژە.

لەسەر قەنەفە بۆ خۆت ڕابکشێیت و هەرچۆنێک بووە لای خۆمان بی. ئەوە زۆسیمۆفیش لەوێیە. خۆ تۆش دێی؟

– نا.

ڕازومیخین کە ئیتر گەیببووە سەر لووتی، قیڕاندی:

– باشـــە ئەوە تۆ چی دەڵێی! تۆ ناتوانی خاوەنی قســـەی خۆت بی، چۆن دەزانی کە نایێی؟ تۆ لەم شـــتانە هەر تێشـــناگەی... من زیاتر لە هەزار جار لەگەڵ خەڵکی دەســـــتەویەخە بوومە، وەلێ دواتر بە پێی خۆم چوومەتەوە بۆ لایان... ئاخرییەکەی تەریق دەبیتەوە و بە پێی خۆت دەگەڕێیتەوە! کەواتە بیرت نەچێ، بینـــای پـــاچینکۆف، نهۆمی سێیەم...

– هەر وا لەســـــەری بڕۆ جەنابی ڕازومیخین، تا بەرەبەرە بگەیتە ئاســـتێ کەســـێک ناچار بکەیت شـــەقکاریت بکا تا ئەوســـا چێژ لە چاکەکاری وەرگری!

– کێ شـــــەقکاری بکەن؟ من؟ حەدیـان نییە، کەس زاتی نەبووە تەنانەت بیریشی لێ بکاتەوە، لووتی لە خۆڵ وەردەدەم! ڕێک دەیڵێم تا بیرت نەچێ: بینای پاچینکۆف، ژمارە ٤٧، ئەپارتمانی کارمەندێک بە ناوی بابۆشکین...

– من نایێم، ڕازومیخین.

ڕاسکۆڵنیکۆف وەرسووڕا و دوور کەوتەوە.

ڕازومیخین بەدوایدا هاواری کرد:

– دێی و چاکیش دێی! گەر نەیێی تا ماوی ناوت نابەم! ئا بوەســـــتە بزانم، هۆووو! ئەی زامیۆتۆف لێرەیە؟

– ئەرێ، لەوێیە.

– تۆ بینیت؟

– بینیم.

– قسەشت لەگەڵ کرد؟

– قسەشمان کرد.

– ئەی چیت پێ گوت؟ پێویست ناکا بیڵێی، چاوت دەرەهات! کەواتە بینای پاچینکۆف، ژمارە ٤٧، ئەپارتمانی بابۆشکین، بیرت نەچێ!

راسـکۆڵنیکۆف بەدەم هەنگاونانەوە دوور کەوتەوە و خۆی بە شەقامی سادۆڤایادا کرد. رازومیخین بەدەم فکر و خەیاڵەوە لە پشترا لێی دەڕوانی، پاشان دەستێکی ڕاوەشاند و ویستی بچێتە ژوور، وەلێ هەر لەوێ و لەسەر پلیکانەکان ڕاوەستا و کەم تا زۆر بە دەنگێکی بەرزبەرز لەسەری ڕۆیشت:

– دەی بە نەفرەت بێ! قسەکانی بە گۆترە نەبوون... خۆ منیش زۆر دەبەنگم! باشە یانی شێتەکان ناتوانن دوو قسەی ڕێکوپێک بکەن؟ لام وایە زۆسیمۆفیش ڕێک لەمە دەترسا!

پەنجەی بە لاجانگیدا کوتی:

– وەلێ ئاخر... چۆن وێڵی بکەم بە تەنیا بڕوا؟ ئەوە ڕۆیشت و خۆی خستە ناو ئاو... ئاخ، چ هەڵەیەکم کرد! نا ئەمە ڕاست نییە!

جا هەڵهات تا بە ڕاسکۆڵنیکۆف ڕابگاتەوە، بەڵام ئیتر ئەو دیار نەمابوو. ڕازومیخین تفێکی کردەوە و بە هەنگاوی خێرا بەرەو کۆشکی بلوورین گەڕایەوە تا بتوانێت قسەیەک لە زامیۆتۆف دەربهێنێت.

ڕاسکۆڵنیکۆف ڕاستەوڕاست بەرەو پردی ڤازنێسنسکی ڕۆیشت و لە ناوەڕاستی پردەکەدا ڕاوەستا، هەردووک ئەنیشکی نانە سەر

پەرژینەکەی و لە ئاسۆ راما. ئەو کاتەی رازومیخینی جێ هێشت هێندە بێهاز بوو کە تەنانەت بە دژواری تا پردەکە بڕی کرد. زۆری دڵ پێوە بوو لە شوێنێکی ئەو شەقامەدا دابنیشێت یان رابکشێت. بەرەو ئاوەکە چەمییەوە و نائاگایانە لە دواهەمین درەوشانەوەی گوڵباوی[1] زەردەپەڕ راما، لە دیمەنی ریزەماڵێک کە لە بەر شـــالاوی تاریکیدا، لێڵ و لێڵتر دەچوونەوە و، هەروەهـا لە پەنجەرەی ژوورێکی ژێر بـانەلێژی لای چەپی کەنداوەکە، کە لە بەر پاشـماوەی تیشـکی دەمەو ئاوابووندا بە جۆرێک دەدرەوشایەوە وەک ئەوەی گڕی گرتبێت. تەماشـایەکی ئاوی کەنداوەکەشی کرد کە ڕەش دەچووەوە و وا دیاربوو ئاوەکە سەرنجی راکێشـــاوە. دواجار بازنەگەلێکی ســـوور لە بەرچاوانیدا دەرکەوتن و دەتگوت مــاڵەکـان کەوتوونەتە جووڵە. ڕێبواران، قەراخ ئـاوەکە و گالیســکەکان و هەموو شـتێک لە بەرچاویدا کەوتبووە ســەما. کتوپڕ راچەنی، وا دیـارە ئەم جـارەیـان بەهۆی دیمەنێکی تۆقێنەر و نائاســاییەوە راچڵەکیوە. هەســتی کرد کەســێک لە لای راســتییەوە راوەســتاوە. تەماشــای کرد و ژنێکی بەژنبەرزی ڕەنگزەردی دیت کە دەسماڵێکی بە سەرییەوە بەستووە بە دیدەی چەشنی گۆمی خوێن و بەچاڵداچووەوە. ژنە راست چاوی لەو بڕیبوو، بەس وەک ڕۆژ ڕۆشن بوو کە هیچ نابینێت و کەس ناناســێتەوە. لەپڕ دەســتی راســتیی بە سەکۆکەوە نا، ســەرەتا پێی راستی بردە ئەودیو پەرژینەکە و پاشـان پێی چەپی و خۆی هەڵدایە ناو کەنداوەکە. ئاوە لێڵەکە باوەشی کردەوە و لە چرکەساتێکدا قوربانییەکەیی هەڵلووشـی، بەلام بۆ سـاتێک دواتر ژنەی نغرۆبوو کەوتەوە ســەر ئاو. هێمن‌هێمن بە ئاراســتەی ئاوەکەدا دەجوولا و سەر و پێی بە ئاو داپۆشرابوون و داوێنی وەک سەرینێک بەسەر پشتییەوە فوو درابوو.

دەیان دەنگ پێکرا کەوتنە هاتوهاوار:

---

[1] گوڵباو: سووری ئاڵ.

– وا دەخنکێ! ژنە وا دەخنکێ!

خەڵکی ڕایان کردە پێشـــەوە، لە هەردووک قەراخەوە ئاپۆڕای تەماشـــاڤان جمەی دەهات. لەســـەر پردەکە خەڵکی لە چواردەوری ڕاسکۆلنیکۆفدا کۆ بووبوونەوە و لە پشتڕا بە سەکۆکەیانەوە گوشی. ژنێک لەو نزیکانەوە هاواری کرد:

– خوایاااا! خۆ ئەوە *ئافراســـینیای* خۆمانە! ئەی خوایە! ڕزگاری کەن، خەڵکینە! دەری بێنن!

لەنێو کۆمەڵی خەڵکەکەوە یەکێک قیڕاندی:

– بەلەم! بەلەم بێنن!

بەڵام بەلەم پێویست نەبوو، پاسەوانێک بە پلیکانەکاندا فڕکەی کردە لای کەنداوەکە، پاڵتۆ و پووتەکانیی داکەندن و فڕێی دانە لایەکەوە و تیژ خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە. ژنە چەند مەترێک لەولای پلیکانەوە بەدەم ئاوەکەوە بوو و پاســـەوانەکە بە ئاســـانی خۆی گەیاندێ. بە دەســـتی ڕاســـتی جلی ژنەی گرت و بە دەســـتە چەپیشـــی توند شـــوشـــکەکەی[1] گرت کە هـاوڕێکەی بەرەو لای درێژی کردبوو؛ دەســـتبەجێ ژنەی نغرۆبوویان دەرهێنایەوە و لەســـەر بەردفەرشـــی کەنارەکەدا ڕایانکێشـــاند. زۆر زوو هاتەوە ســـەر خۆی، ســـەری بەرز کردەوە، هەر لەوێ دانیشـــت و دەســـتی کردە کۆکە و پژمە و بە شێوەیەکی دەبەنگانەش کەوتە پاککردنەوەی کراسە خووساوەکەی و نقەی لێوە نەدەهات.

دەنگی شـــینوشـــەپۆڕی ژنەکەی پێشـــوو بەرز بووەوە کە ئێســـتە لەتەک ئافراسینیاوە دانیشتبوو:

---

١. شـوشـک: لس؛ لیس؛ باتۆم؛ کورتە تێلایەکی لە دار یان پلاستیک کە پاسـەوانان، وەک چەکی سارد هەڵی دەگرن.

– ئەوەندە سەرخۆشە ئاگای لە دونیا نەماوە و خۆیشی ناناسێتەوە! هەر لەم ڕۆژانەدا بەتەما بوو خۆی لە دار بدا کە گوریسەکەمان پچڕاند و دامانگرت. وا ئێستەش تەنیا خولەکێ چوومە دوکان شتێ بکڕم و کچەکەمم لەلای جێ هێشت تا ئاگاداری بێ... تەماشا دیسان تووشی چ نەگبەتییەک بووین! ئەم داماوە دەستگێرە! هەر لەم ناوەدا خەریکی دەستگێرییە. ئەلەم نزیکانە دادەنیشین، دووەمین بینا لەوسەرەوە، تەماشا، ئەوێ...

خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد. پاسەوانەکە هێشتا لای ژنە بوو و کەسێکیش قسەیەکی لەبارەی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسەوە فڕێدا... ڕاسکۆڵنیکۆف بە خەمساردی و گوێنەدانێکی سەمەرەوە دەیڕوانی و لەبەرخۆیەوە ورتاندی: *نا، چەپەڵانەیە... ئاو... ئاو بە کەڵکی ئەم کارەیە نایێ. تەواو، بڕیار نییە شتێ ڕوو بدا!* پاشانیش درێژەی پێدا: *بێسوودە لەوە زیاتر چاوەڕێ بم. ئەمانە چییان دەگوت لەبارەی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسەوە؟... ئەی بۆچی زامیۆتۆف لەسەر کارەکەی نەبوو؟ خۆ بەڕێوەبەرایەتی تا کاتژمێر دە کراوەیە...* پشتی کردە پەرژینەکە و چاوێکی بە چواردەوریدا گێڕا.

پاشان لێبڕاوانە گوتی: *دەی، جا چییە؟ بە توون!* لە پردەکە تێپەڕی و بەرەو بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس چوو. دڵی خاڵی و بۆش بوو. نەیدەویست بیر لە هیچ بکاتەوە. تەنانەت هەڵچوونەکەشی دامرکابووەوە. ئێستە ئیدی هیچ ئاسەوارێک لەو کەفوکوڵ و وزەیەی نەمابوو کە کاتی هاتنەدەر بۆ تەواوکردنی هەموو شتێک هەیبوو و خەمساردییەکی تەواو شوێنەکەی گرتبووەوە.

لە بارێکدا کە تەکەتەک و بێتاقەت بە قەراخ ڕێژاوەکەدا تێپەڕی، بیری کردەوە: *دەی، هەڵبەتە ڕێگەیەک هەیە. من کۆتایی پێدەهێنم، خۆم دەمەوێ کۆتایی پێ بهێنم... وەلێ ئیتر پیاو تیادەچێ، وایە؟ ئیتر هیچ جیاوازییەکیشی نییە! خۆ ئەو بستە جێگەیەم هەیە، هاها! وەلێ*

*ئیمەیش ئاقیبەتێکی ســـەیرمان هەبوو ها! هەر بە ڕاســـت یانی ئیتر تەواو؟ دواجار مەســـەلەکەیان لا دەدرکێنم یان نایدرکێنم؟ دەک... نەفرەت لەم دۆخە! چەندە شـەکەتیشـم: بریا زوو دەگەیشـتمە شـوێنێ بتوانم لێی دانیشـــم یان ڕاکشـــێم! ئەم دۆخە گەمژانەیە زیاتر لە هەر شتێ مایەی شـوورەییە! بەس ئیتر ئەمەشـم بۆ گرنگ نییە! ئاە مرۆڤ چ هەڵیتوپەڵیتێکی بە مێشکدا دێ...*

بۆ گەیشتنە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس دەشیا ڕاست بڕوات و لەسەر دووەمین قەمچ[1] بەلای چەپدا پێچ بکاتەوە و ئیدی بەڕێوەبەرایەتییەکە دوو هەنگاوێک لەو ناوەوە دوور بوو. وەلێ کە گەیشــتە پێچی یەکەم، ڕاوەســتا و بیری کردەوە، خۆی بە لاکۆڵانێکدا کرد و بە درێژایی دوو شەقام ڕێگەی دوور کردەوە. بۆی هەبوو نیازێکیشی نەبێت، لەوانەش بوو مەبەســـتی بێت تەنانەت گەر خولەکێکیش بێت درەنگتر بگات و کاتی بۆ بگەڕێتەوە. لە بارێکدا کە هەر وا بەدەم هەنگاونانەوە چاوی لە زەوی بڕیبوو، کتوپڕ دەتگوت کەســـێک شـــتێکی بە گوێیدا ورتاند. ســـەری بەرز کردەوە و بینیی وا لە بەردەم دەرگەی *ئەو بینایە*دا ڕاوەســـتاوە. لە یارۆ ئێوارەکەوە ئیدی نە بە بەردەم ئەو بینایەدا ڕابردبوو و نە تەنانەت لێشی نزیک بووبووەوە[2].

حەزێکی لێڵ و وەسفهەڵنەگر ئەوی بەرەو پێش ڕادا. چووە ژووری و لە ڕاڕەوەکە تێپەڕی و لە یەکەمین دەرگەی لای ڕاســـتەوە چووە ژووری. بە پلیکانە ئاشـــناکاندا ملی نا تا بەرەو نهۆمی چوارەم بچێتە ســـەرێ. پلیکانە باریک و کەم تا زۆر ســـتوونییەکە، تاریکتاریک بوو. ڕاســـکۆڵنیکۆف لە هەر باداکێکدا ڕادەوەســـتا و فرە کونجکۆلانە چاوی

---

١. قەمچ: پێچ.

٢. بە گوتەی *تیخۆمیرۆف*، شرۆڤەکاری ناسراوی *تاوان و سزا*، ڕاسکۆڵنیکۆف یان لەوانەیە خودی دۆســتۆیفســکی بیری چووە کە پاڵەوانەکە بەیانیی دوای تاوانەکە لە ڕێگەی بەرەو بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، هەر بەوێدا ڕابردووە. «و. ف»

بە چواردەوریـدا دەگێڕا؛ لە بـاداکی نهۆمی یەکەمـدا چوارچێوەی پەنجەرەکەیان دەرهێنابوو. بیری کردەوە: *ئەو ڕۆژە وا نەبوو.* پاشـان گەیشـتە نهۆمی دووەم و ئەو ئەپـارتمـانەی کە میتری و میکۆلای کاریان تێدا دەکرد. *قوفڵیان لێ داوە و دەرگەکەشـی تازە ڕەنگ کراوە؛ کەواتە بڕیارە بەکرێی بدەن.* ئەوەش نهۆمی سـێیەم... جا چووارەم. *ئەوەتا!* حەپەسـابوو: دەرگەی ئەپارتمانەکە لەسـەر پشـت بوو و چەند کەسـێکیش لە ژوورەوە بوون و لەوێڕا دەیتوانی دەنگیان ببیسـتێت؛ بیری لەمە نەکردبووەوە. دوای ئێسـتێک بە چەند پلیکانەکەی دیکەشـدا سەر کەوت و چووە ئەپارتمانەکەوە.

چەنـد کرێکـارێـک خەریکی گسـکـدان و بۆیەکردنی بوون. وا دەردەکەوت پەشۆکاو و گێژکەوتووە و لەبەر چەند هۆکارێکی ناڕوون لای وا بوو هەموو شتێک هەر وەک جاران ماوەتەوە و تەنانەت دەبێت تەرمەکانیش ڕێک لە شـوێنی خۆیان و بەسـەر زەوییەکەوە کەوتبن. وەلێ ئێستە دیوارەکان ڕووتوقووت بوون و هیچ کەلوپەل و ناوماڵێک بەرچاو نەدەکەوت؛ هەموو شـتێک بە جۆرێکی دی دەهاتە بەرچاو. بەرەو لای پەنجەرەکە چوو و بەسەر لێوارەکەیەوە دانیشت. تەنیا دوو کرێکاری لێ بوون، کە هەردووکیان گەنج بەڵام دانەیەکیان زۆر لەوی دیکە کەمتەمەنتر بوو و خەریک بوون کاغەزدیوارییەکی تازەی سـپیی پڕ لە گوڵی یاسـی وەنەوشـەییان بە شـوێنی کاغەزدیوارییە کۆنە و پیسـەکەی جارانەوە دەلکاند. دیار نەبوو بۆچی ڕاسـکۆلنیکۆف ئاوها بەو کارەیان پەسـتە و دژمنانە تەماشـای کاغەزدیوارییە تازەکەی دەکرد و دەتگوت لە ناخەوە داخدارە بەوەی کە وا هەموو شـتێک خەریکە دەگۆڕێت. دیار بوو کە کرێکارەکان زیاد لە کاتی دیاریکراوی خۆیان ماونەتەوە و خەریک بوو بلەز کاغەزەکانیان لوول دەکردن و خۆیـان دەپێچـایەوە تـا بڕۆن. سـەرگەرمی قسـەکردن بوون و بە هـاتنەژووری ڕاسـکۆلنیکۆفیـان هەر نەزانی. ڕاسـکۆلنیکۆفیش

دەستلەسەرسنگ دانیشت و گوێی گرت. کرێکارە گەورەکە بە هاوکارە بچووکترەکەیی گوت:

– ئەم ژنە ســـەرلەبەیانی هـاتە لام، زۆر زووش. ســـووراو و سپیاوێکی چاکیشی کردبوو! گوتم: *وات زانیوە چییە، کە ئاوا لەبەردەم مندا مەکر و ناز دەکەی و پەڕ و باڵت دەنوێنی؟*... گوتی: *تیت ڤاسیلیچ، من تەنیا و تەنیا دەمەوێ بەتایبەت لە خزمەت ئێوەدا بم!* گەیشـتووەتە ئەوە ئیتر! ئەوە باسی سەروسەکوت و جلوبەرگی هەر مەکە! ڕێک لە ناو گۆڤارێکەوە هاتووەتە دەر، ڕێک هەر وەک هی ناو گۆڤارەکان!

– گۆڤار چییە، مامۆستا گیان؟

ئاشـــکرا بوو کە کرێکارە گەنجترەکە ئەوی دیکەی بە مامۆســـتای خۆی دەزانی.

– گۆڤـار، کـاکی من، دونیـایەک وێنەی تێـدایە و هەموویشـــی ڕەنگاوڕەنگ. هەموو شـــەممانێک لێرە بۆ بەرگدوورەکانی دەنێرن، لە هەندەرانەوە بۆیان پۆســـت دەکەن تا چۆنییەتی جلپۆشـــین نیشـــانی خەڵکی بدەن، ژن و پیاویشـــی بۆ نییە. دەڵێی تابلۆن. پیاوەکانیان کەم تا زۆر هەمووی چاکەت لە بەر دەکەن، جا با بەشە ژنانەکانی لەولاوە بوەستێ، کاکی خۆم، شتی وای تیایە کە بە خەونیش نایبینی و من بە هەرهەموویان تێر نابم!

گەنجەکە بە تامەزرۆییەوە هاواری کرد:

– هیچ شتێک نییە پیاو لەم پیتەربورگە سندانییەدا دەستی نەکەوێ! بێجگە لە دایک و باوکی، دەڵێی لە هیچی کەم نییە!

ئەوی دیکەشیان وتاربێژانە گوتی:

– بەڵێ، بێجگە لەمەیان، هەموو شتێ دەست دەکەوێ، کاکی خۆم.

ڕاسکۆڵنیکۆف هەستایەوە و چووە ناو ئەو ژوورەی کە پێشتر تەختەخەو و دۆلاب و سندووقچەکەی لێبوون؛ ژوورەکە بێ کەلوپەل و ناومال گەلێک بچووک دەهاتە بەرچاو. کاغەزدیوارییەکە نەگۆڕدرابوو و هێشتا شوێنی مێزی کۆتەڵەکە لە قوژبنێکەوە بەسەر کاغەزدیوارییەکەوە دیار بوو. ڕاسکۆڵنیکۆف، بە حاڵ چاوێکی خشاند و گەڕایەوە لای پەنجەرەکە. کرێکارە گەورەترەکە زیتزیتێک سەیری کرد و کتوپڕ پرسیی:

– ئیشێکتان هەبوو، قوربان؟

ڕاسکۆڵنیکۆف لەبری ئەوەی وەڵام بداتەوە، چووە ڕاڕەوەکە و زەنگەکەی لێدا، هەمان زەنگ و هەمان زایەڵەی شکاو. دووبارە و سێبارە زەنگی لێدایەوە و گوێی گرت و بیری هاتەوە، هەمان ترسی تۆقێنەر و پڕئازاری ئەو ڕۆژە، ئەم جارەیان خەریک بوو ئاشکراتر دەهاتە سەروەختی. لەگەڵ هەر زەنگێکدا سەرتاپا لەرزی لێ دەهات و هەر ساتەو زیاد و زیادتریش هەستی بە قایلبوون دەکرد.

کرێکارەکە بۆی هاتە دەرێ و هاواری کرد:

– چیت دەوێ لێرە؟ باشە تۆ کێی؟

ڕاسکۆڵنیکۆف هەمدیسان چووەوە ژوور و گوتی:

– دەمەوێ ئێرە بە کرێ بگرم. وا سەیری دەکەم.

– شەو و تەماشای خانوو! دەبوو لەگەڵ قاپچی بێی!

ڕاسکۆڵنیکۆف درێژەی پێ دا:

– ژوورەکەشتان شۆردووەتەوە! بۆیەشی دەوێ؟ خۆ خوێنەکە ئاسەواری نەماوەتەوە؟

– خوێنی چی؟

– ئێ پیرێژنە و خوشـــکەکەیان لێرەدا کوشـــتن. ئێرە لە خوێن گەوزابوو.

کرێکارەکە تەنگپێهەڵچنراوانە هاواری کرد:

– باشە تۆ کێی؟

– من؟

– ئەری، تۆ.

– زۆر حەز دەکەی بزانی؟... با بچینە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس تا پێت بڵێم.

هەردووک کرێکارەکە واقووڕ تەماشایان دەکرد.

کرێکارە گەورەکەیان گوتی:

– درەنگ کەوتووین، ئیتر کاتی ڕۆیشـــتنە. دەی وەرە، *ئالیۆشـــکا*. دەبێ دەرگەکە قوفڵ بدەین.

راسکۆڵنیکۆف بێباک بوو:

– چی لەوە باشتر، دەی وەرن با بچین!

خۆی کەوتە پێش و بەر لەوان چووە دەر و بە پلیکـانەکـانـدا شێنەیشێنەی داگەڕا. کە گەیشتە دەرگەی دەرێ قیڕاندی:

– هێی! لە کوێی قاپچی؟

چەند کەســێک لە بەردەرگەکەدا ڕاوەســـتابوون و لە ڕێبوارانیان دەڕوانی: دوو قاپچی، ژنێکی لادێیی و کاسـبێک بە جلی ماڵەوە لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەدا.

راسکۆڵنیکۆف ڕاستەوراست بەرەو لایان ملی نا.

یەکێک لە قاپچییەکان پرسیی:

– چیتان دەویست؟

– چووبوونە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس؟

– ئێستە لەوێ بووم. ئەمریکتان هەبوو؟

– هێشتا خەریکی دەوام بوون؟

– ئەرێ، لەوێ بوون!

– ڕاگریش؟

– تا ماوەیەک لەوێ بوو. دەی، چیتان دەویست؟

ڕاسکۆڵنیکۆف وەلامی نەدایەوە، بەلام بەدەم فکر و خەیاڵەوە هەر لەوێ لە تەکیانەوە ڕاوەستا.

کرێکارە گەورەکە هاتە پێشەوە:

– هاتووەتە سەیری ئەپارتمانەکە.

– کامە ئەپارتمان؟

– ئەوەی کە ئیشی تێدا دەکەین. فڕک هاتووەتە ژووری و دەڵێ، *خۆ خوێنەکەشتان شۆردووەتەوە!* پاشانیش دەڵێ، *لێرە مرۆڤیان کوشتووە و منیش هاتووم بە کرێی بگرم.* جا چووە پشت دەرگەکە و زەنگ لەدوای زەنگی لێدەدا، لە بندا دەریهێنا! دەڵێ: *وەرن بچینە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس تا حاڵیتان بکەم.* لە کۆڵ نابێتەوە.

قاپچی ناوچاوی دا بە یەکدا و تیاماوانە سەیری ڕاسکۆڵنیکۆفی کرد تا بەسامتر دەربکەوێت و گوتی:

– جەنابی پایەبەرزتان کێن؟

– من ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ ڕاسکۆلنیکۆفم، خوێندکاری زانکۆم. له بینای شیلدا دەژیم... ئەلەم کۆلانەی خوارەوەدا، دوو هەنگاو لەبەرترەوەیە، ئەپارتمانی ژمارە ١٤. له قاپچی بپرسی، من دەناسێ.

ڕاسکۆلنیکۆف ئەمەی بە دەنگێکی درێژکراوە و خەیاڵییەوە گوت و تەنانەت ڕووشی لەوان نەکرد، هەر وا کەللەڕەقانە لەسەر شەقامەوە ڕوو لە تاریکییەکە وڕ بووبوو.

– بۆچی چوونە ناو ماڵەکەوە؟

– چووم سەیرێکی بکەم.

– لەوێ چی هەیە تا پیاو سەیری بکا؟

کابرای کاسبکار لەپڕ پەڕییە نێو قسەکانەوە:

– دەبێ بیگری و ڕایکێشییە بنکەی پۆلیس، ها؟

دەستبەجێش وسکت بوو.

ڕاسکۆلنیکۆف لە سەرووی شانەوە تیری سەرنجیی گرتە کاسبکارەکە و بە هەمان دەنگی خاو و درێژکراوەوە گوتی:

– وەرن با بچین.

کاسبکار وەک ئەوەی هەمدیسان گوڕوتینی بە بەردا هاتبێتەوە، بە بڕوابەخۆبوونێکی زیاترەوە گوتی:

– ئەرێ، بیبەن! ئەسڵەن بۆ دەبێ *ئەو مەسەلەیە* بێنێتە ناوەوە؟ تۆ بڵێی چ خەیاڵێکی لە سەردا بێ، ها؟

کرێکارەکەش لەژێر لێوەوە گوتی:

– لەوە ناچێ سەرخۆشیش بێ، هەر خوا دەزانێ چ گلاراوێکیەتی!

قاپچی خەریک بوو کەلەبی دەبوو و هەمدیسان قیڕاندی:

– لەگەڵ تۆمە، چیت دەوێ لێرە؟ بۆ لە کۆڵمان نابیەوە؟

ڕاسکۆلنیکۆف تەشقەڵەی پێ کرد:

– چی بوو، لەوە ترسای بچینە لای پۆلیس، ها؟

– ترسی چی؟ بۆ واز ناهێنی و ناڕۆی؟

ژنە لادێییەکە شاتاندی:

– کڵاوچییە ئەو کابرایە!

قاپچییەکەی دیکەش کە پیاوێکی قلۆر بوو و کۆتەکەی کرابووەوە و کلیلەکانیی بە قاییشەکەیەوە کردبوون، هاواری لێ هەستا:

– باشـــە بۆ چەنەچەن لەگەڵ ئەم کابرایەدا بکەین؟ یەڵا، ئادەی ون بە!... ڕاست دەکەی ئەوە کڵاوچییە... یەڵا عەرەبانەت ڕاکێشە!

چنگی لە شـــانی ڕاســـکۆلنیکۆف گیر کرد و فڕێی دایە ســـەر شـــەقامەکە. ڕاســـکۆلنیکۆف وەخت بوو تەخت ببێت، بەڵام توانیی هـاوســـەنگیی بپارێزێت. بێدەنگانە تەمـاشـــایەکی کردن و بەدەم هەنگاونانەوە دوور کەوتەوە.

کرێکار گوتی:

– ع ساختەچییەکە، ئەو کابرایە!

ژنەی لادێیی گوتی:

– لەم ڕۆژانەدا هەمووی بووەتە ساختەچی!

کاسب گوتی:

– دەبوو بیدەیە دەست پۆلیس!

سەرۆکقاپچی قسەی یەکلاکەرەوەی کرد:

– پێویســـــت ناکا خۆمان تووش کەین. کڵاوچییە! کابرا خواخوای بەزمێکی بوو، جا کە پێوەشـــیان کردی، ئیتر نەجاتت نابێ.... من چاک ئەمانە دەناسم!

*ئاخرییەکەی بچم یان نا؟* ڕاسکۆلنیکۆف لە ناوەڕاستی ڕاستەڕێکەدا ڕاوەســـتابوو و چاوی بەو دەوروبەرەدا دەگێڕا، وەک ئەوەی بیەوێت وەڵامەکەی لە دەمی کەسێکەوە ببیستێت. بەڵام نە وەڵامێک هەبوو و نە دەنگێک، دەتگوت هەموو شتێک قڕوقەپ و مردووە، ڕێک وەک ئەو بەردانەی کە پێی دەنانە سەر، هەموو شتێک لەهەمبەر ئەودا مردبوو، هەر بە تەنیا لەبەرانبەر ئەودا... وەلێ کتوپڕ، بیســـــت هەنگاوێک لە پێشـــترییەوە، لەوپەڕی شـــەقامەکەدا چاوی بە ڕەشـــایەتیی کۆمەڵە کەســـێک کەوت و غەڵبەغەڵب و هاواری هاتە گوێ... لەناو ئاپۆراکەدا، گالیسکەیەک ڕاوەستابوو... ڕووناکییەکیش دەدرەوشایە ناوەڕاستی شـەقامەکەوە. ڕاسکۆلنیکۆف بە لای ڕاستدا بای دایەوە و بەرەو لای ئـاپۆراکە چوو. *تۆ بڵێی چی بووبێ؟* پێـدەچوو ئـامـادەی هەر پەلەقاژەکردنێک بێت و، جا هەر ئەم بیرکردنەوەیەش، زەردەخەنەیەکی ساردی خستە سەر لێوی، چونکە ئیدی بڕیاری پەیوەست بە چوونە لای پۆلیس یەکلایی بووبووەوە و بەبێ هیچ گومانێک دەیزانی کە زۆر زوو هەموو شتێک دەبڕێتەوە.

## حەوت

گالیسکەیەکی خانەدانانە و ڕازاوە کە جووتە ئەسپێکی خۆڵەمێشی ڕایان دەکێشا، لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا وەستابوو. گالیسکەکە خاڵی بوو و گالیسکەوان دابەزیبوو و کەسێکیش هەوساری ئەسپەکانی بە دەستەوە گرتبوو. کەسانێکیش گرد بووبوونەوە و لە پێش ئەوانیشەوە چەند پاسەوانێک. یەکێک لە پاسەوانەکان چرایەکی بە دەستەوە بوو و ڕووناکییەکەیی دەگرتە شتێک کە لە نزیک تایەی گالیسکەکە بەسەر زەوییەوە کەوتبوو. هەمووان ژاوەژاویان بوو و هاواریان دەکرد و ئاخیان هەڵدەکێشا. گالیسکەوان تیا مابوو و هەیتاهەیتا پاتەی دەکردەوە:

– ئای لەو تاوانە! خوایە، ئای لەو تاوانە!

ڕاسکۆلنیکۆف تا دەکرا ڕێی بۆ خۆی کردەوە و چووە پێش و دواجار توانیی چاوی بەو کەسە بکەوێت کە هەڵاکەی نابووەوە و ئەو خەڵکەشی کە لە دەوری خۆی کۆ کردبووەوە. پیاوێکی بە ڕواڵەت بێهۆش کە گالیسکە بەژێرەوەی کردبوو، لە خوێندا گەوزاو، تەختی زەوی بووبوو. دۆخێکی ناخهەژێنی هەبوو، وەلێ لە کرێکار و شت نەدەچوو. جۆگەلە خوێن بە سەروگوێلاکیدا ڕێچکەی بەستبوو و دەموچاوی هەلاهەلای هیچی بە بەرەوە نەمابوو. پێدەچوو زیانێکی خراپی بەر کەوتبێت. گالیسکەلێخوڕ دەیناڵاند:

– خوا هاوار! دەی من دەبوو چی بکەم ئاخر؟ ئێستە گەر خێرا لێم خوڕیبا یان پێشوەختە هاوارم نەکردبا بەهەرحاڵ، وەلێ خۆ من

شێنەی دەڕۆیشتم و هیچ پەلەم نەبوو! هەمووی شایەتن کە من وەک هەر کەسێکی دی لێم دەخوڕی. خۆ سەرخۆش و شت ناتوانن ڕێک ڕێ بکەن، هەمووومان دەزانین... بینیم کە خەریک بوو بە شەقامەکەدا ڕادەبرد. ڕەتی دەبردەوە و کەم تا زۆر خەریک بوو تەخت ببێ. دوو جار، سێ جار و چەند جارێک هاوارم کرد، پاشانیش هەوسارەکەم ڕاکێشا، وەلێ ئەو ڕاستەوڕاست هات و خۆی هاویشتە ژێر سمی ئەسپەکان! یان پێشوەختە نیازی وەها کارێکی هەبوو و یان تەواو بەدمەست بووە... ئەسپەکانیشم گەنجن و زوو دەسڵەمنەوە... لە ترساندا سڵەمینەوە و ئەویش دەیقیڕاند، ئەمەش زیاتر ئەسپەکانی تۆقاند و ئیتر ئەم بەلایەمان بەسەر هات!

دەنگێک لەنێو ئاپۆڕاکەوە بەسەرهاتەکەی پشتڕاست کردەوە:

– کتومت وا بوو!

دەنگێکی دیکەش ڕایگەیاند:

– هاواریشی کرد، ڕاست دەکا. سێ جار هاواری کرد.

دەنگی سێیەمیش بەرز بووەوە:

– سێ جار هاواری کرد کاکە، هەمووومان بیستمان.

بەلام گالیسکەوانەکە هێندەش دڵخورت و تۆقیو دەرنەدەکەوت. دیار بوو کە خاوەنی گالیسکەکە کەسێکی دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتووە و ئێستاکەش لە شوێنێکدا چاوەڕێی ئەوە؛ پاسەوانەکانیش هەموو خەموخەفەتێکیان ئەوە بوو کە بەرنامەی ئەو پایەبەرزە نەشێوێت. دەبوو کەسەی پێکراو کە تەنانەت هیچ کەسێک ناویشی نەدەزانی، ببەن بۆ بەڕێوەبەراتیی پۆلیس یان نەخۆشخانە.

لەم بگرەوبەردەیەدا ڕاسکۆڵنیکۆف بە زۆر و گوشار دڕی پێ دادان و ڕووەو پێکراوەکەدا چەمییەوە. لەپڕ ڕووناکیی چراکە کەوتە ســـەر ڕووخساری کابرا سیاچارەکە و ڕاسکۆڵنیکۆف ئەوی ناسییەوە.

– دەیناسم! من دەیناسم!

ڕاسکۆڵنیکۆف قیڕاندی و خۆی گەیاندە ڕیزی یەکەمی ئاپۆڕاکە.

– فەرمانبەرێکی خانەنشـــینکراوە، ناویشـــی مارمیلادۆڤە.ماڵی لەم نزیکانەیە، لە بینای کۆزێل... خێرا دکتۆر ئاگادار بکەنەوە! فەرموون، پارەکەشی لەسەر من...

پارەی لە گیرفانی دەرهێنا و نیشـانی پاسـەوانەکانی دا. ئەو هەموو هەژان و خرۆشەی شتێکی سەیر بوو.

پاســەوانەکان دڵخۆش بوون کە لانیکەم ناســنامەی کابرایان زانی. ڕاسـکۆڵنیکۆف ناونیشـانی خۆیشـی پێ دان و زۆر هەتەر، بە جۆرێک وەک ئەوەی باوکی خۆی لێی قەومابێت، پاســـەوانەکانی گیر دان کە دەمودەست مارمیلادۆڤ ببەنە ماڵی خۆی و نەسرەوتانە گوتی:

– لێرانەیە، دووســـێ بینـا لەولاتر! بینـاکە هی کۆزێلە، لە یـارۆ دەوڵەمەندە ئەڵمانییەکانە. بێگومان مارمیلادۆڤ بە سـەرخۆشی بەرەو ماڵێ بەڕێوە بووە! من دەیناســـم... ئەو ئالوودەیە... ژن و چەند ســـەر خێزان و کچێکیشـــی هەیە. زۆری پێدەچێ تا بیگەیەنینە نەخۆشـــخانە، وەلێ لەو بینایەدا بێگومان پەکی ناکەوێ! پارەکەشی لەسەر من، خۆم دەیدەم!... لە ماڵەکەی خۆیدا لانیکەم کەســـێکی هەیە بێ بەدەمییەوە، بەس ڕەنگە تا نەخۆشخانە بڕ نەکا و تەواو ببێ...

توانیی دوور لە چاوی ئەوانی دیکەوە شـتێک بخاتە مشـتی یەکێک لە پاســەوانەکانەوە. هەڵبەتە هەموو شـتێک ئاسـایی و یاسـایی بوو و هەر چۆنێک بووە گەر مارمیلادۆڤیان بگەیاندباوە ماڵێ دەکرا زووتر

بگەنە فریای. پێکراوەکەیان بلند کرد و خەڵکیش ئارەزوومەندانە بۆ یارمەتیدان هاتنە پێشێ. بینای کۆزێل سی هەنگاوێک لەولاترەوە بوو. راسکۆلنیکۆف لەپشتەوە بوو، بە پارێزەوە سەری مارمیلادۆڤی گرتبوو و رێگەی نیشان دەدان و بە هێواشی دەیگوت:

– لێرە، ئەلێرەیە! لەم لاوە! لە پلیکانەکاندا دەبێ سەری بەرز بکەینەوە؛ بەولادا با بدەینەوە... ئەها بەم جۆرە! پارەکەشی دەدەم و ئەرکی ئێوەش قەرەبوو دەکەمەوە.

کاترینا ئیڤانۆڤنا بە ژوورە دووبستییەکەیدا دەستی کردبووە هەنگاونان، رێک وەک هەمیشە کە بەپێی دەرفەت لە پەنجەرەوە بەرەو کوانووەکە دەچوو و دەگەڕایەوە. دەست لەسەرسنگ ئامۆشۆی دەکرد و لەگەڵ خۆی دەدوا و دەکۆکی. لەم دواییانەدا زیاتر لە جاران لەگەڵ پۆلینکای کچە گەورە و دە ساڵانەکەیدا دەکەوتە قسە. کچۆلەکە هێشتا لە زۆر شت حاڵیی نەدەبوو، بەلام چاک لەوە تێدەگەیشت کە دایکی پێویستیی بەوە و هەر لەبەر ئەوەش دایمە چاوە گەورە و زیتەڵەکانیی لەو دەبرین و ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا تا نیشانی بدات کە تێدەگات. پۆلینکا خەریک بوو جلی لە بەر برا بچووکەکەیدا دادەکەند کە بە درێژایی رۆژ نەخۆش بوو و ئێستاکەش بەتەمای خەوتن بوو. کورێژگەکە چاوەڕێ بوو خوشکەکەی کراسەکەی لە بەر داکەنێت، چونکە دەشیا هەر ئەو شەوە کراسەکەی بۆ بشۆن. قیت و بێ جوولە لەسەر کورسییەکە دانیشتبوو، وسکت و بە رووخسارێکی جددییەوە. پێیەکانی رێک لە بەردەمیدا درێژ کردبوون، پاژنەکانی لکابوون بە یەکدییەوە و پەنجەکانی رووەو دەرێ و گوێی شل کردبوو تا بزانێت دایکی چی بە خوشکەکەی دەڵێت. لێوی هەڵقرتاندبوو و جوولەی لێوە نەدەهات و بە چاوانێکی زیت و واقەوە، رێک بەو جۆرە دانیشتبوو کە کورە چکۆلە باش و ژیرەکان بەر لە خەوتن و لەبەرداکەندنی جلوبەرگەکەیان دادەنیشن. کچۆلەیەکی بچووکتر

لەویان کە تەنیا شـەپەڕۆیەکی لە بەردا بوو، لەبەردەم باریکەدیوارەکەدا ڕاوەستابوو تا نۆرەی بێت. دەرگەی ڕوو لە پلیکانەکەیان کردبووەوە تا چرەهەوری دووکەڵی توتن کە لە ژوورەکانی دیکەوە دزەی دەکردە ئەوێ بڕێک سووک ببێت. لەبەر شالاوی دووکەڵ، نۆبەی تۆقێنەری کۆکەی توند و درێژ دەکەوتە گیانی ژنەی سیلاوی و چارەڕەش. کاترینا ئیڤانۆڤنا کە وا دیار بوو لە ماوەی ئەم حەفتەیەی دواییدا لاوازتر بووە و پەڵەیێ سووری سەر گۆناکانی لە جاران تۆختر بوونە، بەدەم ڕێکردن بە ژوورەکەدا، گوتی:

– باوەڕ ناکەی پۆلینکا، تەنانەت ناتوانی وێناشی بکەی کە لە ماڵی باوکمدا ژیانێکی چەند خۆش و پڕ لە پەخشانوتەخشانمان هەبوو و جا ئێستەش ئەم خوێڕییە ئالوودەیە ئەوە هیچ کە سەری منی خواردووە، خەریکە ئێوەش دەخاتە بنی چاڵەکەوە! باوکە گیان ئەفسەرێکی پلەبەرز بوو و تەنیا یەک هەنگاوی مابوو ببێتە فەرماندار! هەر کەسێ دەهاتە لای دەیگوت: *ئیڤان میخایلیچ، ئێمە هەموو میوایەکمان بە تۆیە ببێتە فەرماندار!* کاتێ من... ئەهە! کاتێ... ئەهەئەهەئەهە... کاتێ.... ئااااخ، تف لەم ژیانە!

کۆکەیەکی پیسی کرد و بەڵغەمی هێنایەوە، چنگی بە سەرسنگیدا کرد و قیژاندی:

– کاتێ من... ئاخ، کاتێ لە دواهەمین کۆڕی سەمادا... لە بەردەم نوێنەری خانەدانان... شازادە بیزیمیل *نایا* خودی خۆی چاوی بە من کەوت... هەمان ئەو خاتوونە شازادەیەی کە دواتر کاتی زەماوەندکردنی من و باوکت بۆ دوعای خێر، پۆلینکا... ئەرێ، هەر کە چاوی بە من کەوت، پرسیی: *ئەمە هەمان ئەو شۆخەکچە نییە کە لە ڕێوڕەسمی دەرچووندا بە شاڵەوە سەمای دەکرد؟*.... (پێم گوتی خۆ دەبێ ئەو دڕاوییە بگری، دەرزییەکەت بگرە و هەر بەو جۆرەی کە فێرم کردی

بیدووره‌وه، ده‌نا کوڕه‌که به‌یانیش... ئه‌هه! به‌یانیش.... ئه‌هه‌ئه‌هه‌ئه‌هه!... له‌وه خراپتر کونه‌که‌ی گه‌وره ده‌کا!)

گیانی ده‌رچوو تا چه‌ند ڕســـته‌یه‌کی کۆتایی ده‌ربڕین و پاشـــان درێژه‌ی پێ دا:

– ئه‌رێ، ئه‌و ڕۆژانه شـــازاده *شـــیکولســـکای* که تازه تا له پیته‌ربورگه‌وه هاتبوو... له‌گه‌ڵ من سه‌مای مازورکای کرد و ده‌یویست هه‌ر به‌یانییه‌که‌ی بێته دیدارم و پێشنیاری هاوسه‌رگیری بکا، وه‌لێ من سوپاسم کرد، هه‌ڵبه‌ته به سه‌روزمانێکی خۆشه‌وه و گوتم من ده‌مێکه دڵم به که‌ســـێکی تر داوه. ئه‌و که‌ســـه‌ی تریش باوکت بوو، پۆلینکا. باوکه گیانیشـــت تۆقینه‌رانه هه‌ڵچوو... ئه‌رێ ئاوه‌که ئاماده بوو؟ کراس و گۆره‌وییه‌کانم به‌رێ! لیدا...

ڕووی کرده بچووکترین منداڵ:

– لیدا! ده‌بێ ئه‌مشـــه‌و بێ فانیله به‌ســـه‌ر به‌رێ... گۆره‌وییه‌کانیشـــت بخه‌ره لاوه... هه‌مووان پێکه‌وه ده‌شـۆم... باشـه ئه‌م ئالووده مفته‌خۆره بۆ تا ئێسته نه‌گه‌ڕاوه‌ته‌وه ماڵێ؟ بووده‌ڵه‌ی وا ئه‌وه‌نده کراسه‌که‌یی له به‌ر کردووه هه‌ر ده‌ڵێی شـــڕه‌ده‌ســـڕی گوشـــراوه! بێ له‌مه‌ش، شڕوشـیتاڵی ده‌رهێناوه. هه‌موویم پێکڕا ده‌شـۆردن تا ناچار نه‌بم دوو شـــه‌و به‌ســـه‌ر یه‌که‌وه خۆم بپڕووکێنم! خوایاااا!.... ئه‌هه‌ئه‌هه‌ئه‌هه‌ئه‌هه! هه‌متر ده‌ستی پێ کردووه! ئه‌ی ئه‌مه چییه؟

کاتێک که‌ســـانی ســـه‌ر پلیکانه‌کان و ئه‌و پیاوانه‌ی بینین که خه‌ریک بوون به زۆر باریکیان کێش ده‌کرده ژووره‌که‌وه، قیژه‌ی لێ هه‌ستا:

– ئه‌مه چییه؟ چی ده‌هێننه ژوورێ؟ خوایاااا!

که مارمیلادۆڤی بێهۆش و خه‌ڵتانی خوێنیان هێنایه ژوور، یه‌کێک له پاسه‌وانه‌کان ته‌ماشایه‌کی چوارده‌وریی کرد و پرسیی:

– لە کوێ درێژی کەین؟

– لەسەر قەنەفە! لەسەر قەنەفەکە درێژی کەن، با سەری لەملاوە بێ.

ڕاسکۆلنیکۆف ئەمەی گوت و شوێنەکەی نیشان دا.

یەکێک لە پلیکانەکەوە قیراندی:

– لەسەر شەقام کردوویانە بە ژێرەوە! سەرخۆش بووە!

کاترینا ئیڤانۆڤنا ڕاوەستا و وەک گەچ سپیی هەڵگەڕا و هەناسەی سوار بوو. منداڵەکان تۆقیبوون. لیدای چکۆلە زریکاندی و ڕایکردە لای پۆلینکا و بە سەراپای لەرزۆکەوە خۆی پێوە هەڵواسی.

کە مارمیلادۆڤیان ڕاکشاند، ڕاسکۆلنیکۆف ڕای کردە لای کاترینا ئیڤانۆڤنا.

– بۆ خاتری خوا لەسەرخۆ بن و مەترسن!

ڕاسکۆلنیکۆف پەلەپەل قسەی دەکرد.

– لە کاتی پەڕینەوە لە شەقامدا گالیسکە لێی داوە. مەترسن، دێتەوە هۆش خۆی، من گوتم بیهێننەوە ماڵێ... خۆ من دەناسنەوە، هاتبوومە ئێرە... هەر ئێستە دێتەوە هۆش خۆی، خۆشم پارەکەی دەدەم!

کاترینا ئیڤانۆڤنا بێهیوایانە قیژاندی و ڕای کردە سەر مێردەکەی.

– ئاخرییەکەی سەری خۆی خوارد!

ڕاسکۆلنیکۆف دەمودەست تێگەیشت کاترینا ئیڤانۆڤنا لەو جۆرە ژنانە نییە کە هەقوناهەق ببووریێنەوە. کاترینا ئیڤانۆڤنا دەستبەجێ پشتییەکی خستە ژێر سەری مێردە چارەڕەشەکەی –کەس ئەوەی بە خەیاڵدا نەهاتبوو– جا کەوتە داکەندنی جلەکانی و پشکنینی سەراپای.

دەیزانی چی دەکات و هیچ دەســـتەپاچە نەبووبوو. تەنانەت دۆخی شــەڕی خۆیشــیی لە بیر چووبووەوە، لێوە لەرزۆکەکانیی دەگازاندن و ئەو هاوارانەی لە ســـنگیدا کپ دەکردنەوە کە هەڵپەی هاتنەدەرەوەیان بوو.

لەم بێنەوبەرەیەدا ڕاسکۆڵنیکۆف کەسێکی ڕاسپارد تا بچێتە شوێن دکتۆر. وا دیار بوو لەو نزیکانەدا دکتۆرێکیان پێ شک دەهات، لە دوو بینا ئەولاترەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف ورەی دەدایە کاترینا ئیڤانۆڤنا:

– ناردوومە بەشــوێن دکتۆردا. خەمتان نەبێ، پارەکەشــی لەســەر من. ئاوتان هەیە؟... دەســـڕێک، خاولییەک، شــتێکم بدەنێ بەس تۆزێ خێرا... هێشـــتـــا دیـار نییە زامەکـانی چۆنن... زامـدار بووە، وەلێ نەمردووە، دڵنیا بن... جارێ بزانین دکتۆر چی دەڵێ!

کـاتریـنـا ئیڤـانۆڤـنـا فرکەی کردە لای پەنجەرەکە. لەوێ، لەســـەر کورسییەکی شکاوی لایەکی ژوورەکەوە، پڕی دەفرێکی گەورەی گڵین ئاوی ئامادەیان دانابوو تا کاترینا ئیڤانۆڤنا هەر ئەو شـــەوە جلوبەرگی منداڵەکان و مێردەکەی بشوات. ئەم شتوشۆرە لە حەفتەیەکدا لانیکەم دوو شەو یان زیاتر دەهاتە ئارا. خێزانەکە دۆخی گەیشتبووە ئاستێک کە هیچ کامیان جلی زیادەیان نەبوو تا بیگۆڕن و کاترینا ئیڤانۆڤناش بەرگەی پیســـوپۆخڵیی نەدەگرت. ئامادە بوو شـــەوانە کاتێک ئەوانی دیکە خەوتبوون، خۆی بپرووکێنێ، بەوپەڕی هێزوتوانایەوە کار بکات و جلە تەڕەکان بەســەر تەنافەوە هەڵبخات تا بۆ بەیانی وشـک ببنەوە، تەنیا بەو مەرجەی هیچ شـتێکی پیس بە بەرچاوییەوە نەبێت. ڕۆیشـت تـا دەفرە ئـاوەکە بۆ ڕاســـکۆڵنیکۆف بهێنێت، بەڵام خەریـک بوو بە دەفرەکەوە تەختی زەوی ببێت. وەلێ ڕاسکۆڵنیکۆف بەر لە ئەو توانیی خاولییەکە بدۆزێتەوە، کەمێک خووســـاندی و دەســـتی کردە ســـڕینی

خوێنی ســـــەرڕووی مـارمیلادۆڤ. کـاترینـا ئیڤـانۆڤنـا لەتەکییەوە ڕاوەستابوو، بە ئەشکەنجەوە هەناسەی هەڵدەکێشا و دەستەکانیی بە سنگییەوە دەگوشین؛ خۆی پێویستیی بە یارمەتی بوو. ڕاسکۆڵنیکۆف بەرەبەرە خەریک بوو تێدەگەیشت کە هێنانەماڵەوەی پیاوە بریندارەکە هەڵەیەکی گەورە بوو. پاسەوانەکەش واقووڕ ئەملا و ئەولای دەکرد.

کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری کرد:

– پۆلینکا، ڕاکە ســـۆنیا بانگ کە، بەس خێراکە! گەر لە ماڵێ نەبوو، بەوانی تر بڵێ کە باوکی بووە بەژێرەوە و دەبێ دەمودەســـــت خۆی بگەیەنێتە ئێرە... هەر کە گەیشـــتەوە ئەوێ، پێی بڵێن بێ بۆ ئێرە. دەی ڕاکە، پۆلینکا! بوەستە، ئەم شاڵەش بدە بە شانتدا!

کوڕیژگەکە، کە لەســـــەر کورســـــییەک لەوێ دانیشـــتبوو، لەجێوە هاواری کرد:

– خێراکە بڕۆ!

جا وەک پێشـــــتر، قرووقەپ، بە هەمان ئەو چاوە واق و پاژنە بەرەو پێش درێژکراوانە و پەنجە ڕوو لە دەرەوانە، جووڵەی لێ بڕا.

لەم کاتەدا قەڵەباڵغییەک لە ژوورەکەدا دروســـت بووبوو کە دەرزی بەر زەوی نەدەکەوت. پاســـــەوانەکان هەموو ڕۆیشـــــتن بێ لە یەک دانەیـان، کە ئەویش هەر مـاوەیەک مـایەوە و هەوڵی کردنەدەرەوەی ئەو خەڵکەی دا کە لە پلیکـانەکـانەوە دەهـاتنە ژووری. زۆربەی کرێچییەکـانی خـاتوو لیپی ڤیخزیـڵ وەک مـارومێروو لە ژوورەکـانی پشتەوەدا ڕژابوونە دەرێ، سەرەتا ترنجابوونە لاشیپانی دەرگەکە و پاشان شاڵاویان هێنایە ناو ژوورەکە. کاترینا ئیڤانۆڤ هار بوو و ڕوو لە ئاپۆڕاکە قیژاندی:

– لانیکەم دەتوانن لێگەڕێن مرۆڤ بە ئارامی بمرێ یان نا؟ چییە نمایشـە وا دەمداچەقیو بە جگەرەوە لێی راماون!؟ خۆ جگەرەشـیان لە دەسـت نـابێتەوە! ئەهەئەهەئەهە! خوانەکـا تەریق ببنەوە و تـاوێ کڵاوەکانتان لە سـەر لابەن!... ئەوەتا، یەکێکیان هێشـتا کڵاوی بە سەرەوەیە... ونبە بۆ دەرێ! ئاخر مردووش رێزی خۆی هەیە!

کۆکە خەریـک بوو دەیخنکانـد وەلێ تـانەکـانی بێئەنجـام بوون. کرێچییەکان، کە دەتگوت سـڵ لە کاترینا ئیڤانۆڤنا دەکەنەوە، یەک لەدوای یەک بەرەو لاشیپلانی دەرگەکە پاشەکشەیان کرد. ئەو هەستی رازیبوونە لە دەروونیاندا بوو کە هەمیشـە لە کاتی کارەسـاتێکی کتوپڕانەدا بەو جۆرە لە مرۆڤێکدا دروسـت دەبێت، تەنـانەت لە هاورێیانی نزیک و ئازیزانی قوربانییەکەشـدا. هیچ کەسـێک ناتوانێت لەم هەسـتە دەگمەنە هەڵبێت، تەنانەت ئەگەر هاوخەمی راسـتەقینە و خۆشەویستیی پاکیش لەئارادا بێت.

لە دەرەوەشڕا دەنگگەلێک دەهاتن کە باسـی نەخۆشـخانەیان دەکرد و هەروەهـا بـاس لەوە بوو کە مـافی ئەوەیـان نییە بێمـانـا لە مـاڵی خەڵکیدا ئەوانی دیکە بێزار بکەن و سەرئێشەیان بۆ ساز بدەن.

– یانی مردنی بێمانا و مایەی سەرئێشەیە، ها؟

ڤیژەی کاترینا ئیڤانۆڤنا گەیشـتە ئاسـمان و بەرەو لاشـیپلانی دەرگەکە هەڵمەتی برد تا تووڕەیی خۆی بەسـەر کرێچییەکاندا خاڵی بکاتەوە، وەلێ تووشـی خاتوو لیپی‌ڤیخزیل بوو کە تازە هەواڵی رووداوەکەی پێ گەیشـتبوو و جا ئێسـتەش بە راکەراک هاتبوو تا دۆخەکە سـەقامگیر بکات. خاتوون کە لە ئەڵمانییە خراپە شـەڕانی و قرەقرکەر و بێسەروبەرەکان بوو، دەستی پێکدا کێشا و هاواری کرد:

– ئاه! خوایە گیان! ئەسـپ مێرد سـەرخۆشـەکەتانی شـێلاوە! دەبێ ببرێت نەخۆشخانە! من خاوەنماڵ و دەڵێم دەبێ ببرێت نەخۆشخانە!

– ئامالیا لودڤیگاونا، تکا دەکەم وریای قسەکردنتان بن!

کاترینا ئیڤانۆڤنا خۆی گیف کردەوە و تەنانەت لەو ساتەشدا نەیتوانی خۆی لەچێژبردن لە هەستی خۆشی ئەو شێوازە بەکەشوفشە بەدوور بگرێت کە هەمیشە خاوەنماڵەکەی پێ دەدواند تا لە قاڵبی بداتەوە.

– ئامالیا لودڤیگاونا...

– پێشتر بە ئێوە وت کە ئێوە ماف نییە زات کرد و من بە ئامالیا لودڤیگاونا بانگ کرد، ئامالیا ئیڤانۆڤنا!

– ئێوە ئامالیا ئیڤانۆڤنا نین، ئامالیا لودڤیگاونا! منیش یەکێک نیم لەو ماستاوچیانەی دەورتان یان ئەو بەڕێز لیبی زیاتنیکۆفەی، کە وا ئێستەش لەپشت دەرگەوە حیلکەحیلک پێدەکەنێ (ڕێک لە هەمان ئەو ساتەدا لەپشت دەرگەوە دەنگی پێکەنین بەرز بووەوە و بەدواشیدا هاوارێک هات کە *خۆ هەمدیسان دەستیان پێ کردەوە!*). کەواتە من تاهەتا بە ئامالیا لودڤیگاونا بانگتان دەکەم، جا هەر بە ڕاستیش نازانم کە کێشەتان لەگەڵ ئەم ناوەدا چییە! بە چاوی خۆتان دەبینن کە چ بەلایەک بەسەر سیمیۆن زاخارۆڤیچی مێردمدا هاتووە و لەسەر مەرگە. تکا دەکەم هیچ نەبێ ئێستە ئەو دەرگەیە پێوە بدەن و مەهێڵن کەس بێتە ژوورێ. لانیکەم لێگەڕێن بە ئاسوودەیی بمرێ! دەنا دڵنیا بن کە فەرماندار سبەینێ ئەم هەڵسوکەوتەتانی پێ دەگاتەوە. خاتوونی شازادە هەر لەو سەردەمەوە من دەناسێ کە کچی ماڵەوە بووم و چاک مێردەکەشمی بیر ماوە و چاکیش هەواڵیی پێ گەیشتووە! هەمووان دەزانن کە سیمیۆن زاخارۆڤیچ هاوڕێ و پشتیوانی زۆری هەبووە، وەلێ لەبەر نەفسبەرزی لێیان دوورەپەرێز بووە، ئاخر چاک ئاگاداری خاڵی لاواز و جێداخی خۆیەتی. وەلێ ئێستە (ئاماژەی بۆ ڕاسکۆلنیکۆف کرد) گەنجێکی سەخی هاتووە دەستمان بگرێ کە هەم

پەیوەندی و هەم بارێکی ماددیی باشیان هەیە و مێردەکەشم هەر لە منالییەوە دەیانناسی. کەواتە بێخەم بن، ئامالیا لودڤیگاونا، کە...

کاترینا ئیڤانۆڤنا بە خێراییەکی ئەقڵنەبڕ ئەمانەی گوتن. هەر ساتەو خێرا و خێراتریش قسەی دەکرد، وەلێ کۆکەیەکی کتوپڕانە گوتارە شکۆدارەکەیی بڕی. هاوکات پیاوەکەشی، کە لە سەرەمەرگدا بوو، هاتەوە سەر خۆی و نالاندی. کاترینا ئیڤانۆڤنا ڕایکردە لای. پێکراوەکە چاوی کردەوە و بێ ئەوەی هیچ تێبگات یان ڕاسکۆلنیکۆف بناسێتەوە، لەو ڕاما کە بەسەریدا چەمیبووەوە. هێمن و قووڵ و بەئازار هەناسەی دەدا. خوێن بە لادەمیدا دەهات و دڵۆپەی ئارەقە نیشتبووە سەر تەوێڵی. کاتێک نەیتوانی ڕاسکۆلنیکۆف بناسێتەوە، بە ئازارەوە تەماشای چواردەوریی کرد. کاترینا ئیڤانۆڤنا بە ڕووخسارێکی جددی وەلێ هەر وا خەمگینەوە لێی دەڕوانی و فرمێسک بە چاویدا دەهات و تێماو پرسیی:

– خوا هاوار! سنگی ورد بووە! چ خوێنێکی لە بەر دەڕوا! دەبێ جلەکانی داکەنین.

هاواری بەسەر پێکراوەکەدا کرد:

– کەمێ بکەوە بە لایدا گەر دەتوانی، سیمیۆن زاخارۆڤیچ!

مارمیلادۆڤ ئەوی ناسییەوە و خێسەخێس گوتی:

– قەشە بانگ بکەن!

کاترینا ئیڤانۆڤنا چووە بەر پەنجەرە، سەری بە لایەکی چوارچێوەکەوە نا و بێهیوا نالاندی:

– نەفرەت لەم ژیانە!

کابرای نیوەگیانیش پاش خولەکێک بێدەنگی، دووبارە گوتی:

– قەشە!

– چوونەتە شوێنی!

کاترینا ئیڤانۆڤنا بەسەریدا قیژاند و ئەویش گوێڕایەڵی ژنەکەی بوو و زاری لێک نا. چاوانی خەمگین و شەرمەزاری بەدوای کاترینا ئیڤانۆڤناوە بوون و ژنەش گەڕایەوە و هاتە ژوور سەری. پێدەچوو پێکراوەکە ئاسوودەتر بووبێت، بەڵام ئاسوودەییەکەی هێندەی نەخایاند. زۆر زوو چاوی بە لیدای بچکۆلە و نازەنینی کەوت. کچۆڵەکە وەک ئەوەی تووشی نۆرەی فێ بووبێت، لە سووچێکی ژوورەکەدا هەڵدەلەرزی و بە نیگای منداڵانە و سەراسیمەی چاودێریی ئەوی دەکرد.

– ئا... ئا...

مارمیلادۆڤ هەراسان ڕوو لە کچۆڵەکە تەتەڵەی دەکرد، دەیویست شتێک بڵێت.

کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری کرد:

– چییە دیسان؟

– پێخواسە مناڵەکە، پێخواسە!

مارمیلادۆڤ بە نیگای شێتئاسای ئاماژەی بۆ پێی پەتیی منداڵەکە کرد.

کاترینا ئیڤانۆڤنا پشووکورت و تووڕە هاواری کرد:

– دەمت داخە! خۆت چاک دەزانی بۆ پێخواسە!

ڕاسکۆڵنیکۆڤ هەناسەیەکی ئاسوودانەی هەڵکێشا:

– سوپاس بۆ خوا، دکتۆر هات!

دکتۆر، پیرەمێردێکی وردیلەی جوانپۆش بوو کە بەدگومـانـانە تەماشـاى چواردەوریی دەکرد و دواجار هاتە ژوور و چووە سـەر سەری نەخۆشەکە، ترپەی دڵیی گرت، ورد پشکنینی بۆ سەری کرد و بە یارمەتیی کاترینا ئیڤانۆڤنا قۆپچە خوێناوییەکانی کراسـەکەی کردنەوە و سـینگیی ڕووت کرد. قەفەسـەی سـنگی شـەقی بردبوو و ورد بووبوو، چەند دانەیەک لە پەراسـووەکانی لای ڕاسـتیشـی شـکابوون. لە لای چەپەوە، ڕێک لە سـەرووی دڵییەوە، کوتراوییەکی زۆری ناجۆریان بینی کە زەرد و ڕەش دەچووەوە و شـوێنی لەقەی بێبەزەییـانەی سـمی ئەسـپ بوو. دکتۆر نـاوچـاوی گرژ بوو. پاسـەوانەکان پێیان گوت کە پێکراوەکە کەوتووەتە ژێر تایەوە و سـی هەنگاوێک لەگەڵ تایەکەدا ڕۆیشتووە و ڕاکێشراوە.

دکتۆر بە هێمنی ڕوو لە ڕاسکۆڵنیکۆف وەرتاندی:

– هەر ئەوەی کە هۆشی هاتووەتەوە لە خۆیدا شتێکی سەیرە!

– حاڵی چۆنە بە ڕای ئێوە؟

– هاکا نەجاتی بوو.

– هیچ هیوایەک نییە؟

– هیچ هیوایەک نییە! هەناسەی کۆتایەتی. سەریشی خراپ بریندار بووە... ئممم.... هەڵبەتە دەکرێ خوێنی لێ بگرین، وەلێ... سـوودی نییە. پێنج خولەک ئەوپەڕی دە خولەکی تر و تەواو دەبێ.

– کەواتە لانیکەم خوێنی لێ بگرن.[1]

---

١. خوێنگرتن یـاخود (Bloodletting) ڕێگەیەکی کۆنی پزیشـکییە، لە هەندێک هەلومەرجی تایبەتدا سـوودی لێ بینراوە. شـوێنێکی نەخۆش بردراوە تاکوو خوێنی لەبەر بڕوا و بەم جۆرەش فشـاری خوێن بە نزمی بهێڵدرێتەوە. هەڵبەتە ئەم

– با بە دڵی ئێوە بێ... بەس وا پێتان دەڵێم کە سوودی نییە!

لە هەمـان کـاتـدا دەنگی هەنگـاوگەلی دیکە هـاتن، ئـاپۆڕای نێو ڕاڕەوەکە دڕی پێ دادرا و قەشــە، پیرەمێردێکی وردیلە و قژســپی بە پێداویســـتیی تـایبەت بە تەڕکردنەوە[1]، لە ئـاســـتـانەی دەرگەکەدا دەرکەوت. یەکێک لە پاسەوانەکان دوای ڕووداوەکە چووبووە شوێنی. دکتۆر شــوێنەکەی بۆ قەشــە چۆڵ کرد و نیگایەکی پرمانایان ئاڵوگۆڕ کرد. ڕاســـکۆڵنیکۆف تکای لە دکتۆر کرد کە لانیکەم تۆزێک زیـاتر بمێنێتەوە و ئەویش شانێکی هەڵتەکاند و مایەوە.

هەمووان چوونەوە دوا. ڕێوڕەســــمی دانپێدانان زۆر زوو دای بە دەســـتەوە. ئاســـتەم بوو ئەو پیاوەی کە خەریکی گیانەڵا بوو شـــتێک تێبگات و تەنیا دەیتوانی دەنگگەلی پچڕاو و ناڕوون دەربکات. کاترینا ئیڤانۆڤنا لیدای بچکۆلەی گرتە باوەش و کوڕیژگەکەشـــی لەســـــەر کورســییەکە بەرز کردەوە، لە لایەکی ژوورەکەوە و لەتەک ئاگردانەکە کەوتە ســــەر ئەژنۆ و منداڵەکانیشـــی ناچار کردن لەبەردەمیدا بکەونە ســـەر ئەژنۆ. کچۆڵەکە هێشـــتا هەر وا هەڵدەلەرزی، وەلێ کوڕیژگەکە لەسەر ئەژنۆ بچووکە ڕووتەکانی دانیشتبوو و دەستیی هەڵدەبڕی، بە ســـەرنجەوە خاچی دەکێشـــا، ســـووژدەی دەبرد و تەوێڵیی بە ڕووی زەویی ژوورەکەدا دەسووی، کە وا دیار بوو ئەو کارە ڕەزامەندییەکی تایبەتی بۆ ئەو تێدایە. کاترینا ئیڤانۆڤنا لێویی گازاند و بە زۆر بەری بە فرمێسکی گرت؛ ئەویش خەریکی دوعاکردن بوو و جاروبار کراسی منداڵەکەی ڕێک دەکردەوە، تەنـانەت لەو بگرەوبەردەیەدا بە لەچکێک کە لە کۆمێدەکەدا دەریهێنابوو، شـانی ڕووتی کچۆڵەکەی داپۆشـی، بێ ئەوەی پێویست بکات هەڵبسێتەوە یان دەست لە دوعاکردن هەڵبگرێت.

---

ڕێچارەیە چیدی بەکار نابرێ و لەگەڵ بەرەوپێشـــچوونی بواری پزیشـــکیی و دۆزینەوەی ڕێگەی باشتر و سەلامەتتر، بە تەواوی پشتگوێ خرا. «و. ک»

[1] مەسحکردن

ئەو دەرگەیەی کە کەوتبووە سەر ژوورەکانی پشتەوە، هەمدیسان بە مەبەستی کونجکۆڵی کرایەوە. لە ڕاڕەوەکەدا ئەو کۆمەڵە تەماشاکەرەی کە لە ئەپارتمانەکانی دیکەوە دەهاتنە دەرێ و لە پلیکانەڕێکەدا دەوەستان، سات دوای سات چڕتر دەبوونەوە، وەلێ ئەوانەی دەرێ نەیاندەوێرا هەنگاو بنێنە ئەمدیو لاشیپلانەکە. تەنیا بنەمۆمێک ڕۆشنایی دەبەخشییە ئەو دیمەنە.

لەم کاتەدا پۆلینکا بەنێو ئاپۆڕای پشت دەرگەکەدا ڕێی کردەوە و هاتە ژوورێ، هێندە خێرا رایکردبوو کەوتبووە هەناسەبڕکێوە. شاڵەکەی فڕێ دایە لایەک و چاوی بەدوای دایکیدا گێڕا و چووە بەردەمی و گوتی: *وا دێ. لەسەر شەقامەکە تووشی بووم!* دایکەکە ئەویشی ناچار کرد لەتەنیشتییەوە بکەوێتە سەر ئەژنۆ. کچەی گەنج، سەرکز و بێدەنگ دری بە ئاپۆڕاکە دادا و هاتە پێش. دەرکەوتنی کتوپڕانەی لەو ژوورە تەژی لە هەژاری و شەرپۆشی و مەرگ و بێهیواییەدا، سەرسوڕهێن بوو. ئەوە سەروسیمای خۆیشی لەلایەک کە جلێکی هەرزان و بێکەڵکی پۆشیبوو، بەڵام خشڵ و ڕازێنەری جلەکەی، پەیڕەویی لەو یاساوڕێسا و سەلیقەیە دەکرد کە بەسەر دونیا تایبەتەکەی ئەودا فەرمانڕەوا بوو و هاواری دەکرد بە چ مەبەستێکی شەرمهێنەرەوە لە بەر کراون. سۆنیا لە ئاستانەی دەرگەکەدا وشک بوو و وەک ونبووەکان لە چواردەوریی دەڕوانی و نەیدەزانی چی بە چییە، تەنانەت هۆشی بە لای ئەو کراسە ئاوریشمییە ڕەنگاوڕەنگە ناجۆرە دەستچەندەمەشییەوە نەبوو کە چاکێکی[1] درێژ و گاڵتەجاڕانەی هەبوو و بە هیچ شێوەیەک بۆ ئەو ژینگەیە نەدەشیا. داوێنە ئاشدارە گەورەکەی پانتایی دەرگەکەی گرتبوو و پووتی کاڵەوەبووی لە پێدا بوو. چەترێکی هەتاویی بە دەستەوە بوو، گەرچی شەویش بوو و بە کەڵکی نەدەهات. کڵاوێکی حەسیریی خڕی

---

١. چاک: بەشێک لە شتێک، وەک جلوبەرگ، کە لە دواوە شۆڕ بووەتەوە.

سەمەرەی بە سەرەوە بوو کە پەڕێکی سووری پێوە بوو و لەژێر ئەو کڵاوەوە، کە بە خوویێکی هەرزەکارانەوە بە خواری لە ســـەر کرابوو، ڕووخســـاری بچووک و ڕەنگپەڕیو و ترســـاوانەی بە دەمێکی بەش و چاوانێکی تۆقیوی ورماوەوە دیار بوو. سۆنیا کچێکی لاواز و وردیلەی هەژدە ســـاڵە بوو، بە قژێکی کاڵ و چاوانێکی شـــینی جوانەوە. واقووڕ لە قەشە و جێخەوەکەی دەڕوانی و هێندە بە ڕاکەڕاک خۆی گەیاندبوو کە هەناســـەی بۆ نەدەدرا. دواجار لە دەمی ئاپۆڕاکەوە ورتەورتێکی بەر گوێ کەوت. نیگای بڕییە زەوی و هەنگاوی نایە ژوورەکە، وەلێ هەر وا لای دەرگەکەوە ڕاوەستا.

دانپێدانـان و ڕێوڕەســـمی دینی کۆتـایی هـات. کـاترینـا ئیڤـانۆڤنـا هەمدیســـان فرکەی کردەوە لای مێردەکەی. قەشـــە کشـــایە دواوە و وەرســـووڕا تا بەر لە ڕۆیشـــتن ســـەرەخۆشـــییەک لە کاترینا ئیڤانۆڤنا بکات و ئامۆژگارییەکیشی بکات.

ژنە بە توورەیی پەڕییە نێو قســـەی قەشـــەکە و ئاماژەی بۆ منداڵە بچووکەکانی کرد و پرسیی:

– چی لەمانە بکەم؟

– خوا خۆی بەخشندەیە. ئێوەش بڕواتان بە بەخشندەیی و بەزەیی خواوەند هەبێ...

– با بەخشندە بێ، بەس خۆ بەخشندەییەکەی بە نسیبی ئێمە نابێ!

قەشە سەری لەقاند و ڕایگەیاند:

– گوناحە خاتوون، ئەم قسانە ناشوکرین!

کاترینا ئیڤانۆڤنا ئاماژەی بۆ کابرای نیوەگیان کرد و شاتاندی:

– ئەی ئەمە چی، ئەمە گوناح نییە؟

– ڕەنگە ئەو کەسانەی کە بێمەبەست تووشی ئەم ڕووداوانە بوونە، پەسەندی بکەن کە سەوسیّ[1]، شتێ بدەن، لانیکەم هێندەی مووچەکەی کە ئێستە لەدەستی دەدەن...

کاترینا ئیڤانۆڤنا بە تووڕەیی دەستی ڕاوەشاند و هاواری کرد:

– ئێوە دەڵێی تێناگەن؟ سـەوسـی چی بدەن؟ سـەرخۆش بووە و خۆی هاویشـتووەتە ژێر سـمی ئەسـپەکان! جا پاشـانیش باسـی کامە مووچە دەکەن؟ بێ لە مەینەت هیچ شـتێکی ترمان لەم پیاوەوە دەسـت نەکەوتووە. دار و نەداریی دایە ئارەق! پارەی لە خۆمـان دەدزی بۆ خواردنەوە و ژیـانی من و ئەم منـاڵە بێتـاوانـانەی لە کـافێکـانـدا تەفروتوونا کرد! وا باشە بتۆپێ و نەجاتمان بێ! نانخۆرێک کەمتر!

– لە دواساتدا دەبێ ببەخشین. گوناحە، خاتوون. ئەم قسانەی ئێوە لە گوناحە گەورەکانن!

کاترینا ئیڤانۆڤنا خەریکی مێردەکەی بوو، ئاوی دەکردە دەمییەوە، خوێن و ئارەقەی سـەروسیمای دەسـڕی و پشتییەکەی ڕێک دەکرد و جاروبار لای دەکردەوە تا وەڵامی قەشەکە بداتەوە. بەڵام ئەم جارەیان بە بارێکی شێتانە بە ڕووی قەشەکەدا هەڵشاخا:

– ئەی باوکە گیان! قسـە بە دەم خۆشـە! دەبێ چی ببەخشـم! گەر تووشـی ئەم ڕووداوەش نەبووبا، بە سـەرخۆشـی دەهاتەوە ماڵێ بەم تاقە کراسـە شـڕوور و چڵکنەوە. وەک پارچە بەردێک لێرەدا دەکەوت و منی داماو دەبوو تا قووقەی کەڵەشـێر جلی چڵکن بپروێنم و ئەم سـیپالانەی خۆی و مناڵەکان بشـۆم و پاشـانیش لای پەنجەرەکەوە هەڵیانخەم تا وشک ببنەوە. لەگەڵ خۆرکەوتنیش دەبوو هەموویان پینە

---

[1] سـەوس: غەرامە؛ خوورومە؛ تاوانە؛ ئەو پارەیەی کە بۆ قەرەبووکردنەوەی زیان دەدرێتە لایەنی بەرانبەر.

بکەم! شـــەوانی منی بەدبەخت ئاوها تێدەپەڕن!... جا ئێســـتە ئێوە هەتا قیامەت هەر باسی بەخشین بکەن! من لە هەموو ئەمانە خۆش بوومە...

کۆکەیەکی توندی تۆقێنەر قســـەکەی پێ بڕی. دەســـڕەکەی لە بەردەمیدا ڕاگرت و پاشـــان لە بارێکدا کە دەســـتەکەی دیکەیی بە سـنگییەوە دەگوشـــی، بە قەشـــەی نیشـــان دا. دەسـڕەکە لە خوێن گەوزابوو...

قەشە سەری دانەواند و هیچی نەگوت.

دواهەمین ســـاتەکانی گیانکەنشـــتی مارمیلادۆڤ بوو و چاوی لە کاترینا ئیڤانۆڤنا کلا نەدەکرد کە بەســـەریدا چەمیبووەوە. هەوڵی دەدا شتێک بە ژنە بڵێت. بە هەزار حاڵێک زمانیی بزواند و شتێکی ناڕوونی گوت، وەلێ کاترینا ئیڤانۆڤنا کە تێگەیشـــتبوو پیاوەکە نیازیەتی داوای بەخشینی لێ بکات، فەرمانکەرانە وەڵامی دایەوە:

– قسە مەکە! پێویست ناکا!... خۆم دەزانم دەتەوێ چی بڵێی!...

بریندارەکە بێدەنگ بوو، بەڵام لە هەمان ئەو ســـاتەدا کە چاوی بە چواردەوردا دەگێڕا، نیگای گیرایە دەرگەی ژوورەکە و سۆنیای بینی...

تا ئەو ساتە ئاگای لە ئامادەبوونی سۆنیا نەبوو؛ کچە لە شوێنێکی تاریکدا ڕاوەستابوو.

مارمیلادۆڤ کتوپڕ هەراســـان بوو و تۆقیوانە چاوی لە دەرگەکە و ئەو شوێنە بڕی کە کچەکەیی لێ ڕاوەستابوو، جا بە دەنگێکی پچڕپچڕ و خێسەدارەوە گوتی:

– کێ لەوێیە؟ کێیە لە بەردەگەکەدا؟

جا هەوڵی دا هەستێتەوە.

کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری کرد:

– پالکەوە! هەلمەستەوا!!!!

مارمیلادۆڤ کە وزەیەکی نائاسایی تێ گەڕابوو، توانیی بە سەری ئانیشکی خۆی بەرز بکاتەوە. تا ماوەیەک نیگای واق و شێتانەی لەسەر کچەکەی بێجوولە مایەوە؛ دەتگوت ناتوانێ بیناسێتەوە و تا ئەو ساتە بە وەها جلێکەوە نەیدیبوو. کتوپڕ ئەوی ناسییەوە کە لە بەر باقوبریقی ڕووالەتی ڕسوایانەی، هەستی بە شەرمەزاری و سووکی دەکرد و چەوساوانە چاوەڕێ بوو تا سەرەی بێت و مالئاوایی لە باوکی بکات کە خەریکی گیانەلا بوو. ڕووخساری مارمیلادۆڤ ئێش و ئازارێکی بەسوێی لێ دەباری.

– سۆنیا، کچەکەم! بمبوورە!

مارمیلادۆڤ هاواری کرد و هەولی دا دەستی بەرەو لای کچەکەی درێژ بکات، بەلام هاوسەنگیی لەدەست دا و لەسەر قەنەفەکەوە بە دەمدا کەوتە سەر زەوی. پڕتاویان کرد تا هەلیبستێننەوە. هێنایانەوە سەر قەنەفەکە، وەلێ ئیدی دواهەمین هەناسەی بوو. سۆنیا هاوارێکی کزی لێوە هات و فرکەی کردە پێشەوە و باوەشی بە باوکیدا کرد و بێ ئەوەی بەری بدات، بێجوولە لەلای مایەوە. مارمیلادۆڤ لە باوەشی سۆنیادا گیانی دەرچوو.

کاترینا ئیڤانۆڤنا کە چاوی بە جەستەی بێگیانی مێردەکەی کەوت، هاواری کرد:

– ئەوەی دەویست! ئێستە من چ قوڕێ بە سەرمدا بکەم؟ منی چارەڕەش چۆن کفنودفنی بکەم ئاخر؟ سبەی بە چی سکی ئەم منالە بێتاوانانە تێر بکەم؟

ڕاسکۆلنیکۆف چووە لای کاترینا ئیڤانۆڤنا و سەری قسەی کردەوە:

– کـاتـرینـا ئیـڤـانـۆڤـنـا، حەفتەی ڕابـردوو بـوو کە مـێردی خوالێخۆشـبووتان ورد و درشـتی ژیانی خۆی بۆ گێڕامەوە... دڵنیاتان دەکەمەوە بەوپەڕی ڕێز و خۆشـــەویســـتییەوە لە ئێوە دوا. هەر لەو ئێوارەیەوە تێگەیشتم چەندە هۆگری یەک بە یەکتانە و بەتایبەت چەندە خودی ئێوەی خۆش دەوێ و ڕێزی بۆتان هەیە، کاترینا ئیڤانۆڤنا، جا ســـەرەڕای ئەو لاوازییە نەفرەتییەشـــی، بەڵێ، هەر لەو ئێوارەیەوە بووینە هاوڕێ... ئێستەش مۆڵەت بدەن من... شتێ بکەم... ئەرکی خۆم بەرانبەر هاوڕێی کۆچکردووم بەجێ بێنم. فەرموون... لام وایە بیســت ڕۆبڵێک دەبێ... ئەگەریش بتوانم لە هەر ڕێیەکەوە یارمەتیتان بدەم... من... بە کورتییەکەی سەردانتان دەکەمەوە، بێگومان سەر دەدەمەوە... لەوانەشە سبەی بێمەوە خزمەتتان... ماڵئاوا!

ڕاســـکۆڵنیکۆف بە پەلە ژوورەکەی جێ هێشـــت، بەنێو ئاپۆڕای تێکترنجاوی ناو ڕێڕەوەکەدا خۆی دەرباز کرد و گەیشـــتە پلیکانەکان. وەلێ لەو قەڵەبـاڵقییەدا کتوپڕ بەر نیکۆدیم فۆمیچ کەوت، کە هەواڵی ڕووداوەکەی پێ گەیشتبوو و وا ئێستەش هاتبوو تا خۆی ڕێوشوێنی پـێـویســـــت بـگـرێـتە بەر. دوای ئەو ڕۆژە و ڕووداوەکەی نـێـو بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس یەکـدیـیـان نەبینیبوو، بەڵام نیکۆدیم فۆمیچ دەستبەجێ ئەوی ناسییەوە و پرسیی:

– ئاه، ئەوە ئێوەن؟

ڕاسکۆڵنیکۆف وەڵامی دایەوە:

– مردووە. دکتۆر و قەشە هاتنە ژوور سەری، هەموو شتێ بەپێی نەریت ئەنجام درا. تەنیا ئەو ژنە چارەڕەشـــە بێزار مەکەن، خۆی بەدەست سیلەوە هەراسانە. گەر توانیتان بە جۆرێک دڵنەوایی بکەن... ئێوە پیاوێکی دڵباشن، من دەزانم...

دواهەمین ڕستەی بە زەردەخەنەی سەر لێوەوە دەربڕی و ڕێک چاوی بڕییە ناوچاوی نیکۆدیم فۆمیچ.

– خۆ ئێوە تەواو خوێناوین!

نیکۆدیم فۆمیچ لە بەر ڕووناکیی چرادا چاوی بە پەڵەگەلی خوێنی تازەی سەر هێلەک و سەرقوڵی ڕاسکۆڵنیکۆف کەوت.

ڕاسکۆڵنیکۆف بە بارێکی نائاسییەوە گوتی:

– بەڵێ من... سەراپا لە خوێندا گەوزاوم!

پاشان بزەیەکی کرد، سەرێکی لەقاند و بە پلیکانەکاندا داگەڕا.

لەسەرخۆ و بە دڵنیاییەوە ڕۆیشت، تای لێ هاتبوو، بەس خۆی هەستی پێ نەدەکرد، سەراپای تەژیبوو لە تایەک بۆ ژیان کە بە لایەوە شتێکی نوێ بوو و، وزەیەکیش کە هەر وا لە دەروونیدا هەڵدەقولا. دەکرا هەستی نێوان ئەو و هی سزای مەرگبەسەرداسەپاوێک کە کتوپڕ بەخشراوە، بە یەک بزانیت. هێشتا نیوەی پلیکانەکانی نەبڕیبوو کە قەشە پێی ڕاگەیشتەوە، ئەویش بەرەو ماڵ دەڕۆیشتەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف ڕێی بۆ قەشە خۆش کرد تا ڕەد ببێت و، لە بێدەنگیدا، سەرێکیشیان بۆ یەکدی لەقاند. خەریکبوو یەک دوو پلیکانی کۆتای دەبڕی کە دەنگی هەنگاوگەلێکی بە پەلەی لەپشتەوە بیست. کەسێک خۆی بەو گەیاندەوە: پۆلینکا بوو کە دوای کەوتبوو و بانگی دەکرد: *بوەستن! بوەستن!*

ڕاسکۆڵنیکۆف لای لە کچۆڵەکە کردەوە. ئەویش تا خوارەوەی پلیکانەکان هاتبوو و تەنیا یەک پێپلە لە سەرووی ئەوەوە ڕاوەستابوو. ڕۆشناییەکی کز لە دەرێڕا دەدرەوشایە ژووری. ڕاسکۆڵنیکۆف توانیی ڕووخساری لاواز وەلێ بچووک و جوانی کچەکە ببینێت کە بە زەردەخەنەی شیرینی منداڵانەیەوە تەماشای ئەوی دەکرد. بێگومان

هەواڵێکی بۆ ئەو پێ بوو کە ئاوها بە هەڵەداوان دوای کەوتبوو و دیاریش بوو گەلێک بەوە دڵخۆشە کە گەیاندنی ئەو هەواڵەی لە ئەستۆ گرتووە. پەلەپەل و هەناسەسوار گوتی:

– ئێوە ناوتان چییە؟ ماڵتان لە کوێیە؟

ڕاسکۆڵنیکۆف دەستەکانیی خستنە سەر شانەکانی کچۆڵەکە و نیگای شاد دیار بوو. تەماشاکردنی کچۆڵەکە، لە چێژێکی سەیروسەمەرەدا نغرۆی کرد و خۆیشی نەیدەتوانی نهێنییەکەی بزانێت.

– کێ ئێوەی ناردووە؟

– دادە سۆنیا!

کچە شیرینتر لە جاری پێشوو زەردەخەنەی کرد.

– سۆسەم دەکرد دادە سۆنیا ناردبێتتی.

– دایە گیانیش هەڵبەتە گوتی کە بێم... کە دادە سۆنیا گوتی بێمە شوێنتان، دایکیشم هاتە پێش و گوتی *خێرا ڕاکە پۆلینکا!*

– دادە سۆنیاتت خۆش دەوێ؟

زەردەخەنەکەی پۆلینکا کاڵ بووەوە و زۆر جددی وەڵامی دایەوە:

– من هیچ کەسێکم هێندەی دادە سۆنیا خۆش ناوێ!

– ئەی من؟ خۆشت دەوێم؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بینیی کە کچۆڵەکە لە وەڵامدا ڕووخساریی نزیک کردەوە و سادەدڵانە لێوی گۆشتنی شل کرد تا ئەو ماچ بکات و باسکە لاوازەکانی کە لە تەختەیەکی ڕەقوتەق دەچوون، لە دەوری ملی ئەو ئالاند. کچۆڵەکە، سەری خستە سەر شانی ڕاسکۆڵنیکۆف و

هێمن‌هێمن کەوتە گریان، ڕووخساریشی بە شان و پشتییەوە دەگوشی.

چەند ساتێک دواتر ڕووخساری فرمێسکاویی بەرز کردەوە و بە دەست فرمێسکەکانیی سڕین:

– دڵتەنگی باوکمم.

پاشانیش کتوپڕ بەو سەنگینییەی کە منداڵان ئەو کاتانە تێیاندا دەردەکەوێت کە دەیانەوێت لە بابەتگەلی گەورەکاندا قسە بکەن، بۆی زیاد کرد:

– ئێستە ئیتر داماو بووین!

– بابەش خۆشتی دەویست؟

– بابە لیدای لە هەمووان زیاتر خۆش دەویست.

پاشان، ڕێک وەک مرۆڤە گەورەکان، فرە جددی و بێ زەردەخەنە درێژەی دایێ:

– لەبەر ئەوەی لیدا بچکۆلەترە زیاتر خۆشی دەویست، ئاخر لیدا نەخۆشە. بابە هەمیشە شتێکی بۆ دەکڕی. ئەو فێری خوێندنەوەی کردین و منیشی فێری ڕێزمان و ئینجیلم کرد.

دواهەمین ڕستەی بە شکۆیەکی تایبەتەوە گوت.

– دایە هەرگیز هیچی نەدەگوت، وەلێ ئێمە دەمانزانی بەوە دڵخۆشە و بابەش دەیزانی کە ئەو چەندە پێی دڵخۆشە. وەلێ دایە بەتەمایە فێری فەرەنسیم بکا، ئاخر ئیتر کاتی ئەوەیە دەست بە خوێندن بکەم.

– ئەی دوعا؟ دوعاش دەزانی؟

– ئەی چۆن نایزانم! دەمێکە دوعاکانمان لەبەر کردوون! من ئیتر گەورە بوومە و خۆم بە هێمنی دوعا دەکەم، وەلێ کۆلیا و لیدا هێشتا

بە دەنگی بەرز لەگەڵ دایە گیـان دەیکەن؛ یەکەم مریەمی پیرۆز و پاشـانیش ئەم دوعایەی کە *ئەی خوایە، سـۆنیای خوشـکمان بخە بەر سۆز و خۆشەویستیی خۆتەوە!*.... پاشانیش دانەیەکی تر هەیە کە *ئەی خوایە، لە بـاوکی دووەممـان خۆش بە و بیخە بەر سـۆز و خۆشەویستیی خۆتەوە!*... ئاخر باوکی یەکەمی ئێمە مردووە و ئەمەیان بووبووە بـاوکی دووەممـان. بەس ئێمە دوعـا بۆ ئەوی تریشـیـان دەکەین.

– پۆلینکـا، من نـاوم ڕۆدیۆنە، ڕۆدیۆن. بە ڕۆدیـا بـانگم دەکەن. جاروبار دوعا بۆ منیش بکە، بۆ *بەندەیەک بە ناوی ڕۆدیۆنەوە*... هەر ئەوەندە.

کچۆڵەکە گەرموگوڕانە وەڵامی دایەوە:

– تا کۆتای تەمەن دوعاتان بۆ دەکەم.

کتوپڕ بزە درەوشـاوەکەی دەرکەوتەوە، هەمدیسـان بەرەو لای ڕاسـکۆڵنیکۆف وەرچەرخا و باوەشـێکی گەرمی پێدا کرد. ناونیشـانی خۆی دایە کچۆڵەکە و بەڵێنی دا ڕۆژی دواتر لەوێ بێت. کچە شەیدای بووبوو و ئیدی وا دەڕۆیشـت. کاتژمێر لە دە لای دابوو کە هەنگاوی نایە سـەر شـەقام. پێنج خولەک دواتر، ڕێک لەو شـوێنەدا ڕاوەسـتا کە یارۆ ژنەکە لێیەوە خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکەوە.

لێبڕاو و سـەرکەوتووانە لەگەڵ خۆیدا یەکلایی کردەوە: *بەسـە ئیتر! با بەس بێ ئیتر ئەو هەموو سـەراب و وەهم و خەیاڵ و تۆقینەی سـەری تێ ناوم!... ژیان لە شـوێنی خۆیدایە. بۆ من ئائێسـتە زیندوو نیم؟ کەواتە یانی ژیانم لەگەڵ پیرێژنەکەدا لەناو نەچووە! خوا ڕەحمەت پێ بکا، دایە گیان، هێمن بخەوێ! ئیتر کاتی ژیری و ڕۆشـنـاییە و... کاتی ویست و هێز... جا با ببینین!* وەک ئەوەی نیازی ململانێی لەگەڵ هێزێکی ناو تاریکیدا هەبێ، لە دڵدا بۆی زیاد کرد: *جا تاقیی دەکەینەوە!*

*کەچی منیش قایل بووبووم کە لەو بســـتە زەوییەدا بژیم!... ئێســـتە تـاقەتیم نییە، وەلێ... وا بزانم نەخۆشـــییەکەم چوو بەدەم ئێشـــی خۆیەوە. لە کاتی هاتنەدەرەوەدا خۆم دەمزانی چاک دەبمەوە. بوەستە بزانم، خۆ بینای پاچینکۆف هەر دوو هەنگاوێک دوورە! نزیکیش نەبوو لێگەڕێ با گرەوەکەی بباتەوە!... لێگەڕێ با ئەویش دڵی خۆش بێ. خۆ من هیچم لێ کەم نابێتەوە! مرۆڤ هەر بە تەنیا هێزی دەوێ، بۆ بەبێ هێز مرۆڤ هیچی لەدەســت دێ؟ وەلێ بۆ بەدەســتهێنانی هێزیش هەر دەبێ هێزت هەبێ، ئائەمەیە کە هیچ کەس تێی ناگا!*

چەند ڕستەی کۆتای شـکۆدار و بڕوابەخۆبووانە گوتن و بە هێمنی لە پردەکە تێپەڕی. شـــکۆ و بڕوابەخۆبوونی بەرەبەرە ســـەری لە ئاســـمان دەســـووی و لەگەڵ تێپەڕینی هەر خولەکێکدا، دەتگوت وا مرۆڤێکی دیکە لە نـاخیـدا لە دایـک دەبێـت. ئەم گۆڕانکـارییە ســەرســوڕهێنەرە دەروونییەی لە کوێوە ســـەرچاوەی گرتبوو؟ خۆ خۆی ســـەری لێ دەرنەدەکرد. وەک مرۆڤێک کە بۆ ڕزگاربوون پڕ دەداتە هەر پارچە گوریسێک، کتومت ئەم هەستە هاتە سەروەختی کە ئەویش دەتوانێت بژی و هێشـتا دەرفەتی هەیە و ژیانی لەگەڵ مەرگی پیرێژنەکەدا کۆتـایی نەهـاتووە. لەوانەش بوو ئەنجـامگرییەکەی هەڵپەکارانە بێت، بەڵام خۆی بەوەی نەدەزانی.

شـــتێکی دیکەی بە زەیندا هات: *بەس خۆ من بە کچۆلەکەم گوت کاتێ دوعا دەکا، بیریشی لای من بێ و بەندەیەک بە ناوی ڕۆدیۆنەوە بەســـەر بکاتەوە... ئێ مەبەســـتم ئەوە بوو کە ئەگەر پێویســـتی کرد!* ئەمەی گوت و خۆیشـــی بە هەڵســوکەوتی منداڵانەی پێکەنی. ورەیەکی بێوێنەی هەبوو.

بە ئاســـانی ژوورەکەی ڕازومیخینی دۆزییەوە. لە بینای پاچینکۆفدا هەمووان کرێچییە تازەکەیان دەناســـی و قاپچی دەســـتبەجێ ڕێنوێنیی کرد. دەنگوهەرای پڕخرۆشـــی کۆڕێکی گەورە دەهاتە ناوەڕاســـتی پلیکانەڕێکەوە. دەرگە، لەســـەر پشـت بوو و ڕاسـکۆڵنیکۆف دەیتوانی

هەر لە دەرەوەڕا ژاوەژاو و گوتوبێژەکەیان ببیسـتێت. ژوورەکەی ڕاسـکۆڵنیکۆف تا ڕادەیەک گەورە و کراوە بوو و پازدە کەسـێکیشـی تێدا بوو. ڕاسـکۆڵنیکۆف لە ئاسـتانەی دەرگەکەدا ڕاوەسـتا، هەر لەوێ دوو خزمەتکار لەپشـت باریکەدیوارێکەوە خەریکی سـەماوەر و بتڵی خواردنەوە و قـاپ و دەفرگەلی خواردەمەنی بوون کە لە موبەقی خاوەنماڵەوە دەیانهێنانە سـەرێ. ڕاسـکۆڵنیکۆف داوای لێ کردن ڕازومیخینی بۆ بانگ بکەن. ڕازومیخین شـاد و بەکەیف لە ژوورەکە هـاتە دەر. هەر بە یەکەمین سـەرنج دیـار بوو کە تـا بینەقـاقـای خواردووەتەوە. گەرچی یەک بەرمیلە خواردنەوەش نەیـدەتوانی ئەم بوونەوەرە سەرخۆش بکات، بەڵام دەتگوت خواردنەوەکە ئەم جارەیان تا ڕادەیەک کاری تێ کردووە.

ڕاسکۆڵنیکۆف زوو سەری قسەی لەدەست گرت:

– تەماشـا، تەنیا بۆ ئەوە هاتووم پێت بڵێم تۆ گرەوەکەت بردەوە و ڕێی تێناچێ هیچ کەسێ بزانێ بڕیارە چیی بەسەر بێ. نایێمە ژوورێ، زۆر بێهێزم و هاکا کەوتم. دەی، ماڵئاوا و شـەویشـت شـاد! بەس گەر توانیت سبەی سەرێکم لێ بدە!

– دەزانی چییە؟ دەتگەیێنمەوە ماڵێ. خۆت دەڵێی بێهێزیـت، کەواتە دۆخەکە شڕە...

– ئەی میوانەکانت؟ کێ بوو ئەو قژلوولەی ئێسـتە سـەرەتاتکێیەکی کرد؟

– قژلوول؟ خوا دەزانێ کێ بوو! دەبێ لە هاوڕێکانی خاڵە گیان بێ، لەوانەشە بەبێ بانگهێشت خۆی پێدا کردبێ... خاڵە گیان لای میوانەکان جێ دەهێڵم. ئەم پیاوە گەوهەرە، حەیف کە ئێستە کاتی ئەوە نییە پێتی بناسـێنم. دەک بە تووندا بچن هەموویان! ئەوەندەیان هەڵداوە تەنانەت ناشـزانن هاتوومەتە دەر. پێویسـتە هەوایەکیش هەڵمژم. تۆش ڕێک لە کاتی خۆیدا هاتووی، کاکە! خوا دەزانێ دوو خولەکی تر لەوێ بمابام، کار دەگەیشـتە لەقە و بۆکز! قسـەی بێسـەرەوبەری وایان بە دەمدا

دێ... کە بڕوا ناکەی دەتوانێ قسەی وا بکا ئەم ئینسانە دووپییە! وەلێ بۆ بڕوا نەکەی؟ مەگەر خۆمان کەم قســـــەی قۆڕ دەکەین؟ لێگەڕێ تا بەیانی قسەی پڕوپووچ بکەن... بەم جۆرە مرۆڤ خۆی تێدەگا کە نابێ قسەی بەلاش بکا... بوەستە تا زۆسیمۆفیش بهێنم.

وا دیار بوو زۆسیمۆف گەلێک تامەزرۆی دیداری ڕاسکۆلنیکۆفە و کونجکۆلانە ســـــەراپای هەڵدەســـــەنگاند و هێندەی پێ نەچوو ڕووی کرایەوە. تـــا ئەو جێیەی کە دەکرا هەر وا بە پێوە پشـــکنینی بۆ نەخۆشەکەی کرد و گوتی:

– هەر کە گەیشـــــتییەوە ماڵێ بۆی بخەوی، شـــــتێکیش هەیە گەر بیخۆی خراپ نییە. بتدەمێ دەیخۆی؟ دەمێکە بۆم ئـامـادە کردووی... ئەوەتا، کەپسوولە...

ڕاسکۆلنیکۆف وەلامی دایەوە:

– دوو شتیش بێ دەیخۆم.

جا دەمودەست دەرمانەکەی قووت دا.

زۆسیمۆف بە ڕازومیخینی گوت:

– زۆر بـاشـــــە کە خۆت دەیگەیێنی. بزانین تـا بەیـانی حـاڵی چۆن دەبێ. ئەمڕۆ دۆخەکە باشــە و لە پاشـنیوەڕۆوە زۆر گۆڕاوە. ڕاســت دەکەن هیچ کاتێ درەنگ نییە بۆ فێربوون!

هەنگاویان نەنابووە سەر شەقام کە ڕازومیخین دەستی پێ کرد:

– دەزانی لە کاتی هاتنەدەرەوەدا، زۆسـیمۆف چیی بە گوێدا دەدام؟ من هەموو شـــــتێکت پێ دەڵێم کاکە، ئای کە ئەمانە چەندە دەبەنگن! زۆســـــیمۆف پێی گوتم ڕاشـــکاوانە لەگەڵیدا بدوێم و تۆش ناچار بکەم قســـــەی دڵت بکەی، پاشـــــانیش بڕۆم و هەرچیمان گوت و بیســـــتمان بیخەمە مشـــتی کاکم! بۆچی؟ چونکە کاکم وای بۆ چووە کە تۆ... هەر بە ڕاستی ئەقڵت لەدەست داوە یان بۆی هەیە لە هەر ساتێکدا شێت بی! تۆ بیری لێ بکەوە! یەکەم، تۆ ســـــێئەوەندەی ئەم کابرایە ئاقڵی! دووەم، هەر بە ڕاستی گەر شێت نەبووی، بۆ دەبێ قسەی بەلاش و

خەیالاتی ئەم کابرایە بەهەند وەربگری؟ سێیەمیش، ئەم خەپە گیانە پسپۆڕییەکەی نەشتەرگەرییە، جا ئێستەش گرتوویەتی بە نەخۆشییە دەروونییەکانەوە. هەڵبەتە قسەکانی ئەمڕۆت لەگەڵ زامیۆتۆفدا وایان کردووە جەنابی پایەبەرزیان بەم ئەنجامە بگەن!

– کەواتە زامیۆتۆف هەموو شتێکی پێ گوتووی؟

– بەڵێ، هەموو شتێکی گوت و باشیشی کرد کە گوتی. جا من تێگەیشتم مەسەلە سەرەکییەکە چییە، زامیۆتۆفی داماویش ئەوسا تێگەیشت... ئێ، ئەوەی ڕاستی بێ ڕۆدیا گیان... مەسەلە ئەوەیە کە... وا بزانم من تۆزێ سەرخۆشم ئێستە... وەلێ ئەمەش گرنگ نییە... مەسەلە ئەوەیە کە ئەم خەیالاتە... خۆ حاڵی دەبی؟ خەریک بوو لە مێشکیاندا دەچەسپی... تێدەگەی یان نا؟ هەڵبەتە هیچ کەسێ نەیوێرا ڕاشکاوانە هیچ شتێ بڵێ، چونکە بیرکردنەوەیەکی زۆر زۆر نابەجێ و سەیر بوو و کە ئەو بۆیەچییەشیان گرت، ئیتر تەواوی گریمانەکانیان بە با چوون. وەلێ ئەمانە بۆچی هێندە دەبەنگن؟ هەڵبەتە خۆم هەر ئەو کاتە زامیۆتۆفم لە قاڵب دایەوە... جا با بەینی خۆمان بێ، کاکی خۆم، جا تکایە با هیچ شتێکت سەبارەت بەو بابەتە لە دەم دەرنەچێ! تێگەیشتم کە ئەم زامیۆتۆفە گەلێ هەستیارە. ئەو کاتە تێگەیشتم کە لای لویزا ئیڤانۆڤنا بووین. وەلێ ئەمڕۆ، هەر ئەمڕۆ، ئیتر هەموو شتێ ڕوون بووەوە. هەموو شتێ لەژێر سەری ئەو ئیلیا پێترۆڤیچەدا بووە! تۆش بۆ من ڕۆیشتوویت و ڕێک لە ناوەڕاستی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسدا بووراویتەوە و بیانووت داونەتە دەست. پاشانیش لەبەر ئەو ئیشەی شەرمەزار بووە؛ من دەزانم ئیتر...

ڕاسکۆڵنیکۆف سەراپا بووەوە گوێ و ڕازومیخین هەرچیی لە دەم دەهاتە دەر، ئەو هەڵی دەلووشی. ڕازومیخینیش بەو ڕادەیە سەرخۆش بوو کە لە قسەکردندا زیادەڕۆیی بکات و هەموو شتێک بخاتە سەر بەڕە.

– من لەتــاو بۆنی بۆیە و هەوای تــاســـێنەری ئەوێ بوو کە بوورامەوە!

– بە ناخێری گیانت پێویســـت بە ڕوونکردنەوە ناکا! هەر بە تەنیا لەبەر بۆنی بۆیە نەبووە، مانگێک بووە کە تات لێ بووە و زۆسیمۆفیش شـــایەتە! وەلێ باوەڕ ناکەی ئەم کوڕۆکەیەی ئێمە، زامیۆتۆف، چەندە پیس تێکوپێک شـــکاوە ئێســـتە! دەڵێ، *من نابمە پەنجە بچووکی ئەو پیاوە*. مەبەســتی تۆیە دەی! کەســێکی باش و نەرمونیانە، کاکی خۆم. بەس ئەمڕۆ لە کۆشـــکی بلوورین وانەیەکی چاکت پێ دا، هەر بە ڕاستی تەفروتوونات کردووە! سەرەتا چاک ترساندووتە و ئەو داماوە حەپەســاوە! پاشــانیش بە جۆرێک ســەلماندووتە کە ســەرلەبەری ئەو هەڵیتوپەڵیتە تۆقێنەرە بڕواپێکراو بووە، دواجــاریش کتوپڕ زمــانی لێ دەردەهێنی و دەڵێی: *ئێســـتە چی دەڵێی چۆلەکە ژیکەڵەکەی من؟* تەماشا، یانی هەر زۆر باش بوو، کاکە! تەفروتوونا بووە کابرا! بە خوا مامۆســتای ئەم کارانەی تۆ، هەر شـــایەنی ئەوەش بوو! داخەکەم کە لەوێ نەبووم! زۆر تامەزرۆی بینینت بوو ئێســـتە! پارفێریش هەر وا، زۆر حەز دەکا پێت ئاشنا بێ...

– ئەها... یانی پارفێریش... باشـــە ئێســـتە بۆچی وایان زانیوە من شێتم؟

– شـــێت نا، من قســـەی بێســـەروبەری زۆرم کرد، کاکی خۆم... زۆرســـیمۆف هەر خەیاڵی لای ئەوەیە کە تۆ بۆچی هێندە ئەم بابەتەت بە لاوە گرنگە... هەڵبەتە ئێستە کە تێگەیشتوون تۆ لە چ هەلومەرجێکدا بووی ئیتر ئاشـــکرایە بۆچی ئەم بابەتە بۆ تۆ جێی ســـەرنج بووە و... چەندە ئەشـــکەنجەشـــی داویت و لەگەڵ نەخۆشـــییەکەشـــتدا دەســـتیان ناوەتە دەســـتی یەک... من، کاکی خۆم، ئەوەندەش ســـەرخۆش نیم... دەی ئەم زۆرســـیمۆفەش بە جەهەنەم بەو بیر و بۆچوونانەیەوە. وا پێت دەڵێم، گرتوویەتی بە نەخۆشـــییە دەروونییەکانەوە، وەلێ تۆ هەر بیریشی لێ مەکەرەوە...

هەردووکیان بیست چرکەیەک بێدەنگ بوون و پاشان ڕاسکۆلنیکۆف کەوتە قسەکردن:

– تەماشا، ڕازومیخین، با کورتی بکەمەوە و زۆر بە سادەیی پێت بڵێم کە... هێندە نابێ بەسەر مەرگی کەسێکەوە گەڕاومەتەوە... فەرمانبەرێکی خانەنشینکراو بوو کە ئەمڕۆ مرد... منیش هەرچی پارەم بۆ مابووەوە دامە خێزانەکەی... شتێکی تریش هەیە، هەر ئێستە بوونەوەرێک ماچی کردم کە ئەگەر مرۆڤیشم کوشتبووبا هەر بە لایەوە گرنگ نەبوو و هەر ماچی دەکردم... گەر ڕاستییەکەیت دەوێ، کەسێکی تریشم لەوێ بینی، بە پەڕێکی سووری سەر کڵاوەکەیەوە... خوایە، هەمدیسان خەریکی قسەی بێسەروبەرم! بۆچی ئەوەندە بێهێزم؟ تەماشا، تۆزێ ئاگادارم بە... ئێستە دەگەینە پلیکانەکان...

ڕازویمیخین بە نیگەرانییەوە پرسیی:

– چیت لێ قەوما کتوپڕ؟ نەخۆش کەوتییەوە دیسان؟

– سەرم دەسووڕێ، وەلێ ئەوە کێشە نییە، تەنیا زۆر خەمگینم، خەمێکی زۆر!... وەک ژنم لێ هاتووە. تەماشای ئەوێ کە! تۆ بڵێی چی بێ؟ تەماشا کە، تەماشای کە!

– ئێ چییە؟

– بۆ نابینی؟ ڕووناکیی ژوورەکەی من نابینی؟ لە درزەکەیەوە دیارە...

گەیشتبوونە سەر دواهەمین پلیکانەکان، واتە بەردەرگەی ئەپارتمانی خاوەنماڵ و هەر بە ڕاستیش دەکرا لەو خوارەوە ببینیت کە دەرگەی ژوورەکەی ڕاسکۆلنیکۆف ڕووناکە.

– سەیرە! ئێ، جا لەوانەیە ناستاسیا بێ.

– تا ئێستە هەڵنەکەوتووە ناستاسیا لەم کاتانەدا بێتە ژوورەکەی من، جا ئێستە دەبێ ئەو خەوتبێ. بەس... ئیتر بۆم گرنگ نییە! ماڵئاوا!

– چی دەڕێسی لە بەرخۆتەوە؟ من دەتبەم و هەر پێکەوەش دەچینە ژوور!

– دەزانم پێکەوە دەچینە ژووری، بەس دەمەوێ لێرانە ماڵئاوایی و تەوقەکەمان بکەین، کاکی خۆم. دەستت بێنە، دەی! ماڵئاوا!

– چ گلاراوێکتە تۆ، ڕۆدیا!

– هیچ؛ با بڕۆین، تۆ دەبێ شایەت بی.

بە پلیکانەکاندا چوونە سەر. ڕازومیخین ئەوەی بە مێشکدا هات کە نەکا قسەکانی زۆسیمۆف هێندەش بێبنەما نەبووبن و لەبەرخۆیەوە ورتاندی:

– ئاخ، چەنەبازییەکەی من هەمدیسان تێکی دایەوە!

کە گەیشتنە لای دەرگەکە، دەنگی گوتوبێژی ناو ژوورەکەیان هاتە گوێ.

ڕازومیخین هاواری کرد:

– چ باسە لەوێ؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بوو کە سەرەتا دەرگەکەی کردەوە، بە تەواوی پاڵی پێوە نا و خۆی لە لاشیپلانەکەدا وشک بوو و زمان شکایە دەمی.

دایک و خوشکی بینین کە وا لەسەر قەنەفەکە دانیشتوون و کاتژمێر و نیوێک دەبوو کە چاوەڕێی ئەو بوون. هەر ئەو ڕۆژە چەند جارێک بیستبووی کە ئەوان بەڕێوەن و هاکا گەیشتن، ئەی بۆچی چاوەڕێی دیداریان نەبوو و تەنانەت بە بیریشدا نەهاتبوون؟ دایک و خوشکی لەو کاتژمێر و نیوە چاوەڕوانییەدا، ناستاسیایان پرسیارباران کردبوو، ئەویش لە بەردەمیاندا ڕاوەستابوو و هەموو شتێکی لە نووکەوە بۆ نووک بۆ گێڕابوونەوە. کاتێک بیستیان ئەو دوایینیوەڕۆیە نەخۆش و تادار، بەپێی قسەکانی ناستاسیا، بەدەم وڕێنەوە چووەتە دەرێ، تۆقین و جڵەوی خۆیان لەدەست دا. *خوایە، تۆ بڵێی چیی بەسەر هاتبێ؟* هەردووکیان تێر گریابوون و تەواوی ئەو کاتژمێر و نیوەیان بە بێقەراری بەسەر بردبوو.

ڕاسکۆڵنیکۆف کە هاتە ژووری، بەدەم هاوارێکەوە لەتاو جۆش و حاڵ، خرۆشاوانە پێشوازییان لێ کرد و دووقۆڵی فڕکەیان کردە لای.

بەڵام ئەو دەتگوت بووەتە بەرد. کتوپڕ هەموو گیان کەیل بووبوو لە هەستێک کە وا دیار بوو بەرگەگرتنی نەکردەیە. تەنانەت باوەشی بە ڕوودا نەکردنەوە و نەیدەتوانی دەستی هەڵبڕێت. دایک و خوشکی توند باوەشیان پێدا کرد، ماچیان کرد، پێکەنین و گریان... بەڵام ڕاسکۆلنیکۆف جووڵەی لێوە نەهات، جا ڕەتێکی بردەوە و بە بێهۆشی تەختی زەوی بوو.

شلەژان و هاوار و تۆقین و ناڵە... ڕازومیخین کە لە بەردەرگەکەدا ڕاوەستابوو، پڕتاوی کردە ژوورەکەوە و نەخۆشەکەی بە باسکە بەهێزەکانی گرتە باوەش و توانیی لەسەر قەنەفەکە پاڵی بخات، پاشان ڕووی کردە دایک و خوشکە دڵپەرۆشەکە و هاواری کرد:

– هیچ نییە، هیچ نییە! بووراوەتەوە، هیچ گرنگ نییە! هەر ئێستە دکتۆرەکەی دەیگوت زۆر زۆر باش بووە و حاڵیشی باشی باشە! ئاو بێنە! ئەها، تەماشا کەن، خەریکە دێتەوە هۆش خۆی، ئەها، دووبارە حاڵی باش بووەوە!...

ڕازومیخین هێندە توند باسکی دونیای گرت کە خەریک بوو دەریبێت و کچەی ناچار کرد دانەوێت و بە چاوی خۆی ببینێت کە *حاڵی باش بووەتەوە*. دایک و خوشکەکە وەک فریشتەی فریادڕەس لە ڕازومیخینیان دەڕوانی و چون نموونەی پەرەستی و ورەبەرزی دەهاتە بەرچاویان. ناستاسیا پێی گوتبوون کە بە درێژایی ماوەی نەخۆشییەکە *ئەم گەنجە چوست و چالاکە* هەموو کارێکی بۆ ڕۆدیای ناساغی ئەوان کردووە. هەڵبەتە ئەوە خاتوو پولخێریای دایکی ڕاسکۆلنیکۆف بوو کە دەمەوئێوارە لە کاتی قسەکردن لەگەڵ دونیادا، بەم جۆرە ناوی ڕازومیخینی بردبوو.

# یەک

ڕاسکۆڵنیکۆف نیوخێز بوو و لەسەر قەنەفەکە دانیشت. بە بێهێزی دەستێکی بەرەو لای ڕازومیخین ڕاوەشاند تا بەڵکوو بەر بەو دڵدانەوە گەرم و لەخۆڕایە بگرێت کە پێشکەشی دایک و خوشکیی دەکرد. پاشان دەستی هەردووک ئافرەتەکەی گرت و تا خولەکێک بێ ئەوەی هیچ بڵێت، نیگای لە یەکێکیانەوە بۆ ئەوی دیکە دەگواستەوە. باری ڕووخسار و نیگای ترسی دەخستە دڵی دایکییەوە، نیگایەکی هێندە هەستیار و قووڵ، کە تا سەر ئاستی ئەشکەنجەدان هەژێنەر بوو. بارێکی نامۆی دیکە لە نیگای ڕاسکۆڵنیکۆفدا هێلانەی کردبوو کە لە شێتی دەچوو. دایکی، پولخێریا، کەوتە گریان. دونیای خوشکیشی ڕەنگی بە ڕووەوە نەبوو و دەستی لەنێو دەستی براکەیدا هەڵدەلەرزی.

ڕاسکۆڵنیکۆف کە دەنگ لە گەروویدا دەشکا، ئاماژەی بۆ ڕازومیخین کرد و گوتی:

– بڕۆنەوە ماڵێ... ڕازومیخین دەتانگەیەنێ. کەواتە تا بەیانی؛ بەیانی هەموو شتێ... بە ڕاست زۆردەمێکە لێرەن؟

پولخێریا هاتە وەڵام:

– عەسر گەیشتین، ڕۆدیا گیان. شەمەندەفەرەکە زۆر دوا کەوت. وەلێ ڕۆدیا، ئێستە گەر ئاسمانیش لە زەوی بدا، من جێت ناهێڵم! شەو لێرە لەلات دەمێنمەوە...

ڕاسکۆڵنیکۆف بە تووڕەیی و بێتاقەتییەوە جووڵەیەکی کرد و گوتی:

– تۆش ئەشکەنجەم مەدە دایە!

ڕازومیخین هاواری کرد:

– خۆم لەلای دەمێنمەوە، نــاهێڵم یەک خولەکیش تەنیــا بێ. میوانەکانیشم بە توون! با بە دار و دیواردا هەڵگەڕێن! خاڵە گیان خۆی لەوێ هەموو شتێکە.

– ئاخر من چۆنچۆنی سوپاسی ئێوە بکەم، گەنجەپیاو!

پولخێریا ئێستە خەریک بوو دەستەکانی ڕازومیخینی دەگوشین و سوپاسی دەکرد، بەڵام ڕاسکۆڵنیکۆف هەمدیسان پەڕییە نێو قسەکانی:

– بەرگە ناگرم، ناتوانم!

هەڵچووانە دووبارەی کردەوە:

– ئیتر شکەنجەم مەدەن! دە بیبڕنەوە و بڕۆن خێرا... ناتوانم بەرگە بگرم!...

دونیا بە ترسەوە ورتاندی:

– یانی دەڵێی دوای سێ ساڵی ڕەبەق نەبینین جێی بێڵین؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بەری پێ گرتن:

– ڕاوەستن، هەر دەپەڕنە نێو قسەکانم و بیروخەیاڵم دەشێوێنن... ئەرێ ئەم لوژنەتان بینی یان نا؟

– نا، ڕۆدیا، نەمانبینیوە. وەلێ ئاگادارە کە گەیشتووین.

پولخێریا بوو کە وەڵامی دایەوە و پاشــانیش کەســاسانە بۆی زیاد کرد:

– ڕۆدیا، بیســـتمان لوژن ئەرکی کێشـــاوە و ئەمڕۆ ســـەرێکی لێ داوی.

– بەڵێ... ئەرکیان کێشـــاوە ئەوان، هەر پایەدار بن... دونیا، بەڵێنم بەو لوژن خانەت دا کە لنگاوقووچ هەڵیدەدەمە خوارێ و پێم گوت ون بێ و بچێ بۆ دۆزەخ...

پولخێریا حەپەسا و بەدەم تەتەڵەوە گوتی:

– ڕۆدیا، چیت پێ گوت؟ تۆ هەڵبەتە... یانی ناتەوێ بڵێی کە...

بەڵام کە نیگای کەوتە سەر دونیا، بێدەنگ بوو.

دوینا کە واقووڕ لە براکەی دەڕوانی، چاوەڕێ بوو ببینێ دواتر چی ڕوو دەدات. دایک و خوشکەکە مەسەلەی دەمەقاڵێکەی نێوان لوژن و ڕاسکۆڵنیکۆفیان لە ناستاسیاوە بیستبوو و –هەڵبەتە بەو ڕادەیەی کە ئەو ســـەری لێ دەرکردبوو و توانیبووی بۆیان باس بکات– لەو کاتەوە، هەردووکیان تاساوانە پڕ لە دڵەڕاوکێ و ترس بووبوون.

ڕاسکۆڵنیکۆف زۆری لە خۆی کرد تا بتوانێت درێژەی پێ بدات:

– دونیا خاتوون، من ڕازی نیم ئەم هاوســـەرگیرییە ســـەر بگرێ! ڕێک سبەینێ هەر سەرلەبەیانی جوابی دەکەی و بڕایەوە، تا ئیتر ئەم کابرایە پێوار بێ!

هاواری پولخێریا گەیشتە ئاسمان:

– خوا هاوار!

– براکەم، ئاگادار بە چی دەڵێی!

دونیا هەڵچووانە بە براکەیدا هەڵشـــاخا، بەڵام دەمودەســـت خۆی جڵەو کرد و نەرمتر لەسەری ڕۆیشت:

– لەوانەیە ئێســـتە کاتی قســـەکردن نەبێ، تۆ لەســـەر خۆت نیت و ماندووشی.

– لات وایە وڕێنە دەکەم، ئەرێ؟ نەخێر خاتوون گیان... تۆ تەنیا لەبەر من دەتەوێ شـــوو بە لوژن بکەی. وەلێ من قوربانیم ناوێ، تێگەیشـــتی؟ کەواتە هەر ئەمشـــەو یادداشـــتێکی بۆ دەنووســـی و... داواکەی جەنابی پایەبەرز ڕەد دەکەیتەوە... بەیانیش دەیدەیتە من بیخوێنمەوە و تەواو!

کچە لەسەر دڵی گران کەوت و هاواری کرد:

– ناتوانم وەها کارێ بکەم! ئەسڵەن تۆ کوا مافی ئەوەت هەیە کە...

دایکەکە بە نیگەرانییەوە مشتومڕەکەی پێ بڕین:

– دونیا، تۆش ئاگاداری قســـەکانت بە کچێ! هیچ مەڵێ ئیتر، بۆ بەیانی... نابینی حاڵی چۆنە... باشترە ئێمەش بڕۆین!

ڕازومیخین بە بارێکی سەرخۆشانەوە گوتی:

– کاکە وڕێنە دەکا، گەرنا بێشەرمیی وای لێ نەدەوەشایەوە! بەیانی هەموو ئەم هەڵیتوپەڵیتە تەواو دەبێ و دەچێ بەدەم کارییەوە... ئەمڕۆ کابرای لە قاڵب دایەوە. ڕاست دەکا. لوژنیش پەست بوو... لێرە وتاری بۆ دەداین و بڕێک خۆی بەسەردا هەڵکێشاین و ئاخرییەکەشی ناچار بوو کلکی بە کۆڵییەوە بنێ و بڕوا...

پولخێریا هاواری کرد:

– یانی هەر بە ڕاستی وا بووە؟

دونیا دڵی پڕ بووبوو:

– برا گیان، جارێ ماڵئاوا تا بەیانی. با بڕۆین دایە گیان... خوا ئاگادارت، ڕۆدیا.

ڕاســـکۆڵنیکۆف بە هەر تەقەللایەک بوو بەدوایاندا دووبارەی کردەوە:

– بیسـتت، خوشـکێ؟ من وڕێنە ناکەم. ئەم هاوسـەرگیرییە مایەی شـــوورەییە! من گەر ســـووک و ڕســـوا بوومە، ئەوا تۆ مەبە... هەر ئەمەی من بۆ حەوت پشت بەسە... وەلێ بەم سووک و ڕسواییەشەوە، وەها خوشـکێکم ناوێ. کەواتە خۆت ســەرپشــکی، یان من یان لوژن! دەی ئێستە بڕۆن...

ڕازومیخین نەڕاندی:

– تۆش هەر دەڵێ ئەقڵت لەدەســـت داوە! لێمان بوویتەتە کوێخا و شت؟

ڕاسکۆلنیکۆف وەڵامی ڕازومیخینی نەدایەوە و پێدەچوو نەشتوانێت بیداتەوە. لەســەر قەنەفە ڕاکشــا و ڕووی کردە دیوارەکە. بڕســتی لێ بڕابوو. بەڵام ســـــەرنجی دونیا لای ڕازومیخین بوو و ئەویش لەتاو تیری نیگا و بریقەی چاوی ڕەشی هەڵدەلەرزی.

پولخێریا کە لە پێ کەوتبوو، بێهیوا بە گوێی ڕازومیخیندا ورتاندی:

– من بە هیچ شـــێوەیەک ناتوانم بڕۆم. هەر لێرە لە شـــوێنێک دەمێنمەوە... ئێوە دونیا بگەیەننەوە ماڵێ.

ڕازومیخینیش کە ئیدی خەریک بوو حەوسەڵەی بەسەر دەچوو، بە ورتەوە وەڵامی دایەوە:

– هەموو شــتێ تێک دەدەن گەر بمێننەوە، لانیکەم وەرنە دەرێ بۆ سەر پلیکانەکان. ناستاسیا، ئێرە ڕووناک بکەرەوە! دڵنیا بە...

ماوەی قسەکانیی لە دەرەوە و کەم تا زۆر بە چپەچپ تەواو کرد:

– کاکم دوانیوەڕۆ ئەوەندەی نەمابوو بە بناگوێی من و دکتۆرەکەیدا بســـــرەوێنێ! حاڵی دەبن چی دەڵێم؟ دەیویســـــت لە دکتۆرەکەی بدا! تەنانەت ئەویش کۆڵی دا و ڕۆیشــت، نەیدەویســت تووڕەتری بکا. من

له نهۆمی خوارەوەدا مامەوه و ئێشـــکم گرت، وەلێ جەنابی پایەبەرز کتوپڕ جلیان له بەر کرد و بۆی دەرچوون! تووڕەی بکەن هەمدیسـان دەسخەڕۆمان دەکا و بەم کاته ناوەختەی شەو له دەستمان دەردەچێ و لەوانەشە خۆی تووشی بەلایەک بکا...

– ئاخ! ئێوه چی دەڵێن؟...

– جا ناشکرێ بەبێ ئێوه دونیا خاتوون لەو ماڵەدا تەنیا جێ بهێڵین، هەر ئەوەندە بەسـه بیری لێ بکەنەوه که بڕیاره له چ جۆره شـوێنێکدا بمێنێتەوه! ئەم لوژن خانه ناپیاوە، هەر به ڕاسـتی شـوێنێکی باشـی بۆ مانەوەتان دۆزیوەتەوه.. ئەوەی ڕاسـتی بێ، من کەمێ سـەرخۆشـم و هەر لەبەر ئەوەیە کە... خەریکی جنێودانم، ئێوه به گەورەیی خۆتـان لێم ببوورن...

بەلام پولخێریا کۆڵی نەدا:

– من ئێسـته دەچمه لای خاوەنماڵ و لێی دەپاڕێمەوه گەر تەنیا بۆ ئەمشـەویش بووه، سـووچێک بداته من و دونیا. ئاخر خۆ ناتوانم بەم دۆخەوه وازی لێ بهێنم و به تەنیا جێی بهێڵم، ناتوانم!

ئەم گوتوبێژه له باداک و ڕێک لەپشـــت ئەپارتمانی خاوەنماڵەکەوه بوو و ناسـتاسـیاش چرابەدەسـت پێپلەیەک له خوارووی ئەوانەوه ڕاوەسـتابوو تا باداکەکه ڕووناک بکاتەوه. ڕازومیخین خرۆشـا بوو. نیو کاتژمێرێک لەوەوبەر که خەریک بوو ڕاسـکۆڵنیکۆفی دەهێنایەوه ماڵێ، زۆر قسـەی کردبوو، وەلێ خۆی چاک دەیزانی خەریکه چی دەکات و سـەرەڕای ئەو هەموو خواردنەوەیە، زەینی کراوه و ڕۆشـن بوو. بەلام ئێسـته تەواو گرتبووی و وا دیار بوو کاریگەریی ئەو هەموو خواردنەوەیه دووبەرانبەر بووبوو و مێشـکیی جڵەو کردبوو. له باداکەکه و لەتەک خاتوونەکانەوه ڕاوەسـتابوو و دەسـتی هەردووکیانی گرتبوو، هەوڵی دەدا ڕازییان بکات و هێنده پتەو و

ڕەوان پاساوی دەهێنایەوە کە سەری دەسووڕماند. کەم تا زۆر لەگەڵ گوتنی هەر قسەیەکدا، دەستی ژنەکانی بە جۆرێک لە گیرەی ئاسنینی دەستیدا دەگوشی کە دەیئێشاند؛ پێدەچوو لەم ڕێیەوە بیەوێت باشتر پاساو و بەڵگەکانی بسەلمێنێت. لەو بارەشدا زەق چاوی بڕیبووە دونیا و تەنانەت گوێی بە ڕەچاوکردنی ئەتەکیەتیش نەدەدا. ژنەکان هەندێک جار دەیانتوانی دەستیان لە پلوپەنجەی قلۆر و ئێسکنی ئەودا دەربهێنن، بەس ڕازومیخین نەیدەزانی مەسەلە چییە و توندتر لە جاران دەستی دایک و کچەکەی دەگرت و بەرەو خۆی ڕایدەکێشان. گەر داوایان لێ بکردبا، ئەوا سەراوسەر خۆی لە پلیکانەکانەوە هەڵدەدایە خوارێ، نە بیری لێ دەکردەوە و نە دەیهێشت تۆزقاڵێک دوودڵی دزەی تێ بکات؛ بۆ خزمەتکردنی ئەوان یەکسەر خۆی هەڵدەدایە خوارێ.

گەرچی پولخێریا هەستی دەکرد بە گشتی گەنجەکە کەسێکی فرە سەیروسەمەرەیە و زۆر توندیش دەستی دەگوشێت، کەچی لەو ترۆپکی دڵپەرۆشییەی ڕۆدیا گیانیدا، وای دەهاتە بەرچاو کە خودا ئەوی بۆ ناردوون و پێی باشتر بوو چاو لە خوو و بارە نائاساییەکانی بپۆشێت. دونیا کە هاوبەشی دڵپەرۆشیی دایکی بوو، سرووشتێکی پڕ لە ئازایەتی و وورەی هەبوو، بەڵام هێشتا هەر بە بینینی بریقەی ئاگرینی نیگای گەنجەکە، دوودڵ دەبوو و کەمێکیش ترساو. گەر پێشتر ناستاسیا لە تاریفی هاوڕێ سەیروسەمەرەکەی براکەیدا، ئەوی ئاوها شیاوی متمانەپێکردن نەنواندبا، بەبێگومان دونیا لەبری مانەوە لێی هەڵدەهات و دایکیشیی قایل دەکرد کە خۆی لەو گەنجە دوور بگرێت. هەڵبەتە دەیزانی ئیدی ناکرێ تەنانەت بیریش لە ڕاکردن بکاتەوە. دە خولەک دواتر، زۆر زۆر لێی ئەرخەیان بووبوو، ئاخر لە تایبەتمەندییە بەرجەستەکانی ڕازومیخین ئەوە بوو کە سەرەڕای ئەو بارودۆخەش کە تێیدا بوو، زۆر زوو سرووشت و دەروونی خۆی

ئاشـکرا دەکرد و هەمووان خێرا تێدەگەیشـتن سـەروکاریان لەگەڵ چ جۆرە مرۆڤێکدا هەیە.

ڕازومیخین هاواری کرد:

– مانای نییە بچن و دەسـت بە داوێنی خاوەنماڵەوە بگرن! ڕاسـتە کە دایکن، وەلێ گەر لێرە بمێننەوە شێتی دەکەن و خوا دەزانێ ئێمەش چ بەڵایەکمان بەسەردا دێ. بڕوانن، ئێستە دەڵێم پێویستە چی بکەین: ناسـتاسـیا لای دەمێنێتەوە و من هەردووکتان دەگەیەنمە شـوێنی مانەوەتان. خۆ بەو شەقامانەدا ناتوانن بە تەنیا بۆ خۆتان بسووڕێنەوە! پیتەربورگی ئێمە لەم لایەنانەوە... وەلێ گرنگ نییە!... پاشـانیش من خێرا دەگەڕێمەوە ئێرە و، سوێند بە شەرەفم، چارەکێک نابا هەواڵیتان بۆ دەهێنم، کە باشـە یان نا، خەوتووە یان نەخەوتووە و وردەکارییەکانی تریش. ئێسـتە گوێ بگرن کە دواتر چی دەکەین! پاشـان لە چاوتروو‌سـکانێکدا خۆم دەگەیەنمە ماڵەوە، بۆ لای ئەو هاوڕێ بەدمەسـت و پاتاڵانەم؛ هەڵبەتە دەچم تا زۆسـیمۆف بهێنم. زۆسـیمۆڤ، دکتۆرەکەی ڕۆدیایە. ئەویش لەوێیە، وەلێ سـەرخۆش نییە. ئەسـڵەن هیچ کاتێ نایگرێ ئەم بەشـەرە! پەلکێشـی لای ڕۆدیای دەکەم و دواتریش دەیهێنمە لای ئێوە. بەم جۆرە، لە مـاوەی یەک کاتژمێردا ئێوە دوو ڕاپۆرتتان دەگاتە دەسـت! بیسـتن لە زمانی دکتۆرەکەیەوە شـتێکی ترە تا من بمەوێ لەجێی ئەو بۆتان باس کەم! جا گەر کێشـەیەکیش هەبوو سـوێند بێ خۆم بتانهێنمەوە ئێرە، بەس گەر هەموو شـتێ باش بوو، ئێوە دەبێ بە ئارامی بۆی بخەون. من خۆم شـەو لێرە دەمێنمەوە، لە ڕاڕەوەکەدا، بۆ ئەوەی دەنگم نەبیستێ. بە زۆسیمۆفیش دەڵێم لە ماڵی خاوەنماڵدا پشـوو بدا تا لێمانەوە نزیک بێ. ئێسـتە خۆتان بڵێن، ئێوە لەلای بمێننەوە، زیاتر بۆ ئەو سـوودی هەیە یان دکتۆرەکەی؟ خۆ دیارە دکتۆرەکەی بەسوودترە. کەواتە بێن با بڕۆین! ئیتر ناوی خاوەنماڵیش مەهێنن؛ بۆ من کێشـەیەکی نییە،

وەلێ بۆ ئێوە نەکردەیە... ڕاتان ناگرێ، چونکە... چونکە دەبەنگییکە بۆ خۆی. ئەوەی ڕاســـتی بێ لەبەر من هەم لە ئێوە و هەم لە دونیـا خاتوون خانەگومان دەبێ... ئەوە بێگومان دڵ لە دونیا خاتوون پیس دەکا. بە کورتییەکەی بە هیچ جۆرێک ناکرێ لە پێچوپەنای کەسایەتیی ســـەیری ئەم ژنە تێبگەی! وەلێ دەی، قەیـدی چییە؟ خۆ منیش دەبەنگم!... کێشـــە نییە! با بڕۆین. خۆ متمانەتـان بە من هەیە؟ دەی بیڵێن، دڵنیان لە من؟

دونیا گوتی:

– با بڕۆین دایە گیان، دەزانم کە هاوڕێکەمان قســەی خۆی دەباتە ســەر. تا ئێســتەش هەر ئەمان بوون کە فریای ڕۆدیا کەوتوون و چی لەوە باشتر کە دکتۆرەکەشی ئامادە بێ شەو لێرە لای بمێنێتەوە؟

– تەماشا... تەماشا... چەندە باش لە قسەکەم تێگەیشتن، ئاخر ئێوە فریشتەن!

ڕازومیخین خەنی بووبوو. درێژەی پێدا:

– با بڕۆین! ناســتاســیا! بچۆرە ســەرەوە و لەلای دایکوتە، چراکەش ببە! چارەکەکێکی تر خۆم دەگەڕێمەوە.

پولخێریـا هێشـــتـا تەواو قـایـل نەبووبوو، بەڵام لەوەش زیـاتر کەللەڕەقیی نەکرد. ڕازومیخین هەر باســکێکیی دایە دەســت یەکێک لە ژنەکان و بە پلیکانەکاندا بردنییە خوارێ. شــتێکی ئەم گەنجە هێشـــتا پولخێریـای نیگەران دەکرد و لەبەرخۆیەوە گوتی: *گەرچی گەنجێکی چوســـتوچالاک و میهرەبانە، وەلێ ئاخر دەتوانی بەڵێنەکانی بەرێتە سەر؟ جا بەم حاڵەشییەوە...*

ڕازومیخین لە بارێکدا کە بە شـــەقاوی درێژەوە بە پیادەڕێکەدا هەنگاوی دەنا و خاتوونەکان بە هەزار حاڵێک پێی ڕادەگەیشـــتنەوە و

خۆیشی بەمەی نەدەزانی، سۆسەی کرد کە چی بە سەری پولخێریادا ڕادەبووریّ و هەودای بیریی پچڕاند:

– ئەی هاوار! دەبینم وا بیر دەکەنەوە کە ئەم کابرایە خۆی حاڵی شـــڕە. هەرگیز وا نییە!... دەی ئەریّ، وەک گەمژە تـا قوڕقوڕاگە خواردوومەتەوە، وەلیّ مەســـتییەکەم هی خواردنەوە نییە. کە ئێوەم بینی تێک چووم... بەس ئێوە گوێی مەدەنیّ! لەم گوێیەوە ببیســـتن و لەو گوێتانەوە دەریکەن: من دڵنیام هاوشـــانی ئێوە نیم... ئاخر ئێمە لە کویّ، ئێوە لە کویّ! کە ئێوەم گەیـانـد، لە قەراخ ئەم ڕێژاوەدا دوو ســـەتڵە ئاو بە ســـەرمدا دەکەم و دێمەوە ســـەر خۆم... ئاخ ئەگەر دەتانزانی چەندە عاشـــقانە هەردووکتانم خۆش دەویّ!... پێمەکەنن، لێشـــم توورە مەبن!... لە هەر کیّ پێتان خۆش بوو توورە بن، وەلیّ لە من نا! من هاوڕێی ڕۆدیام، دەی کەواتە هاوڕێی ئێوەشـــم. لەخوامە هاوڕێتان بم... دەزانن، هەستێک لە دڵمدا دروست بووبوو... ساڵی پار، لە کتوپڕێکدا بوو کە... هەڵبەتە، پێشـــتر هەســـتم پیّ نەکردبوو، چونکە ئێوە هەر دەڵێی ڕێک لە ئاســـمانەوە باریون! بڕوا ناکەم ئەمشـــەو تا بەیانی خەو بچێتە چاوم... زۆســـیمۆف عەســـر لەوە تۆقیبوو کە نەکا ڕۆدیا شێت ببیّ... هەر لەبەر ئەوەش نابیّ توورەی بکە...

دایکەکە هاواری کرد:

– ئەوە ئێوە باسی چی دەکەن؟

دونیاش ترسی لیّ نیشت و پرسیی:

– دکتۆر شتێکی وای گوتووە؟

– بەڵیّ، بەس وەها شـــتیّ لەئارادا نییە، هەرگیز. دەرمانی پیّ دا. کەپســـوول بوو، خۆم بینیم. هـاتنی ئێوەش کە... ئـاە!... گەر بەیـانی بهاتبان، زۆر زۆر باشـتر دەبوو. ئێسـتە باش بوو کە هاتینە دەر. ڕێک یەک کاتژمێری تر زۆســـیمۆف دێتە خزمەتتان و هەموو شـــتێکتان پیّ

دەڵێ. خۆ گوتم، ئەو ســـەرخۆش نییە! منیش زوو بەرم دەدا... ئاخر بۆچی تا قورقوراگە خواردمەوە؟ خوا بە نەفرەتیان کا! خەتای ئەوان بوو، منیان تێکەڵی مشـتومڕە پڕوپووچەکەیان کرد، منێک کە سـوێندم خواردبوو مشـــتومڕ لەگەڵ هیچ بەنیئادەمێکدا نەکەم!... کاکە ئەمانە خەریکی قســەی بەلاشــن! هەر خەریک بوو دەســتەویەخە بین! خاڵە گیانم لەوێ داناوە تا هەوســـاریان ڕاکێشــێ! ئاخر بڕوا دەکەن: دەیانەوێ مرۆڤ هیچ کەســـایەتییەکی تایبەت بە خۆیی نەبێ و بە جۆرێکیش کراس لەســەر ئەمە دەدڕێنن کە هەر مەپرســە! دەیانەوێ خۆیان نەبن، تا پێیان دەکرێ لە خۆیان نەچن. ترۆپکی پێشــکەوتن لەمەدا دەبیننەوە، ئەو بەڕێزانە! جا بریا ئەم درۆ و هەڵیتوپەڵیتانە قسەی خۆیان بان، نەک ئەوەی لە...

پولخێریا شەرمنانە پەڕییە نێو قسەکانییەوە:

– تاوێ مۆڵەت بدەن...

بەڵام بەم کــارە تەنیــا ئــاگری گەنجەکەی بڵێســـەدارتر کرد و ڕازومیخین بە دەنگێکی بەرزترەوە نەڕاندی:

– ئێوە چۆنی بۆ چوون، ها؟ لاتان وایە بۆیە بە گژیاندا دەچمەوە، کە درۆ دەکەن؟ وەها شتێ لەئارادا نییە! ئەسڵەن حەز دەکەم قسـەی بەلاش و درۆ بکەن. ســـەرداری بوونەوەران هەر لەبەر ئەوە لە سەرووی هەمووانەوەیە! تا حەز دەکەی قسـەی پڕوپووچ بکە و درۆ، خۆت دەبینی کە دواجار دەگەیتە حەقیقەت! ئێمە بۆیە مرۆڤین چونکە درۆ دەکەین! کەس دەســتی بە هیچ حەقیقەتێک ڕانەگەیشــتووە، گەر چواردە درۆ لەسـەر ڕێگەکەی نەبووبێ، گەر بشـڵێین سـەد و چواردە درۆ هەر کەممان گوتووە! ئەمەش لە خۆیدا شـتێکی خراپ نییە! وەلێ خۆزگە لانیکەم درۆکانمان هی خۆمان بان! قســـەی بێمانا بکە، درۆ بکە، بەس بـا قســـەی خۆت بێ نەک هی ئەوانی تر، ئەوســـا من

دەستیشت ماچ دەکەم. مرۆڤ با بە لاڕێدا بڕوا وەلێ گەر ڕێگەکە، ڕێگەی خۆی بێ سەد کەڕەت لەوە باشترە کە ڕێگەی ڕاستی کەسێکی تر بپێوێ. چونکە کابرا گەر مرۆڤ بێ، ڕێگەی خۆی دەگرێتە بەر، وەلێ گەر لەسەر ڕێگەی ئەوانی تر بێ، ئەوپەڕی دەبێتە تووتییەکی لاساییکەرەوە. حەقیقەت بەردەوام وا لە شوێنی خۆیدا و ناتوانین لێی هەڵبێین، بەس ژیان، هەندێ جار زۆر مرۆڤ دەخاتە ژێر گوشارەوە؛ نموونەکانیشی زۆرن. بەس ئێمە ئێستە خەریکی چیین؟ ئێمە هەموومان، هەموومان بەبێ هەڵاوێردن لەڕووی زانست، پێشکەوتن، هزر، داهێنان، خەون، ئامانج، لیبرالیزم، ئەقڵ، ئەزموون و چی و چی و چییەوە... هەموومان، کە ئەم باسانە هاتنە ناوەوە، منالی پۆلی یەکین. هەمووان وای بە باش دەزانین بیرکردنەوەی ئەوانی تر دەرخواردی خۆمان بدەین و پێشی ڕاهاتووین. خراپ دەڵێم؟ ها؟ ڕاست ناکەم؟ ها؟

ڕازومیخین ئیدی خەریک بوو پڕ بە گەرووی هاواری دەکرد و توند دەستی هەردووک ئافرەتەکەی ڕادەوەشاند:

پولخێریای چارەڕەش هاواری کرد:

– خوا هاوار! ئاخر من لە کوێ بزانم؟

– بەڵێ، بەڵێ ڕاست دەکەن... گەرچی لە وردەکاریدا بۆچوونمان جیاوازە.

ئەوە دونیا بوو کە زۆر بە جددی ئەمەی گوت، بەڵام هاوکات لەتاو ئازار هاواری لێوە هات، چونکە ڕازومیخین خەریک بوو توند دەستیی دەگوشی.

– گوتتان بەڵێ؟ یانی ئێوە گوتتان ڕاست دەکەم؟ ئێستە ئیتر دوای ئەمە ئێوە... ئێوە...

ڕازومیخین کە پێی زەویی نەدەگرت، درێژەی پێ دا:

– ئێوە سەرچاوەی باشی و پاکی هەست و... کەماڵن! دەستتانم بدەنێ... ئێوەش دەستتان بێنن! دەمەوێ هەر ئێستە بکەومە سەر ئەژنۆ و ئەلێرەدا دەستتان ماچ بکەم...

ڕازومیخین لە هەمان شوێن و لە ناوەڕاستی پیادەڕێکەدا کەوتە سەر ئەژنۆ تا دەستیان ماچ بکات؛ خۆشبەختانە لەو کاتی نیوەشەوەدا پیادەڕێکە کشومات بوو.

پولخێریا تیاماو و حەیران هاواری کرد:

– واز بێنن، تکا دەکەم! خۆشتان دەزانن خەریکی چین؟

دونیا گەرچی وەک دایکی نیگەران بووبوو، کەچی پێکەنی:

– هەستنەوە، هەستنەوە، تکا دەکەم!

– سەریشم تیاچێ هەڵناستمەوە، هەتا دەستتانم نەدەنێ! ئەها، ئێستە تەواوە، بەسە ئیتر، هەستامەوە، دەی با بڕۆین! گەپچاڕێکی چەندە سیاچارەم من، هاوشانی ئێوە نیم، سەرخۆشم و زۆریش شەرمەزارم... تەنانەت شیاوی ئەوەش نیم کە خۆشم بوێن، وەلێ گەر پیاوانی دونیا هەمووی پیاو بن دەبێ لەبەردەم ئێوەدا سەری کڕنۆش دابنەوێنن! منیش کڕنۆشم برد... فەرموون، ئەمەش ئەو شوێنەی کە لوژن خان تێیدا ژووری بۆ گرتوون. گەر تەنانەت لەبەر ئەم کارەشی بووە، ڕۆدیا هەقی خۆی بوو بیکاتە دەرێ!... ئاخر چۆن توانیویەتی ئەوەندە ڕوودار بێ و لە وەها شوێنێکدا ژوورتان بۆ بە کرێ بگرێ؟ ئیشەکەی مایەی شەرم و ڕسواییە! ئەسڵەن دەزانن لەم بینایەدا ژوور دەدەنە چ جۆرە مرۆڤانێک؟ ئێوە لای خۆی دەزگیرانین، ڕاستە؟ دەی، کەواتە ببوورن، وەلێ دەبێ بە جەنابی بەرزوبەڕێزتان ڕابگەیەنم کە دەزگیرانەکەتان کەسێکی ناپیاوە!

پولخێریا ویستی بەرهەڵستیی ڕازومیخین بكات:

– گوێم بۆ بگرن، بەڕێز ڕازومیخین، وا دیارە بیرتان چووە كە...

ڕازومیخین پەلەپەل كەوتە داوای لێبوردن:

– بەڵێ، بەڵێ، ڕاســــت دەفەرموون. لە دەمم دەرچوو، بیرم چوو! وەلێ... خۆ ناكرێ هەر لەبەر ئەوەی قســـەی دڵمم كردووە لێم تووڕە بن! من ڕاســـــتگۆیـانە دەدوێم، نەك ئەوەی كە وەك... ئـمـمـم! شەرمەزارییە! ئەمەم بۆ ئەوە نەگوت كە بۆچوونی ئێوە... ئمممم! دەی، واز لە هۆكارەكەی بێنن؛ نایڵێم ئیتر، ئاخر بێشـەرمییە! وەلێ ئەمڕۆ كە ئەو كابرایە هاتە ژووری، هەموومان دەمودەست تێگەیشتین كە وەك بڵێی كابرا بە ئێمە ناخوا. هیچ پەیوەندییەكیشـــی بەوەوە نییە كە بە دەلاكەكەی گوتبوو قژیی لوول بكـا یـان ئەوەی كە دەیویســــت خوێندەواری و زانیارییەكانی بە ڕووی ئێمەدا بداتەوە. لە ئێمە نییە، چونكە كابرایەكی هەلپەرســـت و تازەچاوپێكەوتووە... چونكە وەك یەهوودییەكان چاوچنۆكە و ئەمانەش وەك ڕۆژ ڕۆشـــن بوون. لاتا وایە گەلێـك ئـاقڵە ئەم بەڕێزە؟ نـا كـاكە، كـابرا دەبەنگە، نموونەی نەفـامییە! جـا ئەوەی كە بە ئێوە دەخوا یـان نـا؟ تەنیـا خوا دەزانێ! تەماشا، خاتوونینە...

بە پلیكانەكاندا خەریـك بوون دەچوونە ژووری خـاتوونەكـان كە كتوپڕ ڕازومیخین هەنگاوی شل كرد:

– تەماشـــا، خاتوونینە... ڕاســـتە ئەو هاوڕێ حەپۆلانەی من ئێســـتە هەمووی تا قوڕقوڕاگە خواردوویانەتەوە، وەلێ لەگەڵ ئەوەشـــــدا هەر ڕاســـتگۆن. ڕاســـتە كە ئێمەومانان قســـەی زیادەی زۆر دەكەین. بەڵێ دەی، من خۆشـــم جاروبار درۆودەلەســـە دەكەم! وەلێ ئاخر، لەوپەڕی ئەم هەڵیتوپەڵیت و قسە پڕوپووچانەدا دەگەینە حەقیقەت، ئاخر ڕێگەی ڕاســـتمان گرتووەتە بەر. وەلێ ئەم لوژنە... بە ڕێی ڕاســـتدا ناڕوا.

ڕاستە ئێستە هەرچیم بە دەمدا هات بە هاوڕێکانمم گوت، وەلێ ڕێز لە یەک بە یەکیان دەنێم... هەروەها لە زامیۆتۆفیش... گەرچی ڕێزێکی وای لێ نانێم، وەلێ خۆشم دەوێ، ئاخر ئەم کوڕە توولەسەگێکە بۆ خۆی! زۆسیمۆفی ورچە زلەشم خۆش دەوێ، لەبەر ئەوەی کەسێکی سەرڕاستە و شارەزای کارەکەیەتی... وەلێ با بەس بێ ئیتر! هەموو شتێ گوترا و چاوپۆشیش کرا. هەر بە ڕاست لێم خۆش بوون یان نا؟ لێم خۆش بوون؟ باشە، با بڕۆین. ئەم ڕێڕەوەم لە بیرە، پێشتر لێرە بووم؛ ڕێک لێرە لە ژووری ژمارە سێ، ڕسواییەک بوو لە باسدا نایە... ئێ، ئێوە بڕیارە لە کامە ژووردا بمێننەوە؟ ژمارەی ئێوە چەندە؟ ژووری هەشت؟ باشە، کەواتە با بە دڵنیاییەوە تا بەیانی دەرگەی ژوورەکەتان کلۆمدراو بێ. دەرگە لە کەس نەکەنەوە! من چارەکێکی دی هەواڵی تازەتان بۆ دەهێنم و نیوکاتژمێر دواتریش زۆسیمۆف لە خزمەت ئێوەدایە، جا بزانن ناشیهێنم! خوا ئاگادارتان، تا زووە با بڕۆم!

پولخێریا بە ترس و نیگەرانییەوە بە کچەکەی گوت:

– ئەی خوایە! دونیا، بڕیارە چیمان بەسەر بێ؟

دونیا کە کڵاو و کۆڵوانەکەی لابردبوون، گوتی:

– ئەوەندە خۆت بێتاقەت مەکە، دایە گیان. خوا خۆی ئەم بەڕێزەی بە هانامانەوە ناردووە. ڕاستە لەسەر مێزی خواردنەوەوە هاتووەتەوە، وەلێ بڕوات هەبێ دەتوانین پشتی پێ ببەستین. جا بە دڵ و گیان چیی بۆ ڕۆدیا نەکردووە...

– ئاه! دونیا، جارێ خوا دەزانێ دووبارە دەگەڕێتەوە یان نا! لە خۆڕا قەبووڵم کرد ڕۆدیا گیان لەوێ بە تەنیا جێ بهێڵم!... بە هیچ شێوەیەک بە خەیاڵیشمدا نەدەهات لەو دۆخەدا ببینم! تەواو پەست بوو و دەتگوت بە بینینمان هیچ دڵخۆش نەبووە...

چاوانی پولخێریا پڕ بوون لە فرمێسک.

– نا دایە گیان، مەســـەلە ئەوە نییە. ئێوە ئاگادار نەبوون و هەر خەریکی فرمێسکڕشتن بوون. تەنیا بە بۆنەی نەخۆشییەکەیەوە بێزار بوو... هۆکاری هەڵسوکەوتەکەشی هەر ئەوە بوو.

– ئاە، ئامان بەدەست ئەم نەخۆشییەوە! ئێستە چی دەبێ، ئاخری بڕیارە چی ببێ؟ ئای، دونیا، ئەوە باســـی قســـەکردنەکەی هەر مەکە لەگەڵ تۆ!

دایکەکە بەدەم گوتنی ئەم قسانەوە، لەژێر چاو و بە کەمڕوویییەوە چاودێریی کچەکەیی دەکرد و بێقەرار بوو تا بزانێ ئەو لەم بارەیەوە چۆن بیر دەکاتەوە. بە هەمان ئەو دوو قسەیەی کە خوشکەکە وەک پشتیوانییەک لە براکەی کردنی، تا ڕادەیەک ئۆقرەی گرت، چونکە دیار بوو دونیا قسەی براکەیی لە دڵ نەگرتووە؛ بەڵام هەر وازی لە کچەکە نەهێنا و لەسەری ڕۆیشت:

– دەزانم بەیانی دێتەوە سەر خۆی و تێدەگا کە هەڵەی کردووە.

دونیا دواجار گوتی:

– وەلێ من دەڵێم بەیانیش هەر ئەم قســـانە لەبارەی ئەو بابەتەوە دووبارە دەکاتەوە...

هەڵبەتە لەمە زیاتر درێژەیان بەو قسانە نەدا. پولخێریاش دەترسا لەوە زیاتر مشتومڕ لەبارەی ئەم بابەتە تایبەتییەوە بکات. دونیا چووە لای دایکی و ماچی کرد. دایکەکەش بێ ئەوەی هیچ بڵێت، باوەشـــێکی گەرمی پێدا کرد و تامەزرۆیانە لە چاوەڕوانیی ڕازومیخیندا دانیشـــت؛ هەر واش بە کەمڕوویییەوە لە کچەکەی دەڕوانی کە دەستلەسەرسنگ بە ژوورەکەدا هاتوچۆی بوو و فکروخەیاڵ بردبوویەوە. دونیا لەمێژە ئەم خووی پیاسـەکردن و بیرکردنەوەیەی هەبوو و دایکەکە هەمیشـە

دەترسـا لەم کـاتـانەدا ببێتە هۆی پچڕانی هەودای بیرکردنەوەی کچەکەی.

هەڵبەتە شـەیدابوونی مەسـتانە و کتوپڕانەی ڕازومیخین بۆ دونیا گەمژانە بوو، وەلێ بە چاوپۆشین لەو دۆخەی کە گەنجەکەی تێدا بوو، کەم تا زۆر گەر هەر کەسـێک دونیای بدیتبا، ناهەقی ڕازومیخینی نەدەگرت کە ئەم جۆرە هەسـتەی هەبێت، بەتـایبەت لەو سـاتە نائاسـاییەدا کە کچەکە خەریک بوو تێفکر و زویر، دەستلەسـەرسنگ بە ژوورەکەدا پیاسـەی دەکرد. دونیا زۆر نازدار بوو، بەژنبەرز و ئێجگار ڕێکئەندام و هەڵبەتە پتەو و بڕوابەخۆ. بڕوابەخۆبوونی لە یەک بە یەکی جووڵەکانیدا دیـار بوو، بەڵام بە هیچ جۆرێک لە شـکۆ و نەرمیی جووڵەکانیی کەم نەدەکردەوە. ڕاسـتە کە هاوشـێوەی براکەی بوو، وەلێ دەشـیا ئەوپەڕی دڵڕفێنی لە ڕووخسـاری کیژەکەدا ببینیت. قژە قـاوەییە تۆخەکەی کەمێک لە هی براکەی کـاڵتر بوو. لەو چـاوە ڕەشـانەدا بریقەی شـکۆ دەدرەوشـایەوە، بەڵام هەندێک جاریش بێڕادە نەرمونیان دەبوو. ڕەنگی پەڕیبوو، وەلێ نەک لەبەر ناسـاغی، وزە و تەندروسـتییەکی زۆر لە ڕووخسـاری گەشـیدا بەدی دەکرا. دەمی تا ڕادەیەک بچووک بوو و لێوی خوارەوەشـی گۆشـتن و دەرپەڕیو و سـوور و زنجیشـی برێک هاتبووە پێشـەوە؛ ئەمە بە تاکە خەوشـی ڕووخساری دادەنرا، بەڵام بارێکی تایبەتی و تا ڕادەیەکیش سەرکەشی پێ دەبەخشی. ڕووخساری زیاتر جددی و تێفکرانە بوو تا خۆشحاڵ، وەلێ هەتا بڵێیت ئەو زەردەخەنە و پێکەنینە گەنجانە و سـووکباڵ و بێپاکـانەیەی لێ دەهـات! ئـاخر دێوێکی بیـابـانیی دڵسـافی چون ڕازومیخین، کە تـا ئەو کـاتە کچێکی وەک دونیـای نەدیبوو و تەواو هۆشـیـاریش نەبوو، چۆن دەیتوانی دەسـتبەجێ دڵ و دینیی پێ نەدۆڕێنێ؟ لەگەڵ ئەوەشـدا، وا هەڵکەوتبوو ڕازومیخین کاتێک دونیا ببینێت کە عەشـقی براکەی و شـادیی دیداری، ئەوی لە هەر سـاتێک

زیاتر دڵڕفێن کردبوو. پاشانیش کە خوشکەکە لەبەر پێنەزانی و قسەی ڕەق و بێشەرمانەی براکەی ڕەنجا و ڕازومیخین بینیی کە چۆنچۆنی پێی دڵگران بووە و لێوی خوارەوەی دەلەرزێت... ئیدی بە تەواوی کەوتە داوییەوە.

ڕازومیخین لەوەدا هەڵەی نەکردبوو کە لەسەر پلیکانەکان بەدەم قسە سەرخۆشانەکانییەوە، لەبارەی پاشا خاتوونی سەیروسەمەرەی خاوەنماڵی ڕاسکۆلنیکۆفەوە، گوتی کە لەبەر ئەو، دڵ لە دونیا و پولخێریا پیس دەکات.

پولخێریا تەمەنی چلوسێ ساڵ بوو، بەڵام ئاسەواری جوانیی سەردەمی گەنجی هێشتا لە ڕووخساریدا دیار بوو و لەچاو تەمەنیدا گەنجتر دەینواند؛ ئەو ژنانەی کە ڕۆحێکی مەزنیان هەیە و ئاسوودەیی و هەستیاری و گەرموگوڕیی ناوازە و ڕاستەقینەی دڵی پاکیان دەپارێزن، هەمیشە بەم جۆرەن. لێگەڕێن لێرانەدا بەتایبەت ئەوەشی بۆ زیاد بکەین کە تاکە ڕێی پاراستنی جوانی تا سەردەمی پیری، هەر بە تەنیا ئەمەیە و هیچ ڕێگەیەکی دیکەی نییە. قژی پولخێریا خەریک بوو شاش و خۆڵەمێشی دەبوو و دەمێکیش بوو وردەچرچ لە دەوری چاوەکانیدا دەرکەوتبوون. جا سەرەڕای ئەمانە و ئەو گۆنایانەی کە بەبۆنەی خەم و دڵەڕاوکێوە چاڵیان تێ کەوتبوو، ڕووخساری هێشتا سەرنجڕاکێش و دڵنشین بوو. هەر لە بنەڕەتەوە دەتگوت خودی دونیایە، تەنیا بیست ساڵێک پیرتر، وەلێ بەبێ لێوی خوارەوەی بەپێشداهاتووی کیژەکە. پولخێریا هەستیار بوو، بەس نەک لە جۆرە ساویلکانەکەی، شەرمن بوو و لەگەڵ خەڵکیدا دەسازا، بەڵام سنوورێکی بۆ خۆی هەبوو. بۆی هەبوو بسازێ و تەنانەت زۆر شت پەسەند بکات بێ ئەوەی بڕوای پێیان هەبێت، وەلێ هێڵێکی سووریشی لەسەر بنەڕەتی ڕاستگۆیی و بنەما و باوەڕی پتەو هەبوو، کە ئەگەر ئاسمانیش لە زەویی بدابا هەر ئامادە نەبوو بیبەزێنێ.

ڕێک کە بیست خولەکێک بەسەر ڕۆیشتنی ڕازومیخیندا تێپەڕی، دوو تەقەی کۆنترۆڵکراو و هێمن بەڵام بەهێز لە دەرگەکە درا؛ گەنجەکە گەڕابووەوە. هەر کە دەرگەکەیان کردەوە، ڕازومیخین پەلەپەل گوتی:

– نایێمە ژووری، کاتم نییە! تەخت لەسەر قەنەفەکە ڕاکشاوە و زۆر هێمن بۆی خەوتووە. خوا بکا دە کاتژمێرێک بەم جۆرە بخەوێ. ناستاسیا لەلای دانیشتووە، گوتم تا من دەگەڕێمەوە نەجووڵێت. ئێستەش وا دەچم زۆسیمۆف بهێنم. خۆی هەواڵی تازەتان پێ ڕادەگەیەنێ. پاشانیش وا باشە سەرخەوێ بشکێنن؛ دیارە کە زۆر لەوە ماندووترن بتوانن کارێک بکە...

ئەمەی گوت و بە ڕاڕەوەکەدا ڕاکەڕاک لێیان دوور کەوتەوە.

پولخێریا کە لە شادیان جێی بە خۆی نەدەگرت، هاواری کرد:

– ئای لەو گەنجە! ئای لەو گەنجە چوستوچالاک و... دڵسۆزە!

دونیا تا ڕادەیەک بە گەرمی وەڵامی دایەوە:

– ئەرێ، بەو جۆرەی کە دەردەکەوێ، کەسێکی ماقووڵە.

جا کەوتەوە پیاسەکردن.

کاتژمێرێکی خایاند تا هەمدیسان دەنگی هەنگاویان لە ڕاڕەوەکەدا بیستەوە و تەقە لە دەرگە درا. ئافرەتەکان ئەم جارەیان بەوپەڕی دڵنیاییەوە چاوەڕێ بوون ڕازومیخین بەڵێنەکەی بباتە سەر و هەر واش دەرچوو: گەنجەکە توانیبووی زۆسیمۆف بهێنێت. زۆسیمۆف زۆر بە ئاسانی قایل بوو کۆڕی خواردنەوەکە جێ بهێڵێت و بچێت بۆ ماڵی ڕاسکۆڵنیکۆف، وەلێ کە نۆرەی سەردانیکردنی ئافرەتەکان هات، مەیلێکی وای بۆ ئەو کارە نیشان نەدا. لە کۆتاییدا، بە بەدگومانییەکی سەیرەوە هات تا چاوی پێیان بکەوێت، ئەمەش لە بارێکدا کە هیچ

متمانەیەکی بە ڕازومیخینی مەبەست نەبوو. بەڵام کاتێک بینیی ئافرەتەکان بە جۆرێک چاوەڕوانیی دەکەن وەک ئەوەی کە خودای چارەسەرکردن بێت، ئیدی لووتبەرزییەکەی دامرکایەوە و جۆرێک لە سەنگینیی تێکەڕا. دە خولەک زیاتر نەمایەوە، بەڵام هەر لەو ماوەیەدا توانیی پولخێریا قایل و ئاسوودە بکات. شێوازی دواندنەکەی هاوخەمیی تێدا بەدی دەکرا، وەلێ بە دیوێکی دیکەدا جددییەت و زۆرزانیی پزیشکێکی بیستوحەوت ساڵەی هەبوو کە لە شێوازی کارکردنیدا ڕاوێژکردنێکی پزیشکیی ئێجگار گرنگ هەیە. یەک قسەی لەبارەی هیچ بابەتێکی دیکەوە نەکرد و کەمترین ئارەزووی بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکی نزیکتر لەگەڵ خاتوونەکاندا نیشان نەدا. زۆسیمۆف هەڵبەتە هەر کە پێی نایە ژوورەوە دەرکی بە جوانیی دڵڕفێنی دونیا کرد، کەچی هەوڵی دا تا ئەو کاتەی کە لەوێیە سەرنجێکی ئەوتۆی نەدات و تەنیا ڕووی دەمی لە پولخێریا بێت و بە پەیڕەویکردن لەمە، ڕەزامەندییەکی دەروونیی بێڕادەی بەدەست هێنا. ڕایگەیاند کە بە بۆچوونی ئەو باری جێگیربوونی تەندروستیی نەخۆشەکە لەو ساتەدا گەلێک دڵخۆشکەرە و پشکنینەکان نیشانیان داوە کە نەخۆشییەکەی ئەو تا ڕادەیەک بەهۆی هەلومەرجی خراپ و نەشیاوی ئەم چەند مانگەی دوایی ژیانییەوە بووە، وەلێ لەم نێوەندەدا هۆکارێکی دیکەش لەئارادایە کە ڕەگێکی ئاکاریی هەیە و وەک *دەڵێن دەشێت لە چەندان پاڵنەری ماددی و مەعنەوییەوە سەرچاوەی گرتبێ و جۆرەها دڵەڕاوکێ و گێچەڵ و خەفەت و بیرکردنەوەی جۆراوجۆر و... لەم جۆرە شتانە.* هەڵبەتە زۆسیمۆف کە لەژێر چاوەوە تێگەیشتبوو دونیا وشە بە وشە سەرنجی لەسەر قسەکانیەتی و، لە ئەنجامدا، زیاتر بابەتەکەی کردەوە و شەنوکەوی کرد. پاشانیش لە وەڵامی پولخێریادا کە دڵپەرۆش و شەرمۆک پرسیی ئایا هیچ *نیشانەیەک لە هەڵسوکەوتی شێتانە* بەدی کراوە یان نا، بە بزەیەکی هێمن و ڕاستەقینەوە گوتی ئەو قسەیەی کە کردوویەتی زیادەڕۆیانە

بووە و هەڵبەتە نەخۆشەکەیان گیرۆدەی بیرگەلی تایبەتییە کە دەستی لێ هەڵناگرن، شـــتێکی وەک واســـواســـی –چونکە ئەو، جەنابی زۆســـیمۆف، بە چڕی لەم بابەتە تایبەتەدا خەریکی توێژینەوەیە و لە زانســتی پزیشــکیدا قووڵ بووەتەوە– وەلێ دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە نەخۆشـــەکە هەتـا ئەمڕۆش هەر وڕێنەکردنی لەگەڵـدا بووە و ئامادەیی خێزانەکەشی کاریگەرییەکی ئەرێنیی لەسەر چاکبوونەوەی و ڕاکێشـانی هەستوهۆشی بەلای شتگەلێکی دیکەدا هەیە. لە کۆتاییشدا زۆر مانادارانە بۆی زیاد کرد: *هەڵبەتە بەو مەرجەی کە ئیتر بەم جۆرە شـۆک نەبێ*. پاشـان هەسـتایەوە، بە نیوەکڕنۆشـێکی سـۆزدارانە و کاریگەرەوە داوای مۆڵەتی کرد و، لەبەرانبەردا، بـارانێـک لە دوعـای خێر و پێزانینی گەرموگوڕ و تکا و سـوپاسـگوزاریی بەسـەردا باری. جا، سـەرەڕای هەموو ئەمانە، دونیا خاتوون دەستیشـی بۆ درێژ کرد. زۆسیمۆف بەدەم چوونەدەرەوەوە، تەواو خۆشحاڵ بوو بە دیدارەکەی و فرە لە خۆیشی ڕازی بوو.

ڕازومیخین بەدوای زۆســـیمۆفدا لە ژوورەکە چووە دەرێ و بۆ کورت و پوختکردنەوەی بابەتەکە گوتی:

– بەیانی قســـە دەکەین، ئێوەش زوو بگەڕێنەوە و بخەون. بەیانی زوو بە هەواڵی تازەوە دەگەمە خزمەتتان.

کە گەیشتنە سەر شەقام، زۆسیمۆف کە خەریک بوو ئاو بە دەم و لەوسیدا بچکێت، ئاماژەی کرد:

– بەینی خۆمان بێ، ئەم دونیایە چەندە تەڕوبڕ بوو!

– تەڕوبڕ؟ پێت گوت تەڕوبڕ؟

ڕازومیخین نەڕاندی و بەگژ زۆسیمۆفدا چوو و قوڕقوڕاگەی گرت:

– گەر جارێکی تر بێشـــەرمیی وا بکەی... حاڵی بووی چی دەڵێم؟ حاڵی بووی یان نا؟

لە بـارێکـدا کە چنگی بە یەخەی زۆســـیمۆفـدا کردبوو و ڕای دەوەشاند، پشتاوپشت بە دیوارەکەوەی کوتی و هاواری کرد:

– بیستت چیم گوت؟

زۆسیمۆف بەدەم تەقەللادانەوە گوتی:

– ئەریّ بەردە، ملئەستووری سەرخۆش!

کاتێک ڕازومیخین دواجار بەریدا، زۆســـیمۆف لێی ڕاما و کتوپڕ کەوتە پێکەنین. ڕازومیخین کە بە دەســـتی شـــۆڕ و نغرۆ لە بیرکردنەوەی خەمگین و گەلێک هەتەر لەبەردەمیدا ڕاوەستابوو، وەک پەڵە هەورێکی تاریک دای کرد:

– ئەوە هیچ کە من وڵاخم... بەس ئاخر... تۆش لە من خوێڕیتری.

– نا، کاکی خۆم، وەها شـتێ لەئارادا نییە. من تەنانەت بە خەیاڵیش هەنگاوی خوار نانێم.

بەدەم هەنگاونانەوە، بە بێدەنگی درێژەیان بە ڕێگەکەیان دا و تەنیا ئەو وەختەی کە نزیکی ماڵی ڕاســـکۆڵنیکۆف بووبوونەوە ڕازومیخین بە پەشێوییەکی سەیرەوە بێدەنگیی شکاند:

– گوێ بگرە، تۆ گەنجێکی باشی، قسە لەوەدا نییە. وەلێ یەکێ لەو عەیبوعارانەی کە هەتە ئەوەیە کە ژنبازی، چاک ئاگادارم، جا لە جۆری چەپەڵکارەکانیشی. تۆ، تۆ پۆخڵەواتێکی توورە و پڕوپووچی، کەسێکی میزاجی کە ڕۆژ بە ڕۆژیش خەریکە قەڵەو و تەمبەڵتر دەبی و ناتوانی خۆت لە چنگی هەوەســـەکـانـت نەجـات بـدەی... من بەمە دەڵێم چەپەڵکاری، چونکە مرۆڤ ســـەراوســـەر هەڵدەدەنە ناو پیســـی و چەپەڵییەوە. ئەوەندە موونەرمی کە نازانم چۆن بەم دۆخەوە هێشـــتا

دکتۆرێکی باش و تەنانەت بەرپرسـیاری. تۆیەک کە بە ناخێری گیانت دکتۆری، خۆت لەسـەر پەڕی قوو دەخەوی کەچی شـەوانەش بەئاگا دێیتەوە تـا بچیت بەدەم نەخۆشـەکانتەوە! جا گەر وا بڕوا، دوای سێ‌چوار سـاڵێک ئیتر ڕێی تێناچێ لەبەر نەخۆشـەکانت خۆت لە خەو بکەی... وەلێ واز لەم شتانە بێنە، قسە سەرەکییەکەم ئەمە نییە! بڕیار وایە ئەمشـەو لێرە لە ئەپارتمانی خاوەنماڵدا بمێنیتەوە. واشـنەزانی کە قـایلکردنی وەک ئـاوخواردنەوە وا بووە! منیش لە موبەقەکەیـدا دەمێنمەوە. دەرفەتێکی شاز هاتووەتە پێش تا بە خاوەنماڵ ئاشنا ببی! نـا، ئەوە نییە کە بیری لێ دەکەیەوە! لێرە، کـاکی خۆم، ئەو جۆرە یاریانە لەئارادا نین!

– بۆ من بیرم لە چی کردووەتەوە؟

– کاکە، لێرە تەنیا شـەرم و حەیا دەبینی و بێدەنگی و ئەوپەڕی داوێنپاکی... ئەم کەسە لە ناخی دڵەوە ئاە هەڵدەکێشێ و وەک مۆم لە بەردەمدا دەتوێتەوە، هەر بە ڕاسـتی دەبێتە ئاو! وەرە و ئەم ژنەم لە کۆڵ بکەرەوە، بە هەرچی دۆزەخی ئەم دونیایە هەیە سـوێندت دەدەم ئەم کارەم بۆ بکە! ئەم ژنە هێندە جوان و دڵڕفێنیشـە کە هەر باسـی مەکە... قەرەبووی دەکەمەوە، چی بڵێی بۆت دەکەم...

زۆسیمۆف بەرزتر لە جاری پێشوو کەوتە قاقالێدان.

– ئێ، دەبینم تێک چووی! ئاخر من چی لەم ژنە بکەم؟

– خەمت نەبێ، بەزموڕەزمی ناوێ. هەر هەڵیتوپەڵیتێکت پێ خۆش بوو بۆی هەڵڕێژە، هەر ئەوەندەی لە بەردەمیدا دانیشـی و قسـەی لەگەڵ بکەی، بەسـە. خۆ دکتۆریشـی، هەوڵ بدە ئازارێک، شـتێکی چارەسـەر بکەی. تەماشـا، ئامادەم سوێند بخۆم پەشیمان نابیتەوە. لە ماڵەکەیدا پیانۆشی هەیە و تۆش ئاگاداری کە من درنگەدرنگێک دەکەم جاروبار. ئاوازێکم خسـتووەتە سـەر پیانۆکەی، هی گۆرانییە ڕەسـەنە

ڕووسییەکان: *دەیهێنا بە چاومدا فرمێسکی ئاگرین*. خاتوون کەیفی بە شــتی دەگمەن دێ... وەلێ هەموو شــتێ لەم گۆرانییەوە دەســتی پێ کرد. ئەوە تۆش لەم پیانۆلێدانەدا شارەزای، ڕوبنشتاینێکی[1] بۆ خۆت!... بەڵێنت دەدەمێ پەشیمان نابیتەوە!

– ئەرێ تۆ، قەولوقەرارت پێ داوە، ها؟ واژۆ و شتت بۆ نەکردووە؟ خۆ بەڵێنی هاوسەرگیریت پێ نەداوە؟...

– نە هیچ بەڵێنێکم پێ نەداوە، نە واژۆیەکیش لەئارادایە! جا ئەم خاتوونە لەو جۆرە کەسانەش نییە! ئەوە چیبارۆف بوو کە دەیویست...

– دەی کەواتە وازی لێ بێنە!

– بەس خۆ ناتوانم هەر وا وازی لێ بێنم!

– بۆ ناتوانی؟

– ناتوانم کاکە گیان، بە کورتییەکەی، بەم جۆرە ناکرێ! کاکی خۆم، هەر دەڵێی شتێ پیاو پەلکێش دەکاتە ئێرە.

– دەی تۆ بۆچی ئەوت هۆگری خۆت کرد؟

– من هۆگرم نەکرد. تەنیــا بە جۆرێ لە جۆرەکــان خۆم لەم نێوەندەدا تێ کەوتووم. بەس ئەم خاتوونە، من و تۆ و کەســێکی دی جیاوازییەکمان بۆی نییە، هەر ئەوەندە کەســێ هەبێ لە بەردەمیدا دابنیشــێ و ئاهی بۆ هەڵبکێشــێ... کاکی خۆم، ناتوانم لەمە زیاتر بڕۆم.

---

١. ئانتۆن گریگۆریۆیچ روبینشــتاین: (لەدایکبووی ٢٨ی تشــرینی دووەمی ١٨٢٩ – کۆچکردوو لە ٢٠ی تشــرینی دووەمی ١٨٩٤) ئاهەنگســازێکی ڕووســی بوو و لە سەدەی نۆزدەیەمی میلادیدا بە یەکێک لە گەورەترین ژەنیارانی پیانۆ دادەنرا. ئەو لە ســالی ١٨٦٢دا ئەکادیمیایەکی مۆســیقیی لە ســانت پیتەربورگدا بنیاد نا. لەنێو بەرهەمەکانی ئەودا دەتوانین ئاماژە بە ٢٠ ئۆپێرا، ٦ ســەمفۆنیا و پێنج کۆنســێرتۆ پیانۆ بکەین. «و. ک»

تەماشـــا، کاکی من... خۆ تۆ هەمیشـــە بیرکاریت باش بووە، ئێســـتەش هەر وا خەریکی. کەواتە دانیشـــە و... فێری حســـابی تەواوکاری[1] بکە. خوا بمکوژێ گەر گاڵتە بکەم! هیچ کات لەمە جددیتر نەبوومە، ئاخر خۆ بۆ ئەم خاتوونە هیچ جیاوازییەکی نییە. دادەنیشـــێ و بۆ ســـاڵێکی ڕەبەق پێتدا واق دەبێ و تەنیا ئاه هەڵدەکێشـــێ. ماوەیەک لەمەوبەر، دوو ڕۆژی ڕەبەق لەبارەی ئەنجوومەنی لۆردانی پرووسیا[2] قسـەم بۆ کرد (خۆ هەرچۆنێک بووە دەبێت پیاو باسـی شـتێک بکا)، جا ئەویش بۆ ئەم بابەتە هەر ئاهی هەڵدەکێشـا و ئارەقەی دەڕشـت! بیرت بێ کە باسـی عەشـق و ئەم جۆرە شـتانەی لا نەکەی! چونکە ئەم ژنە هەتا بڵێی شـــەرمنە. وەلێ دەبێ بە جۆرێک لە جۆرەکان نیشـــانی بدەی کە خۆشـــت دەوێ و ناتوانی دەســـتبەرداری بی، هەر ئەوەندە! ئێرە شوێنێکی باشە. هەر دەڵێی لە ماڵی خۆتدای. دەتوانی بۆ خۆت بخەوی و دانیشـی و بتلێیتەوە و بنووسـی... گەر دڵیشـت پێوە بوو ماچی بکە، تەنیا پێی لێ ڕامەکێشە...

– ئاخر من ئەم کەسەم بۆ چییە؟

– کاکە گیان، بۆچی من ناتوانم بیکەم بە مێشـکتاندا! تەماشـا، ئێوە ئەو دووانەتـان هەر دەڵێی بۆ یەکتری کراون، تـاکی یەکترین! من پێشـــتریش هەر بیرم بۆ تۆ چووا... جا خۆت دەیبینی، ئاخرییەکەی دێیتە سەر قسەکەم! تەنیا درەنگ و زووی کەوتووە. کاکە، ئێرە گەرم و نەرم و خۆشـــە، کاکی خۆم... نەک هەر بە تەنیا ئەمەندە بێ، نا! خۆ

---

١. Integral: تەواوکـاری یـان ئینتێگراڵ، یەکێکە لە دوو ژێربـابەتی ســـەرەکیی بیرکاری، لەگەڵ چەمکی گرتە، هەژماری جیاکاری و تەواوکاری پێک دەهێنن. «و. ک»

٢. Prussian House of Lords: ئەنجوومەنی لۆردانی پرووسـیا، ئەنجوومەنی باڵای شانشینی پرووسیای ئەڵمانی بوو، کە پەرلەمانی ساڵانی ١٨٥٠–١٩١٨ی پێک هێنابوو. «و. ک»

گوتم، بەرەو خۆیت ڕادەکێشـــێ! ئێرە هەر دەڵێی ئەوســـەری دونیایە. وەک لەنگەرگەیەک بێوەیە ئێرە، پەناگەیەکی هێمن و چەقی قورســـایی زەوییە و، خوا شـــاهیدە، یەکێکە لەو ســـێ ماســـییەی کە زەوییان بەســـەرەوەیە. ئیتر با پێت بڵێم: ســـەرچاوەی کێکی تاوەیی و خۆراکی چەور ئەئێرەیە! دایمە چای و ســـەماوەرت دەمەوئێواران ئامادەیە. بە کورتییەکەی ئاهگەلی نەرم و شـــاڵی گەرم و کوانوویێکی شـــاز کە تۆ لەپاڵیدا بۆ خۆت دەحەوێیەوە. وەک ئەوە وایە کە مردبی، بەس هێشـتا زیندووی. بە کورتییەکەی خێری دونیا و ئاخیرەتی تێدایە! دەی ئیتر، گوێی مەدەیە، یەک دونیـا چەنەم دا و کـاتەکەش بەفیڕۆ چوو! گوێ بگرە چی دەڵێم: زۆر شەو لە خەو ڕادەچڵەکێم، هەر لەبەر ئەوە دەچم و سەرێکیش لە نەخۆشەکەمان دەدەم. وەلێ گرنگ نییە، قسەی بەلاش بوو، هەموو شـتێ باشـە. تۆش خۆت ئەزیەت مەدە، وەلێ گەر حەزت کرد، ســـەرێکی لێ بدە. بەس ئەگەر تـا و وڕێنە و شـــتی هەبوو، هەرچییەک بوو دەستبەجێ من هایی بکەوە. گەرچی لام وایە ئیتر هیچ ڕوو نادا...

## دوو

ڕازومیخین نزیکەی کاتژمێر حەوت و هەشتی بەیانیی ڕۆژی دواتر، زۆر جددی و بە زەینێکی ئاڵۆزەوە هایی بووەوە و خۆی لەبەرانبەر چەندان کێشـــەی جددی و چاوەڕوانینەکراودا بینییەوە. لە خەونیشـــدا نەیبینیبوو کە ڕۆژێک بەو دۆخەوە بێدار ببێتەوە. ســـات بە ســـاتی دوێنێی بە تەواوی وردەکارییەکانیەوە دەهێنایەوە یاد و باش دەیزانی ئەوەی کە ڕۆژی ڕابردوو بەسەری بردووە، بۆ ئەو نائاساییە و وەها کاریگەرییەکی خســتووەتە ســەری کە تا ئەو ســاتە تووشــی نەبووە. هەڵبەتە، لە لایەکیشـــەوە ئەوەی بۆ ئاشــکرا بوو کە هیچ هیوایەک بۆ دەســـتڕاگەیشـــتن بەو خەونە لەئارادا نییە کە بەم جۆرە خەیاڵیی وروژانـدبوو؛ خەونێکی هێنـدە دوورەدەســـــت کە دەبووە مـایەی شـــەرمەزاریی. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە وازی لە خەونەکەی هێنا و بیریی لەســـــەر کێشـــە و نیگەرانییەکانی دیکەی چڕ کردەوە کە دوای دوێنێی نەفرەتییەوە تووشیان بووبوو.

تۆقێنەرترین یـــادگـاریی دوێنێ، ئەو ڕووخســـــارە چەپەڵ و بەدگەوهەرانەیە بوو کە نواندبووی، جا ئەوەش نەک تەنیا لەبەر ئەوەی کە خواردبوویەوە، لە بنەڕەتــدا لەبەر ئەوە بوو کە دۆخی خراپی کچەکەی قۆســـتبووەوە و بە ئیرەییەکی گەمژانەوە ســـووکایەتیی بە دەزگیرانەکەی کردبوو، لە بارێکدا نە هیچ شــتێکی لەبارەی پەیوەندیی ئەوانەوە و ڕێککەوتنی نێوانیان دەزانی و نە هیچ بە باشی ئەو پیاوەی دەنـاســـی. ئەســـڵەن چۆن ئەوەی بە خۆی ڕەوا دەبینی کە بە هەڵسوکەوتێکی ئەوەندە هەڵپەکارانە و هەڵنەسەنگێندراوەوە ئەو پیاوە

بداته بەر ڕەخنە؟ بۆ هیچ كەسێك داوای بۆچوونی ئەوی كردبوو؟ بۆ دەكرا فریشـــتەیەكی وەك دونیـا، لەبەر پـارە ببێتە ژنی پیـاوێكی ناشـایەن؟ كەوایە دەبێ شـتێك لەم كابرایەدا هەبێ! ئەی ئەو ژوورەی كە بۆیـانی گرتبوو؟ دەی ئـاخر، ئەو دامـاوە چۆن بزانێت ئەو مـاڵە چۆنچۆنییە؟ ئاخر ئەو ســەرقاڵی گرتن و ڕازاندنەوەی ئەپارتمانەكەی خۆی بووە... ئـاه، هەڵســـوكەوتێكی چەنـدە چەپەڵانەی نوانـدبوو! هۆكارەكەی تەنیا سەرخۆشییەكەی بووە؟ پاكانەیەكی دەبەنگانەی لەم جۆرە زیاتر مایەی ئاوڕووچوون بوو! *مەگەر نالێن مەستی و ڕاستی؟* دەی لێرانەشــــدا حەقیقەت و ڕاســـتی دەركەوتبوو، یـانی *هەرچی چەپەڵكاری و پیسی لە دڵی ئیرەگەر و خراپیدا هەبوو، دەری خستبوو!* جا ســـەرەڕای ئەمانەش، ئایا ئەو، ڕازومیخین، هەر لە بنەڕەتدا مافی ئەوەی هەبوو كە وەها خەون و خەیاڵێك بڕێســـێت؟ بۆ ئەو لەچاو وەها كچێكدا، چی بوو بێ لە ســەرخۆشـێكی نەڕەنەڕكەر و قسـەزل؟ *باشە ئەو پێكچوونە گاڵتەجاڕانە و توقێنەرە ڕێی تێدەچێ؟* ڕازومیخین تەنـانەت بە وێنـاكردنی ئەم بـابەتە ســـوور هەڵگەڕا و كتوپڕ یادەوەرییەكی ڕوون هێرشـی هێنایە سـەر زەینی كە چۆن دوێشـەو لە پلیكانەڕێكەدا بە ئـافرەتەكانی گوتبوو خـاوەنمـاڵ لەبەر ئەو لە دونیـا خـانەگومـان دەبێت... ئیـدی بەرگەی ئەمەیـانی نەدەگرت و بۆكزێكی هێندە تونـدی بە كوانووەكەدا كێشـــا كە دەســـتی برینـدار بوو و خشتێكیش لە جێگەكەی خۆی ترازا.

كە خولەكێك تێپەڕی، شـــەرمەزار لە خۆی، لەژێر لێوەوە گوتی: *هەڵبەتە... هەڵبەتە ئەم حەیاچوون و شـووڕەییەی كە بەسـەر خۆممدا هێنا تاهەتا دەمێنێتەوە و پاك ناكرێتەوە، لانیكەم ناشـــكرێ ماڵەیەكی بەسەردا بێنی!... تەنانەت بیرلێكردنەوەشی بێهوودەیە. ئیتر كە چوومە لایان تەنیا دەبێ وســـكت بم و... ئەركەكەم جێبەجێ بكەم... جا لە*

*بێدەنگییەکی تەواو و... بەبێ هیچ داوای لێبوردن و تەنانەت نقەشم لێوە نەیێت... چونکە ئیدی کار لە کار ترازەوە و براوەتەوە!*

ویڕای هەموو ئەمانەش، ئەو کاتەی کە خەریکی خۆگۆڕین بوو، زیاد لە کاتە ئاسایییەکان دەستی بە خۆیدا دەهێنا. جلوبەرگی دیکەی نەبوو و هەڵبەتە ئەگەر هەشیبا، بۆی هەبوو لە بەری نەکا. *تەنانەت دەستەنقەستیش بێ جلەکانم ناگۆڕم.* بەڵام هەر چۆنێک بووە نەدەکرا ئیدی ئەوەندە نەرێنی بێت و شپرێو و پیسوپۆخڵ: ئەو مافەی نەبوو هەستی ئەوانی دیکە پامال بکا، جا بەتایبەت لەو کاتەشدا کە ئەوانی دی پێویستییان بە یارمەتیی ئەو بوو و داوایان لێ کردبوو بچێتە دیداریان. بە ماهووت جلوبەرگەکەی پاکوخاوێن کرد. کراسەکەشی هەمیشە ڕووی ئاوەدانیی هەبوو و، لەم ڕووەوە، بە خوای پاکوخاوێنی دەهاتە ئەژمار.

ئەو بەیانییە بە واسواسییەکی زۆرەوە دەست و دەموچاوی شۆرد، تەنانەت سابوونێکی لە ناستاسیا وەرگرت و قژ و سەر و مل و بەتایبەت دەستەکانیی چاک چاکێک شۆردن. پاشان هاتە سەرەی بڕیارێکی دیکە کە ئایا ڕیشی بتاشێ یان نا (پاشا خاتوون گوێزانی چاکی هەبوون کە لە مێردە خوالێخۆشبووەکەی، جەنابی زارنیتسینەوە جێ مابوون)، وەلێ بە تووڕەییەوە وەڵامێکی نەرێنیی ئەم پرسیارەی دایەوە: *لێگەڕێ چۆنە با هەر وا بێ! نەکا وا تێبگەن کە مەبەستێکم هەیە و بۆیە ڕیشمم تاشیوە تا... ئەی چۆن، هەر وای بۆ دەچن! خۆ من بە هیچ شێوەیەک ئامادە نیم... لە هەمووشی خراپتر، ئەوە پیسی و چەپەڵیی منە کە پەلکێشی نێو مەیخانەکانی سەررێگەم دەکا... تەنانەت گریمان کەمێکیش ڕێکوپێک بووم... دەی، بۆ مەگەر ئەوە شانازییە کە کەسێکی ڕێکوپێک بێ؟ هەر کەسێ دەبێ بۆ خۆی کەسێکی ڕێکوپێک بێ و تەنانەت زۆر لەوە پاکوخاوێنتریش... لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا چاک بیرمە کە پێشتر چیم کردووە... نەک بڵێی ئاوڕوومم ژێرپێ*

*خستبێ، نا، وەڵێ دەی، هەندێ شتم کردووە کە تەنیا!... ئاە لەو بیر و خەیاڵانەی کە سەردەمانێک سەریان تێ کردبووم! ئممم... جا ئێستە وەرە وەها مرۆڤێک بەم هەموو بەزمانەوە بخەرە پاڵ کەسێکی وەک دونیاوە! ئای تف لە من! هەر ئەوەم کە هەم! ئەسڵەن لێگەڕێ دەسئەنقەست با هەر وا بم، هەر ئەم خوێڕییە چەپەڵە لات و ئارەقخۆرە، گوێی مەدەرێ کاکە! تەنانەت لەوەش خراپتر دەبێ!...*

لەگەڵ خۆیدا سەرقاڵی ئەم جۆرە گفتوگۆیە بوو کە زۆسیمۆف هات. دکتۆر بەپێی ڕێککەوتنەکە شەوی لە ماڵی پاشا خاتوون بەسەر بردوو و ئێستەش خەریک بوو دەچووەوە ماڵێ و پەلەی بوو بەر لە ڕۆیشتن سەرێک لە نەخۆشەکە بدات. ڕازومیخین ڕایگەیاند کە ئێستە نەخۆشەکە پرخەی خەوی دێ و زۆسیمۆفیش ڕایسپارد هەڵی نەستێنن و بەڵێنی دا نزیکەی کاتژمێر دە و یازدە سەرێک بدات. پاشانیش ئەوەی بۆ زیاد کرد:

– هەڵبەتە گەر تەشریفیان لە ماڵەوە بێ! نەفرەت لە شەیتان! ئاخر دکتۆر گەر نەتوانێ نەخۆشەکەی لەسەر جێگەکەی بهێڵێتەوە، ئەی چۆن دەتوانێ چارەسەری بکا؟ ئێستە نازانی کە بڕیارە کاکی پایەبەرز بچێ بۆ لای ئەوان یان ئەوان دێنە دیداری؟

ڕازومیخین تێگەیشت مەبەستی لە ئەوان کێیە:

– لام وایە بڕیارە ئەوان بێنە لای و بێگومان دەیانەوێ قسە لەسەر بابەتی تایبەتی و خێزانییان بکەن ئیدی. من ملم دەشکێنم. تۆ لەبەر ئەوەی دکتۆری ئەوی، زیاتر لە من مافت هەیە لێرە بمێنیتەوە.

– جا منیش باوکی ڕۆحانی نیم! دێم، بەس نامێنمەوە و دەچم بەدەم کارەکانمەوە؛ بێ لە بەدەمەوەبوونی ئەم خێزانە کار و دەردیسەریی زۆری دیکەم هەیە!

ڕازومیخین ناوچاوی بە یەکدا دا و قسەی زۆسیمۆفی بڕی:

– شـــتێک هەر وەک مۆرانە کەوتووەتە گیان و خراپ ئازارم دەدا. دێشـەو کە لەگەڵ ڕاسکۆڵنیکۆف خەریک بووین دەگەڕاینەوە ماڵێ، بە سـەرخۆشـی دونیایەک قسـەی بێسـەروبەرم تێدا کرد... ئاسـمان و ڕێسـمانم پێکەوە دەدووری... ئەوەشـم گوت کە تۆ دەترسـای ئەو... لە شێتبوونەوە نزیک بێ...

– ئاخر تۆ هەر واشت بە خاتوونەکان گوت.

– دەزانم کـارەکەم گەمژانە بووە! دڵـت ئـاو دەخواتەوە، وەرە بسـرەوێنە بە بناگوێمدا! وەلێ هەر بە ڕاسـتی وای بۆ دەچووی ئەقڵی لەدەست بدا؟

– قسەی قۆڕ بوو کاکە گیان، وا خۆم پێت دەڵێم! چۆن دەکرێ هەر بە ڕاستی وا بیر بکەمەوە؟ تۆ، کاتێ خۆت هاتیتە دوام تا بچینە ژوور سەری، گوتت ئەم کەسە تووشی بیرپەرتی بووە... ئەوە دوێنێش زاتر بـاســـی ئەم بـابەتەمـان گەرم کرد؛ لە ســـــایەی تووە بوو بەو حەکایەتانەتەوە... لەبارەی بۆیەچیی بیناکەوە! چ قســەیەک هاتە ناوەوە و وا بزانم هەر لەبەر ئەو مەســـەلانەش بوو کە ڕۆدیا تێک چوو! گەر هەر لە سـەرەتاوە بمزانیبا ئەو کاتەی لە بەڕێبەرایەتیی پۆلیسدا بووە، چی ڕووی داوە و لەوێ ناپیاوێک سووکایەتیی پێ کردووە و گومانی لێ کردووە، زۆر جیـاواز دەبووا... ئمممم... ئەرێ، گەر بمزانیبـا، بڕوا ناکەم بمهێشـتبا دوێنێ ئەو باسـانە بێنە ناوەوە! مرۆڤە واسـواسـەکان لەبەرخۆیانەوە مێشێک دەکەنە گایەک و وەهم و خەیاڵەکانی خۆیانیان لێ دەبێتە حەقیقەتی سەلمێنراو... هێندەی بیرم بێتەوە، ئەوە مەسەلەی زامیۆتۆف بوو کە لانیکەم نیوەی مەتەڵەکەی بۆ هەڵهێنـام و زەینم کرایەوە. جا ئەمە هەر هیچ نییە کاکە! ئاگاداری دۆســـییەی کابرایەکی چل ســـاڵە بووم کە ماخولیایی بوو و تەنیا و تەنیا لەوە پەســـت بووە کە کوڕێژگەیەکی هەشـــت ســـاڵە هەموو ئێوارەیەک لە کاتی شـــێودا گاڵتەی پێ کردووە و لاسـایی کردووەتەوە، لە گوێوە بۆ گوێ سـەری

بڕیوە! دەی، لێرەشدا ڕاسکۆڵنیکۆف بەو سیپاڵانەی بەرییەوە، پۆلیسی دەمهەراش، نەخۆشـــییەکی لێ پیســـکردوو و، بە کورتییەکەی، بەدگومـانیی ئەوان! پێکڕا بەر بوونەتە گیانی کەســـێکی مـاخولیـایی سـەلێشـێواو کە شـکۆ و حورمەتی نۆبەرەشـی شـکاوە! لە بنەڕەتەوە دەکرێ هەر ئەمەش هۆکاری نەخۆشـــییەکەی بووبێ! هەر ئەوەیە و مووش بە درزیدا ناچێ!... هەر بە ڕاسـت ئەم زامیۆتۆفەش کەسـێکی باشـە، وەلێ ئمممم... دوێنێ لە خۆڕا تەواوی ئەم بەسـەرهاتەی باس کردووە. ئەم کابرایەش کەسێکی تەواو چەنەبازە.

– بۆچی بەســـەرهاتەکەی بۆ کێ باس کردووە؟ هەر بۆ من و تۆ بووە خۆ، ها؟

– بۆ پارفێریش.

– دەی، با بۆ پارفێریشی باس کردبێ، ئەوە کەی گرنگە.

– تەماشـــا، تا بیرم نەچووە، تۆ قســـەت لای ئەم دایک و خوشـکە دەخوا یان نا؟ پێیان بڵێ ئەمڕۆ زیاتر وریای ئەو کوڕە بن...

ڕازومیخین بە قەڵسییەوە هاتە وەڵام:

– خۆیان دەسازێن.

– ئێستە ئەم کوڕە کێشەی چییە لەگەڵ لوژن؟ لوژن پیاوێکە پارەی هەیە و کچەش پێدەچێ دڵی پێوە بێ... لاشـــم وایە ئەمانە خۆیان لە لاتیدا دەژین؟ ها؟

ڕازومیخین توورە بوو و هاواری کرد:

– کاکە بەدوای چییەوەی تۆ؟ من چووزانم لە لاتیدا دەژین یان نا؟ خۆت لێیان بپرسە، لەوانەیە پێت بڵێن و سەری لێ دەر بکەی...

– هەر بە ڕاستی هەندێ جار زۆر گەمژەی! وا بزانم هێشتا سەرخۆشییەکەی دوێنێ کاریگەریی لەسەرت ماوە... دەی من وا ڕۆیشتم، ماڵئاوا، سوپاسی پاشا خاتوونیشت بکە لەبارەی دوێنێ شەوەوە. دەرگەیان لەسەر خۆیان داخست و بەیانییەکەشی لەپشت دەرگەوە بەیانیباشم لێ کردن، وەڵامیان نەدامەوە. هەڵبەتە لە حەوتی بەیانییەوە بێدار بوون و ڕاستەوخۆ سەماوەرەکەیان لە موبەقەوە بردە خزمەتیان... وەلێ ئەو شانازییەم پێ نەبرا کە ڕووی گوڵئاسایان ببینم...

ڕێک کاتژمێر نۆ بوو کە ڕازومیخین خۆی گەیاندە بینای باکالییڤ. خاتوونەکان کە تەنانەت لەپێش کاتژمێر حەوتیشەوە هایی بوون، نەسرەوتانە چاوەڕوانیی ئەویان دەکرد. ڕازومیخین بە بێتاقەتی و وەک شەوی تاریک چووە ژوور و بە ناڕەحەتییەوە نیمچەکڕنۆشێکی برد و هاوکات قین بەرۆکی گرت کە بۆچی کڕنۆشی بردووە. پولخێریا فڕکەی کردە لای، توند هەردوو دەستی گرت و تەنانەت هێندەی نەمابوو دەستی ماچ بکات. ڕازومیخین تەماشایەکی شەرمەزارانەی دونیای کرد، بەڵام ڕووخساری لووتبەرزانەی کچەکە لەو ساتەدا لەبری نیگای پڕ لە تانە و سووکایەتی، بە جۆرێک سەرڕێژ بوو لە نیشانەی پێزانین و هەستی هاوڕێیەتی و ڕێزێکی تەواو چاوەڕواننەکراو کە گەنجەکە ئەگەر جنێوبارانیشیان بکردبا بەو ڕادەیە شپرزە نەدەبوو و نەدەحەپەسا. خۆشبەختانە بابەتێکیان هەبوو بۆ ئەوەی قسەی لەسەر بکەن و ڕازومیخینیش دەستبەجێ و تامەزرۆیانە بە باسەکەوە نووسا.

پولخێریا کە بیستی هەموو شتێک باشە و ڕۆدیاش هەر وا خەوتوو، دڵخۆش بوو، چونکە گوتی خاڵێک هەیە بەر لە هەر شتێک، دەبێت قسەی لەسەر بکرێت. پاشان لە ڕازومیخینی پرسی بەرچایی خواردووە یان نا و داوەتیان کرد لەگەڵ ئەوان بیخوات، ئاخر

خاتوونەکان چاوەڕێ بوون ئەو بێت و پێکەوە بەرچایی بخۆن. دونیا زەنگی لێدا و شــــرپۆشــــێکی چلکن هاتە بەردەرگە و داوایان لێکرد بەرچـایـیـان بۆ بهێنێ. دواجـار چـای هـات، وەلێ هێنـدە نـاخۆش و نـاڕێکوپێـک خورایەوە کە خـاتوونەکـان تەریق بوونەوە. ڕازومیخین بەتەمـا بوو تونـد و هەڵچووانە بەو بینـایە و ژوورەکـانیدا بێتە خوار، بەڵام لوژنی بیر هاتەوە و شــــپرزە و شــــەرمەزار هەر وا دەمیی بە نووقاوی هێشتەوە و دەستڕێژی پرسیارەکانی پولخێریاش کە بێئامان بە سەریدا دەبارین، بە هانایەوە هات.

چلوپێنج خولەکێک بۆیان دوا و هەڵبەتە پرســــیارەکانیان بەردەوام قســــەکانی ئەویان دەپچڕاندن، وەلێ توانیی دۆخی ژیانی ئەم ســــاڵەی دوایی ڕاســــکۆڵنیکۆفیـان بۆ بـاس بکـات، جـا هەنگـاو بە هەنگـاوی نەخۆشــــییەکە و تەواوی وردەکارییەکانی بۆ شــــی کردنەوە. زۆربەی ئەو شــــتانەش کە وا چاک بوو نەگوترێن، لە باســــەکەدا ســــڕینییەوە؛ لەنێویـانـدا بـابەتی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس و ئـاقیبەتەکەی. ئەوانیش تـامەزرۆیـانە چـاویـان لە دەمی بڕیبوو و گوێیـان لێ دەگرت. دواجـار ڕازومیخین کە لای خۆیەوە هەموو بەســــەرهاتەکەی گێڕایەوە و وای بۆ چوو کە بیسەرەکانی قایل بوونە، سەیر دەکات بۆ ئەوان سەرەتای بەسەرهاتەکەیە و وا دەزانن ئەو تازە سەری قسەی کردووەتەوە!

پولخێریا بە دڵەڕاوکێوە گوتی:

– بڵێ بزانم، ئەی بۆچوونی خۆتان چییە کاکە... ببوورن، هێشـتا بە تەواوی ناوتان نازانم!

– دیمیتری پراکۆفیچ.

– بەڵێ، دیمیتری پراکۆفیچ، ئەو شــــتەی کە زۆر تامەزرۆم بیزانم، ئەوەیە کە ئێستە ڕای چۆنە... یانی بە گشتی ڕای لەسەر مەسەلەکان... چۆن ڕوونی بکەمەوە ئاخر! مەبەســتم ئەوەیە کە چ شــتانێ پەســەند

دەکا، چ شتانێکیش پەسەند ناکا؟ لەم دواییانەدا هەمیشە ئاوا زوو هەڵدەچوو؟ چ ئاواتێکی هەیە و چ خەونێکی لە سەردایە؟ خۆ دەتوانن ئەمانە بڵێن؟ ئێستاکە لەژێر کاریگەریی چ بیروباوەڕ و ڕێبازێکدایە؟ بە کورتییەکەی زۆر حەز دەکەم بیزانم...

دونیا ڕای دەربڕی:

– ئاه دایکی خۆم! چۆن بە یەک جار وەڵامی ئەم هەموو شتانە بداتەوە!

– دیمیتری پراکۆفیچ، خوا بێ بەهانامانەوە! ئەسڵەن چاوەڕێ نەبووم ڕۆدیا لە وەها بارودۆخێکدا ببینم!

– دەی ئەمە زۆر ئاساییە! من دایکم نییە بەس خاڵە گیانم کە ساڵی جارێ دێتە دیدەنیم، هەموو جار بە زۆر منی ناسیوەتەوە. تەنانەت بە ڕواڵەت و دەموچاویش، گەرچی کەسێکی بیرتیژیشە. ئێوە سێ ساڵە یەکتریتان نەدیوە، ماوەیەکی کەم نییە! نازانم چی بڵێم؟ ساڵ و نیوێک دەبێ کە ڕۆدیا دەناسم. دایمەی خوا گرژ و مۆن و لووتبەرز بووە و بە جۆرێ لە جۆرەکان دوورەپەرێز. لەم دواییانەدا (یان لەوانەشە زۆر دەمێک بێت) زۆر واسواس و ماخولیایی بووە. میهرەبان و دڵباشە، وەلێ بە هیچ جۆرێک حەز ناکات هەستەکانی دەربڕێت و تەنانەت ئامادەیە دڵڕەقی بنوێنێ، وەلێ ئەو شتە نیشان نادا، کە لە دڵیدایە. هەندێ جار تەنانەت ماخولیایی نییە، تەنیا بێڕادە ساردوسڕ و تا ئاستێکی نامرۆڤانە بێبەزەییە؛ وەک ئەوەی دوو کەسایەتیی لێکدژی هەبن و لەنێویاندا جۆلانێ بکا. هەندێ جاریش هێندە کەمدووە هەر نەبێتەوە! دەڵێی بە جۆرێک سەرقاڵ و گیرۆدەیە کە هەر شتێکی تر بە لەمپەر دەزانێ و لای وایە بەر بە کارەکەی دەگرێ، کەچی کە دێتە سەر کردە، بۆی ڕادەکشێ و هیچ ناکا. گاڵتە و قەشمەریاتیش لە مێشکی ئەودا نییە، نەک ئەوەی کە زیرەک یان ورد نەبێ، نا، تەنیا

وەک ئەوە وایە کە کاتی بۆ ئەم شـــتە بێبایەخانە نەبێت. ئەســـڵەن تا کۆتا گوێ لە قســـەی ئەوانی تر ناگرێ. تاقە جارێکیش ڕووی نەداوە شـــتێ کە بۆ ئەوانی تر گرنگە، بۆ ئەویش گرنگ بێ. خۆی زۆر بە بەرزتر دەزانێ و ڕەنگە لە هەنـدێ ڕووەوە هەقی خۆی بێ وا بیر بکاتەوە. ئێ، چیی تر؟ من لام وایە هاتنی ئێوە کاریگەرییەکی باشـــی لەسەر دادەنێ.

پولخێریا کە بە بیستنی قسەکانی ڕازومیخین لەبارەی ڕۆدیاکەیەوە زۆر حەپەسابوو، هاواری کرد:

– ئاخ خوا بکا وا بێ!

ڕازومیخین دواجـار جوامێریی بەدەســــت هێنـایەوە و بوێرانەتر تەماشـــای دونیای کرد. کاتی قســـەکردنەکەش جاروبار لێی دەڕوانی، بەڵام گەلێک کورت بوو و دەســـتبەجێ نیگای دەگواســـتەوە ســـەر شـــوێنێکی دی. دونیا بە هێمنی لەپشـــت مێزەوە دانیشـــتبوو و بە ســـەرنجەوە شـــوێن قســـەکانی ڕازومیخین کەوتبوو. تۆزێک دواتر هەســـتایەوە و دەســـتلەســـەرســـنگ و بە لێوی پێکگوشـــراوەوە، سەرلەنوێ بە ژوورەکەدا کەوتەوە پیاسە و جارناجارێکیش بێ ئەوەی بوەستێت پرسـیارێکی دەکرد. ئەویش هەمان خووی براکەی هەبوو و تا کۆتایی گوێی لە قسەی ئەوانی دیکە نەدەگرت. جلێکی تەنکی ڕەشی لە بەردا بوو و پەڕۆیەکی سپیی تۆڕیی لە ملی بەستبوو. ڕازومیخین فرە زوو بە کەلوپەل و جلوبەرگیاندا دەرکی بە هەژاریی لەڕادەبەدەری ژنەکان کرد. هەسـتی دەکرد گەر خاتوو دونیا وەک شـازادەکان جلی لە بەر کردبوویـا، ئـاوهـا ترســـنـاک نەدەبوو، بەس لەبەر ئەوەی جلوبەرگەکەی هەژارانە بوو و ڕازومیخین کوێرەوەری و دەستکورتیی لە چواردەوریدا دەبینی، ترس کەوتە گیانی و ئیدی بە دەربڕینی هەر وشـــەیەک و کردنی هەر جووڵەیەک هەڵدەلەرزی؛ ئەم هەلومەرجە بۆ

وەها کەسێک کە دەروونێکی دڕی ئەوتۆی نەبوو، بێڕادە ئازاربەخش بوو.

دونیا زەردەخەنەیەکی هاتێ و گوتی:

– ئێوە زۆر شتتان لەبارەی کەسایەتیی براکەمەوە گوت کە هەر بە ڕاستی زۆر جێی سەرنجە و... قسەکانیشتان بێلایەنانە بوون. ئەمە زۆر باشە، ئاخر لام وابوو تەنیا تاریفی دەدەن.

جا تێفکرانە لەسەری ڕۆیشت:

– لام وایە ڕاست دەکەن کە دەڵێن پێویستە لە ژیانیدا ژنێک هەبێ.

– هەڵبەتە من وەها قسەیەکم نەکرد، بەس ڕەنگە ئێوە ڕاست بکەن؛ تەنیا ئەوەندە هەیە کە...

– تەنیا چی؟

ڕازومیخین لە وەڵامدا زۆر یەکلاکەرەوانە ڕایگەیاند:

– ئاخر ڕۆدیا دڵی بە کەسەوە نییە و ڕەنگە لە داهاتووشدا عاشق نەبێ.

– یانی دەڵێن توانای خۆشویستنی نییە؟

– دونیا خاتوون، دەزانن، ئێوە بە شێوەیەکی زۆر سەیر لە براکەتان دەچن و هەموو شتێکتان وەک یەک وایە!

ئەمە کتوپڕ لە دەمی ڕازومیخین پەڕی و خۆشی سەری سوڕما، وەلێ هاوکات بیری هاتەوە کە دوو خولەکێک لەوەوبەر چ قسەگەلێکی لەبارەی کاکی برایەوە کردبوو و لەناکاو وەک قرژاڵ سوور هەڵگەڕا و شپرزە بوو. دونیاش کە لێی دەڕوانی، نەیدەتوانی بەر بە پێکەنینی خۆی بگرێت.

وا دیار بوو پولخێریا دڵگران بووبوو و گوتی:

– لەوانەیە هەردووکتان لەبارەی ڕۆدیاوە بە هەڵەدا چووبن. باس باســـی کێشـــەی ئێســـتەمان نییە، دونیا. ڕەنگە ئەوەی کە لوژن لە نامەکەدا نووســیویەتی بە تێگەیشــتنی من و تۆشــەوە هەڵە بێ، وەلێ تەنـانەت نـاتوانن ئەوە وێنـا بکەن، دیمیتری پراکۆفیچ، کە ئەم کوڕە دایمەی خوا چەندە دەمدەمی[1] بووە! کە تەمەنی پازدە ســـاڵان بوو بە هیچ شـــێوەیەک نەمدەتوانی لە هەڵســـوکەوت و بیکردنەوەی تێبگەم. ئێستەش دەزانم بۆی هەیە کارێکی لێ بوەشێتەوە کە ئەوانی تر شتی وایان هەر بە زەینیشـــدا نەیێ... دەی، نموونەکەشـــی مەســـەلەی زەماوەندکردنی بوو لەگەڵ کچی ئەم خاوەنماڵە، خاتوو زارنیتســـینا! ســـاڵ و نیوێک لەمەوبەر بوو کە بیری زەمـاوەنـدکردن لەگەڵ ئەو کچەی کەوتە ســـەر و بە جۆرێکیش منی ترســـاند و حەپەســـاندمی کە هەر بە ڕاستی خەریک بوو گیانم بکێشێ...

دونیا لە ڕازومیخینی پرسی:

– ئێوە کتومت شتێک لەم بارەیەوە دەزانن؟

پولخێریا بە گوڕوتینەوە درێژەی پێ دا:

– ئێســـتە ئێوە... یانی لاتان وایە فرمێســـک و ناڵە و پاڕانەوە و ناخۆشـــیی من و ئەوەی کە لەوانەیە تەنانەت لە خەفەتان مەراق بکەم، دەیتوانی بەری پێ بگرێ؟ ئەســـڵەن بەوپەڕی بێبـاکییەوە گوێی لە هەموو ئەم شـــتانە دەخەواند. بەس یانی ڕێی تێدەچێ، ڕێی تێدەچێ ئێمەی خۆش نەوێ؟

ڕازومیخین بە پارێزەوە هاتە وەڵام:

---

[1]. دەمدەمی: مەزاجی؛ بێباری.

– ئەوەی ڕاستی بێ لەو بارەیەوە یەک وشەشی بە من نەگوتووە، بەس من لە دەمی خاتوو زارنیتسیناوە بیستم، گەرچی لە جۆری کەسە دەمشڕ و چەنەبازەکان نییە ئەم ژنە. وەلێ ئەو شتەش کە بیستم زۆر سەیر بوو...

ژنەکان پێکەوە دەمودەست پرسییان:

– چیتان بیستووە؟

– ئێ شتێکی هێندە تایبەت نەبوو. هەر ئەوەندە تێگەیشتم کە خودی پاشا خاتوونیش بەو هاوسەرگیرییە قایل نەبووە، کە مەرگی کچەکەی بەری بە سەرگرتنی گرت. دەڵێن کچێکی جوان نەبووە، یانی پێیان گوتم بگرە ناشیرینیش بووە و... تەنانەت کەمئەندام و... بە جۆرێ لە جۆرەکان سەیروسەمەرە بووە. وەلێ بێگومان لایەنی ئەرێنیشی تێدا بووە، ئاخر هەر دەبێ شتگەلێکی ئەرێنیشی تێدا بووبن، گەرنا پاڵنەرێک هەیە کە... ئاخر ئەو کچە پاشتێلانەشی نەبووە، گەرچی ڕۆدیاش کەسێ نییە چاوی لە پاشتێلانە و ئەم جۆرە شتانە بێ... بە گشتی لەم جۆرە مەسەلانەدا داوەریکردن کارێکی زۆر دژوارە.

دونیا وەڵامێکی کورتی دایەوە:

– من دڵنیام کچێکی شایستە بووە.

پولخێریا باسەکەی کۆ کردەوە:

– خوا بمبوورێ کە تەنانەت بە مردنیشی دڵخۆش بووم! گەرچی خۆیشم نازانم کامیان ئەوی تریانی چارەڕەش دەکرد، ڕۆدیا کچەکە یان کچە ڕۆدیا...

پاشان دوودڵ و بە پارێزەوە دەستیان کردە پرسیاربارانکردنی ڕازومیخین لەبارەی دیدارەکەی لوژن و زوو زووش لەژێر چاوەوە سەیری دونیای دەکرد و دیار بوو کچە لە هاتنەناوەوەی ئەم باسە

ناڕازییە. پێدەچوو مەسەلەی ئەم دیدەنییە زیاتر لە بابەتەکانی دیکە پولخێریا ئازار بدات و تەنانەت دەشیخستە دڵەڕاوکێوە. ڕازومیخین سەرلەنوێ و بەوپەڕی وردەکارییەوە دیدارەکەی بۆ باس کردنەوە، بەڵام ئەم جارەیان بۆچوونەکانی خۆیشیی بۆ زیاد کرد و زۆر ڕاشکاوانە ڕاسکۆڵنیکۆفی بەبۆنەی سووکایەتیکردنی دەستەنقەست بە لوژن سەرکۆنە کرد و نەیویست ئەم جارەشیان بە بیانووی نەخۆشییەوە، پاکانە بۆ هەڵسوکەوتی هاوڕێکەی بکات. لە کۆتاییشدا بۆی زیاد کرد:

– هەڵبەتە بەر لە نەخۆشکەوتنەکەشی بۆچوونی هەر وا بوو!

– منیش هەر وا دەڵێم.

پولخێریا بێهیوا و زویر قسەکانی ڕازومیخینی پەسەند کردن، وەلێ لە لایەکەوە ئێجگار لەوە سەراسیمە بوو کە ئەو بۆچی هێندە بە پارێزەوە باسی ئەو دیدارە دەکات و تەنانەت واش دیارە دەیەوێت ڕێزێک بۆ لوژن دابنێ؛ ئەمە سەرنجی دونیاشی ڕاکێشابوو.

پولخێریا خۆی پێ ڕانەگیرا و پرسیی:

– یانی بۆچوونتان لەبارەی لوژنەوە بەم جۆرەیە؟

ڕازومیخین لێبڕاو و بەگوڕ وەڵامی دایەوە:

– ئاخر من لەبارەی مێردی داهاتووی خانمخاسی کچتانەوە دەبێ چ بۆچوونێکی ترم هەبێ؟ تەنیا لەبەر دابونەریت و ڕێزی ڕووالەتیش نییە کە ئەمە دەڵێم، چونکە... چونکە... بەڵگەکەی گەلێک سادەیە: دونیا خاتوون بە ویست و ڕەزامەندیی خۆیان داوای ئەم پیاوەیان پەسەند کردووە. گەر دوێنێ شەویش خراپەی ئەم پیاوەم گوت و بێڕێزیم پێ کرد، تەنیا لەبەر ئەو سەرخۆشییە نەفرەتییە بوو و هیچی تر... دەی، من کەللەپووچم ئیتر؛ ئەرێ، کەللەپووچم، ئەقڵ لە سەرمدا نییە، بە

تەواوی شێت بووبووم... جا هەر لە سەرلەبەیانی ئەمڕۆشەوە من لەم بارەیەوە شەرمەزارم!

ڕازومیخین تا بناگوێ سوور هەڵگەڕا و بێدەنگ بوو. ڕووخساری دونیا سوورایی تێ گەڕا، وەلێ بێدەنگیی نەشکاند؛ لەو کاتەوەی قسە هاتبووە سەر لوژن، یەک وشەشی نەگوتبوو.

پولخێریا وا دیار بوو بەبێ پشتیوانیی کچەکەی نەیدەزانی دەبێت چی بکات. دواجار بەدەم تەتەڵەکردن و لەبارێکدا کە هەر سەیری کچەکەی دەکرد، دانی پێدا نا کە بابەتێکی تایبەت بێتاقەتی کردووە و بەم جۆرە سەری قسەی کردەوە:

– دەزانن، دیمیتری پراکۆفیچ... دونیا گیان، دەمەوێ لەگەڵ دیمیتری پراکۆفیچدا ڕاشکاو بم، خۆ کێشە نییە؟

دونیا لێبڕاوانە وەڵامی دایەوە:

– بێگومان کێشە نییە، دایە گیان.

پولخێریا دەستبەجێ بەدوای قسەکەیدا بێئامان دەستی پێ کرد؛ دەتگوت ئێستە کە دەرفەتی باسکردنی کێشەکانیان پێ داوە، وەک ئەوە وایە بارێکی گریانیان بە کۆڵییەوە داگرتبێ:

– مەسەلەکە ئەوەیە کە سەرلەبەیانی یادداشتێکمان لە پیۆتەر پیترۆڤیچ لوژنەوە پێ گەیشتووە کە وەڵامی پەیامێک بوو ئێمە بۆمان ناردبوو تا هەواڵی گەیشتنمان بگەیەنین. بەڵێنی دابوو بێتە وێستگە بەدەممانەوە، وەلێ لەبەرانبەردا خزمەتکارێکی نارد تا ناونیشانی ئەم ماڵەمان بداتێ و ڕێگەکەشمان نیشان بدا؛ پەیامێکیشی نارد کە خۆشی ئەمڕۆ بەیانی دێتە ئێرە، وەلێ لەجێی ئەوە ئەم بەیانییە ئەم یادداشتەمان بەدەست گەیشتووە... باشتر وایە خۆتان بیخوێننەوە. ئاماژەیەکی تایبەتی تێدایە کە زۆر بێتاقەتم دەکا... خۆتان ئێستە

تێدەگەن مەبەستم چ ئامـاژەیەکە... جا ڕاستگۆیـانە بۆچوونی ڕاستەقینەی خۆتان بڵێن، دیمیتری پراکۆفیچ! ئێوە باشتر لە هەر کەسێکی تر کەسایەتی و سرووشتی ڕۆدیا دەناسن و تەنیا ئێوە دەتوانن ڕێک ڕێنوێنیمان بکەن. ئاگادار بن کە دونیا خێرا بڕیاری خۆی دا، بەس من هێشتا دوودڵم کە ئاخۆ چی بکەم و چ کاردانەوەیەکم هەبێ... بە کورتییەکەی چاوەڕوانی هاتنی ئێوە بووم.

ڕازومیخین یادداشتە دەقکراوەکەی کردەوە، بەروارەکەی هی دوێنێ‌عەسر بوو:

خاتوونی ڕێزدار پولخێریا ئالێکساندراڤنای هێژا، بە حورمەتەوە پێتان ڕادەگەیەنم لەبەر ئەوەی کۆمەڵێک کێشەی چاوەڕوانینەکراو هاتنە پێش، نەمتوانی لە وێستگەدا بگەمە خزمەتتان و بتانبینم، بەڵام کەسێکی حورمەتدارم نارد تا کارە پێویستەکان جێبەجێ بکات. هەروەها، لەبەر ئەوەی لە ئەنجوومەنی پیراندا[1] کارێکم هەیە کە ناکرێ دوای بخەم و لەلایەکیشەوە نامەوێ لە کاتی دیداری ئێوە و کوڕەکەتان و دونیای ئازیز لەگەڵ براکەیدا بگرم، کۆبوونەوەی خێزانیی بەڕێزتان تێک بدەم، سبەینێش شانازیی دیداری ئێوەم پێ نابڕێ. سبەی شەو کاتژمێر هەشت بۆ دیداری ئێوە و نواندنی ڕێز و حورمەت دەگەمە خزمەتتان و هەر لێرەدا گەر ڕووداری نەبێ پێداگرانە داوا دەکەم با کوڕە هێژاکەتان، جەنابی ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، لەو دیدارەدا ئامادە نەبێ. ڕۆژی ڕابردوو لە کاتی سەردانکردنی ئەوان لە پێخەفی نەخۆشیدا، هەڵسوکەوتێکی هێندە شەڕەنگێزانە و دزێویان لەگەڵدا نواندم کە بەرکەوتنی لەو جۆرە لەگەڵ مندا پێشینەی نەبووە. هەروەها، بەندە ڕوونکردنەوەیەکی تێروتەسەلم لەبارەی بابەتێکەوە لە ئێوە دەوێ و حەز دەکەم بۆچوونی خودی بەڕێزتان بزانم. بەوپەڕی ڕێزەوە پێتان

---

١. ئەنجوومەنی پیران: یەکێک لە دوو شوێنی یاسادانانی هەندێک وڵاتان.

ڕادەگەیەنم کە ئەگەر سـەرەڕای داوای بەندە، لەوێ چاوم بە پایەبەرزی کوڕتان بکەوێ، ناچار دەبم دەمودەست جێی بهێڵم و بەرپرسیاریەتییەکەشی دەکەوێتە ئەستۆی ئێوە و نابێ من بە خەتابار لە قەڵەم بدرێم. لام وایە پایەبەرزەکەتان، ڕۆدیۆن رامانۆڤیچ، کە بە ڕواڵەت لە کاتی دیدارەکەماندا ئێجگار نەخۆش دیار بوو، کەچی لە ماوەی دووکاتژمێردا کتوپڕ چاک بووەتەوە و توانیویەتی لە ماڵ دەربچێ، لەوانەیە سـەرێکیش لە ئێوە بدات. من بۆیە ئەمەتان پێ ڕادەگەیەنم، چونکە بە چاوی خۆم ئەوانم لە ماڵی سـەرخۆشـێکدا بینین کە گالیسـکە کردبووی بە ژێرەوە و مرد. پایەبەرز بە بیانووی ئامادەکاریی ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردن بیستوپێنج ڕۆبڵی دایە کچی بەدناوی ئەم پیاوە سـەرخۆشـە، کە من زۆر بەمە سـەرسـام بووم، ئاخر دەزانم ئێوە بە چ ڕەنجێک ئەو برە پـارەیەتـان کۆ کردووەتەوە. لێرانەدا، بە هەلی دەزانم ئەوپەڕی سۆز و خۆشەویستیی خۆم بۆ کچەخاسەی بەڕێزتان، دونیا خـاتوون، ڕابگەیەنم و خوازیـارم ئەم هەموو وەفـادارییە ڕاستگۆیانەیەم پەسەند بکەن.

خزمەتکاری خاکەڕاتان

پیۆتەر لوژن

پولخێریا خەریک بوو بداتە پرمەی گیان:

– ئێسـتە چارمان چییە، دیمیتری پراکۆفیچ؟ چۆن بە ڕۆدیا بڵێم نەیێ؟ دوێنێ لەسـەر ئەوە سـوور بوو کە داوای هاوسـەرگیرییەکەی لوژن ڕەد بکەینەوە و ئێستەش لەملاوە داوا کراوە ڕۆدیا ئامادە نەبێ! گەر بزانێ، دەسـئەنقەسـتیش بێ هەر خۆی دەگەیەنێ و... پاشـان چ بەڵایەکمان بەسەر دێ؟

ڕازومیخین کاتی بەفیڕۆ نەدا و دەستبەجێ هێمنانە وەڵامی دایەوە:

– ئەوە بکەن کە دونیا خاتوون بڕیاری لەسەر دەدا!

– ئۆو، خوایە! دونیا دەڵێ... خوا دەزانێ چی دەڵێ، خۆ بە ڕێکی مەبەستی خۆی ناگەیەنێ! دەڵێ چاکترین کار ئەوەیە، یانی گەر باشترین کاریش نەبێ، هیچ نەبێ پێویستە ڕۆدیا کاتژمێر هەشت لێرە بێ و لوژن و ئەو یەکتری ببینن. وەلێ بەرنامەی من ئەمە بوو کە نامەکە نیشانی ڕۆدیا نەدەم و دەمویست داوای یارمەتی لە ئێوە بکەم کە بە جۆرێک لە جۆرەکان بەر بە هاتنی بگرین... چونکە زۆر توورەیە... جیا لەمەش، ناتوانم ڕێک تێبگەم مەسەلەی ئەو کابرا سەرخۆشە مردووە و کچەکەی کە لوژن بەم جۆرە باسی دەکا، چی بووە و ڕۆدیا چۆن توانیویەتی هەموو پارەکەمان بخاتە دەستی ئەو کچەوە... پارەیەک کە...

دونیا هاتە ناو باسەکەوە:

– پارەیەک کە بە دونیایە کوێرەوەری پەیات کردووە.

ڕازومیخین تێفکرانە گوتی:

– دوێنێ حاڵی باش نەبوو. ئاخ ئەگەر دەتانزانی دوێنێ کە چووەتە ڕێستۆرانت، چ قسەیەکی کردووە! گەرچی قسەکانیشی ئاقڵانە بوونە... ئمممم! ئەرێ، دوێنێ ئێوارە کە پێکەوە دەچووینەوە ماڵێ، ورەوڕێکی لەبارەی پیاوێکی مردوو و کچەکەیەوە کرد، وەلێ من خۆ لە یەک وشەشی تێنەگەیشتم. هەڵبەتە دوێشەو منیش...

– دایە گیان باشترین کار ئەوەیە خۆمان بچینە لای و دڵنیا بە کە گەیشتینە ئەوێ، یەکسەر تێدەگەین دەبێ چی بکەین. جا هێشتا ئەوەندە درەنگیش نەبووە. خوایە! خۆ دەش لای داوە!

دونیا هاوارێکی لێ هەستا و تەماشایەکی کاتژمێرە ئاڵتوونییە میناکاریکراو و شازەکەی کرد کە بە زنجیرێکی ڤینیسیایی[1] جوان کردبوویە ملی و هیچ لەگەڵ جلوبەرگ و سەروسیمای سادەیدا نەدەگونجا. ڕازومیخین لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *دیاریی دەزگیرانەکەیەتی!*

پولخێریا هەراسان بە چواردەوری خۆیدا دەسووڕایەوە:

– ئاخ، ئەرێ، دەبێ بکەوینە ڕێ! هەر ئێستە دەبێ بکەوینە ڕێ، دونیا گیان! ئێستە وا دەزانێ لەبەر ئەوە نەچووینەتە لای کە بەبۆنەی دوێنێوە لێی تووڕەین، ئەی وای، خوایە!

پولخێریا بەدەم کردنی ئەم قسانەوە، خەریکی پۆشینی کۆڵوانەکەشی بوو و کڵاوەکەی لە سەری دەکرد. دونیاش لەم ماوەیەدا خۆی ئامادە کرد. ڕازومیخین بینیی دەستکێشی کچەکە، وێڕای کۆنەیی، کونیشی تێ بووە، بەڵام ئەوە سەرنجڕاکێش بوو کە ئەو کەمدەستییە شکۆیەکی تایبەتیی بەو ئافرەتانە دەبەخشی، شکۆیەک کە هەمیشە لە بوونی ئەوانەدا بەدی دەکرێ کە دەزانن جلی هەژارانەش بە ڕێکوپێکی لە بەر بکەن. ڕازومیخین لە دونیای دەڕوانی و هەستی بە شانازی دەکرد کە بڕیارە یاوەریی بکات. لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *ئەو شازادە خاتوونەی کە لە زینداندا گوێرەوییەکەی دەدوورییەوە، بەو دۆخەشەوە، لە کاتی میوانییە شکۆدارەکاندا زیاتر لە شاژنەکان دەچوو.*

پولخێریا ترسا و سەراسیمە گوتی:

---

١. ڤینیسیا: یەکێکە لە شارە گەشتیارییەکانی ئیتاڵیا کە ساڵانە ملیۆنان گەشتیار ڕووی تێ دەکەن. وا دیارە ئەم شارە هەر لە دێرزەمانەوە لە بواری دروستکردنی کریستاڵ، زنجیر، کاتژمێر و ئەم جۆرە کەرەستانەی ڕازاندنەوەدا بەناوبانگ بووە. «و. ک»

– خوایە، هەر بە خەیاڵیشمدا نەدەهات ترسم لە بینینی کوڕی خۆم هەبێ، بینینی ڕۆدیا گیانم، ڕۆدیای ئازیزم!

پاشان شەرمنانە سەیرێکی ڕازومیخینی کرد و درێژەی پێ دا:

– خراپ ترسم لێ نیشتووە، دمیتری پراکۆفیچ.

دونیا دایکیی ماچ کرد:

– ئەوەندە مەترسە، دایە گیان. تۆ دەبێ بڕوات بە ڕۆدیا هەبێ، من بڕوام پێی هەیە.

ژنەی بێناز گوتی:

– ئاخ، خوایە گیان! باوەڕم پێی هەیە، وەلێ دوێشەو خەو نەچووە چاوم.

هاتنە سەر شەقامەکە.

– دەزانی، دونیا گیان، کە دەمەوبەیان وەنەوز بردمیەوە، خەونم بە مارفا پیترۆڤناوە بینی... سەراپا سپیی پۆشیبوو... هاتە لام، دەستمی گرت و سەری بادا، بەس زۆر جددی سەری با دەدا وەک ئەوەی سەرکۆنەم بکا. تۆ بڵێی مانای چی بێ؟ خێرە؟ ئاخ، خوایە گیان! ئاخر خۆ ئێوە بێئاگان، دمیتری پراکۆفیچ، مارفا پیترۆڤنا مردووە!

– نا، ئاگادار نیم. باشە کامە مارفا پیترۆڤنا؟

– کتوپڕ کەوت و مرد. بیری لێ بکەنەوە...

دونیا قسەی پێ بڕی:

– لێی گەڕێن بۆ دوایی، دایە گیان. دیمیتری پراکۆفیچ، لە کوێ مارفا پیترۆڤنا دەناسێ ئاخر؟

– ئاخ، ئێوە نایناســـن نا؟ وام زانی ئێوە ئیتر ســەروبنی ژیانی من دەزانن. داوای لێبوردن دەکەم، دیمیتری پراکۆفیچ، ئەم چەنـد ڕۆژە خۆشـم نازانم بیر و خەیاڵم بە چییەوە سـەرقاڵە. من وای دەبینم کە خوا ئێوەی بۆ ئێمە نـاردووە و وا دیـارە بڕوام بەوە کردووە کە لە ژیانی ئێمەدا شـــتێ نییە ئێوە نەیزانن. حســـێبی خۆمـانەیەکتـان بۆ دەکەم... بەبۆنەی ئەم قسـانەوە لێم نەڕەنجێن. وای، خوایە گیان! ئەوە دەستتان چیی لێ هاتووە؟ بریندار بووە؟

ڕازومیخین فرە دڵخۆش ورتاندی:

– ئەرێ، بریندار بووە.

– من هەندێ جار زۆر هەسـتیار دەبم و قسـەی دڵم دەکەم و دونیا ســـێخورمەم تێـدەچەقێنێ کە بیبڕەوە... وەلێ، خوایە گیـان، لە چ کولانەیەکدا دەژی ئەم کوڕە! نازانم هایی بووەتەوە یان نا ئەم کوڕە؟ نەکا ئەم خاتوونە، خاوەنماڵەکەی ڕۆدیا، ئەم کولانەیەشـــی هەر بە ژوور حســـێب کردبێ؟ گوێ بگرن، ئێوە گوتتـان ڕۆدیـا حەز نـاکا هەســـتەکانی دەرببڕێت، دەی نەکا خاڵە لاوازەکانی من زیاتر بیخەنە ســـەر باری لاســـاری؟... پێم ناڵێن دەبێ چۆن هەڵســـوکەوتی لەگەڵدا بکەم، دیمیتری پراکۆفیچ؟ چی بکەم لەگەڵ ئەم کوڕەدا؟ دەزانن، خراپ سەرم لێ شێواوە!

– هەر کە بینیتـان خەریکە نـاوچـاو گرژ دەکـا، لە گەرمەی هەر باسـێکیشـدا بێ ئیتر دەسـت هەڵگرن و پرسـیارانی مەکەن؛ زۆریش لەبارەی تەندروستییەوە سەرشاخی مەگرن، پێی ناخۆشە.

– ئـاە، دیمیتری پراکۆفیچ، گەر بزانن دایکبوون چەنـدە ســـەختە! فەرموون ئەوەش پلیکانەکەی... وای لەو پلیکانەیە، بە زیاد نەبێ!

– دایە گیـان، خراپ ڕەنگتـان پەڕیوە، ئەوەنـدە دڵپەرۆش مەبن، ئازیزەکەم.

دونیا دایکیی لاواندەوە و لە بارێکدا کە چاوی دەبریقایەوە، درێژەی پێ دا:

– ڕۆدیا لە خۆشـــیان دەبێ شـــاگەشـــکە ببێ کە ئێوە دەبینێ، جا ئێوەش خەریکن زۆر خۆتان ئەشکەنجە دەدەن.

– بوەستن با من سەرێک بدەم و بزانم هەڵساوە یان نا.

خاتوونەکان بە شـــێنەیی لەپشـــت ڕازوومیخینەوە کە پێشـــیان کەوتبوو، ســـــەر کەوتن؛ کە گەیشـــتنە نهۆمی چوارەم و ئەپارتمانی خاوەنماڵ، ســـەیر دەکەن دەرگەکە هێندەی پلەپەنجەیەک کراوەتەوە و جووتە چاوێکی ڕەش لە ناوجەرگەی تاریکییەوە چاودێرییان دەکات. بەڵام هەر کە نیگایان گیرایە یەکدی، دەرگەی ماڵەکە هێندە توند پێوە درا کە پولخێریا خەریک بوو لە حەژمەتان قیژەی لێ هەستێ.

## سێ

ڕازومیخین و ژنەکان کە چوونە ژووری، زۆسیمۆف بە دڵخۆشییەوە هاواری کرد:

– حاڵی باشە، باشی باش!

زۆسیمۆف دە خولەک پێشتر گەیشتبوو و لە شوێنەکەی دوێنێی، لە سووچێکی قەنەفەکەوە پاڵی دابووەوە. ڕاسکۆڵنیکۆفیش جلی پۆشیبوو، بە دەموچاوی شۆردراو و قژی شانەکراوەوە ڕووبەڕووی دانیشتبوو. دەمێک بوو هیچ کەسێک ڕاسکۆڵنیکۆفی بەم پاکوخاوێنی و ڕازاوەییە نەدیتبوو. بە هاتنی ئەو سێ کەسە، ئیدی ژوورەکە شوێنی هەناسەدانی تێدا نەما، بەڵام ناستاسیا هەرچۆنێک بوو توانیی بەدوایاندا بێتە ژوور و لە سووچێکدا شوێنی خۆی بکاتەوە و ببیستێت چ باسە.

هەر بە ڕاستیش دۆخی ڕاسکۆڵنیکۆف لەچاو دوێنێدا تا ڕادەیەک باش بوو. هەڵبەتە هێشتا ڕەنگپەڕیو و شپرزە و مۆن بوو. ڕوواڵەتی لە هی کەسێکی بریندار دەچوو یان کەسێک کە ئازارێکی کاریی[1] جەستەیی تێپەڕاندبێت. بە چاوانێکی تادارەوە، چرچی خستبووە تەوێڵییەوە و لێوەکانیی پێک دەگوشین. زۆر کەم قسەی دەکرد و ئەویش بە بێزارییەوە، وەک ئەوەی تەنیا بیەوێت ئەرکێک ڕاپەڕێنێت. هەندێک جاریش شپرزەییەکی تایبەت لە جووڵەکانیدا بەدی دەکرا.

---

١. کاری: بەسوێ؛ سەخت.

هەر ئەوەندە بەس بوو کە باســکی بە ملییەوە شــۆڕ بکاتەوە یان پەنجەی لە بەندێک گیر بکات تا دیمەنی پیاوێک کە پەنجەی دمەڵێکی لێ ڕوواوە یان دەستی شکاوە یان نەخۆشییەکی لەم جۆرەی هەیە، کامڵ ببێت.

کە دایک و خوشــکی هاتنە ژووری، بۆ ســاتێک ڕووخســاری ڕەنگپەڕیو و خەمگینی گەشــایەوە، وەلێ هاوکاتیش بووە هۆی ئەوەی دڵســاردی و بێزارییەکەی بگۆڕێت بۆ بــاری ئازارێکی قووڵ. ئەو گەشــییەی کە بە ڕووخســارییەوە دەرکەوتبوو، زوو ڕەوییەوە، بەڵام باری ئازارەکەی هەر وا مایەوە. زۆســیمۆف بە پەرۆشــیی ئاگرینی پزیشــکێکی گەنجەوە کە تازە هەنگاوی ناوەتە مەیدانی پزیشــکییەوە، چاودێریی نەخۆشــەکەی دەکرد، وەلێ نەیتوانی هیچ نیشــانەیەکی شــادمانیی ســەرچاوەرگرتوو لە هاتنی دایک و خوشــکەکە لە ڕاسکۆڵنیکۆفدا پەیدا بکات، تەنیا ویستێکی شــاراوە و تاڵی تێدا بوو تا بتوانێت هەرچۆنێک بووە یەک دوو کاتژمێرێک بەرگەی ئەو ئەشکەنجە بێچەندوچۆنە بگرێت. زۆســیمۆف پاشــان بینیی کە یەک بە یەکی ئەو وشــانەی لە کاتی گوتوبێژەکەیاندا ئاڵوگۆڕ دەکرێن، بە جۆرێک لە جۆرەکان نەخۆشــەکە ئازار دەدەن، بەس هاوکات شــتێکی دیکەش ســەرسامی کرد: ئەو نەخۆشــەی کە ڕۆژی ڕابردوو هەڵسوکەوتێکی دەروونزانانەی هەبوو و لەگەڵ هەر قسەیەکی ئاساییدا هەڵدەچوو، وا ئێســتە خەریکە بە ویســتێکی بەرچاوەوە خۆی جڵەو دەکات و باری هەڵچوونەکانی دەشارێتەوە.

– بەڵێ، خۆشم هەست دەکەم ئیتر چاک بوومەتەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف وەک پێشوازیکردن دایک و خوشکیی ماچ کردن و پولخێریا هەمان کات شــاگەشــکە بوو. ڕاســکۆڵنیکۆف وەرســووڕا و دۆستانە دەستی ڕازومیخینی گوشی و درێژەی پێ دا:

– هەر بە ڕاستی  باشم و وا مەزانن ئەمە لەبەر قسەکانی دوێنێیە!

زۆســـیمۆف بە هاتنی خاتوونەکان زۆر شـــادمان بوو، چونکە بە درێژایی ئەو دە خولەکە تەنیـایيە نەیتوانیبوو پەیوەنـدییەکی جێگیر لەگەڵ نەخۆشەکەیدا دابمەزرێنێ:

– بەڵێ، بە ڕاستی وایە! ئەمڕۆ منی تەواو سەرسام کردووە! وەلێ گەر وا بەرەو پێش بچێ، ســـێ چوار ڕۆژی تر ڕێک وەک جارانی لێ دێتەوە، یانی وەک مانگێک یان دوو مانگی ڕابردوو... لەوانەشــە ســێ مانگ لەمەوبەر! دەمێکە حاڵی وایە... ها؟ ئادەی دانی پێدا بنێ، دەی خەتای خۆشتی تێدا بووە، وایە؟

زۆسیمۆف بە بزەیەکی دوودڵانەوە پرسیارەکەی کرد، وەک ئەوەی هێشتا لە سیخورمەتێژەنین و تووڕەکردنی نەخۆشەکەی سڵ بکاتەوە:

– هیچ دوور نییە.

زۆسیمۆف بە تامەزۆرییەوە درێژەی پێ دا:

– دەبێ ئەوەش ڕابگەیەنم کە چـاکبوونەوەی تەواوەتی تەنیـا لەدەست خۆتدایە. ئێسـتە کە لانیکەم دەکرێ دوو قسـەت لەگەڵ بکەم، حەز دەکەم ئاماژەی پێ بدەم کە لە نانی ئێوارە پێویسـتترە خۆت لەو هۆکارە سـەرەکی و، وەک دەڵێن، بنەڕەتیانە بەدوور بگریت کە دەشـێ دووبارە تووشی ئەو دۆخەت بکەنەوە. گەر خۆتیان لێ بەدوور بگری، چاک دەبیتەوە، گەرنا تووشی دۆخێکی خراپتر لە هی ئێستەش دەبیت. من نـازانم دەکرێـت ئەم هۆکـارانە چی بن، وەلێ خۆت دەبێ چـاک بزانیت. تۆ کەسێکی وریایت و ئاشکرایە تا ئێستە خۆت تێگەیشتوویت. لام وایە یەکەمین قۆنـاغی شـــپرزەیی زەینیت هـاوکات بووە لەگەڵ وازهێنان لە زانکۆت. نابێ بێکار دابنیشـیت و بۆچوونی من ئەمەیە کە

هەبوونی ئیشـــێک و ئامانجێکی دیاریکراو لە داهاتووتدا، زۆر لە بەرژەوەندیتدا دەشکێتەوە.

– بەڵێ، بەڵێ! خۆم کۆ دەکەمەوە و دەگەڕێمەوە زانکۆ، پاشـــانیش هەموو شتێ... باش و وەک خۆی لێ دێتەوە...

زۆســیمۆف کە ســپاردەکانی زیاتر بۆ ئەوە بوون کاریگەری بخاتە ســـەر خاتوونەکان، بە جۆرێک لە جۆرەکان مت بوو، تا ســـەیرێکی نەخۆشـــەکەیی کرد و نیشـــانەگەلی گاڵتەجاڕییەکی نکۆڵیلێنەکراوی لە ڕووخســـاریدا بینی. پولخێریا دەســـتی کردە دەربڕینی پێزانین و ســوپاس بۆ زۆســیمۆف. بەتایبەت لەبەر ســـەردانەکەی دوێشـــەو و گەیاندنی هەواڵی کوڕەکەی.

ڕاســکۆڵنیکۆف دەتگوت بە بیســـتنی ئەم قســـانە ڕاچەنیوە، چونکە حەپەساوانە پرسیی:

– چی؟ دوێشەو سەری لێ داون؟ یانی دوای ئەو سەفەرە دوور و درێژەتان هێشتا خەوێکی باشتان نەکردووە؟

– ئاخ، ڕۆدیا! هەموو ئەمانە تەنیا تا کاتژمێر دوو درێژەیان کێشـــا. من و دونیا گەر لە ماڵەوەش بین هەر پێش دوو ناخەوین.

ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ ناوچاوی بە یەکدا دا و سەری دانەواند:

– منیش تیاماوم کە چۆن ســـوپاســـی بکەم. ئەوە پارەکەشـــی لە لایەک! ببوورن کە باســـی دەکەم (ڕووی کردە زۆســـیمۆف)، وەلێ خۆشـــم نازانم چیم کردووە کە تۆ ئاوها گرنگیم پێ دەدەی! هیچ ســـەری لێ دەرناکەم... جا... جا ئەم گرنگییپێدانە تەنانەت وەک بارێک وایە بە کۆڵمەوە، چونکە ناتوانم دەرک بە هۆکارەکەی بکەم. تەماشـــا، ڕاشکاوانە قسەت لەگەڵ دەکەم!

زۆسیمۆف بە زۆر پێکەنی:

– نیگەران مەبە! ئەسڵەن وای دانێ تۆ یەکەمین نەخۆشی منیت. ئاخر، ئێمەی پزیشکە تازەکارەکان، عاشقانە یەکەمین نەخۆشەکانمان خۆش دەوێن و وەک ڕۆڵەی خۆمان لێیان دەڕوانین! ئەسڵەن هەندێکیان عاشقی یەکەمین نەخۆشەکانیان دەبن! جا ئێستەش نەخۆشەکانی من بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن.

ڕاسکۆلنیکۆف ئاماژەی بە ڕازومیخین کرد و درێژەی پێ دا:

– لەبارەی ڕازومیخینیشەوە هەرچی بڵێین کەمە، لە هاوڕێیەتیکردنی مندا بێ لە ئەرک و گێچەڵ هیچی تری بە نسیب نەبووە.

ڕازومیخین هاواری کرد:

– ئەی هاوار، ئەمە بۆ قسەی بێسەروبەر دەکا! ئەرێ تۆ ئەمڕۆ کتوپڕ زۆر هەستیار بووی، ها؟

ڕازومیخین گەر زیرەکییەکی زیاتری بەکار بهێنابا، دەیبینی کە سەرەدەرزییەک *هەستیاری* لە بوونی ڕاسکۆلنیکۆفدا نییە و، بە پێچەوانەوە، ئاسەواری هەستێک هەیە بە چۆنییەتییەکی پێچەوانەوە. دونیا کە خەریک بوو ناڕەحەت و بە سەرنجەوە تەماشای براکەیی دەکرد، چاک لە خاڵی ئاماژەپێکراو تێگەیشتبوو.

ڕاسکۆلنیکۆف وەک ئەوەی وانەیەکی لەبەر کردبێ، ئەم جارەیان ڕووی کردە دایکی:

– دایە گیان، لەبارەی تۆوە چی بڵێم؟ زمانم گۆ ناکا! ئەمڕۆ توانیم تا ڕادەیەک تێبگەم دوێنێ لێرە لە چاوەڕوانیی گەڕانەوەی مندا چیتان کێشاوە و چەندە نیگەران بوونە.

کە ئەمەی گوت، کتوپڕ دەستی بەرەو خوشکەکەی درێژ کرد و بێ ئەوەی شتێک بڵێت، بزەیەکی کرد. لەو بزەیەدا، بریقەی هەستێکی ڕاستەقینەش بەر چاو دەکەوت. دونیاش هەمان سات هەستی ورووژا

و له بارێکدا که سـوپاسـگوزار بوو و له شـادیان جێی به خۆی نه‌ده‌گرت، به گه‌رمی ده‌سـتی براکه‌یی گوشـی. دوای ده‌مه‌قاڵێکه‌ی دوێنێیان ئه‌وه یه‌که‌مین جار بوو که براکه‌ی ڕاسـته‌خۆ ڕووی تێ ده‌کرد. ڕووخساری دایکیان به بینینی دیمه‌نی ئاشتبوونه‌وه‌ی بێقسه به‌ڵام بێچه‌ندوچۆنی خوشک و براکه، له خۆشی و شادیدا گه‌شایه‌وه.

ڕازومیخین وه‌ک هه‌میشـه له زێده‌ڕۆییدا درێغیی نه‌کرد، له‌سـه‌ر کورسییه‌که‌ی شوێنگۆڕکێی کرد و هێواش گوتی:

– هه‌ر له‌به‌ر ئه‌م کارانه‌یه‌تی که خۆشـم ده‌وێ! هه‌میشـه ئه‌م هه‌ڵچوونانه‌ی هه‌یه!

دایکه‌که‌ش له‌به‌رخۆیه‌وه بیری ده‌کرده‌وه: *ئه‌م کارانه هه‌ر له خۆی دێن! هه‌ڵسوکه‌وتی چه‌نده نه‌جیبانه‌یه و ته‌ماشـای چه‌نه‌ده سـاده و به ڕێکوپێکی هه‌ڵه‌تێگه‌یشـتنه‌که‌ی دوێنێی نێوان خۆی و خوشـکه‌که‌یی چاره کرد. ته‌نیـا ده‌سـتی بۆ درێژ کرد و جوان لێی ڕوانی... جا چاوه‌کانیشـی چه‌نده جوانن و ئه‌سـڵه‌ن هه‌موو ڕووخسـاری جوانه!... زۆر تایبه‌ته و بگره له سه‌رووی دونیاشه‌وه! وه‌لێ ئاخر، خوایه گیان، ئه‌م جلوبه‌رگ و سـیما تۆقێنه‌ره چییه که هه‌یه‌تی!... ڕاوه‌سـته، په‌یکی دوکانی ئاخرۆشـین، جا خۆ جلوبه‌رگێکی جوانتریشـی هه‌یه!... ئاخر وه‌خته سـوێنم بێته‌وه بۆ له‌باوه‌شـگرتنی و... له باوه‌شـیدا بگریم، به‌س ده‌ترسـێم، ده‌ترسـێم... وای، خوایه! ئه‌م کوڕه جۆرێکه! زۆریش نه‌رمونیان ده‌دوێ، که‌چی من هه‌ر لێی ده‌ترسـێم! باشـه بۆچی لێی ده‌ترسێم؟!...*

کتوپڕ ده‌نگی هه‌ڵبڕی تا په‌له‌په‌ل وه‌ڵامی ڕاسکۆڵنیکۆف بداته‌وه:

– ئاخ، ڕۆدیا بڕوا ناکه‌ی من و دونیا چه‌نده خه‌مبار بووین دوێنێ! هه‌ڵبه‌ته ده‌بێ بڵێم که ئێسـته هه‌موو شـتێ به خێر گه‌ڕاوه، هه‌موومان زۆر دڵخۆشـین. تۆ بیری لێ بکه‌وه، که له شـه‌مه‌نده‌فه‌ر دابه‌زیین

یەکسەر رامانکردە ئێرە تا باوەش بە تۆدا بکەین و ئەو ژنە... ئەها، خۆ لێرەیە! ڕۆژت باش، ناستاسیا!... ناستاسیا هەر کە گەیشتین گوتی تۆ لەتاو لەرز و تا کەوتبوویە جێگە، وەلێ بەدەم ورێنەوە لە دکتۆرەکەت هەڵهاتووی و ئێستەش لە شەقامەکاندا بەدواتەوەن! دەتوانی لە حاڵمان تێبگەی؟ منیش کتوپڕ ئاخیر و ئاقیبەتی تۆقێنەری ڕاگر *پاتانچیکۆف*م بیر کەتبووەوە کە لە ناسیاوەکانی باوکت بوو. تۆ ئەوت بیر نەماوە، ڕۆدیا. ڕاگریش تاکەی لێی پیس کردبوو و جا وەک تۆ دەچێتە دەر و سەراوسەر دەکەوێتە بیری ناو حەوشەکەوە... هەتا بەیانییەکەی نەیانتوانی دەری بهێننەوە. هەڵبەتە ئێمەش زیاد لە ڕادە گەورەمان دەکرد و خەریک بوو بچینە دوای پیۆتەر پیترۆڤیچ و داوای یارمەتیی لێ بکەین... ئاخر بێکەس و تەنیا مابووینەوە.

شێوازی قسەکردنی پولخێریا سکالاَئامێز بووبوو، وەلێ کتوپڕ نقەی لێ بڕا و بیری هاتەوە کە *گەرچی ئێستە ئیتر هەموو شتێ بە خێر گەڕاوە و هەموومان زۆر دڵخۆشین*، بەس هێشتا هێنانی ناوی پیۆتەر پیترۆڤیچ لوژن مەترسیدارە.

– بەڵێ، بەڵێ... بێگومان مرۆڤ ئازار دەچێژێ...

ڕاسکۆلنیکۆف بە ورتەورت وەڵامی دایکیی دایەوە، بەڵام هێندە زەینپەرت و بێئاگا بوو لە چواردەوری کە دونیا بەدیارییەوە واقووڕ بووبوو.

ڕاسکۆلنیکۆف هەوڵی دا ماوەی قسەکانی بیر بهێنێتەوە:

– دەمویست چیی تر بڵێم؟ ئەها، بەڵێ. دایە گیان و هەروەها تۆیش دونیا گیان، نەکا لاتان وابێ من ئەمڕۆ نیازم نەبووە بێمە دیدارتان و چاوەڕێ بوومە سەرەتا ئێوە بێنە لام!

پولخێریاش ئەم جارەیان دۆش داما و هاواری لێ هەستا:

– ئەوە چی دەڵێی، ڕۆدیا!

دونیا دەیزانی چۆن بیر بکاتەوە: *یانی خەریکە وەک ئەرکێک وەڵامی ئێمە دەداتەوە؟ هەم ئاشتبوونەوە و هەم داوای لێبووردنەکەشی جۆرێکە، دەڵێی لە ڕێوڕەسمی دوعاکردندایە یان بیەوێ وانە بڵێتەوە.*

ڕاسکۆڵنیکۆف درێژەی دایێ:

– بەر لە هاتنی ئێوە بە ئاگا هاتم و دەمویست بێمە دیدەنیتان، بەس چاوەڕێی جلەکانم بووم. دوێنێ بیرم چوو پێی بڵێم... بە ناستاسیا.. کە خوێنەکە بشوا، هەر لەبەر ئەوەش ئێستە توانیم خۆم بگۆڕم.

پولخێریا تۆقی:

– خوێن؟ چ خوێنێ؟

– هیچ نییە... نیگەران مەبە. دوێنێ کە بە شەقامدا دەسووڕامەوە و بێگومان وڕێنەشم دەکرد، بە هەڵکەوت تووشی پیاوێکی زامدار بووم... کابرا فەرمانبەر بوو...

ڕازومیخین قسەکەی بڕی:

– وڕێنەت دەکرد؟ خۆ تۆ ورد و درشتی بەسەرهاتەکەت لە بیرە!

ڕاسکۆڵنیکۆف زۆر بەپارێزەوە هاتە وەڵام:

– ئەرێ، هەموو شتێکم لە بیرە، بە بچووکترین وردەکارییەوە. بەس گەر بمەوێ بە باشی ڕوونی بکەمەوە بۆچی فڵانە کارم کردووە و ڕۆیشتووم بۆ فڵانە شوێن و فڵانە قسەم کرد... ناتوانم.

زۆسیمۆف هاتە ناو باسەکەوە:

– ئەسڵەن ئەوە شتێکی سەیر نییە. فڵانە کردەوەی ئەو کەسە دەکرێ زۆریش شارەزایانە و بێکەموکوڕی ئەنجام بدرێ، وەلێ

دۆخی زاڵبوونی کەس بەســـەر کردەوەکانیدا و هەروەها بنەڕەتی کارەکانی ڕوون نییە و وابەستەی بیرگەلی نەخۆشانەی جۆراوجۆرە؛ بە جۆرێک لە جۆرەکان وەک خەوگەڕی وایە.

ڕاسـکۆڵنیکۆف لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *لەوانەیە خراپیش نەبێ ئەمە وا بزانێ من تا ڕادەیەک تووشی شێتی بوومە!*

دونیا نیگایەکی پڕ لە شپرزەیی گرتە زۆسیمۆف:

– خۆ کەســانێ هەن کە ســاغوســەلیمن و ئەم کارانەشــیان لێ دەوەشێنەوە!

زۆسیمۆف وەڵامی دایەوە:

– تا ڕادەیەک فەرمایشــتەکەتان ڕاســتە. گەر لەو ڕووەوە لە مەسەلەکە بڕوانین، ئەوە زۆر ڕوو دەدا کە یەک بە یەکی ئێمە بارگەلی شــێتانە بنوێنین، وەلێ جیاوازییەکی وردیش هەیە... نەخۆشــێک کە تووشی شێتی دەبێ، تا ڕادەیەک شێتانەتر هەڵسوکەوت دەکا؛ کەواتە دەبێت ســنوورێک هەبێ. دەکرێ بڵێین مرۆڤی ئاســایی و ســاغ بە تەواوی مانا بوونی نییە! لەنێوان دەیان یان لەوانەشە سەدان کەسدا ڕێی تێنەچێ کەسێکی ساغ و ئاسایی دەسچن بکەی.

زۆســیمۆف کاتێک خەریک بوو لەبارەی بابەتە دڵخوازەکەیەوە دەیڕێسا، زۆر تێپەڕانە شتێکی لەسەر *ئەو نەخۆشانەی کە تووشی شێتی دەبن* پێدا کرد و ئەوانی دی بە بیســتنی ناوچاویان ترش کرد. بەڵام ڕاســکۆڵنیکۆف بە زەردەخەنەیەکی ســەیری ســەر لێوە ڕەنگپەڕیوەکانییەوە، بە جۆرێک نغرۆ لە بیرکردنەوەدا دانیشتبوو وەک ئەوەی لە مەبەســتەکە تێنەگەیشــتبێت. بە ڕواڵەت هێشــتا زەینی بە بابەتێکی دیکەوە قاڵ بوو.

ڕازومیخین حەپەسا و هاواری کرد:

– ئێ، باسـت دەکرد! خەریک بووی باسی ئەو پیاوە بریندارەت دەکرد کە قسەم پێ بڕیی!

ڕاسکۆلنیکۆف دەتگوت لە خەو ڕاچڵەکی:

– چی؟ ئەرێ... یارمەتیم دان بێنەوە ماڵێ و جلوبەرگەکەم خوێناوی بوو. جا دایە گیان، دوێنێش کارێکم کردووە کە ڕەنگە شیاوی لێخۆشبوون نەبێ! هەر بە ڕاستی ئەقڵم لەدەست دابوو. ئەو پارەیە فەوتا کە بۆت ناردبووم، جا هەر هەمووشی... دامە ژنی ئەو کابرایە بۆ ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردن و ئەم جۆرە شتانە. ژنەکەی ئێستە ئیتر بێوەژن کەوتووە، سیلیشی هەیە. سێ منداڵی وردەڵەشی هەن کە خەریکە لە برسان تیا دەچن... لەو ماڵەدا کەس تیکە نانێکی وشکیشی دەست ناکەوێ... جا کچێکی گەورەتریشی هەیە... گەر خۆشت لەوێ بوویای و بتدیتبا، بۆی هەبوو پارەکەیان پێشکەش بکەی. وەلێ قەبووڵمە، من وەها مافێکم نەبوو، بەتایبەت لەبەر ئەوەی دەزانم کە ئەو پارەت بە چ کوێرەوەرییەک دەست کەوتبوو! بۆ یارمەتیدانیش سەرەتا دەبێ مافی ئەو کارەت هەبێ، گەرنا...

پاشانیش بە فەڕنسی بۆی زیاد کرد:

–Crevez, Chiens, si vous netes has contents[1]

جا ڕوو لە دونیا پێکەنی و گوتی:

– وا نییە، دونیا؟

دونیا توند وەڵامی دایەوە:

– نا، وا نییە.

ڕاسکۆلنیکۆف لەژێر لێوەوە بۆڵاندی:

---

[1] ئێستە کە ڕازی نین، گیانتان دەرچێ، سەگینە!

– ئەی هاوار! خۆ تۆش لە کەسە چاکەکارەکانیت.

کەم تـا زۆر بە ڕقەوە لە خوشـــکەکەیی ڕوانی و بزەیەکی گاڵتەجاڕانەشی کرد:

– دەبوو گریمانەی ئەوە بکەم؟... باشە، شایەنی بەرزنرخاندنە و بۆ تۆش وا باشـــترە... ئەو ڕۆژە دێ کە... دەگەیتە ســـنوورێ کە ئەگەر لەپشـــتییەوە بمێنی، هەســـت بە چارەڕەشـــی دەکەی و ئەگەریش لێی تێپەڕی، لەوانەیە چارەڕەشـــتریش ببی... بەس ئەمە هەمووی قســـەی بەلاشە!

دواهەمین ڕستەی بە توورەییەوە بۆ زیاد کرد، چونکە لەوە دەیری بووبوو کە بۆچی جڵەوی ویستیی لەدەست داوە. وشک و بە کورتی و زۆر کتوپڕانە باسەکەی کۆ کردەوە:

– تەنیا دەمویست داوای لێبوردنتان لێ بکەم، دایە گیان.

دایکەکە بە شادمانییەوە وەڵامی دایەوە:

– بیبڕەوە، ڕۆدیا. هەر کارێ تۆ بە باشی بزانی و بکەی، باشە.

ڕاسکۆڵنیکۆف بە شێوەیەکی بزەئاسا دەمیی داپچڕاند:

– بەس ئەوەندەش دڵنیا مەبن.

بێدەنگی باڵی کێشا. بارێکی دەستکرد لە گوتوبێژ و ئاشتی و داوای لێبوردن و تەنانەت ئەم بێدەنگییەی دواییش هەبوو کە یەک بە یەکیان دەیانتوانی هەستی پێ بکەن.

ڕاســـکۆڵنیکۆف بە تیلەی چاو لە دایک و خوشـــکەکەی دەڕوانی و لەبەرخۆوە بیری کردەوە، *هەمووان لێم دەترسن!*

هەر بە ڕاســـتیش پولخێریا تا بێدەنگییەکە زیاتر درێژەی دەکێشـــا، زیاد و زیادتر دەترسا.

شـتێکی وەک برووسـکە بە زەینی ڕاسـکۆڵنیکۆفدا ڕابرد: *کە لێم دوور بوون، چەندە خۆشم دەویستن!*

پولخێریا کتوپڕ لە دەمی دەرچوو:

– مارفا پیترۆڤناش مرد، ڕۆدیا.

– کامە مارفا پیترۆڤنا؟

– خوایە گیان، دەی مارفا پترۆڤنا، ژنی سـڤیدریگایلۆڤ، لە نامەکەشدا باسم کردبوو بۆت!

ڕاسـکۆڵنیکۆف وەک ئەوە وا بوو لە خەو ڕاچڵەکێت و خرۆشـاوانە گوتی:

– ئەهـاااا! ئەری، بیرمە... یانی مردووە! بە ڕاسـت؟ بۆ چیی لێ قەوما؟

کونجکۆڵیی کوڕەکە، پولخێریـای هـان دا و پەلەپەل لەسـەری ڕۆیشت:

– تۆ بیری لێ بکەوە! زۆر کتوپڕانە، ڕێک هەمان ئەو ڕۆژەی کە خەریک بووم ئەو نامەیەم بۆ دەنووسـیی! ڕەنگە بڕوا نەکەی، بەس هەمان ئەو پیاوە خوێڕییە ترسـناکە بووەتە هۆی مردنی، دەڵێن خراپ لێی داوە!

ڕاسکۆڵنیکۆف لە خوشکەکەیی پرسی:

– یانی ژیانیان وا بووە؟

– نا، هەرگیز. سڤیدریگایلۆڤ دایمە لەگەڵ ژنەکەیدا زۆر پشوودرێژ بوو و زۆریش دڵی ڕادەگرت. لە حەوت ساڵ ژیانی هاوبەشیاندا، زۆر جار و تەنانەت زیاد لە ڕادە لەگەڵ ژنەکەیدا سـازاوە؛ بەس دەڵێی کتوپڕ حەوسەڵەی بەسەر چووە.

– دەی گەر کابرا حەوت ســـاڵ توانیویەتی بەر بە خۆی بگرێ، کەواتە مرۆڤێکی هێندە تۆقێنەر نییە؟ هەر بە ڕاستی وا بیر دەکەنەوە؟ تۆش بێگومان لایەنگریی دەکەی، دونیا، ها؟

– نا، نا! بێگومان کە ترسناکە، لەم کابرایە ترسناکتر ناناسم!

دونیا لەرز کەوتە گیانی، ناوچاوی تێک نا و فکر و خەیاڵ بردییەوە.

پولخێریا بە پەلە درێژەی پێ دا:

– بەیانییەکەی لێی داوە، پاشـــان مارفا پیترۆڤنا فەرمان دەدا ئەسپەکان ببەستن بە گالیسکەکانەوە تا دوای خواردنی فراوێن بچن بۆ شـار. خووی بوو لەو کاتانەدا بچێتە شـار... دەڵێن بە ئیشـتهایەکی زۆریشەوە فراوێنەکەیی خواردووە...

– دوای لێدانەکە؟

– ... ئێ ئەوە خووی بوو... هەر کە فراوێنەکەیی خواردووە، بۆ ئەوەی دوا نەکەوێ، چووە خۆی بشـــوا. ئـاخر وەک چارەســـەر ڕایانسپاردبوو خۆی بشـوا. لە موڵکەکەیاندا کانییەکی ساردی لێیە کە خـاتوون هەموو ڕۆژێ لە ئـاوەکەیـدا خۆی شـــۆردووە، وەلێ ئەم جارەیان هەر کە پێی ناوەتە ئاوەکەوە، دەمودەست جەڵدە لێی داوە!

زۆسیمۆف گوتی:

– هەر دەبوو جەڵدە لێی بدا!

– خراپ لێی دابوو مێردەکەی؟

دونیا هاتە نێو باسەکەوە:

– جا ئیتر ئەوە کەی گرنگە!

ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ و پێدەچوو بەبێ ویست، هەڵچووانە بە ڕووی دایکیدا هەڵشاخا:

– ئممم! دایە گیان، نازانم تۆ تاقەتی باسکردنی ئەم جۆرە شتانەت لە کوێ بوو.

پولخێریاش لە دەمی دەرپەڕی:

– ئاخ، ئازیزی دڵم! ئاخر نەمدەزانی دەبێ باسی چی بکەم!

ڕاسکۆڵنیکۆف هەمدیسان بەدەم ژارخەندێکەوە دەمی داپچڕی:

– چییە، هەر دەڵێی لێم دەترسن هەمووتان؟

دونیا نیگای جددی و تیژیی لە براکەی بڕی:

– بەڵێ، مەسەلە ئەوەیە. دایە گیان کاتی سەرکەوتن بە پلیکانەکاندا، لە ترسان خاچی دەکێشا!

ڕووخساری ڕاسکڵنیکۆڤ –وەک بڵێیت لەبەر کرژبوون– لاروێر بوو.

پولخێریا سەرسووڕماو تەماشای کرد:

– پەنا بە خوا، دونیا! ڕۆدیا گیان، لە دڵی نەگری... باشە ئێستە پێویست بوو ئەوە بڵێی، دونیا؟ مەسەلە ئەمە بوو، دونیا: بەدەم ڕێگەوە بەرەو ئێرە، بە درێژایی ڕێگەکە لە شەمەندەفەردا، دیدارەکەمانم وێنا دەکرد و ئەوەی کە چۆن لەبارەی هەموو شتێکەوە قسە دەکەین... ئەسڵەن ئەوەندە دڵخۆش بووم کە هەر نەمزانی سەفەرەکە چۆن تێپەڕی! وەلێ ئەوە چی دەڵێم لەبەرخۆمەوە؟ ئێستەش زۆر زۆر شادمانم! دونیا، تۆش لە خۆڕا ئەم جۆرە قسانە مەکە!... هەر ئەم بینینەت دونیایەک دڵخۆشی کردووم، ڕۆدیا گیانم...

ڕاسکۆڵنیکۆف تەماشای دایکیی نەکرد، بەڵام دەستیی گوشی و وڕ و ون ورتاندی:

– با بەسی بێ، دایە گیان! ئێستە دەرفەت هەیە ئیتر بە ئاسوودەیی قسەکانمان بکەین.

هەر کە ئەم ڕستەی بە دەمدا هات، کتوپڕ پەشێوی بوونیی تەنییەوە و ڕەنگ بە ڕووخسارییەوە نەما. هەمدیسان ئەو هەستە تۆقێنەرە سەیرە کە لەم دواییانەدا دیلی دەکرد، لەگەڵ سەرمایەکی مەرگاویدا چنگی بە ڕۆحیدا کرد و دیسان بۆی ڕوون بووەوە کە ئەم جارەشیان درۆیەکی تۆقێنەری کردووە. تێگەیشت کە نەک هەر بە تەنیا دەرفەتی بۆ قسەکردنێکی سەربەستانە نییە، تەنانەت لەمەوودواش ئیدی ناتوانێت ببێتە هاودەمی هیچ بەنیئادەم. وەها شپرزەییەک لەگەڵ ئەم بیرکردنەوەیەدا بەرۆکی گرت کە دەتگوت بۆ خولەکێک خۆی بیر چووەتەوە، هەستایەوە و بێ ئەوەی تەنانەت نیوەسەرنجێکیش لەوانی دیکە بدات، بەرەو دەرگەکە کەوتە ڕێ. ڕازومیخین چنگی ڕاوەشاند و باسکی گرت و هاواری کرد:

– ئەوە خێرە؟

ڕاسکۆڵنیکۆف هەمدیسان دانیشتەوە و بێدەنگانە سەیری چواردەوریی کرد. هەمووان، بە حەپەساوی لێی ڕامابوون. کتوپڕ هاواری گەیشتە ئاسمان و هەمووان ڕاچەنین:

– باشە ئێوە چ گلاراویکتانە؟ خۆ یەک قسەش ناکەن! خۆ ناتوانین هەر وا بۆی دانیشین! دەی، یەڵا قسە بکەن! بێنە گۆ... باشە ئێستە کە لە دەوری یەکتری کۆ بووینەتەوە، بۆچی بێدەنگی... یەڵا، شتێ بڵێن دەی!

پولخێریا خاچی کێشا:

– خوایە شوکرت! ترسام هەمان بەزمی دوێنێ بقەومێتەوە و حاڵی تێک بچێ هەمدیسان.

دونیا بە زەردەخەنەیەکی بێمتمانەوە پرسیی:

– چی قەوماوە، ڕۆدیا؟

ڕاسکۆڵنیکۆف وەڵامی دایەوە:

– هیچ، هەر وا! شتێکم بیر هاتەوە.

جا کتوپڕ کەوتە پێکەنین.

زۆسیمۆف هەستایەوە و لەژێر لێوەوە گوتی:

– باشـــە، گەر شـــتێکت بیر هاتووەتەوە ئەوە هیچ، گەر نا خەریک بوو بیرم بۆ ئەوە بچێ کە... لێی گەڕێ، من بە یارمەتیتان دەبێ جێتان بهێڵم. ئەگەر کرا... لەوانەشە دووبارە سەر بدەمەوە.

کڕنۆشی برد، جا ماڵئاوایی کرد و لە ژوورەکە چووە دەرێ.

پولخێریا گوتی:

– ئای لەو پیاوە نازدارە!

– بەڵێ، شازە، بێوێنەیە، هەم خوێندەوار و هەم تێگەیشتوو...

ڕاســـکۆڵنیکۆف ئێســـتە خەریک بوو بە خێراییەکی تاســـێنەر و ژووژییەکەوە[1] کە تا ئەو ساتە پێوەی نەبیندرا بوو، قسەی کرد:

– بە هیچ شـــێوەیەک بیرم نییە کە بەر لە نەخۆشـــییەکە لە کوێ بینیبووم... لام وایە لە شـــوێنێک یەکتریمان بینیبوو... وەلێ ئەمەش کەسێکی باشە!...

١. ژووژی: وریایی؛ زیتەڵەیی. ژووژ: زیتەڵە؛ وریا.

جا ئاماژەی بۆ ڕازومیخین کرد:

– دونیا، کەیفت بەم کابرایە دێ؟

کە ئەمەی لە خوشکەکەی پرسی، دیار نەبوو بۆچی بێ پێشەکی لە تریقەی پێکەنینی دا. دونیا هاتە وەڵام:

– زۆر!

ڕازومیخین بەوپەڕی شـــەرمەزارییەوە تا بناگوێ ســـوور هەڵگەڕا، لەسەر کورسییەکە پرتاوی کرد و بەرهەڵستیی کرد:

– ئەک... چەندە ناڕەسەنی!

پولخێریا بزەیەکی کەمڕەنگی کرد، وەلێ ڕاسکۆڵنیکۆف قاقا پێکەنی:

– ئێستە بۆ کوێ دەچی؟

– من دەبێ بڕۆم... ئەوەی ڕاستی بێ...

– نا، دەبێیەک لەئارادا نییە، بمێنەوە! ئەوە زۆسیمۆف بۆی دەرچوو، کەواتە تۆ دەبێ بمێنیتەوە. مەڕۆ. کـاتژمـێر چەنـدە؟ دوازدە؟ کـاتژمێرەکەت چەنـدە جوانە، دونیـا. خۆ ئێوەش دیســـــان بێدەنـگ بوونەوە. منیش هەر چەنە دەدەم!

دونیا وەڵامی دایەوە:

– دیاریی مارفا پێترۆڤنایە.

پولخێریا دای بە دەمییەوە:

– لە یارۆ گرانبایییەکانیشە!

– ئەها! وەلێ ناجۆریشە، هێندە لە ژنانە ناچێ.

دونیا گوتی:

– من بەدڵمە.

ڕازومیخین لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *کەواتە دیاریی دەزگیرانە ئازیزەکەی نییە!* جا لە خۆڕا گەشایەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف گوتی:

– وام زانی لوژن پێی داوی...

– نا، لوژن هێشتا هیچ شتێکی بە دیاری نەداوەتەوە دونیا.

ڕاسکۆڵنیکۆف سەیرێکی دایکی کرد و بێ پێشەکی گوتی:

– دە وا بڵێ! دایە گیان، بیرتە عاشـــق بووبووم و دەمویســـت ژن بهێنم؟

دایکەکە لەتاو گۆڕانی کتوپڕانەی بابەتەکە و ئاواز و شێوازی دوانی کوڕەکەی گێژ کەوتبوو:

– ئاخ، بەڵێ، ئازیزم!

پولخێریا و دونیا و ڕازومیخین نیگایەکیان لەگەڵ یەکدی ئاڵوگۆڕ کرد.

ڕاسکۆڵنیکۆف هەمدیسان چاوی لە زەوی بڕی و خەیاڵ بردییەوە:

– ئەممم! بەڵێ! چیتان بۆ باس بکەم؟ شـــتی زۆرم بیر چووەتەوە. کچەکە خراپ نەخۆش بوو، تەنـانەت دەکرێ بڵێین کەلەلا بووبوو. هەموو بیر و خەیاڵی ئەوە بوو خێر بە دەســـتکورتان بکا و بچێتە پەرستگە... جارێکیان کە بەتەما بوو لەو بارەیەوە قسەم بۆ بکا، وەک هەوری بەهار فرمێســـکی ڕشـــت و فرمێســـکی ڕشـــت. بەڵێ، بەڵێ... بیرمە... زۆر بە باشـــی بیرم دێتەوە. کچێکی جوان نەبوو... خۆشـــم نازانم چ شتێک منی بەرەو لای پەلکێش کرد. لەوانەیە بۆیە سەرنجمی

ڕاکێشابێ کە دایمەی خوا نەخۆش بوو... ڕەنگە گەر شەل با یان کوورِ ئەوە زیاتر هۆگری ببام... زۆر زۆرم خۆش بویستبا!

خەیاڵپڵاوانە بزەیەکی کرد:

– ئەرێ، دەڵێی وڕێنەی بەهاران بوو...

دونیا کەیل لە هەستێکی گەرموگوڕ گوتی:

– نا، تەنیا وڕێنەی بەهاران نەبوو!

ڕاسکۆڵنیکۆف بە نیگایەکی ڕقاوییەوە لە خوشکەکەی ڕاما، بەڵام نەیبیست چی دەڵێ یانیش ئەوەبوو بیستی و لە مەبەستی تێنەگەیشت. پاشان نغرۆ و ون لە بیر و خەیاڵدا هەستایەوە، بەرەو لای دایکی چوو، ئەوی ماچ کرد، گەڕایەوە سەر جێگەکەی و هەمدیسان دانیشتەوە.

پولخێریا خرۆشابوو:

– هێشتا هەر خۆشت دەوێ؟

– ئەو کچە؟ ئێستە؟ ئاخ، بەڵێ... مەبەستتان ئەو کچەیە؟ نا... ئێستە ئیتر وام دێتە بەرچاو کە ئەو مەسەلەیە هەمووی سەردەمانێک لەمەوبەر لە جیهانێکی دیکەدا ڕووی داوە... هێندە دوور بووە کە... هەر بە ڕاستی ئەوەی ڕووی دەدا هەر دەڵێی پەیوەستە بە جیهانێکی دوورەدەستەوە!

بە سەرنجەوە لە یەک بە یەکیانی ڕوانی:

– ئێوەش ئەو چەند کەسەتان... هەر دەڵێی لە دوورایی چەند فەرسەخێکەوە لێتان دەڕوانم... وەلێ هەر خوا دەزانێ بۆچی خەریکین باسی ئەم شتانە دەکەین!

جا توندوتیژانە بۆی زیاد کرد:

– باشە ئەم پرسیار و وەڵامانە بۆچین؟

دەستی کردە کرۆشتنی نینۆکەکانی و سەرلەنوێ بیر و خەیاڵ بردییەوە و بێدەنگ بوو.

کتوپڕ پولخێریا بێدەنگییە قورس و ناخۆشەکەی شکاند:

– ژوورێکی چەندە تاریک و تەنگت گرتووە، ڕۆدیا! هەر دەڵێی گۆڕە! لانیکەم نیوەی خەمۆکییەکەت بەبۆنەی ئەم ژوورەوەیە!

ڕاسکۆلنیکۆف بێتاقەت و وەک ئەوەی لە دونیایەکی دیکەوە وەڵام بداتەوە:

– باسی ژوورەکەم دەکەی؟... بەڵێ وایە، ژوورەکەشم کاریگەرییەکی زۆری لەسەر بارودۆخم هەبووە... خۆشم بیرم لێ کردبووەوە...

تیزخەنێکی نامۆی کرد و درێژەی پێ دا:

– وەلێ ئەگەر دەتزانی دایە گیان، کە هەر ئێستە قسەیەکی چەندە سەیرت کرد!

هەر ئەوەندە بەس بوو کەمێکی دیکە تێپەڕێت تا بە هیچ شێوەیەک نەتوانێت بەرگەی ئەم کوڕە و دایک و خوشکی و، کۆبوونەوەیان دوای سێ ساڵ و گفتوگۆی گەرمیان –گەرچی ڕێی تێنەدەچوو بتوانێت بە ڕێکوپێکی لەبارەی بابەتێکەوە بدوێت– بگرێت. بەڵام پرسێکی گرنگ لەنێواندا بوو کە دەشیا هەر ئەو ڕۆژە یەکلایی بکرێتەوە؛ ڕاسکۆلنیکۆف هەر لە ساتی بێداربوونەوەوە سوور بوو لەسەر ئەوەی هەرچۆنێک بووە چارەوبڕی بکات و ئێستەش دڵخۆش بوو کە کارێکی هەیە بۆ ئەنجامدان، وەک ئەوە وا بوو ڕێی هەڵهاتنی دەست کەوتبێت! وشک و جددی دەستی پێ کرد:

– گوێ بگرە، دونیا. هەڵبەتە من لەبارەی دوێنێوە داوای لێبوردنت لێ دەکەم، وەلێ وەک برا ئەرکەکەم ڕام دەسپێرێ کە پێت بڵێم لە قسەکەم پاشگەز نابمەوە؛ کەواتە، یان من یان لوژن. من گەر سووک و ڕسوا بوومە، ئەوا نابێ تۆ ببی! هەر ئەمە بۆ حەوت پشتمان بەسە. گەر ببیتە ژنی ئەم لوژنە، ئیتر خوشکی من نییت.

پولخێریا بە خەمناکی هاواری کرد:

– ڕۆدیا، ڕۆدیا! خۆ دیسان کردتەوە بە هەمان بەزمەکەی دوێنێ! بۆ واز ناهێنی و زوو زوو دەڵێی سووک و ڕسوا بوویتە؟ من بەرگەی ناگرم! دوێنێش هەر ئەمەت گوت...

دونیا توند وەڵامی براکەی دایەوە و شێوازی قسەکردنەکەشی بە هەمان ڕادە وشک بوو:

– براکەم، تۆ بە هەڵە تێگەیشتووی. من بە درێژایی شەو بیرم لێ کردەوە و دواجار تێگەیشتم هەڵەی تۆ لە کوێدایە. وا بزانم تۆ لات وایە من لەبەر خاتری کەسێک و بۆ کەسێک خۆم دەکەمە قوربانی! بە هیچ شێوەیەک وا نییە. تەنیا و تەنیا لەبەر خۆمە کە زەماوەند دەکەم، لەبەر ئەوەی هەلومەرجێکی دژوارم هەیە. هەڵبەتە خۆشحاڵ دەبم گەر بتوانم شتێک بۆ خێزانەکەم بکەم، وەلێ هۆکاری سەرەکیی بڕیارەکە ئەوە نییە...

ڕاسکۆلنیکۆف لە داخان کەوتە کرۆشتنی نینۆکەکانی و لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *درۆیەکی زەقە! کچەی لووتبەرز! ئامادە نییە دان بەوەدا بنێ کە دەیەوێ شتێ بۆ ئێمە بکا! ئای لەو کەسایەتییە نزمانە! عەشقەکەشیان وەک نەفرەت وایە... ئۆو، من چەندە... چەندە ڕقم لە هەموویانە!*

*دونیا درێژەی پێ دا:*

– ڕاســــتییەکەی ئەوەیە کە من لەنێوان هەڵبژاردنی خراپ و خراپتردا، ئامادە بووم ببمە ژنی پیۆتەر پیترۆڤیچ لوژن و نیازمە هەر چاوەڕوانییەکی لە من هەیە، ڕاســــتگۆیانە بۆی بەدی بێنم، ئەوەتا دەبینی کە هیچ کەسێکیشم فریو نەداوە... ئێستە ئەم تیزخەنەت بۆچی بوو؟

دونیاش سوور هەڵگەڕا و بریقەی ڕق لە چاویدا درەوشایەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف بە ژارخەندێکەوە پرسیی:

– هەر چاوەڕوانییەک؟

– هەر چۆنێک بووە تا ئاستێکی ماقووڵ. هەڵسوکەوت و شێوازی خوازبێنییەکەی پیۆتەر پیترۆڤیچ دەستبەجێ تێی گەیاندم کە ئەو چیی دەوێ. لەوانەیە کەسێک بێ کە زۆر خۆی لە سەرترەوە ببینێ، وەلێ هیوادارم ڕێزی منیش بگرێ... بۆ هەمدیسان پێدەکەنی؟

– تۆ بۆچی ئەوەندە ســـوور و ســـپی دەبیتەوە؟ خەریکی درۆ ڕێز دەکەی، خوشــکی من؛ دەســـئەنقەســـتیش درۆ دەکەی و تەنیا و تەنیا لاســـارییەکی ژنانەیە. ئامادەی هەر کارێ بکەی تەنیا بۆ ئەوەی ناچار نەبی لە بڕیارەکەت پاشـگەز ببیتەوە!... تۆ ڕێی تێناچێ کەسێکی وەک لوژنت بە لاوە ڕێزدار بێ. من خۆم ئەم کەســـەم دیوە و قســـەم لەگەڵ کردووە. کەواتە تۆ لەبەرانبەر پارەدا خەریکی خۆت دەفرۆشیتە ئەو و لە هەر بارێکدا بێ کارێکی قێزەون دەکەی. خۆشـــحاڵم کە لانیکەم شەرم دەکەی و سوور هەڵدەگەڕێی!

پشوودرێژیی دونیاش سنوورێکی هەبوو و هاواری کرد:

– بە هیچ شـــێوەیەک وا نییە و من درۆ ناکەم. ئەگەر بڕوام بەوە نەبێ کە لوژن ڕێزم دەگرێ و بایەخێکی هەیە بۆم، هەرگیز نابمە ژنی؛ هەروەها گەر لەوەش دوودڵ بم کە ئایا دەتوانم ڕێزی بگرم یان نا،

هەر شووی پێ ناکەم. خۆشبەختانە هەر ئەمڕۆ هەموو ئەم شتانەم بۆ یەکلایی دەبنەوە. ئەم هـاوســـەرگیرییە بەو جۆرەش کە تۆ دەیڵێی مایەی شەرم و سەرشۆڕی و ڕسوایی نییە! گریمان تۆ ڕاست دەکەی و من نیازمە کارێ بکەم کە سووکمان بکا، لات وا نییە لەگەڵ ئەوەشدا هەر دڵرەقانەیە کە تۆ ئاوها قســەم لەگەڵ دەکەی؟ بۆچی چاوەڕوانیی پاڵەوانبازییەکم لێ دەکەی کە لەوانەیە لە توانای خۆشــتدا نەبێ؟ ئەمە ســتەمە و تۆ خەریکی زۆرداریی! گەر بڕیار بێ لەم نێوەندەدا کەســێ بفەوتێ، ئەو کەســـە تەنیا منم، نەک هیچ کەســـێکی تر... خۆ پیاوم نەکوشتووە!... بۆچی وا سەیرم دەکەی؟ بۆ دووبارە ڕەنگت پەڕییەوە؟ ڕۆدیا، چی بووە؟ ڕۆدیا، ئازیزم!...

پولخێریا هاواری کرد:

– ئای خوایە! ئاخرییەکەی بوورایەوە لەدەست تۆ!

– نا، نا... شتێکی وا نییە... گرنگ نییە!... تەنیا سەرم سووڕا. هێشتا نەبووراومەتەوە... ئێوەش دایمە خەمی بوورانەوەی منتــانە هەر!.... ئمممم! بەڵێ... چیم دەگوت؟ ئەها... باشـــە ئەمڕۆ بڕیارە چۆن هەموو شـــتێ یەکلایی ببێتەوە کە بە قســـەی خۆت تا بزانی دەتوانی ڕێزی لوژن بگری و ئەویش دەتوانێ حورمەت لە تۆ بنێ؟ ئاخر گوتت هەر ئەمڕۆ؟ یان بە هەڵە بیستم؟

دونیا گوتی:

– دایە گیان نامەکەی پیۆتەر پیترۆڤیچ لوژن نیشانی ڕۆدیا بدە!

پولخێریا بە دەســـتی لەرزۆکەوە نامەکەی دایە ڕاســـکۆلنیکۆف، ئەویش زۆر کونجکۆڵانە نـامەکەی وەرگرت، بەڵام بەر لە کردنەوەی، کتوپڕ نیگایەکی ســـەیروســـەمەرەی گرتە دونیا و هێمن، وەک ئەوەی بیرێکی تازەی بە زەیندا هاتبێت، گوتی:

– سەیرە من بۆچی ئاوها سەری خۆم بەم بەزمەوە دەئێشێنم؟ بۆچی ئاوها بیکەینە هەلا؟ بچۆ کێت ویست شووی پێ بکە!

دەتگوت خەریکە قسە لەگەڵ خۆیدا دەکات، بەس ئەم قسانەی بە دەنگی بەرز کردن و تا ماوەیەکیش هەر وا وڕ لە خوشکەکەی ڕاما. دواجار نامەکەی کردەوە، وەلێ هەر وا بە هەمان وڕییە نائاسییەکەوە. بە شێنەیی و وردییەوە دەستی کردە خوێندنەوە و دووبارە نامەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی خوێندەوە. پولخێریا زۆر پەرێشان بوو و ئەوانی دیکەش چاوەڕێ بوون کتوپڕ ڕووداوێکی نەخوازراو بقەومێت.

– ئەوەی کە سەرسامی کردووم...

ڕاسکۆلنیکۆف ئێستێکی کورتی کرد و نامەکەی دایەوە دایکی، وەلێ ڕووی دەمی لە کەسێکی تایبەتی نەبوو:

– ئەوەی کە سەرسامی کردووم ئەوەیە کە کابرا بازرگانە، پارێزەرە، قسەکردنەکەی فشەکەرانەیە و وەک دەڵێن سەرژنانی... بەس تەماشای نووسینەکەی، هەر دەڵێی خوێندەوارییەکی نیوەچڵیشی نییە!

هەمووان لە سەرسامیان حەپەسان، ئاخر وایان دەزانی کە ئەو، کاردانەوەیەکی جیاوازتری دەبێت.

ڕازومیخین بە پەلە و کورتی وەڵامی دایەوە:

– وەلێ هەموویان هەر وا دەنووسن.

– تۆش خوێندتەوە؟

– بەڵێ.

پولخێریا بە شەرمەوە هاتە قسە:

– ئێمە نیشـــــانمـان دا، ڕۆدیـا... بەر لەوەی بێین، بۆ ڕاوێژ و بەرچاوڕوونی...

ڕازومیخین پەڕییە نێو قسەکانی:

– ئەمە شـــێوازی تایبەتی دادگە و پارێزەرەکانە دەی. هەمیشـــە بەڵگەنامە یاساییەکان بەم وێژە ئیدارییە دەنووسن!

– یاسـایی؟ بەڵێ، ڕاسـتە... یاسـایی، بازرگانی... نە عەوامانە و نە وێژەیی... زمانی بازرگانی و ئیداری!

وا دیار بوو دونیا بە شێوازی قسەکردنی براکەی دڵگران بووە:

– پیۆتەر پیترۆڤیچ هیچ کـاتێ نەیشـــاردووەتەوە کە بە هەژاری خوێندوویەتی و تەنانەت شانازیش دەکات کە خۆی خۆی پێگەیاندووە!

– باشـە، ئەگەر شـانازی دەکا، لەوانەیە هۆکاری خۆی هەبێ. منیش نکۆڵیی لێ ناکەم. دەڵێی لە دڵت گرتووە، خوشـــکێ، خۆ من بێ لەم ڕەخنە پووچە هیچی ترم لەبـارەی نـامەکەیەوە نەگوت. لات وایە دەستەنقەست گرتوومە بەم وردەشتە بچووک و بێبایەخانەوە، لەبەر ئەوەی تووڕەم و حەز دەکەم هەرایەک بنێمەوە. وەلێ مەســـەلەکە پێچەوانەیە، لەبارەی نووسـینەکەشـییەوە زەینم لەسـەر خاڵێکە کە بە ســـەرنجدان لە هەلومەرجەکە جێی بایەخپێدانە. ئەو هەســـتاوە و نووسیویەتی کە *بەرپرسیارییەتییەکەی لەسەر ئێوە دەبێ و نابێ من بە خەتابار لەقەڵەم بدرێم*، زۆریش ڕاشـــکاو و توند ڕایگەیاندووە! جا هەڕەشـــەش لەئارادایە و دەڵێت ئەگەر منتان لەگەڵ بم، ئەوان جێی دەهێڵن! بەم هەڕەشەکردنە بە ڕۆیشتن، لە بنەڕەتدا خەریکە هەڕەشە دەکا کە ئەگەر لە فەرمانی دەرچن، هەردووکتان بەرەڵا دەکا و ئێستە کە ئێوەی پەلکێشی پیتەربورگ کردووە، بە تەنیا جێتان دەهێڵێ. باشە، ڕات چییە؟ بیسـتنی ئەم قسـەیە لە دەمی لوژنەوە هەر بە هەمان ڕادە

له بەردڵت گرانه که ئەگەر له دەمی ئەو (ئاماژەی بۆ ڕازومیخین کرد) یان زۆسیمۆف یان یەکێک له ئێمەوه بکرابا؟

دونیا گوڕی به بەردا هاتەوه و خرۆشا:

– نا، نا! خۆم تێگەیشتم که زۆر سەرپێیی نووسیویەتی. ڕەنگه هێنده دەستی نووسینی نەبێ و ئەمە... ئەم ڕەخنەیه ئاساییه، براکەم. خوشم چاوەڕێی ئەوه نەبووم...

– ئەم بەڕێزه به زمانی دادگه نووسیویەتی و بەو زمانەش نەیتوانیوه جۆرێکی تر دەربیبڕێ. بەس ئێستە ناچارم تۆزێکی تریش بێهیوات بکەم، چونکه له نامەکەیدا شتێکی دیکەشی گوتووه، به مەبەستی خراپەگوتن و تۆمەتبارکردنی من، که زۆریش چەپەڵانه و قێزەونه. من دوێشەو پارەکەم دایه ژنی ئەو پیاوه، که ژنێکی کۆستکەوتوو و سیلاوییه و دونیایەک کێشه سەری تێ ناوه؛ جا نەک به *بیانووی* ئامادەکاریی بەخاکسپاردنەوه، بەڵکه هەر به ڕاستی بۆ *ئەوه* پێم دا تا ڕێوڕەسمی بەخاکسپارنی پێ بەڕێوه بەرن! جا نەشمداوەته کچەکەیان، که لوژن به خراپه باسی کردووه، چونکه دوێشەو یەکەم جار بوو ئەو کچه ببینم. پارەکەم دایه ژنی خوالێخۆشبوو. لام وایه تەنیا ئامانجی ئەوەیه که حەیای من ببا و بەگژ یەکماندا بدا. هەمدیسان قسەکانیی به هەمان زمانه پڕوپووچه ڕەسمییەکه نووسیون، وەلێ خۆش دەستی ئاشکرا کردووه و زۆر به زەقی دیاره بەدوای چییەوەیه. زۆر ناشیانەش تامەزرۆیی خۆی بۆ تۆ نیشان دەدا. لوژن کەسێکی زیرەکه، وەلێ بۆ هەڵسوکەوتێکی ماقووڵ، هەر به تەنیا زیرەکی بەس نییه. هەموو شتێ پێکرا هاوار دەکا که بایی چەنده. لاشم وا نییه ڕێز و بایەخێکی وەهات لەلای ئەو هەبێ. بۆیه ئەمانەم گوتن تا بەرچاوت ڕوون بێتەوه و له ناخی دڵەوه تەنیا چاکەی تۆم دەوێ...

دونیا هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، پێشـوەختەش بڕیاری خۆی دابوو و ئێستەش تەنیا چاوەڕوانیی ئێوارەی دەکرد.

شـێوازی قســەکردنی ڕاســکۆڵنیکۆف کە کتوپڕ ســارد و فەرمی بووبوو، پولخێریای زیاتر لە جاران ڕەنجاند:

– تۆ دواجار بڕیارت چییە، ڕۆدیا؟

– بڕیاری چی؟

– ئێ خوێندتەوە کە پیۆتەر پیترۆڤیچ نووسیویەتی ئەمڕۆ عەسر تۆ نابێ لای ئێمە بی گەرنا ئەو نامێنێتەوە و دەڕوا. دەتەوێ چی بکەی؟ دەمێنیتەوە؟

– هەڵبەتە بڕیـارەکە لەدەســـــت من نییە، ئەوە ئێوەن کە ئەگەر داواکەیتان لە بەردڵ گرانە، دەبێ بڕیارێک بدەن. پاشــانیش لەدەســت دونیایە، ئەگەر لە بەردڵی گران نەبووبێ.

جا بە شێوازێکی ساردوسڕ بۆی زیاد کرد:

– ئێوە چی بە باش دەزانن منیش ئەوە دەکەم.

پولخێریا کاتی بەفیڕۆ نەدا:

– دونیا بڕیاری خۆی داوە و منیش بە تەواوی هاوڕاییم!

دونیا گوتی:

– ڕۆدیا، من بڕیارم وایە داوات لێ بکەم و تەنانەت ســـووریش بم لەسەر ئەوەی کە لەم دیدارەدا لەگەڵمان بی. خۆ دێی؟

– دێم.

جا پاشانیش ڕووی کردە ڕزاومیخین:

– داوا له ئێوەش دەکەم بۆ کاتژمێر هەشـــت لەگەڵ ئێمه بن! دایه گیان، ئەوانیشم داوەت کرد.

– ئێ چی لەوە باشـــتر، دونیا گیان. دەی، ئێســـته مادام هەمووتان بڕیارتان داوە، کەواته وا دەکەین. منیش ئاسوودەتر بووم، ئاخر کەیفم به درۆ و نواندن نایێ! باشـــتر وایه هەر لەوێ و ڕووبەڕوو قســـەی خۆمان بکەین و هەموو ڕاســـتییەکان بڵێین... جا گەر پیۆتەر پیترۆڤیچ پێی ناخۆش بوو، ئەوا با هەر پێی ناخۆش بێ!

## چوار

ڕێک لەو کاتەدا، دەرگەی ژوورەکە، بە شـێنەیی و نەرم، کرایەوە و کچێکی گەنج هاتە ژوور و شـەرمنانە تەماشـایەکی ژوورەکەی کرد. هەموان سـەرسـام و کونجکۆڵ ڕوویان کردە تازەهاتووەکە. ڕاسـکۆڵنیکۆفیش بە یەکەمین سـەرنج ئەوی نەناسـییەوە. وەلێ ئەم کچە، هیچ کەسـێک نەبوو بێجگە لە سـۆنیا. ڕێک، دوێنێ بۆ یەکەمین جار ئەوی دیتبوو، بەڵام لە وەها ژینگە و دۆخ و بە وەها جلوبەرگێکەوە کە وێنایەکی جیاوازی کچەکە لە یادگەیدا دروسـت بووبوو. ئێسـتە کچێکی گەنجی لەبەرانبەر خۆیدا دەبینی بە ڕووالەتێکی بێئازایش و تەنانەت هەژارانە کە زۆر زۆر کەمتەمەنتر دەینواند. بە شـەرم و حورمەتەوە هەڵسـوکەوتی دەکرد، وەلێ لە ڕووخسـاری بەویقاریدا بڕێک ترسـیش بەدی دەکرا. ئەم جارەیان جلێکی سـادەی ماڵەوەی لە بەردا بوو بە کڵاوێکی مۆدێلبەسـەرچوو و پواوەوە، بەڵام هەمان چەترەکەی دوێنێی هەر پێ بوو. کچە کە دیار بوو گریمانەی ئەو قەڵەباڵقییەی ناو ژوورەکەی نەدەکرد، نەک هەر بە تەنیا ناڕەحەت بوو، بەڵکە تەریق بووەوە و وەک منداڵێک شـڵەژا و تەنانەت خەریک بوو وەرسووڕێ و لە ژوورەکە بچێتە دەرێ.

ڕاسکۆڵنیکۆف وڕ و شەرمەزار بوو:

– ئاه... ئەوە ئێوەن؟

دەمودەسـت بیری هاتەوە کە دایک و خوشـکی لەسایەی نامەکەی لوژنەوە، شـتگەلێک لەسـەر ئەم کچە *بەدناوە* دەزانن. هەر خۆی چەند

خولەکێک لەمەوبەر خەریک بوو درۆکانی لوژنی ڕەد دەکردنەوە و دەیگوت لە تەمەنیدا بۆ یەکەمین جار دوێنێ کچەکەی بینیوە و وا ئێستەش خانمخاس کتوپڕ خۆی بە ژوورەکەیدا کردووە. بیری هاتەوە کە نارەزاییەکی وای لەسەر سیفەتی *بەدناو* دەرنەبڕیوە و هەموو ئەمانە بە شێوەیەکی گرنگ و برووسکەئاسا بە زەینیدا ڕابردن. وەلێ کە وردتر سەیری کچەی کرد، بینیی ئەو بوونەوەرە شەرمۆکە هێندە سووکایەتیی پێ کراوە کە کتوپڕ دڵی بۆی کەوتە ژان.

کچەکە کە ویستی لە ترسان وەرسووڕێ و بڕوات، شتێک لە دەروونی ڕاسکۆلنیکۆفدا ژێروژوور بوو.

– ئاخر چاوەڕێ نەبووم ئێوە لێرەدا ببینم...

بە پەلە ئەمەی گوت و بە نیگایەک کچەی ڕاگرت.

– فەرموون دانیشن. بێگومان لەلایەن کاترینا ئیڤانۆڤناوە دێن؟ مۆڵەت بدەن، لەوێ نا. فەرموون لێرە دانیشن...

ڕازومیخین کە لە نزیک دەرگە و لەسەر یەکێک لە سێ کورسییەکەی ڕاسکۆلنیکۆف دانیشتبوو، بە هاتنەژووری سۆنیا لەسەر کورسییەکە هەستایەوە تا جێی بۆ بکاتەوە. ڕاسکۆلنیکۆف سەرەتا فەرمووی شوێنەکەی زۆسیمۆفی (سەر قەنەفەکەی خۆی) لە کچەکە کردبوو، بەس لەبەر ئەوەی هەم قەنەفە و هەم تەختەخەوەکەشی بوو، هەستی کرد نەشیاوە و حەپەساو ئاماژەی بۆ کچەکە کرد تا لەسەر قەنەفەکەی ڕازومیخین دابنیشێت.

– تۆ لێرە دانیشە!

جا ڕازومیخینیشی لەسەر قەنەفەکە دانیشاند.

سۆنیا دانیشت، کەم تا زۆر خەریک بوو لە ترسان هەڵدەلەرزی و شەرمنانە لە دوو خاتوونەکەی دیکەی دەڕوانی. دیار بوو خۆشی

نەیدەزانی چۆن لەنێو ئەم خاتوونانەدا قوت بووەتەوە و تەنانەت بیرکردنەوە لەم بابەتە وەها ترسێکی خستە گیانییەوە کە تاساوانە لە جێگەکەیدا پرتاوی کرد و وڕ و بەدەم تەتەڵەوە بە ڕاسکۆڵنیکۆفی گوت:

– من... من... تەنیا بۆ خولەکێک هاتم. داوای لێبوردن دەکەم کە کاتم گرتن. کاترینا ئیڤانۆڤنا پەیامێکی بۆتان هەبوو و کەسی دیکەشی لێ نەبوو تا بەودا بۆتان بنێرێ... گوتی تکاتان لێ بکەم بۆ ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی سبەینێ ئامادە بن... بۆ دوعا... گۆڕستانی میترافانییێفسکی... پاشانیش تەشریف بێننەوە لای خۆمان... یانی لای کاترینا ئیڤانۆڤنا بۆ فراوێن... ئەو شانازییە بەوان دەبەخشن... داوای کرد تکاتان لێ بکەم...

سۆنیا بە جۆرێک زمانی گیرا کە ئیدی وسکت بوو.

ڕاسکۆڵنیکۆف وەڵامی دایەوە:

– هەڵبەتە هەوڵ دەدەم بێم... بە دڵنیاییەوە...

هەستایەوە و ڕاوەستا، بەس خۆیشی زمانی گیرا و نەیتوانی ڕستەکەی تەواو بکات. کتوپڕ دەستی پێ کرد:

– تکا دەکەم دانیشن، قسەم هەیە لەگەڵتان. ڕەنگە درەنگ کەوتبن و پەلەتان بێ، وەلێ تکا دەکەم بە چاکەی خۆتان دوو خولەک گوێم لێ بگرن...

جا کورسییەکەی بۆ کچە بردە پێشەوە. سۆنیا وڕ و گێژ دووبارە دانیشتەوە و دیسانەوە سەیرێکی ترساو و سرگی خاتوونەکانی کردەوە و دەمودەستیش نیگای دزییەوە و سەری داخست.

ڕووخساری ڕەنگپەڕیوی ڕاسکۆڵنیکۆف سوورایییەکی زەقی تێ گەڕا و لەرزەیەکیش کەوتە گیانی؛ چاوانی پشکۆئاسا دەدرەوشانەوە.

توند و بە جەختلەسەرکردنەوەیەکی زۆرەوە گوتی:

– دایە گیان، ئەمە خاتوو سۆنیان، کچی مارمیلادۆڤی خوالێخۆشبوو کە هەر ئێستــــتە باســــمان دەکرد و گوتم دوێنێ بە بەرچاوی منەوە گالیسکە کردی بە ژێرەوە.

پولخێریا بە جۆرێک لە فیز و بەکەمزانینەوە تەماشـایەکی سـۆنیای کرد؛ ســـەرەڕای ئەوەش کە لەژێر نیگـای زەق و توندوتیژانەی کوڕەکەیدا ناڕەحەت بوو، کەچی هەر نەیتوانی بەر بە خۆی بگرێت و خۆی لە چێژی ئەو بەکەمســـەیرکردنە بکات. بەڵام دونیا جددی و بە ســـەرنجێکی ڕاســـتەوخۆوە لە دەموچاوی کچەی داماوی دەڕوانی و ســـەرســـامانە ئەوی خســـتبووە ژێر چاودێرییەوە. ســـۆنیا کە ناســـاندنەکەی بیســـت، هەوڵی دا هەمدیســـان ســـەر هەڵبڕێت، وەلێ پێشوەختە شپرزە بوو.

ڕاسکۆڵنیکۆڤ پەلەپەل لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

– دەمویســـــت بپرســـــم ئەمڕۆ کاروبار چۆن بەڕێوە چوو. خۆ ئاسوودەییان تێک نەدان؟... مەبەستم پۆلیس و ئەم شتانەیە.

– نا، بەڕێز، هیچ کێشەیەک نەهاتە پێش... هۆکاری مردنەکەش زۆر ڕوون بوو. هیچ کەســـێ بێزاری نەکردین. تەنیا دراوســـێکان تووڕە بوون، هەر ئەوەندە.

– لە چی تووڕە بوون؟

– زیاتر لەوەی کە لاشـــەکە لەو گەرمایەدا هەر وا ماوەتەوە و بۆگەنی کردووە... بڕیار وایە ئەمڕۆ بەر لە دوعـای ئێواران ببەنە گۆڕســـتان و تا بەیانی لە تەلاری تازیەدا بمێنێتەوە. کاترینا ئیڤانۆڤنا سـەرەتا ئامادە نەبوو بێتە ژێر بار، وەلێ ئێســـتە خۆشـی وای دەبینێ کە پێویستە ئەم کارە بکرێ...

– یانی دواجار ئەمڕۆیە؟

– کاترینا ئیڤانۆڤنا تکای کرد ئەو شـانازییەی پێ ببڕن و بەیانی بۆ ڕێوڕەسمەکە تەشریف بهێننە کڵێسا و پاشانیش بۆ فراوێنی پرسەکە بێنە ماڵیان.

– یانی بەنیازن ڕێوڕەسمی پرسەی بۆ بگێڕن؟

– بەڵێ، بەڕێز، خواردەمەنییەکی ئاســـایی هەڵبەتە... گوتی لەبارەی یارمەتییەکەی دوێنێتانەوە زۆر زۆر سوپاستان بکەم. گەر ئێوە نەبان، بۆ بەخاکسپاردنەکە دەستمان خاڵی بوو.

سـۆنیا کە وەڵامی دایەوە، کتوپڕ لێو و زنجی کەوتنە لەرزین، بەڵام بە هەر تەقەلایەک بوو خۆی گورج کردەوە و هەمدیســـــان ســـــەری دانەواند.

ڕاسـکۆڵنیکۆف لە ماوەی گوتوبێژەکەیاندا بە سـەرنجەوە تەماشـای سـۆنیای دەکرد. ڕووخســـاری بچووکی کچەکە، ناجێگیر و ئێســـکن و لاواز بوو، لاوازییەکی تۆقێنەرانە و زۆر ڕەنگپەڕیو. لووت و زنجی بچووکیشـی باریک بوون. نەدەکرا بڵێی دەلالە، وەلێ چاوە شـینەکانی هێندە ســـاف و نیگای ئەوەندە بریقەدار بوو کە ســـیمای بارێکی نەرمونیان و ســـادەی وەردەگرت و هیچ کەسـێک لەبەرانبەریدا خۆی ڕانەدەگرت و ســـەرنجیی ڕادەکێشـــا. ڕووخســـــار و ئەنـدامی تایبەتمەندییەکی دیکەشـیان هەبوو. گەرچی تەمەنی هەژدە سـاڵ بوو، بەس وەک کچۆڵەیەک وا بوو و زیـاتر لە منـداڵێـک دەچوو نەک مرۆڤێکی باڵقبوو. ئەم منداڵییە لە هەندێک جووڵەیدا زیاتر دەردەکەوت و تەنانەت پێکەنیناویش دەهاتە بەرچاو.

بەڵام ڕاسکۆڵنیکۆف مکووڕانە درێژەی بە گفتوگۆکە دا:

– وەلێ کاترینا ئیڤانۆڤنا چۆن بەو چەند پەنابایەش هەموو کارەکانی ڕایی کردوون؟ ئاخر گوتتان دەیەوێ شێویش ئامادە بکا!

– تابووتێکی سادەمان کڕیوە هەڵبەتە... یانی شتەکان هەمووی ئاسایین و شتێکی وایان تێناچێ... لەگەڵ کاترینا ئیڤانۆڤنادا هەموو شتێکمان حسێب کردووە و هەر ئەوەندەمان لەسەر دەمێنێ کە خواردەمەنییەکە ئامادە بکەین... کاترینا ئیڤانۆڤنا زۆر سوورە لەسەر کردنی ڕێوڕەسمەکە؛ ئاخر خۆ ناکرێ هەر وا... خۆتان دەزانن ئەوان چ جۆرە مرۆڤێکن!

– بەلێ، تێدەگەم، تێدەگەم... هەڵبەتە... باشە بۆ سەیری ژوورەکە دەکەن؟ دایکیشم چەند ساتێ بەر لە هاتنی ئێوە دەیگوت ئێرە لە گۆڕ دەچێ!

سۆنیا لە وەڵامدا، بە پەلە و تا ڕادەیەک بەرز ورتاندی:

– ئێوە دوێنێ دار و نەداری خۆتانتان دایە ئێمە!

جا کتوپڕ چاوی لە زەوی بڕی. دیسان لێو و زنجی کەوتنەوە لەرزین. لەگەڵ هاتنەژوورەوەیدا هەستی بە هەژاری و داماویی ڕاسکۆلنیکۆف کرد و ئێستەش ئەم وشانەی نائاگایانە لە دەم پەڕیبوون. بێدەنگییەک باڵی کێشا. بریقەیەک لە نیگای دونیادا بوو و تەنانەت پولخێریاش خەریک بوو بە نەرمونیانی لە سۆنیای دەڕوانی.

– ڕۆدیا...

پولخێریا لە جێگەکەی هەستایەوە و درێژەی پێ دا:

– خۆ دەبێ پێکەوە شێو بخۆین! وەرە، دونیا. تۆیش برۆ پیاسەیەک بکە بەر لەوەی بێیتە لای ئێمە، تۆزێ ڕاکشێ و پشووێ بدە... وا بزانم زۆر ماندوومان کردی، دەترسێم کە...

ڕاسکۆلنیکۆف خرۆشاوانە هەستایەوە و گوتی:

– بەڵێ، بەڵێ، دێم. هەڵبەتە کارێکیشم هەیە...

ڕازومیخین بە سەرسامی تەماشای ڕاسکۆڵنیکۆفی کرد و بە دەنگی بەرز گوتی:

– نەڵێی بەنیازی خۆت بدزیتەوە بۆ ئەو شـــێوە خێزانییە! باشـــە منگەمنگی چیتە ئاخر؟

– بەڵێ، بەڵێ! دێم، بێگومـــان دێم، هەڵبەتە... تۆ تەنیـا خولەکێک بمێنەوە. دایە گیان خۆ ئێسـتە هیچ ئیشـێکتان بە ڕازومیخین نییە؟ یان لەوانەیە پێویستیتان پێی بێ...

– ئۆو، نـا، بە هیچ شـــێوەیەک! دیمیتری پراکۆفیچ، ئێوەش ئەو شانازییەمان پێ دەبڕن شێومان لەگەڵ بخۆن؟

دونیاش گوتی:

– بەڵێ، تکایە وەرن!

ڕازومیخین بە پانتایی ڕووخساری بزەیەکی کرد و سەری دانەواند، شـــادی لە ســـەروشـــکڵی دەباری. تا چەند چرکەیەک هەمووان دڵەڕاوکێیان بوو.

– کەواتە خواحافیز، ڕۆدیا، یانی بەهیوای دیدار. حەز ناکەم بڵێم خواحافیز، ناستاسیا... ئاە، خۆ دیسان گوتمەوە خواحافیز...

پولخێریا ویستی سـەرێک بۆ سـۆنیاش بلەقێنێ وماڵئاوایی لەویش بکات، وەلێ هەرچیی کرد نەیتوانی و لە ژوورەکە دەرچوو.

بەس دونیا پێدەچوو ئامەزرۆ بێ ســـەرەی بکات. لە بارێکدا کە خەریک بوو بەدوای دایکیدا ژوورەکەی جێ دەهێشـت، ڕاسـتەوخۆ و فرە هاوڕێیانە سـەری بۆ سـۆنیا لەقاند. سـۆنیا شـەرم دایگرت و وەک ئەوەی کە ئاســـابێت و بترســـێت، ڕێزی خۆی نواند و تەنانەت لە

ڕووخســـاریشـــیدا دەکرا ئاســـەواری ئازار بەدی بکەیت، دەتگوت بەهەندوەرگرتن و ڕێزنواندنی دونیا بووبووە بارێک بە کۆڵییەوە و ئەشکەنجەی دەدا.

ڕاسکۆڵنیکۆف چووە ڕێڕەوەکە و دەنگی هەڵبڕی:

– دونیا، خوات لەگەڵ! لانیکەم تەوقە بکە!

دونیا نەرمونیان بەس بە بارگرانییەوە بەرەو لای ڕاســـکۆڵنیکۆف وەرچەرخا:

– خۆ تەوقەمان کرد! بیرت چوو!

– دەی با کردبێتمان! دیسان بیکەرەوە!

جا ڕاســـکۆڵنیکۆف بە گەرمی پەنجە ناســـکەکانی خوشـــکەکەیی گوشـــین. دونیا زەردەخەنەیەکی کرد و ڕووخســـاری گەشـــایەوە، جا دەستی لە دەستی براکەیدا دەرهێنا و کەوتە دوای دایکی؛ دیار نەبوو بۆچی دەموچاوی شادیی لێ دەباری.

ڕاســـکۆڵنیکۆف گەڕایەوە ژوورەکە و بە جۆشـــەوە ســـەیرێکی سۆنیای کرد و گوتی:

– ئێ باشە، لەوە باشتر نابێ! خوا لە مردووی هەمووان خۆش بێ، وەلێ زیندووەکان ناچارن درێژە بە ژیانیان بدەن! خراپ دەڵێم؟ ها؟ خراپم گوت؟

سۆنیا بە بینینی ئەو ڕۆشناییەی کە لەپڕ دەموچاوی ڕاسکۆڵنیکۆفی شـــەوقاندبوو، ســـەرســـام بوو. ڕاســـکۆڵنیکۆفیچ چەند خولەکێک لە بێدەنگیدا تەمـاشـــــای ئەوی کرد و لەو چەنـد خولەکەدا بـاوکی خوالێخۆشبووی هەرچیی لەبارەی کچەکەیەوە گوتبوو، کتوپڕ هێرشی هێنایە سەر زەینی.

پولخێریا هەر کە هەنگاوی نایە سەر شەقام، دەستی پێ کرد:

– خوا پەنامان با، دونیا! چەندە خۆشحاڵم کە هاتینە دەرێ... دەڵێی ئاسوودە بووم! دوێنێ کە لە شەمەندەفەردا بووین هەرگیز لام وا نەبوو وەها شتێ بتوانێ ئەوەندە خۆشحاڵم بکا!

– دایە گیان، گوتبووم و ئێستەش دووبارە پێتانی دەڵێمەوە کە ڕۆدیا هێشتا زۆر نەخۆشە. خۆتان سەرنجتان نەدا مەگەر؟ وا بزانم کە خەمی ئێمەی لێ نیشت، زیاتر تێک چوو. دەبێ پشوودرێژ بین و ئەوەندە سەری نەخەینە سەر، پێویستە چاو لە هەندێ شت بپۆشین...

پولخێریا توندوتیژانە و بە ئیرەییەوە پەڕییە نێو قسەکانی:

– ئێ، ئەوە نییە ئێستە خۆت زۆر پشوودرێژ بووی! دەزانی چییە، دونیا گیان؟ کە سەیری هەردووکتانم دەکرد، تێگەیشتم کە هەر دەڵێی تۆ ڕێک لەبەرگیراوەی ئەسڵیی براکەتی، جا نەک تەنیا بە ڕوواڵەت... ناخیشتان وەک یەک وایە! هەردووکتان ساردوسڕ و بەدخوو و تاوتاون، لە لایەکی دیکەشەوە، هەردووکتان لووتبەرز و خۆبەشتزانن. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دونیا گیان، ڕێی تێناچێ ڕۆدیا هێندە خۆپەرست بووبێ، ها؟ کە بیر لەمڕۆ عەسرمان دەکەمەوە، یەکسەر دڵم دادەخورپێ!

– خۆت ئازار مەدە، دایە گیان. گەر بڕیار بێ شتێکمان لێ بێ، هەر لێمان دێ!

– دونیا، تۆ بیری لێ بکەوە چ گیرێکمان خواردووە ئاخر! گەر پیۆتەر پیترۆڤیچ هەموو شتێ هەڵوەشێنێتەوە، ئەوسا چی دەقەومێ؟

پولخێریای داماو ئیدی جڵەوی خۆی لەدەست دابوو و بێپارێز ئەم قسانەی دەکردن.

دونیا بە زبری و سووکایەتییەوە وەڵامی دایەوە:

– گەر هەموو شـــتێ هەڵبوەشـــێنێتەوە، کەواتە یانی ئەم مرۆڤە شیاوی ئەوە نەبووە و نییە!

پولخێریا پەڕییە نێو قسەکانی:

– بەس چاکمان کرد هاتینە دەر، خۆیشـــی پەلەی شـــوێنێکی بوو. شـــتێکی باشـــە بۆ ئەو بچێتە دەر... لانیکەم هەوایەک دەگۆڕێ... خۆ هێندە داخراو و دڵتەنگکەرە کە لێی دەتۆقی... وەلێ لەم وێرانەیەدا لە کوێ هەوایەکی تازە دەســـت دەکەوێ؟ شـــەقامەکانیشـــی هەر دەڵێی ژووری بێپەنجەرەن! پەنا بە خوا، ئاخر ئێرە چ جۆرە شـــارێکە!... ئاخ، دونیا وریا بە، وەرە لاوە گەرنا دەتپلیشـــێننەوە، دەڵێی خەریکی بردنی شـتێکن! دەبێ پیانۆ بێ... چ ڕاکێش‌ڕاکێشـێکە... ئەوەی ڕاستی بێ زۆر لەو کچەش دەترسم من...

– کامە کچ، دایە گیان؟

– ئەی هاوار، ئەم سۆنیایەی کە ئێستە هات دەی...

– جا بۆچی لێی بترسی؟

– ئاخر دڵم باش نالێ، دونیا! ڕەنگە باوەڕ نەکەی، وەلێ هەر کە هەنگاوی نایە ژوورێ، هەســـتم کرد هەموو گێچەڵەکان لەژێر ســـەری ئەو کچەدان...

دونیا بە تووڕەییەوە هاواری کرد:

– ئەم داماوە هیچی لە ژێرسەردا نییە! ئاخ، ئاخ لەدەستی تۆ و ئەم شـــتانەی کە بە دڵتدا دێن، دایە گیان! ئەوان دوێنێ عەســـر یەکترییان ناسیوە، کاتێکیش هاتە ژوور، ڕۆدیا نەیناسییەوە.

– با وا بێ، من قســـەی خۆمم کرد و ئەمەش ڕۆژەکەیە!... دەبینی، دەبینی ئێســـتە... من خەریک بوو لە ترســـان دەکەوتم. بەو چاوانەیەوە زەق لێم ڕامابوو! بە زۆر لە کورســـییەکەمدا خۆم گرتبوو... خۆ بیرتە

چۆن بە ئێمەی ناساند؟ دۆخێکی سەیر هاتووەتە ئارا، پیۆتەر پیترۆڤیچ چیی لەبارەی ئەم کچەوە نووســـیوە و کەچی ڕۆدیاش بە ئێمەی دەناســـێنێ و... بەتایبەتیش بە تۆ! کەواتە دەبێ ئەم کچەی چووبێتە دڵەوە!

– خەڵکی زۆر شـــتیان بە دەمدا دێ. بۆ کەمیان بە ئێمە کرد؟ نەکا بیرت چووبێتەوە، دایە گیان؟ من دەڵێم کچێکی باش بوو و ئەوی تری قسەی پووچە.

– خوا بکا وا بێ!

دونیا کتوپڕ بە توورەییەوە گوتی:

– پیۆتەر پیترۆڤیچیش لە فاتوفیتکەرە بێتامەکانە!

پولخێریا بە بیســـتنی ئەم قســـەیە بێدەنگ بوو و گوتوبێژەکە لەوێدا کۆتایی هات.

راسکۆڵنیکۆف بە ڕازومیخینی گوت:

– ئێستە پێت دەڵێم چ کارێکم هەیە...

جا ئەوی پەلکێشی لای بەرپەنجەرەکە کرد.

سۆنیا بە پەلە قسەی پێ بڕین:

– کەواتە من بە کاترینا ئیڤانۆڤنا دەڵێم ئێوە ئامادە دەبن.

جا سەری دانەواند و ویستی بچێت.

– تەنیا خولەکێک، سۆنیا خاتوون! ئێمە قسەیەکی تایبەتیمان نییە و ئێوەش بێزارمان ناکەن... قسەیەکی ترم هەبوو بۆتان. گوێ بگرن...

هەمدیسان ڕووی لە ڕازومیخین کردەوە:

– گوێ بگرە، تۆ ئەم کابرایە دەناسی؟ چی بوو ناوی... پۆرفیرى پیترۆڤیچ!

– بەڵێ دەیناسم، بە ناخێری گیانمان خزمین! بۆچی؟

ڕازومیخین لە کونجکۆڵیان خەریک بوو مەراقی دەکرد.

– هەر ئەم پۆرفیرى پیترۆڤیچە نییە کە دۆسییەی ئەو مەسەلەیە... کوشتنی ئەو پیرێژنەی... لەدەستدایە؟ دوێنێ خەریک بووی دەتگوت...

چاوانی ڕازومیخین خەریک بوو لە کاسەوە بێنە دەرێ:

– بەڵێ دەی... مەسەلە چییە؟

– بەتەما بووە ئەوانەی کە بارمتەیان لای پیرێژنەکە بووە، ببینێ و دەی... منیش لەوێ شتوکەیەکم بە بارمتە داناوە. هەڵبەتە زیاتر وردەواڵەیەک، وەلێ بەهەرحاڵ... ئەنگوستیلەیەکە کاتی بەڕێکەوتن بەرەو ئێرە خوشکەکەم بە یادگاری پێی دام و کاتژمێرە زیوینەکەی باوکیشم. بە گشتی پێنج شەش ڕۆبڵێک زیاتر ناکەن، بەس لەبەر ئەوەی یادگارین، بۆ من خۆشەویستن. ئێستە دەبێ چی بکەم؟ نامەوێ هەر وا یاردگارییەکانم لەدەست بچن، بەتایبەت کاتژمێرەکەی باوکم. هەر ئێستە خەریک بوو لە ترسان بە لادا بێم، ئاخر باسی کاتژمێرەکەی دونیا بوو و لەبەرخۆمەوە گوتم نەکا دایکم کتوپڕ ورکی بینینی کاتژمێرەکەی باوکم بگرێ! تاکە شتە کە لێیەوە بۆمان ماوەتەوە. گەر بفەوتێ دایکم نەخۆش دەکەوێ... خۆت چاک ژنان دەناسی! تۆ بڵێ دەبێ چی بکەم. دەزانم، ڕێگە دروستەکە ئەوەیە بچمە لای پۆلیس و ڕایبگەیەنم کە هی منن، وەلێ پێت چۆنە ڕاستەوخۆ بچمە لای پۆرفیرى؟ ها؟ چی دەڵێی؟ تا زوو بکرێ باشترە! ئەسڵەن دوور نییە دایکم بەر لە شێو هەواڵی بپرسێ. جا دەشیبینی!

ڕازومیخین بە هەیەجانێکی سەیرەوە گوتی:

– واز لە پۆلیس بێنە! ڕاستەوخۆ دەچینە لای پۆرفیری! خۆشم ئەوەم دەویست، ئاسوودە بووم! تەماشا، کەواتە خنەخن مەکە، با بکەوینە ڕێ. ماڵەکەی هەر دوو هەنگاوێ دوورە. ئێستە بچین لە ماڵەوەیە!

– باشە کەواتە... با بڕۆین!

– پۆرفیری زۆر بە بینینت دڵخۆش دەبێ. من زۆر باسی تۆم بۆ کردووە، چەندان و چەندان جار! هەر دوێنێ باسی تۆ بوو. با بڕۆین دەی. کەواتە تۆ پیرێژنەکەت دەناسی، ها؟ هەرگیز پێم وا نەبوو! هەر زۆر باشە... ئۆو، ئەرێ بە ڕاست... لیدیا خاتوون...

ڕاسکۆڵنیکۆف بۆی ڕاست کردەوە:

– ئەمان خاتوو سۆنیان. بەڵێ، سۆنیا خاتوون، ئەمە هاوڕێی منە: ڕازومیخین. لەو مرۆڤە باشانەیە کە لە دونیادا وێنەیان کەمە...

– گەر دەبێ بچنە شوێنێ...

سۆنیا ویستی وەڵامی بداتەوە، بەڵام تەنانەت سەری بەرەو ڕازومیخین نەبزواند و ئەمەش شپرزەتری کرد.

ڕاسکۆڵنیکۆف بڕیاری خۆی دا:

– بەڵێ، با بڕۆین! من ئەمڕۆ سەرێکتان لێ دەدەم، سۆنیا خاتوون. تەنیا ناونیشانەکەتانم بدەنێ.

نەدەکرا بڵێین ڕاسکۆڵنیکۆف نارەحەتە، بەڵام دیار بوو پەلەیەتی و نیگای لە سۆنیا دەدزییەوە. سۆنیا ناونیشانەکەی پێ دا و تا بناگوێش سوور هەڵگەڕا، پاشان هەمووان پێکڕا لە ژوورەکە چوونە دەرێ.

ڕازومیخین لەپشتیانەوە بە پلیکانەکاندا چووە خوارێ:

– یانی دەرگەکە قوفڵ نادەی؟

ڕاسکۆڵنیکۆف وەڵامی دایەوە:

– تا ئێستە شتی وای بە خۆیەوە نەدیوە... ئەوەش لەلایەک کە دوو ساڵە بەتەمام قوفڵی بۆ بکڕم!

جا بەدەم پێکەنینەوە بە سۆنیای گوت:

– کەسێ کە ئیشی بە قوفڵ و کلۆم نەبێ بەختەوەرە، وایە؟ ئەرێ بە ڕاست چۆن منت دۆزییەوە؟

ئەم ڕستەیەی دوایی بە شێوەیەک گوت وەک بڵێیت بیەوێت شتێکی دی بە کچەکە بڵێت. بە درێژایی ئەم ماوەیە دەیویست سەیری چاوی نیان و نیگای ڕوونی کچەکە بکات، کەچی دەتگوت توانای ئەنجامدانی وەها کارێکی نییە.

– دوێنێ خۆتان ناونیشانتان دایە پۆلینکای ئێمە!

– پۆلینکا؟ ئۆو، بەڵێ. پۆلینکا... مەبەستتان ئەو کچە بچووکەیە. خوشکتانە؟ دوێنێ ناونیشانم پێ دا؟

– هەر بە ڕاست بیرتان چووە؟

– نا، بیرم هاتەوە.

– لە باوکی خوالێخۆشبوومەوە باسی چاکەی تۆم بیستبوو... تەنیا ناوە بنەماڵەییەکەتانم نەدەزانی، ئاخر باوکیشم نەیدەزانی. ئێستە کە هاتم... دوێنێ زانیم ناوتان چییە... بەڵێ، ئێستە کە هاتم، پرسیم ماڵی بەڕێز ڕاسکۆڵنیکۆف لە کوێیە؟ نەمدەزانی ئێوەش تەنیا یەک ژوورتان بە کرێ گرتووە. دەی خواحافیز... کاترینا ئیڤانۆڤنا ئاگادار دەکەمەوە.

سۆنیا شاگەشکە بووبوو کە دواجار ئازاد بووە و دەتوانێت بڕوات؛ بارێک بە کۆڵییەوە داگیرابوو. سەری دانەواند و تا پێی کرا خێرا ڕۆیشت. دەیویست تا زووە لە چاو ون ببێت، ئەو بیست هەنگاوە تا

سەری پێچەکە ببڕێت و بە لای ڕاستدا لا بدات و دواجار تەنیا بێت؛ پاشانیش بەوپەڕی خێراییەوە دوور بکەوێتەوە و تەماشای تاقە مرۆڤێکیش نەکات و سەرنجیشی بەلای هیچ شتێکدا نەچێ... تا تەنیا و تەنیا بتوانێت بیر بکاتەوە و یەک بە یەکی ئەو وشانە بە گشت وردەکارییەکانەوە بیر خۆی بهێنێتەوە و، لە زەینیدا شەنوکەویان بکات. هەستێکی نوێی هەبوو کە تا ئەو ڕۆژە هەرگیز و هەرگیز تووشی نەبووبوو. دەتگوت دونیایەکی پەرتاپەڕ تازە -گەرچی ناڕوون و لە شوێنێکی نادیار- لە ناخیدا خەریک بوو شێوەی دەگرت. کتوپڕ بیری هاتەوە کە ڕاسکۆلنیکۆف گوتوویەتی بەتەمایە هەر ئەمڕۆ سەرێک لە ئەو بدات... لەوانەیە بەر لە نیوەڕۆ بچێت و یان تەنانەت هاکا ئائێستەش گەیشت!

دڵی بە جارێک داخورپا. دەتگوت بووەتەوە بە منداڵێکی تەرسەزاڵ کە خەریکی پاڕانەوەیە و هەر وا لەبەرخۆیەوە دەیورتاند: *ئەمڕۆ نا! تو خوا!!!... ئەمڕۆ مەیێ، ئەمڕۆ نا! مانا بۆ تۆ خوایە! گەر بێتە ژوورەکەم... هەموو شتێ دەبینێ... ئاخ خوایا!!!!!*

جا بێگومان بەو حاڵەوە نەیدەتوانی بەو غەوارەیە بزانێت کە پەیجۆریی دەکرد و هەنگاو بە هەنگاو بەدوایەوە بوو. غەوارەکە هەر لە بەردەگەکەی ڕاسکۆلنیکۆفەوە دوای کەوتبوو. کاتێک ڕازومیخین و ڕاسکۆلنیکۆف و سۆنیا بەر لە جیابوونەوە لە بەردەم پیادەڕێکەدا ڕاوەستان تا ماڵئاوایی بکەن، غەوارەکە کە خەریک بوو ڕادەبرد، بە هەڵکەوت چەند وشەیەک لە قسەکانی کچەی بەرگوێ کەوتن، *ئێستە کە هاتم، پرسیم ماڵی بەڕێز ڕاسکۆلنیکۆف لە کوێیە؟* جا لە سەرسامیان ڕاچەنی. تەماشایەکی خێرا بەڵام وردی هەر سێکیانی کرد، بەتایبەت تەماشای ڕاسکۆلنیکۆف کە سۆنیا خەریک بوو لەگەڵ ئەو دەدوا. پاشانیش لای کردەوە و لە خانووەکەی ڕوانی و شێوەکەی سپاردە یادگەی. هەموو ئەمانە لە چاوترووسکانێکدا ڕوویان دا و

کابرای غەوارە کە نەیدەویست بە هیچ شێوەیەک سەرنج ڕابکێشێت، درێژەی بە ڕێگەکەی دا، بەس وەک ئەوەی چاوەڕێی کەسێک بێت، هەنگاوەکانیی خاو کردنەوە. هەر واش بوو. چاوەڕێی سۆنیا بوو و بینیی کە ماڵئاواییان کرد و کچە بەرەو ماڵ کەوتە ڕێ.

بێگانەکە ڕووخساری سۆنیای هێنایە بەرچاوی و لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *تۆ بڵێی ماڵی لە کوێ بێ؟ من ئەم کچەم لە شوێنێ دیوە. دەبێ بچمە بنجوبناوانی.*

لە سەری پێچەکەوە چووە ئەوبەری شەقام، لای کردەوە و تەماشایەکی دواوەی کرد و بینیی سۆنیاش هەر لەو ڕێیەوە دێت و تەواو بێئاگایە. سۆنیا خۆی بە هەمان شەقامدا کرد. کابرای غەوارە لەوبەری شەقامەکەوە کەوتە شوێنی و کە پەنجا هەنگاوێک ڕۆیشت، دیسان پەڕییەوە ئەوبەر و تەنانەت خەریک بوو پێش کچەکەش بکەوێتەوە؛ لە کۆتاییدا مەودای نێوانیان بووبووەوە بە پێنج هەنگاوێک.

غەوارەکە پەنجا ساڵێک دەبوو، باڵای مامناوەند و تۆکمە و چوارشانە بوو. شانە پانەکانیی کەمێک بەرەو پێش دەچەماندنەوە و ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی قەمبوور دەربکەوێت. جلوبەرگەکەی گرانبایی و لە مۆدێلی ڕۆژ بوو، خۆش لە بەریدا وەستابوو و سەراپای لە کەسە گەورە بەشکۆکان دەچوو. گۆچانێکی گەورە و پتەوی بە دەستەوە بوو و لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا تەقەتەق بە زەوییدا دەکوتی. دەستکێشەکەشی تازە و پاکوپوختە بوو. ڕووخسارێکی پانی هەبوو بە ئێسکی دیارەوە، کە دەکرا بڵێیت دڵگیر بوو و تەواویش سووروسپی؛ لەو ڕەنگ و ڕووانەی کە بەو ئاسانییەی لە پیتەربورگدا دەست ناکەون. قژە درێژەکەی بە پڕی مابووەوە و لێرە و لەوێ تاڵی سپی لە سەریدا دەبینرا، تۆپەڵە ڕیشە بێئاساکەی لە قژی کاڵتر بوو. لێوەکانی سوور بوون و چاوە شینەکانی سارد و واق و تێفکرانە

تەماشـــای چواردەوری دەکرد. لەو پیاوانە بوو کە زۆر باش خزمەتی خۆی کردبوو و لەچاو تەمەنیدا فرە گەنجتر دەینواند.

سۆنیا کە گەیشتە قەراخ ڕێژاوەکە، بێجگە لە خۆی و غەوارەکە هیچ کەســێک لە پیادەڕێکەدا نەمابوو و پیاوەکە کاتی پێویســتی هەبوو تا تێبگات کە بیری کچەکە تا چەندە قاڵە و وڕ بووە. کە گەیشـــتنە ئەو بینایەی ماڵی سۆنیای لێ بوو، کچە لە دەرگەی سەرەکییەوە خۆی بە ژووردا کرد و پیاوەکەش کە ســـەری ســـووڕ مابوو، بەدوایدا تا حەساری بیناکە چوو. سۆنیا بە دەستەڕاستدا لای دا و لە پلیکانەکانی سووچی حەسارەکەوە سەرکەوت. غەوارەکە لەژێر لێوەوە ورتاندی *هەر ئەمەمان نەدیبوو!* جا ئەویش پلیکانەکانی گرتنە بەر و بەدوای سۆنیادا سەر کەوت و لێرانەدا بوو کە سۆنیا پێی زانی. سۆنیا تا نهۆمی سێ ڕانەوەستا و خۆی بە ڕێڕەوەکەدا کرد و زەنگی ئەپارتمانی ژمارە نۆی لێدا کە لەسەر دەرگەکەی بە تەباشیر نووسرابوو *کاپیرنائۆمافی بەرگدوور*. بێگانەکە لەم هەڵکەوتە سەیروسەمەرەیەش سەرسامتر بوو و دووبارە وردتاندییەوە *هەر ئەمەمان نەدیبوو!* جا خۆی زەنگی ئەپارتمانی ژمارە نۆی تەنیشت ئەوی لێدا. دەرگەکان ئەوپەڕی هەر شەش هەنگاوێک مەودایان لە نێواندا بوو.

پیاوەکە تەماشای سۆنیای کرد و پێکەنی:

– ئێوەش لە بینای کاپیرنائومۆفدا نیشـــتەجێن؟ هێلەکێکم هەبوو دوێنێ پێم دا تا چاکی بکاتەوە. منیش لەم تەنیشـــتەوەم، بینای خاتوو *ڕێسلیخ*، هەمان *گێرترودا کارلاونا*. ئای لەو هەڵکەوتە!

سۆنیا مت و وڕ لێی دەڕوانی و بێگانەکە بە شادییەکی تایبەتییەوە لەسەری ڕۆیشت:

– کەواتە دراوسێین. من سێ ڕۆژێکە هاتووم بۆ شارەکەی ئێوە. جارێ بە یارمەتیتان، بەهیوای دیدار، خاتوونی بەڕێز!

سۆنیا وەڵامی نەدایەوە؛ لەم کاتەدا دەرگەکەیان کردەوە و کچە خۆی بە ژووردا کرد. دیار نەبوو بۆچی تەریق دەبێتەوە و تا ڕادەیەکیش ترسی لێ نیشتبوو.

لە ڕێگەدا بەرەو ماڵی پۆرفێری، ڕازومیخین هەیەجانێکی بێڕادەی هەبوو و چەندبارەی کردەوە:

– زۆر باشە، کاکی خۆم، هەر زۆر باشە! بە ڕاستی خۆشحاڵم!

ڕاسکۆڵنیکۆف لەبەرخۆوە بیری کردەوە: *باشە تۆ بۆچی خۆشحاڵی ئاخر؟*

– هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات کە تۆش بارمتەیەکت لای ئەو پیرەژنە هەبێ!... جا ئێستە با بزانین... مەسەلەکە کۆنە؟ یانی ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر چووبووی بۆ ئەوێ؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بیری کردەوە: *ئاخۆ خوایە تۆ لەمە دەبەنگ و ساویلکەترت دروست کردووە!*

جا بۆ ساتێک وەستا تا بیری بێتەوە:

– کەی بوو؟ دووسێ ڕۆژ بەر لە مردنی بوو وا بزانم... وەلێ ئێستە نامەوێ ئەو وردەشتانە لە بارمتە دەربێنم!

جا وەک ئەوەی ترسی لێ نیشتبێت و پێداگرانە لە خەمی وردەشتەکاندا بێت، بۆی زیاد کرد:

– لەبەر ئەوەی هەمدیسان تاپلووچ[1] بوومەتەوە و تەنیا یەک ڕۆبڵی زیو لە گیرفانمدا ماوە... لەسایەی ئەو وڕێنە نەفرەتییەی دوێنێوە!

ڕاسکۆڵنیکۆف زۆر بە قورسی وڕێنەی گۆ کرد:

ڕازومیخین خێرا هاوڕایی خۆی دەربڕی، جا ئەوەش لەلایەک کە بە هیچ شێوەیەک دیار نەبوو لەبارەی چ شتێکەوە هاوڕایە:

– ها، بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ! کەواتە مەسـەلە ئەمە بوو کە لەو کاتەدا... لەسـەر خۆت نەبووی... دەزانی، کە تووشـی وڕێنە بووبووی هەر باسـی ئەنگوسـتیلە و زنجیر و ئەمانەت دەکردا... باشـە، باش بوو... ڕوون بووەوە. ئێستە ئیتر هەموو شتێ ڕوون بووەوە!

ڕاسکۆڵنیکۆف لەبەرخۆوە بیری کردەوە: *سەیرە! ئێستە تێکەیشتم ئەو گومانەی کەوتبووە سەریانەوە و دەم بە دەم لەنێویان گەڕا، چییە! ئائەم مرۆڤەی کە ئامادەیە لەبەر من لە خاچ بدرێ، کە دەرکەوت بەدەم وڕێنەوە باسی ئەنگوستیلە و زنجیرم دەکرد، ئێستە هەر دەڵێی دونیایان پێ داوە! دیارە کە یەک بە یەکیان خراپ گیرۆدەی ئەم مەسەلەیە بوونە!*

بە دەنگی بەرز پرسیی:

– تۆ بڵێی پۆرفیری لەماڵەوە بێ؟

ڕازومیخین بە پەلە گوتی:

– دەی بەڵێ لە ماڵەوەیە! کەسـێکی خۆشـە، ئێسـتە خۆت دەبینی کاکی خۆم! تۆزێکیش شـەرمنە، هەڵبەتە نەک ئەوەی کە کۆمەڵایەتی نەبێ، نا، من لە لایەنێکی دیکەوە گوتم شـەرمن. کەسـێکی زیرەکە، زۆریش زیرەکە، وەلێ شـێوازی بیرکردنەوەی تایبەت بە خۆی هەیە...

---

[1] تاپلووچ: قەلۆش؛ مایەپووچ.

بێمتمـانه و بەگومـان و بەدبینه... حەزی له یـاریکردن به مرۆڤ و شـــێواندنییەتی، یان تەنانەت وا بکا ئەوانی دی گەمژه بێنه بەرچاو... لەو شـێوازه ماتریالّییه داڕزیوانه... وەلێ چاک شـارەزای کارەکەیەتی، به تەواوی شـــارەزایه... پار دۆســـیەیەکی کوشـــتن هەبوو که تێیدا هەرچی ســـەرەداو و شـوێنپێ هەبوو سـڕابووەوه، وەلێ ئاخرییەکەی چووه بنجوبناوانی هەموو شـتێ! ئێسـتەش زۆر زۆر تامەزرۆی دیدار و ناسینی تۆیه!

– ئاخر بۆچی دەبێ ئەوەنده تامەزرۆی بینینی من بێ؟

– ئێ، نەک ئەوەی بلّێین... دەزانی، لەم دواییانەدا، یانی لەو کاتەوەی کەوتیته جێگه، زۆر جار ناوتم بردووه... دەی، پارفێریش دەیبیســـت... هەر که بیســـتی خوێنـدکـاری بەشـــی مـاف بوویته و نەتتوانیوه خوێندنەکەت تەواو بکەی، ئاهی لێ هەستا که جەخار! هەر لەبەر ئەوه بوو که گوتم تـامەزۆری دیـدارته... هەلّبەته نەک تەنیـا لەبەر ئەم قسەیەی، زۆر شت هەبوون؛ دوێنێ زامیۆتۆف... دەزانی ڕۆدیا، دوێنێ که بەڕێوه بووین بەرەو مالّ به ســـەرخۆشـــی دونیایەک قســـەی قۆڕم بۆ کردی... ئێســـته کاکی خۆم، دەزانی، خەمی ئەوەمه نەکا به خۆڕایی گەورەت کردبێ...

ڕاسکۆلّنیکۆف به زۆر بزەیەکی کرد:

– ئەوه چی دەلّێی؟ ئەوەی که هاوڕێیان لایان وایه دێوانەم! باشـــه، خۆ لەوانەشه ناهەقیان نەبێ!

– بەلّێ... بەلّێ... مەبەســـتم ئەوەیه که، ئەی خوا به نەفرەتت کا!... دوێشـــەو هەرچیم گوت (ئاخر باسـی شـتگەلێکی تریش کرا وا بزانم) هەلّیتوپەلّێت بوو و کۆمەلّێک قسەی کاتی سەرخۆشی...

ڕاسکۆلّنیکۆف به تووڕەییەکی سەیرەوه هاواری کرد:

– ئێستە بۆچی پاساو دەهێنیتەوە؟ بەسە ئیتر، بەم قسانە تێک دەچم!

هەڵبەتە توورەییەکەشی تا ڕادەیەک درۆیینە بوو.

– دەزانم، دەزانم، تێدەگەم! خەمت نەبێ، من چاک لە حاڵت تێدەگەم! ئاخ خۆ پیاو تەنانەت ڕووشی نایێ قسەی خۆی بکا...

– کە ڕووت نایێ کەواتە باسی مەکە!

هەردووکیان وسکت بوون. ڕازومیخین نەیدەتوانی ورووژانی خۆی جڵەو بکات و هەر ئەمەش ڕاسکۆڵنیکۆفی پەست دەکرد. لە لایەکەوە قسەکانی ڕازومیخین سەبارەت بە پۆرفێری بێتاقەتیان کردبوو. ڕەنگی وەک گەچ سپی هەڵگەڕا و لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *ئێستە دەبێ لەبەردەم ئەم کابرایەشدا هەمدیسان بکەومەوە باسی مەسەلەی تاپلووچییەکەم، جا زۆریش ئاسایی! وەلێ ئاساییترین کار ئەوەیە کە ئەسڵەن قسەی زۆر نەکەم! یانی بە باشی هەست و هۆشم چڕ بکەمەوە... نا، گەر بڕیار بێ هەست و هۆشم چڕ بکەمەوە خۆ ئاسایی دەرناکەوێ... دەی، با بزانین چیی بەسەر دێ... با بزانین چی دەبێ جارێ... ئەوەندەی نەماوە... ئەسڵەن ئەوە ڕاستە کە من وا دەڕۆم؟ دەڵێی مەسەلەی پەپوولە و مۆمە! دڵم تەپەتەپەتی... هەر ئەوەم کەم بوو!...*

ڕازومیخین گوتی:

– گەیشتین، ئەم بینایە خۆڵەمێشییە...

ڕاسکۆڵنیکۆف هەر وا لەبەرخۆیەوە بیری دەکردەوە: *ئێستە خاڵە سەرەکییەکە ئەوەیە کە پۆرفێری ئاگادارە من دوێنێ لە ماڵی ئەو قرچۆڵە بوومە یان نا... یانی دەزانێ من چوومەتە ئەوێ و باسی خوێنم کردووە؟ دەبێ هەر کە چوومە ژوور، دەرکی پێ بکەم کە شتێ*

*دەزانی یان نا، دەبێ لە ڕووخسـاریدا بیخوێنمەوە، گەرنا... گەر گیانیشم دانابێ دەبێ سەر لەوە دەربێنم کە شتێ دەزانێ یان نا!*

کتوپڕ بزەیەکی فێڵبازانەی کرد و بە ڕازومیخینی گوت:

– کاکی خۆم، هەر بەیانی شـەنوکەوم کردی، جێ بە خۆت ناگری ئەمڕۆ! خۆ هەڵە تێنەگەیشتووم!

ڕازومیخین خۆی کۆ کردەوە:

– جێ بە خۆم ناگرم؟ نا، وەها شتێ لەئارادا نییە. بە هیچ شێوەیەک وا نییە!

– بۆچی کاکی خۆم، بە تەواوی ڕوونە! ئەوە باسی دانیشتنت هەر مەکە، بە جۆرێ لەسەر لێواری کورسییەکە دانیشتبووی کە تا ئێستە شتی وام نەدیبوو. هەر جموجووڵت بوو و پێچت دەدایە خۆت! لەسەر جێگەکەت نەدەسـرەوتی، لە خۆڕا هەڵبەزودابەزت بوو! یان تەواو توورە بوویت یان ڕووخسارت دەبووە هەنگوین! تەنانەت ڕووخسارت داگیرسا... بەتایبەت کە بۆ شێو داوەتیان کردی، بە چەشنێک سوور هەڵگەڕای کە شتی وا نەبوو!

– هەمووی هەڵیتوپەڵیتە، بە هیچ شـێوەیەک وا نەبوو!... مەبەستت چییە؟

– سـەیری‌کە توو خوا، خەریکە وەک منالی قوتابخانە نکۆڵیی لێ دەکا! ئەک شـەیتان بە نەفرەت بی... خۆ دیسـان ڕووخسـارت داگیرسایەوە!

– زۆر ناپیاوی!

– ئێ بۆچی خۆت قەڵس دەکەی؟ گوێ بگرە، *ڕۆمیۆ*! ئائەمڕۆ باسی ئەو حاڵەت بۆ کەسێ دەکەم! جا چاوەڕێ بە و ببینە، هاهاها! دەتوانم دایە گیان بخەمە سەر قاقای پێکەنین و ئەویش...

ڕازومیخین لە ترسان وشک بووبوو و دیار نەبوو چی دەڵێ:

– گوێ بگرە، گوێ بگرە، گوێ بگرە بزانە چی دەڵێم، ئەم مەسەلەیە گاڵتە هەڵناگرێ ها... سـەیرکە، شـەیتان بە نەفرەت بێ، قسـە هەڵنەبەسـتی... ئاخر دەتەوێ چییان پێ بڵێی؟ من، کاکی خۆم، ئاخ کابرایەکی چەندە ناپیاوی تۆ!

– بوویتە سـوورەگوڵی دەمەو بەهاران! حەیفە کە خۆت نابینی چەندە لێت دێ؛ ڕۆمیۆ دمیترییەک بە شـەشونیو پێ باڵاوە! چاک خۆشـت ڕازاندووەتەوە ئەمڕۆ، دیارە، یانی تەنانەت ڕۆمیۆ نینۆکەکانیشـی کردوون، ئەرێ؟ هەر ئەمەمان نەدیبوو! کەی بوو دواهەمین جارێک کە پەرژایتە سـەر دەسـت و نینۆکت؟ خوایە، تەماشایکە، خۆ ڕۆنیشی لە قژی داوە! دانەوێ بزانم!

– تەماشا، زۆر ناپیاوی!

وا دیاربوو ڕاسـکۆڵنیکۆف ناتوانێت بەر بە پێکەنینی خۆی بگرێت، هەر پێدەکەنی و پێدەکەنی. هەر وا بەدەم حیلکەحیلکەوە چوونە ناو ئەپارتمانەکەی پۆرفیری پیترۆڤیچەوە. ڕاسـکۆڵنیکۆفیش هەر ئەوەی دەویسـت کە ئەوانی دیکە لە ناوەوە بزانن کە ئەوان وا خەریکە بەدەم گاڵتەوگەپ و پێکەنینەوە دێنە ژوور و فیلەفیل و قاقایان ڕاڕەوەکەی تەنیوەتەوە.

ڕازومیخین چنگی بە شـانی ڕاسـکۆڵنیکۆفدا کرد و زۆر توورە ورتاندی:

– سـەیرکە، یەک وشـە، لێرە گەر تەنیا یەک وشـەت لە دەم بێتە دەر... دەتپلیشێنمەوە!

## پێنج

ڕاسکۆلنیکۆف بەدەم ئەم بەزمەوە گەیشتبووە ژووری دانیشتن. سەروسیمای هاواری دەکرد کە بە زۆر خۆی گرتووە تا هەمدیسان لە تریقەی پێکەنین نەداتەوە. ڕازومیخین، ڕازومیخینیش قەلۆر و گرژ، بە شپرزەیی و شەقاوی درێژەوە هاتە ژووریَ و لەپشتییەوە دەهات، تەواو پەست بوو و ناوچاوی دابوو بە یەکدا و هەڵبەتە لە شەرماند وەک گوڵەپیۆنی[1] سوور هەڵگەڕابوو؛ ساتی هاتنەژوور سەروسیمای هێندە گاڵتەجارانە بوو کە بە تەواوی پاکانەی بۆ پێکەنینەکەی ڕاسکۆلنیکۆف کرد. هێشتا کەس بە کەس نەناسرابوو، بەڵام ڕاسکۆلنیکۆف چاوەڕوانیی نەکرد و ڕوو لە خانەخوێکەیان، کە لە ناوەڕاستی ساڵۆنەکەیاندا ڕاوەستابوو و پرسیارکەرانە لەوانی دەڕوانی، سەری دانەواند، دەستی بەرەو ئەو ڕاکێشا و تەوقەیان کرد. وا دیار بوو بێهوودە دەکۆشێت تا پێکەنینەکەی کپ بکاتەوە و لانیکەم بۆ خۆناساندنەکەی چەند وشەیەک پێکەوە بنێ، وەلێ هێشتا نەیتوانیبوو سیمایەکی جددی بداتە خۆی و لەژێر لێوەوە شتێک بڵێ کە هەمدیسان -وەک ئەوەی بە هەڵکەوت بێت- چاوی بە ڕازومیخین کەوت و ئیدی کار لە کار ترازا. ئەو پێکەنینەی کە بە درێژایی ئەو ماوەیە بەو تەقەڵلایەوە بەندی کردبوو، تەقییەوە و ئیدی هیچ شتێک بەری پێ نەدەگرت. پەستبوونی ڕازومیخین لەم پێکەنینەی کە لە دڵەوە دەهات، وای کرد ئەو دیمەنە و شادییەکەی، بێڕادە سرووشتی

---

[1] Peony: بە فارسی گوڵی سەدتمەنی، بە عەرەبی «عود الصلیب».

و خۆرسک بێتە بەرچاو. ڕازومیخینیش وەک بڵێت بە دەسئەنقەست و ڕێک لە کاتی خۆیدا یارمەتیی سرووشتیترکردنی دۆخەکەی دا:

– ئەی شەیتان بە نەفرەت بی!

نەڕاندی و بە جۆرێک دەستی ڕاوەشاند کە توند بەر ئەو مێزە خڕ و بچووکە کەوت کە پیاڵەچایەکی خاڵیشی بەسەرەوە بوو. ئیدی بەم جۆرە هەموو شتێک هەڵبەزییەوە و بە زەوییەکەدا پەرش بوو.

پۆرفیری پیترۆڤیچ بە شادییەوە هاواری کرد:

– باشە ئێستە بۆچی کافێکە تێک دەدەن، بەڕێزان؟ دەزانن بەمە زیان لە دەوڵەت دەدەن!

ئێستە دیمەنەکە بەم جۆرە بوو: ڕاسکۆڵنیکۆف هێشتا دەست لەناو دەستی پۆرفیری پیترۆڤیچدا پێدەکەنی، وەلێ دەترسا کە نەکا زیادەڕۆیی کردبێت و چاوەڕێی ساتێک بوو تا بتوانێت زۆر بە ئاسایی سەر لە هەموو شتێکی مەسەلەکە دەربکا. شێواندنی مێزەکە و وردوخاشکردنی پیاڵەکە، بە تەواوی ڕازومیخینی شەرمەزار کرد. تەماشای پارچەکانی پیاڵەکەی کرد، پرتەپرت دەستی کردە جنێودان و توند بەرەو پەنجەرەکە وەرچەرخا. لەوێ لە بەرپەنجەرەکەدا ڕاوەستا و پشت لە ئامادەبووان خۆی بە سەیرکردنی دەرەوەوە سەرقاڵ کرد؛ چرچ کەوتبووە ناوچاوییەوە و پێدەچوو چاویشی هیچ شتێک نەبینێ. پۆرفیری پیترۆڤیچ پێکەنی و دڵیشی پێوە بوو لە قاقا بدات، وەلێ دیار بوو کە چاوەڕێشە لەم بارەیەوە ڕوونکردنەوەیەک ببیستێت. زامیۆتۆف سەرەتا لەسەر کورسییەکی سووچێکی ساڵۆنەکەدا دانیشتبوو، وەلێ لەگەڵ هاتنەژووری میوانەکاندا نیوخێز بوو و ئێستەش بزە لەسەرلێو چاوەڕێ مابوو و ئەوەش لەلایەک کە سەرسام و باوەڕنەکردە لەم دیمەنەی دەڕوانی و ڕاسکۆڵنیکۆفیش تەنانەت بە نیگەرانییەکی زۆرەوە سەیری دەکرد. ڕاسکۆڵنیکۆف بە

ئامادەبوونی کتوپڕانەی زامیۆتۆف ڕاچەنی و بە زەینیدا ڕابرد: *باشە ئەمە بە ناخێری گیانی چی دەکا لێرە؟*

بە شەرمەزارییەکی زۆری دەستکردەوە سەری قسەی کردەوە:

– تکا دەکەم، بمبوورن... من ڕاسکۆڵنیکۆفم...

– ڕێزتان هەیە، وا مەفەرموون قوربان، بە بینینتان زۆر زۆر خۆشحاڵم... هەروەها زۆر خۆشحاڵتریشم کە ئاوها کەیفساز هاتنە ژوور...

پۆرفیری پیترۆڤیچ بە سەر ئاماژەی بۆ ڕازومیخین کرد:

– ئەی هاوار، نایەوێ بەیانیباشێکیش بکا ئەم پایەبەرزە؟

– بە شەرەف هەر نازانم بۆچی ئاوا لێم پەست بووە! بەدەم ڕێوە تەنیا پێم گوت لە ڕۆمیۆ دەچی... جا قسەکەشمم سەلماند؛ خوا شاهێدە هەر ئەوەندە بوو!

ڕازومیخین بێ ئەوەی ڕوو لە پەنجەرەکە وەرگێڕێ، گوتی:

– ئەی نارەسەن!

پۆرفیری پێکەنی:

– هەڵبەتە هۆکاری خۆی هەیە کە ئاوا لەم قسەیەت پەست بوو.

– ئای لەدەستی تۆ! جەنابی لێکۆڵەر!... دەک پێکڕا هەمووتان بە تووندا بچن!

ڕازمیخین بە قینەوە ئەمەی گوت، بەڵام دواتر وەک ئەوەی کە هەر هیچ نەبووبێت، خۆیشی کەوتە پێکەنین و بە ڕووخسارێکی شادەوە چووە لای پۆرفیری:

– باشـــە دەی، بەســـە! هەموو کۆمەڵێک دەبەنگین! با خەریکی ئیشەکەمان بین: ئەمان هاوڕێی منن، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ ڕاسکۆلنیکۆف، یان هەمان ڕۆدیاکەی خۆمان. ســـەرەتا باســـی چاکەی تۆی زۆر بیستووە و دەیەوێ پێت ئاشنا بێ؛ جا دواتر کارێکی بچووکیشی پێت هەیە. ئۆو! زامیۆتۆف خـان، تۆ لە کوێ و ئێرە لە کوێ؟ یـانی ئێوە یەکتری دەناسن؟ ئەمە لە کەیەوە بە خێر؟

ڕاســـکۆلنیکۆف کەوتە دڵەڕاوکێ و لەبەرخۆیەوە گوتی: *مەســـەلە چییە؟*

زامیۆتۆف دەتگوت تا ڕادەیەک بەمە حەپەسـاوە، چونکە خەمسـارد و هێمن وەڵامی دایەوە:

– لە ماڵە نوێکەی ئێوەدا یەکترمان ناسی، هەر دوێنێ!

– باشـــە، کەواتە ســـەرئێشـــەی من کەمتر بووەوە. پۆرفێری، ئەم جەنـابی زامیۆتۆفە بە درێژایی هەر حەوت ڕۆژەکەی حەفتە لە کۆڵم نەبووەوە و هەر تکای کرد کە بە تۆی بناسـێنم! کەچی ئێسـتە دەبینم هەردووک یەکتریتـان دۆزیوەتەوە... ئەرێ بە ڕاســـت، تۆ تووتنت هەبوو، ئەی کوا؟

پۆرفێری پیترۆڤیچ جلی ماڵەوەی لە بەردا بوو و بە ژێرکراســـێکی تەواو پاکوخاوێنەوە و، جووتێک پاپووچی پاژنەبەرزیشـی لە پێدا بوو. تەمەنی سیوپێنج ساڵ بوو. باڵاکورت بوو بە ڕووخسارێکی پاکتاشراو (کە تاڵە موێکیشت لە دەموچاویدا بەدی نەدەکرد) و قەڵافەتێکی قەڵەو و ورگی دەرپەڕیوەوە. قژەکانیی کورتکورت دەکردنەوە و ســـەرێکی خڕ و گەورەی هەبوو و بەتـایبەت پشـــتەســـەری فرە خڕ بوو. ڕووخســـــاری هەڵمـاســـیو و خڕی بەو لووتە کورت و قنجەوە، زەردییەکی نەخۆشـــانەی هەبوو کە ژووژەڵە و بگرە گاڵتەجاڕانەش دەهاتە بەرچاو. تەنانەت دەکرا بە پاکســـرووشـــتیش لە قەڵەمی بدەیت

ئەگەر ئەو نیگا تایبەتەی نەبا کە بریقەیەکی تەڕ و ناڕوونی هەبوو لەگەڵ ئەو برژانگە کەم تا زۆر سـپیانەی کە هەمیشـە تـرووسـکەیان بوو. نیگای بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ سیمای ژنانەیدا یەکی نەدەگرتەوە و بە جۆرێکی هەتەر نیشـانی دەدا کە بە یەکەمین سـەرنج نەدەکرا سۆسەی بکەیت.

پۆرفێری پیترۆڤیچ هەر کە بیسـتی میوانەکەی کارێکی بچووکی هەیە، فەرمووی لێ کرد تا لەسـەر قەنەفەکە دابنیشـێت و خۆیشـی تامەزرۆیانە لە سـووچی ئەوسـەری قەنەفەکەوە دانیشـت و واقی بە میوانەکەدا وڕ ما تا بزانێ چیی دەوێ؛ وەلێ ئەم جۆرە سـەرنجدان و جددییەتە زیاد لە ڕادەیە، هەم ئازاردەر بوو و هەم سـەرلێشـێوێن، بەتـایبەت گەر بەرانبەرەکە غەوارە بێـت و لە دیـدی خۆشـییەوە کێشـەکەی ئەوەش نەهێنێ کە ئەم تـامەزرۆیـی و سـەرنجە باوەڕپێنەکراوەی پێ بدرێت. بەڵام ڕاسـکۆلنیکۆف کورت و پوخت و بەپێز قسـەی خۆی کرد و هێندەش بە شـێوازی کارامەییەکەی خۆی دڵخۆش بوو کە تەنانەت نەیتوانی بە باشـی پۆرفێری هەڵبسـەنگێنێت. پۆرفێری پیترۆڤیچیش لە یەکەم سـاتەوە چاوی لە ڕاسـکۆلنیکۆف کلا نەکردبوو. ڕازومیخین کە ڕووبەڕووی ئەوان و لەپشت هەمان مێزەوە دانیشـتبوو، بەدەم گوێگرتن لە ڕوونکردنەوەکانی ڕاسـکۆلنیکوفەوە جێی بە جۆی نەدەگرت و، نیگاشـی هەر سـاتەو لەسـەر یەکێکیانەوە فڕکەی دەکردە سـەر ئەوی دیکەیان، بە جۆرێک کە وا دەردەکەوت ئەویش زیاد لە ڕادە جددییە.

ڕاسـکۆلنیکۆف خەریک بوو لەبەرخۆیەوە جنێوی بەو دەدا: *ئای دەبەنگ!*

وەلێ شێوازی قسەکردنی پۆرفێری زیاد لە ڕادە پیشەییانە بوو:

– ئێوە دەبێ بە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس ڕابگەیەنن کە هەواڵی ڕووداوەکەتان بیستووە... مەبەستم هەمان ئەم هەواڵی کوشتنەیە... ئینجا داوا دەکەن بەرپرسی دۆسییەکەی ئاگادار بکەنەوە کە فلان و فیسارە شت هی ئێوەیە و دەتانەوێ وەریبگرنەوە... یان شتێکی لەم جۆرە... وەلێ هەرچۆنێک بووە ئەوان وەڵامتان دەدەنەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف هەموو توانای خۆی کۆ کردەوە تا شەرمەزار و پەشۆکاو دەرنەکەوێت:

– کێشەی منیش ئەوەیە کە ئێستە گیرفانم خاڵییە و... تەنانەت ئەم چەند پەنابایەش بۆ من پارەیەکی زۆرە... تەماشا، تەنیا دەمەوێ ڕایگەیەنم کە خاوەنی ئەو دوو شتە منم و هەر کات شتێکم هاتە دەست، پارەکەی...

– هیچ جیاوازییەکی نییە...

باسی نەهامەتییەکانی ڕاسکۆڵنیکۆف و بەسەرهاتی قەلۆشییەکەی هیچ کاریگەرییەکی نەخستبووە سەر پۆرفیرێ:

– وەلێ گەر حەزیشتان کرد، ئەوا ڕاستەوخۆ نامەکە بۆ من بنێرن. بەپێی هەمان ئەو ڕێوشوێنەی کە باسم کرد، بنووسن هەواڵی ڕووداوەکەتان پێ گەیشتووە و فلانە شت هی ئێوەیە و داواکارن کە...

ڕاسکۆڵنیکۆف دەرفەتی نەدا و پەڕییە نێو قسەکانی پۆرفیرێ، دەیویست هەمدیسان نیشانی بداتەوە کە چەندە لە لایەنە ماددییەکەوە کۆڵەوارە.

– دەکرێ لەسەر کاغەزێکی ئاساییش بینووسم؟

– بەڵێ، قوربان، لەسەر سادەترین کاغەز.

پۆرفیری پیترۆڤیچ کتوپڕ نیگـایەکی پڕ لە تـانەی ڕوونی گرتە ڕاسکۆڵنیکۆف و بە جۆرێک چاوەکانیی زیت کردنەوە کە دەتگوت چاو دادەگرێ. هەڵبەتە ڕاســکۆڵنیکۆف تووشــی خەیاڵات بووبوو، چونکە ئەمە هەمووی یەک ســاتیشــی نەخایاند. هەرچۆنێک بووە شــتێکی گوماناوی لەئارادا بوو. ڕاسـکۆڵنیکۆف ئامادە بوو سـوێند بخوات کە پۆرفیری چـاوی لێ داگرتووە. هەر بە تەنیـا خواش دەیزانی بۆچی، بەڵام برووسکەئاسا بیرێکی بە زەیندا هات: *کابرا گومانی کردووە!*

دەتگوت گریمانەکانی ڕاست دەرنەچوونە. ئینجا بە دەنگێکی بەرز و کەمێک پەرێشانەوە درێژەی پێ دا:

– ببوورن کە لەبەر ئەم بـابەتە هـاکەزاییە ئێوەم ئەزیەت دا؛ ئەو دوو شــــتە ئەوپەڕەکەی پێنج ڕۆبڵێک دەکەن بەس بۆ من زۆر زۆر خۆشەویست و بەبەهان، ئەو کەسانەم بیر دەهێننەوە کە پێشکەشیان کردووم. دانی پێدا دەنێم لە ترســــان خەریک بوو ببوورێمەوە کاتێ بیستم...

ڕازومیخین بە جۆرێـک پەرییە نێو قســـەکـانی کە دیـار بوو مەبەستێکی هەیە:

– هەر لەبەر ئەوە بوو کـاتێ گوتم زۆســـیمۆف خەریکە بەدوای خاوەنی بارمتەکاندا دەگەڕێ، تۆ ئاوها ڕاچەنییت و تێک چووی!

ڕاســکۆڵنیکۆف ئیدی بەرگەی ئەم قســەیەی دوایی نەدەگرت، خۆی نەگرت و تیری نیگای ژەهراویی چاوە ڕەشـــەکانیی گرتە ڕازومیخین، بەڵام دەمودەست خۆی کۆ کردەوە و لێزانانە سیمایەکی بەدخووانەی بەخشییە خۆی:

– تۆش خەریکی گاڵتەپێکردنمانی، کاکە؟ تێدەگەم، ئەم دوو شـــتە وردەڵەیە لەوانەیە بە لای تۆوە هیچ نەبن و شــــیـاوی ئەم هەموو بێنەوبەردەیە نەبن، بەس نابێ وا بزانی من خۆپەرســـتم، یان چاوم

بەدوای ماڵی دونیاوەیە؛ لەوانەیە ئەم وردەواڵانە بەلای منەوە هێندەش بێبەها نەبن و زۆرم بۆ گرنگ بن! هەر ئێستە خەریک بووم بۆم باس دەکردی کە ئەو کاتژمێرە یەک پەناباڵیش ناکا، وەلێ ئەوە تاکە یادگاریی باوکمانە! حەز دەکەی تا بەیانی پێبکەنە، بەس دایکم لێرەیە و...

ڕاسکۆڵنیکۆف کتوپڕ بەرەو لای پۆرفێری وەرچەرخا:

– ... جا خوانەخواستە گەر گومان بکا...

هەمدیسـان خێرا ڕووی لە ڕازومیخین کردەوە و هەوڵی دا تا دەکرێ لەرزینێک بخاتە دەنگییەوە:

– کە کاتژمێرەکەی باوکم ون بووە، پێی بێتاقەت دەبێ! خۆت ژن و شت دەناسی!

ڕازومیخین زویر بوو و هاواری کرد:

– نا، بە هیچ شـێوەیەک! خۆ مەبەسـتم ئەوە نەبوو، بە گشـتی قسەکەی من شتێکی تر بوو کاکە گیان!

ڕاسـکۆڵنیکۆف پەرێشـان و لەرزۆک بە خۆیی گوت: *کارەکەم باش بوو؟ ئاسـایی دەرکەوت؟ زیادەڕۆیی تێدانەبوو؟ ئاخر بۆچی گوتم خۆت ژن و شت دەناسی؟*

پۆرفێری پیترۆڤیچ دیار نەبوو بۆچی لەم بێنەوبەردەیەدا پرسیی:

– ئۆو، دایکتان هاتووە بۆ لاتان؟

– بەڵێ.

– کەی هاتوون؟

– دوێنێ عەسر.

پۆرفیری وەک ئەوەی لە زەینیدا خەریکی سەنگوسووککردنی پرسیارێک بێت، ئێستێکی کرد و پاشان زۆر سارد و هێمن درێژەی پێدا:

– هەرچۆنێک بووە شتەکانی ئێوە پارێزراو دەبن، من دەمێک بوو لێرە چاوەڕێتان بووم.

ئەمەی گوت و بە ڕووالەت وا دەرنەدەکەوت کە ئاماژەی بە خاڵێکی گرنگ کردبێ، چونکە هەر نەتدەگوت قسەیەکی تایبەتی کردووە، تەپڵەکێکی بۆ ڕازومیخین خزاند، کە بێبەزەییانە و بێباک سووتووەکەی دادەتەکاندە سەر فەرشەکە. ڕاسکۆلنیکۆف ڕاچەنی، وەلێ پۆرفیری هێشتا سەرقاڵی تەپڵەکەکەی ڕازومیخین بوو و بەو جۆرەی کە دەردەکەوت، ئاگاداری هیچ شتێک نەبوو.

ڕازومیخین هاواری کرد:

– چیت گوت؟ چاوەڕێی بووی تۆ؟ بۆچی؟ بۆ دەتزانی کە ئەویش لای پیرێژنەکە بارمتەی هەیە؟

پۆرفیری پیترۆڤیچ ڕووی دەمی کردە ڕاسکۆلنیکۆف:

– بارمتەکانی ئێوە، هەمان ئەڵقە و کاتژمێرەکە، پێکەوە کاغەزێکیان لێوە پێچابوون و لەسەر کاغەزەکەش بە دەستخەتێکی زۆر ناخۆش ناوتانیان نووسیبوو، ڕێککەوتی ئەو ڕۆژەشی لەسەر بوو کە بارمتەکەتان دانابوو...

– چۆنە ئاوها وردن؟

ڕاسکۆلنیکۆف بزەیەکی لارووێری هاتێ و خۆی ناچار کرد چاو ببڕێتە ڕووخساری پۆرفیری، بەڵام نەیتوانی و کتوپڕ بۆی زیاد کرد:

– نەبێتە ڕووداری! ئەمەم بۆیە گوت، لام وایە بارمتەکان یەک دانە و دوو دانە نەبوونە خۆ... ئاســـان نییە هەموویانت بیر بمێنن... وەلێ ئێوە زۆر باش هەمووتان بیر ماون و... جا...

لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *کەمژانە بووا جێی داخ بووا باشــە من بۆ ئەمەم ڕێسا؟*

– ئاخر ئەوانەی کە بارمتەیان هەبوو، هاتن و ئێســتە دەیانناســین، بێ لە ئێوە. ئێوە تەنیا کەسن کە نەهاتنە پێش.

پۆرفێری بە دەنگێک وەلامی دایەوە کە نەدەکرا بڵێیت تانەئامێز بوو.

– تۆزێک نەخۆش بووم.

– بەڵێ، ئاگادارم. تەنانەت بیســتیشــم کە زۆر زۆر نیگەرانی شــتێک بوون. ئێوە ئێستەش ڕەنگوبۆیەکی واتان پێوە نییە!

ڕاســـکۆڵنیکۆف، لە وەلامدا، بێڕێز و بەدخووانە پێیدا هەڵشـــاخا و تەنانەت بە تەواوی ئاوازی دەنگیشی گۆڕابوو:

– ڕەنگوبۆم وەک خۆیەتی... ئەسڵەن بە پێچەوانەوە، زۆریش باشم!

ســـات دوای ســـات زیاتر بە قیندا دەچوو و نەیدەتوانی پێش بە هەڵچوونی خۆی بگرێت. هەمدیســـان برووســـکەئاســـا بیرێک هاتە سەروەختی: *گەر تووڕە ببم، ئاخربیەکەی شــتێکم لە دەم دەردەچێ و خۆم تووش دەکەم. بۆچی ئازارم دەدەن ئەمانە؟*

ئەم جارەیان ڕازومیخین خۆی هەڵقورتاند:

– گوتی هەر زۆر باشــم؟ هەر ئەمەمان نەبیســتبوو! دوێنێ هەر لە بەیانییەوە تا درەنگانی شــەو بێهۆش بوو و وڕێنەی دەکرد. پۆرفێری، باوەڕ دەکەی هەر کە من و زۆســـیمۆف چاومان لێ لادا، ســـەرەڕای ئەوەی کە بە زۆریش دەیتوانی جل لە بەر بکا و بە پێوە بوەســـتێ،

بۆی دەرچوو و هەموومانی نارد؟ کاکم تا نیوەشەو خەریکی ویڵگەڕی و ڕابواردن بوو... بە درێژایی ماوەکەش وڕێنەکردنێکی پیسی لەگەڵ بووە! دەتوانی وێنای بکەی! خۆ من تا ئێستە شتی وام نەدیوە!

پۆرفیری بە شێوەیەکی ژنانە سەری لەقاند:

– سەیرە! وڕێنەکردنێکی پیس؟ باسی بکەن، با بزانین!

ڕاسکۆلنیکۆف تووڕە بوو و جڵەوی زمانیی لەدەست دەرچووبوو:

– ئەی هاوار، قسەی بەلاش دەکا! باوەڕ بەو هەڵیتوپەڵیتەی نەکەن! گەرچی ئێوە بێ ئەوەی منیش بیڵێم، باوەڕ بە وەها شتێ ناکەن!

بەڵام پۆرفیری پیترۆڤچ دەتگوت ئەم چەند وشە نائاساییەی هەر نەبیستن.

ڕازومیخین گەرم بوو:

– دەی ئەگەر جەنابی پایەبەرزت وڕێنەت نەبووە، چۆن بوو بۆی دەرچووی؟ ئەی لە دەرەوە ئیشت چی بوو؟ بەدوای چییەوە بووی؟... بۆچی بە دزییەوە ڕۆیشتی؟ ئەسڵەن ئەو کاتەی کە خەریک بووی دەچوویە دەرێ، هۆشت لەسەر خۆت بوو؟ ئێستە ئیتر مەترسییەکە تێپەڕیوە و وا ڕاستگۆیانە قسەی لەسەر دەکەم!

ڕاسکۆلنیکۆف کتوپڕ بە بزەیەکی ژەهراویی بێشەرمانەوە ڕووی کردە پۆرفیری:

– دوێنێ ئیتر خەریک بوو بەدەست ئەمانەوە تێک دەچووم! ویستم بیانخەڵەتێنم و بچمە شوێنێک کە دەستی کەسم پێ ڕانەگا و هەرچی پارەش هەبوو لەگەڵ خۆمدا بردم! ئەم بەڕێز زامیۆتۆفە پارەکانی بینین. خراپ نییە ئێوە باسی بکەن، جەنابی زامیۆتۆف، من دوێنێ وڕێنەم دەکرد یان هۆشم لەسەر خۆی بوو؟ ئەم کێشەیە یەکلایی بکەرەوە دەی!

ڕاسـکۆڵنیکۆف دەیتوانی دەسـتبەجێ زامیۆتۆف بخنکێنێ، چونکە لەئاست نیگای زەق و بێدەنگیی پیاوە گەنجەکەدا خۆی پێ ڕانەدەگیرا.

زامیۆتۆف وشک و بە زۆر وەڵامی دایەوە:

– بە بۆچوونی من قسـەکردنی ئێوە زۆر ئاقڵانە بوو و تەنانەت دەتوانم بڵێم لێهاتووانە... هەر ئەوەندە هەبوو کە زیاد لە ڕادە توورە بوون.

پۆرفیری پیترۆڤیچ هاتە نێو باسەکەوە:

– نیکۆدیم فۆمیچیش ئەمڕۆ پێی گوتم کە درەنگانی دوێشەو ئێوەی لە ماڵی ئەو پیاوەدا دیوە کە گالیسـکە کردبووی بە ژێرەوە... یارۆ فەرمانبەرەکە...

ڕازومیخین گوتی:

– دە فەرموو، هەمدیسـان باسـی فەرمانبەرەکەیە! دەی، کارەکەت شـێتانە بووە ئیتر، بۆ مرۆڤی ئاقڵ وەها کارێ دەکا؟ هەموو پارەکەی خۆتت دایە ژنەکەی بۆ ڕێورەسـمی بەخاکسـپاردن. دەتویسـت خێرێ بکەی؟ دەی پازدە یان تەنانەت بیسـت ڕۆبڵت پێ بدابا و لانیکەم سـێ ڕۆبڵت بۆ خۆت گل بداباوە... بەس جەنابی پایەبەرزت دەبوو هەر هەمووی بدەیتێ بۆ ئەوەی دڵت ئاو بخواتەوە!

– کێ نـاڵێ من گەنجینەیەکم نەدۆزیوەتەوە و تۆ لێی بێئاگای! هۆکاری دەسـتودڵکراوەییەکەی دوێنێشـم هەر ئەوە بووە!... جەنابی زامیۆتۆف کە لەوێ دانیشـتووە، چاک دەزانێ من گەنجینەم دۆزیوەتەوە!...

ڕاسـکۆڵنیکۆف بە لێوی لەرزۆکەوە ڕووی کردە پۆرفیری و درێژەی پێ دا:

– توو خوا بمانبوورن که وا نیوکاتژمێره خەریکین بەم قسـانه پروپووچانه کاتتان دەکوژین. بێزارمان کردن، وایه؟

– نا، ڕێزتان هەیە... بە پێچەوانەوە، تەواو بە پێچەوانەوە! خۆزگە خۆتان دەتانزانی کە بە لای منەوە چەندە جێی سەرنجن! سەیرکردنی ئێوە و بیستنی قسەکانتان گەلێک سەرنجڕاکێشە... دواجاریش دەبێ بڵێم کە زۆر دڵخۆشـم واتان بە باش زانی ئاقیبەت سـەرێکیش لە من بدەن.

ڕازومیخین هاواری کرد:

– خۆ ئێستە دەتوانی پیاڵەیەک چایمان بدەیتێ! گەروومان وشـک بوو، کاکی خۆم!

– ئای لەو پێشـنیارە باشـە! کێ ناڵێ ئێمەش لەگەڵتان چای ناخۆینەوە. بەس حەز ناکەن بۆ نموونە شتێکی... خۆشتر بەر لە چای هەڵبدەین؟

– عەرەبانەکەت ڕاکێشە کاکە!

پۆرفیری پیترۆڤیچ چوو فەرمان بدات تا چای بێنن.

لە زەینی ڕاسـکۆلنیکۆفدا بیرگەلی ئاڵۆز لێک دەئالان و توورەیی سـنووری تێپەڕاندبوو: *لە هەمووی خراپتر ئەوەیە کە تەنانەت ئەرک ناکێشن و شتێک بشارنەوە؛ هەر نازانن ڕێز و حورمەت چییە! باشـە مەی خوێڕی، من و تۆیەک کە تـا ئێسـتە چـاومـان بە یەکتری نەکەوتووە، ئـاخر چۆن کتوپڕ لەگەڵ نیکۆدیم فۆمیچ بـاسـی من دەهێنیتە ناوەوە؟ کەواتە تەنانەت بۆشیان گرنگ نییە پەردەپۆشـییەک بکەن، وەک ڕەوە سەگێکی هار کەوتوونەتە شوێنم. خەریکن بە ڕۆژی ڕۆشن تف دەکەنە نێوچاوم!*

لە ڕقان سـەرتاپێی هەڵدەلەرزی: بسـرەوێننە بناگوێم، تەنیا یاریی مشـک و پشـیلەم لەگەڵ مەکەن. لە ئێوە ناوەشـێتەوە، پۆرفێری پێترۆڤیچ... ئەم هەڵسـوکەوتە باش نییە، ڕێک ناپیاوییە! وەلێ هاکا منیش لێتان هاتمە دەنگ، جەنابی پایەبەرز. کە هەستامەوە و حەقیقەتم تف کردە دەموچاوی ناشـیرینتان، ئەوسـا تێدەگەن کە چەندە بێز لە چڕوچاوی یەک بە یەکتان دەکەمەوە!

هەناسەی بۆ نەدەدرا.

بەس کێ ناڵێ تووشی خەیالات نەبوومە؟ ڕەنگە هەموو شتێ تەنیا خەیالاتێکی پووچ بێ و من تووشی هەڵەیەکی گەورە بووبم؟ ئاخر خۆ ئەزموونیشـم نییە، ئەی ئەگەر لە گەرمەی بابەتەکەدا پەسـت ببم و نەتوانم لە یارییەکی ئێندە چەپەڵانەدا ڕۆڵی خۆم بگێڕم؟ لەوانەشـە هیچ شتێک دەسئەنقەست نەبووبێ. ناڵێم شتێکی تایبەتییان گوت، هەر قسـەی ئاسـایی بوو، وەلێ هەر لەم قسـە ئاسـایی و ڕواژنەییانەیاندا شـتێ هەیە کە... باشـە من بۆچی ئاوها ڕێکوڕاسـت گوتم لای ئەو خاتوونە؟ ئەی زامیۆتۆف؟ بۆچی گەڕایەوە بۆ ئەو کاتە و فلتاندی کە ئێوە زۆر ئاقڵانە قسەتان دەکرد و تەنانەت دەشتوانم بڵێم لێهاتووانە؟ باشە شێوازی قسەکردنی ئەمانە بۆ دەبێ ئاوها بێ؟ ئەرێ، شێوازی... جا ڕازومیخینیش لێرە بێخەم بۆی دانیشتووە، ئەی بۆچی هەست ناکا شـتێ لەئارادایە؟ ئەو دەبەنگە پاکە هیچ کاتێ گومان نابا کە شـتێ لەئارادایە!... ئەی هاوار، خۆ ئەم تایەش بووەتە ملۆزم، هەمدیسـان گەڕاوەتەوە! باشـە ئێستە پۆرفێری چاوی لێ داگرتم یان دای نەگرت؟ قسـەی بەلاشـە، ئاخر بۆ دەبێ چاو دابگرێ، قلۆری ئاوها! دەیانەوێ پەستم بکەن؟ یان خەریکن پێم ڕادەبوێرن؟ لەو حاڵەتە بەدەر نییە، یان خەیالاتی پووچە یان مەسـەلەکە دەزانن!... تەنانەت زامیۆتۆفیش لێمان ڕوودار بووە... باشـە ئەم پیاوە ڕوودار نەبووە؟ کابرا، لە شـەوێکدا بۆچوونی گۆڕا. دەمزانی ژێروژوور دەبێتەوە! کابرا یەکەم جاریەتی

*بێتە ماڵی پۆرفیری، کەچی هەر دەڵێی ماڵی باوکیەتی! جا پۆررفێریش حسێبی میوانی بۆ ناکا، دیارە خۆمانەیە و بە ئاسانی پشتی تێ دەکا و دادەنیشـــێ! زۆر بە جوانی ڕوونە کە پێکەوە یەکیان گرتووە لە دژی منی نەگبەت! بەر لە هاتنی ئێمەش خەریک بوون باسی منیان دەکرد!... یانی مەســـەلەی ئەپارتمانەکە دەزانن؟ خوا بکا زوو بیبڕنەوە!... کە گوتم دوێنێ بۆی دەرچووە و ویســـتوومە بیـانخەڵەتێنم و بچمە شـوێنێ کە دەسـتی هیچ کامیانم پێ نەگا، پۆرفیری ئەسـڵەن مێشـێ نەبووە میوانی. باش بوو باسیم هێنایە ناوەوە، لەوانەیە دوایی بەکەڵکم بێ... وڕێنەکردن... دەڵێن وڕێنەم کردووە!... هـاهـاهـا! بـاش دەیزانێ دوێنێ ئێوارە چی بووە و چۆن تێپەڕیوە، بەس نەیـدەزانی دایکم هاتووە!... جا تۆ ســـەیری ئەو پیرێژنە کە بە پێنووس ڕێککەوتەکەی لەسەر پاکەتەکان نووسیوە!... خەیاڵتان خاوە، ناتوانن پێوەم کەن! هیچ بەڵگەیەک لەئارادا نییە، تەنیا و تەنیا گریمانەیە! گەر بەڵگەتـان هەیە بیخەنە ڕوو بزانم! مەســەلەی ئەپارتمانەکەش نابێتە ســەرەداو و تەنیا وڕێنەیە! باش دەزانم چییان پێ بڵێم! یانی بەســـەرهاتی ئەپارتمانەکە دەزانن؟ تا تێنەگەم پێ نانێمە دەرێ! باشـــە بۆچی هەســـتام و هاتمە ئێرە؟ وەڵێ هەر ئەوەی کە ئێســـتە تووڕەم بۆ خۆی بەڵگەیەکی ســەلمێنەرە! ئاخ چەندە تووڕە و بەدخوو بوومە من! لەوانەشــە خراپ نەبێ وەڵێ... دەبێ وای بنوێنم کە نەخۆشم... ئەو خەریکە پەستم دەکا. دەیەوێ پێوەم بکا. باشە ئەمە چ کارێ بوو هەستام و هاتمە ئێرە؟*

بڕووسکەئاسا هەموو ئەم بیرانەی بە زەیندا تێپەڕین.

پۆرفیری پیترۆڤیچ گەڕایەوە و ئێستە دەتگوت تەنانەت وا دیار بوو زیاتر لە پێش ڕووخۆش و شادە:

– کاکە گیان، میوانییەکەی دوێنێت چاک تێکی داین... ئەوەی ڕاستی بێ، وەختە سەرم بتەقێ!

رووی کردبووە ڕازومیخین و پێدەکەنی و شێوازی قسەکردنەکەشی زۆر لە هی پێشتر جیاواز بوو.

– کەواتە خۆش ڕاتان بواردووە! باسەکەتان زۆر سەرنجڕاکێش بووە هەڵبەتە. من ڕێک لە بەشە سەرنجڕاکێشەکەیدا جێم هێشتن و ڕۆیشتم. کێ براوە بوو ئاخری؟

– ئەی هاوار، براوە چییە! باسەکەمان گەیشتە سەر پرسی نەمری و تا کەشکەڵانی فەلەک ڕۆیشت!

– باوەڕ دەکەی ڕۆدیا، کە ئەم گەیشتن بە کەشکەڵانی فەلەکەیان لە کوێوە دەستی پێ کرد؟ باسەکەیان لەسەر ئەوە بوو کە دەیانگوت بزانین لە بنەڕەتەوە تاوان بوونی هەیە یان نا. پێم گوتی کە خەریک بوو مێشکی یەکتریمان دەخست!

ڕاسکۆلنیکۆف خەمسارد وەڵامی دایەوە:

– ئەمە کەی جێی سەرسامییە؟ خۆ ئەمە بووەتە کەڵکەڵەی ڕۆژانەی کۆمەڵگەی ئێمە!

پۆرفیری ڕوونکردنەوەی دا:

– هەڵبەتە بە جۆرێکی تر خرایە بەر باس!

ڕازومیخین وەک هەمیشە خرۆشاو و بە گوڕوتینەوە هاوڕایی خۆی دەربڕی:

– ڕاست دەکەی، بەم جۆرە نەبوو کە گوتمان! ڕۆدیا، تۆش ئێستە چاک گوێ بگرە و بۆچوونی خۆت بڵێ، دەمەوێ بۆچوونی تۆش بزانم. دوێنێ خەریک بووم کەللەڕەقانە بەرگریم لە قسەی خۆم دەکرد و بە درێژایی ئەو ماوەیەش چاوەڕێ بووم تۆ بێیت و یارمەتیم بدەی؛ تەنانەت پێشم گوتن بڕیارە بێی... مەسەلەکە لە مشتومڕکردن لەسەر

بۆچوونی سۆسیالیستەکانەوە دەستی پێ کرد و ئەمەش جێی سەرسامی نییە! دەزانی کە سۆسیالیستەکان دەڵێن تاوان کاردانەوەیەکە لەبەرانبەر ناڕێکییە کۆمەڵایەتییەکان و شتی تر! ئامادە نین پەسەندی بکەن کە دەکرێ هۆکاری تریشی هەبێ! بە بۆچوونی ئەوان هەر بە تەنیا ئەم هۆکارەی هەیە!...

پۆرفیری پیترۆڤیچ هاواری لێ هەستا:

– قسەی هەڵەقومەڵەق دەکەی، کاکە گیان!

خانەخوێ تا دەهات زیاتر دەخرۆشا و هەر کە نیگای دەچووە سەر ڕازومیخین، پێکەنین دەیگرت، بەڵام پێکەنینەکەی زیاتر ڕازومیخینی گەرم دەکرد. ڕازومیخین بەوپەڕی گەرموگوڕییەوە قسەی بە پۆرفیری بڕی:

– ئامادە نین پەسەندی بکەن تاوان هۆکاری تریشی هەیە! قسەی هەڵەقومەڵەق ناکەم، بە هەڵەشدا ناچم! پەیام و نامیلکەکانیانتان نیشان دەدەم؛ گرتوویانە بەم دەربڕینەوە: *کاریگەریی ژینگە و کۆمەڵگە!* خۆیانی لەسەر بە کوشت دەدەن! ئێ، کۆتاییەکەی بە چ ئەنجامێک دەگەن؟ بەو ئەنجامەی کە ئەگەر ڕێکخستنی کۆمەڵگە دروست و بە پێوەر بێ، ئیتر تاوانێک لەئارادا نییە، چونکە ئیتر هیچ کێشەیەک نەماوەتەوە تا کەسێ بیەوێ لەدژی بوەستێتەوە و بەنیئادەم لە چاوتروووسکاندنێکدا دەبێتە نموونەی دروستکاری و هێژایی! بە هیچ شێوەیەک سرووستی مرۆڤ لە بەرچاو ناگرن، سرووشت وەلا دەنێن... ئەسڵەن بەلای ئەوانەوە شتێ نییە بە ناوی سرووشتی مرۆڤەوە! ئەقڵیان بەوە ناشکێ کە ڕەچەڵەکی مرۆڤ، خەریکە ڕەوتی پەرەسەندنێکی مێژوویی دەبڕێ و دواجار خۆی دەگات بە کۆمەڵگەیەکی ئاسایی؛ بە پێچەوانەوە، باوەڕیان وایە سیستمێکی کۆمەڵایەتی کە لە ئەقڵێکی حسێبکارەوە دەدەڵێ، بڕیارە بێ بە هانای

سـەرانسـەری مرۆڤایەتییەوە و هەمووان چاک و بەویژدان بکا، جا هەموو تاوانەکان بشـواتەوە و بڕیاریشـە لە هەر پەرەسـەندنێکی مێژوویی باشتر کار بکا! ئیتر کاریان بە ڕەوتی پەرەسەندنەوە چییە؟ هەر لەبەر ئەوەشـە کە دژمنی خوێنیی مێژوون و دەڵێن سـەر *تا سـەری ئاژاوەیە و چەپەڵی و گەمژەیی!* ڕوونکردنەوەکەشیان هەر بە تەنیا ئەو یەک وشـەی *گەمژەییە*یە! ئێسـتە دەزانی بۆچی ڕقیان لە ڕەوتی ژیانە؟ چونکە ڕقیان لە زیندووەکانە! مرۆڤی زیندوو ژیانی دەوێ و ناچێتە ژێر باری یاسـا میکانیکییەکانەوە! مرۆڤی زیندوو گومان دەکا، ئاخر مرۆڤی زیندوو لا لە سرووشتی خۆشی دەکاتەوە! وەلێ ئەو بوونەوەرەی کە ئەوان بۆی دەگەڕێن، بۆنی تەرمی لێوە دێ و دەکرێ بە مۆم دروستی بکەی، تەنانە زیندووش نییە، ویستی نییە، ملکەچ و خزمەتکارە و گەر بشمرێ سەرپێچی لە کاریدا نییە! ئەوپەڕی دەگاتە ئەوەی کە هێندە هەموو شـتێ دابڕێژن تا بگاتە ئاسـتی خشـتنانەسـەرخشـت بۆ ژوورگەل و ڕاڕەوی بینای هاوبەشـی سۆسیالیستەکان! دەی، فەرموو، گریمان بینای هاوبەشیش ئامادەیە! وەلێ قسـەکە ئەوەیە کە سـرووشـتی مرۆڤ ئامادە نییە بخزێتە نێو بینای هاوبەشـی سـۆسـیالیستەکانەوە. مرۆڤ هێشـتا ژیانی دەوێ و هێشـتا ڕەوتی ئاسـایی پەرەسـەندنی نەبڕیوە! جارێ زووە بۆ ئەوەی بچێ لە ناوجەرگەی گۆڕستاندا بخەوێ! ناکرێ بە لۆژیک سرووشتی مرۆڤ بخەڵەتێنی، ناکرێ، کاکە گیان! لۆژیک تەنیا دوو سـێ گریمانە لە بەرچاو دەگرێ، بەس ملیۆنـان ئەگەری دیکەش هەیە! کەواتە چی بکەین ئێسـتە؟ نەکا پێویسـت بکا ملیۆنان گریمانە بخەینە لاوە و تەنیا خۆمان بۆ پرسی خۆشگوزەرانیی مرۆڤ یەکلایی بکەینەوە؟ بەڵێ، بە ڕواڵەت زۆر سـادە و شـیاوی تێگەیشـتنە! سـادەییەکەی هێندە وەسوەسەکەرە کە مرۆڤ شوێن خۆی دەخا! خۆ بیرکردنەوەی ناوێ ئیتر! مەسـەلە سـەرەکییەکە هەر ئەمەیە، تەنانەت پێویسـت ناکا بیرت

بخەیتە کار! فەلسەفەی گشتی و ڕەمز و ڕازی ژیان چووە نێو دوو پەڕەکاغەزەوە و تەواو!

پۆرفیری پێکەنی:

– کاکە کەسێک ئەمە ڕاگرێ، هەوساری پچڕاندووە! دەست و پێی ئەمە ببەستنەوە!

جا ڕووی کردە ڕاسکۆلنیکۆف:

– دوێنێشەویش هەر ئەم بەزمە بوو لەگەڵ شەش کەسدا کە ترنجابوونە ژوورێکەوە و جا هاوکات پڕ بە گەرووشیان دەیانقیڕاند! هەڵبەتە دوای ئەوەی کە بە خواردنەوەیەکی باش شەرمەزاری کردین... باوەڕ دەکەن؟ نا، براڵە، بە هەڵەدا دەچی. دەوروبەریش کاریگەریی بەسەر ڕێژەی تاوانەوە هەیە؛ من پاڵپشتی لەوە دەکەم!

– منیش دەزانم کاریگەریی هەیە، وەلێ بۆ ئەمەیان وەڵامێکم بدەرەوە: پیاوێکی چل ساڵە دەستدرێژیی سێکسی دەکاتە سەر کچۆڵەیەکی دە ساڵە؛ دەتەوێ بڵێی دەوروبەر ناچاری کردووە؟

پۆرفیری یەکسەر جددی و شکۆدار گوتی:

– ئەگەر بمانەوێ ڕێک و ورد وەڵام بدەینەوە، دەبێ بڵێین بەڵێ، زۆر بە ئاسانی دەتوانین ئەمەش بدەینە پاڵ دەوروبەر، هەر زۆر ئاسانیش.

ڕازومیخین کە چاوی پەڕیبووە تەوقی سەری، نەڕاندی:

– باشە! کەواتە لێگەڕێ منیش بیسەلمێنم برژانگەکانی تۆ سپین و تەنیا بەو بەڵگەیەش سپین کە بەرزیی تاوەری زەنگی کڵێسەی ئیڤانی گەورە حەفتا مەترە! جا ڕوون و ڕێک و بە شێوازێکی مۆدێرن دەیسەلمێنم و تەنانەت بە جۆرێک لە جۆرەکانیش لیبراڵانە! من ئامادەم و تا کۆتاییش لەسەری دەڕۆم! گرەو دەکەی؟

– قەبووڵمە، گرەو دەکەم! تامەزرۆم بزانم دەتەوێ چۆن بیسەلمێنی؟

ڕازومیخین لە جێگەکەی هەســتایەوە و بە دەســت پارفیریی دوور خستەوە:

– ئەی خوا بە نەفرەتت کا، هەر خەریکی گاڵتەوگەپ و ڕابواردنی! ئاخر قسەکردن لەگەڵ تۆ چ سوودێکی هەیە؟ هیچ کارێکی بێمەبەست نییە، تۆ هێشــتا نەتناســیوە، ڕۆدیا خان! دوێنێ زۆری بۆ هێنابووین، تەنیا بۆ ئەوەی بە یەک بە یەکمان ڕابوێرێ و بمانتێرێ! خوا دەزانێ چیی بە دەمدا هات! ئەو گەمژانەش پێی شــاگەشــکە دەبوون!... ئەم کابرایە دەتوانێ تا دوو حەفتە لەســـەر گاڵتەجاڕییەکەی بڕوا! پار هەمووانی کۆ کردنەوە کە دەمەوێ لەبەر ئەم هۆکارە و ئەو هۆکارە بچم بۆ پەرســـتگە و ببمە ڕاهیـب و دوو مـانگی ڕەبەق گرتی بەم بارییەوە! لەم دواییانەشـــدا لە کەللەی دا کە نیازی ژنهێنانی هەیە و ئامادەکاریی ســـەرەتایی کردووە و هەر ئەوەندەی ماوە خۆی هەڵداتە سەر تەختەخەوی زاوایی‌یەکە! جلی زاواییەکەی بە کردن دا و هەموومان دەســـتمان کردە پیرۆزباییکردن و ئەم شـــتانە، کەچی نە هەواڵێک لە بووکێ هەبوو و نە هیچ شتێکی تر؛ هەمووی خەیاڵات بوو!

– خۆ بینی کە درۆ دەکەی! پێشــتر ڕامســپاردبوو جلەکە بدوورن. پاشــان کە تەماشــام کرد قاتبۆینباخەکە تازەیە، ئەوەم بە خەیاڵدا هات کە ئێوە بنێرم!

ڕاسکۆڵنیکۆف خەمساردانە پرسیی:

– یانی هەمیشە بەم لێهاتووییەت ئەوانی تر دەنێری؟

– هەرگیز بە خەیاڵتاندا نەدەهات مرۆڤێکی ئاوها بم، ئەرێ؟ گەر مۆڵەت بدەن، ئێوەش دەنێرم! هاهاها! نا، بەڕێز، من تەنیا ڕاستییەکە بە ئێوە دەڵێم! ئەم هەموو قســە و مشــتومڕە لەبارەی تاوان و دەوروبەر

و کچۆڵەکانەوە ئەو گوتارەی جەنابی بەرزوبەرێزتانی بیر هێنامەوە کە زۆریش بە لامەوە سەرنجڕاکێش بوو؛ *لەبارەی تاوان* یان وەها شتێکەوە... ئێستە کتومت ناونیشانەکەیم بیر نییە. دوو مانگ لەمەوبەر بوو کە لە *ڕۆژنامەی گوتە*دا بە تامەزۆرییەوە خوێندمەوە.

ڕاسکۆلنیکۆف سەرسامانە پرسیی:

– گوتاری من؟ لە *ڕۆژنامەی گوتە*دا؟ بەڵێ، شەش مانگ لەمەوبەر کە وازم لە زانکۆ هێنا، وەک ڕەخنەیەک ئەو گوتارەم لەسەر کتێبێک نووسی، وەلێ ناردم بۆ *حەفتەنامەی گوتە* نەک ڕۆژنامەی گوتە!

– بەس دواجار ڕۆژنامەی گوتە چاپی کرد.

– *حەفتەنامەی گوتە* هەر ئەو ڕۆژە داخرا و لەبەر ئەوە چاپیان نەکرد.

– بەڵێ، فەرمایشتەکەتان ڕاستە! وەلێ *حەفتەنامەی گوتە* لەگەڵ ڕۆژنامەی گوتە بوونە یەک و لە ڕاستیدا گوتارەکەی ئێوەش دوو مانگ لەمەوبەر بڵاو بووەوە. ئاگاداری نەبوون؟

ڕاسکۆلنیکۆف هەر بە ڕاستی ئاگادار نەبووبوو.

– سەیرە! لەوانەشە برە پارەیەکیشیان لەسەر گوتارەکە خواردبێ! ئێوە هەر بە ڕاستی مرۆڤێکی سەیرن! دوورەپەرێزیتان گەیشتووەتە ئاستێک کە تەنانەت لە بابەتگەلی پەیوەست بە خۆشتان بێئاگان. مەسەلەی گوتارەکە ڕاستە، دڵنیا بن.

ڕازومیخین هاواری کرد:

– ئای دەستخۆش، ڕۆدیا! منیش لە گوتارەکە بێئاگا بووم! هەر ئەمڕۆ دەچمە کتێبخانە و ژمارەی ئەو بڵاوکراوەیە دەکرم... هی دوو مانگ لەمەوبەر بووە؟ ڕێککەتی چەند؟ ئەسڵەن ڕێککەوتەکەی گرنگ نییە، دەیدۆزمەوە! مەسەلەیەکی سەیرە! ئەی بۆچی بە ئێمەت نەگوت؟

– باشە چۆن تێگەیشتن کە گوتارەکە هی منە؟ ئاخر تەنیا پیتەکانی سەرەتای ناوەکەمم نووسیبوو!

– بە هەڵکەوت بوو... چەند ڕۆژێ پێش ئێستە. سەرنووسەرەکە ناسیاوە، لەڕێی ئەوانەوە تێگەیشتم... زۆر سەرنجڕاکێش بوو بۆ من.

– لەو گوتارەدا باری دەروونیی تاوانکارم پێش تاوان تا دواتری شی کردبووەوە.

– بەڵێ، کتومت، هەروەها بە بۆچوونی ئێوە هەمیشە تووشبوونی تاوان نەخۆشیی لەگەڵە. زۆر زۆر داهێنەرانەیە ئەم پرسەی ئێوە، وەلێ... وەلێ بەشێکی تری گوتارەکەتان زۆر زیاتر سەرنجی منی ڕاکێشا، بەشی کۆتای... یانی ئەو تیۆرییەی کە لە کۆتایی گوتارەکەدا دەیخەنە بەرباس. بەس حەیف کە تەنیا ئاماژەیەکتان پێ کردووە و تێروتەسەل نەتانکردووەتەوە. بە کورتییەکەی گەر بیرتان بێ، لە کۆتایی گوتارەکەدا کورتەئاماژەیەک بە مرۆڤانێکی تایبەت دەکەن کە دەتوانن... یانی دەتوانن و ئاسانە، بە جۆرێ لە جۆرەکان لەوەدا سەرپشکن کە دەست بدەنە هەر کردەوەیەکی نائاکاری و تەنانەت تاوان و جا گوتبووتان ئەم کەسانە لە سەرووی یاساوەن.

ڕاسکۆلنیکۆف بەوە بزەیەکی گرت کە پۆرفیری دەستئەنقەست بیرۆکەکەی ئەوی بە لاڕێدا بردووە و خەریکە زیادەڕۆیانە شیی دەکاتەوە.

ڕازومیخین کە دەتگوت ترسی لێ نیشتووە، پرسیی:

– چی بووە؟ تێنەگەیشتم! دووبارەی بکەرەوە بزانم! مۆڵەتپێدراون بۆ کردنی هەر تاوانێک؟ نەکا *دەوروبەر* لەم نێوەندەدا هاندەر بێ، ها؟

پۆرفیری وەڵامی دایەوە:

– نا، نا، ناکرێ بڵێین لەبەر دەوروبەرە. گەر گوتاری هاوڕێکەمان بخوێنیتەوە، دەبینی مرۆڤەکانیان بەسەر دوو دەستەدا پۆلێن کردوون: مرۆڤە ئاســـایی و مرۆڤە ڕیزپەڕەکان[1]. مرۆڤە ئاســـاییەکان دەبێ بەرفەرمان بن و مافی بەزاندنی ســـنوورەکانی یاســـایان نییە، چونکە هەر چۆنێک بێ دواجار ئاســـایین ئیتر! بەس مرۆڤە ڕیزپەڕەکان ڕێپێدراون هەر تاوانێک بکەن و هەر چۆنێ پێیان خۆشە یاسا بشکێنن، تەنیا و تەنیا لەبەر ئەوەی کە ڕیزپەڕن. گەر بە هەڵەدا نەچم، چەقی باسەکەتان ئەمە بوو، وایە؟

ڕازومیخین واق و وڕ لەژێر لێوەوە بۆڵاندی:

– ئەوە منگەمنگی چیتە؟ مەگەر وەها شتێ ڕێی تێدەچێ؟

ڕاســـکۆڵنیکۆف ئەم جـارەش بزە گرتی. پێی زانیبوون و بـاش دەیزانی چ نەخشەیەکیان بۆ کێشاوە و دەیانەوێ بەرەو کوێی پەلکێش بکەن. دواجار بڕیاری دا ئەو ململانێیە پەسـەند بکات و خاکەڕا و زۆر سادە هاتە گۆ:

– قسەی من لەو گوتارەدا لە بنەڕەتەوە شتێکی تر بوو، وەلێ دانی پێدا دەنێم ئێوە تا ڕادەیەک بە باشـی مەبەستەکەتان گەیاند و تەنانەت دەکرێ بڵێین زۆریش باش...

ڕاســـکۆڵنیکۆف دەتگوت بەم دانپێدانـانە ڕەزامەندییەکی تـایبەتی تێگەڕا:

– وەلێ ناکۆکیی نێوان من و ئێوە لێرەدایە: من لەسەر ئەوە سوور نەبووم کە پێویســتە هەمیشــە مرۆڤە ڕیزپەڕەکان یاســا پاشــێل بکەن، خۆ ئەگەر مەبەســتەکەم ئەوە با گوتارەکەیان چاپ نەدەکرد. من تەنیا کورتەئـامـاژەیەکم بەوە کرد کە مرۆڤی ڕیزپەڕ ئەو مـافەی هەیە، جا

---

[1] ڕیزپەڕ: تایبەتی، هەڵاوێردراو، ناوازە، شاز.

مافێکی دەروونیش نەک یاســـــایی، کە ویژدانی خۆی بکاتە بنەما و هەندێ بەربەســـــتی تایبەت رابماڵێ، هەڵبەتە تەنیا و تەنیا ئەگەر بۆ بەکردەییکردنی ئەندێشـــــەکانی یارمەتییەکی بدەن (چونکە لەوانەیە ئەندێشەکانی ئەو مرۆڤایەتی رزگار بکەن). گوتتان من بە تێروتەسەلی بابەتەکەم نەکردووەتەوە، باشـــــە، من ئامادەم بۆتانی روون بکەمەوە! لام وایە بە لاڕێدا نەچوومە و ئێوەش خۆتان دەتانەوێ باســـــەکەمتان بۆ روون بکەمەوە. زۆر باشـــــە، قوربان! بە بۆچوونی من ئەگەر لەبەر فلان و فیســـــارە هۆکار، بڕیار بووبا داهێنانەکانی *کێپلەر*[1] و *نیوتن* بە نەناســـراوی بمێننەوە، تەنیا مەگەر بەو مەرجەی کەســـێک یان دە یان ســـــەد کەس یاخود تەنانەت زیاتریش ببنە قوربانی، نیوتن ئەو مافەی هەبوو، یانی نەک هەر ماف، بەرئەرک بوو ئەو دە یان ســـــەد کەســـــە لەســـەر ڕێگەکەی ڕاماڵێ تا مرۆڤایەتی لە داهێنانەکەی ئەو ســـوودمەند بێ. لەگەڵ ئەوەشـــــدا، نابێ وا لێک بدرێتەوە کە نیوتن بۆی هەبوو بە کەیفی خۆی بەناو کەوێ و ڕاســـت و چەپ مرۆڤ بکوژێ یان ڕۆژانە لە بازاڕدا شت بدزێ. پاشانیش هێندەی بیرم بێ لە گوتارەکەدا ئەوەم شـــی کردووەتەوە و گوتوومە کە هەموو یاســـادانەر و ڕابەرەکان... بۆ

---

۱. Johannes Kepler: یۆهـــانس کێپلەر زانـــای بیرکـــاری، گەردوونـنـــاس و ئەستێرەناسێکی ئەڵمانیی بەناوبانگ بوو. لە ساڵی ۱۵۷۱دا لە دایک بووە و لە ساڵی ۱٦۳۰ گیانی ســـپاردووە. کێپلەر ڕۆڵێکی گرنگی لە شـــۆڕشـــی زانســـتیی ســـەدەی حەڤدەیەمدا هەبوو، ناوبانگی دەگەڕێتەوە بۆ بابەت و کتێبە جیاجیاکانی ســـەبارەت بە جوولەی هەسارەکان. «و. ک»

نموونه لۆکورگەس[1]، سۆلۆن[2]، ناپلیۆن، موحەممەد و... یەک بە یەکیان تاوانکار بوونە! بۆچی؟ هەر بە تەنیا ئەو بەڵگەیە بەسە کە لەبەر ئەوەی یاسایەکی تازەیان هێنابوو، یاسا کۆنەکەیان پاشێل کرد گەرچی بۆ پێشینانیان پیرۆزیش بوو و جا لە هەر کوێ کە خوێنڕێژی لە بەرژەوەندییاندا بووبا، دەستیان لە ڕشتنی خوێنی ئەو خەڵکە بێتاوانە نەدەپاراست کە هەوڵی پاراستنی یاسا کۆنەکەی دەدا. شیاوی باسە کە زۆربەی ئەم ئاغا و ڕابەرانەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی خوێنڕێژ بوونە. بە کورتی و پوختی: قسەی من ئەمەیە کە زۆربەی مرۆڤە گەورەکان و تەنانەت ئەوانەش کە تۆزێ لە سەرووی خەڵکە ئاساییەکەوەن و لانیکەم قسەیەکیان بۆ گوتن هەیە، تاوانکاری لە سرووشتیاندایە، هەڵبەتە کەم و زۆر. گەر وا نەبێ ئەی چۆن دەیانەوێ بە پێچەوانەی ئاراستەی ئاوەوە مەلە بکەن؟ هەر سرووشتیان بەرگەی ئەوە ناگرێ ئەو ڕێگەیە بگرنە بەر کە ئەوای تر دەیبڕن! گەر لە من بپرسی دەڵێم ئەرکەکەیان وا دەخوازێ بە پێچەوانەی ئاراستەوە ڕێ بکەن. دەی، خۆ دەبینن تا ئێرە شتێکی سەیر و نوێم نەگوت! پێشتر ئەم جۆرە قسانە بڵاو کراونەتەوە و هەزار جار هاوشێوەیانمان خوێندووەتەوە! ئەوەش کە من مرۆڤەکانم کردوون بە دوو دەستەوە و دەڵێم یان ئاساییـن یان ڕیزپەڕ... باشە... قەبووڵمە، ئەمە سەلیقەیەک

---

١. Lycurgus: لۆکورگەس یاسادانەرێکی سپارتایی بووە (٧٣٠–٨٢٠ پێش میلاد). بەپێی دابونەریتە باوەکانی پەرستگەی ئەپۆلۆی شاری دیلفی، کۆمەڵگەی سپارتای کردە کۆمەڵگەیەکی سەربازی. چاکسازییەکانی سێ بنەما لەخۆ دەگرن: یەکسانی، توانای سەربازی، سووربوون. زۆر نووسەر و فەیلەسووفی بەناوبانگ ناوی ئەم کەسایەتییەیان هێناوە، وەک هیرۆدۆت، ئەفلاتوون، پۆلیبیوس، بەلام تا ئێستەش پشتڕاست نەکراوەتەوە کە کەسێک بەم ناوەوە بوونی هەبووبێت. «و. ک»

٢. Solon: سۆلۆن (٦٤٠–٥٦٠ پ. م) شاعیر و یاسادانەرێکی ئەسینییە. کۆمەڵێک یاسای بە مەبەستی چاکسازی دانان کە دژ بە حکومڕانیی دەسەڵاتی ئەو سەردەمە بوون، وێڕای ئەوەی سۆلۆن لە هەوڵەکانیدا بۆ چاکسازی شکستی هێنا، بەلام بە دانەری چەمکی دیموکراسی دێتە ئەژمار. «و. ک»

بوو، وەلێ لەبەرانبەردا، لەسەر ئەوە سوور نیم کە پێوەر و ڕێژەیەکی دیاریکراوی بۆ دابنێم. من تەنیا و تەنیا لەسـەر ئەندێشـەی سـەرەکیی گوتارەکەمم، کە یاسـای سرووشـت، بە گشـتی مرۆڤەکانی کردوون بە دوو دەسـتەوە، عەوام کە وەک دەڵێن چییەتییەکی ماددی و میوەییان هەیە و تاکە ئەرکیشـیان خسـتنەوەی وەچەیە، دەسـتەی دووەمیشـیان مرۆڤە ڕاسـتەقینەکان کە توانا و لێهاتووییەکیان هەیە و قسـەیەکی تازەیان پێیە بۆ گوتن. لەنێو ئەم دوو دەسـتەیەوە دەکرێت هەزاران دەسـتەی بچووک جیا بکەینەوە، وەلێ جیاوازییە سـەرەکییەکانی ئەو دوو دەسـتەیە زۆر ڕوونن. گەر بە گشـتی سـەیری بکەین، دەسـتەی یەکەم ئەوانەن کە پارێزکارن و پابەندی یاسـا، بە درێژایی تەمەنیان بەرفەرمانن و چێژ لەم بەرفەرمانییە دەبەن. بە ڕای من ئەوان ناچاری ئەم ژێرفەرمانییەن، چونکە وەک ئەوە وایە کە هۆکاری بوونیشـیان هەر ئەمە بێ و بە هیچ شـێوەیەکیش لە پێگەیان کەم ناکاتەوە. وەلێ دەسـتەی دووەم ئەوانەن کە بە ئاسـانی یاسـا ژێرپێ دەنێن، یان وێرانکەرن یان ئارەزووی وێرانکردنیان هەیە، جا ئەوە پەیوەندیی بە توانا و لێهاتووییانەوە هەیە. ئەو تاوانانەی کە تووشـیان دەبن ڕێژەیی و هەمەجۆرن و زیاتریش بە ڕێگەگەلی جیاواز خوازیاری لەناوبردنی ئێسـتەن لەپێناو داهاتوویێکی باشـتردا. وەلێ ئەگەر ناچار بن لەبەر خاتری بیروبڕواکەیان بەسـەر تەرمی کەسـێکدا هەنگاو بنێن یان تەنانەت لافاوی خوێن هەسـتێنن، باکیان نییە و چاکیش ئەم کارەیان لەدەسـت دێ، یانی لە ناخیانەوە و لە قووڵایی بوونیاندا مۆڵەتی ڕامالینی بەربەسـتەکانی سـەر ڕێگەیان، بە خۆیان دەدەن. هەڵبەتە ئەوەشـتان لەبیر بێ کە پەیوەندیی بە ئەندێشـەکە و ڕەهەند و گرنگییەکەیەوە هەیە. منیش تەنیا لەم ڕووەوە بووە کە لە گوتارەکەمدا گوتوومە مافی تاوانکردنیان هەیە، چونکە بیرتانە کە باسەکە لە لایەنی یاساییەوە دەستی پێ کرد. بەهەرحاڵ، ئەمە نیگەرانیی ناوێ، چینوتوێژ بەوە ڕازی نابێ کە مرۆڤە ڕیزپەڕەکان وەها مافێکیان هەبێ و سزایان

دەدا یان لە داریان دەدا (کەم تا زۆر هەر وا دەبێ) جا بەم کارانەش پەیامی وجوودیی پارێزکارانەی خۆی دەگەیەنێ. وەلێ نەوەی دواتر، وەک ڕێزلێنان پەیکەری ئەم تاوانبارانە قوت دەکاتەوە و دەیپەرستێ. دەستەی یەکەم، مرۆڤەکانی کاتی ئێستەن، دەستەی دووەمیش کەسانی داهاتوو. دەستەی یەکەم بە دڵ و بە گیان پارێزگاری لە دونیا دەکەن و هەمیشە قەڵەباڵقی دەکەن، دووەمینیش دونیا دەبزوێنن و دەیگەیەننە ئامانجێک. هەردووک دەستەکە مافی ژیانێکی یەکسانیان هەیە. بە کورتییەکەی من مافێکی یەکسان دەبەخشمە هەردووک لا! کەواتە هەر بژی ئەم ململانێ نەمرە، هەڵبەتە تا هەستانەوەی مەسیح و ئاوەدانبوونەوەی ئۆرشەلیمی نوێ!

– کەواتە ئێوە باوەڕتان بە ئۆرشەلیمی نوێ هەیە، وایە؟

– بەڵێ، ئەی چۆن!

ڕاسکۆڵنیکۆف زۆر بە ئەرخەیانی وەڵامی پارفیریی دایەوە، بە درێژایی ئەو ماوەیەش –چ لە کاتی قسەکردن لەسەر هەستانەوە و ئۆرشەلیمی نوێ و چ بە درێژایی گوتە ئاگرینەکانی– چاوی لە خاڵێکی فەرشەکە بڕیبوو و تەماشای هیچ لایەکی دیکەی نەدەکرد.

– ئمممم... باوەڕتان بە خواش هەیە؟ هەڵبەتە لەم کونجکۆڵییەم ببوورن!

ڕاسکۆڵنیکۆف دووبارەی کردەوە:

– باوەڕم پێیەتی!

ئەم جارەیان سەری هەڵهێنا و چاوی لە پۆرفیری بڕی.

– ئمممم... هەروەها بە زیندووبوونەوەی *لازارووس*یش[1]؟ باوەڕتان بەوەش هەیە؟

– باوەڕم پێیەتی. کارت بەمانە چییە؟

– کەواتە بە تەواوی باوەڕدارن؟

– بەڵێ، بە تەواوی!

– هەر زۆر باشـــە... تەنیا لە کونجکۆڵیان بوو. بە گەورەیی خۆتان لێم ببوورن. وەلێ با بگەڕێینەوە ســـەر بابەتەکەی خۆمان، ئاخر ئەم تاوانبارانەی کە باســـتان کردن، مەرج نییە هەمیشـــە ســـزای خۆیان وەربگرن. هەندێکیان هەر بە پێچەوانەوە...

– دەتانەوێ بڵێن بە پێچەوانەوە تەنانەت ســـەریش دەکەون؟ ئۆو، بەڵێ، کەســـــانێکی ڕیزپەڕ هەڵـدەکەون کە لە ژیـانیـانـدا دەگەنە ئامانجەکانیان و ئەوسا...

– جا ئەوسا دەست دەکەنە سزادانی ئەوانی تر؟

– ئەگەر پێویست بکا، بەڵێ. ڕاستییەکەشی ئەوەیە کە زۆربەی کات هەر وا دەبێ. ئاماژەیەکی ژیرانەتان کرد...

– ســوپاس بۆ میهرەبانیتان، قوربان! بەس تکا دەکەم ئەمەشـــم بۆ ڕوون بکەنەوە: چۆن ئەوانە لە کەســانی ئاســایی جیا دەکەنەوە؟ یانی لەگەڵ لەدایکبوونیاندا نیشـــانەیەکی تایبەت بە لەشـــیانەوەیە؟ بۆیە دەپرســـــم، چونکە لام وایە دەبێ پێوەرێکی وردترمـان هەبێ، جۆرە پێوەر و ناســـینەوەیەک بە چاو. هەمدیســـــان لە نیگەرانییەکانی ئەم

[1] لازارووس: لازارووسی بێسانی، برای مارسا و مریەمی پیرۆز بووە. لە بێسانیی نزیک قودس ژیاوە، کاتێک لاســـارووس گیانی ســـپارد، دوای تێپەڕینی چوار ڕۆژ بەسەر مەرگیدا، لەلایەن عیسای مەسیحەوە زیندوو کرایەوە. ئەم زیندووکردنەوەیەی لازارووس، وای کرد بەشێک لە جوولەکەکان باوەڕ بە عیسا بهێنن. «و. ک»

هـاوڵاتییە پابەنـد بە یـاســـــا و کردەگەرایە ببوورن! نیـازم چاکە و نیگەرانییەکەشـــم ســـــرووشـــــتی! بۆ نموونە نـاکرێ جۆرە جلێکی هاوشـــێوەیان بۆ بدوورین یان بە جۆرێک نیشـــانەیان بکەین؟ ئاخر، بێگومان پەســـەندی دەکەن کە ئەگەر دۆخەکە بشـــێوێ و یەکێک لە کەسانی سەر بەمبەر وای بە خەیاڵدا بێ کە سەر بە ئەوبەرە و بەپێی ئەو دەربڕینە سەرنجڕاکێشەی ئێوە دەست بە *ڕامالینی بەربەستەکان* بکا، ئەوسا...

– ئۆو، ئەمە ڕۆژانە ڕوو دەدا. ئەم دووەمین خاڵەی کە ئاماژەتان پێ کرد، لە یەکەمینیان ژیرانەتر بوو...

– مەمنوونم!

– ڕێزتان هەیە پایەبەرز! وەلێ سـەرنجتان لەسـەر ئەوە بێ کە ئەم جۆرە وەهمە تەنیا دەکرێ لەنێوان دەستەی یەکەمدا سەر هەڵبدا، یانی مرۆڤە ئاسـاییەکان (قەبووڵمە کە ناوێکی هێندە باشـیشـم لێ نەناون). ئەمانە وێڕای حەزیان بۆ بەرفەرمانی، یانی زۆربەیان، بەهۆی فریوێکی سرووشتییەوە کە تەنانەت لە گایەکیشدا هەیە، حەز دەکەن خۆیان بە مرۆڤانێکی پێشـــکەوتوو بزانن و بە جۆرێ لە جۆرەکان بخزێنە نێو بزووتنەوەی نوێ و لە قســـەی تازەدا بەشـــدار بن و جا بڕوایەکی تەواویشیان بەم کارەیان هەیە. وەلێ کێشە ئەوەیە کە هیچ کات توانای ناسینەوەی مرۆڤە ڕێزپەڕەکانیان نییە و تەنانەت لەچاو ئەواندا خۆیان لە پێگەیەکی بەرزتردا دەبیننەوە و وەک مرۆڤانێک لەوان دەڕوانن کە شـــێوازی بیرکردنەوەیان نزم و دواکەوتووانەیە. وەلێ من تا ئێرانە، مەترسییەکی ئەوتۆ نابینم و ئێوەش نابێ خۆتان نیگەران بکەن، چونکە هەر هەنگاوێک بەرەو پێش بنێن، لەبەرانبەریدا دوو هەنگاو بەرەو دوا دەکشێنەوە! جاروبار دەکرێ لەبەر ئەوەی کە تووشی خەیاڵات بوونە تەمبێیـان بکەی و لە قـاڵبیـان بـدەیتەوە، بەس لەمە زیـاتر نـا! لە بنەڕەتیشەوە بۆ ئەم تەمبێکارییە پێویست بە کەسێ ناکا، چونکە ئەوان

خۆیان کەسانێکی بەویژدانن و لەنێوان خۆیاندا کەسانی هەڵدەکەون کە ئەو ئەرکە بگرنە ئەستۆ، ئەوەش لەلایەک کە هەندێکیان هەر بەتایبەت خۆیان خۆیان تەمبێ دەکەن... جا جۆرەها تۆبە و کەفارەت بە بەرچاوی خەڵکییەوە هەم شتێکی جوانە و هەم پەندئامێز. بە کورتییەکەی ئێوە بە هیچ شێوەیەک خەمتان نەبێ... چونکە لێرە یاسایەکی لەو جۆرە فەرمانڕەوایە.

– باشە، لانیکەم لەم ڕووەوە ئاسوودەتان کردم و قسەیەک نەمایەوە، وەلێ من خەمی شتێکی تریشمە. بە ڕای ئێوە ژمارەی ئەو کەسانە زۆرە کە فەرمووتان مافی ڕەشەکوژکردنی ئەوانی تر بە خۆیان دەدەن؟ من ئامادەم لە بارەگەیاندا سەری کڕنۆش دانەوێنم، وەلێ ناتوانن نکووڵی لەوە بکەن کە ئەگەر ژمارەیان ڕوو لە زیادبوون بکا، هەلومەرجەکە مەترسیدا دەبێ، ڕاستە؟

شێوازی قسەکردنی ڕاسکۆلنیکۆف گۆڕا:

– نۆو، بەڵێ، خەمی ئەمەشیانتان نەبێ! ئەو مرۆڤانەی کە ئەندێشەگەلی تازەیان هەیە یان لانیکەم لە ناخیاندا توانای دەربڕینی قسەیەکی تازە هەیە، هەر لە بنەڕەتەوە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن! تەنیا یەک شت ڕوونە: سرووشت، یاسایەکی هەیە کە بە وردی نموونەی دەرکەوتنی مرۆڤەکان و دەستە و لقەکانیان دیاری دەکات و بە هیچ شێوەیەکیش ڕەوشی ئەم کارە تێک ناچێت. ڕاستە ئەم یاسایە تا ئێستە بە نەناسراوی ماوەتەوە، وەلێ بوونی بۆ من وەک ڕۆژ ڕۆشنە و دواجاریش هەر ڕۆژێک دەناسرێ. توێژی مرۆڤایەتی هیچ نییە بێ لە ماددەیەکی سەرەتایی کە بۆ ئەوە هاتووەتە بوون تا لە کۆتاییدا بە کۆششێکی زۆر و بڕینی ڕێگەیەک کە هێشتا نەناسراوە، لە شوێن و کاتێک و لەنێو دەستە و ڕەگەزەکاندا، بتوانێ لەنێوان هەزار کەسدا، مرۆڤێکی ڕێزپەڕ بهێنێتە بوون کە وجوودی ئەو کەسە پزیسکێک لە سەربەستیی تێدا بێت. لەوانەشە لەنێو دە هەزار کەسدا،

ئاخر من بە نزیکەیی باســـی دەکەم! یان لەوانەیە لەنێو ســـەد هەزار کەســـدا تەنیا دانەیەکیان خاوەنی ســـەربەســـتییەکی زیاتر بێ. ئەوە بلیمەت لەلایەک، لەوانەیە لەنێو ملیۆنێکدا دانەیەک هەڵکەوێ و بلیمەتە گەورەکان، کە تاجی ســـەری مرۆڤایەتین و بڕیارە ناویان لە مێژوودا بمێنێتەوە، لەوانەیە لەنێو هەزاران ملیۆنـدا دانەیەکیش هەڵنەکەوێ. هەڵبەتە، با کورتی بکەمەوە، من بەتایبەت نەڕۆیشـتووم ســەرێک لەو دەزگایانە بدەم ئەم جۆرە ڕێســـــایانەیان تێدا پەیڕەو دەکرێن، وەلێ دەبێ یاسـایەک لەئارادا بێ و لام وایە کە هەیە. ئەم هەموو شـتە ڕێی تێناچێ بە هەڵکەوت بێ.

دواجار ڕازومیخین جامی سەبری پڕ بوو و هاواری کرد:

– باشـــە ئەو دووانەتان چ گلاراوێکتانە؟ قەشـــمەریاتتان دێ؟ بە یەکتری ڕادەبوێرن؟ لەبەردەم یەکتریـدا دانیشـــتوونە و خەریکی گەپجاڕین ئەم گەندانە! ڕۆدیا، نەکا تۆ هەر بە جددی ئەم قسانە بکەی؟

ڕاســـکۆڵنیکۆف لە بێدەنگیدا ســـەری هەڵبڕی و ڕووخســـاری ڕەنگپەڕیویی کە خەمگـینـیش دەردەکەوت، بەرەو ڕازومـیـخـین وەرســـووڕاند، بەڵام وەڵامی نەدایەوە. لەولایشـــەوە، بە بۆچوونی ڕازومیخین، تیزخەنـدی تـاڵ و بێحورمەتـانەی پۆرفیری کە تەنـانەت نەیدەشاردەوەش، گەلێک نابەجێ و قێزەون بوو.

– باشـــە، کاکی خۆم... ئەگەر بە جددیتە کەواتە... هەڵبەتە ڕاســـتت گوت کە ئەمە بابەتێکی نوێ نییە و وەک ئەو بابەتانە وایە کە هەزار جار بیســـتوومانن و خوێندوومانەتەوە. وەلێ لەنێو قســـەکانتدا خاڵێک هەبوو کە تەنیـا تۆ بۆ یەکەمین جـار وا دەیخەیتە بەر بـاس و هەر ئەوەشـــە کە خراپ منی ترســـــاند. تۆ خەریکیت بە ناوی ویژدان و پێوەری تاکەکەسـییەوە، ڕەوایەتی بە خوێنڕێژی دەدەی و، زۆر داوای لێبوردن دەکەم، جـا بە وەهـا دەمـارگیرییەکیشـــەوە! من وای لێک

دەدەمەوە کە دەبێ خاڵی ســـەرەکیی گوتارەکەی تۆش هەر ئەوە بێ! وەلێ بە بۆچوونی من ئەوەی کە لەڕێی ویژدانەوە مافی هەســـتاندنی خوێنت هەبێ، لە دەرکردنی مۆڵەتی فەرمیی ڕەشەکوژی تۆقێنەرترە...

پۆرفێری پشتگیریی کرد:

– تەواو ڕاستە، هەر بە ڕاستی تۆقێنەرە!

– بەڵێ، لام وایە بە جۆرێ لە جۆرەکان مەســـەلەکە لەدەســـت دەرچووە! لە شـــوێنێکدا، هەڵەیەک هەیە. ئێســـتە خۆم دەیخوێنمەوە... ڕێی تێناچێ تۆ وا بیرت کردبێتەوە... دەبێ بیخوێنمەوە.

ڕاسکۆلنیکۆف گوتی:

– ئەم قســـانە لە گوتارەکەدا نین، لەوێ تەنیا بە کورتی ئاماژەیەکم پێ کردبوون.

– بە ڕاست! دە وا بڵێ...

پۆرفێری لە جێگەکەیدا نەدەسرەوت:

– ئیتر ڕێچارەکەی ئێوەم لەبارەی تاوانەوە بە تەواوی بۆ ڕوون بووەتەوە بەس... لەم کەللەڕەقییە بێمانایەم ببوورن (دەزانم گرتوومە بەم بابەتەوە و ئازارتان دەدەم، مایەی شـــەرمەزارییە!)، بەس تەماشـا کەن، ئێوە خەمی منتـــان لەبـــارەی تێکەڵبوونی دوو دەســـتەکەوە ڕەواندەوە، وەلێ چەندان ئەگەری تر هەن کە خراپ مێشـــکیان قاڵ کردووم! وای دابنێن پیاوێک یان گەنجێک خۆی لێ ببێتە *لۆکۆرگەس* –لۆکۆرگەســـێک لە داهاتوودا– جا دەســـت بە ڕامالینی بەربەســـت و سەختییەکانی سەر ڕێگەکەی بکا... ململانێیەکی گەورەی لەبەردەمدایە ئەم مرۆڤە و پێویســـتیشـــی بە پارەیە... دەی، دواجار دەبێ پارەکە دەست بخا... تێدەگەن خۆ؟

زامیۆتۆف لەوســـەری ژوورەوەکەوە مرخەیەکی کرد، بەڵام راســـکۆڵنیکۆف تەنانەت بە لاچاوێکیش ســـەیری نەکرد و بە ئارامی وەڵامی دایەوە:

– نکۆڵی لەوە ناکەم کە ئەگەری هەموو ئەم شتانە لەئارادایە. دایمە بۆی هەیە کۆمەڵێک دەبەنگ و ناوبانگویســـت بکەونە ئەم داوەوە، بەتایبەت گەنجەکان.

– باشە، کەواتە تا ئێرە هاورامن. ئەی چار چییە؟

راسکۆڵنیکۆف لە وەڵامدا بزەیەکی کرد:

– کامە چار؟ جا خۆ خەتای من نییە. تا ئێسته هەر وا بووە و هەر واش دەبێ. ئەمان ئێســـتە گوتیان (ســـەرێکی بەرەو لای رازومیخین بزواند) من رەوایەتی بە خوێنڕشتن دەدەم. کۆمەڵگە، سوپاس بۆ خوا کە زیندان و تاراوگە و لێکۆڵەر و فەرمانی گرتنی لەگەڵ بێگاریدا[1] هەیە کە پارێزگارییەکی چاکیشـــی لێ دەکەن. هەر بە راســـتی ئەوە ناهێنێ بۆی نیگەران بن. دز دەبێ بگیرێ!

– باشە، با وای دابنێین کە گرتمان. ئەی دواتر؟

– دەی دواتر سزای کردەوەکەی وەردەگرێ!

– لۆژیکەکەتان نکۆڵیی لێ ناکرێ! بەس ئەی ویژدانی کابرا چیی بەسەر دێ؟

– ئێستە بۆچی خەمی ویژدانیتان لێ نیشت؟

– هیچ، تەنیا لەرووی مرۆڤدۆستییەوە ئەوەم گوت!

---

١. بێگاری: کاری زۆرەملێ؛ کارکردنی سەخت و بە زۆر، بەبێ پاداشت.

– ئەگەر ویژدانی هەبێ ئەوا لەپای هەڵەکەی تووشــی ئەشــکەنجە دەبێ و ئەمەش دەبێتە ســـزای کردەوەکەی. ئەمە بۆ ئەو لە بێگاری خراپترە.

ڕازومیخین دەموچاوی مۆن کرد و پرسیی:

– ئەی ئەو بلیمەتە ڕاســـتەقینانەی کە وا دیارە مافی تاوانکردنیان هەیە؟ ئەوان نابێ لەبەر ئەو خوێنەی کە ڕشتوویانە سزا بدرێن؟

– باشە ئێستە بۆچی دەبێ و نابێ بێتە ناو بابەتەکەوە؟ خۆ باسەکە ڕەوایەتیپێـدان و قەدەغەکردن نییە. ئەو بلـیمەتەش گەر خەمی قوربانییەکەیی لێ بنیشێ، ئەوا تووشی ئەشکەنجە دەبێ... فامی بڵند و دڵی گەورە ناتوانێ لە ئێش و ئازار هەڵبێ! لام وایە مرۆڤە گەورەکان لەسەر ئەم گۆیە خاکییەدا تووشی خەفەتێکی زیاتر دەبن.

ڕاســکۆڵنیکۆف دواهەمین ڕســتەی بە شـێوازێکی تێفکرانە گوت کە لەگەڵ باقیی گوتوبێژەکەدا یەکی نەدەگرتەوە.

پاشــان ســەری هەڵبڕی و نیگای تێفکرانەی لە یەک بە یەکیان بڕی، بزەی کرد و کڵاوەکەی هەڵگرت. لەچاو ساتی هاتنەوەژوورەوەیدا بەو دەنـگ و هەرایەوە، زۆر هێور بووبوو و خۆیشـــی ئـاگاداری ئەم جیاوازییە زەقە بوو. هەمووان هەستانەوە.

پۆرفێری پیترۆڤیچ سەرلەنوێ سەرەداوی قسەی گرتەوە دەست:

– باشــــە، ئەگەر حەزتان کرد، جوێنیش بدەن، لێم تووڕە بن، بەس من هیچ چارەیەکم نییە! پرسیارێکی ترم هەیە (دەزانم بوومەتە مووی لووت!). شـــتێکم بە زەینـدا هـاتووە کە بێگومـان دەمەوێ بیڵێم، گەر ئێستەش نەیڵێم دەترسم دواتر بیرم بچێتەوە...

ڕاســـکۆڵنیکۆف ڕەنگپەڕیو و زۆر جـددی، لەبەردەم پـارفێریـدا ڕاوەستابوو:

– باشـــــه، بڵێن با ئێمەش بزانین ئەو شـــــتە چییە کە بە زەینتاندا هاتووە.

– ئێ، دەزانن... راســـــتییەکەی نـازانم چۆن بیڵێم بۆ ئەوەی وەک خۆی بیگەیەنم! هزرێکی دەروونناسانەی گەلێک رووداارانەیە... لە کاتی نووســـینی ئەو گوتارەدا، بەدووری دەزانم بە زەینتاندا نەهاتبێ، هەهە، کە لەســـەر بنەمای ئەو روونکردنەوانەی خۆتان خســـتتاننە بەردەســـت، خۆتان لێ بووبێتە مرۆڤی ریزپەڕ و ویستبێتتان قسەیەکی تازە بکەن! وا بووە یان نا... بە رای خۆتان؟

راسکۆڵنیکۆف بە بێزاری و قێزەوە وەڵامی دایەوە:

– ئەگەری زۆرە وەها بیرکردنەوەیەکیشم بە زەیندا هاتبێ!

رازومیخین راچەنی.

– بەم پێیە، یانی رێی تێدەچێ ئەگەر لە ژیانی ئاسـاییتاندا تووشـی کێشـــەیەک شـــتێک ببن... یان تەنانەت گریمان ئامانجەکەشـــتان خزمەتکردن بێ بە مرۆڤایەتی، بڕیاری راماڵینی بەربەســـتەکانی ســـەر رێگەتان بدەن و بۆ نموونە خۆتان دەست بدەنە دزی و کوشتار؟

پۆرفیری هەمدیســـان چاوی چەپی لە راســـکۆڵنیکۆف داگرت و وەک جاری پێشوو بێدەنگانە پێکەنی.

راســـــکۆڵنیکۆف، یاخی و لووتبەرزانە بە ســـــووکایەتییەوە وەڵامی دایەوە:

– ئەگەریش بەربەستێک، شتێکم لەسەر رێگەکەم رابماڵیبا، لانیکەم دڵنیا بن بە ئێوەم نەدەگوت.

– نا من مەبەســـتم ئەوە نەبوو! بۆیە ئەوە دەپرســـم تا باشـــتر لە گوتارەکەتان تێبگەم، بەتایبەتی لە دیدگەیەکی ویژەییەوە...

راسـکۆلنیکۆف بە پەسـتی بیری کردەوە: *ئاخ بێچاوورووییی کەیشتووەتە چ ئاستێک!*

جا فرە وشک هاتە وەلام:

– دەرفەت بـدەن رایبکەیەنم کە من خۆم بە نـاپلیۆن یـان هەر کەسـایەتییەکی تری سـەر بەم دەسـتەیە نازانم و، لەبەر ئەوەش کە یەکێک لەوانە نیم، ناتوانم بەو جۆرەی کە حەز دەکەن بۆتانی روون بکەمەوە کە چیم دەکرد و چیم نەدەکرد!

پۆرفیری پیترۆڤیچ بە بارێکی خۆمانەی ترسناکەوە وەلامی دایەوە:

– ئەی هاوار، واز بێنن! ئەم رۆژانە کێ هەیە لە رووسـیای ئێمەدا خۆی لێ نەبووبێتە ناپلیۆن؟

ئەم جارەیان ئیدی تەنانەت شتێک لە شێوازی قسەکردن و ئاوازی دەنگیدا بەرانبەرەکەیی پەست دەکرد.

زامیۆتۆف کتوپڕ لە سووچێکی ژوورەکەوە خۆی هەڵقورتاند:

– کێ نالێ هەر یەکێک لەم ناپلیۆنانەی داهاتوو نەبووە کە حەفتەی رابردوو ئالیۆنا ئیڤانۆڤنای تەخت کردووە؟

راسـکۆلنیکۆف هیچی نەگوت، بەلام زەق و جـددی چـاوی لە پۆرفیری بڕی. رازومیخین رووی تاڵ کردبوو و تەنانەت بەر لەوەش باسـەکە بگاتە ئێرە، ئەوەی بە مێشـکدا هاتبوو کە دۆخەکە گوماناوی بووە و شـتێک لەئارادایە و ئێسـتەش بە تووڕەییەوە تەماشـای چواردەوریی دەکرد. بۆ خولەکێک بێدەنگییەکی قورس باڵی بەسـەر ئامادەبوواندا کێشا و راسکۆلنیکۆف پشتی تێ کردن تا بڕوات.

– بەتەمان بڕۆن؟

ئەم شـــێوازی قســـەکردنەی دوایی پۆرفێری هاوڕێیانە بوو و بە ڕێزێکی زیادەڕۆیانەوە دەستی بۆ ڕاسکۆڵنیکۆف درێژ کرد:

– زۆر زۆر خۆشـــحاڵم بە ناســـینتان! بۆ داخوازییەکەشـــتان هیچ دوودڵییەکتان نەبێ. هەر بەو جۆرەی کە گوتم نامەکە بنووســـن. یان ئەگەر ویســـتتان، باشـــتر وایە لە دەرفەتێکی ڕۆژانی داهاتوودا بێنە بەڕێوەبەرایەتی بۆ لای خۆم... حەز دەکەن سبەینێ وەرن. من نزیکەی کـاتژمێر یـازدە لەوێم. ڕای دەپەڕێنین... دەمەتەقێیەکیش دەکەین... لەوانەشـــە بتوانن یارمەتییەکی ئێمە بدەن، ئاخر هەرچۆنێک بووە ئێوە یەکێک بوون لەو دواهەمین کەسانەی کە لەو ماڵەدا بوونە.

پۆرفێری دواهەمین ڕســـتەی زۆر نەرمونیان و خۆشـــخووانانە دەربڕی.

ڕاسکۆڵنیکۆف قەڵس بوو:

– یانی دەفەرموون دەتانەوێ بە فەرمی لێکۆڵینەوەم لەگەڵ بکەن؟

– بۆچی؟ جارێ ئەمە پێویســـت نییە. ئێوە باش لە مەبەســـتی من تێنەگەیشـــتن. مەســـەلە ئەوەیە کە من هەر دەرفەتێک دەقۆزمەوە و... لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە بارمتەیان لای کوژراوەکە هەبووە، قســـەم کردووە... شـــــایەتیم لە هەنـدێکیـان وەرگرتووە و... ئێوەش وەک دواهەمین کەس... ئەها، ئەرێ بە ڕاست...

پۆرفێری وەک ئەوەی کتوپڕ شاگەشکە بووبێ دەنگی هەڵبڕی:

– بە ڕاست بیرم هاتەوە... باشە بۆچی لە بیرم کردبوو؟

ڕووی لە ڕازومیخین کردەوە:

– بیرتە ئەو ڕۆژە خەریک بوو مێشـــکت دەخســـتم و باســـی ئەو کوڕە، میکۆلایت دەکرد؟ هەڵبەتە خۆشم دەزانم... چاک دەزانم کە...

هەمدیسان ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆف کردەوە:

– چاک دەزانم ئەو کوڕە بێتاوانە، وەلێ چارەمان نەبوو. دەبوو میتریش پەلکێش بکەین... وەلێ بابەتە سەرەکییەکە ئەوەیە کە دەمەوێ ڕایگەیەنم: لەو کاتەی کە بە پلیکانەکاندا سەر دەکەوتن، لە حەوت لای دابوو، وایە؟

– بەڵێ.

ڕاسکۆلنیکۆف وەلامی دایەوە، بەلام هاوکات هەستێکی ناخۆشی تێ گەڕا و پێدەچوو وا باشتر بێت هەر هیچ نەڵێت.

– یانی ئێوە ئەو کاتەی کە لەنێوان کاتژمێر حەوت و هەشتدا سەردەکەوتن، ئەو دوو کرێکارە بۆیەچییە یان لانیکەم یەکێکیتان لە ئەپارتمانی نهۆمی دووەمدا کە دەرگەکەی کراوە بوو، نەبینی؟ خۆ بیرتان ماوە؟ ئەو دوو کەسە لە ناوەوە خەریکی بۆیەکردن بوون، یانی لەوێ سەرنجتان نەدا؟ ئاخر دەکرێ ئەمە بۆ ئەو چارەڕەشانە خاڵێکی چارەنووسساز بێ!

– بۆیەچی؟ نا، هیچ کەسێکم نەدیوە...

ڕاسکۆلنیکۆف بە ئەرخەیانی وەلامی دایەوە و پێدەچوو خەریکی تاوتوێکردنی یادگەی بێت. وەلێ سەراپای کرژ بووبوو و دەتگوت لەتاو پەستی خەریکە جام ببێت: *چ داوێکیان بۆ هەڵخستبوو؟ نەکا بەسەر شتێکدا تێپەڕێ و بکەوێتە داوەکەیانەوە؟*

– نا، نەمبینین و لام وایە هەر نەشمزانی دەرگەی ئەپارتمانی نهۆمی دووەم کراوەیە... وەلێ نهۆمی چوارەم...

لە داوەکە نەجاتی بووبوو و ئێستە هەستی بە سەرکەوتن دەکرد:

– نهۆمی چوارەم... وا بیرم دێتەوە کە خەریک بوون ئەپارتمانەکەی بەرانبەر ئالیۆنا ئیڤانۆڤنایان چۆڵ دەکرد... پێدەچوو هی فەرمانبەرێک بێ... زۆر باش بیرم دێتەوە و تەنانەت لە بەرچاومدایە... چەند حەماڵێک خەریکی گواستنەوەی ناوماڵەکە بوون، وا بزانم قەنەفە بوو... جا منیشیان بە دیوارەکەوە کەپس کردا وەلێ بۆیەچی... بیرم نایێ بۆیەچیم دیبێ و واشی بۆ ناچم دەرگەی ئەپارتمانێک کراوە بووبێ. نا، شتی وا نەبووە.

– بەدوای چییەوەی تۆ، ها؟

ڕازومیخین کتوپڕ هاواری گەیشتە ئاسمان، دەتگوت تازە تێگەیشتووە مەسەلە چییە.

– بۆیەچییەکان ڕۆژی کوشتنەکە لەوێ بوونە و ڕۆدیاش سێ ڕۆژ پێشتر لەوێ بووە! ئەوە منگەمنگی چیتە تۆ؟

– ئاخ خۆ من هەموو شتێکم تێکەڵ کردووە!

پۆرفیری توند بە تەختی تەوێڵییدا کێشا.

– نەفرەت لە شەیتان! ئەم مەسەلەیە بە گشتی مێشکی تێک داوم.

شێوازی قسەکردنەکەی وەک داوای لێبوردنکردن وا بوو و ڕووی دەمیشی لە ڕاسکۆلنیکۆف.

– ئاخر زۆر بۆ ئێمە گرنگە بزانین ئەو شەوە کەس ئەوانی لەنێوان کاتژمێر حەوت بۆ هەشتدا دیوە یان نا، ئیتر لەبەر ئەوە بوو وام بە خەیاڵدا هات کە لەوانەیە ئێوە بتوانن یارمەتییەکمان بدەن... بەس هەموو شتێکم تێکەڵ کردووە!

ڕازومیخین ڕووگرژانە بە گوێیدا دا:

– کەواتە دەبێ وردتر بی!

ئەم چەند وشـــەیەی کۆتا لە ڕاڕەوەکەدا ئاڵوگۆڕ کران و پۆرفیری پیترۆڤیچ بەوپەڕی ڕووخۆشـــییەوە تـا بەردەرگەکە ڕایی کردن. ڕاســـکۆلنیکۆف و ڕازومیخین مۆن و پەســـت هەنگاویان نایە ســـەر شـــەقـام و لە بێـدەنگییەکی تەواودا چەنـد هەنگـاوێکیـان بڕی. ڕاسکۆلنیکۆف هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا...

## شەش

ڕازومیخین کە سەراسیمە بوو و بە هەموو توانای خۆیەوە هەوڵی ڕەدکردنەوەی بەڵگاندنەکانی ڕاسکۆلنیکۆفی دەدا، هەر دەیگوت:

– من باوەڕ ناکەم، ناتوانم باوەڕ بکەم!

ئیدی خەریک بوون دەگەیشتنە بینای باکالییف کە پولخێریا و دونیا زۆر دەمێک بوو لەوێ چاوەڕوانیان بوون. ڕازومیخین هێندە شــێواو و ورووژاو بوو، لە ڕێگەدا زوو زوو ڕادەوەستا، چونکە ئەوە یەکەمین جار بوو بێپەردە لەبارەی ئەم بابەتەوە قسەیان دەکرد.

ڕاسکۆلنیکۆف بزەیەکی بێباکانە و ساردی کرد:

– باشە تۆ بڕوا مەکە! جەنابی پایەبەرزت وەک هەمیشە سەرنجت لەسەر بابەتە سەرەکییەکە نییە، وەلێ من خەریک بووم یەک بە یەکی وشەکانیانم سەنگوسووک دەکردن.

– دەی تۆ لە باش و خراپ بەگومانی، هەر لەبەر ئەوەشــە کە بەردەوام ســەرقاڵی ســەنگوســووککردنی!... ئمممم... بێگومان ئەوەم قەبووڵە کە شــێوازی قســەکردنی پۆرفیری ســەیر بوو. لە پارفێریش خراپتر زامیۆتۆفی ناپیاو!... بەهەرحاڵ ڕاســـت دەکەی، ئەو کابرایە گلاراوێکی هەبوو... بەس ئاخر بۆ؟ لەبەر چی؟

– لە دوێشەوەوە گۆڕاوە؟

– نا، مەســـەلەکە بە پێچەوانەوەیە، تەواو پێچەوانە! ئەگەر وەها بۆچوونێکی گەمژانەیان لە سەردا با، هەرچۆنێک بووە لەبەردەم ئێمەدا

رایان نەدەگەیاند و دەستی خۆشیان ئاشکرا نەدەکرد، بۆ ئەوەی دواتر بتوانن بەگیرت بێنن... وەلێ ئێستە، هەمووی وەک جۆرێ لە بێشەرمی و ڕووداماڵراوی وا بوو!

– گەر ئەمانە بەڵگەیەک شـتێکیان بەدەسـتەوە با، یانی بەڵگەیەکی پەسـەندکراو لەلایەن دادگەوە یان لانیکەم هۆکارێک بۆ گومانکردن لە من، ئەوسـا هەوڵیـان دەدا وەرەقەکەیـان دانەکەن، بۆ ئەوەی ئاتوی[1]زیاتریان بێتە دەسـت (جا لەو بارەدا دەمێک لەوەوبەر بەدوایدا وێڵ دەبوون!). بەس ئێستە هیچیان بەدەستەوە نییە. تەنیا بڕێک وەهم و قسەی دوودیوە، وەک ئەوەی ئاسمان دەمی کردبێتەوە و ئەم بیرە کەوتبێتە سـەر زەوی. هەر لەبەر ئەوەیە کە دەیانەوێ بەم یارییە قێزەونانەیان تووشـی سـەرەگێژەم بکەن. ڕەنگە لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی بەدەسـتەوە نییە، پەسـت بووە و لە ڕقاندا ئەم قسـانەی کردوون... لەوانەشە نەخشەیەک شتێکی هەبێ... ئەو، بە بۆچوونی من، کەسـێکی زیرەکە... پێدەچێ تەنیا ویسـتبێتی دەسـتێک بوەشـێنێ و بمترسێنێ... لەم نێوەندەدا، جۆرە شـەڕێکی دەروونییان هێناوەتە ئارا، کاکی خۆم. تەنانەت دڵم بە ڕوونکردنەوەشـی تێک هەڵدێ. هەر وازی لێ بێنە!

– بەس ئەمە سـووکایەتییە، سـووکایەتی! چاک لە حاڵت تێدەگەم! وەلێ... ئێستە کە خەریکین بێ پێچوپەنا باسی دەکەین (زۆر باشە کە دواجار قسـە هاتە سـەر ئەوە، من هەر زۆر خۆشـحاڵم!)، منیش دانی پێدا دەنێم کە زۆر لەمێژ بوو نیشـانەگەلی ئەم بۆچوونەم لەمانەدا دیبوون، یانی لە ئاسـتی پزیسـکێکدا بوو و تەنیا تانەیان دەوەشـاند، قسـەکە ئەوەیە، بۆچی دەبێ تەنانەت تانەش بوەشێنن؟ چۆن دەوێرن؟ باشـە ئەم بیرکردنەوەیە لە کوێوە سـەرچاوە دەگرێ؟ ئاخ ئەگەر

---

١. ئاتو: وەرەقی سەرکەوتوو لە یاریدا. «و. ک»

دەتزانی بە درێژایی ئەم ماوەیە چ مەراقێکم خواردووە! ئاخر تۆ بیری لێ بکەرەوە! بۆچی؟ لەبەر ئەوەی خوێندکارێکی تاپلووچی نەگبەت تێوە گلاوە کە بێپارەیی و ماخولیا زۆریان بۆ هێناوە و، بۆی هەیە لە هەر ساتێکدا ورێنە و نەخۆشییەکەی لێی پیس بکەن (خۆ هۆشت لامە!) کە پێدەچێ دەمێک بێ لەگەڵی بن و بە ڕواڵەت ئاسایی بێ؟ گەنجێ کە هەمیشە بەگومان و لووتبەرز و پێداگرە لەسەر بەهاکانی خۆی و شەش مانگی دەبێ تاقە بەشەرێک پێی نەناوەتە کونەمشکەکەیەوە. مرۆڤێ کە بەو دۆخە وێران و پووتە بێپاژنانەوە ناچار دەبێ بە تەنیا لەبەردەم کۆمەڵێ پۆلیسی خوانەناسدا ڕاوەستێ و تانەش ببیستێ و بەرگەی بێشەرمییەکانیان بگرێ. جا لەم نێوەندەشدا، چاوەڕوان نەبووە خاوەنقەرز و ئەو پسوولەیەی[1] چیبارۆف کتوپڕ یەخەی بگرن، سەرباری ئەمەش بۆنی ناخۆشی بۆیەی تازەی دەرگە و دیواری بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس و گەرما و هەوای تاسێنەر و یەک دونیا خەڵک کە لەوێ بوونە و باسی کوشتنی کەسێ کە ئەم داماوە هەر دوێنێ لای بووە... جا بیهێنە بەرچاوت هەموو ئەمانە بە سکی خاڵییەوە! پیاوم دەوێ لەو دۆخەدا نەبووریێتەوە! جا وەرە ئێستەش هەموو ئەمانە بنە بنەما و زەمینەی بەدگومانیی ئەو بەڕێزانە! خوا بە نەفرەتیان کا! دەزانم ئەمە ناخۆشە و پەستت دەکا، وەلێ گەر من لەجیاتی تۆ بام ڕۆدیا گیان، قەشمەریم بە هەموویان دەکرد... یان بۆچی قەشمەری؟ تفم دەکردە چڕوچاویان، جا چ تفێکیش! پاشانیش دە بیست زللەیەکی چاکم تێ دەسرەواندن. هەر ئەوە باشە. حسێبی سەگێکیان بۆ نەکەی! وەرەوە سەر خۆت! مایەی شەرمەزارین!

---

١. پسوولە: لەبەرانبەر «سەفتە»ی فارسیدا دانراوە، بە واتای: بەڵگەیەکی واژۆکراو کە تێیدا هاتووە کەسی واژۆکەر دانەوەی بڕە پارە یان قەرزێک لە وادەیەکی دیاریکراودا لە ئەستۆ دەگرێت.

ڕاســـکۆلنیۆڤ لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *وەلێ هەرچییەک بێ چاک باسەکەی کردەوە!*

جا زۆر بە ناڕەحەتی گوتی:

– بچم تف بکەمە چڕوچاویان؟ ئەی چی لە لێکۆڵینەوەکەی سبەینێ بکەم؟ یانی ناچارم هەموو شـــتێکیان بۆ ڕوون بکەمەوە؟ هەر ئەوەی کە دوێنێ خۆم تا ئاســـتی ئەو زامیۆتۆفە شـــوومە دابەزاند و لە مەیخانەدا بوومە هاودەمی وەک پێویست پەستی کردووم...

– دەک ملی خۆیان و بەزموڕەزم و ئەژداد و ئابادیان بشکێ! خۆم دەچمە سـەروەختی پۆرفێری و قسـەی لێ دەردەهێنم، خۆ بە ئاخێری گیانمـان خزمین! هەرچی هەیە و نییە لێی دەردەهێنم! ئەو زامیۆتۆفە شوومەش...

ڕاســـکۆلنیکۆف لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *ئاخیرەکەی ئەقلی پێ شکا!*

ڕازومیخین هەمدیسان چنگی بە شانید کرد و قیڕاندی:

– ئادەی بوەســـتە، بوەســـتە! تۆ هەڵەت کرد، زۆر چاک لە هەموو لایەکەوە شەنوکەوم کرد و تێگەیشتم تۆ بە هەڵەدا دەچی! کامە داو و کامە تەڵە؟ مەگەر ناڵێی بۆیە پرســـیاری بۆیەچیی لێ کردی تا بتخاتە داوەوە؟ ئاخر گەر ئەوە کاری تۆ با، هەڵدەسـتای و دەتگوت کەلوپەلی بۆیەکردنی ئەپارتمانەکەت دیوە و... بۆیەچییەکانیش؟ بە پێچەوانەوە، گەر دیتبووباشـــت دەهاتی و دەتگوت نەمدیوە؟ ئاخر کێ هەیە خۆی پێوە بکا؟

ڕاسـکۆلنیکۆف بە سـاردوسـڕی و بێزارییەکی ئاشـکراوە وەڵامی دایەوە:

– گەر ئەو مەســـەلەیە کـاری من بـا، بەبێ هیچ دوودڵییەک و دەستبەجێ دەمگوت هەم بۆیەچییەکانم دیون و هەم ئەپارتمانەکەش!

– وەلێ ئاخر بۆچی خۆت پێوە بکەی؟

– چونکە ئەوە تەنیـا لادێیی و نەزانە کـالفـامەکـانن لە کـاتی لێکۆڵینەوەدا نکوڵی لە هەموو شــتێ دەکەن. کەســـێ گەر بەقەد ســـەرەدەرزییەک ئەقـڵ و ئەزموونی هەبێ، ئەو بەڵگە بەرچـاو و دەرەکیـانەی کە نکۆڵییـان لێ نـاکرێ، پەســـەنـد دەکـا، وەلێ بۆ ڕوونکردنەوەی هەمان ئەو بەڵگانە بەدوای هۆکاری تردا دەگەڕێ و بە جۆرێکی تری تایبەت بە خۆی نزیک نیشـــانیان دەداتەوە و پێچێک دەخاتە بابەتەکەوە و بەم کارەشـــی دەبێ لە دیوێکی ترەوە لە هەموو شـــتێ بڕوانرێ. پۆرفێری دەبێ حســـێبی ئەوەی کردبێ کە من بەپێی ئەم ســـیاســـەتە وەڵامی دەدەمەوە و دەڵێم هەموو شـــتێکم دیوە تا سـەروشـکڵێکی ڕاسـتەقینە ببەخشـەمە باسـەکەم و پاشـانیش تۆزێک ڕوونکردنەوە و شتی بۆ بدەم.

– وەلێ خۆی دەســـــتبەجێ دەمکوتـــت دەکـا کە ڕێی تێنـاچێ بۆیەچییەکان دوو ڕۆژ پێشـــتر لەوێ بووبن و یەکســـەر بەو ئەنجامە دەگەیشـــت کە تۆ لە ڕۆژی کوشـــتنەکەدا لەنێوان کاتژمێر حەوت بۆ هەشت لەوێ بووی! جا چەندە بە ئاسانیش لەسەر ئەم خاڵە گەمژانەیە دەستتی ئاشکرا دەکردا!

– بەڵێ کتومت، پارفێریش وای بۆ دەچوو کە نەتوانم دەســـتبەجێ هۆشـم کۆ بکەمەوە و هەر بە تەنیا ئەوەندەم بوێ کە لەو شـپرزەییەدا بە دانەوەی وەڵامێکی قایلکەر ڕازی بم و بە گشتی بیرم بچێ کە ڕێی تێناچێ بۆیەچییەکان دوو ڕۆژ لەوەوپێش لەوێ بووبن.

– ئاخر چۆن دەچێتە ئەقڵەوە پیاو مەســـەلەی بۆیەچییەکانی بیر بچێ؟

– وەک ئاوخواردنەوە! ئەسڵەن بە پێچەوانەوە مرۆڤە زیرەکەکان کە دێنە سەر ئەو جۆرە وردەکاریانە بە ئاسانی تێدەکەون. بەرانبەرەکەت تا وریاتر بێ، کەمتر گریمانەی ئەوە دەکا بە شتگەلی کەمبایەختر پێوە ببێ. تۆ ئەم پارفیرییەت بە کەم زانیوە، ئەوەندەش گەمژە نییە کە بیری لێ دەکەیتەوە...

– دەی خۆ خوێڕی و ناپیاوە!

ڕاسکۆڵنیکۆف بێ ویست پێکەنی، بەڵام هاوکات هەستی کرد زۆر ڕووڕاست بووە و ئەو چەند خولەکەی کۆتا بە گوڕوتین و تامەزرۆییەکی بێڕادەوە قسەی کردەوە، لە بارێکدا کە پێشتر، لەبەر چەند هۆکارێکی تایبەت بە خۆی و ناچارییەکی تەواو، بە ڕووگرژی و بێزارییەوە بەژداریی لە گفتوگۆدا دەکرد.

لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: خۆ لە لایەکیشەوە چێژی لێ دەبەم.

وەلێ هێشتا بە تەواوی ئەو فکرەی بە مێشکدا ڕانەبردبوو کە کتوتڕ پەشێوییەک کەوتە گیانی، وەک ئەوە وا بوو شتێکی هەراسانکەر و چاوەڕواننەکراو هاتبێتە سەروەختی. نیگەرانییەکەی، تا دەهات زیاد و زیادتر دەبوو. ئیدی گەیشتبوونە بەردەرگەی سەرەکیی بینای باکالییف.

ڕاسکۆڵنیکۆف لەپڕ گوتی:

– تۆ بە تەنیا بچۆ! من زوو دەگەڕێمەوە!

– بۆ کوێ بە خێر؟ خۆ هێشتا نەگەیشتووین!

– ئەوەی ڕاستی بێ کارێکی گرنگم هەیە... هەر نیوکاتژمێرێکم پێ دەچێ... پێیان بڵێ دێم!

– بە دڵی خۆت! بەس منیش لەگەڵت دێم...

ڕاسکۆلنیکۆف قیڕاندی:

– کاکە ئاخر یانی تۆش دەتەوێ ئەشکەنجەم بدەی؟

دەنگی توورەییەکی هێندە چزوودار و نیگایشـــی وەها ناسـۆرێکی تێدا بوو کە ڕازومیخین یەکسەر پاشەکشەی کرد، چەند ساتێک هەر لەوێ لەســەر پلیکانە ســەرەکییەکە ڕاوەستا و خەمگینانە تەماشــای ڕاسکۆلنیکۆفی کرد کە بە خێرایی و شەقاوی درێژەوە بەرەو ماڵەکەی دەچوو. دواجار توند ددانەجیڕەیەکی کرد و مستی ڕەق کرد و بەڵێنی بە خۆی دا هەر ئەو ڕۆژ بە چەشـــنێک پۆرفیری بگوشـــێت کە وەک لیمۆی ئاوگیراو تەنیا تلفەکەی بمێنێتەوە، جا چووە ســــەرێ تا ئیدی کۆتایی بە دڵەڕۆشـــی پولخێریا بێنێ کە لەبەر دواکەوتنیان نیوەگیان بووبوو.

ڕاسـکۆلنیکۆف کە گەیشـتەوە ماڵێ، قژی لە ئارەقەدا خووسـابوو و بە دژواری هەناســـەی بۆ دەدرا. خێرا بە پلیکانەکاندا فڕکەی کردە ســـەرێ و ڕاســـتەوڕاســـت بەرەو ژوورەکەی چوو و دەمودەســـت کلۆمەکەی کردەوە. پاشان زۆر تۆقیوانە ڕایکردە سووچی ژوورەکە و چووە ســـەروەختی کونی پشـــت کاغەزەدیوارییەکە کە وردەواڵەکەی تێدا شـــاردبووەوە؛ دەســـتی بە کونەکەدا کرد و چەند خولەکێک بە باشی پشکنیی. پەنجەکانی بە هەموو کونج و کەلەبەرێکدا دەچوون و بە کـاغەزەکەدا دەخشـــان. هیچی نەدۆزییەوە، هەســـتـایەوە و هەناســـەیەکی قووڵی هەڵکێشـــا. کە لەبەردەم دەرگەی بینای باکالییڤدا بوون، کتوپڕ تووشـــی ئەو خەیـاڵاتە بووبوو کە نەکـا بۆ نموونە زنجیرێک یان قۆپچەی سەرقۆڵێک، شتێک یان تەنانەت پارچەیەک لەو کاغەزەی کە لە شـــتەکانەوە پێچرابوو و دەســـتخەتی پیرێژنەکەی بەســـەرەوە بوو، لە دەســـتی کەوتبێ و لە درزێکدا جێ مابێت و هەر ئەمەش لەناکاوێکدا ئاشـــکرا ببێت و وەک بەڵگەیەکی چاوەڕوانینەکراو و سەلمێنەر لە دژی خۆی بەکار بهێندرێت.

هەر وا بەدەم بیر و خەیاڵەوە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستابوو و بزەیەکی سەیر و سووکایەتیئامێز و تا ڕادەیەک دەبەنگانە بەسەر لێویەوە سەمای دەکرد. دواجار کڵاوەکەی هەڵگرت و ژوورەکەی جێ هێشت. هەموو شتێک لە زەینیدا تێک ئاڵابوو. کاتی دەرکەوتن لە دەرگەی سەرەکییەوە، هێشتا فکر و خەیاڵ بردبوویەوە.

دەنگێکی بەرز هاواری کرد:

– فەرموو، ئەسڵەن ئەوە خۆیان هاتن!

ڕاسکۆلنیکۆف سەری هەڵبڕی. قاپچی لە بەردەرگەی ژوورەکەیدا ڕاوەستابوو و ئەوی نیشانی پیاوێکی کەم تا زۆر بالاکورت دەدا کە لە کاسبکاران دەچوو، شتێکی وەک کراسی ماڵەوە و هێلەکێکی لە بەردا بوو و لە دوورڕا زیاتر لە ژن دەچوو تا پیاو. پشتی کووڕ و سەری لەژێر کڵاوە چڵکنەکەیەوە شۆڕ دەینواند. دەموچاوی چرچولۆچاوی و داتەپیوی نیشانی دەدا کە دەمێکە پەنجا ساڵی تێپەڕاندووە. کابرا وەک ئەوەی دژمنداریی لەگەڵ دونیادا هەبێ، بەو چاوە ورد و پێلووە ئاوساوانەیەوە گرژ و مۆن و ناڕازی لە دەوروبەریی دەڕوانی.

ڕاسکۆلنیکۆف چووە لای قاپچی:

– مەسەلە چییە؟

کابرا لابەلا و لەژێر برۆ پڕەکانییەوە تەماشایەکی ڕاسکۆلنیکۆفی کرد، هەر وا تاوێک ئاشکرا بە سەرنجەوە لێی ڕاما، چاکچاکێک هەڵیسەنگاند. پاشان بە هێمنی وەرسووڕا و بەبێ هیچ قسەیەک لە دەرگە سەرەکییەکە تێپەڕی و هەنگاوی نایە سەر شەقام.

ڕاسکۆلنیکۆف هاواری کرد:

– مەسەلە چییە؟

- هیچ کاکە، ڕاســـت هاتووە و دەپرســـێ فلانە خوێندکار لێرە دادەنیشـــێ... ناوی ئێوەی هێنا و خاوەنماڵەکەتان. ئێســـتەش هەر کە بینیم وا دێن، ئێوەم نیشـــان دان، وەلێ کابرا ملی نا و ڕۆیشـــت! ئاخیرزەمانە بە خوا!

قاپچییەکەش تۆزێک گێژ و سەراسیمە بووبوو، بەس نەک هێندەش جددی. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ســـوورێکی بەو دەوروبەرەدا دا و گەڕایەوە ژوورەکەی.

ڕاســـکۆلنیکۆف کەوتە شـــوێن غەوارەکە و یەکســـەریش دیتی کە ئەرخەیان و بە هەمان هەنگاوی یەکهاوییەوە بە جۆرێک لە بەرێکی دیکەی شـــەقامەکەوە چاوی بڕیوەتە زەوی و ڕێ دەکات وەک ئەوەی شـــتێک لە زەینیدا ســـەنگوســـووک بکات. زۆر زوو بە غەریبەکە ڕاگەیشـــتەوە، بەس هەر چەند هەنگاوێک لە دوایەوە مایەوە و پێشـــی نەکەوتەوە. دواجار شـــانەوشـــانی غەریبەکە بووەوە و تەماشـــایەکی ڕووخســـاریی کرد. کابراش دەســـتبەجێ هەســـتی بە ئامادەگیی کرد و ســـەنگین لێی ڕوانی، بەڵام هەمدیســـان چاوی لە زەوی بڕییەوە. بەم جۆرە بۆ ماوەی خولەکێک شـــان بە شـــان هەنگاویان نا و هیچ قسەیەکیشیان نەکرد.

ئەوە ڕاســـکۆلنیکۆف بوو کە دواجار ســـەری قســـەی کردەوە، بەڵام بە دەنگێکی زۆر کپەوە:

- لای قاپچی... هەواڵی منتان پرسیبوو؟

غەوارەکە وەڵامی نەدایەوە و تەنانەت لێشـــی نەڕوانی. هەمدیســـان بێدەنگی باڵی کێشایەوە.

- ئەی بۆچی... دێن... هەواڵی من دەپرســـن و... پاشـــانیش نقەتان لێوە نایێ... ئەمە یانی چی؟

دەنگی ڕاسکۆلنیکۆف لە گەروویدا شکا و وا دیار بوو ناتوانێ بە ڕێکی و ڕوونی وشەکان دەرببڕێت.

کابرای نەناسراو ئەم جارەیان سەرنجی لە زەوی کلا کرد و نیگای نەحس و مۆنی لە ڕاسکۆلنیکۆف بڕی. کتوپڕ بە هێمنی، بەڵام ڕوون و ڕەوان گوتی:

– ئەی بکوژ!

ڕاسکۆلنیکۆف هەر وا خەریک بوو شان بە شانی کابرای غەوارە هەنگاوی دەنا. لاقەکانی کتپڕ هێزیان لێ بڕا و چەمانەوە، پشتی بەستی و لەرزە کەوتە گیانییەوە. وەک ئەوە وا بوو دڵی بۆ ماوەی خولەکێک لە کار کەوتبێ و، پاشان لەپڕێکدا، وەک ئەوەی لە کۆتێک ڕزگاری بووبێت، سەرلەنوێ کەوتەوە ترپە. بەم دۆخەوە سەد هەنگاوێک بە بێدەنگی و شانبەشانی یەک ڕێیان کرد.

غەوارەکە ئیدی لە ڕاسکۆلنیکۆفی نەڕوانی.

ڕاسکۆلنیکۆف لەژێر لێو و بە دەنگێکەوە کە بە ئاستەم دەبیسترا، ورتاندی:

– مەبەستتان چییە... چیتان دەوێ... بکوژ کێیە؟

پیاوە نەناسراوەکە ئەم جارەیان ڕوونتر و پچڕپچڕ، بە دانان بە بڕگەیەکی وشەکاندا وەڵامی دایەوە:

– بکوژ تۆی!

نیوەبزەیەکی پڕ لە قێزی سەرکەوتووانەشی بەسەر لێوەوە بوو و ئەم جارەیان ڕاستەوڕاست واقی بە دەموچاوی ڕەنگپەڕیو و چاوانی تاساوی ڕاسکۆلنیکۆفدا وڕ ما. تازە گەیشتبوونە دووڕیان. غەوارەکە بە ئاراستەی دەستە چەپدا لای دا و هەر ئاوڕیشی نەدایەوە.

ڕاسکۆلنیکۆف لە شوێنی خۆیدا وشک بوو و پێیدا وڕ بوو. بینیی غەوارەکە پەنجا هەنگاو لە پێشترییەوە لای کردەوە و لەوی ڕوانی کە هێشتا لە شوێنەکەی خۆیدا ڕاوەستابوو. ڕاسکۆلنیکۆف نەیدەتوانی لەو مەودایەوە باش ببینێ، وەلێ وای هاتە بەرچاو کە پیرەمێردەکە دیسان هەمان نیوبزە پڕ لە قێز و سەرکەوتووانەکەی کردووەتەوە.

ڕاسکۆلنیکۆف، تەزیو تا سەر مۆخی ئێسک، بە هەنگاوی خاو و ئەژنۆی لەرزۆکەوە، لەتری دا و بەڕێ کەوت تا دواجار گەیشتە کۆرەولەکەی. کڵاوەکەی لە سەر داگرت، خستییە سەر مێزەکە و دە خولەکێک بێ جووڵە لای مێزەکەوە ڕاوەستا. پاشان لەتاو ماندوویەتی کەوتە سەر قەنەفەکە و بە ئازار و ناڵەیەکی خەفەکراو و کزەوە بە پشتدا ڕاکشا و چاوەکانیشی نوقاندن. نیو کاتژمێرێک لەم دۆخەدا ڕاکشا.

بیری لە بابەتێکی تایبەت نەدەکردەوە. دەتگوت خەیاڵگەل یان بیری نیوەچڵی نامۆ و وێناگەلی سەیروسەمەرە و پەرتەوازە و، شتگەلێک لە زەینیدا ئامۆشۆیان بوو و ڕووخساری کەسانێک کە بە منداڵی دیبوونی یان لە شوێنێکدا تووشیان بووبوو، بەڵام ڕێی تێنەدەچوو هەر وا بێنەوە بیری، تاوەری زەنگی کڵێسای ڤازنیسکی، مێزی بلیاردی فڵانە ڕێستۆرانت و ئەفسەرانێک کە یاریی بلیاردیان دەکرد، بۆنی جگەرەی فڵانە دوکانۆکەی تووتنفرۆشی کە لە ژێرزەمینێکدا بوو و پلیکانێک دەچووەوە سەری، مەیخانەیەکی بچووک، پلیکانی پشتەوەی بینایەک کە لە قیر ڕەشتر و قوڕاوی و پیس و داپۆشراو بە توێکڵە هێلکە و زایەڵەی زەنگی یەکشەممان لە نادیارەوە... وێناکان یەک لەدوای یەک و گێژاوئاسا بە زەینیدا ڕابردن. وێنایان تێدا بوو کە پێی دڵخۆش بوو و دەیویست چنگیان لێ گیر بکات و نەهێڵێت دەربچن، وەلێ دواجار هەرچییەک بوو گشتی ڕەوییەوە. بە درێژایی ماوەکەش لە دەروونی خۆیدا هەستی بە گوشارێکی قورس دەکرد.

نەک هەر گوشارە دەروونییەکەیی سەرکوت نەدەکرد، بەڵکە هەستێکی خۆشیشی تێدا بینییەوە.

کە دەنگی هەنگاوی بەگوڕمی ڕازومیخینی بیست، چاوی لێک نا و وای نوواند کە خەوتووە. ڕازومیخین دەرگەی کردەوە و وەک ئەوەی دڕدۆنگ بێت کە ئایا بچێتە ژوور یان نا تا ماوەیەک لە ئاستانەکەدا ڕاوەستا، پاشان هەنگاوی نایە ژوور و بەکاوەخۆ بەرەو قەنەفەکە چوو.

ڕاسکۆلنیکۆف چپەچپی ناستاسیای بیست:

– وازی لێ بێنە، لێگەڕێ با بخەوێ، دواییش بێ هەر فراوێنەکەی دەخوا.

جا ڕازومیخین وەڵامی دایەوە:

– ئەرێ، بخەوێ چاکترە!

هەردووک بەپارێز و لەسەرخۆ چوونە دەرێ و دەرگەکەیان پێوەدا. نیو کاتژمێری دیکەش تێپەڕی. ڕاسکۆلنیکۆف چاوی کردەوە، دەستەکانیی لە پشت سەرییەوە لێک گرێ دان و هەمدیسان لەسەر گازی پشت بۆی خەوتەوە...

*ئەم کابرایە کێ بوو؟ باشە ئەم کابرایە کێ بوو کە لەپڕێکدا دەتگوت لەژێر زەوییەوە هەڵتۆقیوە؟ تۆ بڵێی لە کوێ بووبێ و چیی دیبێ؟ هەموو شتێکی دیوە، وەک ڕۆژ ڕۆشنە! ئاخر لە کوێ خۆی بۆ مات داوە و چاودێریی خستوومەتە سەر؟ ئەی بۆچی ئێستە قوت دەبێتەوە؟ باشە چۆن ڕێی تێدەچێ ئێستە دیبێتی؟ یانی وەها شتێ ئەقڵ دەیبڕێ؟... ئمممم...*

ڕاسکۆلنیکۆف کتوپڕ بەستی و لەرزی لێ نیشت، وەلێ لەبەرخۆیەوە درێژەی پێ دا: *ئەی ئەو سندووقچەیەی کە میکۆلای*

*لەپشت دەرگەکەوە دۆزیویەتییەوە... ئەسلەن شتی وا دەچێتە ئەقڵەوە؟ دەشــێ بکرێتە بەڵگە؟ گەر هەزار ســەرەداویش بســڕیتەوە، هەزار و یەک دانەت هەر لەدەســـت دەردەچن و ئێســـتەش فەرموو؛ کێوێک بەڵگەی بە بەرزایی هەرەمەکانی میسر لێ دروست دەکرێ! بەو ناوەدا مێشــێک بە هەواوە بووە و هەموو شـــتێکی دیوە! باشـــە ئەمە ئەقڵ دەیبڕێ؟*

کتوپڕ، لەوپەڕی بێزاریدا هەستی کرد فرەفرە لاواز بووە، بەتایبەت لە لایەنی جەستەییەوە.

ژارخەندێکی کرد و فکر و خەیاڵ بردییەوە: *دەبوو سۆســەی بکەم. باشـــە من چۆن زاتی وەها کارێکم کرد؟ بە ناخێری گیانم خۆ خۆمم دەناســی، ســەرباری ئەوەش دڵم هەواڵی دابوو کە بڕیارە چیم بەسەر بێ! جا هەستام چیم کرد؟ دەستم دایە تەورێک و ئاگایانە سەر و پێی خۆمم لە خوێن گەوزاند! دەبوو پێشوەختە بمزانیبا!...*

بە بێهیوایی ورتاندی: *ئاخ! بەس خۆ من پێشوەختە دەمزانی!*

جاروبار ئێســـتێکی دەکرد، وەک ئەوەی بیرکردنەوەیەکی تایبەت بزمارکوتی کردبێت.

*نا کاکە، وا دیارە ئەوان لە توخمێکی ترن! بە هەموو مانایەک ئاغا، کە بێ کۆت و بەند مافی کردنی هەر کارێکیان هەیە، تولون[1] تاڵان دەکا، لە پاریسدا دەیکاتە کوشتوبڕ، سوپاکەی لە میسردا جێ دەهێڵێ، کە لەشکرکێشی دەکاتە سەر مۆسکۆ، گیانی نیو ملیۆن خەڵک دەکێشێ*

---

١. Toulon: شـارێکی فەرەنسـییە، دەکەوێتە باشـووری فەرەنسـا، لە کەنار زەریای ســپی ناوەڕاســت. بە شـــوێنێکی زۆر ســـتراتیژی دادەنرێت، چونکە زۆرترین و گەورەترین ســـەربازگەی لە خۆی گرتووە. هاوکات تێیدا کەلوپەلی فڕۆکە و بەلەم دروســت دەکرێت و، بڕێکی زۆری ترێی ولاتیش هەر لەوێ بەرهەم دەهێنرێت. «و. ک»

*و ئاخرییەکەشی لە ویێلۆ هەموو شتێ بەدەم پێکەنینەوە رایی دەکا و جا دوای مردنیشـــی بە یادی ئەوەوە چەندان پەیکەر قوت دەکەنەوە! کەواتە هیچ نکۆڵیکردنێکی تێـدا نییە کە هەموو شـــتێ بۆ ئەوان رێپێدراوە! نا، هەر دەڵێی ئەم مرۆڤانە لە گۆشـــت و خوێن نین، ئەوان لە برۆنز دروست کراون!*

لەم بێنەوبەردەیەدا کتوپڕ فکرێکی ناپەیوەســـتی بە زەیندا هات و خەریک بوو بکەوێتە پێکەنین: *لە لایەک ناپلیۆن و هەرەمەکانی میســر و واتەرلۆ... لە لایەکی تریشـەوە پیرێژنێکی سیسـەڵەی مردۆخ کە ژنی بابایەکی چارەڕەشی سەرقەڵەم بووە و خۆیشی سووخۆرێکی چەپەڵ و قێزەون بەو جانتا سـوورەی ژێر تەختەخەوەکەیەوە! چۆن کەسـانی وەک پارفێری پیترۆڤیچ ئەقڵیان بەم شـتانە دەشـکێ!... بۆ مەگەر ئەم بابەتـانە بەوان هەزم دەکرێن!.... ئەم دیمەنە تـا دڵ حەزکا بەرییە لە جوانیناســی: ناپلیۆنێک خۆی کیف کردووەتەوە و کەچی دەخزێتە ژێر تەختەخەوی پیرەژنێکەوە! ئاااخ، بۆ شتێ هەیە لەم دیمەنە پڕوپووچتر بێ!...*

جارجار هەســـتی بە وڕێنە دەکرد و دەکەوتە دۆخێکی شـــێواو و تادارەوە کە دەهاتە ســـەروەختی و هەندێک جاریش بێباک و هەڵچوو بیری دەکردەوە: *پیرەژنێکی هیچوپووچە! لەوانەیە هەڵە سەرەکییەکەی من پیرێژنەکە بێ، وەلێ مەســـەلەکە لە بنەڕەتدا لەســـەر ئەو نییە! ئەو پیرێژنە تەنیـا میکرۆبێـک بووە و هیچی ترا... من هەڵپەم بوو تـا لە هێڵەکە تێپەڕم... ئەوەی کە من کوشـــتم مرۆڤ نەبوو، من ڕێســـایەکم لەناو برد! ئەرێ، لەوانەیە بنەمایەک و ڕێســـایەکم کوشـــتبێ، کەچی نەچوومە ئەودیو هێڵەکە و هەر لەمدیو مامەوە!... تەنیا توانیم کەسێک بکوژم. بەس وا بزانم چاک دەرەقەتی ئەوەش نەهاتم... بنەما و ڕێسا؟ بۆچی ڕازومیخینی دەبەنـگ خەریکی ســـەرکۆنەکردنـی ئەو سۆسیالیستانە بوو؟ ئەم سۆسیالیستانە کەسانێکی زەحمەتکێش و*

*کاسبن و خەمی بەختەوەریی گشتییانە. نا کاکە گیان، بۆ مەگەر بڕیار وایە ئێمە زیاد لە جارێک بژیین؟ خۆ مەمدیســـان ژیانێک ناخەنەوە مشـــتمان! کەواتە من نامەویَ بەدیار بەختەوەریی گشـــتییەوە لێی دانیشـــم! دەمەویَ خۆم بژیم، دەنا بەدەر لەوە هەر نـامەویَ! تەنیا نەمویســـت بێباکانە بەلای دایکێکی برســـیدا تێپەڕم و ڕۆبڵەکەشـــم لە گیرفانمدا بشــارمەوە و چاوەڕوانی بەختەوەریی گشـــتی بم! جا بەوە دڵی خۆم بدەمەوە کە، لەڕێی بەختەوەریی گشتییدا بەش بە حاڵی خۆم هەوڵێکم داوە. هاها! بۆچی چاوتان لەئاست مندا داخست؟ بڕیارە من تەنیا جارێک بژیم و دەمەویَ... ئاخر خۆ من لە ئەسپێیەکی جوانیناس بەولاوە هیچی تر نیم!*

کتوپڕ وەک شـێت دایە پێکەنین و لەبەرخۆیەوە لەسـەری ڕۆیشـت: *بەڵێ، من هەر بە ڕاستی ئەسپێیەکم!*

گرتی بەم بیرکردنەوەوە و وازی لێ نەهێنا، چێژێکی نەگریســـانەی لەوە دەبرد کە هەر وا کاوێژی بکاتەوە و بۆ ســـــەرقاڵی لە زەینیدا یاریی پێ بکات: *گەر هیچ بەڵگەیەکی تریش نەبێ، ئەوا ئەم چەند دانەیە هەن: یەکەم ئەوەی کە ئەســـپێم، چونکە وا هەر ئێســـتەش بیر لەوە دەکەمەوە کە ئەســـپێیەکم. دوو، ئەوەی کە یەک مــانگی ڕەبەق دەســـتەوداوێنی خوای میهرەبان بووم و ئەوم کردە شــاهێد کە لەبەر حەز و ئارەزووی خۆم ئەم ڕێگەیەم نەگرتووەتە بەر و ئامانجێکی بڵند و بێوێنەم هەیە، هاها! سێ، ئەوەی کە من دەمویست بە هیچ شێوەیەک سنووری دادپەروەری و ویژدان نەبەزێنم و هەر هەنگاوێک کە دەینێم ویژدانـدارانە بێ، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە بە درێژایی ئەو مـاوەیە هەر خەریکی سەنگوسووککردن و هەڵسەنگاندن بووم و لەنێو هەموو ئەسـپێکانی جیهانیشـدا بێکەڵکترینیانم هەڵبژارد و وەختێکیش کوشـتم هەر بە تەنیا دەمویســـــت ئەوەندەی لێ هەڵگرم کە لە دەســـتپێکی*

*کارەکەدا پێویستم بوو، نە زیاتر و نە کەمتر (ماباقیی پارەکەی خانمخاسیش بەپێی وەسیەتەکەی دەدرێتە پەرستگە... هاها!)....*

ددانەجیڕەیەکی کرد و لەسەری ڕۆیشت: *من بوومەتە ئەسپییەکی تەواو، چونکە... چونکە پێدەچێ خۆم لەو ئەسپێیە کەمتر و چەپەڵتر بم کە لەژێر پێمدا پلیشاندمەوە، جا هەر ئەو کاتەش دڵم هەواڵی دابوو کە دوای کوشتنی، بڕیارە ئەم قسانە بکەم! ئاخر چ ترسێک هەیە لەمە گەورەتر بێ؟ ئاخ لەو بوودەڵەییە، لەو سووکییە!... ئاخ چەندە باش لەو پەیامبەرە تێدەگەم کە شمشێربەدەست بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە دەیگوت: «فەرمان، فەرمانی ئەڵلایە، کەواتە ملکەچ بە ئەی بەندەی لەرزۆک!» کاری پەیامبەر دروست بوو، کارێکی باشی کرد کە گڕی بەردایە شەقامەکان و گوناحبار و بێگوناحی پێکەوە سووتاند و بە ڕوونکردنەوە و پاساودانیش لە ئاستی خۆی دانەبەزاند! تۆ، ئەی بەندەی لەرزۆک، دەبێ ملکەچی فەرمانی خواوەندەکەت بی و داواکارییەکیشت نەبێ، لەبەر ئەوەی ویستن کاری تۆ نییە!... ئاخ خۆ من هەرگیز، هەرگیز لەو پیرێژنە نەفرەتییە خۆش نابم!*

قژەکانی لە ئارەقەدا خووسابوون و لێوە لەرزۆکەکانیشی وشک و نیگایشی ڕسیبووە بنمیچەکە.

*دایکم و خوشکم... منێک کە ئەوەندە خۆشم دەویستن، بۆچی ئێستە پێیان پەستم؟ ئەرێ، ڕقم لێیانە، بە جۆرێ لە جۆرەکان ڕقم لە ئامادەییانە و بەرگەی نزیکییان ناگرم!... چوومە لای دایکم و ماچم کرد... ئەوەم لە بیرە... باوەشم پێدا کرد و بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر تێبگا چی... یانی بەتەمام پێی بڵێم؟ جا خۆ شتی واشم لێ دەوەشێتەوە! ئممممم! ئەویش هەر دەبێ وەک خۆم بێ...*

گوشاری دەخستە سەر خۆی تا بتوانێت بیر بکاتەوە، دەتگوت خەریکە لەگەڵ وڕێنەدا دەستەویەخە دەبێت: *ئاخ من ئێستەش چەندە*

*بێزارم لەم پیرێژنە نەفرەتییە! لام وایە گەر هەمدیسان زیندوو بێتەوە، جارێکی تریش لێی دەدەم و دەیکوژمەوە! تۆ سەیری لیزاڤێتای داماو، ئاخر بۆچی لە کتوپڕێکدا خۆی بە ژووردا کرد؟... وەلێ زۆر سەیرە کە نازانم بۆچی لیزاڤێتاشم هەر بە خەیالدا نایێ؟ هەر نالێی ئەویشم کوشتووە!... لیزاڤێتا! سۆنیا! ئەو منالە پاک و ژیکەلانە، بەو چاوە جوانانەیانەوە... ئەمانە چەندە نەرمونیانن! ئەی بۆچی ناگرین؟ بۆچی ئاه و نالەیان بەرز نابێتەوە؟ هەموو شتێکیان لەدەست داوە... چەندە هێمن و بێگەردانە تەماشا دەکەن... سۆنیا، سۆنیا! سۆنیای هێمن!...*

ئەم جارەیان لەبیرچوونەوە هاتە سەروەختی. بەلای خۆشییەوە سەیر بوو کە نەیدەتوانی بیر خۆی بهێنێتەوە کە چۆن گەیشتووەتە سەر شەقام. تاریکانی دەمەوئێواران بوو و مانگی چواردەشەوە درەوشاوەتر لە هەر ساتێک دەتریفایەوە، بەلام پێدەچوو هەوا لە پێشوو زیاتر تاسێنەر بێت. شەقامەکان جمەیان دەهات لە خەلک، پیشەگەر و کرێکار و فەرمانبەرەکان پەلەپەل بەرەو مالەکانیان دەچوونەوە و ئەوانی دیکەش کەسانێک بوون کە هاتبوون تا پیاسەیەک بکەن. بۆنی مەلات[1] و تۆز و خۆل و گەنداو دەهات. ڕاسکۆلنیکۆف خەمگین و زەینپەرت شەقامەکەی تەی دەکرد؛ باش دەیزانی کە بە مەبەستێک لە مالەکەی هاتووەتە دەر و کارێکی پێویستی هەبووە کە دەبێت هەرچی زووە بیکات، بەلام بیری نەدەهاتەوە کتومت چی بووە. کتوپڕ لە جێوە وشک بوو. چاوی بە پیاوێک کەوت کە لەوبەری شەقامەکەوە و لە پیادەڕێکەدا ڕاوەستاوە و ئاماژەی بۆ دەکات. ڕاسکۆلنیکۆف بە شەقامەکەدا پەڕییەوە تا بچێتە لای پیاوەکە، وەلێ پیاوەکە دەمودەست بە سەرێکی شۆڕەوە، وەک ئەوەی کە هەر دەستی بۆ کەسێک ڕانەوەشاندبێت، وەرچەرخا و تەنانەت ئاوڕیشی لە دواوە نەدایەوە.

---

١. مەلات: هەویری لە قوڕ، ساروج، چیمەنتۆ و... بۆ پێکەوەلکاندنی خشت و بەرد.

ڕاسـكۆڵنيكۆف لە فكردا ڕۆچوو: *بوەسـتە بزانم! كێ دەڵێ ئەسـڵەن كابرا دەستی بۆ ڕاوەشاندووم؟*

لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵی دا بە پیاوەكە ڕابگاتەوە. كە مەودای نێوانیان بووەوە دە هەنگاوێک، كتوپڕ ئەوی ناسـيیەوە و تاسـا، یارۆ پیاوە كوورەكە بوو بە هەمان جلوبەرگەوە. ڕاسـكۆڵنيكۆف مەوداكەی نێوان خۆی و ئەوی پاراسـت؛ دڵی خۆی بە سـنگیدا دەكوتی. خۆیان بە شـەقامێكی دیكەدا كرد، بەڵام پیاوەكە هەر وا ڕێی دەكرد و ئاوڕی نەدەدایەوە.

پیـاوەكە لە دەرگەی سـەرەكیی بینـایەكەوە چووە ژوورێ. ڕاسـكۆڵنيكۆفیش فڕكەی كردە بەردەم دەرگەكە و ملێكی درێژ كرد تا بزانێ ئـاخۆ پیـاوەكە لا دەكـاتەوە ئـامـاژەیەكی بۆ بكـات یـان نـا. لە حەسـاری بیناكەدا وەرسـووڕا و ئاماژەیەكی بۆ ڕاسـكۆڵنيكۆف كرد، ئەویش دەمودەسـت بەدوای غەوارەكەدا خۆی بە حەسـارەكەدا كرد، بەس پیـاوەكە دیـار نەمـابوو. پێدەچوو هەر لە یەكەمین پلیكـانەڕێوە چووبێتە سـەرێ. ڕاسـكۆڵنيكۆفیش بە پلیكانەكاندا فڕكەی كردە سـەر. وا دیـار بوو سـۆسـەكەی لەجێی خۆیەتی، ئـاخر لە دوو نهۆمی سـەرترییەوە دەنگی هەنگاوگەلێكی شـێنەیی و لەسـەرخۆی بیسـت. شـتێكی دیكەش هەبوو: زۆر بە پلیكانەكە ئاشـنابوو! گەیشـتە لای پەنجەرەی نهۆمی یەكەم. تریفەی مانگ، خەمگین و تەلیسـماوی لە شیشـەوە دەهاتە ژوور. پاشـانیش نهۆمی دووەم. ئۆوا! ئەوەش هەمان ئەو ئەپارتمانەی كە بۆیەچییەكان ئیشـیان تێدا دەكرد... وەلێ بۆچی دەسـتبەجێ بیناكەی نەناسـیبووەوە؟ دەنگی هەنگاوی پیاوەكە بە بان سـەرییەوە كەم و كەمتر بووەوە تا دواجار بە یەكجاری نەما. *كابرا وەسـتاوە یان كونێكی دۆزیوەتەوە و خۆی تێناوە!* گەیشـتە نهۆمی سـێیەم. دوودڵ بوو كە ئـاخۆ بەرەو پێش بچێـت یـان نەچێـت. بێدەنگییەكی زراوبەر باڵی كێشابوو... بەڵام ڕاسكۆڵنيكۆف درێژەی بە

ڕێگەکەی دا. تەنانەت دەنگی هەنگاوەکانی خۆیشـــی دەیترســـاند و شـپرزەی دەکرد. خوایا، ئاخ لەدەســـت تاریکی! بە دڵنیاییەوە خۆی لە کونج و کەلەبەرێکی ئەو ناوە نابوو. ئاه! دەرگەی ئەپارتمانەکە لەسـەر گازی پشـــت بوو و چۆڵی چۆڵ، پێدچوو هەرچیی لێ بێت بردبێتیانە دەرێ. بە شێنەیی تا ژووری دانیشتنەکە چوو کە بە تریفەی مانگەشەو ڕۆشـــن بووبووەوە. بەس ئەوێ هەموو شـتێ هەر وەک جاران بوو: کورسییەکان، ئاوێنە، قەنەفە ڕەنگزەردەکە و وێنەگەلی چوارچێوەداری ســـەر دیوارەکان. مانگی چواردەی مســـین و مەیلەو ســـوور لە پەنجەرەکەوە بە ژوورەکەدا وڕ مابوو. ڕاســـکۆڵنیکۆف بیری کردەوە: *ئەم کشـوماتییە لەبەر مانگەشـەوە، بێگومان بێدەنگ خۆی مات داوە تا مەتەڵێ هەڵبێنێ.* لە هەمان شـوێن ڕاوەسـتا و چاوەڕێ ما. ماوەیەکی زۆر چاوەڕێ ما و تا مانگ هەر وا زیاتر لە سـنگی ئاسـماندا بێدەنگ دەمایەوە، دڵی ئەویش توند و توندتر دەخورپا تا دواجار ئازارێک بە سنگیدا هات. وەلێ هێشتا هەر ئەو بێدەنگییە سامناکە فەرمانڕەوا بوو تا لەپڕ ترقەترقێکی کز و کورتی بیســـت. وەک ئەوەی پارچە دارێکی بچکۆلە، تەڵەزمێک شـتێک لەژێر پێیدا بێت، بەس هەمدیســـان بێدەنگی باڵی کێشـــایەوە. مێشـێک کە لە خەو ڕاچڵەکیبوو، کتوپڕ توند دای بە پەنجەرەکەدا و ویزەویزی ئـازارپێگەیشـــتووانەی بەرز بووەوە. لە هەمان ئەو ساتەدا بوو کە ڕاسکۆڵنیکۆف زانیی لە لایەکی ژوورەکەوە، لەنـێوان پەنـجە و دۆلابە بـچـووکەکەدا، جـلـێـک بە دیـوارەکەوە هەڵواســـراوە. لەبەرخۆوە بیری کردەوە: *ئەو جلە لەوێدا چی دەکا؟ پێشـتر لەوێ نەبوو...* بە پادزە چووە پێشـەوە، هەسـتێک پێی دەگوت کەسـێک لەپشـت جلەکەوە خۆی شـاردووەتەوە. بە پارێزەوە جلەکەی لادا و بینیی لەو سووچەدا پیرێژنێک لەسەر کورسی دانیشتووە و بە جۆرێکیش چەمیوەتەوە کە ڕووخســـاری دیار نییە، بەڵام ئەوە هەر خۆی بوو. ڕاســـکۆڵنیکۆف بە ژوور ســـەری پیرێژنەکەوە ڕاوەســـتا و بیری کردەوە: *ترسـاوە!* لەســـەرخۆ تەورەکەی دەرهێنا و دانەیەکی بە

تەپڵەسەری پیرێژنەکەدا کێشا، پاشانیش لێدانی دووەم. وەلێ دۆخەکە ئاسایی نەبوو: پیرێژن تەنانەت بەو لێدانانەش جووڵەی لێوە نەدەهات، هەر دەتگوت لە تەختەیە. ڕاسکۆلنیکۆف تاساوانە دانەوی و هەوڵی دا تەماشـــای ڕووخســـاری پیرێژنەکە بکات، وەلێ ئەویش زیاتر لە جاری پێشـــوو ســـەری دانەواندەوە. ڕاســـکۆلنیکۆف تا ســـەر زەوییەکە خۆی دانەواند و لە ڕووخســـــــاری پیرێژنەکەی ڕوانی، لە خوارێڕا چاوی بە دەموچاوی کەوت و لە ترســـــان دڵی وەســـــتا. پیرێژن دانیشـــتبوو و پێدەکەنی، لەتاو پێکەنین وەخت بوو دەپسا، پێکەنینێکی نەرم و بێدەنگ کە ئـازای ئەنـدامیی دەلەرانـدەوە! دیـار بوو کە پیرێژنەکە ئەوپەڕی هەوڵی خۆی خســـتووەتە گەڕ تا ڕاســـکۆلنیکۆف دەنگی پێکەنینەکەی نەبیســـتێت. ڕاســـکۆلنیکۆف کتوپڕ وای هاتە بەرچاو دەرگەکە لاترەک بووە و لەوێوە دەنگی پێکەنین و چپەچپ دێ. تووڕەییەکی شـــــێتانە ســـــەراپای تەنییەوە و بە هەموو هێزییەوە کەوتە تەورکاریی ســـــەری پیرێژنەکە، وەلێ لەگەڵ هەر گورزێکی تەورەکەدا، پێکەنین و چپەچپی ناو ژووری خەوتنەکە زیاتر تەشەنای دەسەند و خودی پیرێژنەکەش دەتگوت کەیلی شـــــادییە! ڕاســـــکۆلنیکۆف دەیوســـــت ڕابکات، بەڵام ڕاڕەوەکە زۆر قەڵەباڵق بوو، دەرگەی ئەپارتمانەکانیش کراوە و باداک و پلیکان و ســـــەر و خوارەوە جمەیان دەهات. ڕیز بە ڕیز کەللەی دەبینی کە لێی ڕاماون، وەلێ تێکترنجاو، لە بێدەنگی و چاوەڕوانیدا. شـــتێـک چنگی بە دڵیـدا دەکرد... پێی بە زەوییەکەوە دوورابوو و نەیدەتوانی لە شـــــوێنی خۆی جمە بکات. بەتەما بوو بقیڕێنێت کە لە خەو ڕاچڵەکی.

هەنـاســـــەیەکی قووڵی هەڵکێشـــــا. نەدەچووە ئەقڵەوە، وەلێ ئەو مۆتەکەیەی کە دیتبووی، دەتگوت هێشـــــتـا تەواو نەبووە: دەرگەی ژوورەکە کردبووەوە و غەوارەیەک کە تـا ئەو کـاتە نەیبینیبوو، لە ئاستانەی دەرگەکەدا بە سەرنجەوە لێی دەڕوانی.

ڕاســـکۆڵنیکۆف بە زۆر تا نیوە چاوی کردبووە و جا لەو کاتەدا دەستبەجێ چاوی نوقاندەوە و بێ ئەوەی وەرسووڕێ، هەر وا لەسەر گازی پشــت مایەوە. دروســـت نەیدەزانی خەوتووە یان بەئاگا: *یانی هێشتا هەر وا لەو خەوەدام؟*

هەمدیسان لە درزی پێڵووەکانییەوە تەماشای کرد، غەوارەکە هێشتا لەوێ ڕاوەســتابوو و هەر وا لێی ورد دەبووەوە. پیاوەکە بە پارێزەوە هەنگاوی نایە ناو ژوورەکە و ســـووکســـووکێک دەرگەکەی بەدوای خۆیدا پێوەدا. چووە لای مێزەکە، خنەخنێکی کرد و هێشـــتا هەر وا چاوی لە ڕاسـکۆڵنیکۆف بڕیبوو. دواجا بێدەنگ لەســەر کورسـیی لای قەنەفەکە دانیشــت. لەســـەر زەوییەکە و لەتەک پێیەوە کڵاوەکەی دانا، دەســـتەکانیی خســـتنە ســـەر گۆچانەکەی و چەناگەشـــی نایە ســـەر دەســـتەکانی. پێدەچوو ئامادە بێت هەتا قیامەت بەدەم چاوەڕوانییەوە دابنیشـێت. هێندەی ڕاســکۆڵنیکۆف بە دزی و لەنێوان پێڵووەکانییەوە دەیتوانی ببینێت، غەریبەکە چوارشــانە بوو، تەمەنی لاویی تێپەڕاندبوو و تۆپەڵە ڕیشێکی کاڵی هەبوو کە سپی دەچووەوە.

خولەکێک تێپەڕی. دونیا هێشتا ڕۆشن بوو، بەڵام بەرەبەرە خەریک بوو تاریکانی دەمەوئێوارە دادەهات. لە ژوورەکەدا بێدەنگییەکی ڕەها فەرمانڕەوا بوو. تەنانەت لە پلیکانەکانیشـــەوە دەنگێک نەدەهات، بێ لە دەنگی ویزەویزی خەرەنگەزێـک کە بەدەم فڕینەوە تەقتەق بەر پەنجەرەکە دەکەوت. دواجـار وای لێ هـات ئێـدی ئەو دۆخە هی بەرگەگرتن نەبوو و کتوپڕ ڕاســـکۆڵنیکۆف هەســـتایەوە و لەســـەر قەنەفەکە دانیشت.

— دەی، فەرموون بزانم چیتان دەوێ؟

وەڵامی غەوارەکە سەیر بوو و پێکەنینەکەشی هێمن:

– دەمزانی نەخەوتوون و تەنیا خۆتان لە گێلی داوە!... مۆڵەت بدەن خۆم بە جەنـابی موبـارەکتـان بنـاسـێنم: *ئـارکـادی ئیڤـانۆڤیچ سڤیدریگایلۆف*...

## یەک

راسکۆلنیکۆف جارێکی دیکەش لە خۆی پرسی: *یانی من هێشتا هەر وا خەو دەبینم؟* پاشان بەدگومانانە بە سەرنجەوە لە میوانە ناوەختەکە ورد بووەوە، دواجاریش سەری لێ شێوا و گوتی:

– کابرا دەڵێ من سفیدریگایلۆفم! لەو قسە قۆڕە! ڕێی تێناچێ!

میوانەکە بەوەش سەرسام نەبوو کە خانەخوێکەی سەرسووڕمانی خۆی دەربڕی و خەمساردانە درێژەی پێدا:

– من لەبەر دوو هۆکار هاتمە خزمەتتان. یەکەم لەبەر ئەوەی دەمویست لە نزیکەوە بتانناسم. زۆر باسی ئێوەیان بۆ کردووم؛ ماوەیەک دەبێ، لە سەرچاوەیەکی متمانەپێکراو و زۆر بەسوودەوە، بەتایبەت بۆ ئێوە. هۆکاری دووەمیش ئەوەیە کە، هیوادارم ئێوە یارمەتیم بدەن و دەست بە ڕوومەوە نەنێن، جا ئەمەش لە دۆخێکدا کە مەسەلەکە لە بەرژەوەندیی خوشکی ئازیزتان خاتوو دونیای بەڕێزدا دەشکێتەوە! گەر ئێوەم لەپشت نەبن، ڕەنگە هەر نەهێڵێ لێشی نزیک بکەومەوە... ئاخر ڕووی لە من وەرگێڕاوە، هەڵبەتە هەمووشی دەمارگیرییەکی بێمانایە! وەلێ هیوادارم بە یارمەتیی ئێوە، مەسەلەکە پێچەوانە بێتەوە...

ڕاسکۆلنیکۆف قسەی پێ بڕی:

– بێهوودە هیوادارن.

– بە یارمەتیتان دەکرێ شتێ بپرسم: دوێنێ گەیشتوونەتە ئێرە، وایە؟

ڕاسکۆلنیکۆف وەڵامی نەدایەوە.

– دوێنێ گەیشتوون و خۆشم ئاگادارم. منیش پێرێ هاتووم. بەمڕۆوە سێ ڕۆژێک دەبێ لێرەم. باشە، جەنابی ڕاسکۆلنیکۆفی ئازیز، لێی گەڕێن با لەوبارەیەوە پێتانی ڕابگەیەنم کە بە پێویستی نازانم لەسەری بڕۆم، وەلێ ئەو چاکەیە بکەن و بفەرموون کە لە کوێی ئەم مەسەلەیەدا من هەڵەیەکم لێ وەشاوەتەوە، تاوانێک، گوناحێک، شتێکم کردووە؟ هەڵبەتە گەر ڕق و کینەی ڕابردوو وەلا بنێین و ئەقڵێکی ڕاستەقینە بخەینە گەڕ!

ڕاسکۆلنیکۆف هەر وا لە بێدەنگیدا لەو ڕامابوو.

– نەکا تاوانەکەم ئەوە بێ کە لە ماڵی خۆمدا بە بێزارکردن و پێشنیاری بێشەرمانە و ئاژەڵانە کچێکی بێپەنام ئازار دابێ... هەر ئەوەیە دەی، وایە؟ (زۆر ڕۆیشتم). وەلێ گەر بۆ خولەکێکیش بووە وای دابنێن... چیی پێ دەڵێن *rt nihil humanum*... منیش مرۆڤم! پوختەی قسەکە ئەوەیە کە وای دابنێن منیش وەک مرۆڤەکانی تر دڵم هەیە و دەتوانم عاشق ببم (ئەمەیان بەدەست من نییە، ویست و بڕیار و شتی واشی تێدا نییە) ئیتر شتەکانی تر زۆر سرووشتی دەردەکەون! بابەتە سەرەکییەکە ئەوەیە کە بتانەوێ وەک دێوێک لە من بڕوانن یان وەک قوربانییەک بێمە بەرچاوتان. باشە ئەی ئەگەر لەم نێوەندا من خۆم قوربانی بم؟ ڕاستە، من وا خەریکم پێشنیار بۆ خۆشەویستی ژیانم دەکەم کە پێکەوە ڕاکەین بۆ ئەمریکا یان سویسرا، بەس خۆ لەوانەیە ڕێزێکی زۆریشم بۆی هەبێ و لە لای خۆمەوە وام زانیبێ کە بەختەوەریی هەردووکمان دابین دەکەم! مەگەر هەمیشە

ژیری، بەندەی ئەڵقەلەگوێی عەشـق و خۆشـەویسـتی نییە؟ خۆ لەم نێوەندەدا وا بزانم من زیاتر خراپەم بەرانبەر بە خۆم کرد!

ڕاسکۆڵنیکۆف بە بێزارییەوە قسەی پێ بڕی:

– جا خۆ کێشـەکە ئەوە نییە! ئێوە هەر لە بنەڕەتەوە مرۆڤێکی ناحەز و بێزراون، جا چ قسـەی ماقووڵیش بکەن یان ناماقووڵ! هەر لەبەر ئەوەیە کە هیچ کەسـێ حەز بە چارەتان ناکا و بە سـەرەئەژنۆ دەتانکاتە دەرێ و... ئێستەش فەرموون، بە سەلامەت!

سڤیدریگایلۆڤ یەکسەر دایە قاقای پێکەنین:

– هیوادار بووم بتوانم فریوتان بدەم، وەلێ ئێوە دەستبەجێ چاک پەنجەتان خستە سەر باسە سەرەکییە! هاهاها!

– گەر پەنجەشـم خسـتبێتە سـەر باسـە سـەرەکییەکە جەنابی پایەبەرزتان ئێسـتەش هەر وا خەریکی کاری خۆتانن و دەتانەوێ فریوم بدەن!

سـڤیدریگایلۆڤ کە تەنانەت هەوڵیشـی نەدەدا بەر بە پێکەنینەکەی بگرێ، دووبارەی کردەوە:

– باشە بۆچی؟ بۆچی؟ هاهاها! فەرەنسییەکان پێی دەڵێن *bonne guerre*، یانی زۆر ویژدانداراتە، وا نییە؟ جا ئامانجیش پاکانە بۆ هۆکار دەکا!... بەهەرحاڵ قسـەکەتان شـەهید کردم پایەبەرزا! دووبارە ڕایـدەگەیەنمەوە: بڕیـار نەبوو هیچ گێرەوکێشـەیەک بێتە پێش و نەدەهاتە پێشیش گەر مەسەلەی ناو باخەکە نەبا. مارفا پیترۆڤنا...

ڕاسکۆڵنیکۆف هەمدیسان بە بێڕێزییەوە پەڕییە نێو قسەکانی:

– دەڵێن مارفا پیترۆڤناشت یەکجاری کردووە!

– ئۆو، کەواتە ئەمەشـــتـــان بیســـتووە؟ هەڵبەتە نەشـــدەکرا نەتانبیســـتبێ... ڕاسـتییەکەی ئەوەیە کە نازانم چیتان پێ بڵێم، گەرچی ویژدانم تەواو ئاســوودەیە. یانی تەنانەت نەهێڵن ئەو بیرکردنەوەیە بە کەللەی موبارەکتاندا بێ کە من لەم بارەیەوە خەم و ترســـێکم هەیە. هەموو شـــتێ لەوپەڕی ڕێکوپێکی و یاســـاییبووندا ئەنجام دراوە. لە پشکنینی دکتۆرەکاندا دەرکەوتووە کە جەڵدەیە، چونکە خوالێخۆشبوو دەمودەســـت دوای ئەو ژەمە قورســـە و هەڵقوڕاندنی بتڵێک شـــەراب، چووە گەرماو و، ئیتر شتێ لەئارادا نەبوو تا پشکنینی پزیشکی نیشانی بدا... نا، جەنابی پایەبەرز، وەلێ پێتان دەڵێم من مەراقی چیم بوو ئەم ماوەیە، بەتایبەت ئەو کاتەی کە بە شـــەمەندەفەر بەرەو ئێرە دەهاتم. بیرم دەکردەوە نەکا... بەرکەوتنێ، هەڵســـوکەوتێ، کارێکم کردبێ کە لەم پێشـهاتەدا کاریگەرییەکی هەبووبێ! مەبەسـتم لایەنی ئاکارییە، بۆ نموونە توورەم کردبێ و ئەمــانە... بەس دواجــار بیرکردنەوەکـانم گەیشتنە ئەوەی تەنانەت ئەگەری وەها شتێکیش لەئارادا نەبووە.

ڕاسکۆڵنیکۆف پێکەنی:

– بە ڕاستی مەراقێکی قورس بووە!

– ئەمە کوێی پێکەنیناوی بوو؟ ئەی بۆ ئەمەیان چی دەڵێن: من بە گشـــتی بە دوو تووڵ[1] لە مارفا پیترۆڤنام داوە، بە جۆرێ کە تەنانەت شـــوێنەکەی بە لەشـــییەوە جێ نەمێنێ!... ئێوە و خوا وا نەزانن من کەســـێکی ســـەگخووم... خۆم باش دەزانم کارێکی خراپم کرد، بەڵێ، ناپیاوی بووە، وەلێ لە لایەکیشـەوە باش دەزانم کە بە ئەگەرێکی زۆر مارفا پیترۆڤنا بە هیچ شـــێوەیەک ئەم توندوتیژییەی منی پێ ناخۆش نەبووە. ئەو بەســەرهاتەی خوشـکەکەی ئێوە هەرچەند بتگوشـیبا، ئیتر

---

١. تووڵ: داری تەڕ و باریک و درێژ؛ ئەســـتوورتر لە شـــووڵ و باریکتر لە لق؛ کە هەندێک جار بۆ لێدان بەکار دێت و ئێشێکی زۆر کزێنەری هەیە.

یەک دلۆپە ئاوی لێ نەدەتکا؛ دەرئەنجام ســـێ ڕۆژی ڕەبەق بوو کە مارفا پیترۆڤنا بە ناچاری لە ســـووچێکی ماڵەوەدا دانیشـــتبوو. ئیتر شـتێکی پێ نەبوو تا بە بیانوویەوە لە شـاردا خۆی دەربخا و ئەوەش لەلایەک کە خەڵکی بەو نـامەیە بێزار کردبوو. خۆ بە دڵنیـاییەوە بەسـەرهاتی سـووڕانەوە و نامەخوێندنەوەکەیتان بیسـتووە. پاشـانیش کتوپڕ ئاسمان دەمی کردەوە و ئەو دوو تووڵە کەوتنە بەردەستی من! خانمیش دەمودەســت فەرمانیان کرد گالیســـکەکە ئامادە بکەن!... ئەم قســـانە هی گوتن نین، وەلێ ژنان بەو ڕوواڵەتە لووتبەرزانەیانەوە کە دەیبەخشنە خۆیان، هەندێ جار زۆر زۆر حەزیان لە سووکایەتیپێکران و ئەم شـــتانەیە و بە هیچ شـــێوەیەک لە بەردڵیان گران نییە. هەڵبەتە ئەمە دەکرێ بۆ هەر کەسـێک بێتە پێش. بەنیئادەم دڵی تەپەتەپیەتی بۆ سـووکایەتی و ڕسـوایی. تا ئێسـتە سـەرنجتان دابوو؟ وەلێ بەتایبەت ژنان ئاوهان. تەنانەت دەکرێ بڵێین تاکە مایەی ســـەرگەرمییان هەر ئەمەیە.

لە کاتی گوتوبێژەکەدا، ڕاسکۆڵنیکۆف کەوتە سەرییەوە کە هەستێت و لە ژوورەکە بچێتە دەر تـا بـاســـەکە خۆبەخۆ تەواو ببێت، وەلێ کونجکۆڵییەکی تـایبەت و تەنـانەت جۆرێک لە دووربینی وای کرد بۆ ساتێک دان بە خۆیدا بگرێت.

کەمتەرخەمانە پرسیی:

– ئێوە کەسێکی شەڕانین، وایە؟

سڤیدریگایلۆڤ لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە:

– نا، شـــەڕانی نیم بەو مانایە. زۆر بە دەگمەن پێش دەهات من و مارفا پیترۆڤنا بەشـــەڕ بێین یان بیکەینە دەمەقاڵە. بە تەواوی کۆک بووین و دایمە لە من ڕازی بوو. حەوت ساڵ لەگەڵ یەک ژیاین و لەو ماوەیەدا من تەنیا دوو جار دەســتم بۆ تووڵ برد. هەڵبەتە گەر جاری

سـێیەم حسـێب نەکەین، کە دەبێت ئاماژە بەویش بکرێت و تۆزێکیش جێگومان بوو. یەکەمین جار دوو مانگ دوای زەماوەندکردنمان بوو، ڕێک ئەو کاتەی کە گەیشـتینە گوند، ئەوەی دواهەمین جاریش ئێسـتە باس کرا. نەکا لەبەرخۆتانەوە واتان زانیبێ من دێوێکی بێقۆچ و گوێم و یان لەو ئاغا کۆنەپەرسـتە قامچیبەدەسـتانە؟ ها؟ هاها... هەر بە ڕاست بابەتێکی تریش هەیە... بیرتانە، جەنابی ڕاسکۆلنیکۆف، کە چەند ساڵێ لەمەوبەر، لە سـەردەمی ئەو کەشـە کراوە گشـتییەدا، حورمەتی بەڕێزێکی خانەدانیان کە ناوە بنەماڵەییەکەیشـیم بیر چووەتەوە، لە هەموو شـوێن و هەموو ڕۆژنامەکاندا شـکاند؟ جا ئەوەش لەپێناو چیدا؟ هەر لەبەر ئەوەی کە لە قەمـارەی شـەمەنـدەفەردا چـاک زەعیفەیەکی ئەڵمـانیی تەمبێ کردبوو! بیرتـان هـاتەوە؟ هەر لەو ڕۆژگارەدا بوو، یانی لە هەمان ئەو ساڵەدا کە لام وایە *ڕسوایی سەدە* ڕووی دا (باسی شەوانی میسری[1] دەکەم؛ گوتنە گشتییەکەی، بیرتانە؟ ئەو چاوە ڕەشـانە! ئاه، بۆ کوێ چوو ڕۆژگاری گەنجیی ئێمە!) ئێ، کاکە گیان، بۆچوونی من ئەمەیە: تۆزقاڵێ هەسـتی هاوخەمیم بۆ ئەو خانەدانە نییە کە لەو چەتیوە ئەڵمـانییەی دابوو، چونکە هیچ هۆکارێ نییە بۆ ئەوەی من هـاوخەمی بم... ئەمە سـوودی چییە! وەلێ دەبێ ڕایگەیەنم کە ئەم چەتیوە ئەڵمـانیانەی جاروبـار لەسـەر ڕێت قوت دەبنەوە، سـەیر دەکەی لەو جۆرە ئەڵمـانییە خراپـانەن کە هیچ چارەیەکت بۆ ناهێڵنەوە و ئەوە لە مرۆڤی ئاسایی گەڕێ، تەنانەت گەر هەر ڕۆشنبیرێکیش بێنی، بەدووری دەزانم بتوانێ جڵەوی خۆی بکا و پێی تێک نەچێ. ئەو کات هیچ کەس لەم لایەنەوە لە مەسـەلەکەی نەڕوانی، لێمی وەرگرن، لە دیدگەیەکی مرۆڤانەوە ڕێک بەم جۆرەیە. جەنابی پایەبەرز!

---

١. Egyptian Nights: ناونیشانی کتێبێکی نووسەر و شاعیری بەناوبانگی ڕووس *ئەلێکساندەر پوشکین* ـە کە لە ساڵی ١٨٣٧دا بلاو کراوەتەوە. «و. ک»

سـڤیدریگایلۆڤ هەمدیسـان کەوتەوە پێکەنین. بۆ ڕاسـکۆلنیکۆف ئەوە وەک ڕۆژ ڕۆشن بوو کە سەروکاریی لەگەڵ کابرایەکدا هەیە کە بە مەبەسـتێکی تایبەتەوە هاتووە و چاکیش دەتوانێت مەبەسـتەکەی بشارێتەوە. پرسیی:

– لام وایە چەند ڕۆژێک دەبێ کە قسەتان لەگەڵ کەس نەکردووە؟

– بەڵێ، کەم تا زۆر! دەڵێی چاوەڕێ نەبوون مرۆڤێکی هێندە سادە و کراوە بم، ها؟

– نا، لەوەدا تیا ماوم کە ئەم هەموو کراوەییە چیی لەپشتەوەیە!

– مەبەستتان ئەوەیە کە بۆچی دڵگران نەبووم لەو پرسیار و وەڵام و بێڕێزیەتان؟ دەی هەر ئەوەیە مەبەسـتتان؟ وەلێ چی بووە تا بڕیار بێ کەسێک پێی دڵگران بێ؟... ئێوە پرسیتان و منیش وەڵامم دانەوە.

لەوپەڕی سەرسامیدا، وەڵامەکەی سڤیدریگایلۆڤ ڕاستگۆیانە و لە ناخی دڵەوە بوو. تێفکرانە بۆی زیاد کرد:

– سەیر کەن، گەر ڕاستییەکەیتان دەوێ، ئیتر هیچ شتێ نییە بتوانێ سـەرنجم ڕاکێشـێ یان بەلامەوە گرنگ بێ... بەتایبەت ئێسـتە، کە کارێکی دیاریکراویشـم نییە بیکەم... هەڵبەتە ئێوە تەواو هەقی خۆتانە کە وا بزانن من بۆ گەیشـتن بە مەبەسـتێکی چەپەڵ نازتان هەڵدەگرم، جا بەتایبەت لە ئێسـتەشـدا کە هەر خۆم گوتم قسـەیەکم هەیە بۆ خوشـکە نازەنینەکەتان. وەلێ با ڕاشـکاوانە بیڵێم، خراپ بێتاقەتم! بۆ ئەم سـێ ڕۆژەی دواییش هەر باسـی مەکە و مەپرسـە! هەر لەبەر ئەوەشە کە زۆر زۆر بە بینینی ئێوە دڵخۆشم... لە دڵی مەگرن، جەنابی ڕاسـکۆلنیکۆف، وەلێ هەرچی سـەیر دەکەم ئێوەش دۆخێکی سـەیروسـەمەرەتان هەیە! ڕەنگە باوەڕ نەکەن، بەس هەر بە ڕاسـتی دیارە کە کێشەیەک، شتێکتان هەیە... ناڵێم هەر ئێستە وەلێ بە گشتی...

باشە، باشە، ئەوە لێی گەڕام، بەم جۆرە ناوچاو مەدەن بە یەکدا! کاکە گیان، من ئەو ورچەش نیم کە ئێوە وێنای دەکەن!

ڕاسکۆلنیکۆف گرژ و مۆن سەیرێکی ئەوی کرد:

– خۆم دەزانم، هەرچییەک بن ورچ نین! بە ڕای من ئێوە لە کەســە ماقووڵەکانن، یان لانیکەم باش دەزانن وەک کەســــە ڕەســــەنەکان هەڵسوکەوت بکەن.

ســڤیدریگایلۆڤ وشــک و تەنانەت بە ســووکە خۆپەرســتییەک لە دەنگیدا گوتی:

– ئەوەی کە ئەوانی تر چۆن دەڕوانن یان ناڕوانن بۆ من گرنگییەکی تایبەتیی نییە و هیچ کاتیش نەیبووە. کەواتە بۆچی مرۆڤ جاروبار نەکەوێتە گەل کەســـە نزم و چەپەڵەکان؟ بۆ لەم ســـەردەمەدا بۆ ئێمە پۆشــاکێکی لەوە باشــتر دەســـت دەکەوێ؟... جا ئەگەر ســرووشــتی مرۆڤیش زیاتر مەیلی بەولادا بشکێتەوە ئەوە هەر قسەی تێدا نییە!

کە دواهەمین ڕستەی گوت، هەمدیسان پێکەنی.

– وەڵێ بیســـتوومە کە لێرە چەندان هاوڕێ و ناســـیاوتان هەیە و، وەک دەڵێن، تێکەڵیی ســـەرزلەکان دەکەن. کەواتە گەر بەدوای شــتێکی تایبەتەوە نین، چ کارێکتان بێ کەسێکی وەک من پەکی کەوتووە؟

ســــڤیدریگایلۆڤ بە ڕووی خۆیدا نەهێنا کە ڕاســــکۆلنیکۆف چیی پرسیوە:

– بەڵێ، من لێرەش هاوڕێ و ئاشنام کەم نین، هەندێکیشیانم دیون. ئەم چەند ڕۆژەش بێکار سووڕامەوە ئیتر، چاوم بە دیداری هەندێکیان ڕۆشــن بوو و وا بزانم چەند دانەیەکیشــیان منیان ناســییەوە. هەڵبەتە ئەمە جێی ســــەرســـامی نییە: بارودۆخم باشــــە و خەڵکیش دەزانن تیکەیەک هەیە بیخۆم. بەزمی هەڵوەشـــاندنەوەی یاســـای خودان و

ڕەعیەت بۆ من کێشـــەیەکی وای دروســـت نەکردووە، چونکە هەرچی زەویـم هەیە زیـاتـر لـێـرەوار و لەوەڕگەیە، هەر لەبەر ئەوەیە کە داهاتەکەم هیچ کەمی نەکردووە. وەلێ... تاقەتی ســەردانکردنیانم نییە، دەمێکە بەرچاوم کەوتوون و بەرەلآم کردوون. ئێستەش وا سێ ڕۆژە لێرەم و هێشتا سەرم لە هیچ کەسێ نەداوەتەوە... ئەم شارە تووشی نەگبەتییەک بووە! ئێوە بفەرموون و من تێبەگەیەنن، بڵێن ئێمەومانان چۆن توانیمان وەها شـارێ بنیاد بنێین؟ شـاری کۆمەڵێک فەرمانبەر و شت، لووسەخوێندکاری زانکۆ، جا بەم بەرفراوانییەش! بەڵێ، قەبووڵمە هەشـــــت ســــاڵ لەمەوبەر کە لێرە بۆ خۆم خەریکی ڕابواردن بووم، ســـەرنجی هەندێ شـــتم نەدا... وەلێ ئێســـتە هەموو هیوایەکم بووەتە زانستی توێکاری، ئەرێ بە خوا!

– کامە زانستی توێکاری؟

ســـڤیدریگایلۆڤ ئەم جارەشـــیان گوێی لەئاســـت پرســـیارەکەی ڕاسکۆڵنیکۆڤدا خەواند و درێژەی بە قسەکانی خۆی دا:

– ئەم یانە و شـــوێنە خۆشـــانەشـــتان... ئەم *دوســـو و پوئانتە*[1] و شتانە... باشە یانی نیشانەی پێشکەوتنن؛ ئەوە من هەر نەمویستن، با پێشـــکەشـــی ئەوانی دیکە بن! ئەســـڵەن کێ گوتی بچۆ بۆ قومار و گڕیکاری!

– یانی بە خێر گڕیکاریش بوونە؟

– بەڵێ بێگومـان بوومە، بۆچی؟ ئێمە پێڕێـک بووین بۆ خۆمـان، هەموویشـــی بەڕێز... هەشـــت ســـاڵ لەمەوبەر بوو. خراپیش نەبوو، حەیفێ، خۆزگە بە چاوی خۆتان هەڵســـوکەوت و نەریتمانتان دەبینی،

---

١. *دوسو* ڕێستورانتێکی خانەدانی و ڕاقی بوو لە نزیک ڕێژاوی *مویکا* و مەبەستی سـڤیدریگایلۆڤیش لە *پوانتە*، بە ئەگەرێکی زۆر شـوێنێکی گەشـتیارییە لە خۆرئاوای بەشی ئەوسەری دوورگەی *ئەیلاگین*ـەوە لە زارکی ڕووباری نێڤادا. «و. ف»

یەک لە یەکمان ڕەسەنتر، پیرەکەمان هەم شاعیری تێدا بوو و هەم سەرمایەدار. بە گشتی یاسای کۆمەڵگەی ڕووسیای ئێمە ئەوەیە کە ئەگەر چاوەڕێی هەڵسوکەوتێکی باش بی، ئەوا دەبێ بچی بۆ لای ئەوانەی کە مایەپووچن. ئێوە تا ئێستە سەرنجی ئەم خاڵەتان دابوو؟ منێک کە ئێستە دەیبینن، لە گونددا تووشی ئەم دۆخە شرە بووم. لەو ڕۆژانەدا یۆنانییەکی خەڵکی نیژینسک خەریک بوو لەبەر قەرز منی دەخستە زیندانەوە و لەو بێنەبەرەیەدا کتوپڕ مارفا پیترۆڤنا دەرکەوت، دونیایەک چەنەی دا و دواجار لەپێناو مندا سی هەزار سکەی زیویی دایێ (بە گشتی حەفتا هەزار قەرزار بووم). ئەویش کاتی بەفیڕۆ نەدا و وەک ئەوەی بەسەر گەنجینەیەک شتێکدا چووبێ، بەسەر دەستانەوە منی برد بۆ گوند. بێگومان دەزانن کە ئەو پێنج ساڵێک لە من گەورەتر بوو. عاشقم بوو. تا حەوت ساڵ لە گوند نەهاتمە دەرێ. جا ئەوەشتان لە بیر بێ کە بە درێژایی ژیانی هاوبەشمان لەبەر بەڵگەنامەی ئەو قەرزە کلکی منی لە مشتدا بوو! بەڵگەنامەی ئەو سی هەزار ڕۆبڵەی کە واژۆی شاهێدی سێیەمیشی لەسەر بوو! بۆچی؟ بۆ ئەوەی هەر کە دەمم کردەوە، دەستبەجێ لە زیندانم بنێ! چاک ئەم کارەشی لێ دەوەشایەوە! ژن و شت لە بنەڕەتەوە سڵ لەم جۆرە کارانە ناکەنەوە.

— یانی گەر بەڵگەنامە لەئارادا نەبا، دەستت لێ بەردەدا؟

— نازانم چۆن پێتانی بڵێم! بەڵگەنامەکە بەو مانایە نەبووبووە ڕێگر. نەمدەویست بچمە جێیەکی تر. مارفا پیترۆڤنا کە زانیبووی وەڕەز بوومە، دوو جارێ بردمی بۆ هەندەران. وەلێ سوودی چییە! پێشتر خۆم چووبووم بۆ هەندەران و ئەوێ تەنیا بێتاقەتیی تێدا بوو بۆ من! باشە ها، وەلێ کە سەیری هەڵهاتنی خۆر و بەندەری *ناپل* و دەریاکەی، دڵت تەنگ دەبێ. ئەو شتەی کە هەر بە ڕاستی زیاتر مرۆڤ بێتاقەت دەکا غەریبییە! نا، هیچ شوێنێ وەک زێدگەی مرۆڤ نییە: لێرە دەتوانی لەسەر هەر شتێکی ئاسایی و نائاسایی ئەوانی تر سەرکۆنە

بکەی و هیچ نەخەیتە ئەستۆی خۆت. لام وایە گەر بکرابا، گەشتم بۆ جەمسەری باکوور[1] دەکرد، چونکە ئەوەی ڕاستی بێ jai le vin mawvai، دەزانن ئیتر، کاتی سەرخۆشی لەسەر خۆم نیم و لەگەڵ ئەوەشدا ڕقم لە خواردنەوەیە. ئەوەش لە لایەک کە بێ لە شەراب هیچ شتێکی ترم بۆ نەماوەتەوە. تاقیم کردووەتەوە. دەڵێن ئەو کابرایە، بێرگ[2]، بڕیارە ئەم یەکشەممەیە بە باڵۆن بەسەر باخی *یوسوّپاف*دا بفڕێ و گوتوویەتی هەر کەسێ پارە بدا دەتوانێ لەگەڵی سوار بێ، هەواڵەکە وایە؟

– چۆن، بەتەمان بڕۆن؟

سڤیدریگایلۆف کە دەتگوت هەر بە ڕاستی لە فکر و خەیاڵدا ڕۆ چووبوو، ورتاندی:

– من... نا کاکە... هەر وا...

ڕاسکۆلنیکۆف لەبەرخۆوە بیری کردەوە: *مەبەستی چی بوو؟ بە ڕاستی بوو یان خەریکی ڕابواردنە؟*

سڤیدریگایلۆف تێفکرانە درێژەی پێدا:

– نا، بەڵگەنامەکە بەری پێ نەگرتبووم. ئەوە بڕیاری خۆم بوو کە لە گوندەکە دەرنەچم. پار بوو کە مارفا پیترۆڤنا لە ساڵڕۆژی ناولێنانمدا بەڵگەنامەکەی دایە خۆم، سەرباری ئەوەش پارەیەکی

---

١. لە ساڵی ١٨٦٥دا بلاوکەرەوەکانی پیتەربورگ چەندان جار لە دانیشتنەکانی لێژنەی پادشایی جوگرافیدا لە لەندەن، ڕاپۆرتیان دەدا کە ئەندامەکانیان بەتەمان بە مەبەستی دۆزینەوە ئامادەکاری بۆ گەشتێک بەرەو جەمسەری باکوور بکەن. «و. ف»

١. *ویلهالم* بێرگ، بەرنامەڕێژی بەناوبانگ، بۆ گەشت و بەسەربردنی کاتی خۆش، فڕینی پڕ لە مەترسی و سەرنجڕاکێشی بە باڵۆن بەسەر باخی یوسوّپافدا ڕێک دەخست. «و. ف»

زەوەندەی بە دیاری دامێ. پارە و سـەرمایەیەکی باشـی هەبوو مارفا پیترۆڤنا. جا ڕووی تێ کردم و گوتی: *دەبینن کە چەندە متمانەم بە ئێوە هەیە، ئارکادی ئیڤانۆڤیچ؟* ڕێک وای گوت. دەڵێی بڕوا ناکەن! وەلێ هەر بۆ زانیاری ڕایدەگەیەنم، چـاک فێر بووم کە دەبێ چۆن موڵکەکـان بەڕێوە بەرم. لەو دەوروبەرە هەمووان من دەنـاسـن. زۆربەی کاتیش ڕامدەسپارد کتێبم بۆ بهێنن. مارفا پیترۆڤناش سەرەتا هانی دەدام، بەس دواتر بەرەبەرە خەمی ئەوەی لێ نیشـت کە نەکا لاڕێ ببم.

– دەڵێی خراپ دڵتەنگی مارفا پیترۆڤنان!

– دڵتەنگ؟ لەوانەیە. بە ڕاستمە، لەوانەشە دڵتەنگی بووبم! ئەرێ بە ڕاست، ئێوە بڕواتان بە بوونی ڕۆح هەیە؟

– چ جۆرە ڕۆحێک؟

– دەی هەر ئەم ڕۆحە ئاساییانە!

– ئەی ئێوە، باوەڕتان هەیە؟

– لام وایە نا... pour vous plaire، یانی هەرچی کە ئێوە حەز بە بیستنی بکەن... وەلێ دەی، نەک ئەوەش کە بڕوام پێی نەبێ...

– یانی ئێوە ڕۆح دەبینن؟

سـڤیدریگایلۆڤ بە نامۆیی تەماشـایەکی ئەوی کرد و بزەیەکی نائاساییش لێوەکانیی درەوشاندەوە. گوتی:

– مارفا پیترۆڤنا حەز دەکا جاروبار سەرێکم لێ بدا.

– یانی چی حەز دەکا سەرێکتان لێ بدا؟

– تـا ئێسـتە سـێ جـار هـاتووە بۆ لام. یەکەم جـار ڕۆژی بەخاکسپاردن بینیم، ڕێک یەک کاتژمێر دوای بەخاکسپاردنەکە بینیم...

یـانی ڕۆژێـک بەر لەوەی خۆم بپێچمەوە و بێم بۆ ئێرە. دووەمین جاریش پێری بوو کە بەڕێوە بووم و تازە خۆر کەوتبوو... وێسـتگەی *مالایا ویشـیرا*. سـێیەمین جاریش چەند کاتژمێری بەر لە ئێسـتە، لەو ژوورەدا کە لێرە گرتوومە. بە تەنیا بووم.

– بە بێداری؟

– بێداری بێدار. هەر سـێ جـارەکەش بێدار بووم. دێ بۆ لام، نزیکەی خولەکێ قسـە دەکەین و پاشـان لە دەرگەکەوە دەچێتە دەرێ، دایمەش لە دەرگەکەوە دەچێتە دەر! تەنانەت دەنگێکیش دێ.

ڕاسکۆلنیکۆف کتوپڕ گوتی:

– چی بوو وا کتوپڕ ئەوەم بە زەیندا هات کە دەبێ شـتێکی لەم بابەتە بۆ ئێوە پێش هاتبێ؟

کە ئەمەی گوت، خۆیشی سەری سووڕ ما کە چۆن وەها قسەیەکی لە دەم دەرچووە. بێرادە شڵەژا بوو.

سڤیدریگایلۆڤ سەرسامانە گوتی:

– دە وا بڵێن... یانی هەر بە ڕاسـتی وای بۆچوون؟ بە ڕاسـتتانە؟ نەمگوت من و ئێوە بە جۆرێ لە جۆرەکان لە یەک دەچین؟

ڕاسکۆلنیکۆف هەڵچوو و توندوتیژ وەڵامی دایەوە:

– کەی ئێوە قسـەی واتان کردووە!

– نەمکردووە؟

– نا!

– بەس وابزانم کردوومە! ئێستە لەگەڵ هاتنەژووردا، هەر کە بینیم ئێوە چاوتان نووقاندووە و وای دەنوێنن کە خەوتوون، لەبەرخۆمەوە گوتم خۆیەتی!

ڕاسکۆڵنیکۆف هاواری کرد:

– یانی چی کە خۆیەتی؟ مەبەستتان چییە؟

سڤیدریگایلۆڤ کە دەتگوت خۆیشی بە تەواوی شڵەژاوە، ڕێک و ڕاست لە وەڵامدا ورتاندی:

– مەبەستم چییە؟ ئەوەی ڕاستی بێ خۆشم نازانم...

بۆ خولەکێک بێدەنگ و واقوڕماو مانەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف دەیری بوو و بە پەستی هاواری کرد:

– ئەمە هەمووی قسەی قۆڕە! باشە ئەی چی دەڵێن کە دێتە لاتان؟

– مارفا پێترۆڤنا؟ بڕوا ناکەن، قسەی پڕوپووچ و دەبەنگانە و بیسەروبەر... هەر لەبەر ئەوەشە کە من خراپ پێی توورە دەبم. جاری یەکەم (دەزانن، من ماندوو بووم: بەخاکسپاردن، ڕازونیاز و داوای لێخۆشبوون بۆ ڕۆحی کۆچکردووان، پاشانیش ڕێورەسمی فراوێن تا ئەوەی کە دواجار دەستیان لێ هەڵگرتم و لە ژووری کارکردنەکەی خۆمدا دەرفەت ڕەخسا جگەرەیەک ئاگر بدەم و تۆزێ بیر بکەمەوە)، لە دەرگەکەوە هاتە ژوورێ و گوتی: *ئەمڕۆ زۆر سەرتان قاڵ بووە ها، ئارکادی ئیڤانۆڤیچ... لەم بێنەوبەرەیەدا بیرتان چوو کاتژمێری دیواریی ژووری نانخواردنەکە کۆک بکەن.* ئاخر بە درێژایی حەوتساڵی ڕەبەق من هەموو ڕۆژێ ئەو کاتژمێرە کۆک دەکەم و گەر بیرم بچووبا، مارفا پێترۆڤنا خێرا بیری دەهێنامەوە. بەیانییەکەی بەرەو ئێرە کەوتمە ڕێ. کە شەبەقی دا، گەیشتمە وێستگەکە. دابەزیم. تێریش نەخەوتبووم، وێران بووم و چاوم بە زۆر هەڵدەهات. بە کورتییەکەی،

داوای قاوەم کرد و... فەرموون! خانمخاس مارفا پیترۆڤنا لەوێ لەبەردەممدا بۆی دانیشتبوو و سەفتە وەرەقێکیشی بە دەستەوە بوو: *فالتان بۆ بگرمەوە، ئارکادی ئیڤانۆڤیچ؟ فالی سەفەرەکەتان*... زۆر باش فالی دەگرتەوە مارفا پیترۆڤنا. دەبوو پێشنیارەکەی پەسەند بکەم، تا ماوم لە خۆم خۆش نابم! لە حەیبەتان بۆی دەرچووم، هەڵبەتە هەر لەو کاتەشدا زەنگی شەمەندەفەرەکەیان لێ دا. با بێینە سەر ئەمڕۆ! ئەمڕۆ نانێکی بێکەڵکم خوارد. دەستاوی یەکێ لەم چێشتلێنەرە پاتالانە. تا بڵێی قورس بووبووم. دانیشتبووم و جگەرەم دەکێشا کاتێ هەمدیسان کتوپڕ سەروشکڵی مارفا پیترۆڤنا دەرکەوتەوە. چاکیش خۆی ڕازاندبووەوە. بە جلێکی ئاوریشمیی سەوزی تازەی چاکداری[1] زۆر درێژەوە. *ڕۆژتان باش، ئارکادی ئیڤانۆڤیچ! پۆشاکە تازەکەمتان پێ جوانە؟ ئانیسکا ناتوانێ وەها پۆشاکێ بدوورێ ها!* (ئەم ئانیسکایەی کە باسی دەکا، بەرگدووری ئێمەیە لە گوندەکەمان، لە ڕەعیەتەکانی خۆمانە و چووە مۆسکۆ تا فێری ئەو کارە ببێ. خاتوونێکی شۆخوشەنگە ئەویش) جا بە دەوری مندا بەو جلە تازانەیەوە دەستی کردە خۆبادان. چاک لە پۆشاکەکەیم ڕوانی و پاشان لە خۆشی ورد بوومەوە و لە دەموچاوی ڕامام: *ئاخر ئەمە کەی شتە تا کاتی خۆتانی بۆ بەفیڕۆ بدەن و بەو بۆنەیەوە هەستن و بێنە ئێرە، مارفا پیترۆڤنا؟* گوتی: *وای خوایە! جەنابی پایەبەرز، یانی ئێتر ناکرێ دوو قسەشتان لەگەڵ بکەین!* جا بۆ ئەوەی سەرودڵی بگرم، گوتم: *ئەرێ بە ڕاست، دەمەوێ ژن بێنم. مارفا پیترۆڤنا.* گوتی: *لێتان دەوەشێتەوە، ئارکادی ئیڤانۆڤیچ. بەس خۆ حەیاتان دەچێ، هێشتا ژنەکەتانتان نەناشتووە و دوای تازەبووک کەوتوون! لانیکەم خۆزگە هەڵبژاردنەکانتان چاک دەبوون! بەس وەک هەمیشە تێک دەچێ و نە ئێوە بەختەوەر دەبن و نە ئەو ژنە... تەنیا خۆتان دەکەنە*

---

١. چاک: بەشی دواوەی پۆشاک، کە درێژ و شۆڕە.

*کاڵتەجاڕیی خەڵکی و بەس.* جا ڕۆیشـــتە دەرێ، خشـــەخشـــی چاکی کراسەکەیشیم بیست... باشە بە ڕای ئێوە ئەمە قسەی قۆڕ نییە؟

ڕاسکۆڵنیکۆف گوتی:

– لەوانەشە ئەمە هەمووی قسەی گیرفانتان بێ!

سڤیدریگایلۆڤ تێفکرانە وەڵامی دایەوە:

– من زۆر بە دەگمەن درۆ دەکەم.

پێدەچوو لە مەبەســـتی پرســـیارە بێڕێزانەکەی ڕاســـکۆڵنیکۆف تێنەگەیشتبێت.

– ئەی پێشتر، ڕۆحتان بینیبوو؟

– نا... ئێ، بۆچی، پێشـــتریش ڕۆحم دیوە بەس تەنیا یەک جار کە شەش ساڵ لەمەوبەر بوو. ڕەعیەتێکمان هەبوو بە ناوی فیلیپەوە. تازە بە خـاکمـان ســـپاردبوو کە کتوپڕ بیرم چوو مردووە و بـانگم کرد: *فیلیپ، ئەو سەبیلەم بۆ بێنە!* فیلیپیش هات و چوو بۆ لای ئەو دۆڵابەی کە ســـەبیلەکانمی تێدابوون. منیش لەوێ دانیشـــتبووم و وام دەزانی دێت و تۆڵەی خۆی دەسێنێتەوە، ئاخر بەر لە مردنی شەڕێکی پیسمان کردبوو. گوتم: *چۆن ڕووت دێ بە ســـەرئەنیشـکی دڕاوەوە بێیتە لام؟ ئادەی ون بە، هیچوپووچ!* ئەویش ڕووی وەرگێڕا، چووە دەرێ و ئیتر دەرنەکەوتەوە. ئەو کاتە هیچم بە مارفا پیترۆڤنا نەگوت. خەریک بوو دڵم نەرم بێ و ڕاسپێرم نزای بۆ بکەن، بەس ئیتر لە ڕووم نەهات.

– ئێوە پێویستتان بە دکتۆرە!

– گەر ئێوەش نەتـانگوتبـا، هەر دەمزانی حـاڵم بـاش نییە، بەس ئەوەی ڕاســـتی بێ خۆشـــم نازانم چ گلاراوێکمە! خۆ زۆر لە ئێوە تەندروستترم. هەر بە ڕاست خۆ من نەمپرسی کە ئێوە بڕواتان بەوە

هەیە خەڵکی ڕۆح دەبینن یان نا، پرسـیم بڕواتان بە بوونی ڕۆح هەیە یان نا؟

ڕاسکۆڵنیکۆف زۆر بە پەستی و زبری وەڵامی دایەوە:

– نا، بڕوام پێی نییە و هەر بەڵگەیەکیش بێننەوە هەر بڕوا ناکەم!

– باشە، خەڵکی لەم دۆخانەدا چی دەڵێن؟

سـڤیدریگایلۆڤ دەتگوت لەبەرخۆوە قسـان دەکات، تۆزێک سـەری دانەواند و تەماشای ئەولای ژوورەکەی کرد:

– خەڵکی دەڵێن: *ئێوە نەخۆشـن کاکە گیان، جا ئەو شـتانەش کە دەیانبینن تەنیا کۆمەڵی خەیالات و وڕێنەن!* وەلێ قسـەکەشـیان هێندە لۆژیکی نییە. ئەوەم قەبووڵە کە ڕۆح و ئەوان تەنیا دەچنە سەروەختی نەخۆشـەکان، وەلێ ئەمە تەنیا دەیسـەلمێنێ کە ناتوانن بە بەرچاوی ئەوانی ترەوە دەرکەون، نەک ئەوەی کە بوونیان نییە!

ڕاسکۆڵنیکۆف بە توورەیی پێداگریی کرد:

– شتی وا بوونی نییە!

– کەواتە قەبووڵتان نییە، وایە؟ هەر بە ڕاستی وا بیر دەکەنەوە؟

سڤیدریگایلۆڤ هێمنهێمنێک ڕووی نیگای کردە ئەو:

– ئەی ئەم بەڵگەیە چۆنە (ئێوە یـارمەتیم بـدەن) کە بڵێین: ڕۆح تۆزێک و بەشێکە لە دونیایەکی تر و دەستپێکی ئەو جیهانەیە. مرۆڤی تەندروسـت بڕیار نییە بتوانێ ڕۆح ببینێ، هەرچییەک بێ سـەر بەم دونیایەیە و هەردووک پێشـی لەسـەر ئەم گۆیە خاکییەیە، دەبێ تەنیا لێرە بژی و بۆ هاوئاهەنگی و پەرەسـەندنی ئەم سرووشـتە سـەرقاڵی ئەم ژیانە بێ. بەس ئەی ئەگەر خوانەخواسـتە مرۆڤ نەخۆش بکەوێ! کە یەکەمین نیشـانەی نەخۆشـی دەرکەوت و هاوئاهەنگیی زەمینی و

ئاســـــایی زیندەوەرانی شـــێواند، دەمودەســـت گریمانەی هەبوونی دونیایەکی تر دەکا. تا نەخۆشـییەکەشـی جددیتر بێ، پەیوەندیی لەگەڵ دونیـاکەی تردا پتەوتر دەبێ. تەنـانەت دەگـاتە ئەوەش کـابرا هەر کە مرد، یەکســـەر هەنگاو دەنێتە ناو ئەو دونیایەی ترەوە. ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر ئەمەم بۆ خۆم بەڵگاند. گەر بڕواتان بە ژیانی دوای مردن نەبێ، خۆ دەتوانن بڕوا بەمەیان بکەن.

ڕاسکۆڵنیکۆف گوتی:

– باوەڕم بە ژیانی دوای مردنیش نییە!

سڤیدریگایلۆڤ کە بەدەم تێفکرین و خەیاڵکردنێکی قووڵەوە بێدەنگ دانیشتبوو، کتوپڕ گوتی:

– ئەی ئەگەر لەوێ تەنیا جاڵجاڵۆکە و ئەم جۆرە شتانەی لێ بێ؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بیری کردەوە: *ئەم کابرایە شێتە!*

– ژیـانی تـاهەتـایی بۆ ئێمە هەمیشــــە شـــتێ بووە لەودیو تێگەیشتنمانەوە، شتێکی بەرین و ناکۆتا. بەس بۆچی دەبێ ناکۆتا بێ؟ بیهێننە بەرچـاوتـان، ئەی ئەگەر لەبری نـاکۆتـایی تەنیـا یەک ژووری بچووک لەئارادا بێ؟ وەک گەرماوە دووکەڵاوی و تاریکەکانی لادێ کە هەر سووچێکیشی بە تەونی جاڵجاڵۆکە تەنراوە! دەی، ئەوەش نەمری! من جاروبار ئەم بیر و خەیاڵانەم بە سەردا دێن.

ڕاسکۆڵنیکۆف کە حاڵی تەواو خراپ بووبوو، بە بێزارییەوە گوتی:

– بۆ خاتری خوا یانی ناتوانن بیرێکی ئاســـــوودەییبەخشـــــتر یان لانیکەم ویژدانداراانەتر بکەنەوە؟

– ویژدانداراانەتر؟ بەس کێ چووزانێ، ڕەنگە زۆریش ویژدانداراانە بێ. گەر من بام کتومت هەموو شتێکم وا ڕێک دەخست!

سفیدریگایلۆف بزەیەکی مانادار‌ی کرد.

ئەم وەڵامە ترسناک و هەژێنەرە، پشتی ڕاسکۆڵنیکۆفی لەرزاند. سفیدریگایلۆف سەری هەڵبڕی، تەماشایەکی ئەوی کرد و کتوپڕ دایە قاقای پێکەنین و هاواری کرد:

– تۆ سەیری ئێمەش! نیو کاتژمێرێک لەمەوبەر یەکترمان نەدەناسی، ئێستەش دەڵێی دژمنی خوێنینی یەکتریین، چونکە لە بەینی ئێمەدا مەسەلەیەکی چارەنەکراو هەیە! کەچی ئەو مەسەلەیەمان وەلا ناوە و خەریکی فەلسەفەلێدانین! باشە، باشە، خۆتان بڵێن، خراپم گوت کە من و ئێوە لە یەک توخمین؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بە توورەیی و مکووڕی قسەی هێنایەوە سەر باسە سەرەکییەکە:

– پیاوەتی بکەن و زیاتر درێژەی مەدەنێ و بڵێن بۆچی شانازیی دیداری ئێوە بە من براوە؟... من... من زۆر پەلەمە و کاتێکی واشم بەدەستەوە نییە تا بەم جۆرە بەفیڕۆی بدەم. دەبێ بچمە دەرەوە...

– هەڵبەتە، بە دڵنیاییەوە! خوشکی بەڕێزی ئێوە! دونیا خاتوون، بڕیارە لەگەڵ کاکە لوژن، یانی هەمان جەنابی پیۆتەر پیترۆڤیچ لوژندا، زەماوەند بکەن؟

– پیاوەتی بکەن و هیچ شتێ لەبارەی خوشکی منەوە مەپرسن و ناویشی نەهێنن. تێناگەم چۆن زاتتان هەیە بەم ڕووداریییەوە ناوی دونیا لەبەردەم مندا بهێنن، جا ئەگەر هەمان ئەو کەسە بن کە بانگەشەی دەکەن! یان لەوانەشە سفیدریگایلۆف نەبن!

– من هاتوومەتە ئێرە تا باسی ئەوان بکەم، چۆن دەکرێ ناویان نەهێنم؟

– باشە، قسەکەتان بکەن و زووتر بیبڕنەوە!

– لەوە دڵنیام کە ئێوە هەر لەم سەرەتایەوە بۆچوونێکی تایبەتتان لەبارەی بەڕێز لوژنەوە هەیە. ئەوان خزمێکی دووری منن، لە بنەماڵەی هاوسەرەکەمەوە. دەزانم هەر ئەوەندە بەسە کە ماوەیەکی کەم ئەوتان دیبێ یان تەنانەت شتێکەیەکتان لەبارەیەوە بیستبێ تا ئەو بناسن. لوژن بۆ خاتوو دونیا ناشێ. هێندەی من تێگەیشتبم، ئەوان خەریکن وەک گەورەیەکی بەرپرسیار و هەڵبەتە لەوپەڕی کورتبینیدا خۆیان دەکەنە قوربانی، جا ئەمەش لەپێناو... لەپێناو خێزانەکەیاندا. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو شتانەی کە لەبارەی ئێوەوە بیستبوومن، سۆسەم دەکرد گەلێک بەوە دڵخۆش بن کە ئەم هاوسەرگیرییە سەر نەگرێ، بێ ئەوەی هیچ زیانێکی لێ بکەوێتەوە. ئێستەش کە ئێوەم بینی، سۆسەکەم گۆڕا بۆ دڵنیایی.

ڕاسکۆڵنیکۆف گوتی:

– وەها قسەیەک لە دەمی ئێوەوە ئەوپەڕی ساویلکەییە و هەڵبەتە دەبوو بڵێم ئەوپەڕی بێشەرمی!

– یانی خەریکن ناڕاستەوخۆ دەڵێن من بەدوای ئامانجە نەگریسەکانی خۆمەوەم، ها؟ خەمتان نەبێ، جەنابی ڕاسکۆڵنیکۆفی ئازیز! گەر وا با نەدەهاتمە بەردەمتان و ڕووبەڕوو قسەتان لەگەڵ بکەم، ئەوەندەش گەمژە نیم! لەم نێوەندەدا خاڵێکی دەروونیی سەرنجڕاکێشیش هەیە کە گوتنی لە بەرژەوەندیدایە! چەند ساتێ لەمەوبەر کە خەریکبووم پاساوم بۆ خۆشەویستیی خۆم بۆ دونیا خاتوون دەهێنایەوە، گوتم خۆشم قوربانیم. باشە، چاکتر وایە ئاگادار بن کە ئێستە هیچ عەشقێک لە دڵی مندا نەماوە، ئاسەواری سڕاوەتەوە و خۆشم سەرم لەمە سووڕ ماوە! ئەوکات هەر بە ڕاستی هەستێکم هەبوو...

ڕاسکۆڵنیکۆف قسەی پێ بڕی:

– ئەویش هۆکارەکەی بەرەلایی و هەرزەیی بووە!

– با وا بێ. من، بەرەڵا و هەرزەم. وەلێ خوشـــکەکەی ئێوە چەند لایەنێکی هێندە باشـــیان هەیە کە تەنانەت منی هەرزەش نەمدەتوانی نەکەومە ژێر کاریگەرییانەوە. گەرچی ئەمانە ئیتر قســـەی بەلاشـــن و خۆشم تێگەیشتووم.

– ڕێک کەی تێگەیشتن؟

– ماوەیەک دەبێ تێگەیشتووم، وەلێ ئەلەم چەند ڕۆژەدا بوو کە بە تەواوی بڕوام هێنا، کەم تا زۆر ئەو کاتەی کە پێم نایە پیتەربورگەوە. کە لە مۆســـکۆش بووم هەر پێم وابوو بۆیە دەمەوێ بێمە ئێرانە تا دەســـتی دونیا خاتوون بگرم و مارەی ببڕم و ئەو جەنابی بەڕێز لوژنەش لە مەیدانەکە تارێنم!

– ببوورن کە قســـەتان پێ دەبڕم، وەلێ پیاوەتی بکەن و کورتی بکەنەوە و زووتر بچنە ســـەر مەبەســـتی ڕاستەقینەی هاتنتان بۆ ئێرە! پەلەمە، دەبێ بچمە دەرێ...

– بەوپەڕی خۆشـــحاڵییەوە. کە گەیشـــتمە ئێرە و بڕیارم دا بچم... بچم بۆ شوێنێ تا هەوایەک بگۆڕم، وام بە زەیندا هات کە ئامادەکاریی بۆ هەندێ ئیشـــی پێویســـــت بکەم. منداڵەکانم لای پووریان جێ هێشـــتوون، پارەیان هەیە و هیچ پێویســـتییەکیان بە من نییە. ئاخر من وەک باوکێک دەتوانم چییان بۆ بکەم! بۆ خۆشـــم هیچم هەڵنەگرت بێ لەوەی کە پار مارفا پیترۆڤنا پێی دام و هەڵبەتە ئەوە سەروزیادە بۆم. ببوورن، وا دەگەمە ســـەر مەبەســـتە ســـەرەکییەکە. بەر لە ســـەفەر دەمویســـت حســـێبی خۆم لەگەڵ ئەم لوژنەدا پاک بکەمەوە. واش نەبێ بڵێی زۆر ڕقم لێی بێ، وەلێ لەبەر ئەو بوو کە لەگەڵ مارفا پیترۆڤنا بووە شەڕمان، ئەو کاتەی کە تێگەیشتم ئەم پەیوەندییە پیرۆزە لەلایەن خاتوونەوە ڕێک خراوە. ئێستە من دەمەوێ لەڕێی ئێوەوە خاتوو دونیا

ببینم و ئەگەریش ویستتان با هەر لەگەڵ خۆتاندا بێ، هیچ کێشەیەک نییە. بەر لە هەر شتێ دەمەوێ ڕوونی بکەمەوە کە هیچ خێرێکی لەم جەنابی لوژنەوە پێ ناگا و تەنیا شەڕە. پاشان لەبارەی ئەو هەلومەرجە ناخۆشەوەی کە هاتبووە پێش، داوای لێبوردنیان لێ بکەم و جا خوازیارم مۆڵەت بدەن دە هەزار ڕۆبڵیان پێشکەش بکەم بۆ ئەوەی تا ڕادەیەک جیابوونەوەکەی لە لوژن قەرەبوو بکرێتەوە. دەزانم ئەگەر بکرابا، ئەوان خۆیان دەستوبردیان لەم جیابوونەوە دەکرد!

ڕاسکۆلنیکۆف کە زیاتر سەرسووڕماو و تووڕە بوو، هاواری کرد:

– ئێوە هەر بە ڕاستی، هەر بە ڕاستی شێتن! چۆن دەوێرن قسەی بێسەروبەری وا بکەن؟

– دەمزانی هەر کە وام گوت بەسەرمدا دەقیڕێنن! گەرچی من کەسێکی دەوڵەمەند نیم، وەلێ ئەو هەزار ڕۆبڵەی کە گوتم، بێبەرانبەرە و هیچ پێویستییەکم پێی نییە. ئەگەر دونیا خاتوون قەبووڵی نەکەن، ڕێیەکی دەبەنگانە بۆ بەفیڕۆدانی دەدۆزمەوە! کەواتە ئەمە هۆکاری یەکەم. دووەمین ئەوەیە کە ویژدانی خۆشم پاکە و هیچ مەبەستێ لەپشت پێشنیارەکەمەوە نییە. ڕەنگە ئێستە بڕوا نەکەن، وەلێ لە کۆتاییەکەیدا دونیا خاتوون و ئێوە تێدەگەن کە ڕاستم کردووە. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە من خوشکی ئێوەم تووشی سەرئێشە و کێشە کردووە و، ڕێزێکی زۆرم بۆیان هەیە، جا ئێستەش لە ناخی دڵەوە پەشیمانم و دەمەوێ بە جۆرێ لە جۆرەکان قەرەبووی بکەمەوە، نەک لەبەر ئەوەی کە لەبەرانبەر ئەو سەرئێشە و کێشەیەدا بمەوێ پارەیەک بدەم و خۆم ئاسوودە بکەم! دەمەوێ ڕێک و ڕاست و دۆستانە کارێک بکەم کە لە بەرژەوەندییاندا بێ و نیشانی بدەم کە بڕیار نییە من لە ژیانمدا تەنیا خراپە تووشی ئەوانی تر بکەم! من ئەگەر بە ئەندازەی سەرەدەرزییەک خۆبینی و مەرامم هەبا، وەها پێشنیارێکم بەو ڕاشکاوییەوە نەدەخستە بەرباس، جا بۆچی دە هەزار، لە کاتێکدا کە

پێنج حەفتە لەمەوبەر، بڕێکی زیاتریشـــم بۆ پێشـــنیار کردبوون. با ئەوەش بڵێم کە من بڕیارە بەم نزیکـانە لەگەڵ خـاتوونێکی گەنج و جوانـدا زەمـاوەنـد بکەم و ئەمەش دەبێ ئێوە بێخەم بکـا لەبـارەی گریمانەکردنی هەر نەخشەیەکەوە کە بۆ دونیا خاتوون لە سەرمدا بێ. کۆتایی بە قســـەکانم دەهێنم، تەنیا مۆڵەت بدەن ڕاییگەیەنم کە دونیا خاتوون بە زەماوەندکردن لەگەڵ لوژنیشـــدا هەر بڕێکی وای دەســـت دەکەوێ، تەنیا بە جۆرێکی تر... باشـــە ئێســـتە، هەڵمەچن، جەنابی ڕاسکۆڵنیکۆف! تەنیا پشوودرێژ و هێمن بیری لێ بکەنەوە.

سڤیدریگایلۆڤ کە ئەمەی گوت، خۆیشی بێڕادە پشوودرێژ و هێمن بوو.

ڕاسکۆڵنیکۆف گوتی:

– تکـا دەکەم کۆتـایی پێ بێنن، گەر هیچیش نەبووبێ، ئەم بێڕێزیکردنەتان شیاوی بەخشین نییە!

– بە هیچ شـــێوەیەک مەبەســـتی بێڕێزیکردنم نییە! گەر وا بێ لەم دونیایەدا مرۆڤ ناتوانێ بێ لە خراپە هیچی تر لەئاسـت دراوسـێکەیدا بکـا و نـاتوانێ بچووکترین هەنگـاویش لەڕێی چـاکەدا بنێ، چونکە دابونەریتە پووچەکان دەســـت و پێی دەبەســـتنەوە! گەمژانەیە! باشـــە، گریمـان من کەوتم و مردم، دەفەرموون لەم بـارەشـــــدا هەر ڕەدی دەکەنەوە؟

– بە ئەگەرێکی زۆر ڕەدی دەکاتەوە!

– نا دەی، پێم وا نییە! باشـە، بە ئارەزووی خۆتان، وەلێ دە هەزار لەم دۆخەدا بڕێکی باشە. بەهەرحاڵ تکا دەکەم پەیامەکەی من بگەیەننە خوشکتان.

– نەخێر، هیچی پێ ناڵێم!

– کەواتە هیچ ڕێچارەیەکم بۆ نەماوەتەوە، جەنابی ڕاسکۆڵنیکۆف، بێ لەوەی کە هەوڵ بدەم خۆیان ببینم و کاتیان بگرم.

– گەر پێی بڵێم، ئیتر ناچنە سەرەوەختی؟

– ئمممم، نازانم چۆن پێتان بڵێم، زۆر تامەزرۆم لانیکەم یەک جاری تریش بیانبینم.

– هیوادار مەبن!

– داخێکی گەورەیە! وەلێ ئێوە هێشتا منتان نەناسیوە. کێ ناڵێ نابینە دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی.

– لاتان وایە ئێمە ببینە دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی؟

سڤیدریگایلۆڤ بەدەم زەردەخەنەوە گوتی:

– ئێ، بۆ نا؟

هەستایەوە و کڵاوەکەی لەسەر زەوی هەڵگرتەوە.

– ئەوەی ڕاستی بێ من نەمدەویست کاتتان بگرم و کە بەڕێوەش بووم بەرەو ئێرە، چاوەڕێ نەبووم لەم دیدارەدا شتێکی وام دەست کەوێ، گەرچی ئەم بەیانییە پیس بە باری ڕووخسارتان ڕاچەنیم.

ڕاسکۆڵنیکۆف بە نیگەرانییەوە پرسیی:

– بەیانی لەکوێ منتان بینی؟

– زۆر بە هەڵکەوت... بەدەست خۆم نییە، وەلێ وا دەزانم من و ئێوە بە جۆرێ لە جۆرەکان تاکی یەکترین... جا زیرە مەکەن. من لەوانە نیم کە ببمە مووی لووتی کەسێک. تا ئێستەش بەرکەوتنێکی چاکم لەگەڵ قومارچییەکاندا هەبووە و بە هیچ شێوەیەکیش شازادە سڤیربێیم، کە پیاوێکی گەورەیە و یەکێکە لە خزمە دوورەکانم، بێزار نەکردووە و خۆمم لە بەرچاوی نەخستووە! تەنانەت لەبارەی *مدونای*

*رافائیل*یشەوە لە ئەلبوومی خاتوو پریلۆکاودا شتۆکەیەکم نووسیوە! حەوت سالی ڕەبەقیش لەبەردەم مارفا پیترۆڤنادا جوولەم نەکرد! سەردەمانی زووش شەوانە لە بینای *ویازێمسکی*[1] بازاڕی *سێننایا*، دەخەوتم و، ئێستەش، کێ چووزانێ، لەوانەیە لەگەڵ ئەم جەنابی بێرگەدا سواری باڵۆن ببم و خۆم بە ناخی ئاسماندا بکەم!

– زۆر باشە، بەڕێز. دەکرێ بپرسم کەی بەنیازی ئەم گەشتەن؟

– کامە گەشت؟

– ئەی هاوار، ئائەم گەشتەی کە گوتتان دەی... چەوگۆڕین و ئەم جۆرە شتانە.

– من گوتم گەشت؟ ئۆو، بەڵێ!... ئێوە ڕاست دەکەن، باسی بەرنامەی گەشتەکەمم بۆتان کرد... جا هەڵبەتە بەم ئاسانییەش نییە. وای ئەگەر دەتانزانی خەریکن باسی چیم لەگەڵدا دەکەن!

کتوپڕ بزەیەکی هاتێ، بەس هێندەی نەخایاند و بۆی زیاد کرد:

– لەوانەشە لەبری گەشت، ژنێکم بەنسیب بێ! وا خەریکن ژنم بۆ دەدۆزنەوە.

– لێرە خەریکن ژنت بۆ دەدۆزنەوە؟

– بەڵێ.

– چەندە بەدەستوبردن!

---

١. بینایەکی بێڕادە گەورەی فولکەی سێننایا، کە *فسی والود کریستۆڤسکی* لە ڕۆمانە بەناوبانگەکەیدا، *کەلاوەکانی پیتەربورگ*، ئەو بە سێ ماڵی نێو یەک ماڵ ناو دەبات و دەڵێت ئەم بینایە لانەی سەرپێچیکەر و دز و بەرەڵا و گەشتیارانی نایاسایی پیتەربورگە و مایەی شەرمەزارییە بۆ هەر کۆمەڵگەیەکی یاسامەند. «و. ف»

– بەس زۆر تامەزۆری دیداری دونیا خاتوون بووم. دەستەوداوێن تکاتان لێ دەکەم ڕێکی بخەن. دەی، خوا ئاگادارتان بێ! ئۆو، خەریک بوو شتێکم بیر بچێ! بە خوشکتان بڵێن مارفا پترۆڤنا ئەوانیان لە بیر بووە و لە وەسیەتنامەکەیاندا ناوی ئەوانیان هێناوە و سێ هەزار ڕۆبڵیان بۆ داناون. ئەمە ڕاستە و هیچ فرۆفێڵێکیش لەئارادا نییە. مارفا پیترۆڤنا حەفتەیەک بەر لە مردنیان ئەمەیان کرد و لەبەردەم خۆشمدا ئەنجام درا. دونیا خاتوو تا دوو یان سێ حەفتەی تر دەتوانێ پارەکەی وەربگرێ.

– جا بە ڕاستتانە؟

– بەڵێ. پێیان بڵێن، دەی، جەنابی پایەبەرز، من لە خزمەتتاندام. هەر لەم نزیکانەدا ژوورێکم گرتووە.

سڤیدریگایلۆف خەریک بوو دەچووە دەرێ کە تووشی ڕازومیخین بوو.

## دوو

بەرەبەرە دەبووە کاتژمێر هەشــت و ڕاســکۆڵنیکۆف و ڕازومیخین پەلەیان بوو بەر لە لوژن بگەنە بیناکەی باکالییێف.

ڕازومیخین هەر کە هەنگاوی نایە سەر شەقام، پرسیی:

– باشە ئەو کابرایە کێ بوو؟

– ســڤیدریگایلۆڤ بوو، هەمان ئەو موڵکدارەی کە خوشــکەکەم لە ماڵەکەیاندا مامۆستای منداڵەکانی بوو و هەر لەوێش سووکایەتییان پێ کرد. خوێڕییە هێندە بە دەوروخولیدا هات، تا کچەی داماو وازی هێنا و جێی هێشـــت، یانی ژنەکەی ســـڤیدریگایلۆڤ، مارفا پیترۆڤنا، ئەوی وەدەر نـا. ئەم خـاتوو مـارفـا پیترۆڤنـایە دواتر داوای لێبوردن و گەردنئازادیی لە دونیا کرد، جا بەم دواییانەش لە کتوپڕێکیشدا بێهۆش کەوت و مرد. کاکە خۆ ئەم بەیانییە باسـی ئەو بوو. نازانم بۆ ئەوەندە لەو خوێڕییە دەترسـم. دەسـتبەجێ دوای ناشـتنی ژنەکەی هەسـتاوە و هاتووە بۆ ئێرە. مرۆڤێکی ســەیروســەمەرەیە و بێگومان لە هاتنەکەیدا مەبەسـتێکی هەیە... دەبێ چاومان لە دونیا بێ و نەهێڵین ئەو خوێڕییە لێی نزیک بێتەوە، بە کورتییەکەی دەبێ وریای بین... بۆیە ئەم شتانەم بۆ باس کردی تا لەمە تێبگەی، بیستت یان نا؟

– چـاومـان لێی بێ و وریـای بین؟ دەتوانێ چ زیـانێ بە دونیـا خاتوون بگەیەنێ؟ بەس سوپاست دەکەم ڕۆدیا، کە ئاوها گرێی دڵتت لەلا کردمەوە... ئاگاداریم، ترســـی ناوێ!... ئەی ئەم کابرایە لە کوێ دادەنیشێ؟

– ئاگادار نیم.

– ئەی هاوار، بۆچی نەتپرسی؟ حەیفی! بەس خۆم بەدوایدا دەچم.

ڕاسکۆڵنیکۆف ئیستێکی کرد و گوتی:

– بینیت؟

– بەڵێ، چاک بینیم.

ڕاسکۆڵنیکۆف لەسەری ڕۆیشت:

– سەروسیمای لە زەینتدا ماوە؟ بە جوانی بینیت؟

– بەڵێ کاکە گیان، بە جۆرێ سەروسیمایم لە بەرچاوە کە لەنێو هەزار کەسیشدا دەیناسمەوە! دایمە چاک سەروسیماکانم بیر دەمێنن.

دووبارە بێدەنگ بوون.

ڕاسکۆڵنیکۆف لەژێر لێوەوە گوتی:

– ئەممم!... دەبێ سوپاسگوزار بم... ئاخر دەزانی، وام بە خەیاڵدا هات نەکا... یانی هێشتا زەینم بەوەوە قاڵە کە نەکا ئەوە هەمووی خەیالات بووبێ.

– مەبەست؟ هەر نازانم باسی چیش دەکەی؟

ڕاسکۆڵنیکۆف بە بزەیەک دەمی خوار کرد:

– ئاخر، ئێوە هەمووتان دەڵێن من شێت بوومە. ئێستەش وام بە بیردا هات کە ڕەنگە هەر بە ڕاستی تێک چووبم و ئەوەی کە بینیومە تارمایی بووە نەک مرۆڤ.

– ئەوە تۆ منگەمنگی چیتە؟

– کێ چووزانێ! ڕەنگە هەر بە ڕاستی شێت بم و ئەوەش کە لەم ڕۆژانەدا ڕووی داوە تەنیا لە خەیاڵمدا بووبێ...

– ئاخ، ڕۆدیا! هەمدیسان سەرودڵیان گرتییەوە! باشە چیی دەگوت و بەدوای چییەوە بوو کە ئاوها هاتووە بۆ لات؟

ڕاسکۆڵنیکۆف وەڵامی نەدایەوە. ڕازومیخین بۆ خولەکێک تێفکری و پاشان بەم جۆرە سەری قسەی کردەوە:

– کەواتە با ڕاپۆرتێکت بخەمە بەردەست. هاتم بەدواتدا، جەنابت خەوتبووی. فراوێنمان خوارد و پاشانیش من چوومە ماڵی پۆررفێری. زامیۆتۆفیش هێشتا لەوێ بوو. ویستم باسەکە بکەمەوە، کەچی سوودێکی نەبوو، یانی نەمتوانی بە باشی بیکەمەوە. ئەوانیش یان تێناگەن، یان خۆیان لە گێلی داوە، هەرچۆنێ بووە شەرمیان بە خۆیان نییە. پارفێریم ڕاکێشایە بەرپەنجەرە، بەس هەر نەکرا و نەکرا، ئەو شتێکی دەگوت و منیش شتێک. ئاخرییەکەی مستمم لەبەردەم دەموچاویدا ڕاگرت و پێم گوت سەرباری ئەو خزمایەتییەش وردی دەکەم. واقووڕ سەیرمی کرد، منیش تفێکم ڕۆکرد و جێم هێشت؛ تەواو. مەسەلەکە زۆر گەمژانە بوو. حسێبیشم بۆ زامیۆتۆف هەر نەکرد. بە خۆمم گوت هەموو شتێکم تێک داوە، وەلێ کاتێ بە پلیکانەکاندا دەهاتمە خوارێ، بیرم کردەوە: باشە بۆچی ئەو دووانەمان دەبێ ئەوەندە سەری خۆمان بێشێنین؟ ئەگەر هەرەشەیەک، مەترسییەک، شتێکت لەسەر بوو، ئەوەیان لەلایەک، بەس بۆچی ئێستە دەبێ گوێ بەم قسانە بدەی؟ لەم نێوەندەدا چ پەیوەندییەکی بە تووە هەیە، کەواتە لێیان گەڕێ و ملیان بشکێ! دواتر کاتمان زۆرە بۆ تەشقەڵەپێکردنیان. گەر من لەجێی تۆ بام بە دڵی خۆم پێم ڕادەبواردن. هەر شەرمەزارییان بۆ دەمێنێتەوە! داینێ بۆ دواتر، دارکارییەکی چاک قەرززران! بەس جارێ تەنیا دەبێ پێبکەنی!

ڕاسکۆڵنیکۆف گوتی:

– بەڵێ، ڕاستە!

جا لەبەرخۆوە بیری کردەوە: *باشـــە تۆ، گەر سـبەی بیزانی چی دەڵێی؟*

ســـەیر بوو کە تا ئەو ســـاتە بیری لەوە نەکردبووەوە کە ئەگەر ڕازومیخین پێی بزانێ چ کاردانەوەیەکی دەبێت. ڕاسـکۆڵنیکۆف بەدەم ئەم بیر و خەیالانەوە، واقووڕ تەماشـــای ڕازومیخینی کرد. ڕووداوی دیدارەکەی ئەو لەگەڵ پارفیرێدا هیچ سـەرنجێکی ئەوی ڕانەکێشـا: بۆ مەگەر خۆی، هەر لەو ماوەیەدا، کەم تووشی بەزمی دیکەش بووبوو!

لە ڕێڕەوەکەدا تووشـــی لوژن بوون کە ڕێک کاتژمێر هەشـــت گەیشتبوو و بەدوای ژووری خاتوونەکاندا دەگەڕا. لەبەر ئەوە بوو کە هەر ســـێکیان پێکەوە، وەلێ بێ ئەوەی چاکوچۆنی بکەن یان تەنانەت بە تیلەی چاویش لە یەکدی بڕوانن، چوونە ژوورێ، هەڵبەتە پیاوە گەنجەکان پێش کەوتن و لوژن لەبەر ڕەچاوکردنی دابونەریتیش بێ، کەمێ ڕاوەســـتا و هەر لە دەرەوە کۆتەکەی لە بەر کردەوە. پولخێریا خۆی گەیاندە بەردەرگە تا پێشـــوازیی لێ بکا و دونیاش خەریک بوو بەخێرهاتنی براکەی دەکرد.

دواجـــار لوژنیش هـــاتە ژوورێ و ڕووبەڕووی خـــاتوونەکـان نیوەکڕنۆشـێکی برد کە وەک پێویست خۆشەویستیی تێدا بوو، بەڵام، لەبەرانبەردا، دەتگوت وشکیی هەڵسوکەوتەکەی دووهێندە بووبوو. لە لایەکی دیکەوە وا دەهاتە بەرچاو کە بڕێک شـــپرزە بووە و هێشـــتا نەیتوانیوە خۆی کۆ بکاتەوە. پولخێریاش تۆزێک ناڕەحەت بوو و بە پەلەپرووزێ هەمووانی لەدەوری مێزێکدا دانیشـاندن کە سـەماوەرێک بەسـەرییەوە قوڵی دەدا. دونیا و لوژن ڕووبەڕووی یەکدی دانیشـتن، ڕاسکۆڵنیکۆف لەتەنیشت خوشکەکەی و ڕازومیخینیش لەلای لوژنەوە.

چەند ســـاتێک بێدەنگی باڵی بەســـەردا کێشـــا. لوژن لەســـەرخۆ و دڵنیا دەسـرێکی ناسکی دەرهێنا کە بۆنێکی خۆشـی لێ دەهات، جا بە

باری پیاوێکی قورســوقوڵەوە کە هەســت دەکات حورمەتیان پاشــێل کردووە و ئێستەش مکووڕانە ڕوونکردنەوەی دەوێت، مشێکی کرد. لە ڕاڕەوەکەدا کەوتبووە ســەرییەوە کە ئەســڵەن کۆتەکەی دانەکەنێت و بڕوات، بۆ ئەوەی وانەیەکی چاکی ئەو ژنانە دابدات و چاک و توند لە قاڵبیان بداتەوە تا دەرک بە ناڵەباریی دۆخەکە و جددییەتی ئەو بکەن. بەس نەیتوانی خۆی قایل بکات و بێتە ژێر باری ڕۆیشــتن. ئەوەش لە لایەک کە مرۆڤێــک بوو لە بنەڕەتەوە بەرگەی دوودڵی و گومــانی نەدەگرت و ئێســتەش ڕوونکردنەوەی دەویســت: مادام بەم ڕاشــکاوییە ســـەرپێچییان لە فەرمانەکەی کردووە، مانای وایە ماســـتەکە مووێکی تێدایە، کەواتە باشـــتر وایە بمێنێتەوە و بەر لە هەموو شـــتێک تێبگات چی بە چییە. چونکە دواتر کاتی بۆ تەمبێکردنی هەموویان دەبێت.

وشک و فەرمی لە پولخێریای پرسی:

– هیوادارم بە ئاسوودەیی گەیشتبن، خاتوونی ڕێزدار؟

– ئۆو، زۆر باش بوو، پیۆتەر پیترۆڤیچ.

– خۆشـــحاڵم کە ئەمە دەبیســـتم، خاتوونی ڕێزدار. هیوادارم دونیا خاتوونیش زیاد لە ڕادە ماندوو و شەکەت نەبووبن؟

دونیا وەڵامیی دایەوە:

– من هەرچییەک بێ گەنج و بەهێزم، بەم ئاســـانییە ماندوو نابم، وەلێ دایکم زۆر وەڕەز بوو.

– ئیتر چارەیەک نییە، ڕێگەی ئاسنی نیشتمانیی ئێمە دوورودرێژە! وەک دەڵێن، نیشـــتمانی دایک ســـەرزەوییەکی ئێجگار بەرفراوانە... ئەوەی ڕاســـتی بێ حەزم دەکرد دوێنێ بگەمە خزمەتتان و بتانبینم، بەس نەمتوانی. هەرچۆنێک بووە هیوادارم کارەکان بەبێ کێشـــەیەکی ئەوتۆ ڕایی بووبن؟

پولخێریا بە هەلی زانی و ڕێک و ڕاســـت و بە شـــێوازێکی تایبەت گوتی:

– ئۆو، نـا پیۆتەر پیترۆڤیچ، دوێنێ دۆخەکە زۆر نـالەبـار بوو. بە تەواوی ســـــەرمان لێ شـــێوابوو و گەر خوا دیمیتری پراکۆفیچی بۆ نەناردباین، نازانم چیمان بەسەر دەهات! خۆشیان وا لێرە ئامادەن...

جا ڕازومیخینی بە لوژن ناساند:

– دیمیتری پراکۆفیچ ڕازومیخین!

لوژن لەژێر چاوەوە نەیارانە تەمـاشـــــایەکی ڕازومیخینی کرد و لەسەرخۆ گوتی:

– شانازیی ناسینی ئەوانم پێ براوە... دوێنێ.

پاشانیش ناوچاوی بە یەکدا دا و بێدەنگ بوو.

لوژن بە گشـــتی ســـەر بەو دەســـتە مرۆڤانە بوو کە لە کۆڕەکاندا، بنەمـاکانی ئەتەکیەت و نەریت و حورمەت بۆ ئەوان لە ســـــەرووی هەموو شـــتێکەوەیە، بەس وای لەو کاتەی کە کەســـێک لە ڕوویاندا بوەستێتەوە و بە پێچەوانەی ئارەزووی ئەوانەوە بجوولێتەوە! ئەوسا ئیدی ڕووەکەی دیکەیان دەردەکەوێت و دەکەونە سەر باری دەبەنگی. ئیدی هیچ ئاسەوارێک لەو مرۆڤە کۆمەلایەتی و کۆڕڕازێنەی جاران لە دەروونیاندا نامێنێتەوە. هەمووان بێدەنگ دانیشـتبوون؛ ڕاسـکۆلنیکۆف لە لاسـارییان ئامادە نەبوو هیچ بلێت و دونیا نەیدەویسـت بەم زووانە ســـەری قســـە بکاتەوە و ڕازومیخینیش قســـەیەکی نەبوو تا بیکات. لە ئەنجامدا، پولخێریا کەوتە کردوکۆش تا بێدەنگییەکە بشـــکێنێت و ئەم جارەش بەو باسەوەی گرتەوە کە بووبووە قسەی سەر و بنی زمانی:

– بێگومان بیستووتانە کە مارفا پیترۆڤنا بە ڕەحمەتی خوا چووە؟

– بەڵێ، بێگومان بیستوومە. دەستبەجێ هەواڵەکەیان پێ گەیاندم و منیش لە بنەڕەتەوە بۆ ئەوە هاتوومەتە ئێرە تا ئاگادارتان بکەمەوە سڤیدریگایلۆڤ یەکسەر دوای ڕێوڕەسمی بەخاکسپارنی هاوسەرە خوالێخۆشبووەکەی، بە پەلە هاتووە بۆ پیتەربورگ. لانیکەم بەپێی ئەو زانیارییە بڕواپێکراوانەی کە بە من گەیشتوون.

– هاتووە بۆ پیتەربورگ؟ ئێرە؟

دونیا تۆقیوانە ئەمەی پرسی و سەیری دایکیی کرد.

– بەڵێ، ڕاستە خاتوونی ڕێزدار. هەڵبەتە بە سەرنجدان لەو هەڵپەیەی بۆ هاتنەئێرە و لە سەرووی ئەوەشەوە بەزموڕەزمەکەی ڕابردووش، بێگومان نەخشە و بەرنامەیەکی لە سەردایە.

پولخێریا هاواری کرد:

– خوایە! لێرەش بەتەما نییە واز لە دونیاکەی من بێنێ!

– من هۆکارێک بۆ نیگەرانبوونی ئێوە یان دونیا خاتوون نابینم، هەڵبەتە بە پشتبەستن بەو گریمانەیەی کە ئێوەش هیچ حەزێکتان بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵ ئەواندا نییە! منیش لەلایەن خۆمەوە چاوم لەسەر هەموو شتێک هەیە و هەوڵ دەدەم بزانم شوێنی نیشتەجێبوونی لە کوێیە...

پولخێریا شوێن قسەکەی کەوت:

– ئۆو، پیۆتەر پیترۆڤیچ! خۆشتان نازانن چۆنتان تۆقاندم! تا ئێستە تەنیا دوو جار ئەم پیاوەم دیوە، وەلێ بە پیاوێکی ترسناک دێتە بەرچاوم! گومانم نییە کە هەر خۆی بووەتە هۆکاری مردنی مارفا پیترۆڤنا.

– ئەوەی ڕاستی بێ ناکرێ لەمەیان دڵنیا بین. من کتومت ئاگاداری ڕووداوەکەم. ئەوە ڕاستە، لەوانەیە بە شەڕ و دەمەقاڵە یان وەک دەڵێن بە ئازار و ئەشـــکەنجە لە دیوە ئاکارییەکەیەوە بووبێتە هۆکاری پێشـــکەوتنی مەرگی ژنەکەی، وەلێ ســـەبارەت بە هەڵســـوکەوت و بەرکەوتنە تایبەتی و خاسـیەتە ئاکارییەکانی، هاوڕاتانم. ئێستە نازانم ئاخۆ خۆی ماڵومولکێکی هەیە یان نا و ئەوەی کە مارفا پیترۆڤنا کتومت چیی بۆ جێ هێشـــتووە، هەڵبەتە بەم زووانە ئاگادار دەبمەوە. وەلێ ئێســـتە هاتووەتە پیتەربورگ، گەر بڕێکی زۆریش پارەی پێ بێ، دەکەوێتە شـــوێن هەمان خووە دێرینەکانی. لەنێو ئەو مرۆڤانەی کە هـاوتوخمی خۆیین، لەو هەرزەتر نـادۆزیتەوە! من بەپێی هەنـدێک بەڵگەی ئێجگار باش بڕوام وایە کە مارفا پیترۆڤنا –کە بۆ بەدبەختی هەشـــت ســـاڵ لەمەوبەر عاشـــقی ئەم پیاوە بوو و بە تەواویش قەرزەکانی بۆ دایەوە– بە جۆرێکی تریش خزمەتی ئەوی کردووە و تەنیا و تەنیا لە ســـایەی کۆشـــش و قوربانییەکانی ئەوەوە توانیی لە کەیســـێکی تاوانکاری ڕزگار ببێ، کە لە کوشـــتنێکی تەواو ئەقڵنەبڕ و دڵڕەقانەدا تێوەگلابوو و دەکرا بەهۆیەوە ڕاســـت ڕەوانەی ســـیبیریا بکرێ. جا گەر دەتانەوێ بیناسن، ئەوە دەبێ بڵێم لەم جۆرە مرۆڤانەیە ئەو پایەبەرزە!

هاواری پولخیریا بەرز بووەوە:

– هانا بۆ تۆ خوایە!

ڕاسکۆڵنیکۆفیش بە سەرنجەوە گوێی لە قسەکان دەگرت. دونیاش بە شێوازێکی تایبەت کە هیچ شوێنێکی بۆ چەندوچۆن نەدەهێشتەوە، پرسیی:

– یانی هەر بە ڕاســـتی لەبارەی ئەم ڕووداوەوە زانیارییەکانتان وردن؟

– من لێرە تەنیا خەریکم ئەو شــتانە دەڵێمەوە کە خوالێخۆشــبوو مـارفـا پیترۆڤنـا مەحرەمـانە پێیـان گوتووم. هەروەهـا دەبێ ئەوەش بگوترێ ســـەرباری ئەوەی ئەم دۆســـییەیە لە ڕووی یاســـاییەوە دانەخراوە، هەموو شـــتێکیشـــی ناڕوون و گوماناوییە! ئەو کات لێرە خاتوو ڕێسـ*لیخ*ناوێک ژیاوە، کە لام وایە هێشـتا لێرەیە. لەو بیانیانەی کە وردەپارەی بە سـوو داوە و لە چەند لایەکی تریشـەوە بە مامەڵە و کاری تری ســـووخۆرانە هەســـتاوە! جەنابی ســـڤیدریگایلۆڤیش تا ماوەیەکی زۆر پەیوەندییەکی نزیک و ئاڵۆزی لەگەڵ ئەم خاتوونەدا هەبووە. خاتوو ڕێســـلیخ لەگەڵ یەکێک لە خزمەکانیدا ژیاوە، وا بزانم خوشکەزای بووە، کچێکی پازدە ساڵەی کەڕ و لاڵ کە لەوانەیە چواردە سـاڵیش نەبووبێ. ڕێسـلیخ زۆر ڕقی لەم کچە بووە و هەر تیکەنانێکی کردووەتە قوورزەڵقورتی و خراپیش لێی داوە. بە کورتییەکەی ڕۆژێکیان کچەکە بە خنکاوی لە ســـەربان دەدۆزنەوە. لە دانیشـــتنی دادگەدا هۆکاری مردنەکەی بە خۆکوژی لەقەڵەم دەدرێ. دۆسییەکەی قۆناغە ئاســـاییەکانی خۆی تێدەپەڕێنێ و بە ڕوواڵەت دادەخرێ، وەلێ دواتر ڕاپۆرتێک دەدرێ کە ڕایدەگەیەنێ ســـڤیدریگایلۆڤ بێبەزەییانە دەســـتدرێژیی کردووەتە ســـەری. هەموو شـــتێکی گوماناوی بووە و ژنێکی ئەڵمانیی تر ئەو ڕاپۆرتەی دابوو کە ئەویش بەرەلایەک بووە و نەدەکرا متمانە بە قســـەکانی بکرێ. بە کورتییەکەی، لەسـایەی پارە و هەوڵەکانی مارفا پیترۆڤناوە ژنە تەنانەت لای پۆلیس قسـەکانیی تۆمار نەکردن و هەموو شـــتێک وەک دەنگۆیەک مایەوە. لەگەڵ ئەمەشـــدا، مرۆڤ هەر بیر لەوە دەکاتەوە ئاخۆ مەســـەلەکە چۆن بووە. دونیا خاتوون، خۆ ئێوە تەنانەت ئەو کاتەی کە لای ئەوان کارتان دەکرد، ڕووداوێکی تریشـتان بیسـتووە؛ بەسـەرهاتی *فیلیپی* خزمە*تکار*یان کە شـەش سـاڵ لەمەوبەر، بەر لە هەڵوەشـاندنەوەی یاسـای ڕەعیەتداری، لەژێر ئەشکەنجەدا مرد.

– من بە جۆرێکی تر بیستم، بیستم کە فیلیپ خۆی لە دار دابوو.

– بەڵێ، بەڵێ، خاتوونی ڕێزدار! وەلێ ئەوە هەڵسوکەوتی سەختگرانە و بەئازار و تەمبێکردنی بەردەوامی بەڕێز سڤیدریگایلۆڤ بووە کە فیلیپی ناچار بە خۆکوژی کردووە.

دونیا سارد و وشک وەڵامی دایەوە:

– ئاگاداری ئەوەیان نیم. من تەنیا بەسەرهاتێکی سەیرم بیست لەبارەی بارودۆخی ماخولیانیی فیلیپەوە، کە وەک ئەوەی نیوەفەیلەسووفێکی ئەو ماڵە بووبێ بۆ خۆی. دەیانگوت *ئەوەندە کتێبی خوێندووەتەوە تا ئەقڵی لەدەست داوە!* ئەوەش کە خۆی لە دار داوە لەوانەیە تا ڕادەیەک لەبەر گاڵتەپێکردنی خەڵکی بووبێ، نەک لێدان و ئەشکەنجەی بەڕێز سڤیدریگایلۆڤ! بەو جۆرەی کە من لەو ماوەیەدا شایەت بووم، ئەوان هەڵسوکەوتێکی باشیان لەگەڵ هەمووان‌دا هەبوو و تەنانەت خۆشیشیان دەویست، گەرچی بۆ مردنی فیلیپ ئەویان بە تاوانبار دەزانی.

– باشە، دونیا خاتوون، دەبینم ئێوە دڵتان پێوەیە پشتگیرییان بکەن...

لوژن بە بزەیەکی ئاڵۆزەوە دەمیی خوار کرد.

– هەڵبەتە ئەوان مرۆڤێکی خراپەکارن و لە کاتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خاتووناندا زیرەکی و سەرنجراکێشییەکی تایبەتیان هەیە. هەر مردنی سەیروسەمەرەی مارفا پیترۆڤنا نموونەیەکی جێداخە! من تەنیا دەمویست پێتان ڕابگەیەنم بە لەبەرچاوگرتنی جووڵە و هەوڵەکانی دواتر، کە بە دڵنیاییەوە لە وەها مرۆڤێک چاوەڕوانی دەکرێن، ئاگاداری و پەندێک بدەمە ئێوە و دایکی ڕێزدارتان. من دڵنیام هەمدیسان دەبێ بە ژێر قەرزی خەڵکییەوە و سەر لە زیندان دەردەهێنێ. مارفا پیترۆڤنا هەرگیز نەیدەویست شتێکی ئەوتۆی بە میرات بۆ جێ بهێڵێ و بەر لە

هەر شـــتێک بەرژەوەنـدیی منـاڵەکـانی لە بەرچـاو بوو؛ ئەگەریش شـتۆکەیەکی بۆ جێ هێشـتبێ، لەوانەیە بڕێکی زۆر کەم بێ، یانی تەنیا چەند پەناباپەک بێ بۆ دابینکردنی پێداویســـتییە ماوەکورتەکان، کە بەدەســـت مرۆڤێکی هەڵگری ئەم خووانەوە، یەک ســـاڵیش درێژە ناکێشێ.

دونیا گوتی:

– پیۆتەر پیترۆڤیچ، تکا دەکەم ئیتر باســـی بەڕێز ســـڤیدریگایلۆڤ مەکەن؛ پێی تێک دەچم!

ڕاسکۆڵنیکۆف بێ پێشەکی گوتی:

– سڤیدریگایلۆڤ هەر ئێستە لای من بوو.

لەوساوەی کە هاتبوون، ئەوە یەکەمین جار بوو کە بێدەنگیی خۆی دەشکاند.

دەنگی سەرسوورمان بەرز بووەوە، هەمووان ڕوویان کردە ئەو و تەنانەت لوژنیش دۆش دامابوو.

– خەوتبووم کە هات، کاتژمێر و نیوێک لەمەوبەر. هایی کردمەوە و خۆی ناسـاند. کەیفسـاز و ئاسـایی بوو و زۆریش گەشـبین بەوەی کە، ئێمە دەتوانین زۆر باش ببینە هاوڕێی یەکتری. بە ڕاســـت دونیا، ئەو زۆر تامەزرۆی دیدار و قســـەکردن لەگەڵ تۆ بوو و داوای لێ کردم بێمە نێوانەوە تا چاوتان بە یەکتری بکەوێ. پێشـــنیارێکی بۆتان هەیە و بە منیشـــی گوت کە پێشـنیارەکەی چییە. ئەوەشـــی گوت کە مارفا پیترۆڤنا حەفتەیەک بەر لە مردنی لە وەســـیەتنامەکەیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە ســـێ هەزار ڕۆبڵ بدەنە دونیا و بەم زووانەش ئەو پارەیەت دێتە دەست.

پولخێریا هاواری کرد:

– خوایە گیان، سوپاس بۆ تۆ!

جا خاچی کێشا:

– دوعا بۆ شادبوونی ڕۆحی بکە، دونیا!

لوژن لە دەمی دەرچوو:

– بەڵێ، وایە!

دونیا شوێن قسەکانی ڕاسکۆڵنیکۆف کەوت:

– دەی زوو بیڵێ، چیی تری گوت؟

– گوتی پـارە و سـامـانێکی وای نییە و زۆربەی موڵکەکە بە منداڵەکانی براوە و ئەوانیش لای پوورە خاتوونیانن. جا گوتی خۆیشی لە شوێنێکی ئەو دەوروبەرانەی مندا نیشتەجێیە، بەس نازانم کتومت لە کوێ، ئەوەی ڕاستی بێ ئیتر نەمپرسی...

پولخێریا کە خەریک بوو لە حەیبەتان گیانی دەردەچوو، هـاواری لێ هەستا:

– وەلێ ئاخر بەتەمایە چ پێشنیارێ بۆ دونیا بکا؟ هیچی بە تۆ نەگوت؟

– بەڵێ، گوتی.

– دەی، چی بوو؟

– دواتر پێتان دەڵێم.

ڕاسکۆڵنیکۆف بێدەنگ بوو و هەموو سەرنجی لەسەر پیاڵەچایەکەی چڕ کردەوە.

لوژن کاتژمێرەکەی دەرهێنا و سەیرێکی کرد:

– ئەوەی ڕاســتی بێ، من کارێکی گرنگم هەیە و لەوە زیاتر کاتتان ناگرم.

تا ڕادەیەک قەڵس دەهاتە بەرچاو و نیوخێز بوو تا بڕوات.

دونیا گوتی:

– بۆ کوێ، پیۆتەر پیترۆڤیچ؟ ئێوە خۆتـان دەتـانویســـــت ئەمڕۆ بەیەکەوە بین، کەواتە بمێننەوە. هەروەها، خۆتان نووســـیبووتان کە دەتانەوێ بابەتێ بە دایکم بڵێن.

– ڕێک وایە، دونیا خاتوون.

لوژن شـێوازی دووانەکەی بکوت بووبوو، هەمدیســان دانیشـتەوە، بەڵام کڵاوەکەی هەر وا بە دەستییەوە بوو:

– هەڵبەتە چەند خاڵێک هەن کە من دەمویست لەگەڵ ئێوە و دایکی بەرزوبەڕێزتاندا بیانخەمە بەرباس و لەنێویشـیاندا بابەتی گرنگ هەیە. بەس مـادام برا بەڕێزەکەی ئێوە نـاتوانن لەبەردەم منـدا بـاســـی پێشنیارەکەی سـڤیدریگایلۆڤ بکەن، منیش حەزێکی وام نییە و ناتوانم بە ئاسوودەیی... باسی بابەتگەلێکی جددی لەبەردەم ئەم و ئەودا بکەم. جا ئەوەش لە لایەک کە داوا بنەڕەتی و جەختلەســەرکراوەکەی من لە بەرچاو نەگیراوە...

لوژن ڕووواڵەتێکی ڕەنجـاوی بەخشـــییە خۆی و لە بێـدەنگییەکی بەشکۆدا ڕۆ چوو.

دونیا گوتی:

– داواکەی ئێوە، کە براکەم لە دیدارەکەی ئەمڕۆی ئێمەدا ئـامـادە نەبێ، بە پێـداگریی من لە بەرچـاو نەگیرا. نووســـیبووتـان براکەم ســووکایەتیی بە ئێوە کردووە و لام وایە ئەم مەســەلەیە هەر لێرە و

ئێستە ڕوون بکرێتەوە و ئاشت ببنەوە. ئەگەر ڕۆدیا هەر بە ڕاستی سووکایەتیی بە ئێوە کردبێ، ئەوا پێویستە داوای لێبوردن بکا و بێگومانیش دەیکا.

لوژن کە وەک ئەوە وابوو ویستبێتی ئائەمە ببیستێت، خۆی کۆ کردەوە و ئەم جارەیان تۆکمەتر هاتە قسە:

– هەندێک سووکایەتی هەن، خاتوو دونیا، هەرچەندە ویستیشت لەسەر بێ و دڵپاکانە بتەوێ، کەچی هەر لە بیر ناکرێن. هەمیشە سنوورێک هەیە نابێ ببەزێندرێ و مەترسیدارە! کاتێکیش بەزاندت، ئیتر ڕێگەی گەڕانەوە نییە.

دونیا تۆزێک پشووکورتانە قسەی پێ بڕی:

– پیۆتەر پیترۆڤیچ! قسەی من شتێکی تر بوو. تکایە دەرک بەوە بکەن کە داهاتووی ئێمە ڕێک بەوەوە بەستراوەتەوە کە ئەم مەسەلەیە بە تەواوی ڕوون ببێتەوە و چارە بکرێ. وا لە سەرەتاوە پێتان دەڵێم کە من ناتوانم بە جۆرێکی تر بڕوانمە ئەم بابەتە و ئێوەش ئەگەر کەمترین بایەخم بۆ دادەنێن، دەبێ هەر ئەمڕۆ بیبڕنەوە، جا هەرچەندەش دژوار بێ! دووبارەی دەکەمەوە، ئەگەر هەڵسوکەوتی براکەم شیاوی سەرکۆنەکردن بێ، خۆی داوای لێبوردنتان لێ دەکا.

– سەرم لەوە سووڕ ماوە کە ئێوە بۆچی و چۆن بەم جۆرە لە بابەتەکە دەدوێن...

لوژن تا دەهات زیاتر تووڕە دەبوو:

– ڕاستە کە ئێوە زۆر بە لای منەوە بەبایەخن و تەنانەت دەشتان پەرستم، وەلێ هاوکات ئاساییە کە فلانە ئەندامی خێزانەکەی ئێوەم بەدڵ نەبێ! بەڵێ، بەڵێ، بێڕادە پەرۆشم شانازیی زەماوەندکردنم

لەگەڵ ئێوەدا پێ ببڕێ، بەس لەلایەکیشـــەوە ناتوانم بچمە ژێر باری هەندێک ئەرکەوە کە لەگەڵ ڕێسا و بنەماکانی مندا یەک ناگرنەوە...

دونیا خرۆشاوانە قسەی پێ بڕی:

– پیۆتەر پیترۆڤیچ، دەی ئەوەنـدە پشـــووکورت مەبن و تکـایە هەمدیســان ببنەوە بە هەمان ئەو پیاوە تێگەیشـتوو و دڵگەورەیەی کە هەمیشـــە من وێنام کردووە و لە ئێســتە بەدواوەش حەز دەکەم ئەوە بن! من بەڵێنێکی گەورەم بە ئێوە داوە و لای خۆیەوە بەتەمـام ببمە هاوسەرتان! کەواتە لەم بابەتە تایبەتییەدا متمانەم پێ بکەن و دڵنیا بن دەتوانم بێلایەنـانە داوەری بکەم! براکەشـــم ئـاگـای لەوە نەبوو کە دەمەوێ خۆم قسەی هەردوو لا ببیستم و داوەری بکەم. ئەمڕۆ دوای بەدەســـتگەیشـــتنی نامەکەی ئێوە، زۆرم لێ کرد کە هەر پێویســـتە ئامادەبێ، بە هیچ شـــێوەیەک دەرم نەخســـت کە دەمەوێ چ بڕیارێ بدەم. تکا دەکەم تێم بگەن کە ئەگەر ئاشـــت نەبنەوە من ناچار دەبم لەنێوان ئێوەدا دانەیەکتان هەڵبژێرم، یان ئێوە یان براکەم! کەواتە هەم ئێوە و هەم ئەو دەبێ لەم لایەنەوە بڕواننە بابەتەکە. بە هیچ شێوەیەک نامەوێ و نابێ لە هەڵبژاردنەکەمدا هەڵە بکەم؛ دەبێ لەبەر ئێوە چاو لە براکەم بپۆشـــم و لەبەر براکەشـــم لە ئێوە. ئەمە تاکە هەلە بۆم ڕەخساوە تا لە دوو شت دڵنیا ببمەوە: ڕۆدیا هەر بە ڕاستی دەیەوێ برایەتیی خۆی بســـەلمێنێ؟ جا ئێســـتە ئێوە، بە لاتـانەوە گرنگم و بایەخێکم هەیە؟ دەتوانن ببنە هاوسەرێکی ڕاستەقینە؟

لوژن چاوەڕێی وەها بەرکەوتنێک نەبوو و بە قەڵسییەوە گوتی:

– دونیا خاتوون، قسـەکانتان زۆر مانادارن و ئەگەر ئەو پەیوەندی و خزمایەتییە لە بەرچاو بگرن، کە بڕیارە وەک شـــانازییەک بە من ببڕێ، ئەوســـا دەبێ بڵێم تەنانەت قســـەکانتان ڕەقیشـــن! جا ئەوەش لەلایەک کە نـازانم بەپێی چ پێوەرێکی نـامـاقووڵ منتـان لەگەڵ ئەو

گەنجۆکە دەمهەراشانەدا خستووەتە یەک ئاست! چ ئاسان ڕوو وەردەگێڕن و دەڵێن لەوانەیە ئەو بەڵێنە پاشێل بکەن کە لەنێوانماندایە! وا گوتتان *یان ئێوە یان براکەم* کە وەک دیارە من هیچ سەنگ و ڕێزێکم بۆ ئێوە نییە... بە لەبەرچاوگرتنی پەیوەندییەکەمان و... ئەو بەرپرسیارییەتیانەی کە لەنێوانماندا هەن، ناتوانم چاو لەمەیان بپۆشم.

دونیا کتوپڕ تەقییەوە:

– چی؟ من وا ئێوە و بەرژەوەندییەکانتان دەخەمە بەرانبەر شتانێ کە تا ئێستە بەبایەخترین شتگەلی ژیانم بوونە، شتگەلێ کە ئەسڵەن تەواوی ژیانی من بوونە! کەچی جەنابی پایەبەرزتان پێی دەڕەنجێن کە گوایە بەهەندم وەرنەگرتوون و ڕێز و سەنگتان لەلام نییە!

راسکۆلنیکۆف هیچی نەگوت، وەلێ بزەیەکی ماناداری کرد و ڕازومیخینیش سرەوتی لێ بڕابوو و هەر جموجووڵی بوو. بەڵام لوژن گوێی بە تانەکەی دونیا نەدا و، بە پێچەوانەوە، لەگەڵ هەر وشەیەکدا تووڕەتر و بیانووگرتریش دەبوو. بە گشتی پێدەچوو کەیفی بەو دۆخە هاتبێ و بەرەبەرە چێژیشی دەبرد. بە شێوازێکی ئامۆژگاریکەرانەوە گوتی:

– خۆشەویستی بۆ ژیانی داهاتووتان، یانی خۆشەویستی بۆ مێرد، دەبێ لە سەرووی خۆشەویستیی خوشک و برا و، هەرچۆنێک بووە، ناکرێ من لەگەڵ... من خۆم پێداگر بووم و گوتم کە نامەوێ لای براکەتان هەندێ بابەت بکەمەوە، وەلێ ئێستە بڕیارم وایە لەبارەی خاڵێکی زۆر گرنگەوە داوای ڕوونکردنەوە لە دایکی بەڕێزتان بکەم، خاڵێک کە پێگە و سەنگ و ڕێزی من دەخاتە ژێر پرسیارەوە!

لوژن ڕووی کردە پولخێریا و درێژەی پێ دا:

– پایەبەرزەکەتان دوێنێ لەبەردەم بەڕێز ڕاسـۆدکیندا[1] (بە ڕێزەوە ڕووی کردە ڕازومیخین و سـەری دانەواند و گوتی: ناوی شـەریفتان ئەمەیە؟ ببوورن کە ناوی بنەماڵەیی شــەریفی ئێوەی پایەبەرزم بیر چوو) ســووکایەتییان بە من کرد و ئەو قســەیەی کە من لە کاتی گفتوگۆ تایبەتییەکەم لەگەڵ ئێوەدا، ئەو کاتەی قاوەمان دەخواردەوە، کردبـووم، هەڵگەڕانـدەوە و خـراپ لـێکـیـان دایەوە، ئەوەی کە زەمـاوەنـدکردن لەگەڵ کچێکی دەســتکورتدا کە ســارد و گەرمی ڕۆژگاریی چەشــتووە، بە بۆچوونی من باشــترە تا لەگەڵ کچێکی نازپەروەردەدا، چونکە لە لایەنی ژیانی ژن و مێردایەتی و ئەخلاقییەوە هەڵبەتە وا باشترە! وەلێ پایەبەرزەکەی ئێوە دەستەنقەست بە جۆرێک خراپ مەبەسـتی قسـەکەی منی مانا کرد کە ئەسـڵەن بووە شـتێکی گاڵتەجاڕانە و تۆمەتباریان کردم بە هەبوونی بیر و ویستی چەپەڵ! تا ئەو شوێنەش کە من تێگەیشتم، لەژێر کاریگەریی هەمان ئەو نامەیەدا بوو. پولخێریـا خـاتوون، زۆر زۆر دڵخۆش دەبم گەر بکرێ بۆم بسەلمێنن کە من هەڵەم و، بە کورتییەکەی، ئەرک بکێشن و ئاسوودەم بکەن. ئەو چاکەیە بکەن و بڵێن کە کتومت قسـەکانی منتان لە نامەکەدا بۆ ئەوان گێڕاونەتەوە؟

پولخێریا کەوتە تەتەڵەکردن:

– بە خوا بیرم نایێتەوە، هەر بەو جۆرەی کە خۆم تێگەیشـتووم بۆ ڕۆدیام دووبارە کردنەوە. نازانم ڕۆدیا چی و چۆنی گوتووە و ئێوە... لەوانەشە شتەکەی گەورە کردبێ!

– گەر ئێوە ڕێتان بۆ خۆش نەکردبا، نەیدەتوانی گەورەی بکات!

پولخێریا بە قورسوقۆڵییەکی تایبەتییەوە ڕایگەیاند:

---

١. ڕاســۆدکین، لە ڕەگی وشــەیەکی ڕووســییەوە وەرگیراوە کە بە مانای ئەقڵ و لۆژیک دێت و لەگەڵ ڕازومیخیندا نزیکییەکی مانایی هەیە. «و. ف»

– پیۆتەر پیترۆڤیچ! هەر ئەوەی کە من و دونیا ئێستە لێرەین مانای وایە خراپ قسەکانی ئێوەمان لێک نەداونەتەوە.

دونیا وەک پاڵپشتییەک بۆ قسەکانی دایکی گوتی:

– چاکت گوت، دایە گیان.

لوژن زویرانە گوتی:

– کەواتە ئەم خەتایەش کەوتە ئەستۆی من!

پولخێریا تۆکمەتر لە جاری پێشوو درێژەی پێ دا:

– دەی، پیۆتەر پیترۆڤیچ، ئێوە هەر وا ڕۆدیا خەتابار دەکەن، کەچی دوێنێ خۆتان شتێکتان لەبارەی ئەوەوە نووسی کە ئەسڵی نییە...

– بیرم نییە شتێکی پێچەوانەی ڕاستیم نووسیبێت، خانمخاس!

ڕاسکۆڵنیکۆف ڕووی کردە لوژن، بەڵام توندوتیژانە وەڵامی دایەوە:

– نووسـیبووتان من دوێنێ پارەم داوەتە کچی ئەو پیاوەی کە کرا بەژێرەوە، جا ئەوەش هیچ کە من تا دوێنێش ئەو خاتوونەم نەبینیبوو. کەچی ئەوەش ڕاست نییە و من پارەکەم دایە ژنی ئەو خوالێخۆشبووە. ئامانجیشتان ئەوە بوو کە مەودایەک بخەنە نێوان من و خێزانەکەمەوە و تەنیا و تەنیا بۆ جێبەجێکردنی نەخشـتەکەتان ئاماژەیەکی چەپەڵ و ماناداریشـتان بۆ هەڵسـوکەوتی کچێ کردبوو کە نەتاندەناسـی؛ هەمووی کۆمەڵێک قسەی پووچ و فاتوفیتکەرانە بوو!

لوژن لە ڕقان هەڵدەلەرزی:

– ببوورن، جەنابی پایەبەرز! من تەنیا لەبەر ئەوەی کە دایک و خوشـکتان داوایان لێ کردبووم، باسـی هەڵسـوکەوت و شـوێنی نیشتەجێبوونتانم بۆ کردن و ڕوونم کردەوە؛ خاتوونەکان دەیانویست بزانن لە چ هەلومەرجێکدا بینیومن و چۆن لە ئێوە و باروودۆختـان

تێگەیشتووم. لەبارەی ئەو بەشە تایبەتەی نامەکەی منیشەوە کە باسی کرا، ئەرک بکێشـــن و تەنیا یەک وشـــەم بە نموونە بۆ بهێننەوە کە راســـت نەبووبێ و بە مەبەســـتێکی خراپەوە نووســـرابێ. یانی دەفەرموون پـارەکەتـانتـان بە ئـاودا نەدا و لەنێو ئەنـدامـانی ئەو خێزانەشـــدا، با لەوە گەڕێین کە چەندە چـارەڕەش و داماون، هیچ کەسێکی بەدکاری تێدا نییە؟

– بە بـۆچـوونـی مـن جەنـابـی بەرزوبەڕێـزتـان، بەو هەمـوو کەشـوفشـەتانەوە، پەنجەتووتەی ئەو کچە بەدبەختە ناهێنن کە ئێسـتە وا بەردی تێدەگرن!

– کەواتە گەر وا بێ ئامادەن ئەو بخەنە ڕیزی دایک و خوشکتانەوە، ها؟

– گەر هەر بە ڕاســـتی حەز دەکەن بزانن، بەڵێ بە دڵنیـاییەوە ئامادەم. هەر ئەم بەیانییە لەتەنیشت دایکم و دونیاوە دامنیشاند.

پولخێریا هاواری کرد:

– وای، ڕۆدیا!

دونیا سوور هەڵگەڕا و ڕازومیخین برۆی تێک نا. لوژن گورمزێکی[1] زۆر بەرزەدەمارانەی هاتێ:

– دونیا خاتوون، فەرموون، ئێســـتە خۆتان داوەری بکەن و بزانن هەر لە بنەڕەتەوە هیچ هیوایەک بۆ لێکتێگەیشتن هەیە یان نا. هیوادارم ئەم مەسەلەیە هەر لێرە و بە یەکجاری بۆ تاهەتا ڕوون بووبێتەوە. بە یارمەتیتان من ئیتر کاتتان ناگرم، تا لە چێژی کۆبوونەوەی خێزانی و قسە تایبەتییەکانتان نەکەم.

---

١. گورمز: زەردەخەنەیەک بە مەبەســـتی ســـووکایەتی یان گاڵتەهاتن بە کەســـی بەرانبەر.

هەستایەوە و کلاوەکەشی هەڵگرت:

– وەلیّ ئێستە کە بەتەمای ڕۆیشتنم، داواکارم لە داهاتوودا چاوپۆشی لە ئامادەبوونی من لەم جۆرە دیدار و باشتر بڵێم سازانانەدا بکەن. لە ئێوەش، خانمخاس پولخێریا، خاتوونی ڕێزدار، زیاتر لەوانی تر و زویرانە ئەم داوایەم هەیە، چونکە ڕووی دەمی نامەکە لە ئێوە بوو نەک کەسی تر.

پولخێریا ئالێکساندرۆڤنا کەمێک لە بەردڵی گران بوو:

– پیۆتەر پیترۆڤیچ، دەڵێی هەر بە ڕاستی بڕواتان وایە دەبێ ئێمە گوێلەمستی ئێوە بین! دونیا بۆی ڕوون کردنەوە بۆچی داواکەی ئێوەی جێبەجێ نەکردووە و نیازی باش بووە و نازانم چی و چی! ئێوەش بە جۆرێ دەنووسن هەر دەڵێی یاسا بۆ من دەردەکەن! یانی ئێستە دەبێ ئێوە هەرچیتان ویست، ئێمە وەک یاسایەک لێی بڕوانین؟ دەرفەت بدەن تێتان بگەیەنم، ئێستە کە ئێمە دەستمان لە هەموو شتێ بەردا و بە پشتبەستن بە ئێوە هەستاین و هاتینە ئێرە، ئێوە دەبێ زیاتر لە جاران دڵمان ڕاگرن و هەستەکانمان لە بەرچاو بگرن، چونکە دواجار هەرچۆنێک لە مەسەلەکە بڕوانین، ئێمە خۆمان داوەتە دەستی ئێوە!

– یەکجار واش نییە، پولخێریا خاتوون، بەتایبەت ئێستە کە هەواڵی سێ هەزار ڕۆبڵ میراتی مارفا پیترۆڤنا لەئارادایە و جا ئەوەش بەتایبەت لە کاتی خۆیدا! بەم شێوازی قسەکردنەتان لەگەڵ مندا دیارە...

لوژن دواهەمین ڕستەی بە تانەوە دەربڕی.

دونیا بە توورەییەوە بە گژیدا چوو:

– هەر ئەم قســـەیەتان ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمەش دەبێ گریمانەی ئەوە بکەین جەنابتـان پشــتتان بە داماوی و دەســتکورتیی ئێمە بەستبوو!

– بە چی دەچێ؟ خۆ تازە ناتوانم پشت بەوە ببەستم! لەمەش زیاتر نامەوێ کاتتان بگرم و خوانەخواسـتە نەهێڵم بە ئاسـوودەیی لەبارەی پێشـنیارە مەحرەمانەکانی سـڤیدریگایلۆڤەوە، کە لەگەڵ برا هێژاکەتاندا خستوونیە بەر باس، گفتوگۆ بکەن. لام وایە پێشـنیارەکانی بۆ خودی ئێوەش زۆر گرنگ و جێسەرنجن!

پولخێریا هاواری کرد:

– خوایە گیان، بێ بە هانامانەوە!

ڕازومیخین ئیدی لە جێگەکەیدا سرەوتی لێ بڕا بوو.

ڕاسکۆلنیکۆف پرسیی:

– هێشتا هەر تەریق نابیتەوە بەم دۆخە، خوشکێ؟

دونیا گوتی:

– بۆچی، ڕۆدیا. زۆریش شەرمەزارم.

جا لە بارێکدا کە لە ڕقان ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو، ڕووی کردە لوژن:

– پیۆتەر پیترۆڤیچ، بچنە دەرێ!

لوژن بە هیچ شێوەیەک چاوەڕێ نەبوو دۆخەکە وا بشکێتەوە. زیاد لە ڕادە بڕوای بە خۆی هەبوو و بێئەندازەش پشـتی بە بەهێزیی خۆی و بێدەســەڵاتیی قوربانییەکانی بەســتبوو و تەنانەت لەو ســاتەشــدا باوەڕی نەدەکرد کە دۆخەکە پێچەوانە بووەتەوە. ڕەنگی پەڕی و لێوی کەوتە لەرزین:

– دونیا خاتوون، گەر ئێستە لەم دەرگەیە چوومە دەر، بەم جۆرەی کە ئێوە خەریکن وەدەرم دەنێن، وریـا بن کە هەرگیز نـاگەڕێمەوە. چـاک بیری لێ بکەنەوە، چونکە قســەی خۆم دەبەمە ســەر و گەڕانەوەیەک لەئارادا نییە!

– ئـای لەو بێشــەرمی و ڕوودامـاڵراوییە! کێ داوای لێ کردوون بگەڕێنەوە؟

لوژن هاواری لێ هەستا:

– بە ڕاست! یانی نێوانی ئێمە گەیشتووەتە ئەوە!

تەنانەت تا دواهەمین ســاتیش نەیدەتوانی بڕوا بە خۆی بهێنێت کە ئیدی هیچیان تێدا نەهێشــتووەتەوە و لە ئەنجامدا بە تەواوی جڵەوی کارەکە لەدەست دەرچووە.

– وەلێ دەتانزانی، دونیا خاتوون، کە من دەتوانم سکاڵاتان لەســەر تۆمار بکەم؟

پولخێریا هەڵچووانە هاتە نێو مشتومڕەکەوە:

– چۆن ئەو مافەتان هەیە بەم جۆرە قســە لەگەڵ دونیا بکەن؟ بچن ســکاڵا لە چی بکەن بۆ نموونە؟ بۆ مەگەر مافێکتان بەســەر ئێمەوە هەیە؟ واتان زانیوە دوای ئەم قسـانە هەڵدەسـتم و سـووک و ئاسـان دونیا گیانم دەدەمە دەســت کەســێکی وەک ئێوە؟ فەرموون بەڕێز، فەرموون و هەر ئاوڕیش مەدەنەوە! ئەســڵەن خەتای خۆمانە کە ئاوا هاتینە ژێر بار! زیاتر لە هەموانیش من خەتابارم!

لوژن شێتئاسا نەڕاندی:

– وەلێ ئێوە بە بەڵێنی هـاوســەرگیری منتـان دەســـخەڕۆ کرد، پولخێریا خاتوون، جا ئێستەش زۆر بە ئاسـانی وا هەڵیدەوەشـێننەوە! جا لەگەڵ ئەوەشدا... لەم نێوەندەدا من هەندێک خەرجیم هاتنە کۆڵ!

ئەم سکاڵا و کرووزانەوەیەی دوایی هێندە لوژنانە بوو کە ڕاسکۆلنیکۆف وێڕای ئەوەی لەتاو کردوکۆشێکی زۆر بۆ جڵەوکردنی توورەیی خۆی سپی هەڵگەڕابوو، نەیتوانی بەر بە پێکەنینی بگرێ و کتوپڕ لە قاقای دا. بەس پولخێریا خراپ بەگژیدا چوو:

– خەرجی؟ چ خەرجییەکتان هاتووەتە کۆڵ؟ نەکا باسی کۆڵوبارەکەمان بکەن؟ خۆ داتانە دەست پاسەوانی شەمەندەفەرەکە و بە خۆڕایی ئاخنینییە ناو بارەکان و هیچی لێ وەرنەگرتن. خوایە هاوار، ئێمە دەست و پێی ئەوانمان بەستووە! باشە ئێوە چۆن تێگەیشتوون، پیۆتەر پیترۆڤیچ؟ ئەوە ئێوە بوون کە ئێمەتان دەسخەڕۆ کرد و گیرۆدەتان کردین، نەک ئێمە!

دونیا تکای لە دایکی کرد:

– دایە گیان، بەسە! ئیتر دەمەدەمەی لەگەڵ مەکەن! پیۆتەر پیترۆڤیچ، چاکەیەک بکەن و ئێرە جێ بهێڵن!

– وا دەڕۆم! وەلێ تەنیا قسەیەک ماوە و کۆتایی...

لوژن ئیدی هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر خۆیدا نەدەشکا:

– دایە گیان دەڵێی ئێوە هەر بە یەکجاری بیرتان چووە من لە کاتێکدا بڕیارم دا پەیوەندیی خزمایەتی لەگەڵ ئێوەدا ببەستم کە لە سەرانسەری شاردا باس هەر باسی ئێوە بوو. تەنانەت گەر لەبەر ئەوەش بێ کە تەنیا لەبەر خاتری ئێوە و گێڕانەوەی ئاوڕووتان گوێم بە قسەوقسەڵۆکی خەڵکی نەدا، لەبەر ئەوە مافی خۆمە چاوەڕوانیی قەرەبووکردنەوە و پێزانینم هەبێ... بەس ئێستە وا بە چاوی کراوەوە هەموو شتێ دەبینم! لام وایە کاڵفامی بوو کە کوێرانە گوێم لە ئامۆژگاریی ئەو هەموو خەڵکە نەگرت...

ڕازومیخین لە جێگەکەی دەرپەڕی و هاواری کرد:

– دەڵێی سەری خۆی لێ زیادەیە!

دونیا هاواری کرد:

– ئێوە مرۆڤێکی چەندە ناڕەسەن و چەپەڵ دەرچوون!

ڕاسکۆڵنیکۆف ڕازومیخینی ڕاکێشایە دواوە:

– هیچ مەڵێ! لە جێی خۆیشت نەجووڵێی!

جا خۆی بەگژ لوژندا چوو:

– تکایە هەر ئێستە بچنە دەرێ!

لەسەرخۆ و برگەبرگە درێژەی پێ دا:

– یەک وشەی دیکەش نەبیستم ئیتر...

لوژن ئیدی ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو و لە ڕقاندا ڕووخساری کرژ بووبوو، چەند ساتێک لێی ڕاما و پاشان وەرسووڕا و لە ژوورەکە چووە دەر؛ هەموو دونیا بگەڕابای دڵێکت نەدەدۆزییەوە وەک هی لوژن پڕ لە ڕق و مەراق بێت. کینەیەکی مەرگباری بەرانبەر ڕاسکۆڵنیکۆف لە دڵ گرتبوو و تەنیا و تەنیاش ئەوی بە بەرپرسی هەموو ڕووداوەکان دەزانی. جا ئەوە خۆش بوو کە لوژن لە کاتی داگەڕان بە پلیکانەکاندا، وای دەزانی هێشتا بە تەواوی یارییەکەی نەدۆڕاندووە و مادام بەشێک لە مەسەلەکە لەدەست ژنەکاندایە، کەواتە دەکرێ هەموو شتێ بە خێر و خۆشی ببڕێتەوە.

## سێ

راســــتییەکەی ئەوە بوو کە پیۆتەر پیترۆڤیچ لوژن تــا دواهەمین ســـاتیش چاوەڕێی وەها ئەنجامێک نەبوو. بە جۆرێک بەخۆناز و دڵنیا بوو کە تەنانەت بە خەیاڵیشــــیدا نەدەهات ئەو ژنە بێپەنایانە بتوانن لە چنگی دەربچن. خۆپەرســـتیش یەکێک بوو لە هۆکارەکان و تەنانەت تا ســــەر ئاســــتی خۆشــــەیدایی و دەبەنگی لە خۆی گۆڕابوو. لوژن تازەچاوپێکەوتوو بوو و هەر لەبەر ئەوەش تووشـــی نەخۆشـــییەک بووبوو کە بە چاوێکی ســـتایشـــکارانەوە بڕوانێتە خۆی و زۆریش بە ژیری و دانایی خۆیەوە دەنازی و تەنانەت دەگەیشـــتە ئەو ڕادەیەش کە لەبەردەم ئاوێنەدا ڕابوەستێت و چێژ لە بینینی سەروسیمای خۆی وەربگرێت و عاشـــقانە تاریفی خۆی بدات. بەڵام لە ســــەروو هەموو شـتێکەوە، عاشـقی پارەکانی بوو و بە هەموو دونیا و هیچ کەسـێکی نەدەگۆڕینەوە، پارەیەک کە بە ئارەقەی ناوچاوان و بە هەر ڕێگە و فرووفێڵێک کە بیری لێ بکەیتەوە، کۆی کردبووەوە، پارەیەک کە ئەوی دەکردە هاوشانی کەسانی دەستڕۆیشتوو.

کە چەند ساتێک لەوەوبەر توندوتیژانە بە ڕووی دونیای دادابووەوە کە وێڕای ئەو هەموو قســـەوقســـەڵۆک و بەدگۆییانە ئەو دەســـتی بۆ ڕاکێشاوە، هەر بە ڕاستی ئەو قسەیە لە دڵییەوە هاتبوو و ڕاستگۆیانە هەستی دەکرد کە نەدەبوو لەبەرانبەریدا بەو شـێوە چەپەڵانەیە سـپڵە بن و بە ڕاســتی حورمەتی پێی ڕووشــا بوو؛ هاوکات کە پێشــنیاری زەماوەندی بۆ دونیا دەکرد، چاک دەیزانی ئەو بوختانانە ئەســـڵ و ئەســـــاســـــیان نییە. مارفا پیترۆڤنا لە هەر کوێیەک دانیشـــتبوو، بە

ڕاشکاوی گوتبووی کە ئەو بابەتە ڕاست نییە و خەڵکی شارستانیش ئیدی تێگەیشـــتبوون مەســـەلەکە شـــتێکی دیکە بووە و هەمووان دڵگەرمانە پشـــتی دونیایان دەگرت. لوژنیش نکۆڵیی نەدەکرد کە لە کاتی چوونەداوای دونیادا هەموو ئەم شـــتانەی زانیون، بەڵام هەر بڕوای بەوە هەبوو کە بڕیارەکەی بۆ هەڵکشـــاندنی دونیا بۆ ئاســـتی خۆی، بەرز و پڕبەها بووە و تەنانەت بە کردەوەیەکی پاڵەوانانەشـــی دەزانی. لە بنەڕەتدا، بە خســـتنەبەرباســـی ئەم خاڵە لەلای دونیا، هەســـتێکی شـــاراوەی ئاشـــکرا کردبوو کە بە لای خۆیەوە دەگمەن و شـــایەنی ســـتایش بوو، بەس نەیدەزانی ئاخۆ بۆچی ئەوان ناتوانن دەرکی بکەن. کە سەریشی لە ڕاسکۆڵنیکۆف دابوو، هەستی خودانێکی قەدەمخێری هەبوو کە بڕیـار وایە میوەی کردەوە چـاکەکـانی خۆی بچنێتەوە و دونیایەک تاریف و پیاهەڵدانی دڵخۆشـــکەر و گوێلاوێن ببیستێت، وەلێ ئێستە کە خەریک بوو بە پلیکانەکاندا دادەگەڕا، هەستی دەکرد بێ ئەوەی شایەنی وەها شتێک بێت، سووکایەتیی پێ کراوە و چاکەکارییەکەشی لە بەرچاو نەگیراوە.

هەبوونی دونیا هەر بە ڕاســـتی لە ژیانی ئەودا پێویســـتییەکی ســـەرەکی بوو و نەیدەتوانی تەنانەت بیر لە لەدەســـتدانیشـــی بکاتەوە. ســـاڵەهـای ســـاڵ بوو لە کەللەیدا خەونی شـــەهوەتئامێزی بە هاوسەرگیرییەوە دەبینی و پەروەردەی دەکرد، بەس تا ئەو کاتە تەنیا پارەی کۆ کردبووەوە و دەست لەسەر دەست دانیشتبوو. لە خەڵوەت و تەنانەت لە تایبەتترین کاتەکانیشـــدا کە وێنای ســـەروســـیمای وەها کچێکی گەنجی دەکرد، خۆشی و شادییەکی قووڵ دەیتەنییەوە، کچێکی ئاکاربەرز، هەژار (هەژاری مەرجی ســـەرەکیی کارەکە بوو)، فرە گەنج و ئێجگاریش دەلال، پەروەردەکراو و خاوەنی بڕوانامە، حورمەتدار و شـــەرمن؛ کچێک کە ســـەرما و گەرمای ڕۆژگاری چەشـــتبێت و لەبەرانبەر ئەودا ملکەچ و گوێڕایەڵ، تـا کۆتـایی تەمەنیش وەک

ڕزگارکەرێک لەو بڕوانێت و بیپەرستێ و تاریفی بدات، جا بێ لە ئەویش هیچ کەسی دیکە نەبینێت. هەر خوا دەزانێت لەو کاتانەی کە دەستی بەتاڵ دەبوو چەند دیمەن و بڕگەی عاشقانەی سەرمەستکەر و وەسوەسەکەری لەو جۆرەی لە زەینیدا دەئافراند! وا ئێستەش خەیاڵی چەندساڵەی بە ڕاست دەگەڕا، جوانی و کەماڵاتی دونیا هەژاندبووی و ئەو داماوی و گێچەڵەش کە تێی کەوتبوو بێزادە خرۆشاندبووی؛ لە دونیادا شتێکی دەدۆزییەوە کە لە سەرووی خەونەکانییەوە بوو: کچێکی لووتبەرز و بەکەسایەتی و بەرزەئاکار، کە لە ڕووی خوێندەواری و ڕەسەنایەتییەوە تەنانەت لە سەرووی ئەویشەوە بوو (لوژن هەستی دەکرد دەبێت وا بێت). وەها کچێک تا کۆتایی تەمەنی کۆیلانە کردەوە قارەمانئاساکەی ئەوی لە بەرچاو دەبوو و خۆی دەکردە خاکی بەرپێی و ئەویش بێ هیچ کێشە و بەربەستێک دەبووە بڕیاربەدەست و سەروەر و جڵەویی دەکەوتە دەست! لە کۆتاییدا، هەڵبەتە دوای سەنگوسووککردنی هەموو شتێک و دونیایەک خنەخنکردن، بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی دابوو کە کارەکەی بگۆڕێت و ئێستە خەریک بوو هەنگاوی دەنایە بوارێکی بەرفراوانتری کاروکاسبییەوە تا ئاواتە دێرینەکەی بهێنێتە دی و هەتا ئاستی چینێکی بەرزتری کۆمەڵگە هەڵبکشێت. دەمێک بوو بە چێژێکی زۆرەوە لە سەریدا خەریکی پەروەردەکردنی ئەم خەیاڵە بوو. بە کورتییەکەی هاتە سەر ئەو بڕوایەی کە لە پیتەربورگدا بەختی خۆی تاقی بکاتەوە. چاک دەیزانی کە ژنان زۆر کاریان لەدەست دێت و دەکرێت بە یارمەتیی ئەوان بگاتە زۆر شوێن. سەرنجڕاکێشیی ژنێکی دڵڕفێن و داوێنپاک بە بڕوانامەیەکی بەرزەوە دەیتوانی ڕێگەکەی تەخت بکات و بە شێوەیەکی پەرجووئاسا خەڵکیی بەرەو لای ڕابکێشێت و تەنانەت خەرمانەیەکیش بە دەوریدا بئافرێنێت... بەس ئێستە ئیدی خەریک بوو کار لە کار دەترازا! ئەم پچڕانە کتوپڕەی پەیوەندی وەک برووسکە دایدابووە سەر ڕۆحی و لە گاڵتەیەکی بێتام و قەشمەرجاڕی دەچوو!

تەنیا چەند قسـەیەکی هەڵیتوپەڵیتی فڕێ دابوون و وەک پێویسـت دەرفەتی کردنی هەموو قسـەکانیی بۆ نەلوابوو. بۆ نموونە ویستبووی گاڵتەیەک بکات، بەس لەدەستی دەرچووبوو و ئیدی خراپ بەسەریدا شکابووەوە. هەڵبەتە لوژن بە شێوازی خۆی عاشقی دونیا بووبوو و جارێ هیچ نەبووبوو کە لە خەیاڵەکانیدا بووبووە خاوەنی و کەچی لەپڕ!... نا! سبەی، هەر سبەی، دەبێت هەموو شتێک وەک خۆی لێ بێتەوە، دۆخەکە بێتەوە سەر ڕێچکەی جاران و هەڵەکانیش قەرەبوو بکرێنەوە. لە هەموو ئەمانە گرنگتر، دەبێت وانەیەکی چاکی ئەو کوڕیژگە بەخۆنازە –هۆکاری سەرلەبەری نەگبەتییەکانی– دابدات! بەدەست خۆی نەبوو و بە هەستێکی نەخۆشانەوە، ڕازومیخینیشی دەهێنایە بەرچاوی... وەلێ هەر زوو لەبارەی ئەوەوە خۆی ئاسوودە کرد: *نە بابە، هەر ئەوەمان کەم بوو ئەو کابرایەش بێننە ڕیزی من!* بەس هەر بە ڕاستی لە سڤیدریگایلۆڤ دەترسا و... بە کورتییەکەی دونیایەک سەرئێشەی لەبەردەمدا بوو.

*

– نا، نا، تاوانباری سەرەکی منم!

دونیا دایکیی گرتە باوەش و ماچی کرد و درێژەی پێدا:

– پارەکەی لە خشتەی بردم، بەس سوێند بە شەرەفم، برا گیان، نەمدەزانی ئەوەندە کەموکورتە! گەر زووتر بمزانیبا سەروکاریم لەگەڵ ع جۆرە مرۆڤێکدایە، فریوم نەدەخوارد! ئاە، تەنیا تۆ سەرکۆنەم مەکە، براکەم!

پولخێریا ورتاندی:

– خوا فریامان کەوت! خوا خۆی بەزەیی پێماندا هاتەوە!

بەس وەک ئەوە وابوو نیوەهۆشـــیار بێت و ڕێک نەتوانێت تێبگات چی قەوماوە.

هەمووان کەشـێکی خۆشـیان هەبوو و تەنانەت پێنج خولەک دواتر کەوتنە پێکەنین. تەنیا جاروبار دونیا بیری دەهاتەوە کە چی قەوماوە و ناوچاوی کرژ دەکرد و ڕەنگی پێوە نەدەما. پولخێریا ســـەری لەوە سـووڕمابوو کە چۆن خۆیشـی لەم دۆخەدا دڵخۆشـە، چونکە هەر ئەو بەیانییە وای لێک دابووەوە کە پەیوەندیپچڕاندن لەگەڵ لوژندا وەک کارەساتێکی تۆقێنەر بەسەریاندا دەشکێتەوە! ڕازومیخینیش لە شادیان پێی زەویی نەدەگرت. هەڵبەتە هێشـتا زاتی نەبوو بە تەواوی کەیف و شادییەکەی دەرببڕێت، بەڵام بە چەشنێک سەرتاپێی کەوتبووە لەرزین کە دەتگوت تای لێ هاتووە و وەک ئەوە وابوو بارێکی قورســـیان بەســەر دڵییەوە داگرتبێت. ئێســتە دەیتوانی و ئەوەی دەهێنا کە ژیانی خۆی بخاتە بەردەســـتیان و خزمەتیان بکات... ئێســـتە ئیدی هەموو شـتێک کردەیی بوو! وەلی زیاتر لە جاران پارێزی لەســەر بوو تا بیر لە ئەگەرەکانی دیکە بکاتەوە و لە خەیاڵپلاویی خۆی دەترســـا. بەڵام ڕاســـکۆڵنیکۆف لە جێی خۆی جمەی لێوە نەهاتبوو و بە جۆرێک لە جۆرەکان مڕومۆن دانیشتبوو و تەنانەت پێدەچوو هەست و هۆشی لە شوێنێکی دیکە بێت. ئەو بوو کە زیاتر لە هەمووان لەسەر ئەوە مکووڕ بوو کە لوژن لە کۆڵی خۆیان بکەنەوە، کەچی ئێســـتە وا دەردەکەوت ڕووداوەکانی ئەم دواییە گرنگییەکی ئەوتۆیـان بۆ ئەو نەبێت. دونیـا هێشـــتا نەیدەتوانی ئەو بیرکردنەوەیە لە ســـەری خۆی دەربکات کە براکەی زۆر زۆر لێی دڵخورتە و پولخێریـاش لەژێر چـاوەوە و شەرمنانە لە کوڕەکەیی دەڕوانی.

دونیا چووە لای براکەی:

– باشە سفیدریگایلۆف چیی دەگوت؟

پولخێریا هاواری کرد:

– بەڵێ، چیی دەگوت؟

ڕاسکۆڵنیکۆف سەری هەڵبڕی:

– بەتەمایە دە هەزار ڕۆبڵت بە دیاری بداتێ و زۆریش تامەزرۆیە بۆ جارێکیش بێ بە ئامادەبوونی من چاوی پێت بکەوێ.

– چاوی بە دونیا بکەوێ؟ هەر باسیشی مەکە!

پولخێریا بوو کە هاواری بەرز بووبووەوە:

– ئەسڵەن چۆن وێراویەتی پێشنیاری ئەو پارە پیسەی بۆ دونیا بکا!

پاشان ڕاسکۆڵنیکۆف بە بارێکەوە کە بە گشتی وشک و سارد بوو، گفتوگۆکەی نێوان خۆی و سڤیدریگایلۆڤی بۆ باس کردن، بەڵام دەستەنقست بەشی پەیوەست بە سەردانەکانی ڕۆحی مارفا پیترۆڤنای بڕی تا لە بابەتەکە دوور نەکەوێتەوە و پێویست نەکات یەک قسەی زیادە بکەن.

دونیا پرسیی:

– باشە، تۆ چیت گوت؟

– سەرەتا پێم گوت من هیچ پەیام و وەڵامێک ناگەیەنم. ئەویش لای کردەوە و گوتی تەنانەت بێ یارمەتیی منیش هەموو هەوڵێک دەدا تا چاوی بە تۆ بکەوێ و قسەی خۆیت بۆ بکا. ویستی دڵنیام بکاتەوە کە خۆشەویستی و هۆگربوونەکەی بۆ تۆ کاتیی بووە و ئێستە هیچ هەستێکی نییە. هەر ئەوەندە هەیە نایەوێ شوو بە لوژن بکەی... بە گشتی، سەر و بنی قسەکانی ئەوەندە ڕوون نەبوو و ڕێکوپێک قسەی نەدەکرد.

– چۆن هاتە بەرچاوت، ڕۆدیا؟ ڕات چییە لەسەری؟

– ئەوەی ڕاستی بێ هێندە سەر لە بارودۆخی دەر ناکەم. دەیەوێ دە هەزار بە خۆڕایی بداتە تۆ و لەولاشەوە دەڵێ دۆخم شڕە. دەڵێی لەسەر سەفەرە و دە خولەک دواتریش بیری دەچێتەوە چیی گوتووە! دواتریش کتوپڕ قسە فڕێ دەدا کە نیازیەتی دووبارە زەماوەند بکاتەوە و بووکێش دەستنیشان کراوە... ئەوەی کە ئامانج و پاڵنەرێکی جددیی هەیە و لەوانەشە نیازێکی باشی نەبێ، گومانی تێدا نییە. بەس ئەوەش جێی سەرسامییە کە ئەگەر خەیالاتێکی لەبارەی تووە لە سەردا بێ، بۆچی ئاوها گەمژانە لەم دەرگە و لەو دەرگە دەدا... هەڵبەتە من لەلایەن تووە دیارییەکەیم ڕەد کردەوە و ئەو مەسەلەیە بڕایەوە. بە گشتی وەک مرۆڤێکی ئێجگار سەیروسەمەرە هاتە بەرچاوم و تەنانەت... دەتگوت شێتە. لەوانەشە بە هەڵەدا چووبم. لەوانەشە ئەو کابرایە خەریکی نواندن بێ و ئەو هەڵسوکەوتەش بەشێک بێ لە نواندنەکەی. دەڵێی مردنی مارفا پێترۆڤناش کاریگەرییەکی خراپی خستووەتە سەری.

پولخێریا گەرموگوڕ گوتی:

– خوا لێی خۆش بێ! تا مردن هەر دوعای خێری بۆ دەکەم ئەو ژنە! دونیا، دەزانی لەم دۆخەدا چیمان بەسەر دەهات گەر ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەی مارفا پێترۆڤنا نەبا؟ خوایە، لە ئاسمانەوە بۆمان هاتووە! ئاخ ڕۆدیا! ئەگەر بزانی! ئەم بەیانییە من و دونیا تەنیا سێ ڕۆبڵمان لە گیرفاندا بوو و تاکە ڕێیەک کە بە زەینماندا هات، ئەوە بوو کە بچین کاتژمێرەکەی دونیا بخەینە ڕەهنەوە، تا ناچار نەبین بەر لەوەی ئەو خوێڕییە خۆی دەستێکمان بۆ درێژ کا، داوای شتێکی لێ بکەین.

پێشنیارەکەی سڤیدریگایلۆڤ دونیای تاساندبوو. هێشتا هەر وا لە شـــوێنی خۆیدا بزمارکوت ڕاوەســـتابوو و بیر و خەیاڵ بردبوویەوە، پاشان، وەک ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بدوێ، هێمن گوتی:

– بێگومان نەخشەیەکی لە سەردایە!

تەنانەت لەرزیشـــی لێ هاتبوو. ڕاســـکۆڵنیکۆف بە ترســـی بێڕادەی ئەوی زانی و پێی گوت:

– کەواتە لام وایە هەر بە تەنیا ئەم یەک جارە نییە و دیسان ناچار دەبم ئەو دەموچاوە زەریفەی ببینم!

ڕازومیخین یەک بە خۆی هاواری کرد:

– چاوی لەسەر هەڵناگرم! دەکەومە شوێنی و وەک سێبەر بەدوایدا دەڕۆم! ناهێڵم لە بەرچاوم دوور بکەوێتەوە! ڕۆدیا مۆڵەتی پێ داوم، خۆی ئێســـتە پێی گوتم ئاگاداری خوشـــکم بە. خۆ ئێوەش مۆڵەتم پێ دەدەن، دونیا خاتوون؟

دونیا زەردەخەنەیەکی هاتێ و دەســـــتی بەرەو لای ئەو درێژ کرد، بەس دڵەڕاوکێ هەروا لە ڕووخســـــاریدا شـــــەپۆلانی بوو. پولخێریاش لەژێر چاوەوە نیگاکەلی ســـــرگی دەگرتە کچەکەی، بەس دیار بوو کە سێ هەزار ڕۆبڵ تا ڕادەیەک ئۆخژنێکی پێ بەخشیوە.

نیوکاتژمێر دواتر هەمووان سەرقاڵی گوتوبێژێکی گەرموگوڕ بوون. تەنـــانەت ڕاســـــکۆڵنیکۆفیش کە هیچی نەدەگوت، تـــا ڕادەیەک بە ســـــەرنجەوە گوێی لە قســـــەکان گرت. ڕازومیخین بووبووە گوتەبێژی کۆڕەکە و لافاوی قسە بە جۆشوخرۆشەوە لە دەمی دەڕژا:

– ئـــاخر بۆ دەبێ بڕۆن؟ بۆ؟ لەو دەڤەرە چکۆلەیەدا چیتـــان بۆ بەکرێ؟ بـــاشـــــییەکەی ئێرە ئەوەیە کە هەمووتـــان پێکەوەن. ئێوە هەرســـــێکتان پێویســـــتیتان بە یەکە و مەگە هەر خواش بزانێ چەندە

پێویســـتیتـان بە یەکترە! گوێ لە من بگرن کـاکە گیـان، لانیکەم تـا ماوەیەک... وەرن وەک هاوڕێ و کەســـی خۆتان من پەســـەند بکەن؛ ئاســـوودە بن، بۆ خۆمان دەســت دەدەینە کاروکاســبییەکی چاک! گوێ بگرن! بەوپەڕی وردەکارییەوە هەموو شـــتێکتان بۆ باس دەکەم! هەر ئەم بەیانییە وەک برووســـکە بیرۆکەکەی بەم کەللەیەمدا هـات، لەو کاتەشـدا کە هێشـتا هیچ ڕووی نەدابوو... بابەتەکە ئەمەیە: من خاڵێکم هەیە کە دەبێ پێتانی بناســـێنم؛ پیرەمێردێکی زۆر بەڕێز و کراوە و دەســـتبەخێرە! خاڵە گیانی ئێمە هەزار ڕۆبڵ ســـەرمایەی هەیە، بەس خۆی بە مووچەی برانەکەی دەیگوزەرێنێ و هیچ پێویستییەکیشی بەو پارەیە نییە. دوو ســـاڵێکیشـــە بووەتە مووی لووتی من و دەیەوێ ئەو هەزار ڕۆبڵەی لێ وەربگرم و لە ســـەدا شـــەش قازانجی بدەمێ. دەی منیش خۆ کەر نیم و دەزانم دەیەوێ هەرچۆنێ بووە دەســـتم بگرێ. پار ئەم پارەیە بەکەڵکم نەدەهات، بەس ئەم ســـاڵ خولەکم دەژمارد تا خـاڵم بێ، ئـاخر بڕیـارم دابوو هەر کە هـات پـارەکەی لێ وەربگرم. ئێوەش لە ســـێ هەزار ڕۆبڵەکەتان هەزاری بە قەرز دەدەنە من کە بۆ دەســـتپێکردنی کارەکە بەســـە. دەی، کەواتە دەبینە هاوبەش. بەس بێگومان دەپرسن، بڕیارە چی بکەین؟

ڕازومیخین دەستی کردە باسکردنی بەرنامەکانی و بە تێروتەسەلی ڕوونی کردەوە کە پەخشـانگە و کتێبفرۆشـییەکان کەم تا زۆر فریان بەســـەر هیچەوە نییە و نازانن چی چاپ دەکەن و چی دەفرۆشـــن و، ڕێک لەبەر ئەم هۆکارەش، ئیدی چەند پەخشـــانگەیەکی خراپیان لێ دەردەچێ؛ هەروەها ئەوەش کە کتێبی چاک خۆی خەرجیی چاپەکەی دەردەهێنێتەوە و تەنانەت قازانجیشی لێ دەکرێ، ئەوەش دەرکەوتووە کە قازانجەکەشـی زۆر باش بێت. کارکردن لە بواری چاپ و پەخشـدا ئاواتی دێرینەی ڕازومیخین بوو. لە ماوەی دوو ســـاڵی ڕابردوودا لە نووسینگەی پەخشانگەکەلی جیاوازدا ئیشی کردبوو و بە باشیش سێ

زمانی ئەورووپیی دەزانی. مەسەلەی ئەوەش کە شەش ڕۆژ لەوەوبەر بە ڕاسکۆلنیکۆفی گوتبوو ئەڵمانییەکەی شەقوشڕە، ئەوە بوو کە بە وەرگێڕانی نیوەی کارەکە قایل ببێ و لەبەرانبەردا سێ ڕۆبڵ وەربگرێت. دەنا درۆی کردبوو و ڕاسکۆلنیکۆفیش ئەمەی دەزانی.

ڕازومیخین گەرم و پڕخرۆش لەسەری ڕۆیشت:

– هەر بە ڕاست بۆچی، ئاخر بۆچی دەبێ دەستەنقەست وەها هەلێک لەدەست بدەین؟ جا بەتایبەت لە ئێستەشدا کە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتن دەستەبەرن: سەرمایەی تایبەتی خۆمان! هەڵبەتە کارێکی زۆرمان دەبێ، بەس بە دڵنیاییەوە هەموومان شانی دەدەینە بەر، ئێوە دونیا خاتوون، من و ڕۆدیا... جا لەم ڕۆژانەدا چ پارەیەکیان تێدایە هەندێ کتێب! قازانجێکی زەوەندەی تێدایە! بنەمای کارەکەشمان ئەوەیە کە ئێمە خۆمان چاک دەزانین دەبێ چی وەربگێڕین. وەردەگێڕین و چاپ دەکەین و لەگەڵ ئەوەدا شارەزاش دەبین! ئەم ئەزموونەی من لێرانەدا بەکەڵکمان دێ. دوو ساڵێک دەبێ لەنێو پەخشانگەکاندا فرکەفرکمە و لەم کارەدا شتێ نییە سەرم لێ دەرنەکردبێ! چاک دەزانم ئەمانە چۆن کار دەکەن، خۆ قابیلە پەرجوو نییە! جا ئەسپی دیاریش ددانی ناژمێردرێ، کاکە گیان! هەر ئێستە دووسێ کتێبی باشم دیاری کردوون کە تەنانەت گەر بیریش لە وەرگێڕان و چاپکردنیان بکەیتەوە، بۆ هەر یەکەیان سەد ڕۆبڵت دەدەنێ! هەڵبەتە گەر پێنجسەد ڕۆبڵیشم بدەنێ ئامادە نیم ئاشکرایان بکەم! واتان زانیوە دۆخی ئێرە چۆنچۆنییە؟ گریمان چووم و بە خاوەنی پەخشانگەیەکیشم گوت، گومانم نییە دەست دەکاتە منگەمنگ، ئائەمانە هێندە دەبەنگن! لەبارەی بەشی کردەیی کارەکە و چاپ و کاغەز و فرۆشتن و ئەمانەشەوە بێخەم بن، بیسپێرنە خۆم! چاک شارەزای هەموو شتێکیم! بە کەم دەست پێدەکەین و پلەپلە گەشە

دەکەین. نانی خۆمان پەیدا دەکەین و ئەو پارەیەش دەردەهێنینەوە کە خستوومانەتە کارەکەوە.

چاوەکانی دونیا بریقەیان دەهات. ڕوو لە ڕازومیخین گوتی:

– من زۆر زۆر کەیفم بەو شتانە هات کە باستان کردن، دیمیتری پراکۆفیچ!

پولخێریاش هاتە ناو باسەکەوە:

– ئەوەی ڕاستی بێ من هیچ سەر لەم شتانە دەرناکەم، لەوانەشە بیرۆکەیەکی باش بێ، وەلێ هەر بە تەنیا خوا دەزانێ! هەر چۆنێ بووە کارێکی نوێیە و ئەوەی کە سەد لە سەد بیگرێ، بە باشی دیار نییە. هەڵبەتە ئێمە دەبێ لانیکەم... بۆ ماوەیەک لێرە بمێنینەوە.

کە دواهەمین ڕستەی گوت، لە ڕاسکۆلنیکۆفی ڕوانی.

دونیا گوتی:

– کاکە، تۆش ڕای خۆت دەربڕە، چۆن لێی دەڕوانی؟

ڕاسکۆلنیکۆف وەڵامی دایەوە:

– بە بۆچوونی من بیرۆکەکەی ئێجگار باشە، هەڵبەتە ئێستە زۆر زووە مرۆڤ خەون بە پەخشانگەیەکی گەورەوە ببینێ، وەلێ دەتوانین پێنج شەش کتێب دەربکەین و لەوەش دڵنیا بین کە سەردەگرێ. منیش کتێبێکم پێ شک دێ کە فرۆشێکی بێوێنەی هەیە... تەنیا بەڕێوەبردنی کارەکە و ئەوە دەمێنێتەوە کە ئاخۆ ڕازومیخین دەرەقەت دێ یان نا، کە لەوەشدا گومانێک نییە و چاکیش دەرەقەت دێ. شارەزای بێنەوبەرەی کارەکەیە... بەس جارێ کات زۆرە بۆ ئەوەی هەموو قسەکانمان بکەین...

ڕازومیخین هاواری کرد:

– هورااا! باشه، ئێسته شتێکی تر. ئەلەم بینایەدا ئەپارتمانێک هەیە و هەر هی ئەم خاوەنماڵەیە، سەربەخۆ دروست کراوە و هیچ پەیوەندییەکی بە ژوورەکانی ئەمبەر و ئەوبەرەوە نییە. ناوماڵی تێدایە و سێ ژووری هەیە و کرێکەشی زۆر نییە. بۆ سەرەتا، وا چاکە لەوێ بمێننەوە. بەیانی کاتژمێرەکەتان دەخەمە رەهنەوە و پارەکەیتان دەگەیەنمە دەست و ئیتر کارەکانی تریش رایی دەکرێن. دەتوانن پێکەوە بژین و رۆدیاش لەلاتان بمێنێتەوە... ئەوە خێرە، رۆدیا؟

پولخێریا واقی ورمابوو:

– وا زوو دەتەوێ برۆی، رۆدیا گیانم؟

رازومیخین هاواری لێ هەستا:

– ئاخر هەر دەبێ ئەئێستە برۆی؟

دونیا دۆش داما و ناباوەر تەماشای براکەیی دەکرد. راسکۆڵنیکۆف کلاوەکەی نابووە دەستی و خەریک بوو دەرۆیشت و بە شێواز و بارێکی نائاساییەوە گوتی:

– ئێستە یەکێ نەزانێ وا تێدەگا بەتەمان بمنێژن یان بۆ تاهەتا ماڵئاواییم لێ بکەن!

پێدەچوو بیەوێ زەردەخەنەیەکیش بکات، بەڵام ئەنجامەکەی هەر شتێک بوو بێ لە زەردەخەنە. بە هەڵکەوتیش لە دەمی دەرچوو:

– بەس کێ چووزانێ، خۆ لەوانەشە دواهەمین جار بێ کە یەکتری دەبینین...

فکرێک بوو کە بە سەریدا رابردبوو و نەیدەویست دەریببڕێت، کەچی نائاگایانە بە دەنگی بەرز بە دەمیدا هات.

دایکی هاواری کرد:

– ئاخر چی قەوما لەناکاو؟

شـــێوازی قســـەکردنەکەی دونیاش بە جۆرێک لە جۆرەکان ســـەیر بوو:

– بەتەمای کوێی، ڕۆدیا؟

بە ناڕوونی وەڵامی خوشکیی دایەوە، دەتگوت لەوە دوودڵە کە چی بڵێت. بەڵام ڕووخســـاری ڕەنگپەڕیووی نیشـــاندەری ویســـتێکی بەهێز بوو.

– دەمویســـــت بڵێم... کاتی هاتن بەرەو ئێرە نیازم بوو پێتان بڵێم... دونیا، دەمویست بە تۆ و دایکم بڵێم وا باشترە بۆمان تا ماوەیەک لێک جیا بین. من لەسەر خۆم نیم، سرەوتم لێ بڕاوە... دواتر دێم... دێم بۆ لاتان... هەر کات توانیم، خۆم دێم. بیرم لاتانە و خۆشـــم دەوێن... هەر ئەوەنـدە هەیە کە دەمەوێ لێگەڕێن تەنیـا بم، وازم لێ بێنن! بەر لەم قسـانە بڕیاری خۆمم دابوو... لەســـەر قســـەی خۆشـــم. گەر بڕیار بێ هەرچیشـــــم بەســـــەر بێ، لەنێو بچم، یان ڕزگار ببم... هەرچییەک بێ، دەمەوێ تەنیا بم. توو خوا هەر لە بیرم کەن، بۆ هەمووتان باشـــترە... بەدواشمدا مەگەڕێن. هەر کات توانیم خۆم دێم بۆ لاتان یان... دەنێرمە دواتان. لەوانەیە هەموو شـــــتێ وەک ئەوەڵ ڕۆژی لێ بێتەوە!... بەس ئێســـــتە ئەگەر خۆشـــــتان دەوێم، وازم لێ بێنن... دەنا بەرەبەرە لێتان هەراسان دەبم، هەست دەکەم وای لێ دێ!... خوا ئاگادارتان!

پولخێریا هاواری کرد:

– خوایە، فریامان کەوە!

دایک و خوشـــکی ڕاســـکۆلنیکۆف تووشــــی دڵەڕاوکێیەکی قورس بووبوون و ڕازومیخینیش هەر وا.

دایکەی کلۆڵ هاواری کرد:

– ڕۆدیا، ڕۆدیای دایە! لەگەڵمان ئاشـــت بەرەوە، بگەڕێرەوە لامان! با هەر وەک جاران بین!

ڕاســـکۆڵنیکۆف بە هێمنی ڕووی کردە دەرگەکە و چووە دەرێ. دونیا خۆی گەیاندە ئەو، ئاگری تووڕەیی لە چاوانیدا بڵێســـەی دەدا. لەژێر لێوەوە ورتاندی:

– کاکە، بەتەمای چی بکەی؟

ڕاسکۆڵنیکۆف نیگایەکی قورسی گرتە خوشکەکەی.

– هیچ نییە. دێم و سەرتان لێ دەدەمەوە.

دەتگوت دەنگی لە بنی چاڵێکەوە دێت و وا دیار بوو هۆشیار نییە و ڕێک نازانێت چی دەڵێت. لە ژوورەکە چووە دەرێ.

دونیا هاواری کرد:

– ئەی خۆپەرست، ئەی ناپیاو، بێهەست!

ڕازومیخین توند دەســـتی دونیای گوشـــی و بە گوڕوتینەوە لە بنگوێیدا گوتی:

– شـێتە ئەم کابرایە، بەس بێهەســـت نییە. تێک چووە، پێی نازانن؟ گەر دەرک بەمە نەکەن، ئەوە ئێوەن کە بێهەستن!

جـا بەر لەوەی خۆیشـــی لە ژوورەکە بچێتە دەر، ڕوو لە دایکە تۆقیوەکە هاواری کرد:

– من هەر ئێستە دەگەڕێمەوە!

ڕاسکۆڵنیکۆف لە خوارەوەی ڕێڕەوەکەدا ڕاوەستابوو.

– دەمزانی دەکەویتە شــــوێنم! بگەڕێوە لای ئەوان، لەلایــان بمێنەرەوە... بەیانیش لەلایان بە... بۆ هەمیشــــە لەلایان بە. من... منیش لەوانەیە سەر بدەمەوە... گەر بتوانم دێمەوە. ماڵئاوا!

تەنانەت بێ ئەوەی تەوقەش بکات، ملی نا و ڕۆیشت.

ڕازومیخین تەواو تاساو و سەرلێشێواو، لەژێر لێوەوە گوتی:

– بەس بۆ کوێ دەچی ئــاخر؟ تۆ چیــت بەســــەر هــاتووە؟ چ گلاراوێکتە ئاخر؟ چۆن دەتوانی گوێ نەدەیتێ و بڕۆی؟

ڕاسکۆلنیکۆف هەمدیسان وەستایەوە.

– ئەمە دواهەمین قســــەمە: ئیتر هیچ لە من مەپرســــە، هیچ! لەبەر ئەوەی وەڵامێکم نییە بۆت... ئیتر ســــەردانیشــــم مەکە. لەوانەیە خۆم ســەر بدەم و بێمە ئێرە... دەســت لە من بشــۆوە، وەلێ دەســت... لەوان بەرمەدە! ڕێک تێگەیشتی چیم گوت؟

ڕاڕەوەکە، تاریک بوو و ئەوان لە نزیک چراکەوە ڕاوەستابوون. بۆ ماوەی خولەکێک بە بێدەنگی لە یەکدی ڕامان. ڕازومیخین تا کۆتایی تەمەنی ئەو یەک خولەکەی لە بیر نەکرد. نیگای ســووتێنەر و ڕاماوی ڕاســــکۆلنیکۆف، ســــات بە ســــات بەهێز و بەهێزتر دەبوو و ڕۆح و زەینیی دەڕووشــــاند و دزەی دەکردە ناویانەوە. ڕازومیخین کتوپڕ لەرزی لێ نیشــــت. دەتگوت شــــتێکی نامۆ لەنێوانیان ڕووی دا؛ وەک ئەوەی فکرێک یان ئاماژەیەک بووبێت کە بەبێ ویست ئاشکرا بووبوو، خاڵێکی ترســــناک و زراوبەر کە دەتگوت لەناکاوێکدا بۆ هەردووک لا ڕوون بووبووەوە... ڕازومیخین وەک گەچ سپی هەڵگەڕا.

– دەی، ئێستە تێگەیشتی؟

دەموچاوی ڕاســــکۆلنیکۆف لە تووڕەییان کرژ بووبوو. کتوپڕ بۆی زیاد کرد:

– دەی برۆ کەواتە، بگەڕێوە لایان.

خۆیشی پشتی تێ کرد و لە بیناکە چووە دەرێ.

ئەسەڵەن پێویست بە باس ناکات کە ئەو ئێوارەیە لە ژوورەکەی پولخێریادا چی ڕووی دا؛ ڕازومیخین گەڕایەوە لای خاتوونەکان و دایمرکاندنەوە و سوێندی خوارد ڕاسکۆڵنیکۆف نەخۆش کەوتووەتەوە و پێویستیی بە پشوو و خەڵوەت هەیە، بەس بێگومان سەر دەداتەوە و هەموو ڕۆژێکیش سەر دەداتەوە و زۆر زۆر شێواوە و نابێت توورە بکرێت. هەروەها ئەو، ڕازومیخین، ئاگای لە ڕۆدیا دەبێت، پزیشک دەباتە ژوور سەری، باشترین دکتۆری بۆ دەدۆزێتەوە و ڕاوێژ دەکەن... بە کورتییەکەی ڕازومیخین لەو شەوەوە ئیدی ڕۆڵی کوڕ و برای بۆ دایک و کچەکە گێڕا.

## چوار

راسـکۆلنیکۆف راسـتەوراسـت بەرەو ئەو بینایە چوو کە دەکەوتە قەراخ کەنداوەکەوە و سـۆنیای لێ دەژیا؛ بینایەکی سـێنهۆمیی دێرین بە ڕەنگی سـەوزەوە. دواجار توانیی قاپچی بدۆزێتەوە و ئەویش زۆر بە ناڕوونی ناونیشـانی ئەپارتمانی کاپیرناٸۆمافی بەرگدووری نیشـان دا. راسـکۆلنیکۆف لە لایەکی حەسارەکەوە پلیکانێکی تاریک و تەسـکی دۆزییەوە و سـەرکەوت. لە نهۆمی دووەمدا گەیشـتە ڕێڕەوێک کە بە ئەپارتمانەکانی ئەو نهۆمەدا ڕادەبرد کە ڕوویان لە حەوشـە بوو. بە ڕاڕەوەی تـاریکدا وێـڵ دەسـوورایەوە و نەیـدەزانی ئەپـارتمـانی کاپیرناٸومۆف کامەیە کە کتوپڕ سـێ هەنگاوێک لە پێشـترییەوە دەرگەیەک کرایەوە و ناٸاگایانە دەسکەکەیی گرت.

دەنگی ژنێک هات کە بە نیگەرانییەوە پرسیی:

– کێیە؟

– منم... هاتووم چاوم پێتان بکەوێ.

راسـکۆلنیکۆف وەڵامی دایەوە و هەنگاوی نایە دەرگەی بچووکی ئەپـارتمـانەکەوە. لە بەردەرگەکەدا مۆمێـک بە مۆمـدانێکی مسـیی بێکەڵکەوە بەسەر کورسییەکی شکاوەوە بوو.

سۆنیا هاوارێکی کزی کرد:

– خوایە! ئەوە ئێوەن؟

دەتگوت لە جێگەکەیدا وشک بووە و جمەی لێوە نەدەهات.

– ژوورەکەتان کامەیە؟ لێرەوە بڕۆم؟

ڕاسکۆڵنیکۆف هەوڵی دا نیگای نەگیرێتە ئەو و پەلەپەل چووە ژوور. خولەکێک دواتر سۆنیاش بە مۆمێکەوە هات. کە مۆمدانەکەی دانا، پەشۆکاو و دەسەپاچە لەبەردەم ڕاسکۆڵنیکۆفدا ڕاوەستا. لە شپرزەییان زمان شکابووە دەمی و وا دیار بوو ئەم دیدارە چاوەڕواننەکراوە خراپ ترساندوویەتی. کتوپڕ ڕووخساری ڕەنگپەڕیوی سوورایییەکی تۆخی تێ گەڕا و فرمێسک لە چاوەکانیدا ئەڵقەی بەست... دۆخی شڕ بوو و هاوکات هەستی بە شەرم و شادی دەکرد... ڕاسکۆڵنیکۆف توند ڕووی وەرگێڕا، لەسەر کورسیی پشت مێزەکەیەوە دانیشت و بە خێراییش چاوێکی بە ژوورەکەدا خشاند.

ژوورێکی گەورە بوو بە بنمیچێکی زۆر نزمەوە، تاکە ژوورێک بوو کە کاپیرناۆمۆفەکان بە کرێیان دابوو و دەرگەیەکیش لەلای دەستە چەپەوە بە ڕووی ژوورەکەیاندا دەکرایەوە کە ئێستە قوفڵ بوو. لەولاشەوە و ڕووبەڕووی دەرگەی یەکەم، دەرگەیەکی دیکە هەبوو کە دایمە بە قوفڵکراوی دەیانهێشتەوە و دەچووەوە سەر ئەپارتمانی دراوسێکەی کە بە سەربەخۆ دەهاتە ئەژمار و ژمارەکەشی شتێکی دیکە بوو. ژوورەکەی سۆنیا زیاتر لە عەمبار دەچوو... چوار سووچەکەی نارێک بوو و هەر ئەمەش ڕواڵەتێکی ترسناک و نائاسایی پێ دەبەخشی. ئەو دیوارەی کە سێ پەنجەرەی هەبوو و بەسەر ڕێژاوەکەدا دەیانڕوانی، بە جۆرێک خوار بوو کە لە سووچەکەدا، گۆشەیەکی تیژی دروست دەکرد و نەدەکرا بە ڕووناکییەکی کز لەوسەریدا شتێک ببینیت. بەس گۆشەکەی دیکەی بە هەمان ڕادە کراوە بوو. ئەو ژوورە گەورەیە ناومالێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو و دەکرا بڵێیت خاڵییە. لە دەستەڕاستەوە تەختەخەویان دانابوو و، لەتەکیشییەوە، یانی ڕێک لە نزیک دەرگەکەوە، کورسییەک. مێزێک لە تەختەیەکی سادە بە سەرمێزێکی شینەوە بە درێژایی تەختەخەوەکە

و لە نزیک دەرگەی هاوبەشــی نێوان ئەو و ئەپارتمانی دراوســێکەوە بوو و دوو کورســـیی حەســـیریشـــی لە دەور بوون. دۆلابێکی چەکمەجەداری بچووک و ســـادەیان لەنزیک گۆشـــەی تەســـکی ژوورەکەوە بە دیواری بەرانبەرەوە لکاندبوو کە پێدەچوو لەو قاقڕەدا هەر وا وێڵ کرابێت، هەمووی هەر ئەوەندە بوو. کاغەزدیوارییەکی زەرد و خەتــخەتــی پــواو لە قەراخەکــانەوە ڕەش داگەڕابــوو کە دەریدەخســت کەشــی ژوورەکە لە زســتانانادا شــێدار و دووکەڵاوییە. نەداری و کــوێــرەوەری لە دار و دیــواری دەبــاری و تەنــانەت تەختەخەوەکەی پەردەشی نەبوو.

ســـۆنیا بە بێدەنگی لە میوانەکەی ڕوانی کە خەریک بوو بەوپەڕی ســـەرنج و ڕووداریییەوە چاوی بە ژوورەکەی ئەودا دەگێڕا. دواجار وەک ئەوەی لەبەردەم داوەری کردەوەکانیدا ڕاوەستابێت و لۆمەکردنی لەدەستی ئەودا بێت، لە ترسان کەوتە هەڵەرزین.

ڕاسکۆلنیکۆف بێ ئەوەی چاو لە چاوی سۆنیا ببڕێت، پرسیی:

– درەنگ هاتم، دەزانم خۆم... بووەتە یازدە؟

سۆنیا لەژێر لێوەوە گوتی:

– بەڵێ.

جـا دواجـار وەک ئەوەی ڕێی هەڵهـاتنی دۆزیبێتەوە بە پەلە بۆی زیاد کرد:

– ئۆو، بەڵێ، لە یازدە تێپەڕیوە! کاتژمێری دراوســێکەم هەر ئێســتە زەنگی لێ دا... خۆم بیستم...

ڕاسکۆلنیکۆف خەمگینانە قسەکەی بۆ سەندەوە و وەک ئەوەی کە یەکەمین جاری نەبێت چووبێتە ئەوێ، گوتی:

– دواهەمین جارە دێمە لاتان، لەوانەیە ئیتر چاومان بە یەکتری نەکەوێتەوە...

– ئێوە بەتەمان... بچنە شوێنێ؟

– نازانم... سبەی هەموو شتێ...

دەنگی سۆنیا لەرزی:

– یانی بەیانی نایێن بۆ ماڵی کاترینا ئیڤانۆڤنا؟

– نازانم. بەیانی هەموو شـــتێ... واز لەم شـــتانە بێنن. هاتووم قسەیەک بکەم...

ڕاسکۆڵنیکۆف دواجار سەری هەڵبڕی و نیگای مەلوولیی بڕییە ئەو و کتوپڕ تێگەیشـت کە بە درێژایی ئەم ماوەیەی کە خۆی دانیشـتووە، کچە لەبەردەمیدا بە پێوە ڕاوەستاوە.

– بۆچی بە پێوەن؟ دانیشن دەی!

دەنگی گۆڕابوو و نەرم و هاوڕێیانە بوو.

سـۆنیا دانیشـت. ڕاسـکۆڵنیکۆف بۆ ماوەی خولەکێک بە نەرمونیانی و تەنانەت دڵسۆزیشەوە هەر لێی دەڕوانی:

– ئاخ چەندە لاوازن؛ پێسـتێک و چوار چڵ ئێسـقان! تەماشـای ئەو دەست و پەنجانە! خۆ ئەوبەریان دیارە؛ هەر دەڵێی پەنجەی مردوون...

دەستی کچەی گرت. سۆنیا بزەیەکی بێڕەنگی هاتێ و گوتی:

– خۆ من دایمەی خوا هەر وا بوومە.

– تەنانەت ئەو کاتانەش کە لە ماڵی خۆتاندا بوون؟

– بەڵێ.

– باشە، بەڵێ دەی! هەر وا بوونە لە سەرەتاوە!

دواهەمین رستەی رووداوانە دەربڕی و باری ڕووخساری و ئاوازی دەنگیشی لەناکاو وەک پێشی لێ هاتەوە.

هەمدیسان چاوێکی بە ژوورەکەدا خشاندەوە.

– ژوورەکەتان لە کاپێرنائومۆف بە کرێ گرتووە؟

– بەڵێ، بەڕێز...

– خۆیان لەو ژوورەدا دادەنیشن؟ ئەو دەرگەیە...

– بەڵێ... ژووری خۆیانیان هەیە کە هەر وەک ئەمە وایە.

– هەموویان لەو تاقە ژوورەدا؟

– بەڵێ، هەموویان.

ڕاسکۆڵنیکۆف بە خەمۆکی ڕای خۆی دەربڕی:

– گەر من شەوانە لەم ژوورەی ئێوەدا بم وەهم سەرم تێ دەنێ!

سۆنیا وەڵامی دایەوە:

– کەسانێکی زۆر باشن، زۆر نەرمونیانن...

دەتگوت هێشتا گێژە و خۆی کۆنترۆڵ نەکردووە و ناتوانێت ڕێک بیر بکاتەوە:

– کەرەستە و ناوماڵەکەش هەمووی هی ئەوانە، هەموو شتێ... هەموو شتێ هی ئەوانە. زۆر نەرمونیانن و مناڵەکانیشیان زۆر دێنە لای من.

– وابزانم هەموشیان زمانیان دەیگرێ؟

– بەڵێ، بەڕێز... خاوەنماڵەکەم تەتەڵە دەکا و شەلیشە. ژنەکەشی تەتەڵە دەکا... یانی ناکرێ بڵێین تەتەڵە، با بڵێین هەر ئەوەندە هەیە کە

نــاتوانێ وشـــەکــان دەربڕێ. ژنێکی زۆر بــاش و نەرمونیــانە. خاوەنماڵەکەم پێشـتر خزمەتکار بووە. حەوت سـەر خێزانیشـیان هەیە و... یەکەمین منـاڵیـان ترە، ئەوانی دیکەیـان زمـانیـان نـاگیرێ، تەنیـا ئەوەیە نەخۆشن. وەلێ بزانم...

سۆنیا کە ئەمانەی گوت، دۆشداماو بۆی زیاد کرد:

– ئێوە چۆن دەیانناسن؟

– باوکتان باسـی کرد. زۆر باسـی ئێوەشـی کرد و هەموو شـتێکی بۆ گێڕامەوە. گوتی کە کاتژمێر حەوت چوونە دەر و نۆ گەڕانەوە و کاترینا ئیڤانۆڤناش لەلای تەختەکەتاندا کەوتە سەر ئەژنۆ...

سۆنیا شەرمەزار و دڕدۆنگ ورتاندی:

– ئەمڕۆ بینیم!

– کێتان بینی؟

– باوکم. لە دەرەوە ڕێم دەکرد، لەنێوان نۆ و دەدا بوو کە وام هاتە بەرچاو هەر لەوێ لە ســـەری شـــەقامەکەدا بینیم. لە پێش منەوە ڕێی دەکرد. هەر دەتگوت ئەوە و ڕێک خۆیەتی. خەریک بوو بچم بە کاترینا ئیڤانۆڤناش بڵێم...

– بە شەقامدا دەگەڕان؟

– بەڵێ!

ســۆنیا خێرا وەڵامی دایەوە و دووبارە شـــەرم دایگرت و چاوی لە زەوی بڕی.

– کە لە ماڵی باوکتاندا بوون، کاترینا ئیڤانۆڤنا هەمیشـە دەسـتی لێ بەرز دەکردنەوە، وایە؟

– نۆو، نا! ئەوە چی دەڵێن؟ شتی وا نییە!

سۆنیا بە هەراسانییەوە تەماشایەکی ڕاسکۆلنیکۆفی کرد.

– یانی کاترینا ئیڤانۆڤناتان خۆش دەوێ؟

– خۆشم دەوێ؟ دەی بەڵێ بە دڵنیاییەوە خۆشم دەوێ!

دەنگی سۆنیا بەسۆز بوو و زیاتر لە ناڵە دەچوو. کتوپڕ لە شپرزەییان دەستەکانیی لێک ئالاندن:

– ئاخ! ئاخر خۆ ئێوە نازانن... خۆزگە دەتانزانی! تەماشا، کاترینا ئیڤانۆڤنا ڕێک وەک منداڵ وایە... کەم تا زۆر ئەقڵی لەدەست داوە... هێندەی کوێرەوەریی چەشتووە. ئاخ چەندە ژیر و لێوەشاوە بوو ئەم ژنە... دەستودڵکراوە و... چەندە نەرمونیانیش! ئێوە دەرکی پێ ناکەن... ناتوانن دەرکی پێ بکەن... ئاە!

سۆنیا پەشێو بەو دەستە لێکگرێدراوانەیەوە، نائومێدانە بە ئازارەوە قسەی دەکرد و کوڵمە ڕەنگپەڕیوەکانی ئێستە داگیرسابوون و نیگای پڕاوپڕ بوو لە ئێش. بە ئاسانی دەکرا ببینیت کە سەراپای کەوتووەتە لەرزە و ئیدی خۆی پێ ڕاناگیرێت و دەیەوێ شتێک بڵێت، قسەیەک بکات و ڕوونکردنەوەیەک بدات. کتوپڕ هەستێک لە یەک بە یەکی ئەندامەکانی ڕووخساریدا ڕەنگی دایەوە کە لەوانەیە بکرێ بڵێیت جۆرێک لە سۆزێکی بێکۆتایی بوو.

– دەستی لە من بەرز کردبێتەوە؟ کاترینا ئیڤانۆڤنا؟ چۆن دەتوانن تەنانەت بیریشی لێ بکەنەوە؟ خوایە! دەی، گریمان لێشی دابم، قەیدی چییە؟ بۆ مەگەر چی بووە؟ ئێوە ئاگاداری هیچ شتێ نین، هیچ شتێ!... ئەم ژنە تا بڵێی مەینەتی و بەدبەختە... زۆر بەدبەخت! نەخۆشیشە... ئەو تەنیا بەدوای دادپەروەری و ویژدانەوەیە، خۆی ئەوەندە ڕێک و ڕاستگۆیە! بڕوای وایە دەبێ لە هەموو شوێنێ دادپەروەری بێتە ئارا. خۆیشی تەنیا خوازیاری دادپەروەرییە، پڕ بە دڵ... ئەشکەنجەشی

بـدەن کـاری نـاکـا پێچەوانەی ویژدان بێ! تێنـاگـا کە ئەوە هەر لە بنەڕەتەوە نەکردەیە و دادپەروەری و ویژدان لەنێو خەڵکیـدا نییە... هەر لەبەر ئەوەشـە کە تووڕە دەبێ و وەک منال دەتاسـێ، ڕێک وەک منال! خۆی تا خوا حەز کا مرۆڤێکی بەویژدانە!

– ئێستە بڕیارە چی بەسەر ئێوەدا بێ؟

سونیا بە نیگایەکی پرسیارئامێزەوە لەوی ڕوانی.

– لەمەودوا دەبن بە مل ئێوەوە. گەرچی تا ئێسـتەش هەر وا بووە. باوکیشـتان هەر دەهاتە سـەروەختی ئێوە و پارەی خواردنەوەکەی لە ئێوە وەردەگرت. دەی، لەمەودوا بڕیارە دۆخەکە چۆن بێ؟

سۆنیا تازیەدارانە وەڵامی دایەوە:

– نازانم.

– بەتەمان هەر لەوێ بمێننەوە؟

– نازانم، چەند مانگێکیش کرێ قەرزارن، بەس بیستم کە خاوەنمال ئەمڕۆ گوتوویەتی بەتەمـایە جوابیـان بکـا و کـاترینـا ئیڤـانۆڤنـاش گوتوویەتی ئامادە نییە یەک خولەکی تر لەوێ بمێنێتەوە.

– چ ئـازایەتییەکی نوانـدووە، کـاترینـا ئیڤـانۆڤنـا! پشـــتی بە کێ ئەستوورە، بە ئێوە؟

– ئۆو، نا، وا مەڵێن!... ئێمە هەموومان یەک خێزانین و هەموو کاتێ لەپشت یەکترین.

سـۆنیا هەمدیسـان هەراسـان بووەوە و تەنانەت کەمێکیش تووڕە؛ تووڕەییەکەی لە هی کەنارییەک یان منداڵێکی بچکۆلە دەچوو.

– جا چیی لەدەست دێ، کاترینا ئیڤانۆڤنا؟ ئێوە بڵێن چیی لەدەست دێ ئەم ژنە؟

ئەمانەی لە بارێکی خرۆشاو و شپرزە و بە جەختلەسەرکردنەوەوە لە ڕاسکۆلنیکۆف پرسین.

– ئاخ ئەگەر بزانن ئەمڕۆ چۆن دەگریا، ڕێک وەک هەور! ئەقڵیی لەدەست داوە، خۆتان سەرنجتان نەدا؟ تاوێ وەک مناڵ خەمی سبەی دەخوا کە هەموو شتێ بە باشی بەڕێوە بچێ، فراوێن و ئەمانە... جا تاوێکی تر دەستەکانیی ڕادەوەشێنێ و بەدەم کۆکەوە خوێن دەهێنێتەوە و فرمێسک دەڕێژێ و کتوپڕ لەتاو کڵۆڵی و بێهیوایی سەری بە دیواردا دەکوتێ. پاشان هەمدیسان دەسرەوێتەوە. ئێستەش هیوای بە ئێوەیە. دەڵێ دەستی دەگرن و خۆیشی برێک لەملا و لەولا قەرز دەکا و منیش دەخاتە دوای خۆی و پێکڕا دەچین بۆ زێدگەکەی. بڕیارە خوێندنگەیەکی شەوانەڕۆژی بۆ کچە خانەدانان بکەینەوە و منیش ببمە بەڕێوەبەری و دەست بە ژیانێکی تازە و بێوێنە بکەین. دەمگرێتە باوەش و ماچم دەکا و دڵم دەداتەوە! ئاخ ئەگەر بزانن چ بڕوایەکی بە خەونەکانی هەیە! بە جۆرێ بڕوای پێیان هێناوە کە هیچ قسەیەک وەرناگرێ. لە سەرلەبەیانیشەوە خەریکی شۆردن و سڕین و گسکدان و پینەکردنە. هەرچۆنێ بووە ئەو تەشتەی کێش کردووەتە ژوورەکەوە –خۆ دەستەکانی هەر گیانیان تێدا نییە!– جا پاشان بەدەم هەناکەهەناکەوە کەوتە سەر تەختەکە و هەناسەی بۆ نەدەدرا. ئەم بەیانییە چووینە بازاڕ تا پێڵاو بۆ پۆلینکا و لیدا بکڕین، پێڵاوەکانیان کەڵکیان نەماوە. بەس ئەو پارەیەی کە مەزەندەمان کردبوو بەشی نەکرد... بەشنەکردنی چی، ئەسڵەن پارەکەی ئێمە لە کوێ و نرخی پێڵاوەکان لە کوێ! کاترینا ئیڤانۆڤناش پووتێکی زۆر جوان و ڕاقیی هەڵگرتبوو. نازانن سەلیقەیەکی چەندە جوانی هەیە! هەر لەوێ لەناو دوکانەکە و لەبەردەم فرۆشیارەکاندا کەوتە شیوەنکردن کە بۆچی وەک پێویست پارەی نییە... خوایە، بینینی لەو دۆخەدا چەندە جەرگبڕ بوو...

ڕاسکۆلنیکۆف ژارخەندێکی تاڵی هاتە سەر لێو:

– ئێ، من وا ئێستە تێدەگەم کە... بۆچی بەم جۆرە دەژین.

– یانی گەر ئێوە بان دڵتان پێی نەدەسووتا؟ خەمی لێ ناخۆن؟

سۆنیا هەمدیسان بە تووڕەییەوە لێی پرسی:

– خۆ خۆشتان هەموو پارەکەتان دایە ئەو، جا هێشتا ئەمەشتان نەدەزانی و هەموو شتێکتان نەدیبوو... ئاخ ئەگەر بە چاوی خۆتان بتاندیبا چی... خوایە! بۆ مەگەر من خۆم کەم ئازارم داوە؟ چەندان جار خۆم فرمێسکم بە چاویدا هێناوەتە خوار. دواهەمین جار ئەم حەفتەیەی ڕابردبوو بوو. نەفرەت لە من کە شەرمم نەکرد! ڕێک حەفتەیەک بەر لە مردنی باوکم بوو... ئەوەی کردم ئەوپەڕی دڵڕەقی بوو. جار و دوو جاریش نەبووە، چەندان و چەندان جار! لە بەیانییەوە ئەو بیرکردنەوەیە هەراسانی کردووم!

بیرهێنانەوەی ئەو یادگاریانە هێندە بەئازار بوو کە سۆنیا هەمدیسان دەستەکانیی لێک ئاڵاندنەوە.

– ئێوە دڵڕەق بن؟

– بەڵێ، من، ئەمەی بەردەمتان! چووبوومە دیدەنییان...

سۆنیا بەدەم فرمێسکڕشتنەوە درێژەی پێدا:

– باوکە گوتی، *سۆنیا، شتێکم بۆ بخوێنەوە! من سەرم ژان دەکا. تۆ بۆم بخوێنەوە... ئەوەش کتێب.* کتێبەکەی لەلای ئاندرێی سیمیۆنۆڤیچ لیبیزیاتنیکۆف هێنابوو، ئەویش لەوێ دادەنیشێ و دایمەی خواش چەند کتێبێکی خۆشی لایە. جا من چیم وەڵام دابێتەوە؟ گوتم ناتوانم هێندە بمێنمەوە، ئاخر نەمدەویست هیچی بۆ بخوێنمەوە و لە ڕاستیشدا بۆ ئەوە چووبووم تا چەند مۆدێلێک یەخە نیشانی کاترینا ئیڤانۆڤنا بدەم. لیزاڤێتای دەستگێڕ چەند دانە یەخە و سەرقۆڵی

هەرزان و جوانی هێنابوون، تازە و گوڵدووریکراو بوون. بە کورتییەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنا زۆر دڵی چووە سەریان، خستنییە سەر جلەکەی بەری و چووە بەر ئاوێنەکە تا تەماشایان بکا... زۆری بە لاوە جوان بوون. گوتی: *سۆنیا، ئەمانەم بە دیاری دەدەیتێ؟ تکا دەکەم!* بەس ئاخر ئەو چیی هەبوو تا پێوەیان بلکێنێ؟ ئەوە تەنیا گەنجی و ڕۆژانی خۆشی ڕابردووی بیر دەهێنایەوە و هیچی تر! لە ئاوێنەدا تەماشای خۆی دەکرد و زۆر لە خۆی ڕازی بوو. ئاخر خۆ جلوبەرگێکی وای نییە کاترینا ئیڤانۆڤنا! هیچی نییە، بە درێژایی ئەم ساڵانەش هیچی نەبووە! ئەو خووەشی نەبوو کە شت لە دەستی هیچ کەسێ وەرگرێ، هێندە لووتبەرزە ئەم ژنە! لەو کەسانەیە کە درەنگ یان زوو هەموو دار و نەداری خۆیان لەدەست دەدەن. وەلێ هەر ئەم مرۆڤە تکای کرد یەخە و سەرقۆڵەکانی بدەمێ، ئەوەندە دڵی چووبووە سەریان. من دڵم نەدەهات بیاندۆڕێنم و ڕووم تێ کرد و گوتم: *ئێوە ئەمانەتان بۆچییە ئاخر، کاترینا ئیڤانۆڤنا؟* هەر بەم شێوەیەش پێم گوت *بۆچیتانن؟* نەدەبوو ئەوە بکەم، نەدەبوو! وەها لێمی ڕوانی و بە چەشنێک دڵی لەوە شکا کە دەستم بە ڕوویەوە ناوە، کە لێیت دەڕوانی دڵت ئاگری دەگرت... خەفەتی بۆ یەخەکان نەدەخوارد، مەراقی ئەوەی هەبوو کە من تکاکەیم ڕەد کردبووەوە، چاک تێگەیشتم! ئاخ، چی دەبوو ئەگەر بمتوانیبا هەموو شتێ بگەڕێنمەوە دوا، دۆخەکە بگۆڕم... لە قسەکەم پاشگەز ببمەوە... نەفرەت لە من! ئاخ ئەگەر دەکرا... بەس خۆ بە لای ئێوەوە هیچ جیاوازییەکی نییە!

– ئێوە لیزاڤێتای دەستگێڕتان دەناسی؟

– بەڵێ... بۆ ئێوەش دەتانناسی؟

سۆنیا تۆزێک سەرسام بووبوو.

ڕاسکۆڵنیکۆف گوێی بە پرسیارەکەی نەدا و ئیستێکی کرد و پاشان گوتی:

– کاترینا ئیڤانۆڤنا سیلی هەیە و نەخۆشییەکەشی خراپ لێی پیس کردووە. هەر ئەم سیلە بەم نزیکانە دەیکوژێ.

– ئۆو، نا، نا!

سۆنیا بە چەشنێک هەڵچوو و بێهۆشانە دەستەکانی ڕاسکۆڵنیکۆفی گرتن کە دەتگوت لێی دەپاڕێتەوە تا وەها ڕووداوێک نەقەومێ.

– وەلێ بمرێ زۆر باشترە.

سۆنیا کە تۆقیبوو، نائاگایانە دووبارەی کردەوە:

– نا، باشتر نییە، بە هیچ شێوەیەک باشتر نییە!

– ئەی منداڵەکان چی بکەن؟ چارەیەکی ترتان هەیە بێ لەوەی بیانهێننە لای خۆتان؟

سۆنیا گەیشتبووە سنووری بێهیوایی.

– ئاخ، نازانم!

توند بە هەردووک دەست سەری گرت؛ دیار بوو کە خۆیشی پێشتر چەندان جار ئەم بیرکردنەوەیی بە زەیندا هاتبوو و تەنیا ئەوەبوو ڕاسکۆڵنیکۆف هەمدیسان خستبوویەوە بەر باس.

ڕاسکۆڵنیکۆف بێبەزەییانە جەختی لەسەر کردەوە:

– باشە، گریمان هەر لەم ماوەیەدا کە کاترینا ئیڤانۆڤنا زیندووە، ئێوە خۆتان تووشی نەخۆشی بوون و کەوتنە نەخۆشخانەوە. ئەوسا چی دەبێ؟

– ئەوە چی دەڵێن؟ خۆ شتی وا نابێ! نابێ شتی وا بێ!

سۆنیا بە چەشنێک تۆقیبوو کە ڕووخساری کرژ بوو.

ڕاسکۆلنیکۆف بزەیەکی شەرەنگێزانەی کرد:

– یانی نابێ، ها؟ خۆ ئێوە گرەنتی ناکرێن. دەی، چییان بەسەر دێ ئەوسا؟ ئاوارەی سەر شەقامەکان دەبن! کاترینا ئیڤانۆڤناش دەکۆکێ و دەرۆزە دەکا و ڕێک هەر وەک ئەمڕۆ سەری بە دیواردا دەکوتێ و منداڵەکانی دەیکەنە شیوەن... پاشانیش کاترینا ئیڤانۆڤنا تەختی زەوی دەبێ و دەیبەنە بنکەی پۆلیس و نەخۆشخانە. هەر لەوێش گیانی دەردەچێ و منداڵەکان...

– ئۆو، نا!... خوا خۆی ناهێڵێ شتی وا ببێ.

سۆنیا هەر ئەمەی پێ گوترا، لە سنگی گیراو و پڕخەفەتیدا هیچی دیکە دەرنەدەهات. تەنیا بە هەموو سەرنجییەوە گوێی دەگرت. تکاکارانە لە ڕاسکۆلنیکۆفی دەڕوانی و لە کڕووزانەوەیەکی بێدەنگدا بە چەشنێک دەستی بە سنگییەوە دەگوشی وەک ئەوەی ئاکامی هەموو شتێک وابەستەی ئەو بێت.

ڕاسکۆلنیکۆف هەستایەوە و دەستی کردە پێوانی ژوورەکە. خولەکێک تێپەڕی. سۆنیا بە ملێکی چەماوە و سەر و دەستی شۆڕەوە لەوێ کۆستکەوتووانە ڕاوەستابوو.

ڕاسکۆلنیکۆف کتوپڕ بەسەر سەری کچەکەدا چەمییەوە و پرسیی:

– پێم بڵێ، ناتوانن پاشەکەوتێ بکەن؟ بۆ نموونە بڕێک وەلا بنێن بۆ ڕۆژی تەنگانە و ئەمانە...

سۆنیا ورتاندی:

– نا کاکە.

– بەڵێ دەی، پاشەکەوت ناکرێ.

ڕاسکۆلنیکۆف لە درێژەدا بە تەشەرەوە پرسیی:

– وەلێ تا ئێستە هەوڵتان داوە تۆزێ پاشەکەوت بکەن؟

– بەڵێ.

– نەشـــکراوە! بێگومان وایە، هیچی لێ نەمابووەوە! ئەوە پرســـینی نەدەویست!

هەمدیســـــان چوارلای ژوورەکەی پێوایەوە. خولەکێکی دیکەش بەم جۆرە تێپەڕی.

– لام وایە هەموو ڕۆژێ پارەتان دەست ناکەوێ، ها؟

ســـــۆنیا لەڕادەبەدەر نـاڕەحەت بوو و دووبـارە خوێن پەڕییەوە ڕووخساری.

بە هەوڵێکی هەناسەبڕەوە ورتاندی:

– نا.

ڕاسکۆلنیکۆف بێ پێشەکی قسەی فڕێدا:

– ئێ، داهاتووی پۆلینکاش هەر ئەمە دەبێ دەی.

– نا! نا! ڕێی تێناچێ!

ســـۆنیا بە چەشـــنێک بێهیوایانە هاواری دەکرد کە دەتگوت چەقۆی لێ دەدرێ.

– ڕێی تێناچێ خوا ڕازی ببێ وەها بەڵایەکی تۆقێنەری بەســـــەردا بێ!

– هەرچۆن بێ خۆ ڕازی بووە ئەو بەڵایە بەسەر ئەوانی تردا بێ!

سۆنیا جڵەوی خۆی لەدەست دابوو و هەیتاهەیتا پاتەی دەکردەوە:

– نا، نا! خواوەند ئاگاداریەتی، خوا خۆی چاوی لێیەتی!

ڕاسکۆڵنیکۆف بە حەزێکی بەدخوازانەوە وەڵامی دایەوە:

– بەس لەوانەیە خوایەک لەئارادا نەبێ!

جا پێکەنی و تەماشایەکی کچەی کرد.

باری ڕووخساری سۆنیا کتوپڕ گۆڕا و کرژ بوو. بە بێزارییەکی وەسفهەڵنەگرەوە چاوی لە ڕاسکۆڵنیکۆف بڕیبوو. ویستی شتێک بڵێ، بەس نەیتوانی دەم بکاتەوە. هەنسکی گریانێکی تاڵ دایگرت و بە دەستەکانی ڕووخساریی شاردەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف ماوەیەکی کورت بێدەنگ بوو و پاشان لەسەری ڕۆیشت:

– دەڵێن کاترینا ئیڤانۆڤنا ئەقڵیی لەدەست داوە، کەچی خۆتان لەو خراپترن!

پێنج خولەکێک تێپەڕی. ڕاسکۆڵنیکۆف هێشتا لە بێدەنگییەکی تەواودا بە درێژی و پانیی ژوورەکەدا ئامۆشۆی بوو. دواجار چووە لای سۆنیا؛ چاوەکانی بریقەیەکی خراپیان لێ دەهات. دەستی خستە سەر شانی کچە و ڕاستەوخۆ لە ڕووخسارە بە فرمێسک خووساوەکەی ڕاما. نیگا بەهێزەکەی وشک و ئاگرین بوو و لێوی توند دەلەرزی... کتوپڕ دانەوی و خۆی خستە سەر زەوی و پێی سۆنیای ماچ کرد. سۆنیا بە جۆرێک سڵەمییە دواوە وەک ئەوەی شێتێک لێی هاتبێتە پێشەوە.

سۆنیا وەک گەچ سپی هەڵگەڕا و کتوپڕ دڵی لەتاو ئازار کزەی لێوە هات. لەژێر لێوەوە گوتی:

– تکا دەکەم دەســـــت هەڵگرن! ئەســـلەن دەزانن خەریکی چین؟ لەبەردەم مندا!...

ڕاسکۆڵنیکۆف دەمودەست هەستایەوە.

– من لەبەردەم ئێوەدا نەکەوتمە ســــەر ئەژنۆ، ئەوە لە بەرپێی ئازاری مرۆڤایەتیدا بوو کە کەوتمە سەر ئەژنۆ!

توند و تەنانەت کێویانە وەڵامی دایەوە و چووە بەرپەنجەرە. دوای تێپەڕینی خولەکێک ڕووی کردە کچە و گوتی:

– گوێ بگرن، هەر ئێستە بە کەسێکی چەپەڵم گوت پەنجەتووتەی ئێوە ناهێنێ!... هەروەها پێشـــم گوت لە ڕاســـتیدا ئەوە شـــانازییە بۆ خوشکم کە بەیانی لەلای تۆوە دامنیشاند.

– وای خوایە، شتی واتان پێ گوت؟ خوشکیشتان لەوێ بوو؟

سۆنیا بە هەراسانی هاواری کرد:

– گوتتان شـــانازی بووە بۆ خوشـــکتان کە لەلای من دانیشـــتووە! شـــــانازی؟ لەلای منێک کە... هیچ حورمەتێکم بۆ نەماوەتەوە؟... منێک کە گوناحبارم، گوناحبارێکی گەورە! ئاخ، بۆچی واتان گوت؟ بۆچی؟

– لەبەر بێحورمەتی و گوناحەکانت نەبوو، لەبەر ئەو کوێرەوەرییە وام گوت کە تۆ دەیکێشـــی. ئەوەی کە تۆ گوناحباریت ڕاســـتە و هیچ گومانێکی تێدا نییە.

ڕاسکۆڵنیکۆف خرۆشاوانە درێژەی پێدا:

– گەورەترین گوناحیشـــت ئەوەیە کە لەبەر هیچ خۆت فرۆشـــت و لەناو برد، لەبەر هیچ! لەمە ترســـناکتر هیچ هەیە؟ وا لەناو پیســـی و چەپەڵییەکدا دەگەوزێی کە پڕبەدڵ بێزت لێی دێتەوە و خۆشـــت باش دەزانی تەنیا دەبێ چاوەکانت بکەیتەوە و ببینی کە ئەم کارانەت برینی

هیچ کەسێکیان سارێژ نەکردووە و هیچ کەسێکیش ڕزگار ناکەن! خۆت بڵێ...

ڕاسکۆڵنیکۆف کە خەریک بوو دەگەیشتە ئاستی شێتبوون، هێشتا هەر قسەی هەبوو:

– ئاخر چۆن دەکرێ لەلایەکەوە ئەو هەستە پیرۆزانەت هەبن و لە لایەکی ترەوە ئەم سەرشۆڕی و شوورەیی و نەگبەتییە؟ کاری باش و ڕاست ئەوەیە کە... یانی هەزار جار ژیرانەتر و باشترە کە سەراوسەری خۆت هەڵدەیتە ناو ئاو و ئیتر بۆ تاهەتا کۆتایی پێ بهێنی!

سۆنیا بە دەنگێکی کز پرسیی:

– ئەی ئەوان چییان بەسەر دێ؟

جا بە چاوی تەژی لە تۆقین و دڵەڕاوکێوە لەو ڕاما. هاوکات پێنەدەچوو هێندەش بە پێشنیارەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف سەرسام بووبێت.

ڕاسکۆڵنیکۆف نیگایەکی سەیری گرتە ئەو. دەیتوانی هەموو شتێک لە ڕووخسار و نیگای ئەودا بخوێنێتەوە و دیار بوو کە دونیا خۆیشی ئەو بیرۆکەیەی بە زەیندا هاتووە، جا نەک هەر بە تەنیا یەک جار، بەڵکە چەندان و چەندان جار. وا دیاربوو زۆر جار فرە جددی و لە ترۆپکی بێهیواییدا لەگەڵ خۆی کێشمەکێشی بووە کە چۆن کۆتایی پێ بێنێت و مەسەلەکەشی گەلێک بە هەند وەرگرتووە، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئێستە بە بیستنی پێشنیارەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف هیچ سەرسامییەکی دەرنەبڕی. تەنانەت دڵڕەقی و زبریی قسەکانی ئەو هیچ سەرنجێکی ڕانەکێشابوو؛ دیار بوو کە لە مانای شاراوەی سەرزەنشتکردن و ڕوانینە تایبەتییەکەی ئەو بۆ بێحورمەتی تێنەگەیشتووە. ڕاسکۆڵنیکۆف چاک لەمە تێگەیشت، بەڵام لە لایەکی

دیکەوە دەیدیت بیرکردنەوە لە بێحورمەتی و ئەو دۆخە ڕســـوایییەی، ئەشکەنجەی دەدات و ئەم ئەشکەنجەیەش دەمێکە هەر وا بەردەوامە. لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *کەواتە تا ئێستە چی بەری پێ گرتووە تا کۆتایی پێ نەهێنێ؟ تۆ بڵێی چی بێت؟* لەو ســـاتەدا بوو دواجار بۆی دەرکەوت کە ئەو منداڵە بچووکە هەتیوانە و ئەو کاترینا ئیڤانۆڤنا نیوەشێتە بێناز و کڵۆڵە کە بەو سیلە تەشەناکردووەیەوە تاهەتا سەر بە دیواردا دەکوتێت، بۆ سۆنیا چ بایەخێکیان هەیە.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشــدا وەک ڕۆژ بۆی ڕۆشــن بوو کە ســۆنیا بەو کەســـایەتییە تایبەتی و ئەو بڕە زانیارییەیەوە ناتوانێت لەو دۆخەدا بمێنێتەوە. لە لایەکەوە هێشـــتا زەینی گیرۆدەی ئەوە بوو کە کچێک توانای خۆهەڵدانە ناو ئاوی نییە، چۆن تا ئێســتە بەرگەی ئەو دۆخەی گرتووە و شێت نەبووە! هەڵبەتە دەیزانی کە دۆخی سۆنیا، لە ڕاستیدا، لە دیاردە بە هەڵکەوتەکانی کۆمەڵگەکەیانە، گەرچی بەدبەختانە ســۆنیا بە تەنیا نەبوو و کەســانی دیکەی وەک ئەو هەبوون و هەڵکەوتەی وا زۆر بوون. بەڵام مرۆڤ وای بۆ دەچوو کە هەر ئەم دۆخە مۆتەکاوی و وردەزانیارییەی ســـۆنیا و ژیانی ڕابردووی، لە هەمان هەنگاوە یەکەمینەکانی ئەم ڕێگە نەحســـەدا لەپێی بخەن. کەواتە ئەوە چی بوو کە ئەوی بە پێوە هێشـــتبووەوە؟ خۆ هەرزەیی نەبوو؟ نا، نەدەچووە ئەقڵەوە ئەوە بێت! گومانێک لەئارادا نەبوو کە داوێنپیســـی تەنیا بە ڕواڵەت دزەی کردبووە ناویەوە و تەنانەت بەقەد سەرەدەرزییەکیش داوێنپیســی لە دڵیدا نادۆزرێتەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف لەوە دڵنیا بوو. وا بە دیدەی خۆی دەیبینی و کچەکەش لە بەرچاویدا ڕاوەســـتابوو... لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *ئەم کچە سێ ڕێگەی لەبەردەمدایە: خۆی هەڵداتە ناو ئاوەوە، بچێتە شـــێتخانە یان... لانیکەم لە داوێنپیســـیدا بگەوزێ، ئەو ڕادەیەی داوێنپیســـی مرۆڤ وڕ و کوێر دەکا و دڵیشـــی دەکاتە بەرد.*

سێیەمین ڕێگە لە هەمووی قێزەونتر بوو، وەلێ ڕاسکۆڵنیکۆف گەنجێکی بەدبین و دوورەپەرێز بوو، لە ئەنجامیشدا، بێبەزەیی. هەر ئەمەش بوو وای دەکرد بڕوای وا بێت سێیەمین ڕێ زیاتر لەوانی دی ڕێتێچووتر بێت.

لە دڵی خۆیدا هاواری کرد: *بەس دەکرێ ئەویش بگاتە ئەو ئاستە؟ دەکرێ بوونەوەرێک کە پاکیی ڕۆحی جوانی پاراستووە، دواجار دەست لە خۆی بەر بدا و لە لیتاوی پیسی و چەپەڵیدا ڕۆبچێ؟* نەکا *پرۆسەی ڕۆچوونەکەی دەستی پێ کردبێ؟ ئەسڵەن نەکا تا ئێستە هەستیاریی لەبارەی گوناح و سووکییەوە کەمتر بووبێتەوە و هەر لەبەر ئەوەش بێ کە بەرگەی گرتووە؟ نا، نا! وەها شتێ ڕێی تێناچێ!*

پاشان وەک سۆنیا کە چەند ساتێک لەوەوبەر ئاستی تۆقینی خۆی دەردەبڕی، ئەویش هەراسان بوو: *نا! ئەوەی کە نایهێڵێ خۆی هەڵبداتە ناو ئاوەوە مەسەلەی گوناحی خۆکوژی و بوونی منداڵەکانە... ئەگەریش تا ئێستە شێت نەبووە، لەبەر ئەوە... بەس کێ دەڵێ تا ئێستە تێک نەچووە؟ یانی هەر بە ڕاستی ئەقڵی لە شوێنی خۆیدایە؟ ئەوەش قسەکردنی بوو و بەڵگە و پاساوهێنانەوەی! چۆن دەتوانێ بە لێواری هەڵدێرێکەوە دانیشێ کە بۆنی پیسی و چەپەڵیی لێ دێ و وا خەریکە بەرەو خۆی کێشی دەکا، وەلێ ئەو هەر وا دەست ڕابوەشێنێ و هەرچەندە لەبارەی مەترسییەکەوە ئاگاداری بکەنەوە، کەچی گوێی لێ بخەوێنێ؟ نەکا هەر بە ڕاستی چاوەڕێی پەرجوویەک، شتێک بێ؟ بەڵێ دەی! بە دڵنیاییەوە چاوەڕێی پەرجوویەکە! دەی، مەگەر ئەمانە نیشانەی شێتی نین؟*

کەڵلەڕەقانە پێی لەسەر بیرکردنەوەکەی دوایی داگرت و ئەوی زیاتر لە پاساوەکانی دیکە پەسەند دەکرد. بە سەرنجێکی زیاترەوە بە کچەکەدا وڕ بوو و پرسیی:

– تۆ زۆر دوعا دەکەی، سۆنیا؟

سـۆنیا هیچی نەگوت. ڕاسـکۆلنیکۆف بەدەم چاوەڕوانیی وەلامەوە لەتەکیدا ڕاوەستابوو.

کچە زۆر توند و بە زۆر ورتاندی:

– بەبێ خوا من چیم لێ دەمێنێتەوە؟

چـاوانی کتوپڕ بریقەیەکی ئـاگرینیـان لێوە هـات، تەمـاشـــایەکی ڕاسکۆلنیکۆفی کرد و دەستی ئەوی گرت.

ڕاســـکۆلنیکۆف بیری کردەوە: *ئەها! دەرکەوت مەســـەلە* چییە. جا زیاتر گوشاری لێ کرد تا بێتە قسە:

– جا ئەوسا خوا کتومت چیت بۆ دەکا؟

ســـۆنیا تا ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، وەک ئەوەی نەتوانێت دەم بکاتەوە و وەلام بداتەوە. ســـنگی ناســـکی لەتاو هەســـت و هەیەجان خێراخێرا سەروخواری دەکرد و کتوپڕ هاواری لێ بەرز بووەوە:

– وس بێ! هیچ مەپرسن! ئێوە شیاوی نین!...

جا تەماشایەکی توورە و لێنەبردووانەی تێکرت.

ڕاسکۆلنیکۆف لەبەرخۆیەوە ورتاندی: *تەواوە! باشی بۆ چووم!*

سۆنیا پەلەپەل لەژێر لێوەوە گوتی:

– هەموو شتێکمان لەدەستی خوادایە!

جا هەمدیسان چاوی لە ڕاسکۆلنیکۆف بڕییەوە.

ڕاســـکۆلنیکۆف لای خۆیەوە بڕیاری دا: *کەواتە وەلامی مەتەلەکە ئەمە بوو. ڕوونکردنەوەی بەسەرهاتەکە ئەمەیە.*

جا چلێسانە و بە کونجکۆڵییەکی پڕ لە تامەزرۆییەوە ئەوی خستە ژێر چاودێری.

هەستێکی تازە و سەیری هەبوو کە بارێکی نەخۆشانەشی لەگەڵدا بوو. تەماشای ئەو رووخسارە بچووکە رەنگپەڕیو و ئێسکنە، ئەو رووخسارە نارێک و سووچدارەی کرد و ئەو چاوە هێمن و شینانەی کە دەیانتوانی تەژی ببن لە بڵێسەی توورەیی، توورەییەکی راچڵەکێنەر و تووش. جەستەی وردی کچە هێشتا لەتاو توورەیی هەڵدەلەرزی و هەموو ئەمانە لە بەرچاوی راسکۆڵنیکۆفدا سەیروسەمەرە دەیاننواند، تەنانەت تا ئاستی ئەقڵنەبڕی. لەبەرخۆیەوە دووبارەی کردەوە: *شێتێکی ماڵوێرانە!*

کتێبێک بەسەر دۆلابەکەوە بوو کە راسکۆڵنیکۆف هەر جار بە ژوورەکەدا دەگەڕا چاوی پێی دەکەوت. جا ئێستە هەڵیگرت و چاوێکی پێدا خشاند. وەرگێرانی رووسیی *پەیمانی نوێ* بوو، کتێبێکی کۆنە و چەندان جار لاپەڕەهەڵدراوە، بە بەرگێکی چەرمییەوە.

هەر لەوبەری ژوورەکەوە بەرز و ڕوو لە سۆنیا گوتی:

– ئەمەت لە کوێ هێناوە؟

سۆنیا هێشتا لە شوێنەکەی پێشوویدا راوەستابوو، سێ هەنگاوێک دوور لە مێزەکەوە.

– بۆیان هێنام.

وەڵامی دایەوە، بەڵام وەک بڵێیت بە جۆرێک لە بێزارییەوە و تەنانەت سەیری راسکۆڵنیکۆفیشی نەکرد.

– کێ بۆی هێناوی؟

– لیزاڤێتا. خۆم داوام لێی کرد.

ڕاسکۆڵنیکۆف بیری کردەوە: *لیزاڤێتا! زۆر سەیرە!*

لەگەڵ تێپەڕینی هەر خولەکێکدا، ئەوەی کە پەیوەندیی بە سۆنیاوە هەبوو، سەیر و سەرسوڕهێنەرتر دەهاتە بەرچاوی ڕاسکۆڵنیکۆف. کتێبەکەی بردە نزیک مۆمەکەوە و دەستی کردە هەڵدانەوەی پەڕەکانی.

بێ پێشەکی پرسیی:

– چیرۆکی عازر لە کوێیە؟

سۆنیا کەللەڕەقانە چاوی لە زەوی کلا نەکرد و وەڵامیشی نەدایەوە. بە تەواوی ڕووی لە زەوی نەبوو و لاونیو ڕاوەستابوو.

– ئەی کوا چیرۆکی عازر؟ وەرە، بۆمی بدۆزەوە، سۆنیا...

سۆنیا لەژێر چاوەوە سەیرێکی ئەوی کرد.

– خۆ لەوێ نییە، سەیری *ئینجیلی چوارەم* بکەن.

هێشتا بەدخوو و مۆن بوو و ئامادە نەبوو سەیری ڕاسکۆڵنیکۆف بکات.

– خۆت بیدۆزەرەوە و بۆمی بخوێنەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف دانیشت و ئەنیشکەکانیی خستنە سەر مێزەکە، سەری نایە سەر دەستەکانی و بە ڕووگرژی لەوبەری ژوورەکەی ڕوانی و ئامادەی بیستنی چیرۆکەکە بوو. بە خۆی گوت: *سێ هەفتەی تر نابا خۆی لە شێتخانەکاندا دەبینێتەوە، بەوپەڕی خۆشحاڵیشەوە وەریدەگرن. فەرموون، زۆر بەخێر هاتن! منیش گەر بەخت یارم بێ و خۆم لە شوێنێکی تردا نەبینمەوە، ئاقیبەتم هەر ئەوێیە!*

سۆنیا بە خەمساردییەکی تەواوەوە گوێی لە قسەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف گرت و دردۆنگانە بەرەو لای مێزەکە چوو، بەڵام هەرچۆنێک بوو کتێبەکەی هەڵگرت.

لەوسەری مێزەکەوە لەژێر چاوەوە تەماشایەکی ڕاسکۆلنیکۆفی کرد و پرسیی:

– یانی تا ئێستە چیرۆکی عازرتان نەخوێندووەتەوە؟

ئاوازی دەنگی وشک و ڕەقتریش بووبوو.

– زۆر دەمێکە... سەردەمی قوتابخانە خوێندوومەتەوە وابزانم. بیخوێنەوە دەی!

– ئەی چۆن لە کڵێسادا ئەم چیرۆکەتان نەبیستووە؟

– کڵێسا... ناچمە کڵێسا. تۆ زۆر دەڕۆی؟

سۆنیا لەژێر لێوەوە گوتی:

– نا... نا، ناچم.

ڕاسکۆلنیکۆف دەمی دادڕی:

– تێدەگەم... یانی بەیانی بۆ بەخاکسپاردنی باوکیشت هەر ناچی؟

– با، دەچم. حەفتەی ڕابردووش لە کڵێسا بووم... ڕێوڕەسمی دوعاکردن بوو.

– ڕێوڕەسم بۆ کێ؟

– لیزاڤێتا. بە تەور کوشتیان.

مێشکی ڕاسکۆلنیکۆف کەوتبووە ژێر گوشارێکی سامناکەوە و بەرەبەرە خەریک بوو تووشی سەرسووڕانیش دەبوو.

– بۆ لیزاڤێتا هاوڕێت بوو؟

– بەڵێ... ژنێکی باش بوو... جاروبار سەرێکمان لە یەکتری دەدا... بەردەوامیش نا، کاتی نەبوو... پێکەوە دادەنیشتین و دەمانخوێندەوە

و... دەمەتەقێیەکمان دەکرد. بێگومان ئێستە بە دیداری خوا شاد دەبێ بەسەر عەرشەکەیەوە.[1]

دواهەمین ڕستەی سۆنیا بەو زایەڵە فەرمی و کتێبییەوە سەیر هاتە گوێی ڕاسکۆڵنیکۆف. دە فەرموو، نەگبەتی هەر نابڕێتەوە! ئەوەش دیدارە سەیروسەمەرەکانی لیزاڤێتا و سۆنیا خاتوون، جووتێک شێتی پەتبڕ! بە خۆی گوت: *هەر کەسێ پێ بنێتە ئێرە، شێت دەبێ! نەخۆشییەکەیان گوازراوەیە ئەمانە!*

کتوپڕ دەنگی هەڵبڕی و مکووڕ و تووڕە گوتی:

– دەی بیخوێنەوە!

سۆنیا هێشتا دڕدۆنگ ڕاوەستابوو. دڵی ترپەترپ بە سنگییدا دەکوتی و تەنانەت زاتی نەبوو بۆشی بخوێنێتەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف بە هەستی ئەشکەنجەیەکی بەسوێوە تەماشای ئەو شێتە چارەڕەشەی کرد.

سۆنیا هێمن و تەنانەت بە هەناسەی پچڕاوەوە ورتاندی:

– ئاخر بۆچی دەتانەوێ بیخوێنمەوە؟ خۆ ئێوە بڕواتان پێی نییە...

ڕاسکۆڵنیکۆف لەسەر قسەی خۆی سوور بوو:

– بیخوێنەوە! من دەمەوێ بۆم بخوێنیتەوە. خۆ بۆ لیزاڤێتات خوێندووەتەوە!

سۆنیا کتێبەکەی کردەوە و خستییە سەر لاپەڕەی مەبەست. دەستی کەوتبووە لەرزین و دەنگی نەیدەکرد. دوو جار هەوڵی دا دەست پێ بکات، بەڵام تەنانەت نەیتوانی یەکەمین دەنگیش دەربڕێت.

---

١. ئامـاژەیە بە ئینجیلی مەتا: *خەنی لە خۆیان دڵپاکەکان، چون ئەوان بە دیداری خواوەند دەگەن.* «و. ف»

دواجـار بە تەقەللایەکی سـەرسـوڕهێنەوە خۆی نـاچـار کرد بیخوێنێتەوە:

*- پیاوێک بە نـاوی عـازرەوە نەخۆش بوو؛ عـازر خەڵکی بەیت عەنیا...*

وەلێ کە گەیشـتە سـەر سـێیەمین ڕسـتە دەنگ لە گەروویدا پچڕا، وەک ئەوەی ژێیەک بێت و زیاد لە ڕادە ڕایانکێشـابێت. هەناسـەی دەرنەدەهات و سنگی کرژ بووبوو.

ڕاسکۆڵنیکۆف تا ڕادەیەک دەیزانی کە سۆنیا بۆچی ناتوانێت خۆی ناچار بکات شـتێکی بۆ بخوێنێتەوە. تا زیاتریش لەوە دڵنیا دەبووەوە، بە ڕووداریبیەکی شەڕەنگێزانە و تووڕەییەکی فرەترەوە زۆری لە کچە دەکرد تا بخوێنێتەوە. هیچ کەسـێک نەیدەتوانی وەک ئەو ئاوها بە باشـی دەرک بەوە بکات کە چەندە بەئازارە بۆ کچەکە ئەو هەسـتە دەربڕێت و لەبەردەم ئەوانی دیکەدا نمایشـی بکات کە بە هی خۆیی دەزانێت. تێدەگەیشـت کە ئەم هەسـتەی دڵی بە ڕاسـتی نهێنییەکی گەورە و ڕاسـتەقینەی ژیـانی ئەوە کە پێدەچوو سـاڵەهـا بێت شاردبێتییەوە، لەوانەشە هەر لە سەردەمی منداڵییەوە؛ ئەو کاتانەی کە لەگەڵ باوکی چارەڕەش و زڕدایکی شێتبووی بەدەست چەرمەسەری و ئەو منداڵە بچووکە برسـییانەوە کە لە گەرمەی قیڕوهوڕی تۆقێنەر و شەڕ و سەرکۆنەکردندا بوون، ژیانی بەسەر بردووە. وێڕای ئەمانە ڕاسکۆڵنیکۆف چاک تێگەیشتبوو و کەمترین گومانی نەبوو کە گەرچی خوێندنەوە بۆ کچەکە مایەی ئەشـکەنجەیە و تەنانەت دەشـێتۆقاند، بەڵام وەسـوەسـەیەکی کوشـندە لە دەروونیدا هەیە و وا دەکات بخوێنێتەوە و بۆ ئەویشی بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی هەر ئێستە قسەکانی ببیسـتێت؛ جا قیروسـیا! ئەمەی لە نیگای سـۆنیادا دەخوێندەوە و بە هەسـتە ئاگرین و خرۆشـانە قووڵەکەیدا لە حاڵی تێدەگەیشـت. سـۆنیا خۆی جڵەو کرد، ئەو گرژبوونەی کە ڕێگەی گەرووی گرتبوو و هەر

له یەکەمین ئایەتدا لەبەردەم خوێندەوەکەیدا بووبووەوە بەربەست، بە زۆر کۆنترۆڵ کرد و مـاوەی بەنـدی یـازدەیەمی *ئینجیلی یۆحەنـای* خوێندەوە و لە ئایەتی نۆزدەیەمیشەوە دەستی پێ کرد:

*- زۆرێک له یەهوودییەکان هـاتبوونه لای مـارتـا و مریەم تـا بۆ مردنی براکەیان دڵنەواییان بکەن. کاتێک مارتا بیستی عیسا بە ڕێوەیە، بەپیرییەوە چوو، وەلێ مریەم هەر وا لە ماڵەکەیدا مایەوە. مـارتـا بە عیسـاى گوت: گەورەم، گەر لێرە بـاى براکەم نەدەمرد و لەگەڵ ئەوەشدا دەزانم کە تەنانەت ئێستەش، داوای هەر شتێ لە خوا بکەی، دەست نە رووتەوە نانێ.*

سـۆنیا هەمدیسـان وازی لە خوێندنەوەکە هێنا، شـەرمەزار بوو و وەک ئەوەی چاوەڕێ بێت لە هەر ساتێکدا دەنگی لە گەروویدا بشکێت.

*- عیسا بەوی گوت: براکەت هەڵدەستێتەوە. مارتا گوتی: دەزانم کە ڕۆژی پەسڵان لە کاتی لێپرسینەوەدا، هەڵدەستێتەوە. عیسا پێی گوت: من پەسـڵان و ژیانم. هەر کەسـێک بڕوا بە من بهێنێ، تەنانەت ئەگەر بشـمرێ، هەر زیندوو دەبێتەوە. وەک چۆن ئەگەر کەسێک زیندوو بێ و بڕوا بە من بهێنێ، تاهەتایە نامرێ. ئایا بڕوات بەمە هەیە؟ مارتا بە عیسای گوت...*

سـۆنیا هەناسـەیەکی هێندە قووڵی هەڵکێشـا وەک ئەوەی ئازارێکی هەبێت و بە دەنگێکی تەواو زوڵاڵ و تەژی لە بـاوەڕەوە درێژەی بە خوێندنەوە دا؛ ڕێک وەک ئەوەی لەبەردەم خەڵکیدا بەدەم هـاوارەوە دان بە باوەڕی خۆیدا بنێت.

*- بەڵێ گەورەم. من بڕوام هێنـاوە کە تۆ ئەو مەسـیح و کوڕی خوایەی کە دەشیا بێتە ئەم دونیایە.*

سـۆنیا هەمدیسـان بێدەنگ بوو. سـەری هەڵبڕی و بە دزییەوە تەماشـایەکی ڕاسـکۆڵنیکۆفی کرد، بەڵام دووبارە خۆی کۆ کردەوە و

درێژەی بە خویندنەوە دا. ڕاسکۆڵنیکۆف لە جێگەکەیدا نەبزوابوو، هەر لەوێ دانیشــتبوو و گوێی دەگرت. هێشــتا ئەنیشــکەکانی بەســەر مێزەکەوە بوون و نیگاشی لەوبەری ژوورەکە ڕامابوو. کچە تا ئایەتی سیودووی خوێندەوە.

*–کاتێک مریەم گەیشتە ئەو شوێنەی عیسای لێ بوو و ئەوی دیت، خۆی خستە بەرپێی و گوتی: گەورەم! گەر لێرە بای، براکەم نەدەمرد. ئەوسا عیسا بە بینینی گریانی مریەم و ئەو یەهوودیانەی کە لەگەڵیدا هاتبوون، لە ناخەوە ئامێکی هەڵکێشـــا و خەمێکی قووڵ دایگرت. پرسیی: ئەوتان لە کوێ داناوە؟ ئەوان وەڵامیان دایەوە: گەورەم، وەرە ســەیرکە. ئەســرین بە چاوی عیســادا هاتە خوار. جا یەهوودییەکان گوتیان: تەماشــاکەن، چەندە ئەوی خۆش دەویســت! کەچی بەشــێک لەوان گوتیان: خۆ ئەم پیاوە بینایی بۆ کوێرێک گەڕاندەوە، ئەی بۆچی نەیتوانی بەر بە مردنی عازر بگرێ؟*

ڕاسکۆڵنیکۆف ڕووی کردە کچەکە و هەژیوانە لێی ڕوانی. سۆسەی کردبوو! کچە ســەرتاپای لەتاو تادا هەڵدەلەرزی... تای ڕاســتەقینەی جەســتەیی! بەڵێ، ڕاســکۆڵنیکۆف چاوەڕوانیی ئەوەی دەکرد. ســۆنیا بەرەبەرە خەریک بوو لە چیرۆکی گەورەترین پەرجووی جیهان کە لەوەوپێش هاوشــێوەی نەبوو، نزیک دەبووەوە و هەژانێکی مەزن گیانیی تەنیبووەوە، دەنگی زایەڵەیەکی زەنگئاســـای تێکەوتبوو و حاڵێکی قووڵ و ســەرکەوتووانە گیانی بە بەردا دەکردەوە. ڕســتەکان بە بەرچاوییەوە سەمایان دەکرد و هەموو شتێکیشی ناڕوون و تاریک دەبینی، بەڵام ئەو چیرۆکەی بە تەواوی لە بەر بوو کە دەیخوێندەوە. کە گەیشــتە دواهەمین ئایەت، *خۆ ئەم پیاوە بینایی بۆ کوێرێک گەڕانــدەوە، ئەی بۆچی نەیتوانی...*، دەنگی نزم کرد و بە حــاڵ و ورووژانێکی ســەیرەوە گومان و خەوشــبینی و قســەی زبری ئەو یەهوودییە کوێر و بێباوەڕانەی بۆ بیسەر گواستەوە... خولەکێک دواتر

وەک ئەوەی هەمووان برووســـکەیان بەر کەوتبێت، بەدەم گریانەوە خۆیـان دەخەنە بەرپێی ســــەروەر و بڕوای پێی دەهێنن... جـا ئەو، *ئەویش کە وەک ئەوان کوێر و بێباوەڕە، دەبیســـتێت و باوەڕ دەکا! بەڵێ، بەڵێ! هەر ئێستە دەمودەست بڕوا دەکا و باوەڕ دەهێنێ!* سۆنیا لە جیهانی خەیاڵدا ئەمانەی لەبەرخۆیەوە دەگوتن و لەتاو حاڵی ئەو ساتە هەژێنەرەدا هەڵدەرزی.

*– ئەوسا عیسا جارێکی دی لە ناخەوە ئاهێکی هەڵکێشایەوە و هاتە بەردەم گۆڕەکە. ئەو گۆڕە لە ڕاستیدا ئەشکەوتێک بوو کە بەردێکیان بە دەمەکەیەوە نابوو. گەورەم! ئێســـتە ئیدی ڕەنگە بۆنیشـــی کردبێ، چونکە چوار ڕۆژی بەسەردا تێپەڕیوە.*

سۆنیا *چوار*ی بە جەختلەسەرکردنەوە دەربڕی.

*– عیســـا بەوی گوت: ئایا بە تۆم نەگوت گەر باوەڕ بێنی، شـــکۆی خوا دەبینی؟ ئینجا بەردەکەیان لابرد. ئەوســــا عیســــا ڕووی کردە ئاســـمان و گوتی: باوکە، ســـوپاس بۆ تۆ کە دوعاکەی منت بیســـت. دەمزانی کە هەمیشـــە دوعای من دەبیســـتی؛ وەلێ من تەنیا لەبەر ئامادەبووانی ئێرە ئەم قســـەیەم کرد، تا باوەڕ بەوە بکەن کە من نێردراوی تۆم. عیســـا دوای ئەم قســـانە، بە دەنگی بەرز گوتی: عازر، وەرە دەرێ! ئینجا ئەو پیاوەی کە مردبوو، هاتە دەر...*

کچە بەستبووی و هەڵدەلەرزی، بە دەنگی بەرز و پڕ لە خرۆشەوە، وەک ئەوەی کە ئەو دیمەنە بە بەرچاوییەوە بێت، دەیخوێندەوە.

*– هاتە دەرێ لە بارێکدا کە دەست و پێی بە کفن بەسترابوونەوە و دەموچاویشـــی پارچەیەکی ســـپیی لێ پێچرابوو. عیســـا بەوانی گوت: بیکەنەوە با بڕوا. ئەوســـا زۆرێک لەو یەهوودیانەی کە هاتبوونە لای مریەم و چاویان بە کارەکەی عیسا کەوت، بڕوایان پێی هێنا.*

لەوە زیاتری نەخوێندەوە و نەیتوانی درێژەی پێ بدات، کتێبەکەی پێوەدا و بە پەلە هەستایەوە. لەژێر لێوەوە وشک و کوت، بەڵام بە تۆکمەیی گوتی:

– بەشی پەیوەست بە هەستانەوەی عازر ئەمە بوو.

پاشانیش ڕووی وەرگێڕا و بێ جووڵە ڕاوەستا، دەتگوت شەرم لەوەش دەکا کە تەنانەت لە ڕووخساری ڕاسکۆلنیکۆف بڕوانێت. هێشتا لەرزی تا لە جەستەیدا مابوو. بنەمۆمە سووتاوەکە دەمێک بوو لە مۆمدانە شەقوشڕەکەدا بە زۆر پرتەپرتی دەکرد و ڕووناکییەکی زۆر کز و دڵگیری دەخستە سەر بکوژ و سۆزانییەکە، کە لەو ژوورە هەژارانەیەدا بە شێوەیەکی نائاسایی پێکەوە دانیشتبوون و کتێبی پیرۆزیان خوێندبووەوە. لانیکەم پێنج خولەک ڕابرد.

ڕاسکۆلنیکۆف کتوپڕ بە دەنگی بەرز گوتی:

– هاتم بۆ لات تا دوو قسەت بۆ بکەم.

دەموچاوی بە یەکدا دا و هەستایەوە و چوو بۆ لای سۆنیا. سۆنیا لە بێدەنگیدا سەری هەڵهێنا و چاوی لە ڕووخساری ئەو بڕی. نیگای گەنجەکە تۆکمە بوو و ویستێکی شێتانە تێیدا شەپۆلی دەدا. گوتی:

– ئەمڕۆ پشتم لە خێزانەکەم کرد، لە دایک و خوشکم. ئیتر بڕیار نییە بچمەوە بە لایاندا. هەموو پەیوەندییەکانم پچڕاندن و تەواو.

سۆنیا دەتگوت تاساوە. واقووڕ پرسیی:

– ئاخر بۆچی پشتت تێ کردن؟

دواهەمین دیداری لەگەڵ دایک و خوشکی ڕاسکۆلنیکۆفدا کاریگەرییەکی قووڵ و نائاسایی خستبووە سەری کە نەیدەتوانی بڵێت

کتومت چییە. بیسـتنی هەواڵی ئەم جیابوونەوەیە ترسـێکی بێڕادەی خستە دڵییەوە.

ڕاسکۆڵنیکۆف درێژەی پێ دا:

– ئێسـتە تەنیا تۆم هەیت. وەرە با پێکەوە بڕۆین... تەماشـا، بە پێی خۆم هاتوومە شـوێنت. ئێمە هەردووکمان نەفرەتلێکراوین و پێکەوە دەڕۆین!

چاوەکانی بریقەیەکی شـێتانەیان هەبوو. دەتگوت شـێت بووە، سۆنیاش ئەم فیکرەی بە مێشکدا هات و تاساوانە پرسیی:

– بۆ کوێ بچین؟

جا نائاگایانە لە ترسان هەنگاوێک کشایە دواوە.

– چووزانم؟ ئەوەندە دەزانم هەردووکمان ڕێگەیەکمان بۆ ماوەتەوە، هەر ئەوەندە! هیچی تر نازانم. یەک ئامانجمان هەیە هەردووکمان!

سـۆنیا تەماشـای ئەوی کرد و هیچی لە قسـەکانی هەڵنەکڕاند. تاکە شـتێک کە تێی دەگەیشـت ئەوە بوو کە ئەو بە شـێوەیەکی تۆقێنەر خەمناک و چارەڕەشە.

– هیچ کەسـێک لە قسـەت تێناگا. بۆ هەر کەسـێکیشـی بکەی هەر تێناگا، وەلێ من تێدەگەم. پێویسـتیم پێتە و هەر لەبەر ئەوەش هاتووم بۆ لات.

سۆنیا لەژێر لێوەوە گوتی:

– تێناگەم...

– دواتر تێدەگەی. بۆ مەگەر خۆت بێ لەمە هیچی ترت کردووە؟ تۆش توانیت هەنگاوی کۆتایی بنێی، هەنگاوێکی درێژتر بنێی و توانای ئەوەشـت لە خۆتدا بینی. تۆ دەسـتت چووە ژیانی خۆت و هەرچۆنێ

بووه ژیانێکت لەنێو برد، *ژیانی خۆت*، هەر ئەوەیە دەی، جیاوازیی نییە! دەتتوانی ژیانێکی مەعنەوی و لەســــەر بنەمای ئەقڵ و لۆژیکت هەبێ، وەلێ ئێستە ئاقیبەتەکەت دەبێتە سووڕانەوە بە سێنایادا... نا، تۆ ناتوانی بەرگە بگری و ئەگەر بە تەنیا بمێنییەوە، ڕێک وەک من شــێت دەبی. خۆ هەر ئێستەش کەم شێت نیی! کەواتە دەبێ پێکەوە و بە یەک ڕێگەدا بڕۆین. وەرە، وەرە با پێکەوە بڕۆین!

– بەس بۆچی؟ بۆچی ئەم قسانە دەکەن؟

قسەکانی ڕاسکۆڵنیکۆف بە شێوەیەکی تۆقێنەر سۆنیایان هەژاند و خستیانە دڵەڕاوکێوە.

– چی بۆچی؟ لەبەر ئەوەی ناتوانی لەم دۆخەدا بمێنیتەوە، گۆڕینی لە نانی ئێوارەش پێویســــتترە بۆ تۆ؛ ئەوەش هۆکارەکەی! ئیتر کاتی ئەوەیە ڕووبەڕووی هەندێ پرسـی جددی و ڕاسـتەوخۆ ببیتەوە، نەک لەبری ئەوە وەک منداڵ فرمێســـک بڕێژی و هاوار بکەی کە خواوەند ناهێڵێ! ئەی ئەگەر ناچار بین ســەرلەبەیانی پەلکێشـی نەخۆشـخانەت بکەن؟ ئەوە کاترینا ئیڤانۆڤناش شـێتێکە بۆ خۆی و سـیلیش زۆری بۆ هێناوە. هاکا نەجاتی بوو. ئەی ئەوســـا منداڵەکان چییان لێ دێ؟ وا دەزانی پۆلینکا تیا ناچێ؟ بۆ خۆت بەو شـــەقامانەدا ئەو منالانەت نەدیون کە دایکیان دەیاننێرن بۆ دەرۆزەکردن؟ لە من بپرســـە کە ئەو دایکانە لە کوێ و لە چ ژینگەیەکدا دەژین. بۆ مەگەر منال دەتوانێ لەو شـــوێنانەدا بە منالی بمێنێتەوە و منالییەتیی خۆی بکا؟ کە پێ دەنێنە حەوت ســـاڵییەوە ئیتر لەدەســـت دەردەچن، شـــەرمیان دەشـــکێ و دەستیشیان پیسە. بەس خۆ، خۆت باشتر دەزانی کە منالەکان هێمای مەسیحن لەسـەر زەوی و *عەرشـی خوا هی ئەوانە*[1]. ئەوان فەرمانیان

---

[1]. ئاماژەیە بۆ بەشـی بەناوبانگی *ئینجیلی مەرقوس*: جا منداڵە بچووکەکانیان هێنانە لای ئەو تا دەسـتیان لێ بدات، وەلێ شـاگردان، ڕێیان لێ دەگرتن. عیسـا کە ئەمەی

بە ئێمە کردووە کە خۆشـــمان بوێن و حورمەتیان لێ بنێین، لەبەر ئەوەی منداڵەکان داهاتووی مرۆڤایەتین...

– کەواتە... ئاخر دەبێ چی بکەین؟ یانی دەتوانین چی بکەین؟

ســـۆنیا تووشـــی هەڵمەتێکی تونـدی گریـان بووبوو و بەدەم شـلەژانێکی بەردەوامەوە فرمێســکی دەڕشــت و دەســتەکانیی لێک دەئالاندن.

– دەپرســی دەبێ چی بکەین؟ دەبێ ئەوە بشـکێنی کە دەشـکێ، بە یەکجاری و بۆ تاهەتا! دەبێ هەموو ئازار و ئەشـکەنجەکەشـی بگریتە ئەسـتۆ. چییە، تێناگەی؟ دواتر تۆش تێدەگەی... ئازادی و دەسـەڵات گرنگن! ئەوەی کە لە هەموو ئەم ئـافرێنـدراوە لەرزۆک و تۆپەڵە مێروولانە بەهێزتر بێ! مەبەست و ئامانج ئەمەیە، بیرت نەچێ! ئەمەش دواهەمین ئامۆژگاریی منە بۆ تۆ! لەوانەیە ئەمە دواهەمین جار بێ کە قسـەت لەگەڵ دەکەم. گەر سـبەی دیار نەمام، هەموو چیرۆکەکەت بە گوێ دەگاتەوە و ئەوسـا دواهەمین قسـەم بیر خۆت بێنەوە! دواجار ڕۆژگارێک، دوای تێپەڕینی سـالانێک، تۆش لە مانای قسـەکانم تێدەگەی. ئەگەریش سـبەی هاتمەوە، خۆم پێت دەڵێم کێ لیزاڤێتای کوشت. لای تۆ خۆش!

سۆنیا لە ترسان سەراپای هەڵدەلەرزی:

– چۆن... بۆ دەزانی کێ لیزاڤێتای کوشتووە؟

جەسـتەی لە ترسـان بەسـتبووی و بە بارێکی شـێتانەوە سـەیری ڕاسکۆڵنیکۆفی دەکرد.

---

بینی، بە توورەییەوە بەوانی گوت: *لێگەڕێن منداڵە بچووکەکان بێنە لام و ڕێیان لێ مەگرن، ئاخر مەلەکوتی خوا هی ئەوانە.* «و. ف»

– دەزانم کێ لیزاڤێتای کوشــت و پێت... دەڵێم، تەنیا بە تۆ! من تۆم هەڵبژاردووە. بۆ داوای لێبوردن نایێمە لات، تەنیا دەمەوێ قسـە بکەم. بڕیارەکەم هی ئەمڕۆ و دوێنێ نییە، دەمێکە تۆم دیاری کردووە، هەر لەو کاتەوەی کە باوکت باســی بۆ کردم و لیزاڤێتاش هێشــتا زیندوو بوو، بیرم لێ کردەوە. ماڵئاوا، پێویست ناکا تۆقەش بکەی. سبەی!

ڕاسکۆڵنیکۆف لە ژوورەکە هاتە دەر. سۆنیا بە درێژایی ئەو ماوەیە بە جۆرێک لێی دەڕوانی وەک ئەوەی شــێتێکی پەتپســێن لەبەردەمیدا ڕاوەستابێت، بەڵام ئەو خۆیشی دەتگوت شێت بووە، هەستی بە شێتی دەکرد و ســەریشــی دەســووڕا: *خوا هاوار، خوایە! ئاخر ئەو چۆن دەزانێ کێ لیزاڤێتای کوشتووە؟ زۆر ترسناکە!*

بەڵام کە ئەمەی گوت، *ئەو بیرکردنەوەیە* تەنانەت بۆ چرکەساتێکیش بە زەینیدا ڕانەبرد، تەنانەت یەک چرکەســاتیش! *ئۆو، ئێســتە چەندە تۆقێنەر هەســت بە چارەڕەشــی دەکا ئەم پیاوە بێنازە!... خۆ پشــتی کردووەتە دایک و خوشکیشی... ئاخر بۆچی؟ تۆ بڵێی چی بووبێ؟*

ئەی ئێســتە کە هاتبووە لای ئەو، نیازی چی بوو؟ چ نەخشــەیەکی هەبوو؟ چیی گوت؟ پێی ماچ کردبوو و گوتبووی... گوتبووی –بەڵێ، ئەم بەشەی قسەکەی زۆر ڕوون بوو– بەبێ ئەو ناتوانێ بژی.. خوایە، هانا بۆ تۆ!

ســۆنیا ئەو شــەوەی بەدەم لەرز و تاوە بەســەر برد. جاروبار لە خەو ڕادەچڵەکی، دەگریا، دەســتەکانیی لێک دەئاڵاندن و هەمدیســان خەوێکی تادار دەیبردەوە. خەونی بە پۆلینکا و کاترینا ئیڤانۆڤنا و لیزاڤێتاوە دەبینی، خەونی بە خوێندنەوەی ئینجیل و *ئەو*... ئەو بەو ڕووخسارە ڕەنگپەڕیو و چاوە داگیرساوانەیەوە... کە خەریک بوو پێی ماچ دەکرد و دەگریا.

لەپشت ئەو دەرگەیەی لای دەستەڕاستەوە، کە ژوورەکەی سۆنیای لە ئەپارتمانی خاتوون گێرترۆدا کالاونا ڕێسـلیخ جیا دەکردەوە، ژوورێـک هەبوو کە دەمێـک بوو هەر وا بە چۆڵی مـابووەوە. ئەم ژوورەش بەشـێک بوو لە ئەپارتمانی خاتوو ڕێسـلیخ و ئەویش بە کرێی دەدا و بۆ ئەم مەبەستەش ئاگادارییەکی بە دەرگەی سەرەکییەوە لکاندبوو و کاغەزێکیشـی لە یەکێک لە پەنجەرەکەلی ڕوو لە ڕێژاوەکە دابوو. سـۆنیا بە چۆڵیی ئەم ژوورە ڕاهاتبوو و هەر وای بۆ دەچوو کەسی تێدا نەبێت، وەلێ بەڕێز سڤیدریگایلۆڤ بە درێژایی ئەم ماوەیە لەپشـت دەرگەی ئەو ژوورە خـاڵییەوە گوێی هەڵخسـتبوو. کە ڕاسکۆڵنیکۆف ڕۆیشت، لە شوێنی خۆی نەجوولا و ماوەی خولەکێک بیری کردەوە، پـاشـان بە پـادزە چووە ژوورەکەی خۆی کە دیواربەدیواری ژوورە خاڵییەکە بوو و کورسییەکیشی هێنا و بێدەنگ بردی و لەتەک دەرگەی هاوبەشـی نێوان ئەو ژوورە و ژوورەکەی سـۆنیاوە داینا. گفتوگۆی نێوان ئەو دووانەی فرە سـەرنجڕاکێش و هاوکات یارمەتیدەر هاتبووە بەرچاو و بە بیسـتنی چێژێکی زۆری بردبوو، قسـەکانیان هێندە بۆ ئەو چێژبەخش بوون کە کورسـییەکەی هێنا تا لە داهاتوویەکی نزیکدا، بۆ نموونە سـبەینێ، ناچار نەبێ یەک کاتژمێری تەواو بە پێوە ڕابوەسـتێت و بتوانێت بە ئاسـوودەیی دابنیشێت، گوێ بگرێت و لە هەر لایەنێکەوە چێژێکی تەواو ببات.

## پێنج

راسکۆلنیکۆف سەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر، ڕێک کاتژمێر یازدە خۆی بە بەڕێوەبەرایەتیی لێکۆڵینەوەی تاواندا کرد و گوتی بە پۆرفیری پیترۆڤیچ ڕابگەیەنن کە فلانە کەس هاتووە، وەلێ شتێک کە بووە مایەی سەرسوورمانی ئەوە بوو کە زۆریان ڕاگرت و لانیکەم دە خولەکێکی خایاند تا بانگیان کرد. چاوەڕێ بوو بە سەریدا بدەن، بەڵام بە پێچەوانەوە، لە ژووری چاوەڕوانیدا هەر وا بە تەنیا مایەوە و کەسانێک کە هیچ پەیوەندییەکیان بەوەوە نەبوو، بەدوای یەکدا ئامۆشۆیان بوو. لە ژوورەکەی تەنیشتدا کە پێدەچوو نووسینگە بێت، چەند سەرقەڵەمێک خەریکی نووسین بوون و پێدەچوو هیچ زانیارییەکیان لەسەر ئەوە نەبێت کە راسکۆلنیکۆف چ کارەیە و کێیە! راسکۆلنیکۆف نارەحەت و بەدگومان سەیری چواردەوریی کرد و دەیویست بزانێت نەکا پاسەوانێک یان چاودێرێکی تەلیسماوییان بۆ دانابێت کە نەهێڵێت لە کاتی خۆیدا بۆی دەربچێت. وەلێ بە ڕواڵەت شتی وا لەئارادا نەبوو: تەنیا و تەنیا سەرقەڵەمەکانی بینین کە خەریکی کاغەزبازیی بێبایەخ بوون و چەند کەسێکی دی، کە هیچ کامیان هەر حسێبیشیان بۆ نەدەکرد، دیار بوو کە مانەوە و ڕۆیشتنی هیچ جیاوازییەکی بۆ ئەوان نەبوو و دەیتوانی ملی ڕێ بگرێتە بەر و کوێی پێ خۆشە بۆی بچێت. لەگەڵ تێپەڕینی هەر ساتێکدا زیاتر لەوە بێخەم دەبوو کە ئەو کابراڵە تەلیسماوییەی دوێنێ –تارماییەک کە دەتگوت لەژێر زەوییەوە هەڵتۆقیوە– ئەگەر بە ڕاستی هەموو شتێکی دیتبووبا، ئێستە ڕێی تێنەدەچوو لێگەڕێن ئەو هەر وا سووک و ئاسان

به کەیفی خۆی بگەڕێتەوە و بەو ناوەدا بســـوورێتەوە. ئاخر نەدەکرا هەموو شـــتێک بزانن، کەچی لێگەڕێن تا کاتژمێر یازدە ئەو خنەخن بە ئارەزووی خۆی دەرکەوێت؟ ئەمە لە دوو حاڵەت بەدەر نەبوو: یان ئەو کابرالەیە هێشتا ڕاپۆرتی لەسەر نەدابوو یان ئەوەی کە... ئەسڵەن نە هیچی دەزانی و نە هیچیشـــی بینیبوو –ئاخر چۆن ڕێی تێدەچوو بینیبێتی؟– جا پێشـــهاتەکانی پێرێ هەمووی کۆمەڵێک وەهم بوونە کە زەینی نەخۆش و گوشـــارلەســـەری ئەو گەورەی کردوون. تەنانەت دوێنێ لە ترۆپکی بێهیوایی و تۆقینیشـــدا ئەم ســـۆســـەیەی دوایی لە زەینیدا ورووژابوو. هەمدیســـان لە زەینی خۆیدا بە هەموو شـــتێکدا چووەوە و خەریـک بوو ئـامـادەی جەنگێکی تـازە دەبوو کە کتوپڕ تێگەیشـت تووشـی لەرز بووەتەوە. تەنانەت بیرکردنەوە لەوەش کە لە ترســـی پۆرفیری پیترۆڤیچی ناپیاو و چەپەڵدا لەرزی لێ هاتووە، زۆر لە بەردڵی گران کەوت و خەریـک بوو هەڵبچێت. تۆقێنەرترین کاری دونیـا ئەوە بوو کە بیەوێـت هەمـدیســـــان چـاوی بەو بوودەڵەیە بکەوێتەوە. هەتا بڵێیت لێی بێزار بوو و دەشـــترســـا ئاشکرای بکات. بەڵام تووڕەییەکەی لە ئاستێکدا بوو کە دەستبەجێ لەرزەکەی پاشـــەکشـــەی کرد. ئامادە بوو بە ڕووڵەتێکی ســـارد و لووتبەرزانەوە بچێتە ژوور و بەڵێنی دا تـا دەکرێت دەم نەکـاتەوە و تەنیا ســـەیر بکـات و گوێ بگرێـت و لانیکەم ئەم جـارەیـان جڵەوی مێشکی شێواو و گۆشـارلەسـەری بگرێتە دەست و هەرچۆنێک هەیە، هەوســـارەکەی لە دەســـتی خۆیدا بهێڵێتەوە. هەر لەم بێنەوبەرەیەدا بانگیان کرد تا بچێتە نووسینگەکەی پۆرفیری پیترۆڤیچ.

دەرکەوت جەنابی پۆرفیری پیترۆڤیچ لە نووســـینگەکەیاندا تەنیان. نووســـینگەکە، ژوورێـک بوو نە زۆر گەورە و نە زۆریش بچووک؛ مێزێکی گەورەی نووسینی لێ بوو کە خستبوویانە بەردەم قەنەفەیەکی ڕووکێشمشـــەمایی، دۆلابێکی چەندچەکمەجەیی و کتێبخانەیەکیش لە

لایەکی ژوورەکەوە بوون و چەند کورسییەکیش، کە گشتیان لە تەختەی زەردی بریقەدار و بەشێک بوون لە موڵکی میری. لە سووچێکی دیواری ئەوپەڕی ژوورەکەوە یان باشترە بڵێین باریکەدیواری ئەوسەری ژوورەکە، دەرگەیەکی داخراوی لێ بوو کە بێگومان لە پشتییەوە ژووری دیکەشی لێ بوو. پۆرفێری پیترۆڤیچ لەگەڵ هاتنەژوورەوەی ڕاسکۆڵنیکۆفدا دەرگەکەی بە دوایدا پێوەدا و تەنیا مانەوە. پۆرفێری بە ڕووی کراوە و خۆشەویستییەکی بە ڕواڵەت ڕاستەقینەوە بەخێرهاتنی میوانەکەیی کرد و دوای تێپەڕینی چەند خولەکێک جا ڕاسکۆڵنیکۆف توانیی نیشانەگەلی پەشۆکاوییەکی ناڕوون لەودا بەدی بکات. وا دیار بوو پۆرفێری کتوپڕ پەشۆکاوە یان لە گەرمەی کارێکی نهێنی و گرنگدا بە سەریدا هاتوون و ئێستەش وا سەراسیمە بووە.

– ئاە، ئەی هاوڕێی ئازیزتر لە گیان! دواجار تەشریفتان هێنا... بۆ بارەگەکەی ئێمە...

پۆرفێری سەری قسەی کردەوە و هەردوو دەستی بەرەو ڕاسکۆڵنیکۆف درێژ کردن.

– فەرموون، دانیشن کاکە گیان... نەکا کەیفتان بەوە نەیێ کە بە *هاوڕێی ئازیزتر لە گیان* و... *کاکە گیان* بانگتان بکەن؟ لەم کاتانەدا فەڕەنسییەکان دەڵێن tout court، یان هەر سادە و خۆمانە بین باشتر نییە؟ تکام وایە بە بێڕێزی لێک نەدرێتەوە... فەرموون دانیشن... ئەوەش قەنەفەی ڕێکوپێکی بەندە...

ڕاسکۆڵنیکۆف دانیشت. بە درێژایی ئەو ماوەیە نیگای لە پۆرفێری لا نەدابوو. گوتنی *بارەگەی ئێمە* و داوای لێبوردنی لەبارەی خۆمانەیبوون و منگەمنگە فەڕەنسییەکەی، هەرهەموو تایبەتمەندییە کەسییەکانی ئەویان ئاشکرا دەکرد. ڕاسکۆڵنیکۆف کەوتبووە

گومانەوە: *هەردوو دەستی بەرەو لام درێژ کرد، کەچی دەستمی نەگرت و لە ساتی کۆتاییدا کشاندییەوە...* هەردووکیان بە نیگا خەریکی پشکنینی یەکدی بوون و ئەو ساتەش کە نیگایان گیرایە یەکدی، وەک برووسکە ڕوویان وەرگێڕا.

– ئەو نامەیەم بۆ هێناون... لەبارەی کاتژمێرەکەوە... فەرموون قوربان. ئاوها باشە یان هەمدیسان بینووسمەوە؟

– چی؟ نامە؟ ئەها، بەڵێ، بەڵێ... خەمتان نەبێ، باشە، باشە...

پۆرفیری پیترۆڤیچ دەتگوت تووشی شڵەژان بووە. سەرەتا پەلەپەل شتگەلێکی ڕیز کرد و پاشان نامەکەی وەرگرت و سەیرێکی کرد.

– بەڵێ، کێشەی نییە. هیچی دیکە پێویست نییە.

بە هەمان شڵەژان و پەلەپەلییەوە قسەکەی تەواو کرد و نامەکەی خستە سەر مێزەکەی.

خولەکێک تێپەڕی، هێشتا خولەکێک تێنەپەڕیبوو، بەدەم هەڵگرتنی نامەکە و خستنەناو چەکمەجەوە، خەریک بوو باسی ئاسمان و ڕیسمانی دەکرد.

ڕاسکۆڵنیکۆف دووبارە دەستی پێ کردەوە:

– وا بزانم دوێنێ گوتتان دەتانەوێ چەند پرسیارێکم لێ بکەن... جا فەرمیش... لەبارەی ئاشناییم لەگەڵ... ئەو پیرێژنەی کە کوژرا.

کتوپڕ وەک برووسکە بە زەینیدا هات کە باشە بۆچی گوتم *لام وایە؟* دووەمین برووسکەش بەدوای ئەودا هات: *ئەی بۆچی دەبێ لەبەر گوتنی یەک لام وایە ئاوها بشڵەژێم؟*

جا کتوپڕ ئەوەی بە دڵدا هات کە ئەو بێمتمانەیی و گومانەی لەو پەیوەندییە کورتە لەگەڵ پارفیرێدا –چەند وشەیەک لە ماوەی دوو

خولەکی ئەو دیدارەدا– هەستی پێ کردبوو، لە چاوترووسکانێکدا شێوەیەکی دێوئاسای وەرگرتبوو و دەکرا گەلێک مەترسیدار بێت. مێشکی جام بوو و هەر ساتەو زیاتر هەڵدەچوو: *ئای لەو نەگبەتییە! تووشی چ نەگبەتییەک بووین! ماکا کەتنەکەم دا!*

پۆرفێری پیترۆڤیچ لەژێر لێوەوە گوتی:

– بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ! خەمتان نەبێ، هیچ پەلەمان نییە!

پۆرفێری بێئامانج پێش و پاشی دەکرد و بە دەوری مێزەکەدا دەخولایەوە، وەک ئەوەی تەنیا بیەوێت خۆی بگەیەنێتە پەنجەرەکە و لە پەنجەرەکەشەوە بگەڕێتەوە بۆ لای مێز و چەکمەجەکان؛ هەندێک جار نیگای لە سەرنجی پڕگومانی ڕاسکۆڵنیکۆف دەدزییەوە و بڕێک جاریش ڕادەوەستا و بە دەموچاویدا واق دەبوو.

لە کاتی ئەو سووڕانەوەیەیدا، قەلافەتی بچووکی خڕوخەپی، وەک شتێکی سەیروسەمەرە دەهاتە بەرچاو و چون تۆپێکی بچکۆلەی لێ هاتبوو کە بە گشت لایەکدا خل دەبێتەوە و بەر دار و دیوار و سووچەکان دەکەوێت و هەمدیسان دەگەڕێتەوە.

– هیچ پەلەیەکمان نییە و کاتیش زۆرە! جگەرە؟ یان لەوانەیە خۆتان پێتان بێ؟ فەرموون، لەم جگەرە هەرزانانەی ئێمە بکێشن...

پۆرفێری فەرمووی جگەرەیەکی لە میوانەکەی کرد و درێژەی پێدا:

– من ئێستە لێرە لە خزمەتتاندام، وەلێ خۆی ئەپارتمانەکەم لەولایە، لەپشت ئەو باریکە دیوارەوە. ئەپارتمانەکەم دەوڵەت پێی داوم، ئیتر ئەمەش لە سەربەشییەکانی[1] پیشەکەی ئێمەیە. بەس هەنووکە لە دەرەوەی بەڕێوەبەرایەتیدا دەمێنمەوە، ئاخر دەبێ سەرەتا دەستێ

---

[1] سەربەشی: سەرپشکی: ئەو بەشە زیادانەی کە بەهۆی بارودۆخی تایبەتییەوە بە مووچەخۆر دەدرێن.

بیرەدا بهێنم... خۆ خانووی بەلاشیش شتێکی باشە، وایە؟ ڕای ئێوە چییە؟

ڕاسکۆلنیکۆف وەڵامی دایەوە.

– بەڵێ، شتێکی باشە.

جا تەماشایەکی پارفیریی کرد کە ئاماژەیەکی گاڵتەجاڕانەشی تێدابوو.

– شتێکی باشە، زۆریش باشە...

پۆرفیری پیترۆڤیچ هێشتا هەر خەریکی پاتەکردنەوەی ئەم دوو وشەیە بوو، وەلێ بە جۆرێک وەک ئەوەی هاوکات بیری لە هەزار شوێنی دیکەش بێت. دواجار بە دەنگی بەرز گوتی *بەڵێ، هەر بە ڕاستی شتێکی باشە*، جا هێندەش بەرز کە دەکرا بڵێیت، خەریکە هاوار دەکات. پاشانیش کتوپڕ چاوی بڕییە ڕاسکۆلنیکۆف و ڕێک لە دووریی دوو هەنگاوێکەوە ڕاوەستا.

ئەم هەموو زۆرلەخۆکردن و دووبارەکردنەوە گەمژانەیەی بابەتی خانووی بەلاش و سەربەشیی پیشەیی نایاب بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ئەو نیگا جددییەدا نەدەهاتەوە کە پۆرفیری میوانەکەی پێ بەگیر دەهێنا.

بەڵام ئەمە تەنیا ئاگری تووڕەیی ڕاسکۆلنیکۆفی کڵپەدارتر کرد، نەیتوانی بەر بە خۆی بگرێت و دەستی بە ململانێیەکی ناڕاستەوخۆ و بە گشتی بێباکانە کرد:

– ئەری دەزانن...

بێ پێشەکی چووە سەر پرسیارەکەی، کەم تا زۆر بوێرانە لە پارفیریی دەڕوانی و چێژێکی زۆری لە بوێرییەکەی دەبرد:

– لام وایە بنەمایەک هەیە یان جۆرە نەریتێکی یاسایی لەنێوان لێکۆڵەر و شتدا کە زۆر لە دوورەوە بە خستنەبەرباسی بابەتێکی بێبایەخ و پڕوپووچ یان لانیکەم جددی وەلێ ناپەیوەست، دەست بە هێرش دەکەن تا گومانی ئەو کەسە برەوێننەوە کە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکرێ یان هۆشی بە لاڕێدا ببەن تا هیچ ئامادەکارییەکی نەبێ و بە جۆرێ لە جۆرەکان لە چەک دابماڵرێ. جا لەو کاتەشدایە کە گورزێکی نازداری لێ دەوەشێنن و پرسیارە چارەنووسساز و ترسناکەکەی بە سەردا دەکوتن. ڕاست ناکەم؟ بە هەڵەدا نەچم لە هەموو کتێب یان ڕێکارەکانتاندا باس لەمە کراوە، وایە؟

– بەلێ، بەلێ... بەس نەکا واتان زانیبێ لەبەر ئەوەیە کە باسی خانووی بەلاش و ئەمانەم هێنایە ناوەوە... ها؟

پۆرفێری پیترۆڤیچ چاوەکانیی زیت کردنەوە و چاوێکیشی داگرت. بریقەیەکی شاد و زیانەخرۆیانە کەوتە ڕووخسارییەوە: چرچەکانی تەوێڵی کرانەوە و چاوە بچووکەکانی گەشانەوە. وەک ئەوە وابوو لەناکاوێکدا هێڵەکانی ڕووخساری بەرین بووبن و کتوپڕ لە قاقای پێکەنینی دا، پێکەنینێکی درێژ و شێتانە. سەراپای لەتاو هەیەجان و پێکەنین هەڵدەلەرزی و هاوکات واقی بە ڕاسکۆڵنیکۆفدا وڕمابوو. ڕاسکۆڵنیکۆفیش بە زۆر پێکەنی، بەڵام کاتێک بینیی پۆرفێری بە بیستنی قسەکەی ئەو بە جۆرێک لە قاقای پێکەنینی داوە کە خەریکە ڕەش داگەڕێت، هەستی قێزکردنەوە و قەڵسی بەسەر پارێزەکەیدا زاڵ بوو. وازی لە پێکەنین هێنا، ڕووی گرژ کرد، بە ڕقەوە چاوی لە پۆرفێری بڕی و بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە ئەو دەسنەنقەست پێکەنینەکەی درێژ دەکردەوە، چاوی لێ هەڵنەگرت. دەتگوت هەردووک لا پارێزیان وەلا ناوە: پۆرفێری پیترۆڤیچ وەک ڕۆژی ڕۆشن بە میوانەکەی پێدەکەنی و دیار بوو ئەسڵەن نارەحەتی و پەستبوونی ئاشکرای میوانەکەی بە لاوە گرنگ نییە. نارەحەتنەبوونی پۆرفێری

لەو دۆخەدا بە لای ڕاسـکۆلنیکۆفەوە خاڵێکی گرنگ بوو، بیری هاتەوە کە پۆرفیری پیترۆڤیچ پێشتریش هیچ نارەحەت نەبووە و ئەو، جەنابی کاکە ڕاسـکۆلنیکۆف، بە ئەگەرێکی بەهێز ڕێک کەوتووەتە ناو داوی ئەوانەوە. لەم نێوەندەدا شـتێک لەئارادا بوو کە ڕاسـکۆلنیکۆف لێی بێئاگا بوو، مەبەسـت و ئامانجێک لەپشـت ئەم مەسـەلەیەوە بوو... پێشدەچێ هەموو پارچەکان لە شوێنی خۆیاندا بن و بڕیاریش بێت تا خولەکێکی دیکە پەردە دابدرێتەوە و دونیای بەسەردا وێران ببێ...

ڕاسـکۆلنیکۆف هەسـتایەوە و کڵاوەکەیی هەڵگرت و ڕێک چووە سەر مەبەستی سەرەکی:

– پۆرفیری پیترۆڤیچ...

پتەو دەسـتی بە قسـەکەی کرد، گەرچی بە تەواویش لە قسـەکەیدا تووڕەیی بەدی دەکرا.

– دوێنێ فەرمووتـان حەز دەکەن من سـەرتـان لێ بـدەم بۆ لێکۆڵینەوە...

بە جەختلەسـەرکردنەوەیەکی زۆرەوە گوتی *لێکۆڵینەوە* و درێژەی پێ دا:

– دەی، منیش هاتوومەتە خزمەتتان. ئێستە ئەگەر دەتانەوێ شتێکی تایبەتم لێ بپرسـن، فەرموون دەی! ئەگەریش داوایەکی تایبەتیتان نییە لێگەڕێن بڕۆم، چونکە کـاتێکی وام بەدەسـتەوە نییە... دەبێ بچمە ڕێوڕەسمی ناشتنی ئەو پیرەمێردە چارەڕەشەی کە گالیسکە کردی بە ژێرەوە... خۆشتان... دەیناسن و ئاگادارن...

هێشـتا دواهەمین ڕسـتەی تەواو نەکردبوو لەوە پەسـت بوو کە بۆچی وای کردووە و جا لەوەش کە پەست بووە، زیاتر تووڕە بوو:

– ئیتر تاقەتی ئەم شـــتانەم نەماوە، تێدەگەن؟ شـــتەکە تازە نییە، دەمێکە حـاڵم خراپە!... هەر لە بنەڕەتەوە نەخۆشـــییەکەم لەبەر ئەم شتانە بووە!... بە کورتییەکەی...

قیڕوهووڕی چووبووە ئاســـمان، هەســـتی دەکرد نەدەبوو باســـی نەخۆشی بهێنێتە ناوەوە... نا، ئێرە شوێنی ئەم قسانە نەبوو...

– بە کورتییەکەی، تکایە یان لێکۆڵینەوەکەتان بکەن یان هەر ئێستە واز بێنن و لێگەڕێن بڕۆم... وەلێ گەر بڕیـارە لێکۆڵینەوەم لەگەڵ بکرێ، تکایە با ڕێکوپێک و بەپێی ڕێکار بێ! ڕێ نادەم بە جۆرێکی تر بێ، کەواتە لای تۆ خۆش، چونکە ئێمە وا دیارە بەم جۆرە هیچ بە هیچ ناکەین.

– خوایە گیان! ئێوە چیتا لێ قەوماوە، ئەم قســانە چین؟ من چی لە ئێوە بپرسم ئاخر؟

دەنگ و تەنانەت ڕوواڵەتی پۆرفیری پیترۆڤیچ زەوی تا ئاســـمان گۆڕابوو. ئیدی هیچ حیلکەحیلکێک لەئارادا نەبوو. ســـەرلەنوێ دەســـتی کردەوە بە جرتوفرت بەمســـەر و بەوســـەردا. شـــڵەژاوانە بە دەوری ڕاسکۆڵنیکۆفیشدا دەسووڕایەوە و بە پەلەپرووزێ هەوڵی دانیشاندنیی دەدا:

– ئاخر پەلەتان چییە، خۆ هیچ پەلەیەکمان نییە، ئەم قســـانە هیچ بایەخێکیان نییە و تەنیا هەڵیتوپەڵیتن! نازانن چەندە دڵخۆشـــم کە دواجار ســـەرێکتان لێ دام... ئێوە لێرە تەنیا میوانی منن! بە گەورەیی خۆشـــتـان بمبوورن بۆ ئەو پێکەنینە نەفرەتییە جەنـابی ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچ، ڕامانۆڤیچ؟ ڕێکم گوت؟... من زوو دنە دەدرێم، ئێوەش بەو ئـامـاژەپێکردنە وردەتـان خراپ ختووکەتـان دام... بـاوەڕ بفەرموون، ماوەیەکە وەک ئەوەی کەڵەکێک بڕووخێ دەدەمە قاقای پێکەنین و نیو کاتژمێرێ دەحیلکێمەوە... دەترسم لە کتوپڕێکدا ناوسکم ببڕێ و بمخا.

تکا دەکەم فەرموون دانیشن، ئەی بۆچی ڕاوەستاون؟... گەر دانەنیشن وا تێدەگەم لێم قەڵسن!

ڕاســـکۆڵنیکۆف ورتەی لێوە نەهات. تەنیا لە پارفیڕیی دەڕوانی و گوێی دەگرت، هێشتا هەر وا تووڕە و مڕومۆن بوو. دواجار دانیشت، بەس کڵاوەکەی هەر وا بەدەستییەوە بوو.

– با شتۆکەیەکتان لەبارەی خۆم و، وەک دەڵێن، کەسایەتیمەوە بۆ باس بکەم، جەنابی ڕاسکۆڵنیکۆفی ئازیز!

پۆرفیڕی پیترۆڤیچ درێژەی بە قسەکەی دا. هاوکات خەریک بوو بە ژوورەکەدا دەســـووڕایەوە و ئەم جارەیان دەتگوت وای پێ باشـــە نیگای لە میوانەکە بدزێتەوە:

– ئاگادارن کە من سەڵتم، تۆوتۆرەمە و میراتگر و ئەمانەم نییە، نە ناوبانگێکیشــم بۆ خۆم پێکەوە ناوە و نە دونیاشــم گرتووە بە کۆڵەوە! داهاتوویێکی واشم نییە و ئیتر لێبوومەتەوە، کەوتوومەتە لێژایی و... بە کورتییەکەی، سەرنجتان داوە تا ئێستە جەنابی ڕاسکۆڵنیکۆف، کە لە ڕووســـیا و بەتایبەت لە کۆڕەکانی پیتەربورگی ئەمڕۆی ئێمەدا ئەگەر دوو کەســـی زیرەک کە لێک نزیک نین وەلێ ڕێز لە یەکتری دەنێن – وەک من و ئێوە!– دیدارێکیان هەبێ، لانیکەم نیو کاتژمێرێکی پێدەچێ تا بتوانن بابەتێ بدۆزنەوە بۆ ئەوەی قســـەی لەســـەر بکەن. بە جۆرێ لەبەرانبەر یەکتری دادەنیشـــن وەک ئەوەی لاڵ بن! وشـــک دەبن و شـەرم لە یەکتری دەکەن. هەر کەسـێ دەبینی دواجار قسـەیەکی هەیە بۆ گوتن، خاتوونەکان بۆ نموونە... یان ســـــەرزلەکان و پلەبەرزان... هەمیشـــە بابەتێکیان پێیە تا لەبارەیەوە بدوێن. هەمیشـــە هەر وا بووە، وەک فەڕەنســـییەکان دەڵێن !Cest de rigueur... کەچی کەســـانی ســـــەر بە چینی مامناوەندی وەک من و پایەبەرزتان، یان وەک دەڵێن بیرمەندەکان، تەریق دەبینەوە و زمان دەشـــکێتە دەممان... وەلێ بە

بۆچوونی ئێوە هۆکارەکەی چییە؟ بۆچی ئێمە ئاوهاین؟ یانی بابەتێک یان پرسێکی گشتیش نییە کە بۆ ئێمە جێسەرنج بێ و بمانەوێ قسەی لەسەر بکەین؟ یان لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوە بێ کە هێندە ڕاستگۆین نامانەوێ مەمکەمژە لە دەمی یەکتری بنێین؟ چی بڵێم، من تیا ماوم. ئێوە چی دەڵێن؟ ها؟ خۆ هێشتا کڵاوەکەشتان بە دەستتانەوەیە! تکا دەکەم داینێن، ئاوها وەک ئەوە وایە نیازی ڕۆیشتنتان هەبێ و من پێی نارەحەت دەبم... خۆ من، بە پێچەوانەوە، زۆر زۆر بە هاتنتان دڵخۆشم..

ڕاسکۆلنیکۆف کڵاوەکەی دانا. هێشتا بێدەنگ بوو. بە ڕووخساری جددی و ناوچاوی چرچەوە بێ ئەوەی قسەیەک بکات گوێی بۆ ورەورە ناڕوون و بێماناکانی پۆرفێری پێترۆڤیچ دەگرت. *هەر بە ڕاستی یانی دەیەوێ بەم هەڵیتوپەڵیتە گەمژانەیە هەستوهۆشم پەرت بکا؟*

پۆرفێری پێترۆڤیچ چووەوە سەر قسەکانی پێشتری:

– قاوەتان بۆ بانگ ناکەم چونکە ئێرە شوێنی ئەوە نییە. وەلێ زیانێکی تێدا نییە پێنج خولەکێ لەگەڵ هاوڕێکەتاندا بە خراپی بەسەر بەرن و جەوێک بگۆڕن! خۆتان ئاگاداری بەرپرسیارییەتییە وەرەزکەرە ئیدارییەکانن خۆ! بە ڕاست، نەکا بەوە بێزار بن کە بەردەوام هاتوچۆ دەکەم! شەرمەزارم، ببوورن ئازیزا! بە هیچ شێوەیەک نامەوێ نارەحەتتان بکەم یان لە خزمەتتاندا بێشەرمییەک بنوێنرێ... وەلێ جووڵە بۆ من لە نانی ئێواران پێویستترە. دایمە دانیشتووم و ئێستە زۆر دڵخۆشم کە دەتوانم پێنج خولەکێ بە دەوری خۆمدا بسووڕێمەوە... گیرۆدەی مایەسیریم... لە بەرنامەمدا بوو بە وەرزش چارەی بکەم. دەڵێن پلەدار و ڕاوێژکارانی سەر بە هەر پێگە و پلەیەک کە ئێوە بیڵێن دەچنە هۆڵەکانی وەرزش و هەمووشیان مەراقیان پەتپەتێنە! بەڵێ دەی... چیی پێ دەڵێن؟ شتە

سەیروسەمەرەکانی زانستی مۆدێرن... بەڵێ... بەس ئەرکی کەسیی من لێرە لێکۆڵینەوەیە و کۆمەڵێ ڕێوشـــوێنی ئیداریی وا... کە جەنـابی پایەبەرزیشـــتان ئێســـتە قســـەی لێکۆڵینەوەتان هێنایە ناوەوە. وەڵێ دەرفەت بدەن ئاماژە بە خاڵێک بکەم، جەنابی ڕاســـکۆڵنیکۆفی بەڕێز... لێکۆڵینەوە زۆربەی کات لێکۆڵەر تووشـــی ســـەرەگێژە دەکا نەک ئەو کەســـەی کە وەڵام دەداتەوە! ئێوە بە وردی و ژیری و زیرەکیی بێڕادەتانەوە زۆر لە کاتی خۆیدا ئاماژەتان بەم خاڵە کرد...

ڕاسکۆڵنیکۆف هێندەی بیری دەهات وەها ئاماژەیەکی نەکردبوو.

– ئەرێ دەی، مرۆڤ تووشـــی ســـەرەگێژە دەبێ! دایمەی خواش یەکهاوی و بە هەمان ڕیتمەوە، وەک ڕمبەڕمبی تەپڵ! هەڵبەتە هەندێ چاکســـازی لەئارادان[1]، بەس وا دیارە تەنیا بڕیارە ناونیشـــانەکان بگۆڕێن، هـاهـاهـا! بە گوتەی خۆشـــتان لەبارەی نەریت و ڕێکارە یاساییەکانی ئێمەشەوە بەو زیرەکی و هۆشیارییەتانەوە هەر ڕاستتان فەرموو و من ســـەد لە ســـەد هاوڕاتانم. هەر بەرگومانێکی عەوامیش بێ، تەنـانەت گەر لەو جووتیـارە دەبەنگـانەش بێ، دەزانێ لێکۆڵەران ســـەرەتا بە شـــتگەلێکی ناپەیوەســـتەوە دەســـت پێ دەکەن تا بەرانبەرەکەیـان *لە چەک دابمـاڵن*. هەر بە ڕاســـت دەربڕینێکی سەنجراکێشتان بەکار هێنا! جا دواتر گورزێکی نازداری لێ دەوەشێنن، هاهاها! ئەمەش لە دەربڕینە خۆشـــەکانی ئێوە بوو، هاهاها! یانی هەر بە ڕاســـتی ئێوە واتان زانی من قســـەی خانووی بەلاشـــم... بۆ ئەمە هێنایە ناوەوە؟ هاهاها! کەسێکی قسەخۆشـن ئێوە! باشـە، باشـە! هەر لێرە کۆتایی پێ دەهێنم! ئۆو، ئێســـتە مادام قســـە هاتە ئێرە شـــتێکی تریش هەیە کە دەمەوێ پێتانی بڵێم! بەڵێ، ئاخر قســـە قســـە بەشـوێن خۆیدا دێنێ! ئێوە باسـی شـێوازی کاری ئێمەتان کرد، ئائەم لێکۆڵینەوە

[1] ئاماژەیە بە چاکســـازییە دادوەرییەکانی ســـاڵی ١٨٦٤ی ڕووســـیا لەپێناو جیاکردنەوەی سیستەمی دادوەری لە خزمەتگوزارییە سڤیلییەکان. «و. ف»

فەرمی و شتانە. بەس بۆ شێوازی فەرمیی کارەکە کەڵکی هیچ کەسێ دەگرێ؟ زۆربەی کات تەنیا خۆماندووکردنە! هەندێ جار مرۆڤ لە دەمەتەقێیەکی هاورێیانەوە زیاتری دەست دەکەوێ تا لێکۆڵینەوەیەکی فەرمی. خۆ لێکۆڵینەوەی فەرمی هەڵنایێ و هەر کات بتەوێ دەتوانی دەستی پێ بکەی. با خاڵی کۆتاییشی رابگەیەنم، باشە لە بنەرەتدا ئەم لێکۆڵینەوە فەرمییە چییە؟ خۆ لێکۆڵەر هەر وا ناتوانێ لەسەر کاری فەرمی راوەستێ! وەک دەڵێن لێکۆڵینەوە هونەرە، جا دەبێ ئازادیی کاری هونەریی هەبێ. بە کورتییەکەی شتگەلێکی وا... هاهاها!...

پۆرفیری پێترۆڤیچ بۆ خولەکێک پشووی دا. تا ئەو ساتە هەر رستەی بێسەروبەر و پووچی پێکەوە نابوو و تەنیا و تەنیا لەو نێوەندەدا یەک دوو قسەی دوودیو و ناروونی فڕێ دابوون کە دەکرا واتایەکیان هەبێت، پاشانیش هەر درێژەدان بەو چەنەبازییە بێمانایە. ئیدی هەر خەریک بوو بەو پێیە خڕوپڕە بچووکانەیەوە بە ژوورەکەدا جرتوفرتی دەکرد و سات دوای سات خێراتر هەنگاوی دەنا. چاوی بڕیبووە زەوی، دەستی راستیی خستبووە پشتی و کاتی قسەکردن بە دەستەچەپی ئاماژەی دەکرد، بەڵام ئاماژەکانی لەگەڵ ئەو قسانەدا کە دەیکردن، بە شێوەیەکی زۆر سەیر ناتەبا بوون. راسکۆڵنیکۆف کتوپڕ سەرنجی چووە سەر ئەوەی کە پۆرفیری پێترۆڤیچ بەدەم پیاسەکردن بە ژوورەکەدا، لانیکەم دوو جارێک لە نزیک دەرگەکەوە راوەستاوە و یەک خولەکێک گوێی هەڵخستووە. لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: تۆ *بڵێی چاوەڕێی چی بێ؟ چاوەڕێی چییە؟*

– راست دەکەن ئێوە! راست دەکەن...

پارفێری پێترۆڤیچ، سەرخۆشانە دەستی کردە فرەرێسی و نیگایەکی روون و سادەی گرتە راسکۆڵنیکۆف. راشکاوییەکەی چاوەڕواننەکراو بوو و بووە هۆی ئەوەی راسکۆڵنیکۆف لەرزی لێ بنیشێت و دەست و پێی کۆ بکاتەوە.

– تەواو هەقی خۆتانە بە ڕێکاری ئیداری و شـــێوەی فەرمی و گـاڵتەجـاڕانەی کـارەکـانی ئێمە پێبکەنن، هـاهـاهـا! تەکنیکە ئـاڵۆزە دەروونشـــیکارییەکانی کارەکەی ئێمە، لانیکەم چەند دانەیەکیان، زۆر زۆر گاڵتەجاڕانەن و تەنانەت لەوانەشـــە بێکەڵک بن، بەتایبەت ئەو کـاتەی کە زۆر شـــێوە فەرمییەکەی بەهەنـد وەربگیرێـت... بەڵێ... دووبارە خەریکم باسـی شێوەی کارەکە دەکەم: باشـە، وای دابنێن کە گریمانەی من ئەمەیە، یان باشـترە بڵێم گومانم کردووە کە فلانە کەس لە فلانە دۆسـییەدا لەژێر دەسـتمدایە، تووشـی تاوانێک شـتێک بووە... ئێوە خوێندکاری مافن؟ دەتانەوێ ببنە پارێزەر...

– بەڵێ، خوێندکاری ماف بووم...

– باشە، باشە، کەواتە ئەمەش وانەیەکی بچووک بۆ داهاتووی ئێوە، هەڵبەتە من حەدم نییە وانەتان فێر بکەم، جا لە بارێکدا کە ئێوە وەها گوتارێکتان لەبارەی تاوانەوە نووسـیوە و چاپیش کراوە! نا، من تەنیا لە دیدە کردەییەکەوە نموونە دەهێنمەوە. دەی، لە ئێوە دەپرسم، ئەگەر من فلانە کەس بە بکوژ دابنێم، بۆچی دەبێ لە کاتێکدا کە هێشـتا هیچ نەبووە و دۆسـیــیەکە بەرەو پێش نەچووە، بیخەمە دڵەڕاوکێوە و مێشکی تێک بدەم؟ باشە گریمان بەڵگە و شاهێد و هەموو شتێکیشمان هەبوو، ئەی ئەو پەلەیەمان لە چی؟ لەوانەشـە دۆسـییەیەک وا بخوازێ کە تا زووە کابرا دەسـتبەسـەر بکەین، بەس خۆ هەموو دۆسـییەکان وەک یەک نین! کەواتە گەر کێشـــەیەک نەبێ، بۆ لێنەگەڕێم کابرا بۆ خۆی سـووڕێک بە دەوری شـاردا بدا؟ هاهاها! وەلێ دیارە کە ڕێک لە مەبەستی قسەکەم تێنەگەیشتن، کەواتە لێگەڕێن زیاتر بیکەمەوە. ئاخر گەر هەر لە ســــەرەتـاوە بیگرم، لەوانەیە خراپتر بێ و پەنـاگەیەکی ئاکاریم بۆ دروست کردبێ، هاهاها! ئەی هاوار، ئەوە پێدەکەنن؟

ڕاســـکۆلنیکۆف لە بیری هەر شـــتێکدا بوو بێ لە پێکەنین. بە لێوی پێکگوشراوەوە بێجووڵە دانیشتبوو و دەتگوت چاوە تادارەکانیشی بە زنجیر بە چاوی پۆرفێری پێترۆڤیچەوە بەستراون.

– بەس لە ڕاســـتیدا کار دەگاتە شـــوێنگەلێ کە بۆتانم باس کرد، بەتایبەت لەگەڵ هەندێ کەسدا. دەی هەزار جۆر کەسمان هەیە، کەچی ئێمە تەنیا یەک ڕێکارمان هەیە! ئەو شتەی تر کە ئێستە خستتانە بەر باس، مەسـەلەی بەڵگەیە. وەلێ ئازیز، گریمان بەڵگەشمان هەبێ، بەس خۆ بەڵگە شـــمشـــێرێکی دوودەمە. من لێکۆڵەرم و دانی پێدا دەنێم کە منیش مرۆڤم و لاواز! دەمەوێ دۆســـییەکەم هەتا بڵێی تۆکمە بێ و هەموو شـتێکی، وەک دەڵێن، وەک هاوکێشـەیەکی بیرکاری ڕوون بێ. بەڵگەیەکم دەوێ بە ڕوونیی دوو جاران دوو یەکسـانە بە چوار، بەبێ چەندوچۆن! ئێســـتە گەر هەســـتم و هیچیهیچنەبوو بەرانبەرەکەم دەسـتبەسـەر بکەم، جا با دڵنیاش بم کە ئەو بووە، بە ئەگەرێکی زۆر هەلی شـکاندنەوەی بەڵگەکەم بەسـەر ئەودا لەکیس خۆم داوە. بۆچی؟ چونکە بەم جۆرە ئەوە منم کە دۆخەکەی بۆ دیاری دەکەم. هەلومەرجە دەروونییەکەشی ئەمەیە: یەکلاییم کردووەتەوە و هێوریشی دەکەمەوە. ئەوســـا چی دەکا؟ لە من دوور دەکەوێتەوە و دەخزێتە قەپاغەکەی خۆیەوە، دواجاریش بۆی دەسـەلمێ کە تەنیا دەسـتبەسـەر کراوە و هیچی دی. دەڵێن دوای دەسـپێکی جەنگی *ئالما*[1] خەڵکی تێکەیشـتووی *سـواسـتوپل* لەوە تۆقیبوون کە نەکا دژمن دەســـت بە هێرشـــی ڕاسـتەوخۆ بکا و لە چاوتروووسـکانێکدا شـارەکە بگرێ. وەلێ کاتێ بینییان دژمن جارێ خەریکی گەمارۆدانی شـــارە و تازە بەتەمایە

---

١. سـوپای ڕووسـیا دوای شـکسـتهێنان لە جەنگی *ئالمای کریمە* لە سـالی ١٨٥٤دا بەرەو *سـواسـتوپل* پاشـەکشـەی کرد و هێزە هاوپەیمانەکانی ئینگلیز و فەرەنسـاش شـاریان گەمارۆ دا، ئەمەش سـالێکی خایاند. کەوتنی سـواسـتوپل دوای سـالێک زیانێکی قورسی بە هەردوو نەیارەکە گەیاند. «و. ف»

خەنـدەق[1] لێ بـدا، وەک ئەوە وابوو خوا دونیـای پێ دابێ. دڵخۆش بووبوون و ئـارام، چونکە جـارێ ئیتر کـارەکە لانیکەم دوو مـانگی دەخایاند و کاتی دەویسـت تا گەمارۆدانەکە بگاتە ئەنجام. خۆ دیسـان خەریکن پێدەکەنن! باوەڕ ناکەن، ها؟ هەڵبەتە ئێوە هەقی خۆتانە، بەڵێ هەقتانە! ئەمانە نموونەگەلی زۆر تایبەتن، قەبووڵمە! وەلێ ئازیز، دەبێ ئەوەمان لە بەرچاو بێ کە ئەو دۆسـییە گشـتیانە بوونێکی دەرەکییان نییە تا لات وابێ شێوازە یاساییەکان و ڕێکار و ئەم جۆرە شتانەیان بەتایبەت بۆ ئەوانە دانابێ. بۆچی؟ چونکە هەر دۆسییەیەک، بۆ نموونە هەر تاوانێ، هەر لەگەڵ ڕوودانیدا، دەبێتە بابەتێکی تایبەت و تەنانەت هەندێ کاتیش هێندە ڕیزپەڕە کە تا ئێسـتە هاوشـێوەی ئەوە ڕووی نەدابێ، هەندێ جاریش بەسـەرهاتەکان زۆر گاڵتەجاڕانە و مایەی پێکەنین دێنە بەرچـاو. وەلێ گەر هەر وا واز لەم کـاکی بەرگومـانە بەرێزە بهێنم، زۆری بۆ نەهێنم، زووزوو بـانگی نەکەمە ئێرە و لە خۆڕا نـاڕەحەتی نەکەم و تەنیـا وا بکەم کە تێبگـا یـان لانیکەم هەر سـاتەو لە ترس و دڵەڕاوکێی ئەوەدا بێ کە من هەموو شـتێ دەزانم و شەو و ڕۆژ چاوم لەسەریەتی، بەردەوام لە باری تۆقین و دڵەڕاوکێدا دەمێنێتەوە و ئاخرییەکەی بە یەکجاری لە سەری دەدا و بە پێی خۆی دێتە لام. لەوانەشـە وا بکا کە هەموو شـتێ وەک دوو جاران دوو یەکسـانە بە چواری ڕێسـا بیرکارییەکانی لێ بێ و تەواو... باشـە چی لەمە باشـتر؟ گەر بەرانبەرەکەشـمان تەنانەت لادێی و شـتیش بێ ئەنجـامەکە هەر ئەمە دەبێ، چ جـا بگـا بە مرۆڤە تێگەیشـتووە ئەمڕۆییەکان، لەگەڵ ئەوانەدا ئیتر قسـەی تێدا نییە و بە دڵنیاییەوە سـەر دەگرێ! زۆر گرنگە هاوڕێ، کە تێبگەین بەرانبەرەکەمان ئاسـتی تێگەیشـتنی چۆنە و چەندە حاڵی دەبێ! پاشـانیش مەسـەلەی مەزاج، با مەسـەلەی مەزاجیش لەبیر نەکەین! هەموو تاوانکارەکان بە جۆرێ لە

---

٢. خەندەق: کەنەک؛ کەندە؛ کۆزک؛ تاپی؛ خەرەند؛ چاڵی درێژ و دەستکرد.

جۆرەکان نەخۆشـــن، توورە و مەزاجین!... زۆریش بەدبین! هەڵبەتە ئەمە بۆ ئێمە دەســـتکەوتە. کەواتە بۆچی خەمی ئەوەم بێ کە بەرانبەرەکەم ئازاد بێ و بۆ خۆی بە شـاردا سـەرگەردان بێ! هەقمان چییە بەسـەرییەوە؟ لێگەڕێ پیاسـەی خۆی بکا! خۆ من باش دەزانم خستوومەتە داوەکەوە و بڕیاریش نییە لە دەستم دەربچێ. کوێی هەیە تا بۆی بچێ؟ هاهاها! دەرچێ بۆ هەندەران؟ گەر پۆلەندی بێ ئەوەیان ڕێی تێدەچێ، وەلێ لێرە شـــتی وا نییە، بەتایبەت لەبەر ئەوەی من چاوی لەســەر هەڵناگرم و بۆ پارێزیش هەنگاوی پێویســت دەنێم. جا کێ ناڵێ بەرەو قووڵترین و تاریکترین کونج و کەلەبەرەکانی وڵاتەکە هەڵنایێ؟ بەس خۆ ئاگادارن کە ئەو شـــوێنانە پەناگەی موژیکەکانن، بەتایبەت موژیکە نالەبار و بێڕێزەکانی ڕووس! کەسی هێژای ئێستەیی بەبێ دوودڵی وای پێ باشـــترە بچێتە ســـووچی زیندان نەک ببێتە هاودەمی بوونەوەرگەلێکی سـەیروسـەمەرەی وەک موژیکەکانی ئێمە. هاهاها! بەس ئەمە هەمووی لاقردی و قســەی ڕواڵەتییە. ئەســڵەن کێشـە ئەوە نییە کە ئەو شـوێنێکی نییە بۆی بچێ، مەسـەلە ئەوەیە لە ڕووی دەروونشـــیکارییەوە ناتوانێ لەدەســـتم هەڵبێ، هاها! گیانم، دەروونشـــیکاری، ئای لەو زاراوەیە! بە کورتییەکەی ڕێســـاکانی سرووشت دەست و پێی دەبەستنەوە. تا ئێستە دیوتانە چۆن پەپوولە بە دەوری مۆمدا دەخولێتەوە؟ ئەویش وەک ئەو پەپوولەیە بە دەوری مندا دەخولێتەوە و دەخولێتەوە. ئازادی، بۆ ئەو گرنگییەکەی جارانی لەدەست دەدا. دایمە مێشکی جەنجاڵە، دەگیرێتە ئەم گلۆڵەیە، تا سـەر ئاستی مەرگ خۆی دەخواتەوە و پێچ دەداتە خۆی! جا خۆی بەرەبەرە مەسـەلەکە وەک دوو کەڕەت دوو یەکسـانە بە چوار لێ دەکا... تەنیا دەبێ کاتی پێویســـتی بدەینێ... بە درێژایی ماوەکەش بە دەورمدا دەخولێتەوە، نزیـک و نزیکتر دەبێتەوە و کتوپڕ دەکەوێتە داوەوە و منیش دەیکەمە پارووێکی چەور! وای چ چێژێکی هەیە! هاهاها! باوەڕ ناکەن، نا؟

ڕاســـکۆڵنیکۆف وەڵامی نەدەدایەوە. هێشـــتا هەر وا بێجووڵە و ڕەنگپەڕیو دانیشـــتبوو و بە هەمان گرژی و جددییەتی پێشـــترەوە لە ڕووخساری پۆرفیێری ڕامابوو. سەرما گیانیی تەنییەوە و لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە: *بەڵێ، وانەیەکی باشـی پێ دام! ئیتر ئەو یاریی مشـک و پشیلەیەی دوێنێ کۆتایی هات، قسە لەوەدا نەماوە! خوێڕییە زۆر لەوە زیرەکترە و دەیەوێ من تێبگەم کە زیرەکە!... کەواتە بەدوای شـــتێکی ترەوەیە. باشە، بەدوای چییەوەیە؟ نا، تەنیا خەریکی خۆماندووکردنی، کاکی خۆم! ئێســـتە بۆ نموونە دەتەوێ من بترســـێنی و فریوم بدەی؟ دەســـتت خاڵییە و هیچ بەڵگەیەکت نییە! ئەو کەســـەش کە دوێنێ بینیم هیچ بوونێکی دەرەکیی نییە. خۆ دیارە کە دەتەوێ گێژم بخەی، مێشکم تێک بدەی و بمخەیتە داوەوە! بەس نەیخۆی تاڵە، قسەکانت حسێبێکی وایان بۆ ناکرێ! باشـــە بۆچی لەم نێوەندەدا ســـەرەداوی دامێ؟... لەوانەیە هەر لەبەر ئەوە بووبێ کە زوو هەڵدەچم! نا کاکی خۆم، بە کەڵک نایێ، ئێســـتە تا پێت خۆشـــە داو بنێرەوە... دەی، با بزانین چیت لەژێر سەردا بووە بەم داوەت...*

ڕاســـکۆڵنیکۆف هەموو تواناى کۆ کردەوە و توندوتۆڵ خۆی ئامادە کرد تا ڕووبەڕووی نەهامەتییەکی تۆقێنەر و ناڕوون ببێتەوە. چەند جارێک تەواو حەزی کردبوو پەلاماری پۆرفیێری بدات و هەر لە جێوە بیخنکێنێت، لەو کاتەوەی هەنگاوی نابووە ژوورەکەوە ئالەم هەڵچوونە جڵەونەکراوە دەترســـا. هەســـتی دەکرد دەمی تەواو وشـــکە، دڵی لە ســـنگیدا تەپەتەپیەتی و تەنانەت دەمی کەفی هێناوەتەوە. بەڵام هێشـــتا لەســـــەر بڕیارەکەی خۆی بوو کە تا کاتی خۆی ورتەی لێوە نەیێت. تێگەیشـــتبوو لە هەلومەرجی هەنووکەیی ئەودا تاکە ســـیاســـەتی باش تەنیا ئەم بێدەنگی و چاوەڕوانییەیە، چونکە لە جێی چەنەبازیی نابەجێ بە بێدەنگی نەیارەکەی دەگەیەنێتە بنبەســـت و ناچاری دەکات دواجار

لە جێیەکدا پەننەکە بدات. لانیکەم هیوادار بوو بێدەنگییەکەی وەها ئەنجامێکی هەبێت.

– نا، وا دیارە بڕواتان بە یەک قســــەم نەکردووە و واتان زانیوە هەمووی لاقردی[1] بووە...

پۆرفێری پیترۆڤیچ ســەرلەنوێ دەستی کردەوە بە زۆربلێی. سـات بە ســـات زیاتریش دەگەشـــایەوە و هەر وا گاڵتەجاڕانە پێدەکەنی. هەمدیسان بە ژوورەکەدا کەوتەوە گەڕان:

– باشـــە، لام وایە بۆ ئەمەش هەر هەقی خۆتانە. کاری خواش بە جۆرێکە کە ئەم سـەروسـەکوتەی من تەنیا ئەوانی تر دەخاتە پێکەنین؛ گەپچاڕی ئافرانـدووە و دەســـتیشـــی خۆش! وەلێ مۆڵەت بـدەن رابیگەیەنم و چەندبارەش رابیگەیەنم کە ئێوە جەنابی راســـکۆڵنیکۆفی ئازیز دەبێ لە منی پیرەمێرد ببوورن! ئێوە جارێ زۆر گەنجن و وەک دەڵێن تـازە هەنگـاوتـان نـاوەتە تەمەنی گەنجییەوە، لەبەر ئەوە، لە هەموو بابەتێکدا ئەقڵ دەخەنە پێشـــەوە. گەنجەکان هەموویان وان. وردیی ئەقڵی چەتوون و سەرنجڕاکێشیی ئەنجامگری و بەڵگەهێنانەوە شاگەشکەتان دەکا. ڕێک وەک ئەو ڕاوێژکارە سەربازییە ئەتریشیانە[2] کە هەڵبەتە ئەگەر تێگەیشـــتنە ســـنووردارەکەم لەبارەی جەنگەوە یاریدەرم بێ: بەڕێزان لەسـەر کاغەز شـکسـتیان بە ناپلیۆن هێنابوو و دەســـتبەســـەریشـــیان کردبوو و لەوێ لە نووســـینگەکەیاندا بەوپەڕی وردی و بەڵگاندنەوە دونیایەک نەخشـــەیان دانابوو. بەس کۆتاییەکەی چی بوو؟ جەنەراڵ مەک و هەموو هێزەکەی لەلایەن نـاپلیۆنەوە

---

١. لاقردی؛ حەنەکچییەتی؛ جەفەنگبازی؛ ڕابواردن؛ چوختییەتی

١. ئەم ڕاوێژکـارانە ئەنـدامی شـــورای پـاشـــایی جەنگی ئەتریش یـان هەمـان Hofkriegsrat بوون کە بەڕێوەبردنی کاروباری ســـوپایان لە ئەســـتۆدا بوو. «و. ف»

دەســـتگیر کران، هاهاها![1] ئاخ، جەنابی ڕاســـکۆلنیکۆف، خۆ ئەوە پێم پێـدەکەنەن، بە منێ کە تەنیـا کەســـێکی ئیـداریم و وا خەریکی فەرمایشـــتگەلێکم و بە مێژووی جەنگ نموونە دەهێنمەوە! وەلێ چی بکەم، زانســـتی ســـەربازیش بووەتە خاڵی لاوازی من و نازانن چەندە شـــەیدای خوێندنەوەی مێژووی جەنگەکانم... هەر لە بنەڕەتەوە هەڵەم کرد هاتمە ناو ئەم کارە، بە لەبەرچاوگرتنی بەهرە ئەم کارە بۆ من نەکراوە! هەر لە ســەرەتاوە دەبوو بچمە نێو ســوپاوە و دەســتی خۆم گیر بکەم، شـــوێنی من ئەوێیە! ناپلیۆنێکم لێ دەرنەدەچوو، وەلێ خۆ هەر دەبوومە ســـەرهەنگێک، هاهاها! باشـــە، ئازیز، ئێســـتە لێگەڕێن هەموو ڕاســـتییەکەتـان پێ بڵێم، لەبـارەی ئەو دۆســـییە تـایبەتە جێمەبەستەوە! نابێ چاو لەئاست دوو شت دابخەین: حەقیقەتی ئامادە و ســرووشــتی مرۆڤ. ئەمانە پرســگەلێکی گرنگن و هەر بە ڕاســتیش جێی ســـەرســـامییە کە چۆن هەندێک جـار وردترین گریمـانە و ئەگەرەکـان بەدرۆ دەخەنەوە! گوێ لە قســـەی منی پیرەمێر بگرن، قسەکەم جددییە...

پۆرفیری پیترۆڤیچ بە حاڵ ســیوپێنج ســاڵ دەبوو، بەڵام کە ئەمەی گوت وەک ئەوە وابوو لە چرکەساتێکدا تەمەنێکی تێپەڕاندبێت، تەنانەت دەنگیشی گۆڕا و لەشیشی گرمۆڵە.

– جا من کەسێکی ڕاشکاویشم... ڕاشکاوم دەی، ها؟ بۆ نیم؟ ئێوە ڕاتان چییە؟ خۆم وا دەڵێم زۆریش ڕاشکاو و بێپێچوپەنام. وا لە خۆڕا و بە ڕاشکاوی هەموو شتێکتان پێ دەڵێم و چاوەڕێی هیچ پاداشتێکیش

---

١. دەســـتبەســـەرکردنی جەنەراڵ مەک و هێزەکانی لەلایەن ناپلیۆنەوە، بووە هۆی سەرکەوتنی ئمپراتورییەتی فەڕەنسا لە ململانێی نێوان سوپای هاوبەشی ڕووسیا–ئەتریش لە ئەشـــترلیتزدا. تۆلســـتۆیش هاوکات لەگەڵ چاپبوونی زنجیرەیی *تاوان و سزا*دا، لە یەکەمین بەرگی ڕۆمانی *جەنگ و ئاشتی*دا پەرژایە سەر دەستبەسەرکردنی مەک و لێکەوتەکانی. «و. ف»

نیم، هاها! باشـە، خەریک بووم ڕامدەگەیاند: من لام وایە ئەقڵ شـتێکی ناوازەیە، وەک دەڵێن ڕازێنەری سـروشـتە و لە ژیانیشـدا مایەی دڵخۆشییە. جا ئەم ئەقڵە چ فڕوفێڵێکی ئامادەشی لەژێر سەردایە! هەر لەبەر ئەوەشـە کە هەندێ جار زۆر ئاسـتەمە بۆ لێکۆڵەرە داماوەکان تێبگەن لە کوێی کـارەکەدان، بەتـایبەت لەبەر ئەوەی هەنـدێ جـار ئەوانیش جڵەوەکە دەدەنە دەسـت سـۆسـە و خەیاڵ، ئاخر ئەوانیش هەرچۆنێ بێ دواجار مرۆڤن! وەلێ دەی، ئەوە سـرووشـتە کە دێتە پێش و لێکۆڵەرە دامـاوەکەی ئێمە ڕزگـار دەکـا! بیریـان لەمە نەکردووەتەوە ئەو گەنجانەی کە خۆیان دەسـپێرنە دەسـت ئەقڵ و زیرەکی، *هەموو بەربەستەکانی سـەر ڕێگەیان ڕادەماڵن!* هەر خۆتان دوێنێ زۆر زیرەکانە و هەڵبەتە بە تۆزێ فرەزانییەوە ئەم دەربڕینەتان فەرموو! قەبووڵمە، چەند درۆیەکیش ڕێز دەکا بەڕێزەکەی ئێمە، یانی مەبەسـتم هەمان بەرگومانی تایبەتی دۆسـییە جیاوازەکەیە، هەمان تاوانکارە نەناسـراوەکەمان... جا درۆی چاکیش دەکا، یانی بەوپەڕی زیرەکی و ئاقڵییەوە درۆ دەکا. واش دەردەکەوێ کە سـەرکەوتنەکەی یەکلاییکراوەیە و هـاکـا میوەی ئەو ئەقـڵ و زیرەکییەش کەوتە کۆشییەوە، کەچی لە شوێنێکی زۆر سەرنجڕاکێشدا کە بە خەیاڵی هیچ کەسـێکدا نایێ، هاوڕێکەی ئێمە دەبووڕێتەوە! دەی، هەڵبەتە نەخۆشـی و گەرمای ژوور و ئەمانە هەمووی لە لایەک، وەلێ هەرچۆنێ بووە، ئەوە خۆیەتی کە تووی ئەو بۆچوونەی لە زەینی هەمووواندا چاندووە! درۆکردنەکەی بێوێنە بوو و چ درۆگەلێکی دەرەجە یەکیشـی ڕیز کردن، کەچی سـرووشـتە مرۆییەکەیی لە بەرچاو نەگرت! هەر ئەم لە بەرچاونەگرتنەی سـرووشـتیش بوو کە دەسـتیی ئاشـکرا کرد. لە هەلومەرجێکی تریشـدا هەمدیسـان هەوسـار دەداتەوە دەسـت ئەقڵ و زیرەکی و زیادەڕۆیی دەکا، یانی هەمدیسـان دەکەوێتەوە نێو داوی زیرەکیی خۆی و ئەم جارەیان بە جۆرێ لە جۆرەکـان بە کەسـێ ڕادەبوورێ کە گومانی لێ کردووە. وەها ڕەنگی دەپەڕێ وەک ئەوەی

نوانــدن بێ و بیەوێ مەمکەمژە لە دەمی بەرانبەرەکەی بنێ، بەس ڕەنگپەڕینەکەی ئیجگار سرووشتی و زیاد لە ڕادە ڕاستەقینە دەبێ و، دەی، هەر بەم جۆرە گومــانی دواتریش دەخــاتە ســــەرمــانەوە! لێکۆڵەرەکەی ئێمە ڕەنگە لە ســـــەرەتاوە فریو بخوا، وەلێ گەر گەمژە نەبێ، بە درێژایی شـــەو چاک بیری لێ دەکاتەوە و بۆ بەیانییەکەی بۆچوونی دەگۆڕێ. هەنگاو بە هەنگاوی ڕێگەکە ئەم بەزمەیە! تا بێ، سەروسەکوتی لە هەندێ شوێندا دەردەکەوێ کە نابێ دەرکەوێ و لە هەندێ شـوێنیشـدا کە دەبێ ئاگای لە دەمی بێ، دەکەوێتە چەنەبازی و حەکـایەتکردن و نمـایشـــی جۆراوجۆر، هـاهـاهـا! بۆ نموونە کتوپڕ دەردەکەوێ و دەپرسـێ بۆچی هێشـتا نەهاتوون بمگرن؟ هاهاها! ئەمە دەکرێ بۆ هەر کەسێ بێتە پێش، جا حەز دەکەی با زیرەکترین کەسی دونیاش بێ یان دەروونناس یان ئەهلی ئەدەب و قەڵەم. سـرووشـتی مرۆیی وەک ئاوێنە وایە! بڕوانە ئاوێنەکە و چێژ وەرگرە! ئەی هاوار، بۆ هەمدیســـان ڕەنگتان پەڕی، جەنابی ڕاســـکۆڵنیکۆف؟ نەکا هەوای ژوورەکە زۆر قورس بووبێ؟ حەز دەکەن پەنجەرەکە بکەمەوە؟

ڕاسکۆڵنیکۆف دەنگی هەڵبڕی:

– ئۆو، نا، خۆتان ئەزیەت مەدەن تکایە!

جا دواتر دایە قاقای پێکەنین.

– تکایە خۆتان نارەحەت مەکەن!

پۆرفیری لەبەردەم ئەودا ڕاوەسـتا، ئێسـتێکی کورتی کرد و کتوپڕ خۆیشـــی لە قاقای پێکەنینی دا. ڕاســـکۆڵنیکۆف لەســـەر قەنەفەکە هەســـتـایەوە؛ هەر بەو جۆرەی کە لەنـاکـاو کەوتبووە پێکەنین، لەناکاوێکیشدا بەری بە پێکەنینە هیستریبیەکەی گرت.

– پۆرفیری پیترۆڤیچ!

بە دەنگی بەرز و پچڕپچڕ دەدوا، گەرچی قاچیشـــی دەلەرزی و بە زۆر دەیتوانی بە پێوە ڕابوەستێت.

– ئێســـتە ئیتر وەک ڕۆژ بۆم ڕۆشـــن بووەتەوە کە ئێوە هەر بە ڕاســـتی گومانتان لە من هەیە و وای بۆ دەچن من ئەو پیرێژنە و لیزاڤێتای خوشـــکیم کوشـــتووە! من وەک خۆم بەم مەســـەلەیە هێڵنج دەدەم، یانی دەمێکە ئیتر قێزی لێ دەکەمەوە. گەر لاتان وایە لە ڕووی یـــاســـــــاییەوە دەتوانن لێکۆڵینەوەم لەگەڵ بکەن، کەواتە فەرموون لێکۆڵینەوە یاســـاییەکەتان بکەن! ئەگەر دەتوانن دەســـتبەســـەرم بکەم، فەرموون و دەستبەسەرم بکەن. بەس ڕێ بە هیچ کەسێ نادەم گاڵتەم پێ بکا و فیلەفیل بە ڕوومدا پێبکەنێ و ئەشکەنجەم بدا...

لەپڕ لێوی کەوتە لەرزین، بریقەی ڕق کەوتە چـاوییەوە و ئیـدی نەیتوانی دەنگی نزم بکاتەوە کە تا ئەو کاتە جڵەوی کردبوو:

– مۆڵەت نادەم کاکی ئازیز!

دەیقیڕاند و مستی بە مێزەکەدا دەکێشا.

– بیســـتتان چیم پێ گوتن، پۆرفیری پیترۆڤیچ؟ مۆڵەتی وەها شـــتێ نادەم!

– خوایە! باشە چی بووە هەمدیسان؟

پۆرفیری پترۆڤیچ کە دەتگوت هەر بە ڕاســـتی ســـەراســـیمە بووە، هاواری کرد:

– ئازیز گیان! ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز! چی بووە ئاخر؟

ڕاسکۆڵنیکۆف هەمدیسان قیڕاندییەوە:

– مۆڵەتی وەها نادەم!

پۆرفیری پیترۆڤیچ ڕووخساریی زۆر لە ڕووخساری ڕاسکۆڵنیکۆف نزیک کردەوە و حەپەساوانە ورتاندی:

– هێمنتر، بەڕێز گیان! کتوپڕ گوێیان لێ دەبێ و دێنە ژوورا! ئەوسا دەبێ چییان پێ بڵێین؟ ئاخر حسێبی ئەمەش بکەن!

– مۆڵەت نادەم، مۆڵەتی وەها نادەم!

ڕاسکۆڵنیکۆف نائاگایانە هەمان ڕستەی دەگوتەوە، بەڵام ئەویش کتوپڕ دەنگیی تا ئاستی ورتە نزم کردبووەوە.

پۆرفیری فڕکەی کردە لای پەنجەرەکە تا بیکاتەوە.

– پێویستیمان بە هەوای تازەیە و ئێستە دێینەوە سەر خۆمان! دەبێ تۆزێ ئاویش بخۆنەوە ئێوە، ئازیز گیان. تووشی نۆرە هاتوون...

خەریک بوو بەرەو دەرگەکە ڕایدەکرد تا بڵێت ئاو بێنن کە تەماشای کرد سووراحییە ئاوێکیان لە سووچی ژوورەکەدا داناوە. بە سووراحییە ئاوەکەوە ڕایکردە لای ڕاسکۆڵنیکۆف و ورتەئاسا گوتی:

– فەرموون، ئاو بخۆنەوە، ئازیز، باشتر دەبێ...

نیگەرانی و هاوخەمیی پۆرفیری پیترۆڤیچ هێندە سروشتی و بێخەوش بوو کە ڕاسکۆڵنیکۆف بێدەنگ بوو و بە کونجکۆڵییەکی کێویانەوە لێی ورد بووەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاوەکەی لێ وەرگرت.

– ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز، ئەی گەنجی نازدار! بەم جۆرە خەریکە بە خۆڕایی خۆتان شێت دەکەن، گوێ بە قسەی من بدەن! ئەها، ئەرێ، ئاو بخۆنەوە، گەر یەک دوو چۆڕێکیش بێ...

دەکرێت بڵێین پۆرفیری بە زۆر ئاوەکەی دایە دەستی ڕاسکۆلنیکۆف؛ ئەویش بە جووڵەیەکی میکانیکییەوە ئاوەکەی بۆ دەمی برد، وەلێ بە ڤینێکی لەڕادەبەدەرەوە خستییەوە سەر مێزەکە.

– بەڵێ ئازیز، تووشی نۆرەیەکی بچووک بووبوون. وەلێ گەر بتانەوێ هەر وا درێژەی پێ بدەن هەمدیسان نەخۆش دەکەونەوە، ئازیزی دڵم...

پۆرفیری پیترۆڤیچ هاوڕێیانە و بە دڵسۆزییەوە ئەمەی دەگوت، بەس دەتگوت هێشتا فکری لە لایەکی دیکە بوو:

– خوایە گیان! خۆ ئەسڵەن ئاگاتان لە خۆتان نییە! ڕازومیخین لێرە بوو دوێنێ، هات سەرێکم لێ بدا. دەزانم کاکە گیان، دەزانم ڕەوشتێکی پۆخڵم هەیە و زمانم ڕەقە، وەلێ ئەو بۆچی دەبێ بەم جۆرە لە قسەکانی من تێبگا؟... خوایە گیان... دوێنێ پاش ڕۆیشتنتان هەمدیسان گەڕایەوە. چەند پارووێکمان نایە دەممان و ئەویش هەر قسەی کرد و کرد، من لە ناچارییان تەنیا توانیم دەست بۆ ئاسمان هەڵبڕم! بیرم کردەوە کە ئاخ خوایە گیان... نەکا ئێوە ناردبێتتان؟ دانیشن تکا دەکەم، بۆ خاتری مەسیح، دانیشن ئازیز گیان!

– نا، من نەمنارد. وەلێ دەمزانی هاتووەتە سەروەختتان و دەشمزانی بۆچی.

شێوازی قسەکردنەکەی ڕاسکۆلنیکۆف ڕەق بوو.

– یانی ئاگادار بوون؟

– بەڵێ، ئاگادار بووم. جا چییە؟

– هیچ، ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز، ئەم نەرمەبڕییەی ئێوە لەئاست ئەوانی تردا هیچ نییە، من ئاگاداری یەک بە یەکیانم، ئازیز گیان! من دەزانم کە دەمەوئێوارە ڕۆیشتن تا گوایە ئەپارتمان بە کرێ بگرن و

پاشـــانیش زەنگتان لێدا و لەبارەی خوێنی ســـەر ڕووی زەوییەکەوە پرسیارتان کرد و کرێکارە داماو و قاپچییەکانتان حەپەساندن! چاکیش دەتوانم تێبگەم کە لەو ســـاتەدا لە چ هەلومەرجێکی ڕۆحیدا بوونە... وەلێ ســـوورم لەســـەر قســـەی خۆم کە ئەگەر بتانەوێ بەم جۆرە درێژەی پێ بدەن، خۆتان تووشـــی گێچەڵێک دەکەن! هەر بە تەواوی تێـک چوونە! ئێوە خۆتـان دەخۆنەوە و خراپ هەڵـدەچن، هەڵبەتە خۆخواردنەوەیەکی ســەیر لەبەر ئەو مەینەتەی کە پێتان ڕەوا بینراوە، بەر لە هەر شتێ لەلایەن چارەنووسەوە و، پاشانیش، پۆلیس و شت! هەر لەبەر ئەوەشە کە ئێوە بە هەرچوار لادا پەلەقاژە دەکەن و خۆتان بە دار و دیواردا دەکوتن تا ئەوانی تر ناچار بکەن بێنە قسە بۆ ئەوەی مەســەلەکە یەکلایی ببێتەوە، ئاخر بەم هەموو دەبەنگی و بەدگومانییە پەســـت دەبن، وا نییە؟ ڕێک ســـۆســـەی ئەو دۆخەم کرد کە تێیدان، وایە؟... بەس شـــتێ ماوە، ئەم مەســـەلەیە هەر بە تەنیا پەیوەندیی بە خۆتانەوە نییە، بەم جۆرە خەریکن هەم خۆتان شـــێت دەکەن و هەم ڕازومیخینیش. کوڕێکی زۆر باشـە و خۆشـتان دەزانن و پەســـەندی دەکەن! ئێوە نەخۆشن و ڕازومیخین ساغ و میهرەبان. نەخۆشییەکەی ئێوە یەخەی ئەویش دەگرێ دواجار... ئێستە کە هاتنەوە سـەر خۆتان ئازیز گیان، شـــتی تریشـــتان پێ دەڵێم... وەلێ بۆ خاتری هەموو پیرۆزییەکان دانیشـن! چەند سـاتێ پشـوو بدەن، زۆر بەدحاڵ دیارن! دانیشن دەی...

ڕاســـکۆڵنیکۆف دانیشـــت. ئیدی وەک جاران هەڵنەدەلەرزی و، بە پێچەوانەوە، گەرم و تـادار بوو. واقوڕمـاو و بەوپەڕی ســـەرنجەوە گوێی بۆ قســـەکـانی پۆرفیری پیترۆڤیچ دەگرت. وا دەردەکەوت کە پۆرفیری هێشـــتا فرە هاوڕێیانە بە دەورییەوەیەتی و لە خەمیدایە و هەوڵ دەدات ئاگاداری دۆخی بێت. گەرچی لە دەروونیدا هێزێکی زۆر ڕایدەکێشـــا تا بڕوا بە قســـەکانی پۆرفیری بکات، بەڵام تەنانەت تاقە

قسەیەکیشی پەسەند نەکرد. ئاماژەی چاوەڕوانینەکراوی پۆرفیری بۆ ئەپارتمانەکە، بە تەواوی ڕاسکۆلنیکۆفی پەشۆکاند و واقووڕی کرد. کتوپڕ بە خۆیی گوت: *چۆن باسی ئەپارتمانەکە و ئەو شەوە دەزانێ؟ چەندە سووک و ئاسان خۆی بۆم باس دەکا!*

پۆرفیری ڕانەوەستا و درێژەی بە قسەکانی دا:

– بەڵێ، ئازیز گیان، خۆم پێشتر کتومت دۆسیەیەکی وام لە دادگەدا هەبوو، بەسەرهاتێکی دەروونی و سەرتاپێی دەرد و نەخۆشی. کابرالەیەک قووت بووبووەوە و دەیویست خۆی بە بکوژ بداتە قەڵەم و وازی نەدەهێنا. هەر مەپرسە کە چیی دەکرد! کابرا بە تەواوی تووشی خەیاڵات بووبوو. چەند ڕاستییەکی خستنە بەردەستی دادگە، مووبەموو هەلومەرجەکەی ڕوون کردەوە و چاک دەیتوانی یەک بە یەکمان فریو بدا و بمانئێرێ. باشە بۆچی؟ چونکە بەبێ ویست و بە جۆرێ لە جۆرەکان بووبووە هۆی تاوانێک! کاتێکیش تێگەیشت کە دەستئەنقەست ڕێی بۆ بکوژەکان خۆش کردووە، خەمۆکی دایگرت و ئەسڵەن مێشکی تێک چوو، وەهمی سەیروسەمەرەی دەبینی و بەرەبەرە بە گشتی ئەقڵی لەدەست دا. گەیشتە ئەوەی کە بڕوا بە خۆی بهێنێ تووشی تاوانێک بووە و بکوژەکە خودی خۆیەتی. بەس لە کۆتاییدا، دادگەی باڵای پێداچوونەوە چووە بنجوبناوانی مەسەلەکە و ئەو چارەڕەشەیان بەردا و ناردیانە شوێنێ تا لەژێر چاودێرییەکی باشدا بێ. ئافەرین بۆ دادگەی پێداچوونەوە! وەلێ ئێوە خەریکن خۆتان تووشی چ بەزمێک دەکەن، کاکە گیان؟ گەر بتانەوێ یاری بە مێشکی خۆتان بکەن، تووشی تا دەبن و وڕێنە دێتەوە سەرووەختتان! ئەوسا شەوگەڕی و زەنگلێدانی ئەپارتمانەکانی بەدوادا دێ و پرسوجۆ لەبارەی خوێنی سەر ڕووی ژوورەوە! من چاک شارەزای پێچوپەنای ئەم بارە دەروونییەم، یانی بە کردەوە دیومە و ئەزموونم کردووە! ڕوو دەدا کە مرۆڤ بیەوێ خۆی لە پەنجەرەوە هەڵبداتە

دەری یان خۆی بەسەر تاوەری زەنگی کڵێساوە بخاتە خوار، یانی دەکری وای بەسەر بێ و وەها وەسوەسەیەکی بکەویتە دڵەوە. مەسەلەی زەنگلێدانەکەی ئێوەش هەر ئەمەیە... نەخۆشییەکە، جەنابی راسکۆڵنیکۆف! نەخۆشی! ئێوە بە گشتی نەخۆشییەکەتانتان پشتگوێ خستووە و چارەسەر بەهەند وەرناگرن. پێویستە بچنە لای دکتۆرێکی بەئەزموون، ئاخر بۆ مەگەر ئەو هاوڕێ خەپەیەتان هیچی لەدەست دێ؟... کێشەکە ئەم وڕێنەیەیە! هەموو ئەمەی کە بەسەرتاندا هاتووە لەبەر وڕێنەیە!

ڕاسکۆڵنیکۆف بۆ ماوەی خولەکێک هەستی کرد ژوورەکە لە بەرچاویدا سووڕایەوە. وەک برووسکە بە مێشکیدا هات: *تۆ بڵێی مێشتا هەر وا خەریکی درۆکردن بێ؟ نا، ئەوە نابێ، ڕێی تێناچێ!*

لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە ئاخۆ بیرکردنەوە لەمە دەشێ تا چەند توورەی بکات و هەر ئەمەش وای کرد وازی لێ بهێنێت، چونکە هەستێک لە ناخیدا دەیگوت ئەو بیرکردنەوەیە دەکرێت شێتیشی بکات. قیڕاندی:

– بە هیچ شێوەیەک وڕێنەم نەبوو! هۆشیار بووم و زۆر باشیش دەمزانی خەریکی چیم!

هەموو هێزی ئەقڵیی خستە گەڕ تا یارییەکەی پۆرفێری پیترۆڤیچ تێک بدات.

– زۆریش هۆشیار بووم، تێدەگەن؟

– بەڵێ، بە دڵنیاییەوە تێدەگەم. دوێنێ فەرمووتان وڕێنەتان نەبووە و زۆریش لەسەر قسەی خۆتان سوور بوون! دڵی تەنگتان چیی پێ خۆشە، بیفەرموون، من زۆر باش لە فەرمایشتەکانی ئێوە حاڵی دەبم!... ئاخ، برا ئازیزەکەم! تا کۆتایی گوێ لە قسەی من بگرن، بەڕێز ڕاسکۆڵنیکۆفی ئازیز! ئەسڵەن گریمان بکوژەکە ئێوەن یان بە جۆرێ

لە جۆرەکان لەم مەسەلە چەھەننەمییەدا دەستتان ھەیە... ئەوسا ئێوە ھەڵدەستن تا بە ھەموو تواناتانەوە نەک ھەر بیسەلمێنن کە ورێنەتان نەبووە، بەڵکە ھۆشیار و لەسەرخۆش بوونە؟ جا بەم پێداگرییەشەوە؟ ئاخر ئەمە رێی تێدەچێ؟ من لام وایە رێک بە پێچەوانەوە، ھەر لە بنەڕەتەوە ئەقڵ نایبڕێ! ئەگەر بیرتان بەقەد سەرەدەرزییەک گیرۆدە با و وەھا شتێ ئازاری بدابان، بە فەرمانی ئەقڵی رێک دەبوو سوور بن لەسەر ئەوەی کە زۆر چاک ورێنەتان ھەبووە! وا نییە؟ ھا؟ خراپ دەڵێم؟

ئاسەوارێکی فێڵبازی خزابووە شێوازی پرسینەکەی پارفێرییەوە. بە چەشنێک بەسەر راسکۆلنیکۆفدا چەمییەوە کە ئەو راچەنی و بە جۆرێک کشایە دواوە کە بەر پاڵپشتی قەنەفەکە کەوت و واقوڕماو و بێدەنگ لە پارفێریی روانی کە سێبەری خستبووە سەری.

– یان بۆ نموونە رازومیخین و ھاتنی بۆ لای من و ئەوەی کە رای خۆی بوو یان ئێوە ناردتان. دەی، بێگومان دەبوو بڵێن ئەوە رای خۆی بووە و ئێوە ئاگادار نەبوونە تا بیشارنەوە کە خۆتان ناردووتانە! بەس شاردنەوەی چی؟ تەنانەت بە شانازی و پێداگرییەوە ھەستان و گوتتان خۆتان بەگژ منتاندا کردووە!

راسکۆلنیکۆف بە ھیچ شێوەیەک شتی وای نەگوتبوو. لە سەرمادا تەزووێک بە لەشیدا ھات و بێگیان و ھێمن گوتی:

– ئاخ، ئێوەش ھەر خەریکی رێزکردنی درۆن!

لێوەکانی شێوەیەکی بزەئاسا و نەخۆشانەیان وەرگرتبوو.

– تەنیا دەتانەوێ بۆمی بسەلمێنن کە یارییەکەی منتان لەبەرە و بەر لەوەی دەم بکەمەوە ئێوە دەزانن بڕیارە چی بڵێم!

ڕاسکۆلنیکۆف تەنانەت لە کاتی کردنی ئەم قسانەشدا تا ڕادەیەک ئاگادار بوو کە هەست و هۆشی وەک پێویست لەسەر ئەو شتانە نییە دەیانڵێت.

– دەتانەوێ من بترسێنن... یان لەوانەشە تەنیا لە دڵی خۆتاندا پێم پێبکەنن!...

هێشتا لە پۆرفیری ڕامابوو و بریقەی هەمان ڕقی بێڕادە و هەڵچوونی جلەوپچڕاو جارێکی دیکەش لە نیگایدا درەوشایەوە. قیڕاندی:

– درۆ دەکەن، هەرهەمووی درۆیە! خۆتان لە هەر کەسێ باشتر دەزانن چاکترین سیاسەتی هەر تاوانکارێک ئەوەیە کە تا دەکرێ ڕاست بڵێ و ئەو شتانەی کە پێویست ناکا بشاردرێنەوە، نەشارێتەوە! من باوەڕم بە قسەکانتان نییە!

– هەر بە ڕاستی کەسێکی پشووکورتن!

پۆرفیری حیلکەحیلک کەوتە پێکەنین.

– پیاو لەگەڵ ئێوەدا دانووی ناکوڵێ! هەر بە جددی تووشی واسواسی بوونە! یانی بڕواتان بە قسەکانم نییە؟ بەس من خۆم دەڵێم، هەرچەندە کەمیش بێ، هەر بڕواتان کرد، منیش هەوڵی خۆم دەدەم تا بە تەواوی بڕوا بکەن، چونکە خۆشەویستییەکی بێگەردم بۆتان هەیە و لە ناخی دڵەوە چاکەی ئێوەم دەوێ.

لێوەکانی ڕاسکۆلنیکۆف کەوتنە لەرزین.

– بەڵێ ئازیز، لە ناخی دڵەوە گوتم.

پۆرفیری نەرم و هاوڕێیانە باسکی ڕاسکۆلنیکۆفی گرت و درێژەی پێدا:

– یەک قسە و کۆتایی: لە نەخۆشییەکەتان بپرسنەوە ئازیز گیان، بەتایبەت لەبەر ئەوەی کە ئێستە دایە گیان و خوشکتان لێرەن، حسێب بۆ ئەوانیش بکەن! دەبێ ئاسوودەیان بکەن و نازیان هەڵبگرن، کەچی ئێوە هەر دەیانترسێنن...

– ئەمە بە ئێوە چی؟ ئێوە چۆن دەزانن دایک و خوشکی من لە کوێن؟ ئیشتان چییە پێیان؟ نەکا سیخوڕتان بۆ دانابم و ئێستەش ناڕاستەوخۆ بتانەوێ ئەمەم پێ ڕابگەیەنن؟

– خوایە گیان! هەر لە خۆتانمەوە بیست، هەر لە خودی خۆتان! هیچ ئاگادار نین کە بەم هەیەجانەوە هەموو شتێ بۆ ئەوانی تر و، بەتایبەت بۆ من باس دەکەن! دوێنێ چەند خاڵێکی ورد و سەرنجڕاکێشم لە کاتی قسەکردن لەگەڵ ڕازومیخیندا دەست کەوت. نا، ئازیز گیان، ئێوە قسەکەی منتان بڕی، وەلێ دەبێ پێتان ڕابگەیەنم کە سەرەڕای ئەو زیرەکییە بێڕادەیەتان، سرووشتی بەدگومانی ئێوە وای کردووە، لەبەرانبەر پرسەکاندا، تەنانەت ئەقڵی دروستیشتان نەخەنە گەڕ! بۆ نموونە با بگەڕێینەوە سەر ئەو باسەی کە کردمەوە... پەیوەست بە زەنگلێدان و ئەم شتانەوە. من، وەک لێکۆڵەری تاوانەکان، هەڵدەستم و بابەتێکی هێندە بەبایەخ دەخەمە مشتتانەوە! کەچی ئێوە بە بای خەیاڵتاندا نایێ! ئاخر ئەگەر تۆزقاڵێک گومانم لە ئێوە بکردبا، ئەسڵەن بۆچی دەبوو مەسەلەی زەنگی ئەپارتمانەکەتان لەگەڵ بخەمە بەر باس؟ بگرە بە پێچەوانەوە، لەو بارەدا، سەرەتا وام دەکرد بە هیچ شێوەیەک گومانتان بۆی نەچێ و ئەگەریش گومانێکتان هەبا، بۆم دەرەواندنەوە. بە هیچ شێوەیەکیش نیشانم نەدەدا کە هەواڵیم پێ گەیشتووە و بە کورتییەکەی بیرتانم بە لاڕێدا دەبرد و، پاشان، کتوپڕ ئەو گورزە *نازدارە ناوبراوەم* –بە گوتەی خۆتان– پێشکەش دەکردن: *دەی، ئازیزەکەم! دەکرێ بفەرموون جەنابی پایەبەرزتان کاتژمێر دەی شەو لە ئەپارتمانی کوژراوەکەدا خەریکی چی بوون؟* بۆچی

*زەنگەکەتان لێدا؟ بۆچی پرســـتان لەبارەی خوێنی رووی ژوورەکەوە کرد؟ بۆچی بە قاپچییەکانتـان گوت لەگەڵتـان بێن بۆ بنکەی پۆلیس؟* فەرموون! ئەگەر گومـانم لە ئێوە هەبـا، ئەم جۆرە پرســـیـارانەم لێ دەکردن! ئەوسا دەبوو وەڵامەکانتان بە فەرمی تۆمار بکرێن، پشکنینی جەســـتەییتان بۆ دەکرا، ماڵەکەتانمان دەپشـــکنی و تەنانەت لەوانەش بوو دەســـتبەســـەرتان بکەین... کەواتە، ئێســـتە کە هیچکام لەم کارانە ئەنجام نەدراون، مانای وایە گومانمان لە ئێوە نییە! وەلێ جارێک گوتم و ئێستەش دووبارەی دەکەمەوە: ئێوە ناتوانن بە رووونی چواردەورتان ببینن، یانی هەر لە بنەڕەتەوە هیچ نابینن!

راســـکۆلنیکۆف بە جۆرێک راچەنی کە پۆرفیری پیترۆڤیچ نەیتوانی خۆی لە گێلی بدات و وای بنوێنێ کە سەرنجیی رانەکێشاوە. پاشانیش هاواری کرد:

– خۆ هێشـــتا هەر خەریکی درۆڕیزکردنن! نازانم رێکوڕاســـت خەریکی چین، وەلێ هەر وا درۆ دەکەن... دوو خولەک پێشـتر شـتێکی دیکەتان دەگوت و دەزانم کە بە هەڵەدا نەچوومە... ئێوە درۆ دەکەن!

– من درۆ ڕیز دەکەم؟

پێدەچوو پـارفیریش هەڵچووبێت، بەڵام هەر نەتـدەگوت بۆچوونی راسکۆلنیکۆف کەمترین بایەخی بۆ ئەو هەبێت، رووالەتی کراوە و نیگا نەرێساتییەکەیی[1] پاراست.

– یانی من خەریکی درۆڕیزکردنم، ها؟... وەلێ من، جەنابی من لە پێگەی لێکۆڵەری تاواندا، ئێسـتە چ هەڵسوکەوتێکم لەگەڵ ئێوەدا نواند؟ ها؟ هەرچی ســـەرەداو بوو نامە دەســـتتانەوە و رێگەگەلی بەرگری و پاکانەشـــم خســـتە بەر پێتان، ئەســـڵەن لە دیوە دەروونناســـییەکەوە بە

---

١. نەرێســـاتی: کینایی؛ قســـە یان جووڵە و تەماشـــاکردنێک کە واتایەکی رووالەتی و دانەیەکی داپۆشراوی تێدایە.

هەردوو دەســـــت بابەتەکەم پێشـــکەش کردن: نەخۆشـــی، وڕێنە، سـووکایەتیی کوشـندە، خەمۆکی، هەڵسـوکەوتی ئەفسـەرانی پۆلیس و چی و چی! وا نییە؟ هـاهـاهـا! ئەوە لە لایەک کە هەموو ئەم خـاڵە دەروونناسی و بەرگرییە لەسەر بنەمای ئەوان شمشێری دوودەمن و ناکرێ هێندەش پشـتیان پێ ببەسـتی... *نەخۆشـی، وڕێنە، خەیاڵپلاوی، وام هـاتە بەرچاو، بە خەیاڵمدا هـات، بیرم نییە*... هەمووی ڕاسـتە! زۆریش باشـە... بەس بۆچی کتومت لە کاتی نەخۆشـی و وڕێنەدا، ئەو خەیاڵاتە تایبەتانە هاتنە سەروەختتان لەبری بیر و خەیاڵی تر؟ دەکرێ بە جۆرێکی تریش بێ، وایە؟ هاهاها!

ڕاسـكۆلنیکۆف نیگایەکی ســـووکایەتیئامێز و لووتبەرزانەی گرتە پۆرفیێری پیترۆڤیچ و بە دەنگی بەرز و فەرمانکەرانە گوتی:

– یەک قسەی ڕێکوپێک...

لە جێگەکەی هەسـتایەوە و بەم کارە کەمێک پارفیێریشـی پاڵ نایە دواوە:

– من یەک قسـەی ڕێکوپێکم لێتان دەوێ! هەر بە تەنیا دەمەوێ ئەوە بزانم و بەس: دواجار من لە هەر تاوانێ بە بەری دەزانن یان نا؟ وەڵامم بدەنەوە، پۆرفیێری پیترۆڤیچ! وەڵامێکی بـاش و یەکلاکەرەوەم لێتان دەوێ و هەر ئێستەش دەمەوێ!

پۆرفیێری بە هەمـان ڕووخســـاری کراوە و زیـانەخـرۆ و بەسەرخۆدازاڵەوە هاواری کرد:

– منی دامـاو چـاک بەدەســـت ئێوەوە گیرم خواردووە! دەڵێی لەبەردەم دەسـتەی لێپرسـینەوەدام! وەلێ ئێستە بۆچی لەسـەر ئەوە سوورن کە شتەکان یەکلایی ببنەوە؟ خۆ هێشتا هیچ کەسێ بە ئێوەی نەگوتووە بەری چاوتان کلی پێوەیە! هەر بە ڕاســتی دەڵێی منالّن و بۆ شـخارتە دەگرین! تا دەسـتتان نەسـووتێ واز لە ئاگر ناهێنن! ئاخر بۆچی هێندە دڵپەرۆشـن؟ ئەمە چ نەخۆشـییەکە کە دەتانەوێ هەر بە زۆر خۆتان بەسەر ئێمەدا ساغ بکەنەوە؟ ها؟ هاهاها!

ڕاسکۆلنیکۆف لە ڕقاندا هەڵچووبوو و هاواری کرد:

– یانی دەبێ هەمدیســــان بیڵێمەوە بۆچی؟ لەبەر ئەوەی بەرگەی ناگرم!...

پۆرفیری قسەی پێ بڕی:

– بەرگەی چی ناگرن؟ نادڵنیایی؟

– ســەر مەخەنە ســەرم! ناتوانم... وا پێتان دەڵێم کە بەرگەی ناگرم! ناتوانم بەرگەی بگرم و نایگرم! زۆر باشیش دەزانن چی دەڵێم!

جا هەمدیسان بەدەم هاوارکردنەوە مستێکی بە مێزەکەدا کێشا.

– هێواشــتر، ئازیز، هێواشــترا لەســەرخۆ! دەنگتان دەبیســتن! بە جددی ئاگادارتان دەکەمەوە: دەبێ وریای خۆتان بن! گاڵتە ناکەم...

پۆرفیری ئەم جارەشیان ورتەورت قسەی دەکرد، بەڵام ئیدی باری پیرێژنە لادێییە ڕووخۆش و خەمخۆرەکـان لەئـارادا نەبوو، بە پێچەوانەوە، خەریک بوو فەرمـانی دەکرد، جددی و بە دەموچـاوی گرژەوە، بە جۆرێک وەک ئەوەی کە بە ئاماژەیەک هەموو ناڕوونی و نهێنییەکـانی ڕەوانـدبنەوە و ئـاشــکرای کردبن. وەلێ ئەمە یەک خولەکیشــی نەخایاند. ڕاســکۆلنیکۆف بۆ چەند ســاتێک وڕ بووبوو، کتوپڕ شـێتانە هەڵچوو. بەڵام ســەیر ئەوە بوو کە وەک جاری پێشــتر گوێڕایەڵی فەرمـانەکە بوو و دەنگیی نزم کردەوە، ئەمەش وێڕای ئەوەی کە ئەو تووڕەییەی بەرۆکی گرتبوو، لە گشــــت لایەنێکەوە گەیشتووە ترۆپک. لەژێر لێوەوە گوتی:

– ناهێڵم ئەشکەنجەم بدەن!

هەر لە هەمان ســاتیشــدا لەوپەڕی بێزاری و ئازاردا تێگەیشــت کە نـاتوانێت گوێڕایەڵی فەرمـانەکە نەبێت و بیرکردنەوە لەمەش زیـاد و زیادتر تووڕەی کرد.

– بمگرن، خۆم بگرن، ژوورەکەم بپشکنن... وەلێ ئەو چاکەیە بکەن و بە شــــێوازێکی فەرمی کارەکە ئەنجام بدەن و یاریم پێ مەکەن! تەنانەت بیر لە شتی واش نەکەوە...

– ئێوە هێندە خەمی شێوازی فەرمیتان نەبێ!

پۆرفیری پیترۆڤیچ بە هەمــان بزەی بەدخوازانەوە قســـەکەی ڕاسـکۆڵنیکۆفی بڕی و هاوکات خەریک بوو سـتایشـکارانە و تەنانەت بە چێژیشەوە لێی دەڕوانی.

– ئازیز گیان، من وەک هاوڕێ و میوانی ماڵەوە ئێوەم داوەتی ئێرە کردووە! هـاوڕێیەک داوای لە هـاوڕێیەک کردووە بێتە دیـدەنیی، هەر ئەوەندە!

– ئەوە من هــاوڕێیەتیی ئێوەم هەر نەویســـــت! تف لە هەزار هاوڕێیەتیی لەم جۆرە! تێگەیشـــتن یان نا؟ تەماشــــا، وا کڵاوەکەم هەڵدەگرم و ئێرە جێ دەهێڵم. دەی، ئێســـتە دەتانەوێ چی بڵێن، ئەگەر بەرنامەتان ئەوە بوو دەستگیرم بکەن؟...

ڕاسکۆڵنیکۆف کڵاوەکەی هەڵگرت و بەرەو دەرگەکە چوو.

– ئەی چی لە ســـوپرایزە بچکۆلانەکەی من بکەین؟ حەز نـاکەن بزانن چییە؟

پۆرفیری پێکەنی و جارێکی دیکەش باسکی ڕاسـکۆڵنیکۆفی گرتەوە و لە بەردەرگەکەدا ڕایگرت. بەرەبەرە لە جاران شـەیتانتر و قۆشـمەتر دەبوو و ئیدی ئەمەش پەتی سەبری ڕاسکۆڵنیکۆفی پساند.

– ئەم مەسەلەیەیان چییە؟ ئەوە چی دەڵێن لە خۆتانەوە؟

لە جێدا وشک بوو و تۆقیوانە لە پۆرفیری ڕاما.

– ئاخر، گەر بیبینن ســـەراســـیمە دەبن، ئازیز گیان! لەپشـــت دەرگەکەوە دانیشتووە، هاهاها!

پۆرفیری ئـامـاژەی بۆ ئەو دەرگەیە کرد کە بە ڕووی (وەک خۆی دەیگوت) ئەپارتمانە بەلاشەکەیدا دەکرایەوە.

– لەوێ بەندم کردووە تا لە دەستمان دەرنەچێ!

– مەسەلە چییە؟ لە کوێ؟ چی...

ڕاسـکۆڵنیکۆف بەرەو ئەو دەرگەیە چوو و ویسـتی بیکاتەوە، کەچی کڵۆم درابوو و نەیتوانی.

– کڵۆم دراوە، ئازیزەکەم. کلیلەکەشی لێرەیە!
پۆررفێری کلیلەکەی لە گیرفانیدا دەرهێنا.
– درۆ، هەمدیسان درۆ! درۆ دەکەی...
ڕاسکۆڵنیکۆف ئیدی بەبێ ڕەچاوکردن دەیقیڕاند.
– هەر وا بەسەر یەکەوە درۆ دەکەی، ئەی گەپجاڕی نەفرەتی!
هەڵمەتی بۆ پۆرفێری برد و ئەویش بەرەو دەرگەکە پاشەکشەی کرد، وەلێ دیار بوو کە هیچ ترسێکی نییە.

– چاک تێگەیشتم، لە ورد و درشتی هەموو شتێ تێگەیشتم! هەموو ئەم درۆ و گاڵتەجاڕی و تانانە بۆ ئەوەیە کە دواجار خۆم پێوە بکەم...

– ئازیز گیان، ئاخر لەمە زیاتر دەتانەوێ چۆنچۆنی خۆتان پێوە بکەن، جەنابی ڕاسکۆڵنیکۆفی بەڕێز؟ بڕوانن، تەواو تێک چوونە و خراپ شێواون. هاوار مەکەن دەنا ناچار دەبم کارمەندەکان بانگ بکەم!

– هەمدیسان خەریکی درۆکردنی! ئادەی بانگکە! ئەسڵەن هەموو کارمەندەکانت بانگکە! تۆ دەتزانی من ناساغم و هەوڵت دا سەرم بخەیتە سەر تا تووشی نۆرە ببم و خۆم پێوە بکەم. ئەرێ، بەدوای ئەمەوە بووی تۆ! دەی، ئێستە لە کوێیە ڕاستییەکە؟ کوا شاهێد و بەڵگەت؟ خۆ گوتم لە ورد و درشتی تێگەیشتم! تۆ چاک دەزانی کە هیچ بەڵگەیەکت نییە. تەنیا دوو وشەت لە دەمی ئەو زامیۆتۆفە چارەڕەشە بەدگومانەوە بیستووە... چاک منیش دەناسی و دەتویست لەتاو تووڕەییدا شێت ببم و پاشانیش بە قەشە و پارێزەرەکان و بریکارەوە[1] هەڵکوتیتە سەرم... ئێستەش چاوەڕێی ئەوانی، ئەرێ؟ ئەی چاوەڕێی چیی؟ کوا دەی؟ دەریخە دەی، بیانهێنە ژوور!

---

[1] بەر لە چاکسازیی سیستەمی دادوەریی ڕووسیا، دەبوو لە دادگەکاندا پارێزەرێکی سەر بە چینی تۆمەتبار ئامادە بێت –بۆ نموونە لە خانەدان یان سێرف یان پیشەوەران– تا چاودێریی قۆناغەکانی لێپێچینەوە بکات. «و. ف»

– کام کارمەند، کامە بریکار، ئازیز گیان؟ خوایە، خەڵکی چ بیر و خەیاڵێکیان بە مێشـــکدا دێ! گەر بتانەوێ بەم جۆرە درێژەی پێ بدەن ئەوا ناتوانین ڕەوشـــی یاســـایی کارەکە (بە گوتەی خۆتان) بپارێزن؛ ئاخر خۆ ئێوە دەزانن لێرە کارەکان چۆن بەڕێوە دەچن، ئازیز... هەر ئەم ڕەوشـــە یاســـاییە دەســـت و پێی ئێمەی بەســـتووەتەوە و ناکرێ خۆتی لێ لا بدەی... خۆ خۆتان دەیبینن!...

پۆرفێری لە بـارێکدا کە هەروا لەژێر لێوەوە چەنەچەنی دەکرد، لە بەردەرگەکەدا گوێی هەڵخســـت. هەر بە ڕاســـتیش لەپشـــت دەرگەکەوە دەنگگەلێک دەهاتن.

– ئەها! وا دێن!

هاواری ڕاسکۆڵنیکۆف بەرز بووەوە.

– تۆ نـاردتە دوایـان!... چـاوەڕێیـان بووی! بـاشـــــە، هەڵبەتە بیرت لەوەش کردبووەوە... کەواتە یەک بە یەکیـان بێنە! شـــــاهیدەکـان و پارێزەرەکان و هەر کەسێ کە پێت خۆشە!... ئادەی بیانهێنە! من لێرەم، ئامادەم!

بەڵام لێرانەدا بوو کە پێشـــهاتێکی نامۆ هاتە ئارا، پێشـــهاتێکی هێندە چاوەڕواننەکراو کە ڕاســـــکۆڵنیکۆف و پۆرفێری پێترۆڤیچ هیچکامیان نەیاندەتوانی تەنانەت سۆسەشی بکەن.

## شەش

ڕاسکۆلنیکۆف دواتر کە ئەو دیمەنەی دەهێنایەوە یاد، وێناگەلێکی لەم جۆرەی دەهاتنە بەرچاو: دەنگێک کە لەپشت دەرگەوە دەهات بەرز و بەرزتر بووەوە و کتوپڕ لە دەرێڕا دەرگەکە کرایەوە.

– چییە؟ چی بووە؟

پۆرفێری پیترۆڤیچ کە هەڵچووبوو، بە ڕووی ئەوانەی دەرێدا هەڵشاخا:

– باشە پێم نەگوت...

سەرەتا بێدەنگی باڵی کێشا و هیچ وەڵامێک نەبوو، بەس دیار بوو چەند کەسێک لەپشت دەرگەکەوەن و وا دیارە خەریکن لە پشترا کەسێک پەلکێش دەکەن.

پۆرفێری پیترۆڤیچ بە پەشۆکاوی دووبارەی کردەوە:

– پرسیم چی بووە؟ چیتانە؟

یەکێک وەڵامی دایەوە:

– زیندانییەکەمان هێنا... میکۆلای.

پۆرفێری فڕکەی کردە لای دەرگەکە و هاواری گەیشتە ئاسمان:

– ئێستە نا! کاتی نییە! دەی بیبەن! هەر لە دەرێ چاوەڕێ بن! باشە چی دەکەن لێرە؟ تۆ سەیرکە توخوا چ کەس بە کەسییەکە لێرە!

– وەلێ خۆی...

ئەم جارەشیان هەر هەمان دەنگەکەی پێشوو وەڵامی دایەوە، بەس کتوپڕ پچڕا.

چەند خولەکێک –تەنیا چەند خولەکێک نەک زیاتر– بە تێکگیرانێکی تەن بە تەنەوە تێپەڕی و پاشـــان دەتگوت کەســێک بە هەموو هێزی خۆیەوە یەکێکی دیکەی پاڵنایە لایەکەوە و جا پیاوێک کە ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو، هەنگاوی نایە نووسینگەکەی پۆرفێری پیترۆڤیچەوە.

ڕواڵەتی تازەهاتووەکە بە یەکەمین ســەرنج فرە ســەیروســەمەرە دەردەکەوت. واقی بە بەرانبەریدا وڕمابوو، وەلێ دەتگوت هیچ شــتێک و هیچ کەسێک نابینێت. بەس دەکرا بریقەی ویست و بڕیاری بنجبڕانە لە چـاوانیـدا بەدی بکەیـت و بە بـاری ڕەنگپەڕیوی مەرگـاویی ڕووخســـاریشـــیدا؛ دەتگوت خەریکن بەرەو داری قەنارەی دەبەن. لێوەکانی سووکەلەرزینێکیان هەبوو و سپی هەڵگەڕابوون.

هێشـــتا زۆر گەنج بوو، لاواز و ڕەقەڵە، بە بەژنێکی مامناوەندی و سەروسیمایەوە کە هاواری دەکرد کرێکار و شتە. بە دەوری سەریدا قژییان بە خڕی بڕیبوو و ئەندامەکانی ڕووخســـاری ناســـک و تا ڕادەیەک وشـک بوون. ئەو پیاوەی کە گەنجۆکەکە بە پاڵ خسـتبوویە لاوە، بەدوایدا هاتە ژوور و توانیی چنگ لە شـــانی گیر بکات. کابرا، یەکێک بوو لە پاسەوانەکان، جارێکی دی خۆی لە چنگی ئەو ڕاپسکاند.

چەنـدان کەس کونجکۆڵانە بەدوای یەکـدا لەپشـــت دەرگەکەوە ڕاوەستابوون و هەر لە ئاستانەکەوە سەریان دەکێشایە ژووریێ، یەک دوو کەســێکیشــیان ویســتیان هەرچۆنێک بووە بێنە ژوور. هەڵبەتە هەموو ئەمانە لە چاوترووسکانێکدا ڕوویان دا.

پۆرفێری پیترۆڤیچ وەک ئەوەی دۆخەکەی لەدەســـت دەرچووبێت، هەتا بڵێیت بە پەستی لەژێر لێوەوە مڕاندی:

– دەرێ، دەرێ! هێشتا کاتی نەهاتووە! بوەستە تا خۆم بڵێم بتهێننە ژوورا... بۆچی ئەوەندە زوو هێناتان ئێوە؟ ها؟

بەلام میکۆلای کتوپڕ کەوتە سەر ئەژنۆ.

پۆرفیری تاساوانە هاواری کرد:

– ئێ چییە؟ چی بووە؟...

میکۆلای بێ پێشەکی زاری کردەوە:

– من خەتابارم قوربان! تاوانبار منم! بکوژم من... بکوژ!

وا دیار بوو بە باشــی هەناســەی بۆ نادرێت، کەچی وێڕای ئەوەش بە دەنگێکی تا ڕادەیەک بەرزەوە قسەکەی کرد.

دە چرکەیەک بێدەنگی هـاتە هـارا، دەتگوت هەموو لاڵ بووبوون. تەنانەت پاســەوانەکەش هەنگاوی نایە دواوە و وەک ئەوەی نائاگایانە بێت پشتاوپشت تا دەرگەکە چوو و هەر لەوێ بێ جووڵە ڕاوەستا.

پۆرفیری پیترۆڤیچ دواجار توانیی بێتەوە ســەر خۆی و هەرچۆنێک بووە بۆ ساتێک لەو تاساوییە خۆی نەجات بدات، هاواری کرد:

– لێرە چ باسە؟

میکۆلای ئێستێکی کورتی کرد و هەمدیسان گوتی:

– من... بکوژ منم!

– چیت گوت؟... تۆ چی؟... کێت کوشتووە؟

دیار بوو کە پۆرفیری پیترۆڤیچ بە تەواوی گێژ بووە.

میکۆلای دیسان بۆ خولەکێک بێدەنگ بوو.

– ئالیۆنا ئیڤانۆڤنا و لیزاڤێتای خوشــکی... من... من کوشــتمن... بە تەور... ئەقڵم لەدەست دابوو!...

میکۆلای هێشتا لەسەر ئەژنۆ دانیشتبوو.

پۆرفیێری پیترۆڤیچ وەک ئەوەی لە فکر و خەیاڵدا ڕۆچووبێت، چەند خولەکێک وسـکت و بێجووڵە ڕاوەسـتا، وەلێ لەناکاو هاتەوە سـەر خۆی و بە جووڵەی دەسـت ئەو تەماشـاکەرانەی کردنە دەر کە سـەربەخۆ هاتبوون. ئەوانیش یەکسـەر ئەو ناوەیان چۆڵ کرد و بەدوای خۆیاندا دەرگەکەیان پێوە دا. پۆرفیێری نیگای گواستەوە سـەر ڕاسکۆلنیکۆف کە لە لایەکی ژوورەکەدا ڕاوەستابوو و سـەراسیمە لە میکۆلای دەڕوانی و ویسـتی بەرەو لای بچێت، بەڵام بەری بە خۆی گرت. نیگای لە ڕاسـکۆلنیکۆفەوە گواسـتەوە سـەر میکۆلای و بە پێچەوانەشـەوە. لەنـاکـاو وەک ئەوەی جڵەوی خۆی لەدەسـت دەرچووبێت، بە جۆرێک لە پەستییەوە بە میکۆلایدا هەڵشاخا:

– تۆش دەڵێی زۆر پەلەتە! باشـە شـوێنت کەوتوون؟ نەکا بەتەمای دەستپێشخەری بی؟ بۆ من پرسیبووم کە ئەقڵت لەدەست دابوو یان نا کە قسەی بەلاش دەکەی؟... ئادەی بڵێ بزانم تۆ ئەو ژنانەت کوشتن؟

میکۆلای برگەبڕگە گوتی:

– من بکوژم... دەمەوێ دانی پێدا بنێم...

– ئای لەوە! باشە بە چی لەو داماوانەت دا و کوشتتن؟

– بە تەور کوشتمن... پێشوەختە ئامادەم کردبوو.

– وا دیارە تۆ بە شـەش مانگی لە دایک بووی! باشـە، ئەی بە تەنیا بووی؟

میکۆلای لە مەبەستی پۆرفیێری تێنەگەیشت.

– گوتم بە تەنیا بووی؟ یان کەسی تریشت لەگەڵ بوو؟

– تەنیا بووم. میتکا بێتاوانە و هیچی نەکردووە لەم نێوەندەدا.

– جاریّ له میتکا گەرێ بۆ دوایی! ســـەیرە! ئەی... چۆن بوو کە پێکەوە لە پلیکانەکانەوە هەڵهاتنە خوارەوە؟ قاپچییەکان هەردووکتانیان پێکەوە دیبوو!

– هەمووی بۆ بەلاڕێـدابردن بوو... شـــوێنی میتکـا کەوتم تـا بەلاڕێیاندا بەرم...

میکۆلای ئەم جارەشـــیـان فرە خێرا وەڵامی دایەوە. وا دیـاربوو پێشوەختە هەموو شتێکی ئامادە کردووە و پەلەیەتی زوو بیبڕێنێتەوە.

پۆرفێری کە لە تووڕەییان پێچی دەدایە خۆی، هاواری لێ هەستا:

– دە فەرموو، ڕێک بەو جۆرە دەرچوو کە بیرم لێ دەکردەوە!

پاشان وا دیار بوو بە خۆی گوت: *ئەمە قسەی خۆی نییە!* جا کتوپڕ سەرنجی چووە سەر ڕاسکۆڵنیکۆف.

پۆرفێری بە چاولەچاوبڕینی ئەو هەم ســـلەمییەوە و هەم نارەحەت بوو، وا دیــار بـوو زەینـی هێنــدە بە مـیـکۆلایەوە مەژغـووڵە کە ڕاسکۆڵنیکۆفی بیر چووەتەوە:

– ڕۆدیۆن ڕامانۆڤیچی ئازیز! من داوای لێبوردن دەکەم. وا نابێ... ئێوە فەرموون، باشـتر وایە ئێوە بڕۆن... خۆ خۆتان ئاگادارن، شـێتیان کردووین ئەمانە... بڕۆن، خواتان لەگەڵ!

پۆرفێری باسکی ڕاسکۆڵنیکۆفی گرت و بەرەو دەرگەکەی برد.

ڕاســـکۆڵنیکۆف ڕێک لە مەبەســـتی ســـەرەکیی بەســـەرهاتەکە تێنەگەیشــتبوو، لەگەڵ ئەوەشــدا ســنگی دەرپەڕاند و دەســتی کردە چەنەچەن:

– وا بزانم چاوەڕێی ئەوە نەبوون، ها؟

– ئێوەش چاوەڕێی نەبوون، ئازیز گیان! تەماشـــا چۆن دەســـتتان دەلەرزێ! هاها!

– خۆشتان وا هەڵدەلەرزن، پۆرفیری پیترۆڤیچ!

– بەڵێ، منیش هەڵدەلەرزم! سەرنجی ئەوەم نەدابوو!

گەیشـتبووە بەردەرگەکە و پۆرفیری پشـووکورتانە خنەخنی دەکرد تا ڕاسکۆڵنیکۆف زووتر بڕوات.

ڕاسکۆڵنیکۆف تانەی لێ دا:

– باشـــە، ئەی کوا ئەو *ســـوورپرایزە*ی کە باســتان دەکرد؟ نیشــانم نادەن؟

– قسـەی وا دەکەن و کەچی ددانەکانی خۆتان لە ترسـان چۆقەیان دێ، هاها! کەسێکی سەرنجڕاکێشن ئێوە! باشە، بەهیوای دیدار...

– لام وایە هەر لێرە ماڵئاوایی بکەین باشترە!

پۆرفیری پیترۆڤیچ بە زەردەخەنەیەکی گوماناوییەوە گوتی:

– خوا دەزانێ! دەیدەینە دەست خوا...

ڕاسکۆڵنیکۆف لە کاتی ڕابردن بە ڕاڕەوەکانی بەڕێوەبەرایەتییەکەدا، ســـەیر دەکات زۆربەی واقووڕ لێی دەڕوانن. هەردووک قاپچیی ماڵی پیرێژنەکەش کە ئەو شـەوە داوای لێ کردبوون پێکەوە بچن بۆ بنکەی پۆلیس، لەوێ ڕاوەستابوون و بەدەم چاوەڕوانییەوە زەق تەماشـایان دەکرد. بەڵام هێشـــتا هەنگاوی نەنـابووە پلیکانەکـانەوە کە دەنگی پۆرفیری پیترۆڤیچی لە پشتڕا بیست. سـووڕایەوە و سـەیری کرد وا پۆرفیری پیترۆڤیچ هەناسەسوار بەدوایدا ڕادەکات.

– تەنیا خولەکێک، جەنابی ڕاسکۆڵنیکۆف، لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە؛ ڕاسـتە هەموو شـتێ لەدەسـت خوایە، وەلێ ڕەوشـەکەشـی لە بەرچاو

بگرن و شـــتگەلێک ماون کە دەبێ لێتانی بپرســـم... کەواتە بێگومان هەمدیسان یەکتری دەبینینەوە و گوتوبێژێک دەکەین.

پۆرفیری بەدەم بزەوە بێجووڵە لەبەردەم ڕاســـکۆڵنیکۆفـدا ڕاوەستابوو. دووبارەی کردەوە:

– بێگومان یەکتری دەبینینەوە.

وا دیاربوو بەتەمایە قســـەی زیاتر بکات، کەچی نەیدەتوانی هیچی دیکە بڵێت.

– ئێوەش دەبێ بمبوورن پۆرفیری پیترۆڤیچ... لەبـارەی ئەو شتانەوەی کە ئەمڕۆ ڕوویان دا... من لەخۆڕا توورە بووم و کۆنترۆڵم لەدەست دا...

ڕاســـکۆڵنیکۆف لەســـەر قســـەکەی بەردەوام بوو، دۆخی هێندە هاتبووەوە سەر خۆی کە نەیدەتوانی وەها دەرفەتێک لەدەست بدات و لەبەردەم پارفیریدا کەوتە خۆنواندن.

پۆرفیری بە جۆرێک لە شادییەوە وەڵامی دایەوە:

– وا مەفەرموون، قوربـان، وا مەفەرموون! منیش هەر وا... ئـاخر ڕەوشـــتی منیش دەڵێی قوزەڵقورتە! کەواتە یەکتری دەبینینەوە، ئازیز. گەر خوا بیکاتە نسیب زیاتریش چاومان بە یەکتری دەکەوێتەوە!...

ڕاسکۆڵنیکۆفیش خۆی تێک نەدا:

– زیاتریش یەک دەناسین، وایە؟

پۆرفیری هاوڕایی خۆی دەربڕی:

– بە دڵنیاییەوە باشتر یەکتری دەناسین...

جـا چـاوەکـانیی زیـت کردنەوە و نیگـایەکی بێڕادە جـددیی گرتە ڕاسکۆڵنیکۆف:

– باشە، کەواتە ئێستە لەسەر خێر دەچن بۆ ئاهەنگی لەدایکبوون؟

– نەخێر، ڕێورەسمی بەخاکسپاردن.

– ئەها! پێتان گوتبووم، بەڵێ، ڕێورەسمی بەخاکسپاردن! ئاگاداری خۆتان بن، بابەتی تەندروستییەکەشتان بەهەند وەرگرن، تەندروستی!...

ڕاســـکۆلنیکۆف خەریک بوو بە پلیکانەکاندا دەچووە خوار، بەڵام هەمدیسان ئاوڕی دایەوە:

– وەڵێ من نازانم دەبێ چ دوعایەک بۆ ئێوە بکەم! دەمەوێ هیوای ســەرکەوتنتان بۆ بخوازم، بەس ئاخر ئەم پیشــە پێکەنیناوییە چییە کە ئێوە هەتانە!

پۆرفیری پیترۆڤیچیش خەریک بوو دەگەڕایەوە ژوورەکەی، کەچی لەگەڵ بیستنی قسەکانی ڕاسکۆلنیکۆفدا گوێی شل کرد و گوتی:

– باشە بۆچی پێکەنیناوی؟

– دەی بۆ نموونە هەر ئەم میکۆلا چارەڕەشــە! لە ئەشــکەنجەدانی ڕۆحی و گوشــارخســتنە ســەر دەروون هیچ درێغییەکتان نەکردووە! شـــێوازی ئێوە ئەمەیە دەی! ئەوەندە زۆرتان بۆ هێناوە تا دانی پێدا ناوە دواجار. دڵنیام شەو و ڕۆژ بەسەرییەوە بوونە تا بۆی بسەلمێنن کە بکوژە و هەر بە گوێیتاندا داوە کە *تۆ بکوژی، بکوژ*... کەچی ئێستە کە دانی پێدا ناوە، دیسان دەتانەوێ لە خاچی بدەنەوە کە *درۆزنی! خۆ تۆ بکوژ نییت! ئەســـڵەن ڕێی تێناچێ ئەو کوشـــتنە کاری تۆ بووبێ! ئەمانە قســـەی خۆت نین!* ئێســـتە خۆتان بڵێن پێکەنیناوی نییە ئەم دۆخە؟

– هاهاها! کەواتە بیســـتتان کە بە میکۆلایم گوت ئەوەی کە دەیڵێ قسەی خۆی نییە؟

– ئاخر چۆن دەکرا نەیبیستم؟

– هاها! وردن ئێوە، زۆریش وردن! هیچ شـــتێکتان بەســـەردا تێناپەڕێ! زەینێکی چەندە زیتەڵەتان هەیە ئێوە! دایمەش لایەنی تەنزی مەســەلەکە دەبینن... هاهاها! دەڵێن لەنێو نووســەراندا گۆگۆل وا بووە، ئەرێ؟

– بەڵێ، گۆگۆل وا بووە.

– بەڵێ، گۆگۆل... باشە، تامەزرۆی دیدارتانین.

– منیش تامەزرۆی دیدارم...

ڕاسکۆڵنیکۆف ڕاستەوڕاست چووەوە ماڵێ. مێشکی هێندە جەنجاڵ و وڕ بوو کە هەر هەنگاوی نایە ژوورەکەوە تەخت خۆی بەســـەر قەنەفەکەدا دا و کۆشـــای تا هەرچۆنێک بووە زەینی لەو شـــپرزەییە دەرباز بکات. نەیدەویســـت بابەتەکەی میکۆلای شـــەنوکەو بکات. کاس بوو و هەستی دەکرد لەو دانپێدانانەدا شتێکی نامۆ و پاکانەکراو و لە ســـەرووی تێگەیشـــتنی هەنووکەیی ئەوەوە هەبووە. وەلێ نەدەکرا نکۆڵی لەوە بکرێت کە ئەو دانپێدانانەی میکۆلای ڕاســـتییەک بووە و وەک ڕۆژ بۆی ڕۆشن بوو کە ئەم ڕاستییە شتگەلێکی بەدواوە دەبێت. درۆیەکی هێندە گەورە نەدەکرا ئاشـکرا نەبێت و، ئەوسـا، هەمدیسـان شـــوێن ئەو کەونەوە! وەلێ لانیکەم تا کاتی خۆی ئازادە و دەبێت خەمێکی خۆی بخوات، لەبەر ئەوەی مەترســـییەکە ئەملا و ئەولای تێدا نەبوو.

بەڵام مەترسـییەکە تا چ ڕادەیەک بێچەندوچۆن بوو و کتومت بڕیار بوو کەی بە ســـەریدا بدات؟ بارودۆخەکەی خەریک بوو بەرەبەرە بۆ خۆیشـــی ڕوون دەبووەوە. تەنانەت کە بە نیوەچڵی هێڵی گشـــتیی دیمەنەکانی دیدارەکەی ئەمڕۆی لەگەڵ پارفیریـدا دەهێنـایەوە یـاد، نەیدەتوانی بەر بە خۆی بگرێت و لە ترسـاندا سـەراپای هەڵدەلەرزی.

هەڵبەتە هێشــــتــا بۆی ڕوون نەبووبووەوە کە پۆرفیری بەدوای چ شــتگەلێکی دیکەوەیە و نەیدەتوانی سـۆسـەی سـەروبنی نەخشـەکانی ئەو بکات. وەلێ جەنابی لێکۆڵەر تا ڕادەیەک دەســـتی خۆی ئاشـــکرا کردبوو و هیچ کەســـێک بێ لە خودی ڕاســـکۆڵنیکۆف نەیدەزانی جووڵەی دواتری پۆرفیری لەم هەلومەرجە تـایبەتییەدا چ گرنگییەکی تۆقێنەری لە دیاریکردنی چارەنووســـی ئەودا هەیە. گەر تەنیا تۆزێکی دی درێژەیـان پێ بـدابـا، لەوانەبوو بە تەواوی خۆی پێوە بکـات و ئەوەش بۆ خۆی ببێتە ڕاســـتییەک. پۆرفیری کە هەر بە یەکەمین بەرکەوتن چاک لەو تێگەیشـــتبوو و شـــارەزای بووبوو کە بەدخوو و تووڕەیە، بێباکانە دەستی دابووە یارییەکی ترسناکی بێچەندوچۆن، کە سەرکەوتنەکەشی قسەی تێدا نەبوو. لە لایەکیشەوە هیچ نکۆڵیکردنێکی تێدا نەبوو کە ڕاسکۆڵنیکۆف خراپ گومانی تاوانباریی خستبووە سەر خۆی، وەلێ هێشتا ڕاستییەک لەئارادا نەبوو و هیچ شتێکیش یەکلایی نەکرابووەوە. نەکا لەم نێوەندەدا خاڵێک شـتێکی بەسـەردا تێپەڕیبێت؟ پۆرفیری کتومت چیی دەویست؟ ئەو سووپرایزەی کە باسی کردبوو... یانی هەر بە ڕاستی بۆ ئەو مەبەستە شتێکی لە هەگبەدا بوو؟ تۆ بڵێیت ئەو شـتە چی بێت؟ ئاخۆ گەر میکۆلای کتوپڕ نەهاتبا و ئەو شـانۆیەی پێشکەش نەکردبا، لە چ دۆخێکدا لێک جیا دەبوونەوە؟

دەکرا بڵێین پۆرفیری بۆ سـەرکەوتن هەرچی کارتی هەبوو بەکاری هێنابوو –هەڵبەتە بە بەکارهێنانی کارتەکانیشـــی خۆیشـــی خســـتبووە مەترســـییەوە– بەڵام گەر هەر بە ڕاســـتی شـــاهیدێک یان بەڵگەیەکی ڕێکوپێکی هەبا، ڕاســـکۆڵنیکۆف وای بۆ دەچوو کە ئەویشـی دەخسـتە ڕوو. ئاخۆ *سـووپرایزە*کەی ڕاســکۆڵنیکۆف دەبوو چی بێت؟ نەکا پێی ڕابواردبێت؟ نەکا حەقیقەتێک لە قســـەکانیدا هەبووبێت و بەڵگەیەک، شـتێکی لە دژی ڕاسـکۆڵنیکۆف لە بەردەسـتدا بووە کە بتوانێت ئەوی پێ تۆمەتبار بکات؟ ئەی ئەو پیاوەی دوێنێ؟ چۆن ئـاوهـا خۆی ون

کردووه؟ تۆ بڵێیت ئەمڕۆ لە کوێ بووبێت؟ ئەگەر پۆرفیری بەڵگەیەکی بەدەستەوە بێت، بێگومان پەیوەندییەکی بەو غەوارەیەوە هەیە...

لەسەر قەنەفەکە دانیشت، ئەنیشکەکانیی خستنە سەر ئەژنۆکانی و دەموچاویی لەنێو لەپی دەستەکانیدا شاردەوە. هێشتا هەرزینی سەرچاوەگرتوو لە شلەژانەوە دەستی لێ هەڵنەگرتبوو. دواجار هەستایەوە، کڵاوەکەیی هەڵگرت، بیرێکی کردەوە و بەرەو دەرگەکە چوو. دڵی لەبەر هۆکارێکی نادیار هەواڵی دابوو کە لانیکەم دەتوانێت بە بێوەیی ئەمڕۆ بەسەر بەرێت. کتوپڕ کەوتە بارێکی تا ڕادەیەک خۆشەوە و ویستی تا زووە خۆی بگەیەنێتە ماڵی کاترینا ئیڤانۆڤنا. ئیدی فریای ناشتنەکە نەدەکەوت، وەلێ دەیتوانی خۆی بگەیەنێتە ڕێوڕەسمەکە و لەوێش چاوی بە سۆنیا بکەوێت.

چەند ساتێک ڕاوەستا و فکر بردییەوە. بزەیەکی نەخۆشانەی ئازاراوی بەسەر لێوییەوە کەوتە سەما. *ئەمڕۆ! ئائەمڕۆ!* جا لەبەرخۆوە دووبارەی کردەوە: *ئائەمڕۆ! دەبێ، دەبێ...*

ویستی دەرگەکە بکاتەوە کە لەناکاو خۆی لاترەک بوو و بە هێمنی کرایەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف ڕاچەنی و کشایە دواوە. دەرگەکە، زۆر بە نەرمی و شێنەیی کرایەوە و کتوپڕ قەڵافەتێک لە ئاستانەکەیدا دەرکەوت، هەمان ئەو غەوارەیەی دوێنێ کە لەژێر زەوییەوە هەڵتۆقیبوو.

کابرا، لە ئاستانەکەدا دڕدۆنگ ڕاوەستابوو و بێ ئەوەی ورتەی لە دەم بێتە دەر لە ڕاسکۆڵنیکۆفی دەڕوانی. دواجار هەنگاوی نایە ژوورێ. کتومت وەک دوێنێی بوو: هەمان سەروسیما و هەمان جلوبەرگ. بەس دەموچاو و شێوەی سەیرکردنی پێچەوانە بووبوو، زۆر پەرێشان دەینواند و خەمگینانە ئاهی هەڵدەکێشا. هەر ئەوەندە بەس بوو دەست بنێ بە گۆنایەوە و ملی لار بکات تا وەک پیرەژنە لادێییەکان دەربکەوێت.

– چیتان دەوێ؟

ڕاسکۆڵنیکۆف لە ترساندا ئیفلیج بووبوو.

پیاوەکە هەر وا بێدەنگ بوو، بەڵام کتوپڕ هێندە چەمایەوە کە خەریک بوو سەری بەر زەوی دەکەوت، لەو نێوەندەشدا بێگومان پەنجەی دەستی ڕاستی بەر زەوی کەوت.

ڕاسکۆڵنیکۆف هاواری کرد:

– ئیشتان چییە؟

پیاوەکە لەسەر خۆ و بڕگەبڕگە گوتی:

– من گوناحبارم.

– چ گوناحێک؟

– بیری شەیتانیم بە خەیاڵدا هاتن.

بەدەم قسەکردنەوە لێک ورد دەبوونەوە.

– پەست بووبووم بەڕێز. ئەو شەوەی کە هاتن و لەوانەشە سەرخۆش بووبن، بە قاپچییەکاندتان گوت بێن بۆ بنکەی پۆلیس و خۆشتان هەر پرسیاری خوێنتان دەکرد، بە تەواوی لەوە پەست بووم کە بۆچی گوێیان پێ نەدان و هەموو شتێکیان دایە پاڵ سەرخۆشی. بە کورتییەکەی نەمتوانی بخەوم. دوێنێ کە ناونیشانەکەتانمان بیر هاتەوە، هەستاین و هاتین بۆ ئێرە و لای دراوسێکان هەواڵمان پرسین...

ڕاسکۆڵنیکۆف پەڕییە نێو قسەکانی:

– کێ هاتە ئێرە؟

هاوکات خۆیشی خەریک بوو دوێنێی بیر دەهێنایەوە.

– خۆم. خراپم کرد لەگەڵتان.

– یانی ئێوەش نیشتەجێی هەمان بینان؟

– لەگەڵ ئەوانی تر لە بەردەرگەکەدا ڕاوەستابووم ئەو شەوە، لەژێر میچی دەرگەی سەرەکیی بیناکەدا، بیرتان نییە؟ کاروکاسبیمان

لەو ناوەیە، کارم پۆستەیە، کارەکانمان دەهێنینەوە ماڵێ و هەر لەوێ پۆستەکان دەکەین... لەوە ناڕەحەت بووم کە...

کتوپڕ سەرانسەری دیمەنی ڕۆژی پێشووی بەردەرگەی ئەو بینایە، ڕوون و ئاشکرا هاتە بەرچاوی ڕاسکۆڵنیکۆف. بیری هاتەوە بێ لەو دوو قاپچییە چەند کەسێکی دیکەش لەوێ بوون، چەند ژنێکیشیان لەنێودا بوون. دەنگێکی هاتەوە یاد کە گوتبووی دەبێت ڕاستەوڕاست بیبەنە لای پۆلیس، وەلێ ڕووخساری خاوەنی دەنگەکەی بیر نەبوو و تەنانەت ئێستەش ئەوی بیر نەدەهاتەوە و تەنیا ئەوەندەی دەزانی کە ئاوڕی بۆ خاوەنی دەنگەکە داوەتەوە و وەڵامێکیشی دابووەوە...

کەواتە ڕوونە، ئەمەیە وەڵامی مەتەڵە تۆقێنەرەکەی دوێنێ! سامناکترین بەشیشی بیرکردنەوە بوو لەوەی کە چۆن تا پێوەکردن و لەنێوبردنی خۆی سڵی نەکردووەتەوە، جا تەنیا لەبەر خاڵێکی ئەوەندە ورد و بێبایەخیش. کەواتە ئەم پیاوە هیچی پێ نەبووە تا بیڵێ بێ لە پرسیارکردنەکەی ئەو لەبارەی ئەپارتمانی ئەو پیرێژنە و پەڵە خوێنەکانەوە. پارفێریش بێ لە وڕێنەکردنەکانی ئەو پشتی بە هیچ قایم نەبووە و هیچ بەڵگە و ڕاستییەکیش لەئارادا نییە، جگە لە *دەروونناسی* کە ئەویش *شمشێری دوودەمە!* کەواتە هەموو شتێک باشە. بەڵام گەر ڕاستییەکی نوێ دەرنەکەوێت (هەر ناشبێت دەربکەوێت، نابێت، هەرگیز!)... ئەوسا دەتوانن چیی لێ بکەن؟ گریمان دەستبەسەریشیان کرد، چۆن دەیانەوێ تۆمەتباری بکەن؟ کەواتە پۆرفێری تازەبەتازە بابەتی ئەپارتمانەکەی بیستبوو و پێشتریش لە هەموو شتێک بێئاگا بووە!

بیرکردنەوەیەکی چاوەڕواننەکراو بە زەینی ڕاسکۆڵنیکۆفدا ڕابرد. هاواری کرد:

– یانی ئەمڕۆ ئێوە بە پارفێریتان گوت... کە من لەوێ بووم؟

– کامە پۆرفێری؟

– پۆلیسە لێکۆڵەرەکە دەڵێم.

– من پێم گوت. قاپچییەکان نەچوون بۆ لای پۆلیس، لەبەر ئەوە خۆم چووم.

– ئەمڕۆ؟

– خولەکێک بەر لە ئێوە گەیشـــتمە ئەوێ. هەموو قســـەکانیشـــم بیستن، بیستم کە چۆن خەریک بوو ئەشکەنجەی دەدان.

– ئاخر لە کوێ؟ چۆن؟ کەی بوو؟

– لەپشـــت یارۆ باریکە دیوارەکەوە، بە درێژایی ئەو ماوەیە لەوێ دانیشتبووم.

– ئەوە چی دەڵێن؟ نەکا ئەو *ســـووپرایزە* ئێوە بووبن؟ ئاخر ئەوە چۆن ڕووی دا؟ سەیرە!

– سـەیر دەکەم قاپچییەکان قسەیان بە گوێدا ناچێ. دەیانگوت زۆر درەنـگ بووە و ڕەنگە لێکۆڵەر لێمـان توورە بێ کە بۆچی لە کـاتی خۆیدا هەواڵمان نەداوە. منیش پەسـت و بێخەو، کەوتمە پرسیارکردن. دوێنێ بیرم لێ کردەوە و ئەمڕۆ دواجار ڕۆیشـــتم. کە یەکەم جار چووم، لەوێ نەبوو. کاتژمێرێ دواتر دیسان چوومەوە، گوتیان ئێستە ناتوانێ من ببینێ. کە ســـێیەم جار چووم، دواجار یەکتریمان بینی. هەموو شـــتێکم پێ گوت، کتومت بەو جۆرەی ڕووی دابوو. کاکم بە ژوورەکەدا کەوتە پیاسە و زوو زوو بە سـەر سنگییدا دەکوتی: *ئاخر بەتەمـان چ بەڵایەکم بەســـەردا بێنن ئێوەی چەتە؟ گەر بمزانیبـا دەســـتبەجێ دەمگرت!* پاشـــان ڕایکرد و کەســـێکی بانگ کرد و لە ســـووچێکی ژوورەکەوە لەگەڵی کەوتە چپەچپ. ئەوســـا ڕووی کردە من، دامیە بەر پرسیار و جنێو. زۆریشی بەسەردا نەڕاندم. لە نووکەوە بۆ نووک مەســـەلەکەم بۆ گێڕایەوە. گوتم دوێنێ نەتانوێرا لەبەردەم مندا زار هەڵبێنن و تەنانەت نەشـتانناسـیمەوە. ئەویش هەمدیســان بە ژوورەکەدا کەوتەوە ئامۆشـۆ و هەر وا بەســەر ســنگییدا دەکوتی. تا دەهات تووڕەتر دەبوو و ڕێی دەکرد و کاتێکیش گوتیان ئێوە هاتوون، فەرمانی پێ دام بچمە ژوورەکەی تەنیشـــت و گوتی: *دەی، ئێســـتە*

*دەچێتە ئەو پشتەوە و دادەنیشێ و هەرچیشت بیست، نابێ دەنگت لێوە بێ!* پاشانیش کورسیی بۆ دانام و دەرگەی بەسەردا داخستم. گوتی: *لەوانەشە بانگت بکەم.* کە میکۆلایان هێنا، دەرگەکەی لێ کردمەوە و هێنامیە دەرێ. ئێوە ئیتر ڕۆیشتبوون. گوتی: *دیسان دەنێرمەوە شوێنت. لێکۆڵینەوە تەواو نەبووە هێشتا...*

– یانی ئەو کاتەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ میکۆلایدا دەکرد تۆ لەوێ بووی؟

– سەرەتا ئێوەی بەڕێ کرد، پاشانیش تا منی نەناردە دەرێ لێکۆڵینەوەی لەگەڵ میکۆلایدا نەکرد.

کابرا ئێستێکی کرد و لەناکاو داچەمی، بە جۆرێک کە هەمدیسان پەنجەی بەر زەوی کەوت.

– داوای لێبوردن دەکەم بۆ ئەو بوختان و توندوتیژییەم.

ڕاسکۆڵنیکۆف وەڵامی دایەوە:

– خوا بتبوورێ!

بەڵام هێشتا ڕاسکۆڵنیکۆف ڕستەکەی لە دەم دەر نەچووبوو کە پیاوەکە هەمدیسان نووشتایەوە –بەس ئەم جارەیان کەمتر– جا ژوورەکەی جێ هێشت. *شمشێری دوودەمە... بەڵێ، هەموو شتێکمان شمشێری دوودەمە!* ڕاسکۆڵنیکۆف لە بارێکدا کە هەر وا بەسەر یەکەوە ئەمەی پاتە دەکردە، بەهێزتر لە هەر کاتێکی دی ژوورەکەی جێ هێشت.

کە بە پلیکانەکاندا چووە خوار، ژارخەندێکی کرد و گوتی: لە خۆی پەست بوو کە ئەو ترسەزاڵییەیی دەهاتەوە یاد، شەرم و شوورەیی گیانیی دەتەنییەوە.

